# فەرهەنگی مۆزیـــک

**سیانزە هەزار زاراوە.**

**سەدوچوار نیگاری ئامێری مۆزیکایی**

نووسین و لێکدانەوەی

ئەسعەد قەرەداخی



هەرچەند بیرم لە دەوڵەمەندی زوانی کوردی و، زەنگینی و ڕەنگینی هونەرە مۆزیکییەکەی دەکردەوە،
لەلایەک خرۆشی دەیگرتم و لەلایەکیــتر نیگەرانی لەوەی کە چۆن خەرمانی هونەری کوردیمان لە
دەشتی بێکەسیدا دەدرێتە بەر باڕەشی ڕۆژگار و بەدەستانی نامۆ شەنوکەو دەکرێت.
ئەم دیمەنە وەک تارماییەک هەمیشە لە پێشچاومدا دەهاتودەچو و کەوتبوومە
نێو گێژاویەوە، نەمدەزانی چۆن خۆم هەڵدەمە نێو ئەو تارماییەوە و مشتێک
لە نهێنیەکانیهەڵگۆزم و بیانهێنمەوە نێوجیهانی ڕۆشناییەوە. بۆ چەند
ساڵێک کەوتمەخۆم تا بە پشتیوانی خودێ و هاوکارانی دڵسۆز
کەوتمەسەر گوڵەوەچنی ئەو وشانەی دەشێن لە توێی
نووسراوێکدا وەک زاراوە کۆبکرێنەوە بەناوی

## فەرهەنگی مۆزیک

## ..... پێشکەش .....

* بە تیپی مۆسیقای سلێمانی کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە و تاکو ئێستا لە داهێنان و والاکاری هونەریدایە .
* بەو تیپ و کەسایەتییە هونەریانەی کە خزمەت بە هونەری کوردستانی دەکەن.

## ســوپاس و پێزانینم بۆ:ـ

* ئەو خۆشــەویست و بەرێـزانەی لە دوور و لە نـزیک هاوکار و هانـدەرم بوون و دڵســۆزانە بە هانامەوە هاتـن.

## کورتکراوەی ئەو زوانانەی زاراوەکانی لێوە وەرگیراوە

| | |
|---|---|
| Ar | عارەبی |
| Av | ئاڤێستایی |
| Az | ئازەری |
| Br | بەربەری |
| Bu | بولگاری |
| Ch | چینیی |
| E | ئینگلیزی |
| F | فەرەنسایی |
| Fa | فارسی |
| G | ئەڵمانی |
| Gr | یۆنانی |
| H | هەنگاری |
| Hb | عیبری |
| Hn | هیندی |
| I | ئیتالیای |
| J | ژاپۆنی |
| Kr | کوردی |
| L | لاتینی |
| P | پورتوگاڵی |
| Ru | ڕووسی |
| S | ئیسپانیایی |
| Sc | سکاندناڤیایی |
| Tr | تورکی |

# ناوەڕۆک

# بەناوی خودێی پەروەردگار

# پەربووره

گوڵەوەچنی وشەگەلێک و، گێژان و بێژان و داڕشتنیان بۆ ڕۆنانی زاراوەیەک....زۆر لە نووسین و وەرگێڕان ستەمترە، چونکە لە هەموو زوانێکدا وەک پەرداخکردن و بیرازاندنی فەرسەنگێک وایە بۆ هەڵچنینی تەلارێک بەشێوەیەکی هەنداز و نەخشین. واتە داڕشتنی وشەزاراوەیەک کە تەواو مانای زوانەیی و فەلسەفەیی خۆی ببەخشێت.

ئێمەی کورد لەم مەیدانەدا کەم ئەزموون و سسترەوین کە دەشێت هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێکی وەک...ژێردەستەیی و پاوانکردنی زوانی دایک وەک پێویست، دابڕین لە جیهانی دەوەرە و کەمتەرخەمی و....چەند هێندێکیتر.

لەم چەند دواسالانەی سەتەی بیستەم و سەرەتا ساڵەی ئەم سەتەی ئێستاماندا لە باشووری کوردستان بە ئازادانە بەبێ هیچ سانسۆرێکی داگیرکەر گەلێک چالاکی لە گشت بوارەکانی هونەریی و ڕۆشنبیرییدا بە ئەنجامدەدرێت. ئەم هەلە ڕەخساوە بۆتەهۆی ئەوەی گەلێک ڕۆشنبیری بەتوانا کە جارانی ژێرەستە نەیاندەتوانی بیروڕا و تواناى بەهرەیی خۆیان هەڵێنجێنن و بیخەنە بەردەستی خوێنەواران، ئێستا بە دەیان و سەدان گۆڤار و پەڕاو لە چاپدەدرێن کە تێیاندا هەیە جێی دڵخۆشییە و ئومێدی ئەوەیان لێدەکرێت کە ببنە ژێدەر و سەرچاوەیەک بۆ لێتۆژینەوە و لێکۆڵینەوە.

خوێنەری هێژا... ئەم نووسینەی کە لەبەر دەستدایە تایبەتە بە زاراوە مۆزیکیەکان...بەری ڕەنجی چەند ساڵێکمە کە پێوەی خەریکبووم تا گەیاندوومەتە ئەوەی ببێتە بەرهەمێکی هونەری لە بواری مۆزیکدا.

سەرەتا...بەپاڵپشتی چەند سەرچاوەیەکی عارەبی کەوتمە ڕەشنووسی، هەرچەندە نە نیایی{قەناعەت}م پێدەهات و نە تێری دەکردم چونکە پێشەکی دەمزانی تەنیا هەر بەو سەرچاوانە وەک پێویست کارەکەم بۆ ناهێنرێتە ئەنجام، لەبەرئەوەی کە زوانی عارەبی ئەگەرچی زوانێکی باڵا و بێغەوشە بەڵام کە لەو سەرچاوانەی ورد دەبوومەوە، بۆم دەردەکەوت دانەران و نووسەرانی لە ڕووی لایەنە مێژوویی و هونەریەکانەوە زۆر لایانداوە بەلای خۆیاندا و زۆریش پەراوێزانە ئاوڕیان لە غەیری خۆیان داوەتەوە، جارێ خۆ هونەری کوردی مەگەر لەنێو سەدان نووسراو و بلاوکراوەدا تەنیا چەند دانەیەکی کەمی بەویژدان بە چەند دێڕێک ئەگەر ئاماژەیان پێدابێت. لە سەرچاوە تورکییەکاندا هەر بە هەمان شێوە و بگرە خراپتر، لە سەرچاوە فارسیەکانیشدا ئەگەر باسیش کرابێت وەک لەهجەیەکی ئێرانی/مەحەللی{وەک خۆیان دەڵێن} و بە بەشێک لە کەلتووری خۆیان دەزانن.

ئەم گەڕان و پەیجوریەم بووە تەگەرەیەکی گەورە لەبەردەمدا و وەک پێویست نەمدەتوانی لەسەر کارەکەم بەردەوام ببم. بەڵام لە کۆتاییەکانی ساڵی1996ز کاتێک ڕووم لە هەندەران کرد و لە وڵاتی

ســـوید گیرسامەوە، بەدەم خوێندنمەوە چکەچکە کەوتمە هەڵدانەوەی ڕەشنووسەکانم و لێوەیڕا بزێویی کەوتە گیانمەوە بۆ گەڕان بەدوای ســەرچاوە ئاوروپاییەکان کە بەڕاســتی بۆمدەرکەوت لەنێو زەریایەکی قووڵ و بەرینی زانست و هونەردام. خۆشبەختانە دەرووی زۆر لایەنم بەئاسانی بۆ کرایەوە، بەرەبەرە کەوتمەخۆم و دەستمکرد بە خوێندەنەوە و کۆکردنەوە و هەڵگۆزینــی ئەو ژێدەر و چاووگانەی کە لەبواربوون بۆ زاراوە مۆزیکییەکان ئەویـش بە بەکارهێنانی زۆر ســەرچاوە و ژێدەری تایبەت بە هونەر بە هەموو لایەنەکانیەوە، هەروەها زوانەفەرهەنگی ئەو میللەتانەی کە ڕۆڵیان هەبووە لە دانانی زاراوە مۆزیکیەکاندا وەک ئیتالیایی، فەڕەنســایی، ئەڵمانیایی، ئینگلیزیی و ئیسپانیایی ئەویش بە پەیداکردنی وەرگێڕاوی ئەو فەرهەنگانە بۆ زوانی ئینگلیزی، ســوێدی یاخود عارەبـی. ئەم فرە ســەرچاوانە بوونە وزە و پاڵهێزێکی وا کە بەخۆشم بوێرم بکەومە لێکدانەوە و ڕاڤەی زۆر لە زاراوانەی کە چ لە زوانەکەمانەوە نزیکن و چ پەیوەندی تەواویان بە هونەری مۆزیکی کوردییەوە هەیە. بەتایبەتی لێکدانەوەی زوانەوانی و هونەری بۆ ناوی ئەو دەســگامۆزیکیە خۆرەلاتیانەی کە ئێمە لەگەڵ میللەتانی دراوسـێدا هاوبەشین کە هەر میللەتەیش لە دیدەی خۆیەوەڕا لێکیانیداوەتەوە.

بەداخەوە ئێمەی کورد لەم چەند سالانەی دواییەدا کەوتینەوە خۆمان ئەگەرچی لەملاو لەولا هەوڵی چکەچکەی چەند مۆزیکزانێکی دڵسـۆز دەدرێت بۆ ڕاستکردنەوە و شـیکردنەوەی هونەریانەی زۆر لەو دەسـگایانە و هێنانەوەی بۆ باوەشی زێدی ڕەسـەنی.

خوێنەری هێژا....ئەمەی کە بەندە بۆ ڕۆشـنبیری کوردی بە بەرهەمی هێناوە مشـتێکە لەو خەرمانەی کە هەردەم شـەنوکەوی تێدادەکرێت و هەرگیزیش تەواوبوونی بۆ نیە. کانیاوێکی ســازگاری ئاوێســەر ئاسایە کە چەندە لێی بنۆشـرێت تینوێتی ناشـکێنێت.

هیوادارم بەم کۆمەڵە زاراوەیە کە خۆی دەدات لە نزیکەی سیانزەهەزار وشــە و سـەدوچوار ئامێری مۆزیک{ئەوانەی کە زۆر باون}...توانیـبێتم گچکەخزمەتێکی زۆر ڕاشـکاوم بە زوانە شـیرینەکەی کوردستان و هونەرە مۆزیکە ڕەسـەنەکەیم کردبێت. ئێوەی بەڕێزیش بە سـینەیەکی فراوان و گیانێکی کوردەواریانەوە پەسـەندی بکەن و لەو کەموکوڕیانەیش ببوورن کە تیایدا بەرچاودەکەوێت. بەئومێدی ئەوەی کەسانی دڵســۆز هەنگاوی دروسـتــر و بنیادتر بنێن بۆ بەرهەمی بەپێزتر!!!!. بۆ بزاواندن و دەوڵەمەندکردنی زوان و هونەر و ڕۆشنبیری کوردی/مان بەشـێوە و سـیمایەکی شیاوتر و پەسـەندتر.

ئەســعەد قەرەداخـــی

ســوید

2708ک/2008ز

------------------------------------

----------------------

------------

# پێشەکی

گەلی زیندوو...ئەو گەلەیە کە خاوەنی گەوهەر گەنجینەیەکی پڕ لە کەلەپوور بێت و نەخشین و ڕازاوەبێت بە مێژوویەکی دێرین لە سترانومۆزیک، پەندی پێشینان و چەندین چەندین فۆلکلۆریتر.

کورد...کە خاوەنی ئەم گەنجینەیە، لەو نەتەوە هەرەدێرینانەی ئەم ناوچەی خاوەرمیانەیە و کوردستانیش بۆتە زێد و نیشتمان بۆی کە تاکو ئێستا لە سایە و پەنایدا بە زوانێکی پاراوڕەسەنی فرەلاوژە{فرەلەهجە}و ڕازاوە بە بەهاترین دابونەرێتی کوردستانێتی توانیویەتی ناسنامەی خۆی بپارێزێت. یەکێک لەو بنەما بژێو و ڕۆشنە هەرەسەرەکییانەی کە سیما و ناسنامەی کوردستانێتی و ژیانی کوردەواریمان هەڵگرتووە...ئەو هونەرە پاکوبێگەرد و پاراوەیە کە پێیدەوترێت هونەری کوردی، یاخود بڵێین هونەری ستران و مۆزیکی میللی و فۆڵکلۆری کوردستانی.

بەم هونەرە یەزدییە جوان و ساکارهەندازیە...کورد بۆ سەتان و هەزارانساڵ و تا ئێستایش توانیویەتی دەشتودەر و کەژوکێو و دۆڵونشێو بزرنگێنێتەوە، ئاوێزەی بۆنوبەرامەی مێرگوزار و تارای سپی و بەورشەی سەر ترۆپکی کەژ و چیا و هاژەی بەخوڕە بەفراوی چەم و ڕوبارەکان بێت.

تایبەتمەندییەکی وەهای لێوەڕا هەڵێنجێنێت کە ڕەسەنایەتی و مورگی کوردەواریی لە هەنکەڕێ{حونجەرە}ی هەموو کوردێکی دەنگخۆش و دەستڕەگیندا ڕەنگبداتەوە.

ئەوەی جێی دڵخۆشییە....ئەم چەشنە تایبەتمەندیەیە کە بە ئاشکرا و بە باشی پەیپێدەبرێت و بە ڕوونی لە میللەتانی دەرودراوسێ جیادەکرێتەوە. ئەو هەنکەسروشت و مورگە تایبەتمەندییەیە کە لەم هونەرەیدا هەیە و لە میللەتەکانیتردا تاڕادەیەک بەدیناکرێت.

بۆ ڕاستی ئەم بەڵگەیەیش...ئەو دەنگە جۆرانجۆرەیە کە چ بە سترانی تەنیا و چ بە هاویاری ئامێرەمۆزیکییەکان لە چەندین ئاهەنگوبۆنەی شینوشایی و سوران و زەماوەند و سەماوەند و چەمەری و لاوانەوە و گەلێک بواریتردا دێنەبەرچاو.

گەر بکەوینە ئاخاوتن لەمەڕ ئەم هونەرە زیندەبەهایە، دەبێت پەنابەرینە بەر مێژووی هەرە دێرینی ژیانی کوردەواری و هۆگری ئەو ژیانە بە سرۆتە بەزموڕەزمی ئەو ئایین و ئایینزا هەرەدێرینانیەی وەک زاردەشتیی و یارسانیی و ئێزیدی و مانیی و ئەلەڤی{عەلەوی}کە لە هەڤوت(ئامۆژگاری)و سرۆت و بۆنەکانیاندا ڕەنگیانداوەتەوە.

سەرەتای سەرهەڵدانی ئایینی زاردەشتیی و بڵاوبوونەوەی کیاستەکانی....دەشێت دابنرێت بە سەرەتای وەگەڕخستنی دەنگی بەساز و ڕەزمی بەزمیو(بە بەزم)بە چەشنو ڕەنگێکی وەها پیرۆز و سپەنتا{موقەددەس}و بەهادار کە شیاوی دەرباری ئاهۆرامزدا بێت. پێدەچێت کە هەر ئەم ڕەوشە ئایینیە بوویێتە سرۆیەکی هونەری بۆ کەسانی بەهرەمەند کە ئەوەندەیتر بایەخ بەو لایەنە هونەرییە بدەن بیکەنە هەوێنی کارنامەکانیان.

بێگومان ئەم ستران و مۆزیکانەی کە بە دەماودەم بۆمان ماوەنەتەوە، هەر لەو ڕۆژگارەوەڕا بەشێوەیەکی ژیرانە بنجی لەسەر بناخەئاوازێک داکوتاوە، ئەو ئاوازانەیش کە لەدواییدا زاراوەی دەسگا/ی بەسەردا بڕا توانرا بۆ چەند دانەیەکی بپۆلێنرێن وەک:- دەسگای ڕاست، بەیات، سێگا، چوارگا، نەوا، ناوەند(نەهاوەند)، سەبا، ماهوور....هتد. دەبێت ئەوەیشمان لەیادنەچێت کە دەشێت ڕەگەژۆی زۆربەی ئەو دەسگامۆزیکایانە و زاراوەکانیان لە کورستانەوەڕا بەتایبەتییش بەری خۆرەلاتەکەی سەریهەڵدابێت و بە ناوچەکانیتری کوردستاندا بەئاسانی تەشەنەی کردبێت. لەو بلاوبوونەوەیەیشدا وای لێبێت کە هەر تیرە و خێڵێک لە ناوچەکەیدا، هەر ڕەوەند و کۆچڕەو و دەوارنشینێکیش لە گەشتی گەرمیان و زۆزانیدا، بۆنەیەکی تایبەت بۆ خۆی بگێڕێت، بەچێژ و ڕەنگێکی کاریگەری مورگ کوردستانیانە بۆ نەوە دوا نەوە بەجێبهێڵێت.

ئەڵلاوەیسی، ئایئای، زەندبەیات، بەیات، سەفەر، کورد، گاتار(قەتار)، خاوکەر، نیوەشەو، خۆرشیدی، هەوشار، نەورۆز، هۆرامی، هۆرە، لاوک و حەیران، زەمزەمە، فەیلی، بەختیاری و....چەندین ناوی ترن لە دەسگا و دەسگازا و شێووگ*Form*یتر. زۆر جاریش بەدوایدا گرێبەستەی چەندین سترانی ڕەزمین(ڕەزمدار)ی دەکرێ کە پێیدەوترێت بەستە بۆئەوەی ئەوەندەیتر ببێتە دیمەنێکی بەچەش و پڕخرۆش و پەژارەڕەوێن.

مرۆڤی کوردستانی...وەنەبێت بەم چەشن و شێوازە وەستابێتەو، بەڵکو هەر بەدەمیشیەوە بەشێوەیەکی هونەریانە لە داهێنان و دروستکردنی هەندێک مۆزیکئامێری ساکاردا بووە و توانیویشیەتی کە بەشێوەیەکی ڕێسایانە بەکاریانبهێنێت، لەوانەیش شمشاڵ و جووزەلە، نەی و شانەی، بلوێر و تەموورە، ساز، گەورگە، گەواڵ، تەپڵ و دومبوک، شەیپوور، شیشوم، چەنگ، کاسە، زوڕنا، بالابان، سەنتوور، کەمانچە و چەندین ئامێریتر.

کە لەسەر هەر بابەتەهونەرییەکی وەهایش دێینە ئاخاوتن، بۆماندەردەکەێت زۆر لایەنی گرنگی سەرەکی و لاوەکی خۆی پێوە دەئاڵۆزێنێت و بەهیچ جۆرێکیش ناکرێت ئاستن بکرێن. بۆ نموونە هەر لایەنێک لە زانستەکانی چ سروشت و چ ناسروشت وەربگرین و بمانەوێت بزانین تا چ ڕادەیەک ژیانی پساتی گۆڕیوە و بەرەو پێشکەوتن و پاشکەوتنی بردووە...دەبێت لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدینەوە تاکو بزانین و بتوانین بەردەبناخەی گەڕان و لێکۆڵینەوەی لێوەڕا دابنێین. جا مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە دەبێت مرۆڤ بۆ چەلاندن و ڕێکوپێکردنی ڕەباز و لێکۆڵینەوەکەی پەنا بۆ هەموو لایەنێکی ژیان بەرێت بەلام زۆر بە وریایی و ژیرانە، لەوانەیش لایەنی مێژووی، بویار{واقیع}ی جیۆگرافی و دیمۆگرافی و....گەلەک لایەنیتر کە دەبێت بەشێوەیەکی زانستانە و ژیرانە و بوێرانە بەهەرسێنرێن و بکرێنە هەوێنێکی بەپێز بۆ بەرهەمهێنانی نووسینێکی ڕێکوپێک.

ئەوەی جێی داخی گرانە....بەدرێژایی ئەم چەرخ و ڕۆژگارانە بارودۆخێکی وا لەبار جارێک بۆ کورد هەڵنەکەوتوە کە بتوانێت وەک میللەتانیتر ئارشیف و بەڵگەنامەی خۆی وەک پێویست بپارێزێت. دەشێت زۆر هۆیش بووبێت کە بووبێتنە ئاستەنگ و تەگەرە لەڕێی ئەمەدا، لەوانەیش:_

* لە سەروو هەموویانەوە....نەبوونی دەسەلاتێکی ڕامیاری کە توانیبێتی ناسنامەی ئەو دەسەلاتە وەک نەتەوە بکات و بیپارێزێت، زۆری ئەو میرنشینانەی کوردستان کە دەسەلاتداربوون بنەماڵەیی بوون و

ژێرخانێکی ڕۆشنبیریی نەتەوەیی و نیشتمانی ئەوتۆیان نەبووە کە تەواو لە دەسەلاترەوییەکەیاندا ڕەنگبداتەوە و برەوی پێبدرێت و ڕەگەژۆی بەناخی هزری مرۆڤی کوردستانیدا داکوتێت. بەداخەوە تاکو ئێستایش ئێمەی کورد لە هەر گێژاوی نەبوونی ئەو دەسەلاتەداین و بەو لاوازییەوە هەر دەنالێنین.

* نەبوونی یاخود لاوازیی بیر و هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانی لای مرۆڤی کوردستانی و خۆ باربۆکردنەکردن بەو بنەمایانەی کە دەبنە بەهێزکردنی ئەو بیر و هەستە.

* ڕۆڵی ڕاڤەکردنی ئایین بەشێوەیەکی چەوت، بەشێوەیەک کە لە ناوەڕۆکە پیرۆزەکەی لابدات ئەویش بە فتوادانی هەندێک کەسانی نزیک لە دەسەلات بە حەرام و پاوانکردنی هونەر بەگشتی، وای لێبێت کە تەنیا لە چەند بازنەیەکی داخراوی دیاریکراودا پەنگبخواتەوە وەک لە هەندێک ڕێبازگە و ئایینزاکاندا بەدیدەکرێن.

* بوونی کوردستان وەک مەیدان و گۆڕەپانێکی شەڕ و شۆڕی وێرانکەر و تالان بەشێوەیەکی وەها کە تۆزقاڵێک پاشماوە و ئاسەواری وەها نەمێنێتەوە کە سەرلەنوێ بتوانرێت بناخەی ناسنامەی خۆی لەسەر هەڵبچنێتەوە.

ئەمانە و چەندین و چەندین هۆی تر.... بوونە هۆی دواخستنمان لە کاروانی هونەر و زانستدا.

پاش دەیان و سەدان ساڵ ونبوون و بێدەنگی و دووربوون و....لە دواساڵەکانی سەتەی بیستەمەوە هەلێکی زێڕین بۆ کوردستانی باشوور هاتۆتە پێشەوە دوور لە پاوان و سانسۆر و دەسەلاتی داگیرگەر.

لەم هەلە لەبار و زێڕینەدا....ڕووی ڕاشکاوی و تکاکاریم دەکەمە ئەو هونەرمەندانەی کە لەنێو کوردستاندا بە پسپۆڕ و شارەزا و ....ناسراون تاوێک لە کاتی خۆشی و ئاوازدانانی ئاهەنگی لابەلایی تەرخانبکەن بە دانانی بناخەبەردی ناسنامەی نەتەوەییمان ئەویش بە هێنانەوە و بوژاندنەوەی ئەو کەلتوورە هونەریەی کە لە مێژە تاکو ئێستا داگیرکەرانی کوردستان تالانیان کردووە و کردوویانەتە موڵک و سەرچاوەیەکی سەرەکی و بنەمایەکی بەپێز بۆ پەرەپێدانی کارەهونەریەکانیان، سیما و ڕەنگ و مۆرگی هونەری خۆیانی بە بەردابکەن، ئەوەیشی کە ماوەتەوە بۆ ئێمەی کورد هەر پاشەڕۆ و لاساییکردنەوەیە و هیچیتر.

دواوتە نەک کۆتایی...بە ئاخاوتنێکی کەڵەبوێژی ئینگلیزی لۆرد بیرۆن(1788-1824)Lord Byron دەهێنمەوە کە لەگەڵ خۆیدا دەیکات و دەڵێت:ـ

ئاخۆ زانا کێ بێت؟ لەوانەیە کەسێک بێت نەتوانێت قسەبکات!!!

ئەی ئەو کەسە کێ بێت لە ڕوویدا قسەدەکات؟

ئەو کەسە بێت کە هیچ نازانێت!!!!.

باشە....ئەو کەسە، کەی فێری زانین دەبێت؟

لەوانەیە لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودا بێت، یاخود لە دەرفەتێکدا کە هەر ئارەزوو بەهاتنی نەکات!!!!!

------------------------------------

----------------------

-----------

# A



ئایۆلیەن هارپ
Aeolian harp



ئۆتۆهارپ
Autoharp



Accordion ئاکۆردیۆن


شەشەم نوتە (ژێرزاڵ)ی سکێل مێجەری دۆ/Cیە.
یەکەم نوتەیە لە سکێلی خزمە ماینەرەکەیدا Relative minor
کە دەبێتە هاوتەریبی سکێلی دۆ مێجەر.
La(F,I), A(E,G)
A2 A1 A a a1 a2 a3 a4
Hz: 27.50 55.00 110.00 220.00 440.00 880.00 1760.00 3520.00
Middle C


Le(I), As(G), A-flat(E)
Hz: 25.96 51.91 103.86 207.652 415.31 830.61 1661.22 3322.44
Middle C


Li(I), Ais(G), A-sharp(E)
Hz: 29.135 58.270 116.54 233.08 466.16 932.32 1864.65 3729.31
Middle C

# A



A-tone(E,G), La(I,F) **ئا.....، یاخود تۆنی/لا.... شـەشـەمین پلەدەنگە لە پایەتۆن*Tonic*ی دۆ/Cوە کە پێیدەوترێت تۆنی ژێرزاڵ*Subdominant*. یەکەم نۆتەی ســکێڵی خزمە ماینەرەکەیەتی کە دەبێتە هاوتەریبی دۆ ـ مێجەر.**

**لە ســاڵی1939زدا کۆنفرانسی جیهانی لە لەندەن گەیشــتە ئەو بڕیارەی کە ئیتر لەمەودوا ســتاندەر فریکوێنسـی*Standard frequency* بۆ پەردە*Pitch*ی لا/*A* لە دەنگەواری چوارەم/A4دا یەکسـان بێت بە440Hz، جاران لە ســەردەمی مۆزیکزانانی وەک هایدن*Hayden*، مۆزات، باخ و بێتهۆڤن یەکسـان بوو بە422,5Hz بۆ هەمان پەردە.**

A **لا...بە پیتی گەورەی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی لا ـ مێجەر ســیانیی*A-major triad*.**

a **لا...بە پیتی بچووکی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی لا ـ ماینەر ســیانیی*A-minor triad*.**

A double flat(E), La double-bémol(F) **دەبڵ بیمۆڵ لە سـکێڵی دۆ ـ مێجەر/*C-major*.**



A duoble-sharp(E), Aisis(G) **لاـ دەبڵ دێز لە سـکێڵی دو ـ مێجەر.**



A-flat(E), As(G), La-bemolle(I), La-bémol(F) **لا ـ بیمۆڵ.**



A-flat major(E), As-dur(G) **لا بیمۆڵ ـ مێجەر.**



A-flat major scale(E), As-dur Tonleiter(G) **سـکێڵی لا بیمۆڵ ـ مێجەر.**



A-flat minor(E), As-moll(G) **لا بیمۆڵ ـ ماینەر.**



A-major(E), A-dur(G), La-majeure(F), La-maggiore(I) لا-مێجەر.

A-major scale(E) سـکێڵی لاـ مێجەر.



A-minor(E), A-moll(G), La-mineur(F), La-minore(I) کلیلەکانی لا ـ ماینەر.



A-sharp(E), Ais(G), La-dièse(F), La-diesis(I) لا ـ دیێز.



A-sharp minor(E), Ais-moll(G) لا دیێز ـ ماینەر.



A-sharp major scale(E) سـکێڵی لا دیێز ـ مێجەر.



Ab(G), Off, Mute off(E) کپکردن، وەلاخستن.

A-Ballata(I), In the style of a ballad(E) لە چەشنی بالاد.

A ballad(I) سـترانێک لە چەشنی بالاد*Ballad*کە سـترانێکی ساکاری سـروشتیە لە داناندا.

Abandonnê(F) بە ئازادییەکی بێســنوور.

A-Battuta(I), Strictly in time(E) ڕەزمگرتن بەوردی.

Abbandonandosi(I), Freedom(E) ڕەهابوون.

Abandonné(F), Abandono(I), Free and easy(E) ئاسـان و ئازاد.

بۆ نموونە دەوترێت ژەنینێکی ئاسان و ئازاد*(Avec abbandon(F),Con abbandono(I)*.

Abbandonare(I), With the beat(E) لەگەڵ لێداندا{مەبەست لە کێش(ڕەزم)وەرگرتندا}.

Abbandonatamente(I), Violently(E) بە توندی.

Abbassamento Di mano(I) ئاماژەپێدانی نزمبوونەوە بە جووڵەی دەست.

Abbassamento di voce(I), Lowering of the voice(E) نزمکردنەوەی دەنگ.

Abbellimento, Abbelitura(I), Embellishment, Ornament, Decoration(E), Décoration(F) ئۆڕنامێنت، نەخشاندن.






Abbellire(I), To ornament(E) نەخشـدەکرێت، دەنەخشـێت.

Abdämpfen(G), to dampen, to mute(E), Muet(F) کپـبکرێت، میووتـبکرێت.

Abbreviations(E), Abbreviazioni(I) کورتکراوەکان، بە کورتەی/*.Abb*ئاماژەی پێدەدرێت.

A bene placito(I), At pleasure(E) بەخۆشـیـیەوە، بۆ گۆڕینی تێمپۆ، زێدەکردنی ئۆڕنامێنت یاخود گۆڕینی ئامێراندن*Instrumentation*بەو شێوەیەی ژەنیار پێیـخۆشـبێت.

A bene placito(I) ژەنینی پارچە مۆزیکێک بە ئازادی.

Aber(G), But(E), Mais(F) بەڵام.

Abgemessen(G), Measured(E), Mesuré(F), Misura(I) پێوراو، کێش{ڕەزم}گیراو.

Abgestoßen, Abstoßen, Absetzen (G), To play staccato(E) ژەنین بە سـتاکاتۆ.

پنتەپنت، پچڕپچڕ.



Ab initio(L), From the beginning(E) لە ســەرەتاوە.

Abnehmend(G), Diminuendo(I), To soften gradually(E) بەرەو نەرمی.

Abschluss(G), Closing, End(E), Fermant, Fin(F) بەسـتن، کۆتایی.

Absolute music, Abstract music(E) مۆزیکی ڕەها، مۆزیکی ئامێراڵ*Instrumental*ێکی ڕها و ئازاد لە بەرنامە*Program* و سەرچاوەگۆ*Verbal reference*یەکی ڕوون و ڕەوان. بابەتەمۆزیکێکی بیسـتراو کە لەدوای نۆتەکانەوە نەبێت، واتە تەنیا دەنگە*Sound* و بەس، وەک بابەتە مۆزیکـی باخ فیوگە*Bach fugue*.

Absolute pitch(E), Absolutes gehör(G) پەردەی ڕەها، شوێنی نۆتە لە سـکێڵێکی مۆزیکاییدا کە بەپێی ژمارەی لەرینەوەکان لە چرکەیەکدا*Vibration/sec*دیاریدەکرێت، ئاماژەپێدانی پانتاییە بۆ ناسـینەوەی هەر تۆنێکی بیسـتراو چ بە ژەنین و چ بە چڕین.

Abstract(E) پاراوی مەتنی نووسراێک وەک نووسینی تێزێک*Thesis*یاخود تۆژینەوەیەک.

Abstrich(G), Down bow(E) کەوان بەرەو خوار.

Absatz(G) هەڵوێســتە.

Abstand(G), Distance(E,F), Ablazione(I) میانەدەنگ.

Abwechselnd(G), Respectively(E), Rispettivamente(I) بەنۆبە، یەکبەدوایەک.

Academy(E) ئاکادیمیا، خوێنگای باڵا بۆ فێربوون، ڕیشـەی وشــەکە لە ئاکادیمیَ*Academe*ی یۆنانییەوە هاتووە، سـەردەمانی فەیلەســوفی یۆنانی ئیفلاتون*Plato*ە کە لە باخی ئاکادیمیا*Garden of* Academeدا وانەی بە شـاگردەکانی دەوتەوە.

Academy Music(E), Académie d'Musique(F) ئاکادیمیای مۆزیک.

A-cappella(I), In the chapel style(E) کۆڕاڵ بەبێ ئامێری مۆزیک{لە کڵێسەدا باوە}.

A-capriccio(I), In the capriccious style(E) ژەنینی پارچە مۆزیکێک بە ئارەزووی ژەنیار.

Acathistus(Gr) ڕێونیشانی پیرۆزاندنی پاکیزە مەریەم بە شـێوازی کڵێسەی بیزەنتی.

Accalorandosi(I), Agitated(E), Agitâmes(F) هەستـ وروژاو.

Accarezzevole(I), Caressingly(E) بەشێوازێکی دڵنەوایانە.

***Accel.*** کورتکراوەی/*Accelerando*:

Accelerando(I), Acceleration(E) پەلەیی.

Accelerato(I), Accelerated(E) بەپەلە.

Accent(E,F), Accento(I) ئاکسنت، هەنک*Henık*، دەنگێکی جەخت لەسەرکراو.

Accent marks(E) نیشانەکانی ئاکسنت کە بەرەبەرە بەرەو توندتر دەڕوات وەک لەم نموونەیەدا:ـ



Accentato(I), Accent the notes(E) ئاکسنتی نۆتەکان.

Accented passing note(E) نۆتەپاساوی ئاکسنتکراو، دەشێت بە ئاپۆجیاتۆرا*Appoggiatura* یەک یاخود ناسازەدەنگ*Dissonance*ێک دابنرێت کە لە لێدانێکی لاوازدا هەبێت.

Accentuare(I), Accessory note(E), Accentuer(F), Accentuieren(G) ئاکسنتاندن، پاگیریی و جەختاندن لەسەر تۆنێک، بۆ نموونە نۆتەی سەرەوە لە تریللە*Trill*یەکدا یاخود لە سەروو و خوارووی نۆتەکان لە گەڕانەوە*Turn*یەکدا. نۆتەی یاوەر کە زیاتر بۆ ڕازانەوە بەکاردەهێنرێت.

Accentuato(I) پاگیرکردن و جەختاندن.

Accentuazione(I) پاگیربوون، جەختبوون.

Acchetandosi(I) سرەوتن، ئارامگرتن.

Acciaccato(I), Spread chord(E) دەنگەکانی کۆردێک کە هەر دەنگە و لە دەنگەکەیتر جیاوازبێت.




Acciaccatura(I), Crushed note, Grace note(E) نۆتیلە(گچکە نۆتە) کە تێمپۆی بۆ ناگیرێت. هەندێک جاریش پێیدەوترێت کورتە ئاپیۆجیاتۆرا*Short appoggiatura*.



Accidental(E),Accidento(I), Verzeichen,Versetzungszeichen(G) هێمای تۆن گۆڕین، گێڕی لاوەکی کە تۆن بۆ بەرزی و نزمی دەگۆڕێت، هەر یەکەو لەم گۆڕانەیش شوێنی خۆی هەیە لە دێڕە مۆزیکیەکاندا، بۆ نموونە:ـ هیمای تیژ*Sharp*، پانۆک*Flat*و سروشت*Natural*..... هتد.

نموونەی(1)



نموونەی(2)

| notation | English | French | German | Italian | Kurdi |
|---|---|---|---|---|---|
| 𝄪 | double sharp | double dièse | Doppelkreuz | doppio diesis | دەبڵ دێز |
| ♯ | sharp | dièse | Kreuz | diesis | دێز |
| ♮ | natural, natural sign | bécarre, naturel | Auflösungszeichen, Quadrat | bequadro | سروشتەهێما |
| ♭ | flat | bémol | B, Be | bemolle | دەبڵ |
| 𝄫 | double flat | double bémol | Doppel-B, Doppel-Be | doppio bemolle | دەبڵ بیمۆل |

Accidental Chord(E) **لاوەکۆرد، کۆردێک کە دانەیەک یاخود پتر لە نۆتەیەکی تیادا نامۆبێت بۆ هارمۆنییە ڕاستیەکەی***Proper harmony*.

Acclamation(E,F) **هەلهەلە لێدان، هاواری پیرۆزکردن و خۆشی دەربڕین بۆ پێشوازیکردن لە ئیمپراتۆر ئەویش بە هاویاری مۆزیک. ئەم شێوازە لە سەدەکانی 9/م و 10مدا زۆر ڕەواجی هەبوو.**

Accolada(I), Accolade(F), Brace(E) **ئاکۆلادۆ، بەستنی دوو هێڵاسۆ***Staff* **یاخود زیاتر.**

Accolatura(I), System(E) **سیستەم، پێڕەو، ڕژێم.**

Accomodare(I), To mend(E) **هاوئاوازبوون.**

Accompagnamento(I), Accompagne(F), Begleitet(G) **هاویاری، هاوژەنین، ژەنینی پارچەمۆزیکێک لەلایەن تاکە ژەنیارێکەوە و ئامێرێکی تریش یان ئۆرکێسترا هاویاری بکات.**

Accompagnano il canto(I), Accompanyinhg the song(E) **هاویاری ستران.**

Accompagnateur(F), Accompanist(E) **هاویار، هاوژەن، هاوچڕ.**

Accompagnato(I), Accompanying(E) **هاویاری، هاوژەنی.**

Accompany(E) **جێبەجێکردن لەگەڵ یەکێکیتر بەلام بە ڕۆڵێکی لاوەکی***Subordinate*.

Accompanied fugue(E) **فیوگەی هاویار، شێویەکی فیوگەیە کە تێیدا کۆرس هاودەنگی ئامێرەکان دەبێت.**

Accoppiamento,Accoppiato(I), Coupled, Jioned together(E) **جووتبوو، بەند، بەیەکەوە بەستن، وابەستەی نێوان دوو نۆتە بەشێوەی کەوان.**

Accoramento(I), Distress(E) **خەم و خەفەت.**

Accorato(I) **خەمناک.**

Accord(F), Akkord(G), Chord, Tuning, Ackord(E) Accordo(I) **ئاکۆرد، کۆرد، ئاوێز، کۆردی سێ تۆن یاخود زیاتر لە یەک کاتدا.**



Accordance, Conformité(F) **کۆردانس، پلەی نزیکی گونجاندن***Concordance* **و ناسازبوون***Discordance***ی میانەیەک.**

Accordando(I) **ئاکۆرداندۆ، بریتیە لە زنجیرە نۆتەیەک لە ئۆپێرای شۆخی***Comic opera***دا کە بە ئامێرە ژێدارەکان لە ئۆرکێسترایەکدا لێبدرێت، بۆ نموونە بە ئامێری کەمانچە کە نۆتەکانی لە** *g, d´, a´, e´´* **دا دەژەنرێت....**

Accordare(I), To be in tune(E) **لە تۆنی ئاوازدا بێت.**

Accordamento(I), Consonance(E), Cosonanza(I) **دەنگی هاوکۆک و بەسـاز.**

Accordare(I), Accorder(F), Stimmen(G) **هاوکۆکبوون، هاوسـازبوون.**

Accordatura(I) **کۆککردنی ژێیەکان بە گوێرەی ئەو نۆتاندنەی دەخوازرێت.**

Accordion(E), Accordéon(F), Ziehharmonika(G) **ئاکۆردیۆن، مۆزیکـئامێرێکی شـێوە سـنووقییە، نزیکەی سـاڵی1821ز لەلایەن ئامێرسـازی ئەڵمانی کریسـتیان لودڤیک بوخمان***C.L.Buschmann* **لە شـاری بەرلین کە لە پێشـدا ناوی کۆنزێرتینا***Konzertina***یاخود تۆنەنەرمی دەسـتی***Hand-Aeoline***بوو بەڵام پاشان ناوی بە شـیبەر***Schieber* **گۆڕدرا تا دواینجار بەناوی ئاکۆردیۆن گیرسـایەوە. لە نزیک سـاڵی1865ز تۆنەکانی لەسـەر پیانۆ کۆککرا.**

Accordionist(E), Accordéoniste(F) **ئاکۆردیۆنـژەن.**

Accordoir(F), Tuning fork(E) **ئاکۆردۆیر، بڕوانە/***Tuning hammer*.

Accord pefect(E), Accord parfait(F) **ئاکۆردی دروسـت.**

**بۆ نموونە سـێ نۆتەی دۆ/**Do **ـ می/**Me **ـ سـۆڵ/**Sol **لە ئاکۆردی دۆ/**C **مێجەر دا.**

Accresendo(I), Increasing(E) **دەنگ بەرەو بەرزکردنەوە.**

Acerbamente(I) **بە توند و زبری.**

Achromatic(E) **پێوانگ{سـکێڵ***Scale***}ی بێ نیوەتۆن، دیاتۆنیک.**

Acht(G), Eight(E) **هەشـت.**

Achtel(G), Quaver(E) **چنگەتۆن، هەشـتیەک تۆن**1/8.

Acoustics(F), Acustico(I), Sonorité(F) **دەنگزانیی. زانسـتی پەیـبردن بە دەنگ کە لقێکە لە زانسـتی فیزیک. ڕیشـەی وشـەکە یۆنانیـیە و بەمانای پەیـبردن بە دەنگ دێت.**

Acquietandosi(I) **سـرەوتن، ئارامگرتن.**

Act(E), Agir (F), Agire(I) **کردە، کردارێک کە لە دیمەنێکی نواندندا بە ئەنجامبدرێت. فراوانترین بەشـە لە نواندن و ئۆپێرایەکدا کە دەشـێت دابەشـبکرێت بە چەند دیمەن***Scene***ێکەوە.**

Acte de cadence(F) **دوو کۆرد کادەنسـێک پێکبهێنێت.**

Action(E), Traktur(G) **کردار، جووڵە، کارجێبەجێکردن، پەیوەسـتەیەکی مێکانیکی لە نێوان کلیلەکان***Clef***ی ئامێری پیانۆ یاخود لوولە دەنگیەکانی ئامێری ئۆرگن***Orgen***دا.**

Active song(E) **سـترانی کاریگەر، سـترانخوان لەکاتی چڕینی سـترانێک ئەندامانی لەشی وەک سەر و باڵیان دەجووڵێنن بۆ گوزارەکردن لە مانای وشـەکانی سـترانەکە.**

Acute, Acuto(I), High, Sharp(E) **باڵا، تیژ، دەنگی تیژ.**

Acuta(I), Acute(E), Poivré(F) **زیل، دەنگی تیژ.**

Ad(I), At(E), Chez(F) **لەلا، لەپاڵ، لەتەک.**

Adagietto(I), Short adagio(E) **بچەک پەلەتر لە ئاداجیۆ.**

Adagio(I), Slow(E) **ئاداجیۆ، خاو، سەنگین و ئارام.***$Ad^o$* **کورتکراوەیەتی.**

Adagio adagio(I), Very slow(E) زۆر خاو.

Adagio assai, Adagio di molto(I), Very slow(E) زۆر خاو.

Adagio non molto, Adagio non tanto(I), Not very slow(E) نە زۆر خاو.

Adagissimo(I), Much slower than adagio(E) زۆر خاوتر لە ئاداجیۆ.

Adaptation(E), Musical arrangement(E) مۆزیک ڕێخستن.

Add-2 chords(E) دوو کۆردی زێدە، خستنی دووەم بۆ سـەر سـیانیی مێجەر یاخود ماینەر یاخود کۆردی بەهێز*Power chord*.

Added seventh(E) حەوتەم سەرخراو، ماینەر یاخود مێجەر دەخرێتەسـەر مێجەر سـیانیی *Major triad*. بۆ نموونە:ـ لە مۆزیکی جازدا ماینەری حەوتەم کە یەکێکە لە نۆتەکانی بلووز *Blues notes*یاخود مێجەری حەوتەم بە ترۆمۆلۆ*Tremolo* لەسـەر مێجەری پایەتۆنی سیانیی *Major tonic triad* لەلایەن پیانۆژەنی جاز بژەنرێت.

Added sixth(E) شـەشـەمی سـەرخراو، خسـتنەسـەری نۆتەی شـەشـەم. مێجەری پایەتۆنی سـیانیی*Major tonic triad*.

Additional keys(E) کلیلە زێدەکان، ئەو کلیلانەیە کە نۆتەکانیان لە تۆنی فا/F´´´ بەرزترن{لە ئامێری پیانۆدا}. بە هەمان سیسـتەم ئامێرە هەواییەکانیش دەگرێتەوە بەتایبەتی دەسـتەی فلووت*Flutes*.

Additive meter(E) کێشـی تێهەڵکێشـە تاکەکان، تێهەڵکێشـە خراوەسـەرەکان وەک5/4، 7/4، 11/4... .بڕوانە/*Time signature*.

Addolcendo(I), Becoming sweet or soft(E) بەرەو نەرمی یاخود شـیرینی.

Addolorato(I), Sorrowful(E) خەمگین.

A demi jeu(F), Half pitch(E) نیوپلە دەنگ، نیوپەردە.

À demi-jeu(F), Half power of instrument(E) نیوەتین تۆنی ئامێر.

À demi-voix(F), Mezza voce(I), Half power of voice(E) نیوەتینی دەنگ.

A deux(F), A due(I), For two(E) بۆ دوو.

A deux cordes(F), A due corde(I), Auf zwei saiten(G) جووتـژێ، دەبڵ کۆرد.

A deux mains(F), With two hands(E) بە دوو دەسـت.

À deux cordes(F), A due corde(I), playing on two strings(E) ژەنین لەسـەر دوو ژێ.

À deux mains(F), For two hands(E) بۆ دوو دەست.

À deux quatre(F), In 2/4time(E) لەسـەر کێشـی2/4.

À deux temps(F). In 2/2 time(E) لەسـەر کێشـی2/2.

Adirato(I), Wrathful, Irritated(E) تووڕە و بـێزار.

Adjunct, Closely related, As, Scales or keys to one another(E) پەیوەندیەکی نزیک لەنێوان سـکێڵەکان و کلیلەکان بۆ یەکتر.

Adorando(I) بەســتایشەوە، شــیاوی ســتایش و پیاهەڵدان بێت.

Adorazione(I), Adoration(E,F) پەرســتن.

Aengstilch(G) ترســاو، بەترســەوە.

Aeolian(E) ئایۆلیەن، وشــەیەکی زۆر کۆنی بە یۆنانیکراوە کە لە ڕیشەوشەی ئایۆلیا/ئاسـیاییەوە هاتووە و بەمانای خواوەندی با*Wind* هاتووە.

Aeolian Harp(E) چەنگی ئایۆلیەن جۆرە ئامێرێکی ژێداری زۆر دێرینی یۆنانیـیە کە دەدرێتە بەر هەوا دەنگی لێوە دەردەچێت

Aeolian mode(E) دەسگای ئایۆلیەن، یەکێکە لە دەسگا زۆر دێرینی یۆنانیەکان، لوولەی ئۆرگن.



T-S-T-T-S-T-T

T=تۆنی تەواو ، T=نیوەتۆن

Aerophone(Gr) ئێیرۆفۆن، مەبەسـت لەو ئامێرە هەواییانەیە کە لە تەختە و چەوێڵ دروسـتدەکرێن، وەک ئامێری کلارنێت، ئۆبوا....مانەندیان.

Affabile(I), Affabile manner(E) بە ڕەوتارێکی نەرم.

Affabilissant(I) بڕوانە/*Diminuendo*.

Affabilmente(I), Sweetly(E) بە شـیرینی.

Affannato(I), In a distressful, Anxious manner(E) شــپرزە، پەرێشــان.

Affannosamente(I), Distressingly(E) بە شــپرزەیی.

Affection(E), Affetto(I) بارێکی هەســتدەربڕینی وەک سـەرسامی، ترس، خۆشـی و تووڕە.

Affettato(I) بە ڕەوشــێکی وەها کە کاریگەرییەکی گیانی ببەخشــێت.

Affettivo(I) خەم و پەژارەهێن.

Affettuosamente(I), Affectionately(E) نەرم و ســۆزناک.

Affettuosita(I) نەرمی و ئەڤینی.

Affettuoso(I), With feeling(E) بەهەســت و گوزارەیەکی ســەرنجڕاکێــش.

Afflitto(I), Afflicted, Sad(E) خەمناک.

Afflizione(I), Affliction(E) خەمگین.

Affinity(E), Affinité(F) پەیوەســتی و نزیکاندن و بەسـتەیی نێوان نۆتەکان و کلیلەکان.

Afflitto(I), Afflict(E) بەخەم و پەژارەوە.

Afflizione(I) خەم و پەژارە.

Affrettando(I), In a quickening tempo(E) بەهەڵپە، هەڵەداوان. *affrett°*کورتکراوەیەتی.

Affrettando a poco a poco(I) پەلەکردنی پەیتاپەیتا{کەمکەم}.

Affretando molto(I) زۆر بە پەلە.

Affrettando poco(I) پەلە کەمکردنەوە.

Affretando un poco(I) به پەلەیەکی کەمتر.

Affrettato, Affrettoso, Affrettuoso(I), Hurried(E) بەفرتە.

Afior di labbra(I) ستـرانخوانی یاخود قسەکردن بە سـووکی و نەرمی.

After-note, Unaccented approggiatura(E) ئاپرۆجیاتۆرای نائاکسـنت.

Age vole(I), Lightly and easily(E) بە سـووکی و ئاسـانی.

Aggiustatamente(I), Unlaboured(E) بێـئەرک و ماندوویی.

Agevolezza(I), Aise(F), Ease(E) ئاسـان.

Aggradevole(I), Agreeable(E) پەسەند، هاوسـاز.

Aggraver la fugue(F) زێدەکردنی بابەتێک *Subject* لە فیوگە *Fugue*دا.

Aggregation(E), Agrégation(F) گردکردنەوە، گەڵاڵەکردن.

Giatamente(I), Free or comfortable tempo(E) تێمپۆیەکی ئازاد یاخود خۆش.

Agilmente(I) بە شێوەیەکی بژێو.

Agitamento(I), Agitation(E) هەڵچوون.

Agitatissimo(I), Very restless, Very agitated(E) زۆر بێوچان، زوو هەڵچوو، وورووژاو.

Agitato(I), Restless, Agitated, Exited(E), Agité(F), Agitirt(G) بزێو، هەڵچوو، وورووژاو.

***Agit**°* or ***Ag**°* کورتکراوەی/*Agitato*.

Agitazione(I), Agitation(E) شـــپرزەیی و هەڵچوویی.

AGnus Dei(L) دوابەشی کۆنوێژ(نوێژی بەکۆمەڵ)*mass*ی کڵێسەی ڕۆمان کاتۆلیک کە بریتین لە شـەش بەشـــە سـروود ئەویش ئەمانەن:ـ

*Kyrie* , *Gloria* , *Credo* , *Sanctus* , *Bendictus* , *Agnus Dei*

Agogik(G) ئاگۆکیک، چەشـنەڕەزمێکی سـووکە وەک شێوازێک بۆ دەربڕینی گوزارەیەکی دروسـت، ئاکسنت*Accent*ێکی ئاگۆکیک لەژێر کاریگەری نۆتەیەکدا.

Agrand Choeur(F) گەورە کۆڕاڵ، کۆڕاڵێکی زۆر گەورە و دروست کە هەموو دەنگەوارەکانی تێدا بێت.

Agrèments(F) گچکە نۆتە، پێشکۆتا.

Agreste(F), Rural(E) ســادە و سـروشتی وەک کەسێکی گوندەکی.

Aehnlich(G), Similar, Like(E) وەکو، لێکچوون، مانەند.

Aeolian harp, Wind harp(E) چەنگی بایی{هەوایی}، هارپی ئایۆلیەن.

ڕیشەی وشەکە لە ئایلۆس*Aeolus*ی یۆنانییەوە هاتووە کە بەمانای خواوەندی با*God of wind*دێت. مۆزیکـئامێرێکی سـەردەمی ڕۆمانەکانە کە بە هەڵکردنی با دەنگی لێوە دەردەچێت.

A igu(F), Acuta(I), High pitched, Treble(E) ئاوج، پەردەی بەرز، تیژ.

Air, Ayre(E) هەوا{مەبەست دەنگێکی بە ئاواز}، نەوا*Tune*، سترانێکی تۆن تەواو*Tuneful song*، سـترانێک کە ئامێری عوود یاخود ڤیۆلا گامبا *Viola de gamba*هاودەنگی بێت.

Air á boire(F) ئاوازێکی مەست ئامێزە، وا پیشاندەدرێت کە دەستەیەکی مەیخۆران ئەو ئاوازە میلۆدییە بوێژن.

Air Variè(F) بابەتە میلۆدییەک بە چەند شێوەیەکی گۆڕاو*Variation*.

Akhshem, Axşem(Kr), Music(E) ئاخشەم، مۆزیک، مۆسیقا.

یاران یاوەران ئەخشام ئاوازەن نا نا ئاهەنگی تەنبوور و سازەن

میر سادقی دینەوری{1218ـ1283هـ}

Al(I), at the, to the, in the(E) تاکو، لە، تائێرە.

Ala Aux(F) بە شێوازی، بەڕەوشی.

Ala corde(F), Playing legato(E) لێگاتۆ ژەنین لەگەڵ مانەوەی کەوان لەسەر ژێ/یەکە.

Ala mesure(F), In time, A tempo(E) بە پێوانە{مازۆر}.

Ala pointe d'archet(F), A punta d'arco(I), At the tip of the bow(E) بە سەری کەوان.

Alberti Bass(E) ئالبێرت باس، شێوەیەکی هاویارییە بۆ میلۆدییەک کە لە کۆردی نارێک{شکاو}*Broken chords*پێکهاتووە، واتە چارەسەرکردنێکی ئارپیجیو*Arpeggio*ی زنجیرە کۆردێک. سادەترین جۆری جووڵەی هاوپارییە*Moving accompaniment* کە بکرێت. ناوەکەیش لە مۆزیکدانەری ئیتالیایی دۆمێنیکۆ ئالبێرتی(1710-1740)*Domenico Alberti*یەوە هاتووە کە داهێنەریتی. ئەم شێوازە زیاتر



لە کیبۆرد مۆزیک*Keyboard*دا بەدیدەکرێت کە بەدەستی ڕاست میلۆدیەکە دەژنرێت و بەدەستی چەپیش هارمۆنیەکە یاخود مانەندی.

Alborada(S), Morning song(E) سترانی بەرەبەیانی ترۆبادۆران کە هەندێک جار بە هاویاری مەشکەنای*Bagpipe*و تەپڵێکی بچووک دەبێژرێت.

Albumblatt(G), Album Leaf(E) پەڕە ئەلبووم، دووبارەکردنەوەی پارچەمۆزیکێک. بە مەبەستی بەرەو ڕازانەوە بێئەوەی بایەخ بدرێت بە جۆری ئامێرەپێکهاتووەکان.

Alcuna, Alcuno(I), Some, A few(E) هەندێک، بچەک.

Al fine(I), To the end(E) تاکۆتایی.

Algerian scale, Barbarian scale(E) سکێڵی جزایری{بەربەری}



{مەبەست لە مۆزیکی میللەتی بەربەر/ی باکووری ئافریکایە}.

Aliquot tone(E), Several tone(E) ڕێکخستنەوەیەک کە بەهۆیەوە تۆنەلاوازی سەرەوەی ئامێرێک کە ژێیەکی سۆزناک*Sympathetic*تری هەبێت لەگەڵ ئۆکتاڤی سەرەوە بۆ ئەوەی زایەڵەیەکی پڕ بەو تۆنە بدات.

A Livré Ouverte(F), At sight(E) ژەنین بەبێ پێشەکی.

Alla(I), In the style of(E) بە چەشنی.

Alla brev, Cut time(E)  ڕەزمی بڕاو کە بەکاردەهێنرێت بۆ خێراییەکی

دووجار لە ئاسایی خۆی لەسەر کێشی2/2{ هەندێک جاریش گوزارە لە 2/4دەکات}.

Alla antico(I) بەچەشنێکی ئەنتیکە.

Alla caccia(I), In the style of a hunting piece(E) بە شـێوازی ڕاوشـکار.

Alla Camera(I), In the style of chamber music(E) لەسـەر شـێوازی مۆزیکی سالۆن.

Alla cappella(I) لەسـەر شـێوازی کۆڕاڵی کلێسـە، ڕیشـەی وشـەکە لە*Chapel*وە هاتووە.

Alla con molto(I), Animated allegro(E) بە شێوازێکی زۆر بژێو، ئالێگرۆیەکی بژێو.

Alla marcia(I), In the style of march(E) بە شێوازی مارش.

Alla Mente(I), Extemporaneous(E) بەچەشنێکی زۆر سـەرپێیانە.

All'antico(I), In the ancient style(E) بە شێوازێکی دێرینانە.

Alla quinta(I), In fifths(E) لە پێنجەمەکاندا.

Alla stretto(I), In the manner of fast(E) ڕەوتەپەلە.

Alla trumpet(I), Like trumpet(E) وەک ئامێری ترومپێت.

Alla zingara, Alla zingarese(I), In te gypsy style(E) لە چەشـنی قەرەج.

Alla Zoppa(I) لێدانی سـینکۆپ بەشـێوازێکی ناسـک و سەلارانە.

Allargando(I), Getting slower and slower(E) تێمپۆیەکی هێورتر، بەکورتی.*Allarg*

Allargando a poco a poco(I) بەرەو کەمکەم هێورتر.

Allargando molto(I) زۆر هێورتر.

Allargando poco(I) کەمێک هێورتر

Allargando sempre(I) هێورییەکـی بێوچان.

Allargandosi(I) هێوربەخشـین.

Allargando un poco(I) هێوریەکی تۆزێ کەم.

Allargate(I), Go slower(E) هێور بڕۆ.

Aĺĺaweysi(Kr) ئەڵڵاوەیسی، وشەیەکی لێکدراوی کوردی/یە،

پێکهاتووە لە ئەڵڵا کە بەمانای خودێ دێت{وشـەیەکی هەرەکۆنی ئیل/ی عیبرییە و هاتۆتە نێوزوانی عارەبی/یەوە}، وشەی وەیس/یش وشـەیەکی ئاڤێسـتایی/کوردییە بەمانای بەندە دێت و ناوی پیرێکی سپەنتای زاردەشتی/یە و لە ئاڤێسـتایشدا ئاماژەی پێدراوە، کۆی وشـەلێکدراوەکە مانای خودێبەندە(بەندەی خودێ) یاخود شـاوەیس دەبەخشێت.

گڵکۆیەک بەم ناوە هەیە بەناوی پیروەیس کە بۆتە سـەرای دڵداران و شـەیدایان، دەچنە دیدەنی و بێشـکەی ڕادەوەشێنن کە بیێتە تکاکاریان لای پەروەردگار و نزا و پاڕانەوەیان گیربکات.

با بچینە سەر وەیس وەیسـی خۆمانە

پرسـیاری لێبکەین خەتای کامانە..

گەر خەتای من بوو بمکا شێت و وێت

گەر خەتای تۆبوو خێـر نەیەتە ڕێت..

هەر لە دێر ڕۆژگارەوە وشەی <u>وەیس</u> نازناوی هەندێک لەو پیرەخواناسانە بووە کە کۆمەڵگەی کوردەواریمان وەک ئاکار و نەریتێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی بە چاوێکی ڕێز و شکۆوە لە دیدەنی گڵکۆیان یادی دەکەنەوە. پیدەچێت دێرینی و ڕەسەنێتیی ئەم ئاوازە هەنک و کزەسۆزی پیرە دەروێشێکی لە خواترسی خەڵوەتگار بێت کە بە ویرد و یادی یاهویامەلهو ژیانی بردبێتەسەر.

زۆر پیری مێرخاس هەیە لە سەرانسەری کوردستاندا کە خەڵک بۆ موفەڕک و پیرۆزی دەچنەدیدەنی گڵکۆیان، ئەو کزەسۆزەی کە لە هەموویان زیاتر لەنێو خەڵکدا بەناویەوە مابێتەوە ئەو دەسگا بەسۆزە کاریگەرە بەچێژەیە کە تا ئێستا بەناوی ئەو پیرخاسە ئەڵلاوەیسی/یەوە ماوەتەوە.

نۆتاندنی/ئەنوەر قەرەداخی ئەڵلاوەیسی



ئەڵلاوەیسی...لەو دەسگا نەردینانەیە کە لەوانەیە تەنیا هەر لە هونەری مۆزیک کوردیدا بەدیبکرێت، لەبەرئەوەی کە پتر لە دوو مۆزیکدەسگای تیادایە کە پێیبوترێت دەسگای تێهەڵکێش چونکە بە ڕەوشێکی زۆر نەخشین، گەشتێکی ڕەنگین و ڕازاوە بە چەند دەسگایەکدا دەکات. ئەو ڕەوشەی کە دەبیسترێت بە سێ چیندا دەڕوات. سەرەتا بە نەرمە هەوایەکی نزم بە سکێڵی نەهاوەند دێتە ناوەوە و کەمێکیش سکێڵی موستەعاری بەردەکەوێت، ئینجا تێهەڵکێشی سکێڵی ڕاست دەبێت و بەرەبەرە بە وردی دەچێتەسەر سکێڵی بەیات و پاشان کۆتاییەکەی بە نەهاوەند دەگیرسێتەوە.

لە ڕووی دنیاییەوە سۆزێکی فراوێزە، گوزارە لە ناڵە و ژان و بێداری و دەردی کۆمەڵایەتی و جەور و ستەمی ڕۆژگار و ئاهی ساردی شەیدایان دەکات کە بە لاوژەی شیرینی کوردی/گۆران لە ناوچەکانی گەرمیان/دۆڵی زەنگنە و هەندێک ناوچەی موکریان دەبێژرێت.

پای شادیم دیسان ماران گەستەوە　　　　نە پیاڵەی چەم ژار تویژ بەستەوە

مەولەوی، وتنی:عەلی مەردان

Alle(G,I), Tutti(I), All(E) هەموو.

Allegramente(I), Allègrement(F), Brightly(E) بە ڕۆشنی.

Allegrettino(I), Short allegretto(E) بە بزێوی بەڵام هێورتر لە ئالێگرۆ*Allegro*.

Allegretto(I) ئاللێگرۆتۆ، تێمپۆیەکی نێوان ئانداتا*Andante*و ئاللێگرۆ*Allegro* بە پێوەری مەترۆنۆم*Metronom* دەکەوێتە نێوان110-100بۆ 184-152ل/خ{لێدان لە خولەکێکدا}.

Allegretto grazioso(I) خێراییەکی مامناوەندی بەشێوازێکی ناسک و کاریگەر.

Allegrezza(I) ئاللێگرێزا، خێراییەکی ڕووبە خۆشی.

Allegrissimo(I), Very fast(E), Très rapide(F) ئاللێگریسیمۆ، زۆر خێرا.

Allegro(I,F), Quick, lively(E) ئاللێگرۆ، خێراییەکی بە جۆش، بەکورتی. *All*$^{o}$،بە پێوەری مەترۆنۆم لەنێوان126-116بۆ 184-152ل/خ دایە. خێراتر لە ئاللێگرێتۆ بەڵام خاوتر لە پرێستۆ*Presto*.

Allegro agitato(I), Quick and agitated(E) خێرا و بزێو.

Allegro allegro(I), Very quick(E) زۆر خێرا، لە ئاللێگرۆ خێراتر.

Allegro animato, Allegro con fucco(I) بە گیانێکی پڕشوور و گەرم.
With animation and fire(E)

Allegro aperto(I), Allegro with a broad(E) ئاللێگرۆیەکی فراوان، گوزارە ڕەوان.

Allegro appassionato(I) بە سۆز و کاریگەر.

Allegro assai(I), Très vif(F), Very lively(E) بە خێراییەکی بزێویانە.

Allegro commodo(I) خێراییەکی مامناوەندی بەوپەڕی ئارامی و بێشپرزەیی.

Allegro di bravura(I), Brilliant allegro(E) ئاللێگرۆ*Allegro* یەکی ڕوون

Allegro di molto(I), Very fast(E) زۆر پەلە.

Allegro furious(I), Quick and impetuous(E) خێرا و سەرکێشانە.

Allegro giusto(I), Quick and precision(E) خێرا و بەوردی.

Allegro maestoso(I), Quick but majestic(E) خێرا بەڵام شکۆمەندانە.

Allegro ma non troppo(I), Lively but not too quick(E) بە جۆش بەڵام نە زۆر خێرا.

Allegro moderato(I), Moderately quick(E) خێراییەکی مامناوەندی.

Allegro non troppo(I), Not too fast(E) نە زۆر پەلە.

Allein(G), Alone, Single(E) تەنیا، تاک.

Alleluia(Hb), Hallelujah(L) ئەللێلویا، ئەڵڵاهو، سوپاس و ستایشی خودێ بەزوانی عیبری.

Allentamento(I), Slowing(E) خاوبوونەوە.
Allentando(I), Slowing down(E) خاوکردنەوە.
Allentato(I), Slackening the tempo(E) تێمپۆ خامۆشـکردن.
Alles wohl gebunden(G), All the notes well slurred(E) باش بەسـتوی هەموو نۆتەکان. وەک لە شـێوەی لێگاتۆ/دا.
All Pausen gut gehalten(G) باش بەردەوامبوونی هەموو وچانەکان.
Allmählich,(G), Gradually, Little by little(E) پەیتاپەیتا، پلەپلە.
Alle saiten(G) هەموو سـیمەکان(ژێیەکان).
Al loco(I), At the place(E) لە شـوێنی، نیشـاندانی ئۆکتاڤێک بالاتر یان پایینتر لەوەی کە نۆتێنراوە تاکو ئەو شـوێنەی کە مەبەسـتە.
Allongé(F), Porlonged bow stroke(E) درێژەپێلێدان بە کەوان.
All'improvista(I), Extemporaneously(E) سـەرپێـیانە.
All'inglese(I), In the Italian style(E) بە چەشـنی ئیتالیایی.
Allonger(G) درێژەکردنەوەی نۆتەکان بە مەبەسـتی خاوکردنەوەی تێمپۆ.
Allontanando(I), Dying away(E) دوورخسـتنەوە.
Allontandosi(I) دوورخسـتنەوە و کزکردنی دەنگ.
Allontanandosi(I) دەنگ دوورخستنەوە و کزکردن.
Allontanandosi Alquanto(I) بڕێک دەنگدوورخسـتنەوە و کزکردن.
Allontanandosi a poco a poco(I) کەمکەم دەنگکزکردن.
Allora(I), Alors(F), Then(E) پاشان.
All'ottava(I), At the octave(E) بە ئەندازەی ئۆکتاڤێک سـەرووتر $8^{va}$ یاخود خوارتر $8^{vb}$ لە ئۆکتاڤی ئاسـایی.
All'unions(I) هاویاری*Accompaniment*یەکی چوونیەک لەگەڵ بڕگە دەنگیەکدا.
Al piacere(I), At pleasure(E) ژەنینی پارچەمۆزیکێک بە ئارەزوی ژەنیار خۆی، بە خۆشییەوە.
Alquanto lento(I) بڕێک بە هێواشی.
Alquanto mosso(I) بڕێک بەبزێوی.
Al rigore di tempo(I) بە تێمپۆیەکی دروست لە کاتێکی بڕاوەدا.
Al riverso, Al rovescio(I), By contrary motion(E) بە بزاڤێکی پێچەوانە، میانەکانی سەرەوەی میلۆدییەک بگەڕێنرێنەوە بۆ میانەکانی خوارەوە بەهەمان بەها و پێچەوانەوە *Vice versa*.
Als(I), As, Like, When, Then(E) وەک، وەکو، کەی، پاشـان.
*al seg.* 𝄋 کورتکراوەی/*Al segno, Dal segno*
Al segno, Dal segno(I), Go back to the sign(E) گەڕانەوە بۆ هێماکە.
Also, Therefore(E), Aussi(F) هەروەها، لەبەرئەوە.

A l solito(I) به هه‌مان جۆر، هه‌روه‌کو خۆی.

Alt, Alta,(I), High(E) به‌رز. نۆته‌کانی یه‌کەم ئۆکتاڤ له سـه‌روو هێڵاسۆی تریبڵ*Treble staff*که ده‌که‌وێته نێوان"g" to f'''.

Altblockflöte(G), Alto recorder(E) ئامێری ڕێکۆردی تیژ، ئاڵتۆ ڕیکۆرده‌ر.

Altclarinette(G), Alto clarinet(E) ئاڵتۆ کلاڕنێت.

Altclarinette(G), Alto clarinet(E) پێنجتۆن نزمتر له کلاڕنێتی/*B flat* یاخود کلاڕنێتی/*C*.

Alt(G), Alto(E), Altus(L) ئاڵتۆ، ده‌نگگڕی ڕه‌گه‌زی مێـینه و کوڕی ته‌مه‌نی10بۆ15ســاڵ.

Alteration(E), Altération(F), Alterazione(I) به‌رزکردنه‌وه و نزمکردنه‌وه‌ی نۆته‌یه‌ک به هێماگۆڕین. بۆ نموونه هێماکانی ده‌بڵ دێز، دێز، ده‌بڵ بیمۆڵ، بیمۆڵ و سروشت.

Alterato(I) ,Altére(F) گۆڕینه‌کان له سـکێڵێکدا به‌ئه‌ندازه‌ی نیوه‌په‌رده‌یه‌ک.

Altered chord (E), Alterierter Akkord (G), Chromatic chord(E) کۆرد گۆڕین. کۆردێک که نۆته‌که‌ی له جێی خۆی بگۆڕدرێت به‌شـێوه‌یه‌کی کرۆماتیک، ئه‌وه‌ی که زۆر باوه:ـ زاڵه لاوه‌کییه‌کان*Secondary dominants*، ناوه‌نده کرۆماتیکه‌کان*Chromatic mediants*کۆرده شـه‌شـه‌مه زێده‌کراوه‌کان*Augmented sixth chords*.

| Altered chords کۆرده گۆڕاوه‌کان | | | |
|---|---|---|---|
| **Cma9(flat5)** | C major ninth (flat five) | C, E, G flat, B, D | **Cma9** with a flat fifth |
| **Cma13(sharp11)** | C major thirteenth (sharp eleven) | C, E, G, B, D sharp, F | **Cma13** with sharp eleventh |
| **C7(flat9)** | C dominant seventh (flat nine) | C, E, G, B flat, D flat | **C7** plus minor ninth |
| **C9(flat13/sharp11)** | C dom. ninth (flat thirteen/sharp eleven) | C, E, G, B flat, D, F sharp, A flat | **C9** plus sharp eleven and flat thirteenth |
| **C13(sharp11/flat9)** | C dom. thirteenth (sharp eleven/flat nine) | C, E, G, B flat, D flat, F sharp, A | **C13** with sharp eleven and flat nine |
| **C+7(sharp9)** | C augmented seventh (sharp nine) | C, E, G sharp, B flat, D sharp | **C+7** with sharp nine |

Altered dominants(E) زاڵه گۆڕاوه‌کان، که بریتین له سـیانیـیه زاڵه‌کان*Dominant triads* یاخود کۆرده حه‌وته‌میه‌کان*Seventh chords* له‌گه‌ڵ کرۆماتیکی پێنجه‌مه گۆڕاوه‌کان*Chromatic alterated chords*.

Altered nonharmonic note(E) نۆته‌ی ناهارومۆنییه گۆڕاو. ئه‌و نۆته‌یه که به شێوه‌یه‌کی کرۆماتیکانه‌ی وا ده‌گۆڕدرێت که نامۆ بێت به کلیله سه‌ره‌تاییه‌که‌ی*Prevailing key*.

Altered note(E) نۆته‌ی گۆڕاو، ئه‌و نۆته‌یه که به سـکێڵه‌که‌ی نامۆیه وه‌ک دێز، بیمۆڵ، بێکار .

Altered pentatonic scales(E) گۆڕینی سـکێڵه پێنجتۆنیه‌کان.

Altered scale(E) ســکێڵی گۆڕاو، بریتیه له ده‌سـگای حه‌وته‌م له سکێڵی ماینه‌ر میلۆدی، سـکێڵی زاڵی حه‌وته‌م *Dominant 7th scale*له‌گه‌ڵ نزمکردنه‌وه‌ی نۆیه‌م، به‌رزکردنه‌وه‌ی یانزه‌یه‌م، به‌بێ له پێنجه‌م، نزمکردنه‌وه‌ی سـیانزه‌یه‌م به درێژایی له‌گه‌ڵ ڕه‌گی ئاسـایی*Usual root*، ســێیه‌م و حه‌وته‌م. بۆ نموونه:ـ ماینه‌ر میلۆدی/*Db*....بریتیه له:ـ *Db, Eb, Fb, Gb, Ab, Bb, C, Db* .

دۆ/*C*ی گۆڕاوه*C-altered*....بریتیه له:ـ *Db, Eb, Fb, Gb, Ab, Bb, C* .

هەردوو سکێڵەکە سـێیەمماینەر*C-Eb*یان هەیە چونکە تۆنی فاـ بیمۆڵ*Fb* بەشـێوەیەکی ناهارمۆنیانە هاوهێزە بە تۆنی می/*E* و مێجەر سـێیەم*Major third*.



لە مۆزیکی جازدا، سـکێڵی گۆڕاو لە سـەروو کۆردە زاڵ حەوتەمەکان*Dominant 7th chords*وە لێدەدرێت.

Alterezza(I), Pride(E) شـانازی.

Alternamente(I), Alternately(E) بەشـێوەیەکی گۆڕاو.

Alternando(I), Alternatively(E) یەکبەدوابیەک، بەنۆبە. بەنۆرە.

Alternandosi(I) یەکبەدوابییەکدا هاتوو،

Alternatim(I) مۆزیکی کارپێکردە، وەک:ـ ئاڵوگۆڕکردنی سـۆلۆژەنەکان و کۆرس لەگەڵ یەکتر

Alternativo(I) ڕسـتەگۆڕین، نیشـانەیەکی زۆر پێشینە و گوزارە لە سـیانیی*Trio*دەکات کە لەگەڵ ڕسـتەسـەرەکیەکەدا ئاڵوگۆڕدەکات وەک *menuett-trio-menuett*.

Altezza(I), Pitch(E) پەردە.

Altflöte(G), Alto flute(E) ئاڵتۆ ـ فلووت. *Alto Fl.* کورتکراوەیەتی.

Altgeige(G), Viola(E) ئاڵتۆـ کەمانچە.

Alt-horn(E) ئاڵتۆ ـ هۆڕن کە ئامێرێکی سـەربە دەسـتەی سـاکسـهۆڕنە*Saxhorn* و بەزۆری لە مۆزیکی سـەربازیدا بەکاردەهێنرێت.

Altieramente(I), In a majestic style(E) لە شـێوازێکی شـکۆمەندیانە.

Altista(I), Alto singer(E) سـترانخوێنی دەنگی ئاڵتۆ، ئاڵتۆبێـژ.

Altiero(I) بە ڕالەخۆ و سـەربلندییەوە.

Altissimo(I), Highest(E) بەرزترین، نۆتەکانی دووەم ئۆکتاڤ.



Altisono(I) بە دەنگێکی بڵند.

Altistin(G), Contra-Alto(E) کۆنترا ئاڵتۆبێژ، سـترانبێژی مێـیینە لە گڕترین دەنگەواریدا.

Alto(I), Viola(F) ڤیۆلا، ئاڵتۆ، نزمترین دەنگی کیژی لاو و کوڕ لە تەمەنی10بۆ15سـاڵدا.

Alto clef(E), Altschlüssel(G) کلیلی ئاڵتۆ کە لە تۆنی دۆ/Doوە وەربگیرێت.

***Alto Cl.*** کورتکراوەی ئاڵتۆ ـ کلارنێت.

Alto saxophone(E), Altsaxophon(G) ئاڵتۆ ـ سـاکسـۆفۆن، ئامێرێکی هەواییە لەلایەن ئۆدۆڵف سـاکس(1814-1894)*Adolphe sax*دروسـتکراوە

Alto trombone(E), Altposaune(G) ئاڵتۆ ـ ترۆمبۆن لە کلیلی/*F*، ئامێرێکی هەوایی سـەربە خێزانی ترۆمبۆنە.

Alt' Ottava(I) یەک ئۆکتاڤ بالاتر.

Altra(I), Another,Other(E) هیتر، یەکێکیـتر، ئەوانی تر.

Altra volta(I), Play it again(E) **ژەنینەوە، جارێکیتر بژەنرێت.**
Alzamento(I), Raising(E) **بەرزکردنەوە.**
Alzamento di mano(I), Raising of the hand(E) **بەرزکردنەوەی دەست.**
Alzando di scatto(I), Leaping up(E) **هەڵبەزینەوە{بە کتوپڕی}.**
Alzandosi(I), Raising himself(E) **خۆبەرزکردنەوە.**
Alzandosi con grande letizia(I), Jumping up happily(E) **بازدان بە خۆشییەوە.**
Alzando un po'la voce(I), Raising the voice a little(E) **کەمێک دەنگ بەرزکردنەوە.**
Alzato,Alzati(I), Raised, Unmuted(E) **بەرزکراو، دەنگکراوە.**
Am(G), At the, On the, By the, Near the(E) **لە، بۆ، بە، نزیک لە.**
Amabile(I), Lovable, Sweet(E) **شەیدایانە، شیرین.**
Amabilità(I), Sweetness(E) **شیرینی.**
À mains(F), With two hands(E) **بە دوو دەست.**
Amarevole(I), Bitterly(E), Saumâtre(F) **بە تاڵ و ناخۆشی.**
Amarissimo(I), Very bitterly(E) **بەچەشنێکی زۆر تاڵ.**
Amaro(I), Bitterness(E) **تاڵی.**
Ambit, Texture(E), Ambitu(F),Ambitus(L), Tessitura(I) **مەودای{پانتایی}**
**ئاوازەگریگۆریەکان دەگرێتەوە کە لە سێ زاراوەدا پێناسەدەکرێت:ـ**
1. **مەودای تەسک***Narrow ambit***کە شەش تۆن یاخود کەمترە.**2. **مەودای ئاسایی** *Normal ambit***کە نزیکەی ئۆکتاڤێکە.** 3. **مەودای فراوان***Wide ambit***کە یانزە تۆن یاخود زیاترە.**
Äme(F), Anima(I), The soul(E) **یەزد، گیان، ستوونە دەنگ{ئەو کۆڵەکە ستوونەی کە لە ناو بۆشایی کەمانچەدایە، ڕووی هەردوو ڕووی سنگ و و پشتی بەیەکترەوە دەبەستێت بۆ ئەوەی زایەڵەیەکی تێر و پڕ بدات بە دەنگەکەی}.**
Ameen(Hb),Amen, So be it(E). **ئامین، زاراوەیەکی ئایینی زۆر دێرینی عیبری/یە کە لە کۆتایی هەموو نوێژێک بۆ خودێی پەروەردگار و نزا و پاڕانەوەیەک لێی وشەی ئامین چ بە تاک بێت یاخود بە کۆمەڵ دەوترێت کە بەمانای پەسەندبوون و گیرابوون دێت. وتنەوەی ئەم وشەیە بۆتە ویردی سەرزاری پەیڕەوانی ئایینی یەهودی و دیانی و ئیسلام، هەورەها دینی ئێزدی و ئایینزای یارسان...**
**لە مۆزیکهونەری کوردیدا....ئەم شێوەیە لە کۆنسێرتی"ئەوەڵ سەحەرە"دا کە لە دانانی مۆزیکزان ئەنوەر قەرەداخی/یە***Anwer Qaradaghi*{.....-1948**ز}هاتە نێو مۆزیکی نوێی کوردییەوە.**
Ametric, Without meter(E) **بەبێ دانانی هێچ مەتر{مازۆر}ێک.**
Amen cadence(E) **کادەنسی ئامین، بڕوانە/***Cadence*.
A mezza voce(I), Half voice(E) **نیودەنگ.**
Amore(I), Amour(F), Love, Affection(E) **شەیدا، ئەڤین.**

Amorevole(I) شـەیدایانە.

Amorosamente(I), Amorevolemente(I) بەشـێوازێکی شەیدایانە.

Amorosa(I), Organ pipe(E) لوولەی ئۆرگن.

Amoroso(I), Loving(E) ئەڤین.

Amphibrach(E) ئامفیبراچ، کێشێکی مۆزیک بە گۆبڕگە یاخود سـیلاب*Syllablary* کە پێکهاتووە لە کورتەنۆتە ◡ ، درێژەنۆتە — و کورتەنۆتە ◡. واتە لەسەر کێشی ◡ — ◡ .

Amphimacer(E) کێشێکی مۆزیکی پێچەوانەی ئامفیبراچ کە پێکهاتووە لە درێژەنۆتە —، کورتەنۆتە ◡ ، درێژەنۆتە — . واتە لەسەر کێشی — ◡ — .

Ampiezza(I), Ampleur(F) پانی.

Amplitude(E,F) ترۆپکەمەودای تەنێکی لەریو لەسـەر هێڵێکی ڕاســتدا.

Ampölloso(I) سـەنگین و ڕەزین.

Anacrusis(Gr), Upbeat note(E) نۆتە لێدانێکی سەرەتایی میلۆدییەک لە دەسـپێکی هێڵبارەکەدا*Barline*.

Anapest(E) کێشـێکێ مۆزیک لە دوو کورتەنۆتە ◡ ◡ و درێژەنۆتە — یەک پێکهاتووە. واتە لەسەر کێشی:◡ ◡ —

Anche(I), Also(E), Aussi(F) هەروەها.

Anche(F), Ancia(I), reed(E) ڕیشـەی ئامێرە فووپیاکەرەکان(هەواییەکان).

Ancient(Natural)minor scale(E) ســکێڵ ماینەری دێرین{ســکێڵ ماینەری سروشتە}.

Ancora(I), Ancore(F), Also, Still, Again(E) هەروەها، هێشــتا، جارێکی تر.

Ancora forte(I) جارێکا بە دەنگی بڵند.

Ancora meno mosso(I), Still more slowly(E) هێشـتا زیاتر بەخاوی.

Ancora piano(I), Contiue singing or playing softly(E) هەر بژەنرێت{بسـترانرێت}

Ancora più mosso(I), Still faster(E) هێشـتا هەر پەلەتر.

Ancora più piano(I), Still more softly(E) هێشـتا هەر بە نەرمی.

Ancora piu forte(I) جارێکا هەر بەدەنگی بڵند.

Andachet(G), Devotion(E) پاڕانەوە.

Andamento, Allant(I), Going, Enrgetic tempo(E) ڕۆیین، جووڵەیەکی بەوزە، درێژە بابەتێکی فیوگە*Fugue*.

Andamento rapid(I), Quick movement(E) جووڵەیەکی خێرا.

Andando(I), Going on easy(E) ڕۆیشتنێکی ئاسـان.

Andante(I), Walking pace(E) لە وشـەی*Andare* وە هاتووە بەمانای بڕوات*To go*دێت، جووڵەیەکی پەلەتر لە ئاداجیۆ*Adagio* و خاوتر لە ئالێگریتۆ*Allegretto* . بەکورتی/*And*te.

Andante affetuoso(I), Slow and tenderly(E) بە حەزێکی خاوەوە.

Andante cantabile(I) به چەشنە خاوێکی سترانئامێز.
Andante con moto(I), More animated motion(E) ڕەوتێکی زیاتر بەجۆش.
Andante maestoso(I), Slow and majestic(E) خاو و شکۆیانە.
Andante expressivo(I), Slow with expression(E) خاوێکی بەگوزارە.
Andante religioso(I) بە چەشنە ئایینیەکی خاو.
Andatemente(I), Smoothly and flowingly(E) ڕەوشێکی ناسک و ڕۆندەیی.
Andante moderato(I), Moderately slow(E) خاوێکی مامناوەندی بەڵام نەوەکو ئاندانتێ *Andante*.
Andante mosso(I), Flowing slow(E) بەرەوخاوی بەڵام نەوەکو ئاندانتێ *Andante*.
Andante non troppo(I), Flowing but not too fast(E) ڕۆیین بەڵام نەوەک زۆر پەلە.
Andante pastorale(I), Flowing with a tranquil simplicity(E) نەرمەڕەوتێکی پاستۆراڵی لەگەڵ هێمنیەکی سادە و ساکاردا.
Andante quasi allegretto(I) ڕەوتێکی زیاتر خێرا وەک ئاللێگرێتۆ.
Andante sostenuto(I), Slow and sustained(E) خاو و بەردەوام. خاوتر لە ئاندانتێ/*Andante* .
Andante un poco allegretto(I) ڕەوتێکی کەمێک وەک ئاللێگرۆ{بەجۆش}.
Andantino(I) ڕەوتێکی ئارامتر لە *Andante*، بەکورتی/ *And*[no] هەندێجار بە پەلەتر لێکدەدرێتەوە لەبەرئەوە وا بە باش زانراوە کە ئاستنبکرێت.
Andare(I), Go on, To move on(E) ڕۆیین لەسەری.
Andare diritto(I), Go straight on(E) ڕۆیین بێوەستان.
Andare in tempo(I), Keeping strike time(E) هێشتنەوەی ڕەزم بەردەوامبوون لەسەر هەمان کێش.
Andauernd(G), Continuing(E) بەردەوامبوون.
Anfang(G), Begining(E), Commencez(F), Comincio(I) سەرەتا، دەسپێک.
Angelic(E), Angelica(L), Angelico(I) فریشتەیی.
Angelica(F) ئامێرێکی فەڕەنسایی سەردەمانی سالانی1700ز، لە شێوەی عوود/دایە. شانزە ژێی سکێل دیاتۆنیکی لەسەر بەستراوە.
Angore(I), Pain, Anxious wish(E) ئارەزوویەکی بە پەرۆش، ئازار.
Angoscia(I), Anguish(E) دڵتەنگ دەبێت.
Angosciosamente(I) هەست بە دڵتەنگبوونی.
Angoscioso(I). Timidly(E) دڵتەنگانە.
Angreifen(G), To attack(E) شالاوبردن.
Anhalten, Aushalten(G), To hold on(E) مانەوە لەسەری.

Anhemitonic(E) نا نیوەتۆن، دوورکەوتنەوە لە دێز و بیمۆڵ کە لە ئامێری پیانۆدا دوگمە سپییەکان دەگرێتەوە، سـکێڵی پێنجتۆنی*Pentatonic* scaleیشـی پێدەوترێت کە تۆنەکانی بریتین لە *C D E G A* .

Anima(L), Animè(F) گیان، دەنگێکی بژێو بە ئامێری کەمانچە.

Animando, Animant(I), Animating(E) بە گیانێکی جۆش وخروش.

Animatissimo(I), Become animated(E) بەرەو گیانێکی جۆش و خرۆش.

Animato(I), Animated(E) جۆش و خرۆشـبوو.

Animo(I), Spirit, Spirited(E) یەزدانی، ڕۆحانی.

Animando e crescendo(I), Growing livelier and louder(E) بەرەو بژێوتر و بە دەنگتـر.

Animando sempre(più)(I), Growing more and more animated(E) بەرەو زیاتر و زیاتر بژێوی.

Animando un poco(I) کەمێک بژێوتر.

Animato di più(I), With greater animation(E) بەگیانێکی پڕجۆش و خرۆش.

Animosissimo(I), With maximal animation(E) بەوپەڕی جۆش وخرۆشـیەوە.

Animoso(I), Spirited(E) بەگیانێکی بژێوییەوە.

Anmut, Anmuth, Anmuthing, Anmutig(G), Graceful(E) دڵۆڤان.

Ansatz(G), Attack(E), Embouchure(F), Attacco(I) چۆنیەتی پێشـسازاندنی بار و شێوەی دەم و ددان بەهێز لەسەر براس ئامێرە*Brass instruments*کاندا( ئامێرفووپیاکەرە مادەنیەکان).

Anschlag(G), Attack(E) لێدان بەتایبەتی لە ژەنینی ئامێرە کیبۆردەکان.

Anschwellend(G), Swelling(E), Crescendo(I) بەرەو بەرزبونەوەی دەنگ، هەڵاوســان.

Ansia, Fastidio(I), Anxiety(E), Préoccupation(F) شـپرزە و خەمخواردن.

Anstatt(G), Instead of(E) لەبریی، لەباتی.

Anstimmen(G), To tune(E) بەرەو تۆنێکی دروست*Diatonic*.

Anstrich(G), Stroke of bow(E) بە کەوان لێدان.

Answer(E), Antwart(G), Antithesis(I) بەرســـڤ(وەڵام). لە دەقەمۆزیکی فیوگە*Fugue*دا دەبیسـترێت بە شـێوەڕەوتی:ـ بابەت ـ بەرســڤ ـ بابەت ـ بەرســڤ/ *Subject-Answer-Subject-Answer*. لە فیوگە*Fugue*دا...دوو جۆر بەرسڤ هەیە:ـ

1. ئەگەر بەرسـڤ هەمان میانەکانی وەکی بابەت*Subject*ی هەبێت بەڵام تەنیا جیاوازی لە ترانسپۆزەدا*Transposed*بێت پێیـدەوترێت ڕاسـتە بەرسـڤ*Real answer*.
2. ئەگەر بەرسـڤ لەسەر هەمان کلیل بمێنێتەوە و لە بابەت جیابێتەوە پێیـدەوترێت تۆناڵە بەرسـڤ*Tonal answer*.

Antecedent(G) پێشـــڕەو، دەسپێکی یەکەم دەنگی میلۆدیی لە فیوگە یاخود کانون*Canon*دا.

Antefatto(I), Prior fact(E) **ناوەڕۆک، مەبەست لەو ڕاستی و ڕووداوانەیە کە پێشـەکی دەخرێتە ڕوو وەک بەرنامەیەک بۆ زیاتر تێگەیشـتن لە کارێکی وەک ئۆپێرا.**

Anteludium(L), Prelude, Introduction(E) **بەربوورە، پێشـەکی.**

Anthologie (F, G), Anthology, Gatherning of flowers(E) **گوڵەوەچن، کۆکردنەوەی پارچەکانی وەک هۆنراوە و داڕشتن و مۆزیک.**

Anthologium(L) **ناوی ئەو پەڕاوەیە کە سـروود و نوێژ و ئامۆژنامەکانی تێیدا نووسـراوەتەوە لە کلێسـەی یۆنانیدا.**

Anthem(E), Antienne(F), Antifona(I) **سـرروود. وشەیەکی هەڵێنجراوە لە*Antiphonon*ی یۆنانی و دوایی بۆتە*Antifon*ی ئینگلیزی و بەرەبەرە بە وشەیە گیرسـاوەتەوە کە ئێسـتا وەک مۆزیک زاراوەیەک گۆی پێدەکرێت. پارچە کۆڕاڵێکی کلێسەییە هارمۆنی ئامێزە زیاتر وەک پۆلیفۆنی بێت کە لە کۆنوێژ*Mass*دا بە هاویاری ئۆرگـۆن جاروباریش بەبێ هاویاری ئامێری مۆزیک بەئەنجامدەدرێت، جیاوازی لەگەڵ مۆتێت*Motet* لە دوا ڕسـتەیدایە.**

Antibacchius(Gr) **ئەنتیباخیوس، بڕگەیەکی مۆزیکییە لە سـێ سـیلاب پێکهاتووە دوانی درێژی ئاکسنت — — و سـێیەمی کورتی نائەکسنت ◡.**

Anticipation(E), Anticipazione(I), Antizipation(G) **نۆتەی بەراواز لە نووسینێکی هارمۆنیدا...جۆرە کاریگەرییەک لەبەرایی هەندێک نۆتە یاخود زیاتر لە کۆرد*Chord*ێکدا دەبیسـترێت بەرلەوەی پاشـماوە*Rest* ی هارمۆنیەکە بگۆڕدرێت.**

Antico, Antica(I), Antique(F), Ancient(E) **ئەنتیکە، کۆنە.**

Antifona(I), Antiphon(Gr), Wechselgesang(G) **ئەنتیفـۆن...هێنانەوەی ڕستەمۆزیکێک لە چەند ڕەتکەیەکی جیاوازدا کە گروپ بە گروپ لەیەکتری وەردەگرنەوە. ئەو شـێوەیە لە پێـش و پاشی کۆنوێژ*Mass* لە کلێسەکانی ڕۆمان -کاتۆلیک و ئەرتۆدۆکسی یۆنانیدا جێبەجێدەکرێت.**

Anvil(E), Enclume(F) **ئامێری سـاجی کانزایی ڕەزمی بە چەند قەوارەیەکی جیاواز.**

Aperto(I), Apertus(L), Open, Without a mute(E) **ڕوون و کراوە، بەبێ پێکپە.**

A piacere, A piacimento(I), As you want, As you wish(E) **بە خواستی تۆ.**

A poco(I), Gradually(E), Petit à petit(F) **بەپلەیی.**

A poco a poco(I), Little by little(I) **کەمکەم، پلەپلە.**

Apoyando(I) **ئاپۆیاندۆ، ژەنینی نۆتەکان لەسەر گیتار بەچەشنێکی کلاسیک، هەرچی پاساوە پیکادۆ*Picado passage*کانە بەچەشـنی ئاپۆیاندۆ دەژەندرێت.**

Apotome(Gr), Cut(F) برگە، برِە، لە وشـەی ئاپۆتۆمای*Apotomai*یۆنانییەوە هاتووە کە بەمانای برِە*Cut*دێت، کرۆماتیک نیوەتۆنی فیساگۆرسـی بەرِێژەی2187/2048 کە114 centsدەکاتە جیاوازی لەنێوان تۆنی تەواو*Whole-tone*بە رِێژەی9/8 و لێما*Leimma*(*Diatonic semitone*) بەرِێژەی256/243 کە دەکاتە90 cents.

Appassionato(I), Appassionata(I), Impassioned(E) سـۆز و وروژاو.

Appena(I), Á peine(F), Barely(E) بەرِەنج، بەسـەختی.

Appena animando(I), Little more animated(E) کەمێک زیاتر بەجۆش.

Appena meno(I), Very little slower(E) خاوێکی زۆر بەکەمی.

Appenanto(I), Painful(E), Endolori(F) رِەنجور و بەئازار.

Applaudendo(I), Applauding(E), Applaudissant(F) چەپلەلێدان.

Appoggiando, Appoggiato(I), Leaning on(E) بۆ بزوان، برِوانە/*Portamento, legato* ئارەزو و جوولاَن بۆ شـتێکی بەرابەر، مەبەسـت لە نۆتەیەکە کە زۆر بە نەرمـی ئارەزووی بۆ نۆتەیەکیـ تری دوای خۆی هەبێت.

Appoggiatura(I), Appogature(F), Vorschlag(G) ئاپۆجیاتۆرا، تۆنەی هاوسـێ. نۆتیلە{گچکەنۆتە}کە لە پێش و پاشی نۆتەدا دەنووسرێت بەبێ ئەوەی لە تێمپۆی بگۆرِێت. چوار جۆریش لە ئاپۆجیاتۆرا هەیە:ـ

1. نۆتیلەی ئاکسنت*Accented appogg. Grace note*.



2. درِێژەنۆتیلە*.Long appogg*.

 یاخود 

3. کورتە نۆتیلە*.Short appogg*.

 یاخود 

4. نۆتیلەی نائاکسنت*.Unaccented appogg*.



Appoggiatura doppia(I), Double appoggiatura(E) دەبڵ ئاپۆرجیاتۆرا.

Apprestare(I) ئامادەیی بۆ پێشکەشکردن.

Appuyé, Appuyée(F), Emphasised(E) جەختکردن، پێداگرتن.

Aprés(F), After(E), Dopochè(I) پاشـان.

A prima vista(I), A première vue(F), At sight(E) **سەیرکردنێکی چاوترووکاندن.**

A punto(I), Exact(E,F) **تەواو.**

A quattro mani(I), À quatre mains(F), For four hands(E) **بۆ چوار دەست.**

A quattro voci(I), À quatre voix(F), For four voices(E) **بۆ چوار دەنگ.**

Arak(Kr), Uraq(Ar,Fa,Kr,Tr) **ئاراک{ئوراک، عوراق}، دوو بۆچوون هەیە بۆ لێکدانەوەی:ـ**

**یەکێکیان دەیگەڕێنێتەوە بۆ وشەیەکی هەرە دێرینی سۆمەری کە چەند هەزاران ساڵ بەرلە ئێستا لە زۆنکاوەکانی باشووری نێوان دیجلە و فورات نیشتەجێ بووبوون. وشەکە پڕاوپڕ بەمانای ئەو ناوچە زۆنکاوە دێت کە لە زوانی سۆمەریدا بەناوی ئاراک{ئوراک، عوراق}هاتووە. سەرەتاکانی سەتەی بیستەم کاتێک کە لەشکری بەریتانیا هات و زۆر لە ناوچەکانی خاوەرمیانەی داگیرکرت ناوی عوراقی زیندووکردەوە و کردیە عێراقی ئێستا کە ناوی لە خەریتەی جوگرافیای جیهاندا هەیە.**

**بۆچوونێکیتر دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئاراک کە وشەیەکی هەرە کۆنی ماد/کوردییە و لە سەردەمێکی زۆر دێریندا هەرێمێکی پانوبەرینی دەگرتەوە کە بریتیبوو لە ناوچەکانی ئەسپەهان، هەمەدان، خۆزستان، لوڕستان{سەربە وڵاتی ئێرانی ئێستا}، شاری بەسرە و عەمارە و ناسریە تاکو شاری بەخدا{سەربە وڵاتی عێراقی ئێستا}. دوایی لەڕێی بازرگانی و گەشتی کۆچەرییانی چەند هۆز و خێڵێکی عارەب و کەوتنەوەی ئەم ناوە لەسەر زاریان پیتی ئـ بۆتە ع. زۆر نموونەی وا لەنێو زوانی کوردی و زوانانی دراوسێیدا هەیە وەک ئارباد و ئاکرێ و ئامێدی بوونەتە عەربەت و عقرە و عومادیە...هتد.**

**ڕیشەوشەی عێراق...لە ئاراک/ەوە هاتووە و پێکهاتووە لە ئار:ئێر کە بەمانای گەرم، ئاگر دێت، پاشگری ئاک/یش بەمانای ئاخ:خاک یاخود زەوی دێت. کۆی وشەلێکدراوەکە بە ئاخی گەرم{خاکی گەرم}کە لە زوانی کوردیدا بە گەرمیان لێکدەدرێتەوە. جا لە ڕووی ئاوهەواوە هەرێمێکی گەرمە و دەشت و بیابانیشی زۆرە. لە سەردەمی ساسانیەکاندا ئێراقی هەر دوو بەشەکە هەرێمێکی ژێر دەسەڵاتیان و خەڵکەکەیشی پێکهاتەیەک بوون لە هۆزەکانی ماد. بە هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ ئەم هەرێمە پانوبەرینە کەوتەژێر دەسەڵاتی خەلافەتەکەوە و بووە دوو بەشەوە، یەکێکیان بەناوی ئێراقی عەجەم و ئەویتریان عێراقی عارەب. واتە گەرمیانی عەجەم و گەرمیانی عارەب. ئەم دوو ناوە هەروا وەک خۆی مایەوە. تەنانەت تا سەردەمی دوا فەرمانڕانی بنەماڵەی قاجاریەکان/یش هەر لە ناوچەی ئابادانەوە بۆ بەرەو باکوور کە شارەکانی لوڕستان، خۆزستان، هەمەدان و تاکو شارۆکەی ئاراک و لەوێیشەوە بۆ ناوچەکانی شاری کوت و کوردستانی باشووری سەر بە وڵاتی عێراقی ئێستای گرتبووەوە هەر بە عێراقی عەجەم.دەناسرا. ناوچەکانی بەسرە و عەمارە و دیوانیە و ناسریە و کەربەلا و نەجەف و کوفە و حیللە تا خوراوای شاری بەغدا/یش بە عێراقی عارەبی. بەڵام پاش چاوتێبڕینی ئینگلیز بۆ ئەم ناوچە بەفەڕە و پڕپیتە ڕووخاندنی سوڵتانێتی عوسمانلیەکان و هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی وشەی ئێراق بە پلانی ئینگلیز ناوەکە بە فەرمی زیندووکرایەوە و خرایە نێو ئەجندەی نێودەڵەتییەوە پاشان کرایە دەوڵەتێکی دەسکردە بەناوی دەوڵەتی عێراق و شاری بەخدا/یش کرایە پایتەختی.**

**لە ڕووی هونەرییەوە....پێدەچێت هەر لە سەردەمانێکی زۆر دێرینەوە ئاوازێک بوو بێت و گوزارەی لە ڕەوشی ژیانی ئەو ناوچە گەرمەسێرەی کردبێت. شـیدەکرێتەوە بەوەی کە لقێکی سەر بە دەسـگای سـێگایە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سێگای سـیانیی لەسـەر پلەتۆنی ئاراک، ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا. سکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ**

**ڕەگەزی ڕاست لەسەر ڕاست،**

**ڕەگەزی سێگای سـیانی**

**لەسەر پلەتۆنی سـێگا.**




Arbitrio(I), Free-will, Power(E) **هێز، ئازادخواز.**

Arcata, Arcato, Archetto(I), Bow stroke(E) **لێدان بە کەوان، بەکورتی.***Arc*.

Arcato in giu(I), Down bowed(E) **کەوان بەرەو خوارەوە.**

Archet(F), Arc(E), Arco(I) **کەوان، لورک، ئارشە.**

Archlute(E,I) **ئارچلوت، ئامێرێکی ژێداری دەسـکدرێژە، سـیانزە بۆ چواردە جووت ژێی هەیە، کەمێک بە ئامێری تیۆربۆ***Theorbo***دەچێت بەڵام گەورەترە، لە سـەردەمی نوێگەریی***Renaissance***لە وڵاتانی ئیتالیا و ئینگلتەرەدا زۆر باوبووە.**

Arc in gui(I), Down-bow(E) **کەوان لێدان بەرەوخوار{ بەسـەر ئامێرەژێدارەان}.**

Arc in su(I), Up-bow(E) **کەوان لێدان بەرەو ژوور.**

Ardente(I), Ardent, With fire(E) **بە گەرم و جۆش.**

Ardemment(F), Ardently(E) **زۆر بە پەرۆش.**

Ardentissimo(I) **زۆر بە گەرم و جۆش.**

Arditezza(I), Boldness(E) **بێباکیی، نەبەردیی.**

Ardito(I), Bold, Boldly(E) **بـێبـاک، بێباکانە.**

Ardore(I), With warmth(E) **بە گەرمی.**

A-re(F,I) **ناوی تۆنی لا/**A **لە سـۆڵفێـجدا.**

Areato(I), Played with the bow(E) **ژەنین بە کەوان.**

Aretinian syllables(E) **سـیلابە ئارێتینیاییەکان واتە حونجە دەنگیەکان کە بریتین لە لە ناوی تۆنەکان:ـ دۆ***Ut***، ڕێ***Re***، می***Mi***، فا***Fa***، سـۆڵ***Sol***، لا***La* **کە لەلایەن گویدۆ ئارێزۆ** *Guido d'Arezzo*(900-1033) **داهێنرا و ناوی هێکساکۆرد***Hexachord***ی بڕی بەسەردا.**

Argomento(I), Argument(E) **بڕوانە/***Antefatto* .

Aria(I), Arie(I), Air(E,F) **سـۆڵۆستران، ئاوازەمیلۆدییەکی هێدی و لەسـەرخۆ لە پارچە نمایشێکی ئۆپێرا و ئۆراتۆریا و کانداتەر/دا کە ئۆپێراچڕ بە هاویاری ئۆرکێسـترا بەشـێوەی مۆنۆلۆگ پێشـکەشـیدەکات.پێشـتر ئاوازێکی ئەڤینـئاوێز بووە کە بەشـێوازێکی ڕەنگین ڕەنج و پەژارەی تێدا نمایاندەکرا، لە دوو بەشـیش پێکهاتهاتبوو بەڵام بە شـێوەی** A – B – A **دووبارە دەبووەوە.**

**له نیوەسەرەتای سەتەی/18مەوە بواری هونەری ئاریا***A´ria* **فراوانتر بوو و توانرا بۆ چەند بەشێک پۆلێنرێن کە ئەمانەن:ـ**

1. *Aria Cantabile*: **ئاوازێکی نەرم و هێواش و کاریگەرە دەرفەتی ئەوەی تێدایە کە سترانبێژ هەوای خۆی تێدا بڕازێنێتەوە.**
2. *Aria di portamento*: **ئاوازێکی نەرم و کەمێک درێژترە و کەم دەرفەتی ئەوەی تێدایە کە سترانبێژ هەوای خۆی تێدا بڕازێنێتەوە.**
3. *Aria di mezza carattere*: **زیاتر بەسۆزترە و هاویاری ئۆرکێسترایە، ئەمە وای لێدەکات کە ئەرکێکی زیاتری بوێت.**
4. *Aria parlante*: **خۆشئاوازێکی بەجۆش و تاوگیرە، لە هەندێک بەشیدا گۆیندە***Recitative***ی تێدەکەوێت.**
5. *Aria di bravura* **یاخود** *Aria d'agilia*: **چەشنە ئاوازێکە شۆخ و شەنگی و والاکاری لەخۆگرتووە.**
6. *Aria All'unisono*: **چەشنە ئاوازێکە بە هاویاری***accompaniment***یەکی چونیەک ئامێز لەگەڵ برگەیەکی دەنگیدا.**
7. *Aria d'imitazione*: **چەشنە ئاوازێکی لاساییەکردنەوەیە وەک لاسایی خوێندنی باڵندە و ژەنینی هۆڕنی ڕاو، یاخود هەرشتێکیتر کە کاریگەری مۆزیکی و توانای لاساییکردنی تێدابێت.**
8. *Aria concertata*: **چەشنەئاوازێکی هاویاری***accompaniment***ی ئاڵۆزە.**
9. *Aria senza accompagnamento*: **چەشنەئاوازێکی بێ هاویارە کە زۆر بەدەگمەنە.**
10. *Aria da chiesa*: **ئاوازی کڵێسەییە بە هاویاری ئۆکێسترا.**
11. *Aria d'entrata*: **چەشنێکی تایبەت و سەختە، وەک زاراوەیەک لەو دەقە مۆزیکیانەدا دەردەکەوێت کە کاری ئۆپێراڵی تیدا جێبەجێدەکرێت.**
12. *Aria fugata*: **چەشنە ئاوازێکە لە هاویاری فیوگە***fugue***کاندا هەیە.**
13. *Aria tedesca*: **چەشنەئاوازێکی ئاریایی ئەڵەمانیاییە و لە چەشنە ئیتالیاییەکەی گرانترە.**
14. *Aria buffa*: **چەشنەئاوازێکی خۆشمە و گاڵتەجاڕییە.**
15. *Aria aggiunta*: **چەشنەئاوازێکە کە بخرێتەسەر دەقەسەرەکیەکە***original* **و ئارەزوی سترانبێژ ببزوێنێت و سەرنجی بیسەرانیش ڕابکێشێت.**

Arieggiando(I) **وەک سروود خوێندن.**

Arietta(I), Ariette(F), Little aria(E) **گچکە ئاریا***Aria***کە کورتە ئاریا/یەکی سادەیە.**

A rigore del tempo(I) **لە تێمپۆیەکی دروستدا.**

Arioso(I), Free lyric(E) **هۆنراوەیەکی سترانئامێزی ئازاد.**

Armonia, Armonica(I), Harmony, Wind-band(E) **هارمۆنیا، هاوئاهەنگی، باندی هەوایی.**

Armonica de cristal (F), Glass harmonica(E) **ئارمۆنیکا، مۆزیک ئامێرێکی دەمی/یە**

Armonioso(I), Harmonious(E) **هارمۆنیاکی، هاوئاهەنگی.**

Armoniosamente(I), Harmoniously(E) هارمۆنییانە، هاوئاهەنگیانە.

Arpa(I), Harp(E) هارپ، چەنگ.

Arpanelle, Arpanetta(I), Small harp(E) گچکە هارپ.

Arpeggio(I), Arpège(F), Akkordbrechungen(G) ئارپێجیۆ، درێژکردنەوەی ئاکۆرد *Ackord*، بەکورتی.*Arp°*.

Arpèger(F), To arpeggiate a chord(E) ئارپێجاندنی کۆردێک.

Arpégement(F) درێژکردنەوەی ئاکۆرد*Ackord*ێک لە خوارەوە بۆ سەرەوە بەخێرایی و بە هێمایەک لە پێشی ئاکۆردەکەدا ئاماژەی پێدەدرێت.

Arpeggiando, Arpeggiare, Arpeggiato (I) ئارپێجاندنی زنجیرە کۆردێک.

Arpeggiatura(I), Succession of broken chords(E) زنجیرەکۆردی شکستە.

ڕیشەی وشەکە لە ئارپا*Arpa:Harp*وە هاتووە. بە زنجیرە*Succesion*نۆتەیەکی هارمۆنی هارپ ئاسا بۆ پاساوەکان*Passages*بەئەنجامدەدرێت. بۆ نموونە درێژپێدان*Sweep*ی کۆرد ژەنینێک لەسەر پیانۆ وەک چۆن لە ئامێری هارپ/دا بەشێوەیەکی درێژەپێدان بە پەنجەکان دەخشێنرێن بەسەر کۆردەکاندا. ئەم جووڵەیە پێیدەوترێت ئارپێجیاتۆریا.

Arpeggione(I) لێرشتەی ئامێری گیتار و ڤیۆلێنسیلۆ/یە کە شەش ژێ و کیبۆردێکی لەسەر بەستراوە و بە کەوانیش دەژەنرێت، پێیشیدەوترێت*Guittara d'Amore*

Arpicordo(I) ئامێری هارپسیکۆرد لە سالانی سەتەی/16مدا.

Arraché(F), Strong pizzicato(I) توندلێدان بەسەری پەنجە.

Arrangement, Transcription(E) ڕێخستنی پارچەمۆزیکێک یاخود ئاهەنگێک.

Ars antiqua(L) هونەری دێرین، خوێندنگەیەکی فەڕەنسایی بوو کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نزیکەی1200-1325ز، بە ڕەتکەی دووەمی مۆزیکی مەنژوراڵ*Mensural*دادەنرێت.

Arsi(I), Weak beat(E) لێدانی لاواز.

Ars nova(L) هونەری نوێ، خوێندنگەیەکی فەڕەنسایی بووە کە لەدوای سالانی نزیکە1235ز بەشێوازێکی نوێ هاتەپێشەوە. پاشان گۆڕانکاری بەسەرداهات و شێوازی مادریگاڵ*Madrigal*ی بەخۆوەگرت، بە ڕەتکەی دووەمی مۆزیکی مەنژوراڵ*Mensural*دادەنرێت.

Arte(I), Art(E,F) هونەر.

Articolato(I), Articulé(F), Artikuliert(G), Articulation(E) باش، کرداری وابەستەیی*Legato* و جیاجیایی*Staccato*لەسەر نۆتەی پارچەمۆزیکێک.

Arts phonetiques(F) هونەری چۆنیەتی گۆکردن و ژنەوتن(گوێبیستن).

Ascending chromatic(E) هەڵبازە کرۆماتیک، کرۆماتیکی هەوراز.



Asar Kurd(Ar,Fa,Kr,Tr) ئاســارکورد، ئەســەرکورد. دەســگایەکی ســەرەکییە لە مۆزیکی خۆرەلاتیدا. ســکێلی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ئاسارکورد لەسەر ڕاست، ڕەگەزی حیجاز لەسەر نەوا. هاتنەخواەوەیشی پێکهاتووە لە ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی نەوا پاش گۆڕینی پلەتۆنی ماهوور بە ئەجەم.

ڕاست — زیرگولە — کورد — حیجاز — نەوا — هەسار — ماهوور — گردان

گردان — ئەجەم — هەسار — نەوا — حیجاز — کورد — زیرگولە — ڕاست

Asas, Ases(G), A-double flat(E) لا ـ دەبل بیمۆل.

Ass dur(G), A-flat major(E) لا بیمۆل ـ مێجەر

Ass moll(G), A-flat minor(E) لا بیمۆل ـ ماینەر.

Aspiratamente(I) بەگیانێکی پەرواز و گوشــاد.

Aspramente(I) بەتوندی.

Asperzza(I) توند و سەخت.

Aspro(I) زبر و تەڵخ.

Ass(G), A-flat(E) لا بیمۆل، لا پانۆک.

Assai(I), Assez(F), Very, Enough, Rather(E) زۆر، بەس.

Assai commosso(I), Extremely moved(E) بەرپەڕی جووڵەوە.

Assai lento(I), Assez lent(F), Rather slow(E) تاڕادەیەک هێواش.

Assai moderato(I), very moderate(E) زۆر مامناوەندی.

Assai moso(I) بەگیانێکی بژێو و خرۆش.

Assai piu(I), Much more(E) زۆر زیاتر.

Assaissimo(I) تا بتوانرێت، تا ئێرە کە بتوانرێت.

Assez vite(F) بە خێراییەکی گونجاو.

Assieme(I), Together(E) پێکەوە.

Assoluto(I), Absolute, Free(E) پەتی، ڕەها، ئازاد.

Assonante(I), Assonant(E;F), Assonaz(G) وێکچوونی دەنگ، دەنگی نزیک و لەیەکچوو.

Assottigliando(I), Diminishing, Softening(E) نەرم و نیان، کەمکردنەوە.

Assourdir(F) دەنگ کپکردن.

A suo arbiyrio(I) بەدڵ و ئارەزو.

A table sec(F) بەبێ هاویاریی.

A suo arbitrio(I), As you please(E) وەکو پێتخۆش بێت.

A tanto possibile(I) بەگوێرەی توانا.

Atemlos, Athemlos(G), Breathlessly(E) بێ هەناسـەییانە.

Atempause(G), Breath-pause(E) پشوویەکی هەناسەئاسا، وچانێکی زۆر کەم لەسەر لێدانێکی لاواز بۆ خۆئامادەکردن بۆ درێژکردنەوەی لێدانێکی بەهێز.

A tempo, A témpo(I), In time(E) لە تێیمپۆدا، بە زۆری لە گۆڕینی تێمپۆدا بەکاردەهێنرێت کاتی گەڕانەوە بۆ خێرایی یەکەم*Original speed*.

Atempo commodo, A témpo commodo(I), Convenient time(E) تێمپۆیەکی گونجاودا.

A tempo di minuetto(I), In the minuet time(E) لەسەر کێشی مینویت*Minuet*.

A tempo giusto(I), In a strict time(E) لە کێشێکی توندا.

A tempo ordinario(I), In ordinary time(E) لە کێشێکی ئاساییدا.

A tempo primo(I) گەڕانەوە بۆ کێشی یەکەم{دەسپێک*Opening time*}.

A tempo rubato(I), In irregular time(E) لە تێمپۆیەکی ناڕێکدا.

بۆ نموونە پەلەیی*Acceleration* و درەنگیی{دواخستن}*Retardation*ی پارتەکان*Part* لە باڕێکدا.

Athem(G), Breath(E), Souffle(F), Etere(I) هەناسە.

Atonale(E) ئاتۆناڵ، پێچەوانەی تۆناڵ، چەشنە مۆزیکێک کە پێڕەوی ڕێســاکانی تۆناڵ ناکات.

Atonality(E), Atonalität (G), Atonalité (F) ئاتۆناڵیتیی، پێچەوانەی تۆناڵیتیی، پۆلاندنی پارچە مۆزیکێک لە چوارچێوەیەکی کلاسیکی تۆناڵیتیی، چەمکێکی هارمۆنی کۆن کە لەسەر بناخە ئەکۆردی ســێ دەنگی هەڵبەسـترابێت.



A tre(I), À trois(F), For three(E) بۆ ســێ.

A tre mani(I), À trois mains(F) بۆ ســێ دەستان.

A tre parti(I), À trois parties(F) بۆ ســێ پارت{بەش}.

A tre voci(I), À trois voix(F) بۆ ســێ دەنگ.

Attacca(I), Attaque(F), Attack, Immediately(E), Sofort(G) هەڵمەت، دەسـوبرد.

گوزارە لە کۆتایی جووڵە*movement*یەک دەکات کە یەکسەر وەک هەڵمەتبردن بە جووڵەی یەکیتر دەست پێبکات. کۆڵەکەیەکی ســەرەکییە لە دەنگە ڕەزمیەماندا، لە کارێکی ئۆرکێســترادا بە یەکەم کەمان دەوترێت سـەرهەڵمەت*Chef d'attaque*.

Attaccando(I), Attack immediately(E) هەڵمەتبردن، یەکســەر دەســپێکردن.

Attacco(I), Short motif(E) مۆتیڤێکی کورت لە لاساییکردنەوە یاخود وەک بابەتێکی فیوگاڵی.

Attacca subito(I), Attack immediately(E) هەڵمەتبردنی کتووپڕ.

Attenuando(I) پەلەیی.

Attenuato(I) لاوازکردن، کەمکردن.

Attore(I), Actor(E), Acteur(F) **ئەکتەر.**

Attrice(I), Actress(E) **ئەکتەری مێـیینە.**

Attractive dissonant(E) **نەســازی سەرنجڕاکێش، میانەی گەستووی پێنجەم و زێدەی چوارەم.**

Aubade(F) **مۆزیکی بەرەبەیانان. لە سەردەمانێکی زوودا شـایەران***Troubadours* **لە بەرەبەیانێکی زوودا بە جادەکاندا دەگەڕان و ئامێرەهەواییەکانیان دەژەنی. مۆزیکی سـێریناد***Serenade***یش هەبووە کە دەمەوئێواران دەژەنرا.**

Auch(G), Also, But(E) **هەروەها، بەڵام.**

Audace(I,F), Boldness, Audacity(E) **بوێری و جەربەزیی.**

Auf(G), On(E) **لەسەر، بۆ نموونە** *Auf der G* **واتە لەسـەر تۆنەژێی**/G

Aufführung(G), Performance(E) **جێبجێکردن، نمایشکردن.**

Aufgeregt(G), Excited(E) **وروژاو.**

Aufgweckt(G), Lively(E) **بێدارییەکی بژێوانە.**

Aufhalten(G), To retard, To suspend(E) **تەگەرە، دواخســتن، ڕاگرتن.**

Auflage, Ausgabe(G), Edition(E) **ئامادەکردن، چەلاندن.**

**ڕەواندنەوەی دەنگێکی نەســاز لە دەنگێکی ســـازدا کە بەر ڕێســـاکانی هارمۆنی بکەوێت.**

Aufsatz(G) **داڕشــتن، وتار، لوولەزمانەی ئۆرگن.**

Aufschlag(G), Upbeat, Unaccented beat(E) **لێدانێکی نائاکسنت لە کێشکدا.**

Aufschnitt(G), Omitted portion(E) **پاژێکی ئاســتنکراو، دەمەلوولەی ئۆرگن، پارچە.**

Aufstrich(G) **بەرەو ژوورلێدان بەکەوان.**

Auftakt(G), Unaccented part of the bar(E) **پارتێکی نائاکسنت لە باڕێکدا.**

Auftritt(G) **هاتن ناوەوە بۆ سەر شــانۆ لە دیمەن**Scene**ێکی ئۆپێرا***Opera***دا بۆ نمایشکردن.**

Aug(Ar,Fa,Kr,Tr), Hauter(Hn) **ئاوج، ئاوج، ئاوگ، هاوگ، ئوگۆ، نەوایەکی بڵندبەها***Augue*، **دەنگەوارێکی بەرز. لەزوانی کوردیدا پەیڤی هاو، هەو بۆتە پێشگری زۆر لە وشان، بۆ نموونە هەولێر، هۆرێن، هەوشار، هەوراز...، ڕیشەی وشەکە ئاڤێستایی/کوردییە، مانای باڵا و بڵند ڕاگرتن دەگەیەنێت، پلەوپایە بەرز و پیرۆز. پێدچێت!!! ئەمیش وەک چەندین و چەندین وشەیـتر خرابێتە سـەر زاری زوانی عارەبی.**

**ڕەسەنی و دێرینی ئەم ئاوازە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ساسانیەکان کە بەدەنگی نەواســازان دیوەخانانیان هێناوەتە خرۆش. پێدەچێت لەو تایبەتمەندییە هونەرییەی ئەم ئاوازە کە هەیەتی لە دەنگەوارێکی زوڵاڵ و بڵندا بـێژرابێت. ئەم وشەیە دەماودەم هاتۆتە نێو میللەتانەوە و هەر میللەتەیش بەپێی ڕێزمان و ڕێنووسی خۆی گۆی پێکردوە. بەهاتن و نزیکبوونەوەی ڕۆشنبیری عارەبی لەڕێی ئیســلامەوە بە میللەتانی کورد و پارس و ...هیتر. پاشان زاڵبوونی زوانی عارەبی و گۆڕینی هەندێک پیتی وەک گ لە زۆر وشەی کوردیدا بۆتە ج ، بۆ نموونە وشەی مێرگ بۆتە مەرەج، گەچ بۆتە جص. هەروەها پیتی/هـ لە ســەرەتای زۆر وشــەدا بۆتە ئـ وەک هەوشار بۆتە ئابشار،**

یاخود وشەی هاوگ بۆتە ئاوج. دوور نیە گەر بڵێم وشـەی حیجاز/یش لە حیج یاخود حاج و ئاز هاتبێت واتە ئاوازی حاج یاخود بانگی حاجیان بۆ بەجێهێنانی ئەرکی حەج، بڕوانە/$\hat{H}igaz$.

لەم دیدەیەوەڕا...دەشێت ڕیشەی وشەکە لە ئوگۆ*Ugo*، هۆگ یاخود هاوگ/ەوە بووبێت کە بەمانای بەرز و بڵندکردن و بەشکۆکردنی شتێکی وا زۆر سـپەنتا کە لە بۆنە و جەژنە ئایینیەکاندا تەواو بەدیدبکرابێت. واتە بەشکۆ و پیرۆزڕاگرتن بە دەنگاوازێکی تایبەتی شادیبەخش و زوڵاڵی بڵند. بەڵام وا پێدەچێت بەرەبەرە هەروەک ئاوازە دێرینەکانیتر کاڵای دونیایی بەبەردا کرابێت و لە شێوازی چڕیندا گۆڕانکاری تێداکرابێت. بەڵام گەر لە هەستێکی هونەرییەوەڕا هەڵبسەنگێنرێت، لێوەیڕا پەی پێدەبرێت کە ڕەنگە ئایینیەکەی تێدا مابێت. هەندێک وای لێکدەداتەوە کە لەبەر بوونی لە دەنگەوارێکی بەرزدا بە ئاوج/ی لێکبدەنەوە کە بەمانای ئەوپەڕی دەنگ یاخود بەرزترین پەردە*Pitch* دێت، بەڵام وشـــەکە زۆر لەو جۆرە لێکدانەوانە کۆنترە.

لێڕشتەیەکی ســەربە دەســگای ســێگایە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ




ڕەگەزێکی سێگای سیانیی لەسـەر ئاوج. ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی موحەییەر.

{زیل ســێگا: پلەتۆنی بزورگ

زیل نەوا:پلەتۆنی سـەهم}.

Augmentation(E), Agrandissement(F), Ingrandimento(I) **زێدە نیوە تۆن،**

ئەگەر لە کانون*Canon*دا دەنگگێڕانەوەی میلۆدییەک لە چەند نۆتەیەکدا درێژبکرێتەوە پێیدەوترێت کانون بە زێدە*Canon by Augmentation*. ئەگەر هەر بەهەمان ڕێگە میلۆدییەکە لە چەند نۆتەیەکدا کورتبکرێتەوە پێدەوترێت کانون بە گەستن*Canon by diminution*.

Augmentation dot(E) **خاڵی زێدە، پنتی زێدە، زێدە دۆت.**

پنتەکە دادەنرێت لەپاش نۆتەیەک یاخود وچانێک بۆ درێژکردنەوەی کات.

Augmented Chords(E), Augmenté(F), Accresciuto(I) **کۆردە زێدەکراوەکان.**

| سیمبۆل Symbol | سیمبۆل Symbol | ناوی کۆرد Chord Name | میانەکانی کۆرد Chord Intervals |
|---|---|---|---|
| C+ | C+5 | C augmented | 1 3 #5 |
| C∆+5 | C maj7+5 | C major seventh augmented fifth | 1 3 #5 7 |
| C7+5 | C7aug5 | C seventh augmented fifth | 1 3 #5 b7 |
| C7+5(b9) | C7aug5(b9) | C 7th augmented fifth minor ninth | 1 3 #5 b7 b9 |
| C9+5 | C9aug5 | C ninth augmented fifth | 1 3 #5 b7 9 |

Augmented fifth chord(E) **زێدەکۆردی پێنجەم.**



Augmented fourth chord(E) **زێدەکراوە کۆردی چوارەم.**



Augmented intervals(E) میانە زێدەکراوەکان بە ئەندازەی نیوپەردە لە کرۆماتیکدا.

Augmented seventh chord(E) زێدەکراوە کۆردی حەوتەم.



Augement sixth(E) *Chromatc Chord*زێدەکراوی شـەشـەم، دەشـێت بە کرۆماتیک کۆرد دابنرێت. نۆتەکانی لە دەرەوەی کلیلەکەوە*Outside of key*وەردەگیراون.

وەک نموونەیەک دەشـێت بە وەرگرتنی کلیلی/**C-key** سـێ شـێوە بخرێتە بەرچاو:ـ

1. شـەشـەمی ئیتالیایی کە پێکهاتووە لە:ـ $A^{flat}$ – C – $F^{sharp}$.
2. شـەشـەمی فەڕەنسـایی کە پێکهاتووە لە:ـ $A^{flat}$ – C –D – $F^{sharp}$ .
3. شـەشـەمی ئەڵمانیایی کە پێکهاتووە لە:ـ $A^{flat}$ – C –$E^{flat}$ – $F^{sharp}$.

ئەم شـێوەیان لە هەموویان زیاتر بە ڕەواج و بەکارهێنراوە.

Augmented ninth(E) زێدەکراوی نۆیەم لە کۆردێکی پێنج تۆنیدا.

Augmented triad(E), Accord de quinte augmentée(F) زێدەکراوی پێنجەم لە ئاکۆردی مێجەرسـیانیی *Maj. 3rd aug.5th* دا. پێکهاتووە لە مێجەری سـیانیی، ئەویش بە بەرزکردنەوەی پێنجەم نۆتە بە بڕی نیوەتۆن. لێرەدا دوو مێجەری سـیانیی بەدیدەکرێت، یەکێکیان لەسـەرەوەی ئەویتریان. زێدەکراوی سـیانییەکەی*Augmented triad* بە هێمای"+"بۆ مێجەر سـیانییەکە ئاماژەی پێدەدرێت. بڕوانە/*Triads*.

Auletes(Gr), Flute player(E) فلووتـژەن.

Aulos(Gr) دووزەلە(دەبڵ ئۆبوا)ی سـەردەمەدێرینەکانی یۆنان کە لە بۆنەیەکی ئایینیدا بۆ بۆ خوداوەند دیۆنیسۆس*Dionysos*دەژەنرا.

Auméme temps(F) بۆ هەمان تێمپۆی جاران.

Aumentando(I), Augmenting(E) زێدەکردن کە لەبری کریشـاندۆ بەکاردێت.

Aumentata(I) بڕوانە/*Augmented*

A una corda(I), On one string(E) لەسـەر یەک ژێ،
مەبەسـت لە بەکارهێنانی پێدالی نەرمە*soft pedal* لە پیانۆدا.

Aus(G), Out of, Form(E) شـێوە.

Ausdrucksvoll(G) پڕهەستونەست، شـێوا(ڕەوانبێژ)، پڕواتا.

Ausgehalten(G), Sustained, Pause(E) پێنیشـاندان، پشـوو.

Ausschlagen(G) کات، پێوان.

Auszug(G), Extract, Arrangement(E) پاراو، ئاهەنگڕێخسـتن.

Ausfüllgeiger(G) بڕوانە/*Ripieno*.

Authentic(E), Authentique(F) جێگیر، ڕاسـتی، بنیاد، زاراوەیەکە فرۆزەی هەندێک شـت دەکات پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە پایەتۆن*Tonic*وە هەبێت وەک لە شـێوەی پلاگاڵ کە پەیوەندییەکی گونجاوی هەیە بە زاڵ*Dominant*ی ژێر پایەتۆن لە ئۆکتاڤێکدا.

Authentic cadence(E) بنیادە کادەنـــس، کە لە هارمۆنیدا زاڵەتۆن*Dominant*بە پایە*Tonic*دێتەوە، بڕوانە/*Perfect cadence*

Authentic melody(E) بنیادە میلۆدی کە تاڕادەیەک سـەرانسەری گرتبێتەوە و ئۆکتاڤ سـکێڵی کەوتبێتە پایەتۆن*Tonic*کەی یاخود کۆتاییەکەی.

Authentic modes(E) دەسـگا بنیادەکان، چەند جۆرە دەسـگایەکی کڵێسـەیی سـەتەی/16مە. دەسگای بنیاد*Authentic mode*مەبەست لە میلۆدی ئەو دەسـگایانەیە کە نۆتەکانی کەوتبێتە سەروو کۆتاییەوە. بۆ نموونە:-



















Auxiliay note, Neighboring note(E) یاوەرەنۆتە، هاوسێ نۆتە، نۆتەی لاوەکی بۆ ڕازانەوە.




Auxiliay scale(E) یاوەرەسـکێڵ، زێدەسـکێڵ.

Avec(F), With(E), Con(I) لەگەڵ، لەتەک، لەپاڵ.

Avec le bout de l'archet(F) لەگەڵ کۆتاییـبوونی کەوانەکە{ئامێرەژێدارەکان}،

A vista(I) بێ پێشـەکی.

Awa, Hewa(Kr) ئاوا، ئاواز.

Ayre(E) جۆرە خوێندنێکی شـێوە ماردیگاڵ*Mardigal*یە بە زوانی ئینگلیزی کە لە دواسـاڵەکانی سـەتەی/16م و سـەرەتاکانی سـەتەی/17م باو بووە.

Azyn(Kr), Ornamet, Decoration(E) ئازین، ڕازاوە، زێوەر، دیکۆراندن.

Azione, Drama(I), Action(E) دراما، نواندن.

ئۆپێرایەک کە لەسەر بابەتێکی ئایینی دانرابێت، درامای پیرۆز. Azione sacra(I)

لە سالّی1939ز کۆنفرانسی جیهانی لە لەندەن گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە ئیتر لەمەودوا ستاندەر فریکوێنسی *Standard frequency* بۆ پەردە*Pitch*ی لا/ی لە چینی چوارەم/A4دا یەکسان بێت بە440Hz کە هەمان پەردە لە سەردەمی مۆزیکزانانی وەک هایدن*Hayden*، مۆزات، باخ و بێتهۆڤن/دا یەکسانبوو بە422,5Hz.





مەشكەناى
Bagpipe



بالآبان
Balaban



بالآلایكا
Balalaika

# B



شـەكەهۆرن
Bockhorn



بانجۆ
Bango


حەوتەمین نۆتە {تۆننما Leading tone} لە سکێلی دۆ/C مێجەر.
Ti(I), B(E), H(G)
B2 B1 B b b1 b2 b3 b4
Hz: 30.868 61.735 123.47 245.94 493.88 967.77 1975.50 3951.10
Middle C


Te(I), B-flat(E)
B♭2 B♭1 B♭ b♭ b♭1 b♭2 b♭3 b♭4
Hz: 29.135 58.270 116.54 233.08 466.16 932.32 1864.65 3729.31
Middle C


B-sharp(E), His(G), Si-dièse(F)
B#2 B#1 B# b# b#1 b#2 b#3 b#4
Hz: 32.703 65.406 130.81 261.63 523.25 1046.50 2093.00 4186.00
Middle C

# B

به دەنگتان....قورئان بڕازێننەوە..... .

پەیامبەری ئیسـلام

---

B-tone(E,G), Si(I,F) بی/B ، سی، یاخود تۆنی/سیSi یاخود ئێچ/H یاخود کە حەوتەمین پلەدەنگە لە پایەتۆن*Tonic*ی دۆ/Cوە.



B سی...بە پیتی گەورەی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی سی ـ مێجەری سیانیی*B-major triad*.

b سی...بە پیتی بچووکی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی سی ـ ماینەری سـیانیی*b-minor triad*.

B double flat(E), Bes(G) سی ـ دەبڵ بیمۆڵ لەسەر سـکێڵی دۆ ـ مێجەر.



B double sharp(E), His(G) سی ـ دەبڵ دێز لەسەر سکێڵی دۆ ـ مێجەر.



B-flat(E), B-rotundum(L) سی ـ بیمۆڵ.



B-flat major keys(E) کلیلەکانی سی بیمۆڵ ـ مێجەر.



B-flat major scale(E) سی بیمۆڵ ـ مێجەر.



B-flat minor keys(E) کلیلەکانی سی بیمۆڵ ـ ماینەر.



B-major scale(E), B-Dur(G) سکێڵی سی ـ مێجەر.



Baby grand(E) گچکە پیانۆ، لە پیانۆی کۆنسـێرت*Concert grand* بچووکترە.

Bacchae(E), Bacchus(Gr) باخۆس، خواوەندی مەی لای ڕۆمانەکان.

زاراوە پێوانەیەکی مۆزیکییە لەسەر کێشی یەک بڕگەی درێژ و دوو بڕگەی کورت ∪ — — .

Bacchanal(E), Bacchanalia(I) ئاهەنگی ڕۆمانەکان بۆ خواوەندی مەی.

Bachelor of Music(E) بیـکالۆریۆسـنامە لە مۆزیک.*B.Mus*.

Backfall, Descending appoggiatura(E) پاشکەوتە، ئاپۆجیاتۆرای دابەزیو.

زاراویەکی سـەتەی هەڤدەمە، بڕوانە/*Turn*بکە.

Bach trumpet(E) ئامێری باخ ـ ترۆمپێت دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سـەتەی

هەڤدەم و سەرەتاکانی سـەتەی هەژدەم کە لە براس*Brass*دروسـتدەکرا. بڕوانە/*Turn*.

Badinage(E), Badinerie(F) خۆشــمە، ســەمایەکی خۆشـمە و گاڵتەوگەپە

لەسەر کێشی2/4 کە لە سـەتەی هەژدەمدا ڕەواجی هەبـوو.

Bagatelle(F,G), Short unpretentious(E) شتێکی بێهودە، پارچەمۆزیکێکی زۆر کورت و

ســادە بەتایبەتی بۆ پیانۆ.

Bagpipe(E), Ciaramella(I) مەشکەنای، لە گاهێکی زۆر پێشینی سەتان ساڵ بەرلە مەسـیح، ڕۆمەکان لەنیو لەشــکردا وەک ئامێرێکی فووپیاکەرە بەناوی کۆرەس*Chorus*بەکاریانهێناوە، پاشان لەڕێی کاروانچییانەوە گەیشتە نێو میللەتانی بەریتانیا و لەڕێی ئەمانیشەوە بە جیهاندا بڵاوبووەوە.

Baguette(F), Drum stick(E) ئەو دارەی تەپڵی پێلێدەدرێت.

ئەو شــووڵەدارەی یاڵی لەسەر دەبەسترێت تاکو بکرێتە کەوانی ئامێری کەمانچە.

Baisser(F), Lower(E) بەرەوخوار هاتنەوە.

Baisser le ton(F) تۆنەژێی بەرەوگرِی لە ئامێری کەمانچەدا.

BaĺÍaban, Duduk(Kr) باڵابان، دودوک، ئامێرێکی هەواییە و مەودایەکی یەک ئۆکتاڤی هەیە، لە سترانی فۆلکلۆری و میللی کوردیدا زۆر باوە. وشەلێکدراوێکی کوردییە کە لە باڵا:واتە بەرز و بان کە کورتکراوەی بانگ/ە. لەبەرئەوەی بۆتە پاشگری وشەی باڵا پیتی گ/ی لە دەستداوە ئەوەیش لەبەر خۆشهاتنی بۆ سەر زمان. کۆی وشەکەیش دەنگی باڵا یاخود دەنگی بەرز دەگەیەنێت، ئەویش لەبەرئەوەی کە دەنگی لە شمشاڵ تاڕادەیەک باڵاترە. پێیـشیدەوترێت نەرمەنەی لەبەرئەوەی تۆنێکی نەرموناسکی هەیە لەچاو ئامێری زوڕنا. لە زۆر بۆنە و ئاهەنگدا هاویاری ستران و هەڵپەڕکێیە کە ڕۆڵێکی گەرموبەجۆش دەگێڕێت.

Balalaika(Ru) باڵالایکا، ئامێرە ژێدارێکی باوە لەنێو میللەتی ڕووسـدا، پێشیدەوترێت گیتاری ڕووسـی کە سـێ تەلی لێبەسـتراوە. لە کۆتاییەکانی سـەتەی نۆزدەمدا ئاندریڤ*Andreev*چاکاری تێداکرد و بە وڵاتانی ئاوروپا و ئەمریکادا بڵاوبووەوە بەڕادەیەک کە لە هەندێک کاری ئۆرکێسترادا بەکاربهێنرێت.

Balbettando(I), Stammering(E) لاڵبوون، تگەکردن، زمانگیربوون.

Ballabile(I) باللابیل، باللێ ئاســا، وەکو سـەمای باللێ.

Ballad(E), Ballade(F,G), Ballata(I) باللاد، بەمانای سەمابکات*to dance*دێت کە لە باللێرە*Ballare*ی لاتینییەوە وەرگیراوە و پاشان بۆتە باللێت*Ballet*، هەندێجاریش بەمانای سەما و ستران/یش پێکەوە هاتووە. وشەیەکی زۆر دێرینی سەتەکانی سیانزەیە بەڵام لەدوایساڵەکانی سەتەی شانزەم سۆزەشێوازی گۆڕا و بووە شێوەیەکی فرۆزەکردن بۆ بەیتە ئینجیلیەکان.

بە شێوەیەکی گشتی دەشێت بە ئاوازێکی شەیدای و ئەڤینی دابنرێت کە لە سێ بەش پێکهاتووە و هەر بەشێکیش حەفت تا هەشت بەیت لەخۆدەگرێت. سەرەتای چەمکی وشەی باللاد کە وەک زاراوەیەک لە بواری هونەری مۆزیکدا دەرکەوت دەگەڕێتەوە بۆ گێڕانەوەی دیرۆک بەشێوازی بەیت لەسەر ئازایەتی و ئەڤینداری بە دەنگ و جاروباریش بە سەماوە.

Ballad meter(E) باللاد پێو، هۆنراوەیەکی چوار خشتەکییە کە هەر خشتە*Stanza*ی لە شەش تاکو هەشت بڕگە پێکهاتووە.

Ballerina(I) کیژی سەماکار.

Ballerino(I) کوڕی سەماکار.

Ballet(F), Ballett(G), Balletto(I) باللێت، سەمایەکی مۆزیک ئامێزە کە لە دیمەنێکی شانۆییدا بەشێوەیەکی فەنتازیی و لە بەرگ و پۆشینێکی تایبەتیدا گوزارە لە بابەتێک دەکات.

Ballo(I), Dance(E) باللۆ، لە ڕەگەوشەی بالل *Ball*وە هەڵێنجراوە کە مانای سەماکردنە بە باڵ وەشاندنەوە.

Balore(Kr) بالۆرە

بەزۆری پاشکۆی وشەی بەیتە بەشێوەی بەیتوبالۆرە لەسەر زارە. وشەلێکدراوەیەکی کوردییە پێکهاتووە لە با + لۆرە. بەمانای هەوایە، لۆرە بە مانای لەرینەوەی دەنگی گەروو. یاخود بڵێین مرۆڤ کە بە گەرووی لاسایی ئامێرێکی مۆزیکی وەک بلوێر دەکاتەوە. دەشێت هەر لەبەر ئەوەیش بێت کە کورد دەڵێت بالۆرەت بۆ لێدەدەم، ناڵێت بۆ دەڵێم{مەگەر بە دەگمەن}. بەم لێکدانەوەیە پێدەچێت وشەی لۆر تاڕادەیەک نزیکایەتیەکی هەبێت لەگەڵ وشەی لوور*Lur*ی سکۆتلەندی کە ئامێرێکی زۆر کۆنی سکۆتلەندییە{بڕوانە*Lur*/.

بەیت و بالۆرە....ئەگەرچی جمکی یەکترن بەڵام هەر یەکە فرۆزەی دیمەنێک دەکات. بۆ نموونە بەیت کە چامەیەکی پڕ مانایە وەک گۆیندە*Recite*دەگێڕدرێتەوە. بەڵام بالۆرە زیاتر لەنێو ئافرەتاندا بەدەم هەوای مەشکەژەنین و لایەلایەی منال و شینو واوەیلاوە دەبێژرێت. جاروباریش بالۆرە ڕۆڵی ڕەخنە و گازندە و پلارگرتن لە ڕووداوێک دەگێڕێت کە لە کاتی خۆیدا دەبێتە پەندێکی میللی.

Ban, Bang(Kr), Calling out(E) بان، بانگ، بانگین.

Band(E) Bände(Gr) باند، سەردەمانێکی زوو بە گروپێک لە ئامێرژەنە فووپیاکەرەکان و پاشان بە گروپێکی سترانبێژان وتراوە، بەڵام بەهاتنی سەردەمی نوێ چەمکە هونەرییەکی گۆڕا و درایەپاڵ گشت گروپێکی هونەری کە لە چەند مۆزیکژەنان و سترانبێژان پێکهاتبێت.

Bandir, Hand-held round frame of drum(E) بەندیر، تەپڵی هەڵگرتووی بە دەست لێدراو.

Bandora(S), Pandora(E) **ئامێرێکی ژێداره که تاراده‌یه‌ک له ده‌نگدا به ئامێری عوود ده‌چێت. نزیکه‌ی سیوشه‌ش ته‌لی پێوه ده‌به‌سترێت{واته هه‌ژده جووت ته‌ل}.**

Banjo(E) **ئامێرژێیه‌کی زۆر کۆنی خاوه‌رئافریکایه به‌ناوی بانیا*Banya*، پاش بردنی ڕه‌شپێسته‌کان بۆ ولاتی ئامریکا ناوه‌که‌ی بووه بانجۆ که له چوار ته‌له‌وه تاکو نۆ ته‌لی پێوه ده‌به‌سترێت.**

Banjolin, Mandolin-banjo(E) **ماندۆلین بانجۆ.**

Banjo-lute(E) **بانجۆ لووت، ئامێری بانجۆ له‌سه‌ر شێوه‌ی ئامێری عوود.**

Bar(E), Measure(E) **بار، مازۆر، نۆته‌کان یاخود وچانه‌کان که که‌وتوونه‌ته نێوان دوو هێڵه‌باڕه‌وه، یه‌که‌پێوانه‌ی میانه‌مۆزیکیه‌که که کێشێکی ڕێکوهه‌نداز له کات{ده‌م}*time* و لێدان*Beat* بۆ پێکهێنانی ڕسته‌یه‌کی مۆزیک.**

Barbad(Kr, Fa), Lute(E) **بارباد، عوود، ئامێرێکی سه‌رده‌می ساسانیه‌کانه و تا ئێستا به‌رده‌وامی هه‌یه و ئامێرێکی سه‌ره‌کییه له خۆره‌لاتی ناوه‌ڕاستدا. له‌نێو میلله‌تی عاره‌بدا به عوود ناسراوه.**

**له وشه‌لێکدراوی به‌ر/ی کوردی واته پێش یاخود سنگ و باد یاخود بات که گوایه له بط/ی عاره‌بی/یه‌وه هاتووه که به کوردی پێیده‌ڵێن مراوی، گوایه شێوی ئامێره‌که زۆر به سنگی مراوی ده‌چێت. ئه‌مه‌یش دووره له‌و لێکدانه‌وه‌یه چونکه به پێی مێژوو ناوه‌که زۆر کۆنتره له‌وه‌ی که دوا وشه‌ی نزیک بکرێته‌وه له بط/ی عاره‌بیه‌وه. ئه‌مه ته‌نیا هه‌ر یه‌کێکه له‌و وشه هاوڕێکه‌وتانه‌ی که ده‌که‌ونه به‌ر داگیرکردن و به‌خۆماڵیکردن.**

Barhat(Hn) **بارهات، زاراوه‌یه‌کی کلاسیک مۆزیکی هیندییه په‌یوه‌نداره به ڕاگا*Raga*وه.**

Bariolage(F), Medley(E) **گۆڕینێکی خێرا له ژێیه داخراو و کراوه‌کانی ئامێری که‌مانچه، تێکه‌ڵه‌ئاواز، پارچه ئاوازێکی ڕه‌نگینی به‌ستراو به‌یه‌که‌وه.**

Baritenore(I), Low tenor voice(E) **نزمه ده‌نگی تینۆر.**

Bariton(F), Baritono(I), Baryton(G) **باریتۆن، لێکدراوه وشه‌یه‌کی یۆنانییه که پێکهاتووه له بار*Heavy*و تۆن*Tone*، وشه‌ی بار زۆر نزیکایه‌تی هه‌یه له‌گه‌ڵ بار/ی کوردیدا که گوزاره له شتێکی قورس*Heavy*ده‌کات، وشه‌ی تۆن/یش به‌که‌مێک پیت گۆڕانکاری نزیکایه‌تی هه‌یه له‌گه‌ڵ وشه‌ی ده‌نگ/ی کوردیدا، میانه‌ده‌نگێکی نێرینه‌یه له دوای ته‌مه‌نی هه‌رزه‌کارییه‌وه تاکو دواته‌مه‌نی لاوێتی{18ساڵ ـ 25ساڵ}که ده‌که‌وێته نێوان ده‌نگه‌واری نزمه‌باس*Low bass*و بالاتینۆر *High tenor*، ده‌نگه‌واری که دوو ئۆکتاڤه ده‌که‌وێته نێوان تۆنی سۆڵ/G له‌سه‌ر بنه هێڵی کلیلی باس-*Bass clef*تاکو تۆنی سۆڵ/g´ له‌سه‌روو دۆ تۆنی ناوه‌ڕاست*Middle-C*. باریتۆن ساکسۆفۆن *Baritone saxophone* له‌و ئامێرانه‌یه که ده‌نگه‌واره‌کانی له‌م مه‌ودایه‌دایه.**

Baritone Clef, Barytone clef(E) **کلیلی باریتۆن، پێیشیده‌وترێت کلیلی/C و کلیلی/F.**



Baritone horn(E) **باریتۆن هۆڕن، ئامێرێ سی ـ بیمۆڵ براس *B-flat brass*که ده‌مه‌وانه‌ی هه‌یه.**

Baritone oboe, Bass oboe(E) **باریتۆن ئۆبوا.**

Bar line(E), Barra(I), Barre de mesure(F) بارەهێڵ، ئەو هێڵە ستوونانەیە کە بارەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە.



Baroque(F), Barocco(I), Barock(G) بارۆک،
چەرخێکی نێوان سەتەکانی هەڤدەم و هەژدەمە کە ناسراوە بە چەرخی هونەری تەلارسازیی بەشێوەیەکی ڕازاوە و دیکۆرێن*Decoration*ی زۆر قەشەنگی سەرنجڕاکێش.

Barré(F), Bared(E) میل، ئەو سیمەمادەنەی کە لەسەر دەسکی ئامێری گیتار سازێنراوە بۆ دیاریکردنی بواری پەنجەکان لەسەر تۆنەکان، بەهەمان شێوە بۆ ئامێرە ژێدەرە دەسکدارەکانی وەک ساز و تەموورە و ستار و عوود...و مانەندیان.

Barrel drum(E) تەپڵی شێوە بەرمیل ئاسا کە دوو تەپڵی گەورەن و پاڵدەخرێن بۆ لێدان.

Barrel organ(E) ئامێری ئۆرگن باریل کە ئاسان هەڵگرە و دواسەتەکانی هەژدەم لەسەر جادەکان بۆ خەڵک دەژەنرا.

Bas-dessus(F) بڕوانە/*Mezzo-soprano*.

Bass(E,G), Basse(F), Basso(I), Bem(Kr) باس، بنکە، بناخە، گڕ، گڕترین دەنگەواری نێرینە و هەندێک ئامێری وەک باس ساکسۆفۆن، باس کلارنێت و باس ترۆمبۆن.



Bass(E) نزمترین بەش، نزمترین دەنگی نێرینە لەنێوان مەودای E - C´.

Bassa(I) هێمای هاتنەخوارەوە بە ئەندازەی یەک ئۆکتاڤ*(8-Va)Ottava Bassa*.

Bass-Bar(E) کۆڵەکە، ستوونەدارێکە لە دیوی ناوەوەی نێوان هەردوو ڕووپەری سەروبنی ئامێرە کەمان*Violin*یەکان.

Bassbogen(G) دارەکەوانی ئامێری ڤیۆلا و کۆنتەرباس و...مانەندیان.

Bass -C(E) باس/C کە یەک ئۆکتاڤە لە ژێر تۆنی دۆ/Cی ناوەڕاست.

Bass clef(E), Basschulűssel(G) کلیلی باس، باس کلیل



Bass-deep voice(E), Basso profondo, Basso profundo(I) دەنگێکی زۆر گڕ.

Bass drum(E) دەهۆڵی گەورەی باس کە لە باندە سەربازیەکاندا زۆر بەکاردەهێنرێت.

Bass singer(E), Baryphonus(L) سترانخوانی دەنگی باس.

Basset horn, Corno de basssetto(I) باس هۆڕن، باس کلارنێت کە پێنچ تۆن نزمترە{تۆنی/Fدەگرێتەوە} لە کلارنێتی/C.

Basse chantante, Basse-taille(F), Basso cantante(I) دەنگباسێکی بەرزی بەهێز کە چەشنە ئاوازێکی خۆش*Lyric Cantabile style*دەبەخشێت.

Basse Danse(F) باس سەما، سەمایەکی سێ هەنگاوی زیاتر هەڵبەزین و دابەزینە بە هاوباری دەستەی کەمانچەژنانی دەرباری پاشای لە سەتەکانی شانزەیەم.

Basse de hautbois(F) ناوی دێرینی باسسوون بە فەڕەنسایی.

Bass flute(E), Bass flöte(G), Transverse flute(F) **بلوێر، باس فلووت،**
**یەک ئۆکتاڤ نزمترە لە دۆ/ی ناوەڕاست.**
Bass fiddle, Double bass(E) **دبڵ باس.**
Bassgeige(G), Violoncello(E) **ڤیۆلۆنسێللۆ.**
Bass guitar(E) **باس گیتار، باس گیتاری کارەبایی کە لە باندە میللیەکاندا زۆر بەکارە.**
Bass horn, Upright serpent(E) **باس هۆڕن، ئامێری سـەرپێنتـی وەسـتاو.**
Bass mandoline, Mandocello(E), Bassmandoline(G) **باس ماندۆلین.**
Basse récitante(F), Solo bass(E) **سـۆڵۆ باس.**
Bass oboe(E) **باس ئۆبوا کە یەک ئۆکتاڤ نزمترە لە ئۆبوای ئاسایی.**
Basse-taille, Haute-contre(F) **بڕوانە**/*Basse chantante* .
Bassetto(I), Small bass viol(E) **باس ڤیۆلـی بچووک.**
Bassiste(F), Bass player(E) **باســژەن.**
Basso buffo(I) **باسخوانێک کە بەشەخۆشمە***Comic parts***کان بخوێنێت.**
Basso giusto(I) **بڕوانە**/*Basse chantante* .
Basso ostinato(I), Ground bass(E) **بناخە باس، باسێکی توند.**
**هێڵی باس یاخود نموونەیەک ڕەپات***Repeat***بێتەوە لەکاتێکدا بەشی سـەرەوە بەردەوامبێت. بناخەباس مەزرا***Foundation***یە بۆ میلۆدی جۆرانجۆر و کاپێکردنی کۆنتراپونتاڵ***Contrapuntal* **و هارمۆنیک، شێووگ***Form***ەکان کە وەک نیگارێکی زەخرەفەیی لە سەمای شاکۆن و پاساکاگلیادا.**
Bass fundamental(E) **بنچینە باس کە پێکهاتووە لە ڕەگی ئاکۆرد وەک لە**
**ئاکۆردی** E, C, G{6/3**ئاکۆرد**} **کە هەمان ئاکۆردی** C, E, G{**ئاکۆردی**5/3}**بنچینەیە.**
Basso profondo(I) **باسێکی زۆر قووڵی بەهێزی کاریگەر.**
Basson, Basse de cremorne(F), Bassoon(E), Fagotto(I), Fagott(G) **باسسوون، فاگوت.**
**مۆزیک ئامێرێکـی هەواییە، سـاڵانی سەتەی شانزە لە ئینگلترە پێیدەوترا کوڕتاڵ***Curtall***کە جۆرێک بووە لە تینۆر باســوون و جووت کەڕتاڵ***double curtall*، {**نزیکایەتیەکی دروستی هەیە لەگەڵ باسسـوونی ئێسـتادا**}.
Bassoniste(F), Bassoon player(E) **باسسوونژەن.**
Bassposaune(G), Bass trombone(E) **باس تڕۆمبۆن، مۆزیک ئامێرێکی هەواییە.**
Bass trompete(I), Bass trumpet(E) **باس تڕومپێت، مۆزیک ئامێرێکی هەواییە.**
Bass trombone(E), Bassposaune(G) **باس تڕۆمبۆن.گڕترین سـیمی ئامێرەژێدارەکان.**
Bass trumpet(E), Tromba bassa(I) **باس تڕومپێت.**
Bass tuba(E) **باس تووبا، کۆنتراباس تووبا ، مۆزیک ئامێرێکی هەواییە.**
Bassus(F) **یەکێکە لەو کۆڕاڵ مۆزیکانەی دواسەتەی پانزەم تا کۆتایی سەتەی شانزەم**
**کە بریتیبوون لە:ـ** *Cantus*, *Altus*, *Tenor*, *Bassus*. **نزمترین بەشــە لە دانراوەیەکی پۆلیفۆنیدا.**

Bass viol, Leg viola(E), Viola da gamba(I) باس کەمانچەی پاداری پێنج ســیم{ژێ}ی سـەتەی هەڤدەم کە لە کلێســەدا دەژەنرا.

Bass voice(E), Bass stimme(G) دەنگی باس.

Basta(I) بەس، بە ئەندازەیەکی پێویست.

Baton(E), Bâton(F) باتون، کلیلی کۆککردنی ئامێری کاریللۆن*Carillon*.
ئەو دەسکەدارەی بە دەستی ڕاســتی ڕابەری ئۆرکێســتراوەیە کە بە ڕەزمێکی هەنداز پەیوەندییەکی مۆزیکهونەری و گیانی دەهێنێتە کایەوە تاکو ژەنیاران و کۆڕاڵ لەســەر جووڵەدەســتی ئەو کارەهونەرەکەیان جێبەجێ بکەن.

Bâton(F), Breve, Double whole note(E) باتۆن، دەبڵ تۆنی تەواو. 𝅜

Battaglia(I) پارچە مۆزیکێکی جەنگی کە گوزارە لە ڕووداوێکی مێژوویی بکات، ئەویش بە هاویاری بە دەنگی زولاڵی جەنگاوەران و ئامێری وەک شــەیپوور و ســاج و نەقارە.

Battement(F), Battimento(I), Beat, Trill(E) ڕازانەوە و ئاڕایشکردنی چەند نۆتەی پارچە مۆزیکێک کە لە سـالانی سـەتەی هەڤدەم لە ولاتی فەرەنســادا باوبووە.

Battendo(I), Striking(E), Tapageur, Assénant(F) لێدان، پیاکێشان.

Battendo forte le mani(I), Clapping hands loudly(E) چەپڵەلێدان بەدەنگی بەرز.

Batterie(F), Battery(E) ڕەزمەدەنگی تەپڵ لێدان، زیاتر لەنێو ســوپادا بەکاردەهێنرێت.

Battre á deux temps(F) دوو جار لێدان لە باڕ*Bar*ێکدا.

Battuta(I), Bar(E), Misura(F), Measure(E) پێوانگ، مازۆر، باڕ

Battute(I), Bar, Measure, Beat, Rhythm(E) لێدان، ڕەزم.




Bauernleier(G), Bawren Lyra(G), Hurdy-Gurdy جۆرە مۆزیک ئامێرێکی چوارســیمە دەسک*handle*ێکی بە ژێریەوە بەستراوە و چەند تۆنە دوگمەیەکیش لەســەر ڕوویەتی، بە بادانی دەسکەکە و پەنجەدانان لەســەر دوگمەکان دەنگی لێوەڕا پەیدادەبێت.

Beantwortung(G), Answer in fugue(E) بەرسڤ لە فیوگە.

Bearbeitet(G), Arranged(E) ڕێکخراو، ئاهەنگســازکراو.

Beat, Rhythmic pulse(E) لێدان، پرتە ڕەزم لە پارچەیەکی مۆزیکدا، جووڵەی دەسـتی ڕابەر یاخود ئەو دەسکە*Baton*ی کە ڕەزمی پێدەگرێت، چەند جۆرە ئۆڕنامێنتێکی مۆزیکایی کە فرۆزە لە نموونەیەکی وەک مۆردانت*Mordent*بکات.

Beating reed(E) ڕیشەی لێدان، بەو مۆزیکئامێرە هەوایانە دەکرێت کە زمانە(ڕیشە)یان هەیە و بە تەســککردنەوەی ڕووی ڕیشــەکە لەگەڵ ئەو ڕووەی لەســەری بەندە و بە فووپیاکردنــی لەرە دەنگێکی لێوەڕا دەردەچێت.

Beaucoup(F), Much(E) زۆر، فرە.

Bebend, Bebung(G), Tremolo(I), Trembling(E) لەراندنەوەی ژێـیەکان بە سەری پەنجە، دەنگدانەوەی ئامێری کلاڤیکۆرد*Clavichord*.بڕوانە/ *Tremolo*

Bec(F), Becco(I), Mouthpiece(E) پیک، بەشەدەم، مەبەست لەو ئامێرە مۆزیکانەیە کە بە هەوای دەم دەنگی لێوەڕا دەردەچێت وەک ڕێکۆردەر*Recorder*، کلارنێت و فلاجیولێت... .

Becco polacco(I), Large bagpipe(E) مەشـکەنای گەورە.

Bécarre (F), Bequadro(I), Natural sign, Quadrat(E) هیمای بیکار/ ♮، تۆنی ســروشـتی.

Becken(G), Cymbal(E) سـیمباڵ کە ئامێرێکی ڕەزمییە، {سـەنج}.

Beckflöte(G), Recorder(E) ئامێری ڕیکۆردەر.

Bedächtig(G), Careful & Unhurried(E) بەئاگایی.

Bedautend(G), Cosiderable(E) بایەخـپێدارو.

Bedeckt(G), Muffled(E) کپیو، دەنگکپکردنی ئامێرە تەپڵیەکان.

Beffando(I) بە خۆشمە و گاڵتەوە.

Beffardo(I) خۆشمەئامێز.

Beffeggando(I) خۆشمە و گاڵتەپێکردن.

Begeistert(G), Enthused(E), Mordue(F) ئازۆر، سـووربوون.

Begleitung(G), Accompaniment(E) هاویاریی.
ژەنینی پارچەمۆزیکێک لەلایەن تاکە ژەنیارێکەوە و ئامێریکیتر یان ئۆرکێسترا هاویاری بکات.

Behaglich(G), Agreeably, Easily(E) ئاسـانی، پەسـەندانە.

Behend(G), Nimble(E), Agile(F) شـۆخ، چاپووک و لێهاتوو.

Beherzt(G), Encouraging(E) هاندان.

Beide(G), Both(E), Tous(F) هەردووک.

Beide hände(G), Both hands(E) هەردوو دەست.

Beinahe(G), Behind, Almost(E) لەتەک، لەتەنیشت، بەزۆری.

Beispiel(G), Example(E,F) نموونە.

Beisser(G) بڕوانە/*Mordent*.

Beizeichen(G) هێمای دەنگگۆڕینی وەک دێز و بیمۆڵ و بێکار و ....هتد.

Bel Canto(I), Beautiful song(E) بێل کانتۆ، ســترانی جوان و ناســک.
جۆرە سـترانێکی ئیتالیایی سـەتەکانی هەڤدە و هەژدەم، ڕۆژانیکی گەشـی هونەری ئاواز و سـترانی ئیتالیایی بوو کە ئەم چەشـنە سـترانە ئاوێزابوو بە چەشـنی شــەیدایی*Lyrical style*و چەشــنی

وتاریبێژییDeclamatory styleی سـەتەی نۆزدەم. تاکو ئێســتایش ئەو چەشنە ئاوازە لەنێو هونەری ئیتالیادا باوە، لەو سـترانانەی کە لەم چەشـنەیە و گەشـەی پێدراوە بریتین لە:ـ

*Melisma*, *Divisions*, *Fioritura*, *Coloratura*

Belebend(G), Animating(E), Animant(F) بەجۆشبوون.

Belebt(G), Animated(E), Anima, Animée(F) بەجۆش.

Belebter(G), More animated(E) بەجۆشـتر.

Bell(E,F,G,I) دەمێکی پانی لوولەیەکی وەک لوولەی ئامێری ترومپێت. زەنگ، زەنگی کڵێسە کە چەند جۆرێکی هەیە لەوانەیش:ـ *Bell Gamba*, *Bell Harp*, *Bell Lyra*, *Bell Machine*

Bell Anthem(E) ســروودی زەنگ، ســروودێکی ئایینیە کە بە ئامێری زەنگ بەئەنجامدەدرێت.

Bellicoso(I), Warlike(E) زەنگی جەنگ.

Belustigend(G), Amusing(E) خەندە و خۆشــی.

Belly(E) تەختەڕووی سـەرەوەی ئامێرەژێدارەکانی وەک سـەنتوور کە ســیمەکانی لەسەرە .

Bémol(F), Bémolle(I), Flat(E) بیمۆڵ/*b* ، پانۆک، دەنگ نزمکردنەوە بە ئەندازەی نیوتۆن.

Bémoliser(F), Bemollizzare(I) دانانی بیمۆڵ لەپێش نۆتەیەکدا.

Ben(E), Bene(I), Bien(F), Gut(G) باش، نێک.

Ben articolato(I), Bien articolé(F),Well articulate(E) خۆش شــێوا، باش ڕەوان.

Bene(I), Well, Much(E), Rudement, Beaucoup(F) باش، زۆر.

Benedicamus Domino(I) درووود و نزای پەرستنگار{کاتی پەرســتن}بەکۆمەڵ لە کڵێسـەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا.

Benedictus(L), Blessed(E) پیرۆزکراو، دووەم بەشی سـانکتۆس*Sanctus*ە لە کۆنوێژ*Mass*دا. بەرەکەتخوازتن لەلایەن خودێ/وە، نزا و پاڕانەوەیەکی تایبەتییە بۆ خودێ کە ڕۆز و پیرۆزی خۆی بڕژێنێت بەسـەر پارســایانی.

Bene pronunziato(I), Clearly pronounced(E) بەڕەوان گۆکراو.

Ben ritmato, Ben marcato(I), With well rhythm(E) بە باش نیشـاندانی ڕەزم.

Ben sostenuto, Ben tenuto(I), Well sustained(E) باش درێژەپێدراو، باش بەهێزکردن و پڕکێشـی کردن.

Beneplacito, Beneplacimento(I) باش ئاکام .

Ben Legato(I), Well tie(E) باش بەسـتە.

Béquarre(F), Bequadro, Biquadro(I), Natural(E) بێکار، تۆنێکی نە دێز و نە بیمۆڵ.

Bequem(G), Comfortable(E) پۆڕاو، ئاســودە.

Berceuse(F), Lullaby, Cradle Song(E) ســترانی لایەلایە، نەک هەر بەتەنیا بەڵکو بە هاویاری ئامێرانی تری وەک پیانۆ.

Bereite vor(G), Prepare, Make ready(E) ئامادەبکرێت.

Bereits(G), Already, Previously(E) زووتر، پێشــتر.

Bergerette(F), Pastoral song(E) ســترانی شــوانی یاخود لادێیی.

Bernesco(I) خەندەدار.

Besetzung(G), Instrumentation(E) ئامێراندن.

Beschleunigen(G) شــەتاو.

Beseelt(G) بژێو.

Bestenigar(Ar,Fa,Kr, Tr) بەســتەنیــگار، لقێکە لە دەســگای سێگا. ســـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ســێگای ســیانی لەســەر پلەتۆنی ئاراک{عوراق}، ڕەگەزی ســەبا لەسەر پلەتۆنی دووگا. ســکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست.




Bestimmt(G), Decided(E), Décida(F) بڕیاردراو لە چەشن*Style*دا، هەروەها بۆ هێڵەســتوونێک کارپێدەکرێت لە بابەت*Score*ێکی مۆزیکدا کە دەبێت دیاربێت.

Betend(G), Praying(E), Priant(F) نوێژکردن.

Betonend, Betont(G), Streesed, Accentuation(E) پەســت، جەختکردن.

Betrübniss(G), Sorrow(E), Diuleur(F) بەداخ ، مەخابن.

Betrübt(G), Saddened(E) نیگەران، زویر.

Beyt(Kr) بەیت، ســروود. بەیت...وشەیەکی زۆر هەرە دێرینی کوردییە کە تاڕادەیەک ئاستەمە وەک ئاوازێکی مۆزیکایی سەرهەڵدانی دیاریبکرێت. بەڵام پێدەچێت کە ڕیشـەوشەی بەیت*Beyt*/ لەگەڵ وشـەی گیت*Geet*ی ســانسکریتیدا کە بەمانای ســـروود یاخود ستران دێت خزمایەتی هەبێت، واتە ســروودێکی ئایینی بەشــێوە هەوایەکی سادە و ڕەوانییەکی تەواوە لە چامەداســتانێکی سادە و ســاکاری پڕ لە پەند و پەیڤی بەمانا و هەنداز. پێشگری- بە- ی چۆتەسەر و بۆتە **بەگیت***Begeet* وەک وشەیەکی ئاوەڵناو. نموونەی زۆر لەم شێوەیە لە زوانی کوردیدا هەیە وەک وشەی ســۆز، هێز، ڕێز، نرخ...کە دەبنە بەســۆز، بەهێز، بەڕێز، بەنرخ...هتد. چەمکی وشەکە وەک زاراوەیەک بە سروودکردنی چامەداســتان دەگەیەنێت. بەڵام بەدرێژایی ڕۆژگار و خۆنوێکردنەوەی زوان وەک پێداویســتییەکی ژیان پیتی گـ تیایدا ســوواوە بە دواوشـەی **بەیت** وەک زاراوەیەکی زیندووی بژێوی ڕەســەن خۆی شــیرینکرد لەســەر زوانی کوردیدا.

بەڵام ڕاســتییەک هەیە دەبێت بزانرێت کە ئەویش:ـ ئەگەر چاوێک بە مێژووی مۆزیکی میللەتە دێرینەکانی وەک ناوچە پانوبەرینەکانی هیندۆچین/دا بخشێنین، بۆماندەردەکەوێت کە سەرەتای ســەرهەڵدانی ئاواز بەشـێوەیەکی بەزم و هەنداز و زۆر نەخشـین لەگەڵ گەڕان بەدوای بووندا... خودی مرۆڤ خۆی بووە، واتە چۆنیەتی بوون و ئافراندنی لەم گەردوونەدا تاکو گەیشتۆتە ئەو باوەڕی

که کردگارێک هەیە ئەم گەردوونەی بە زیندە و نازیندەوە ئەفراندووە، گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە چاکە هەیە و خراپە هەیە و هەموویشـی پەیوەندی ڕاسـتەوخۆی بەو کردگارەوەیە کە هەر میللەتە بە زوان کەسایەتی خۆی لە چێوەیەکی ئاییندا هاوار و هانای بۆ دەبات، وەک ناوی خودێ{لەنێو ئێزدیاندا}، ئاهۆرا{لەنێو زاردەشتیاندا}. جا بۆ ڕازیکردنی خودێ و سوپاس و ستایشکردن...چەندین بەند و پەند و بەزم لە بەرگی ئاوازدا بۆ ڕێکخراوە.ئەم چەشن و شێوازە لە کوردیدا بە زاراوەی بەیت گوزارەی پێکراوە. بۆ ڕاستی ئەم لێکدانەوەیەیش سروودە هیندۆسیەکان و ئێزدیەکان و زاردەشـتیەکان و عیبریەکان و دواییش سـروودە کلێسـەییەکانە. بەڵام گۆڕانکاری چەرخی ڕۆژگار بەرەبەرە ئەو سروودانەی هەڵڕژانە ناو ژیانی دونیاییەوە، واتە جگەلە شـێوەی ئایینی شێوەی دونیاییشی لەخۆگرت وەک سـەردەمی ئێستا کە لەنێو ژیانی کوردەواریدا بە چەندین چەشن و جۆر دەبیستین و دەیـبینین و بەناوی بەیتی ڕووداوێک ســازێنراوە، لەو بەیتانەیش کە زۆر باون:ـ
بەیتی لاوک و لاوژە{بڕوانە*Lawk*}، حەیران و حەیرانۆک{بڕوانە*Ĥeyran*}. هۆرە{بڕوانە*Hore*}، موور، سـیاوجامانە{بڕوانە*Syacamane*}.... .

بەیات. Beyat(Ar, Fa, Kr, Tr)

دڵم بۆ زوڵف ڕوی جانانە ئەگری          ناڵە بۆ گوڵ و ڕێحانە ئەگری

بێخود، بەدەنگی:عەلـی مەردان

دەســگای بەیات....لە دەسـگاسـەرەکیەکانی مۆزیکی کوردیە، زۆر ئاوازی فۆلکلۆری و میللی و گەلەک ئاوازی دانراوی هونەرمەندان دەچنەوەسەر ئەم دەســگایە، بوارێکی بەربڵاوی هەیە لە مۆزیک و سترانی کوردیدا. زۆر لێڕشتە*Derivative* و شێووگ{فۆرم*Form*}ی کوردی وەک سەفەر و ئۆرفە و باجلان و لاوک و حەیران و حەیرانۆک و هۆرە و ســیاوجامانە....ی لەسەر هەڵبەستراوە کە ئەمانە دادەنرێن بە ئاوازە زۆر دێرینەکان لە کۆمەڵگای کوردەواریدا.
هەر لەم ڕەسەنایەتی و دێرینێتـیەوەیڕا وشەی بەیات....دەشـێت هەر لەسـەر چاووگەوشــەی بەیت/ەوەڕا کەوتبێتەوە کە ئەمیش تەواوکەری وشەگوزارەی بەیتە تاکو مانای سـروودی یادکردنەوە و مەراقخواردن بۆ ڕووداوێک ببەخشـێت. لە ئاڤێســتادا بە ئەییات و ئەیات هاتووە کە بەمانای یاد و بیر دێت، ئەیاگار بەمانای یادگار دێت، جا دەشێت وشـەی بەیات/یش کە هەر لەم بازنەیەدا گرێبخواتەوە هەمان چەمک ببەخشـێت بەڵام بە لێکدانەوەیەکی کەمێک لابەلا، ئەویش چڕینی بەشـێوەیەکی وەها کە بە ڕەهاکردنی ژێیەکانی قوڕگ و بە لەرینەوەیان کە چریکەیەکی کاریگەر و بەسـۆزی وا بنوێنێت گوزارە لەو ڕووداو و بارودۆخە بکات. یاخود بڵێین دیمەنێکی تراژیدانەی وەها نمایانبکات کە گوزارە لە کارەساتێکی زۆر گەورە بکات، وەک یادکردنەوەی کەسانی زۆر ناودار کە شـوێنی لە ناخی خەڵکدا بەجێهێشتبێت و کەسێکی دەنگخۆش و نەواگر بە هەوایەک زۆر سـۆزناک و دڵگوشــاد، بە چەند بەیتێکی زۆر ساکار و هەنداز گوزارە لەو یادە پڕ لە زگار و مەراق و خەموخەفەتە بکات. جا لە ڕاسـتیشـدا گەر لە ڕووی چەش و هەستونەستی هونەرییەوەڕا ڕۆحیەتی دەسگاکە بهۆنینەوە دەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەک دیمەنێکی تراژیدیانە نمانیاندەکات. بۆیە دەبینین کە زۆرینەی ئەو ئاوازە کوردیانە سـرۆ{ئیلهام}یان لەم دەســگایەوەڕا وەرگرتووە.

لە هەندێک ناوچەی دۆڵی زەنگنەی دەوروبەری گەرمیان بە دەســگای ئایئای ناودەبرێت کە ئەم چەشـنەیان سـۆزیکی زۆر تایبەتی هەیە، سـۆزەکەیشی بەئەندازەیەکی وەهایە کە هەڵدەگرێت بگونجێت بۆ دەنگی ناســکو بەسـۆزی ئافرەت. جا لە ڕاسـتیشدا بارودۆخی ژیانی کوردەواریش ئەوەندە نەهامەتی و جەرگسووتانی دایکان و جوانەمەرگبوونی ڕۆڵەی ئازای وای لێ بەسـەردا هاتووە کە کۆڕی شـینوزاری ئافرەتان بە چەشـنە دەســگائاوازێکی تایبەت و ناوێکی لەبار بۆ ئەو دانیشـتنە گوزارە لەو بەرەنسـکە قەتیسـماوەیە بکات. کەسـێک چێژ و هەسـتێکی مۆزیکی تەواوی هەبێت بۆی دەردەکەوێت کە زیاتر لەبارە بۆ دەنگی ئافرەت. لەبەرئەوە دەشێت دەســگای بەیات ئەگەر بە دەنگی ئافرەت بێژرێت پێیـبوترێت دەسـگای ئایـئای. لە ناوچەی سـلێمانی بە دەســگای سـەفەر{بڕوانە*Sefer*}و ناوچەی مەندەلی و خانەقین و دەڤەری بە ئایئای باجلان/یش ناسراوە.

بەیات...دەسـگایەکی سـەرەکیە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەسـەر پلەتۆنی نەوا. سـکێڵی هاتنەخوارەیشـی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی حوسێنی، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی سێگای سیانیی لەسەر پلەتۆنی سـێگا.




دڵم بۆ زوڵف ڕوی جانانە ئەگری منالە بۆ گوڵ و ڕێحانە ئەگری بێخود، بە دەنگی:علی مەردان

لە مۆزیکی خۆراواییدا سـکێڵی بە ماینەر هارمۆنیک دەچێت{بەبێ نۆتـنما*Leading note* و کەمبوونەوەی پلەتۆنی دووەمیـش بە ئەندازەی1/4پلە}.

بەیاتی باجلان یاخود ئایئایی باجلان، شـێووگێکی دەســگای بەیاتە، Beyati BacÍan(Kr) جیاوازییەکەی تەنیا لە لاوژە و چەشــنی چڕینەکەیەتی کە تایبەتمەندی باجلان بەخۆوە بگرێت. ئەمەیش نموونەسۆزێکە لەو ئایئایە{بە دەنگی سـەید فەتاحی جەباری}ی کە لەو ناوچەیەدا باوە:ـ

وادەی بادەی ناب سۆ بو قەرقەفەن
دەنگ زایەڵەی دایەرە و دەفەن.
لە گشت دیارێ تەجەلای تۆرەن
فیتنە گیرەودار قەتڵم مەنسورەن.
مەیەن مەی شەوقەن موعبەتەن مەیلەن
خومان لەب ڕێزەن پیاڵان کیلەن.
ئای سـاقی دەخیل وەی سـبووتەوە
وەی بادەی گوڵ ڕەنگ چون یاقووتەوە.
بێ با بنۆشین خوسـرەوێ بەزمێ

چەنی هەستی دا بکەرین ڕەزمێ.
بێ با بنۆشین جامێ پەیکامێ
ساکن بۆ لە دەرد گشت ئێش و زامێ.
جامێ بدەن پێم سودمەنم بۆ
باعیسی نەجات قەید و بەندم بۆ.
جامێ وێنەی جام بەهمەن وەکام بۆ
هەم بەحس حەدیس هەم عەشق جام بۆ.
موتریب تۆش وەی چەنگ دڵ نەوازەوە
وەی سەدای شیرین خۆش ئاوازەوە.
موغەنیش وەدەنگ ئەو قانونەوە
وەو سەدای نەغمەی ئەرغەنونەوە.
فەنا فیلاهان مەست دڵ ئاگاه
وەحەق وەوانین اینی ئەنەڵلا.
ڕەنان سەرمەست گیان فیدای گیانان
عەینەلحەق چون زیکر زاهید مەوانان.

**بەیاتی زەند، بەیاتی تورک،** Beyati Zend(Kr), Beyati Turk(Ar,Fa, Tr)

وشەی زەند لە ئاڤێستادا بە زەنتی*Zanti*هاتووە کە بەمانای زانین دێت، واتە زانین لە پەندەکانی ئاڤێستا کە ڕاڤە و لێکدانەوە دەگەیەنێت. ڕیشە وشەکەیش لە زان*Zan*/ەوە هاتووە کە لە کوردیدا ڕەگی وشەی زانین/ە. لە هەندێک جاریشدا بەمانای هۆز یاخود هێز و مەزن هاتووە کە دەشێت وشەی هۆز لێرەدا بە سونبۆڵی هێز و گەورەییش لێکبدرێتەوە. لەلایەکی تریشەوە ناوی خێڵێکی کوردە کە بەشێکن لە هۆزی لەک و لوڕ. ئەمانە زۆر پەڕاگەندەی ناوچەکانی دۆڵی زەنگەنە و تا دەچێتەوە سەر ناوچەکانی کرماشان و لوڕستان بوون. کەریمخانی زەند لە ساڵەکانی1754-1794ز بەناوی دەوڵەتی زەند فەرمانڕانی سەرانسەری ئێرانی ئێستای دەکرد، بەڵام قاجاریەکان لە سەردەمی ئاغا محەمەدخانی قاجار زۆر دڕندانە و بێبەزەییانە کەوتنە کوشتن و تەفروتووناکردنی نەک هەر بنەماڵە و خزموخوێشی بەڵکو کەوتنە تاڵانکردن و ڕاوانی خێڵی زەند، ئیتر ئاوا بەم شێوەیە پەڕاگەندەبوون، زۆرینەیان لەتاو گیانی خۆیان هەڵاتن بۆ بەشەکانیتری کوردستان و تێیدا نیشتەجێبوون. لوتف عەلی خانی زەند/ی شاعیر ئەو دیمەنە تراژیدییە دەخاتە پێشچاوی و بە کورتە هەڵبەستێک فرۆزەی کەریمخانی زەند دەکات. جا لەسەر خواستی حەسەن فەهمی بەگی جاف، ڕەوانشاد بێخودی شاعیر ئەمەی لە فارسی/یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زوانی کوردی و دەفەرموێت:ـ

سەندت لە دەستم خودا، هەرچی موڵکی منە
دات بەو تەرەسەی کەوا نەپیاوە و نە ژنە
لەم گەردشی چەرخە تێنەگەییم ئەی بێباک
شێر لێدەر و دەفزەنت وەکوو یەک لە کنە.

بەهەرچۆنێک بێت...دەشێت هەوای ئەم دەسـگایە گوزارکردن بێت لە شرۆڤەکردنی دەسگای بەیات بە سـکێڵێکی سەربەخۆتر، یاخود دەشێت هەر بەناوەکەیدا لە خێڵی زەندەوە کەوبێتەوە. پێدەچێت کزەنەوای دەوارنشینان و کۆچەریان بێت و گوزارەیش لەو کارەساتە تراژیدییەی ئەو سەردەمی کوشتن و تەفروتووناکردن و هەڵاتنە بکات کە بەسەریاندا هات. لە ناوچەکانی کوردستانی خۆرەڵاتدا وەک مۆزیک دەسـگایەکی سەربەخۆ دانراوە.
بەداخەوە لە سەرەتای سالانی سەدەی بیستەمدا چەند قەڵەم و دەنگێکی نەشازی دەمارگیر لە ئێران پەیدابوون و ناوی دەسـگاکەیان بە بەیاتی تورک گۆڕی. بەڵام ئەوەی جێی خۆشبەختیە، هەر لە سـۆز و مورگ و چێژ و بەرامەکەیەوەڕا دەردەکەوێت کە ڕەسەنێتی کوردی لە ڕۆحیدا ماوە.
هەر گوێبیسـتێکی هونەردۆسـت هەسـتوچێژی هونەری تێدابێت و گوێ بۆ لەو نەواخۆشانەی وەک یارغەزال، زەردی خەزان/ی سـەید عەلی ئەسغەری کوردسـتانی شـلبکات بۆیدەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەک مۆرگی ئەم دەسـگایە لە هونەری مۆزیکی کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە.
بەیاتی زەند، یاخود بەیاتی تورک...هەر هەمان سکێڵی چوارگایە{بڕوانە*Chwarga*}.

که شەو هات پەردەی تاریکی دێـنێ        باڵی پرسـام و ناسـۆری دێـنێ

زامدار، بەدەنگی:علی مەردان

Bewegt(G), Motion(E) بزاڤ یان لە هەستەوە یاخود کارتێکراو بێت.

Bewegung(G) ڕادەی بزاڤ و خێرایی، جۆشـەند، تاوگیری.

Bezug(G), Hair(E) پسـک، یاڵ ، موو بۆ سازکردنی کـەوان*Bow*ی کەمانچە.

Bichord(E) جووت ژێ، بەتایبەتی دوو ژێ بۆ هەر نۆتەیەک.

Bicinium(L) ئاوازێک بۆ دوو ستراناخوێنی دووقۆڵی سـازکرابێت، ئەم چەشـنە ئاوازە لە سـاڵەکانی سـەتەی شـانزەمدا زۆر باوبووە.

Bien(F), Well, Very(E) باش، فرە.

Bimodality(E) بەکارهێنانی دوو دەسـگای مۆزیکایی جیاواز لەیەک کاتدا.

Binaire rhythme(F), Double rhythm(E) دەبڵ ڕەزم.

Binaire croches(F), Even quavers, Even eighth notes(E) جووت کرۆش.

Binary, Dual, Two parts(E) دوان، دوو پارت.

Binaural, Both ears(E) بە هەردوو گوێ.

Binary form(E), Forme binaire(F) شـێووگی دوو لایی، فـۆرمی دوو ڕوویی، دوو جۆر هەیە کە بریتین لە شـێووگ:ـ دوو لایی سـادە*Simple binary form*و شـێوگی دوولایی پێکەڵ*Compound binary form*، مەبەستی سـەرەکی لەم شـێووگانەدا هاوجیاوازیە لە کلیل*Clef*دا کە لە دوو لایی سـادەدا دوو بەشە:ـ
بەشـی یەکەم:ـ دەسـپێکردنی لە دەنگەواری پایەتۆن*Tonic*دا و پاشـان دەوازێتە دەنگەواری زاڵ*Dominant*کە دەبێتە کلیلێکی نوێ، واتەکلیلی دۆ/*C-Clef*ی مێجەر/*Major*دەبێتە کلیلی سـۆڵ مێجەر/*G-Clef* و لا/ی ماینەر/*A-Minor*یش دەبێتە دۆ/ی ماینەر/*C-Minor*،

بەشی دووەم:ـ بە کلیلی نوێ دەسپێدەکات و دەگەڕێتەوە بۆ کلیلی پێشـین، واتە لە کلیلی سـۆڵ مێجەر دەگەڕێتەوە بۆ کلیلی دۆ/C و دۆ ماینەر/یش دەگەڕێتەوە بۆ لا ماینەر. شـێوەی دولایی پێکەڵ کە یەکەم شێوەجووڵە/یشی پێدەوترێت پەرەپێدراوی شـێوەسـادەکەیە و کۆکراوەتەوە کە لە بەشی یەکەمیدا کۆتایی دێت لە کلیلە بنەڕەت*Original key*ەکەوە دووردەکەوێتەوە، بەشی دووەمیانیشی هەر بە هەمان دووركەوتنەوە دەڕوات و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان کلیلی پێشـینی.

ئەم چەشـنەیان کە زیاتر لە دەقە سـۆناتاییەکاندا دەبینرێتەوە بە سـۆناتا شـێوە*Sonata form* ناسراوە.

Bind, Tie(E), Legamento(I) — بەند، پەیوەسـتە، ئەو کەوانەهێڵەی دوو نۆت بەیەکەوە دەبەندێنێت. ئەو هێڵەکەوانەی دوو نۆت بەیەکەوە دەبەندێنێت و دەبنە یەک.



Bindebogen(G), Ligature(E) — کەوانی پەیوەست، بڕوانە/*Slur*.

Bindung(G) — بڕوانە/*Syncopation*.

Biquadro(I), Syncopation with bequadro(E) — بیکوادرۆ، سینکۆپێن بە بیکواردۆ/وە. بڕوانە/*Béquarre*.

Bis(F), Encore(E), Ancora(I) — دوو بارە، جارێکیتر، ڕەپاتکردنەوەی ڕستەمۆزیکێک.

Bis(G), until(E), Jusqu'à(F) — هەتاکو، تا شوێنی دیایکراو.

Bisbigliando(I), Whispering, Soft tremolo on harp(E) — سـۆسەکردن، نەرمەجوولاندنی پەنجەکان بەخێرایی لەسەر ژێیەکانی هارپ.

Biscroma(I),Biscrome,Triple-Croche(F)  — 1/32ی نۆتەیەکی تەواو

Bisdiapason(L), Double octave or fifteenth(E) — دوو ئۆکتاڤ یاخود پانزەیەم.

Bisogna(I), Must, Necessary(E) — بایەتە، پێویستە، دەبێت.

Bisser(F) — بڕوانە/*Bis* .

Bissex(L), Twice six(E) — دووجار شـەش، جووتـشەش کە مەبەست لە گیتاری جووت شـەش ژێ/یە.

Bis unca(L), Semiquaver(E) — 1/16ی نۆتەی تەواو.

Bis zum schluss(G), Until the end(E) — هەتا کۆتایـی.

Bittend(G), Enteating(E) — زارین، نزاوپاڕانەوە.

Bizarramente(I), Strangely(E) — بە ڕەوتاری سـەیر.

Bizarre, Bizarro(I), Strange, Whimsical(E) — سـەیر و نەشـاز.

Blades(E) — گێڕێکی سادەیە لەسەر ژێی هارپ بۆ کۆککردنی تۆنی سروشتی بە نیوەتۆن.

Blasinstrument(G), Wind instrument(E) — ئامێرە فووپیاکەرەکان{هەواییەکان}.

Blatt(G), Reed(E) — ڕیشە، زمانەی ئامێری کلاڕنێت و مانەندی.

Blanche(F), Bianca, Minim(I), Half semibreve, White half note(E) 𝅗𝅥 بلانش.

Blasmusik(G), Blow music(E) ئامێره فووپیاکەرەکان.

Bleckmusik(G) مۆزیک ئامێره هەواییه براس*Brass*یەکان.

Blech(G), Sheet metal(E) شـــیتەمادەنی وەک براس*Brass*.

Blech blas instrumente(G), Blow instrument(E) ئامێره فووپیاکەره براس/یەکان.

Bloc de bois(F), Bois(I), Wood block(E) بلوێری لەدار دروستکراو.

Block(E), Bloquer(F) سـەرەبلوێر*Plug*. ئەو ناواخنه تەختەیەی پشتی ئامێری کەمانچە و خێزانی ڤیۆل*Viol-family*ی لەسـەر بەستراوە. جۆره چەکوشـێکی دەنگ پێهێنەره له پیانۆدا. پارچەیەکی ڕەقه بەسـەری پێڵاوی باللێت*Ballet shoe*ەوە.

Blockflöte(G), Recorder, Fipple flute(E) فلووتی ئینگلیزی، کەتەبلوێری زمانەداری هەشت کون. له خێزانی فلووته که پێیدەوترێت دەستەی ڕیکۆرد*Recorder*ەکان. چەند لوولەیەکی ئۆرگن بەشێوەیەکی هەرەمی و به درێژی 8ft, 4ft, 2ftیاخود16ftکه دەنگێکی فلووت ئاسای دڵنشین بەخشـی هەیه.

Block chords(E) کۆرده بلۆکەکان که تیایدا نۆتەکانی کۆردێکی تەواو*Entire chord*دا له هەمان کاتدا بژەنرێن و بەشـێوەیەکی زنجیرەییش بناخەی هەڵبەستبێت. ئەم شـێوه کۆردانه له مۆزیکی کلێسـەییدا بەکاردەهێنرێت.

Bloss(G), Mere, Merely(E) تەنیا، نەوەک هەر، هیچیتر.

Blow(E), Souffler(F) زاراوەیەکی جاز مۆزیکه که بەمانای سـەرپێـیی*Improvise*دێت.

Bluemel, Bluehmel(G) جۆره مۆزیک ئامێرێکی هەواییه کۆنی ئاڵمانیاییه له خێزانی ترومپێت.

Bluette(F) کۆتایی پارچه مۆزیکێکی درەخشــان و ڕازاوەی ســادە.

Blues(E) بلووز، دەنگێکی ڕەسەنی ئافرۆئامریکاییه، زنجیره کۆردێکی دوانزه باڕییه*twelve-bar*.

Blues music(E) بلووز مۆزیکی قولەڕەشەکانی ئامەریکایه که له سەردەمانێکی زوودا به کۆیلەیی هێنرانه جیهانی نوێ که به ئامەریکا ناودەبرێت، ئەمانه مۆزیکی له چەشنی ڕاگ تایم*Rag time*ی ســەما و جاز*Jazz*ی ڕەزمی/یان وەک کەلتورێکی دێرینیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا. لەدوای نزیکەی ســاڵی1911زدا بەرەبەره بڵاوبووەوه و بایەخی پێدرا. لەسەر دەســـتی مۆزیکزان *Irving Berlin*یەکەم باندی بەناوی ئەلەکســاندەر ڕاگ تایم*Alexander's Rag time Band* دامەزراند. پاشان بەرەبەره جاز مۆزیک ڕەواجی زۆر بوو تا گەیشـته ئەو ئاسـتەی ئێستامان.

Blues notes(E) نۆته بلووزەکان که پێکهاتوون له سـێیەمی بیمۆڵکراو*Flattened third*، پلەکانی حەوتەم و جاروبار پێنجەم له سکێڵی مێجەردا. هەر نۆتەیەک ئارەزووی گۆڕینی هەبێت بۆ پەردەکەی خۆی به مەبەستی دیکۆرێن*Decoration*.

ئەمانەیش چەند نموونەیەکن لە سـکێڵەکانی بلووز*Blues* لەسەر ئامێری پیانۆ:ـ

1. **C Blues scale**
   **C - Eb - F - Gb - G - Bb – C**

2. **G Blues scale**
   **G - Bb - C - Db - D - F - G**

3. **D Blues scale**
   **D - F - G - Ab - A - C – D**
4. **A Blues scale**
   **A - C - D - Eb - E - G - A**

5. **E Blues scale**
   **E - G - A - Bb - B - D - E**
6. **B Blues scale**
   **B - D - E - F - F# - A – B**

7. **F# and Gb Blues scales**
   **F# - A - B - C - C# - E - F#**
   **Gb - A - B - C - Db - E – Gb**
8. **Db and C# Blues scales**
   **Db - E - Gb - G - Ab - B – Db**
   **C# - E - F# - G - G# - B - C#**
9. **Ab Blues scale**
   **Ab - B - Db - D - Eb - Gb – Ab**

10. **Eb Blues scale**
    **Eb - Gb - Ab - A - Bb - Db – Eb**
11. **Bb Blues scale**
    **Bb - Db - Eb - E - F - Ab – Bb**

12. **F Blues scale**
    **F - Ab - Bb - B - C - Eb – F**

Blues scale(E), Scala blues(I) — **سـکێڵی بلووز کە سکێڵێکی شەش نۆتەیە، پێنج نۆتەی سـکێڵ ماینەر پێنجتۆنی+پێنجەمی گەسـتوو** *Diminished 5th* **لەسـەر سـکێڵی پایە** *Tonic scale*.



**سـکێڵی نۆ نۆتە کە پێکهاتووە لە:** *C, D, E flat, E, F, F sharp, G, A, B flat, C*.

Blur, Blul(Kr), Kurdish shepherd flute(E) — **بلوور، بلووول، شـمشـاڵی کوردی شـوان.**

B-major Key(E), H-dur(G), Si-majeur(F), Si-maggiore(I) — **کلیلی سـی ـ مێجەر.**



B-major scale(E) — **سـکێڵی سـی ـ مێجەر.**



B-minor keys(E) کلیله‌کانی سی ـماینەر.



Bobs, Change ringing(E) لێدانی زەنگ تایبەت لە کڵێسە بە چەند دەنگێکی جورانجۆر.

Bocal(F), Bocca(I) پیکی ئامێرە هەواییەکان، بەشی دەمی ئامێرەهەواییەکان.

Bocca chuisa(I), Bouché fermée(F), Mit brummstimme(G) دمدمەکردن بە دەنگ، وزوزەکردن بە ئامێرەهەواییەکان.

Boca ridente(I) ئاوازی لێوبەخەندە.

Boceto(S) هێڵکاری پارچەمۆزیکێک بۆ نمایان و پیشاندان.

Bocchino(I) ئەو مۆزیک ئامێرە براس و تەختە فووپیاکرانەی دەخرێنە سەر لێو.

Bodharm(E) بۆدهارم، ئامێری دەف لە قەوارەیەکی مامناوەندیدا.

Body(E) بەهێزکردنی لەرینەوەی دەنگ ئەویش بە بەکارهێنانی بەشەکانی تەنێک.

Boehm flute(E) بۆیهم فلووت، جۆرە نای/ێکی کانزا زیو کردەیە سالی1834ز لەلایەن فلووتژەنی میونیخ/ئەڵمانیایی تیۆباڵد بۆیهم*Theobald Boehm*.

Boehm system(E) سیستەمی بۆیهم، پێڕەوی بۆیهم کە دەگەڕێتەوە بۆ فلووتژەنی میونیخ/ئەڵمانیایی تیۆباڵد بۆیهم*Theobald Boehm*کە توانای داهێنانی لەو ئامێرەدا خستەڕوو، ئەویش بە هێنانی ئەو جۆرە فلووتە کۆنە بیرازنەکراو*Climsy*و سیستەمە ئاڵۆزەی لە دانانی کونەکانی*Holes*و گۆڕینی بە سیستەم و شێوەیەکی وەها کە زۆر ئاسانبێت بۆ هەڵگرتن و دانانی پەنجەکان. ئەم داهێنانەی لە خێزانی فلووت*Flute Family*دا زۆر بە فراوانی بە جیهانی مۆزیکدا بڵاوبووەوە و بووە مایەی گۆڕانکاری بەسەر ئامێری ئۆبوا*Oboe*و باسسوون*Bassoon*و خێزانی کلاڕنێت. لەدوای سالی**1840**زیەوە ئەم سیستەمە لە وڵاتی ئینگلتەرە پەیڕەوکرا.

Bogen(G), Bow(E) ئارشە، کەوان، هێڵی پەیوەستە∩∪ لەنێوان نۆتەیەک بۆ نۆتەیەکی تر.

Bogenstrich(G) کەوان لێدان.

Bobisation, Bocedisation(E) سیستەمی سۆلفێج کە لە سەتەی شانزەمدا لەلایەن مۆزیکزان هوبەرت وایلڕانت*Hubert Waelrant*دایهێنا و سیلابەکانی بەم شێوەی خوارەوە ڕیزبەندن لەگەڵ بەراوردکردنیان بە سیلابە گویدۆنیەکان*Guidonian syllables*.

| سیلابەکان بە خوێندنەوەی کوردی | دۆ | ڕێ | می | فا | سۆل | لا | سی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Guidonian syllables | *ut* | *re* | *mi* | *fa* | *so* | *la* | *ti* |
| Bobisation syllables | *bo* | *ce* | *di* | *ga* | *lo* | *ma* | *ni* |

Bocal(F), Crook(E) کۆلاپ{قولاب}، لوولەیەکی کانزاییە جووتڕیشی بەستراوە بە تەن*Body*ی ئامێری باسسوون*Bassoon*ەکەوە.

Bocca(I), Bouche(F), Mouth(E) دەم.

Bocca chiusa(I), Bouche fermée(F), Wordless humming(E) زەمزەمەی بێ وشـە.
Brummstimmen(G)

Bocchino(I), Brass instrument mouthpiece(E) ئامێرە براسـە دەمدارەکان.

Bockhorn(E) بووقی چوارکونی دورستکراو لە شاخی گا یاخود بزن کە بە ئامێری شۆفار دەچێت.

Bockstriller, Bleat(E), Crier(F) کزەدەنگ.

Body percussion تەن لێدان، دەنگێک لە تەنێکەوە دەرچێت وەک چەپڵە، شـڵپە، تەپە، زرمە... .

Bogen(G), Bow, Bind, Slur(E) کەوان{تایبەت بە ئامێرە ژێدارەکان}، کەوانی پەیوەست.

Bogen-guitarre(G) بڕوانە/*Arpeggione* .

Bogenstrich(G), Bow stroke(E) کەوان لێدان.

Bohrung(G), Bore of a wind instrument(E) بورِ، کون، کونی ئامێرە هەواییەکان.

Bios(F), Wood(E) تەختە، مەبەسـت لە ئامێرە تەختە فووپیاکەرەکانە.

Bombard(E), Pommer(G) ژمارەیەکی زۆر لە{تۆنی تینۆر و باس}ئامێری شـاوم*Shawm*.

Bombardone(I) گەورەترین ژمارە بە دەستەی بۆمبارد*Bombard family*.

Bombix(Gr) بۆمبیکس، ئامێری ڕیشەدار.

Bon temps de la measure(F), The accented part of a bar(E) بەشی ئاکسنت لە باڕێکدا.

Bones(E) بۆنێس، ئامێرێکی ڕەزمی کە سـەرەتا سـاڵانی سـەتەی نۆزدەم پێسترِەشەکانی ئافریکا لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەریتانیا و ئامریکایان هێنا، پێکهاتووە لە دوو پارچە ئێسـکی گیانلەبەران لە شـێوەی کاسـتانێتی ئیسـپانیایی *Spanish Castanet*.

Bongoes(E) بۆنگۆز، تەپڵۆک{تەپڵی بچووک}ی کووبا*Cuba*یی کە دووانی پێکەوەبەسـتراوە و زیاتر بە پەنجەکان لێدەدرێت.

Boogie-Woogie(E) بووگیی ـ ووگیی، چەشنێکی لە مۆزیکی بلووز پیانۆ*Blues piano style* کە لە دوای نزیکەی سـاڵانی1940زیەوە بووە چەشنێکی زۆر باو و میللی. لەو ئامێرانەی کە تیایدا بەکاردەهێنرێت یەک پیانۆ یاخود سـێ پیانۆ پێکەوە، گیتار. تایبەتمەندی ئەم چەشنە لەوەدایە کە لەسـەر هێڵەباس*Basslines*کان و لەسـەر کێشی4/4 بە هەشتیەک نۆتەیی*Quaver*دەنۆتێنرێت و بە دەستەچەپ دەژەنرێت لەکاتێکدا تریللە*Trills*کان و دیکۆراندن*Decorations*ەکان بەدەستە ڕاست بەئەنجامدەدرێت ، وەک لەم نموونەیەدا:ـ

Borioso(I), Snobbish(E) بە شـانوشـەوکەت، خۆنمایی.

Boriosamente(I) شـکۆمەندی.

Borre, Borry, Borea(I), Bourée(F,I) سـەمایەکی فەرەنسایی سـاڵەکانی سەتەی هەڤدەمە، ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ سەمایەکی باسک/ئەسپانیا بەناوی بیسکایا*Biscaye*یە کە دەچێتەوەسەر کێشی 2/4 ، 3/4 و جاروباریش لەسەر کێشی 2/2.

Bout(F), End(E), Finire(I) کۆتایی.

Boutade(F) **سـەمای سـەرپێیی.**

Borrowed chord(E) **کۆردی بارمتەکراو، بەکارهێنانی کۆردێک نە دیاتۆنیک بێت لەبری کۆردێک***Substitution chord* **لە کلیلێکی جیاواز بۆ کارێک.**

Borrowed division(E) **دابەشە بارمتەکراو. زاراوەیەکە بۆ فرۆزەکردنی نۆتەیەک کە دابەشبکرێت بۆ دوو نۆتەی بچووکی نائاسـایی. بۆ نموونە سـێ کرۆش***Quarter notes***بخرێتەسـەر ڕەزمی بلانش***Blanche***وەک تریپلێت***Triplet***ێک.**

Bouchée trompette(F), Muted trumpet(E) **ترومپێتی کپـیو.**

Bourdon(E) **بۆردۆن، مەشـکەی ئامێری مەشکەنای***Bagpipe*. **نزمە دەنگی بۆری ئۆرگن، زرنگانەوە ژێـی ئامێری هوردی ـ گوردی. نزمترین ژێی ئامێری عوود، کەمانچە، چێلو و دەبڵ باس.**

Bouzouki, Buzuq(Gr,Tr) **بوزوق، بوزوک، ئامێرژێدارێکی میللی یۆنانییە کە تاڕادەیەک بە ئامێری سـازدەچێت دوو جۆری هەیە، یەکێکیان سـێتار***Trichordo***ی جووت بە تۆنی***D3/D4 A3 D4* **، ئەویتریان چوارتار***Tetrachordo***ی جووت بە تۆنی***C3 F3 A3 D4* .

Bow(E), Arc(F) **کەوان، ئارشـە، شوولێکی باریکە و بەزۆری یاڵی ئەسپ کە لە هەردووسەری بەستراوە و دەخشێنرێت بەسەر ژێیەکاندا، کەوانی مۆدێرن لە ڕیشاڵی نایلۆن دروستدەکرێت. لێدانێکی تەکنیکیە بە کەوان لەسـەر ژێی ئامێرێک{ئەوانەی بە خشـاندنی کەوان بەسەر ژێ/یاندا دەنگێکی دیاریکراو دەردەچێت، بە سـەری ڕاست هێمای ┌──┐ و بە سـەری چەپـی هێمای^ دیاریدەکرێت.**

Bow-arm, Bow-hand(E) **باڵی کەوان یاخود دەسـتە کەوان کە مەبەست دەسـتی ڕاسـتە کە کەوانەکە هەڵدەگرێت.**

Bowed instruments(E), Stromenti da corda(I) **ئامێرە ژێدارەکان.**

Bowgrace(E) **کەوانـداز مەبەست لە جووڵاندنی کەوانە بەدەستی ڕاست بەسەر ژێ/یەکاندا بەشێوەیەکی جوان و هەنداز.**

Bowing(E) **کەوانەکردن، خوێندنەوەی نۆتەکان بەپێی ئەو هێمایانەی بەشێوەی کەوانە ئاماژەیان پێدەدرێت و ئاڕاستە***Direction***کانیان دیاریدەکرێت. ئەو زاراوە ئاڕاستانەیش بریتین لە:ـ**

1. **لێگاتۆ***Legato*....**کۆمەڵە نۆتەیەک بە کەوانی تەواو بژەنرێت بەشێوەیەکی نەرم.**
2. **سـتاکاتـۆ***Staccato*...**کورتە کەوان{نۆتەکان نیوە بن} بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە و بە هێمای دۆت***Dot***{خاڵ، پنت}لەسـەر نۆتەکان ئاماژەی پێدەدرێت.**
3. **سـپیکاتـۆ***Spiccato*....**هێنانوبردنی کەوان ژێدا زۆر بە خێرایی***Slurred staccato*.
4. **دیتاچێ***Detaché*....**پەڕینەوە***Cross***یەکە لەنێوان لێگاتۆ و ستاکاتۆ، بە هێمای هێڵێک چ لەسەر نۆتەکە چ لەژێری نۆتەکە ئاماژەی پێدەدرێت.**
5. **لۆورێ***Louré*....**زنجیرە نۆتەیەک بەسادەیی و بەجیا بەهەمان پیاهێنای کەوان، وەک دیتاچێ وایە بەڵام ئەمیان بەستن***Slur***ی دەوێت.**

6. مارکاتۆ*Marcato*....قورس، لێدانی جیاجیا بە نزیک پاژنە*Heel*ی کەوان لەگەڵ ئاکسنتێکی پەستیو*Pressed accent*.
7. جەتێ*Jeté*....هێنانوبردنی سەری کەوانەکە بە ستاکاتۆ بەستن*Slurred Staccato*.
8. تریمۆلۆ*Tremolo*...زۆر خێرا هێنانوبردنی کەوان بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە.
9. کۆل لێگنۆ*Col legno*....بەکارهێنانی بەشی سەرەوەی کەوانەکە بەرەوخوارەوە.
10. پۆنتیشێللۆ*Ponticello*...بردنی کەوانەکە نزیک بە پرد*Bridge*ی ژێر ژێیەکان بۆ هێنانی دەنگێکی کز.
11. سول تاستۆ*Sul tasto*....پیابردنی کەوانەکە بەسەر دەسک*Fingerboard*دا{ئەو شوێنەی پەنجەکانی لەسەر دادەنرێت}بۆ هێنانی دەنگێکی تەنگ و تەمین*Hazy*.
12. فلاوتاندۆ*Flautando*....پیابردنی کەوانەکە نزیک بە دەسکەکەدا بۆ هێنانی دەنگێکی وەک ئامێری فلووت.
13. گلیساندۆ*Glissando or portamento*....خلیسکاندن لە نۆتەیەکەوە بۆ نۆتەیەکیتر، بە هێمای هێڵێک لەنێوان نۆتەکاندا ئاماژەی پێدەدرێت.
14. لەسەر تۆنی سۆڵ/*Sul G*....ژەنینی نۆتەکان لەسەر ژێی سۆڵ، دەشێت لەسەر هەر ژێیەکی تربێت وەک لەسەر تۆنی لا/*Sul A*...وەهەروەها.

***Bpm*** کورتکراوەی/*Beats per minute*، لێدان لە خولەکێکدا بۆ پێوانی تێمپۆ.

B quadratum, B quadrum(L), Note B-natural(E) سروشتە تۆنی سی/B.

Braccio(I), Of the arm(E) دانانی ئەو ئامێرانەی دەخرێتەسەرشان و ژێرچەناگە.

Bras(F), Arm(E) باڵ، باسک.

Brass, Bronze(E) دارشتەی براس پێکهاتوو لە کانزای مس و خارسین.

Brass band(E) براس باند، باندی ئامێرە هەواییە دروستکراوەکان لە دارشتەی براس کە ڕیشەیان نیە وەک تووبا، ترومپێت، ترۆمبۆن.... .

Bratsche(G), Viola(E) ڤیۆلا، کەمانچەی ئاڵتۆ.

Brace(E), Graffa(I) ستوونەهێڵ بۆ لێکدانی دوو سکێڵ لەژێر یەکتردا بە هێمای} یاخود بە هێمای ].



Bratschenschlüssel(G), Viola clef, Alto clef(E) کلیلی ڤیۆلا، کلیلی ئاڵتۆ .

Broutlied(G), Bridal song(E) سترانی زەماوەند.

Bravo, Bravissimo(I), Brave, Well done(E) نەبەرد، ئافەرین.

Bravoure(F), Bravour(G), Bravura(I), Skill(E) نەبەردی.

Break(E) جۆرێک لە کورتە کادەنس*Brief candanza*کە لە جاز*Jazz* دا بەکارە، گۆڕینی

دەنگەوارێک بۆ دەنگەوارێکیتر وەک تینۆر، ســـۆپرانۆ، ئالتۆ بەلام باس نیەتی. هەلوێستەیەک لەنێوان تۆنێکی نزم و تۆنێکە بەرز، بۆ نموونە لە ئامێری کلارِنێت، فلووت دەوترێت هەلوێستە لەسەر کلارِنێت{بۆ نموونە} نێوان ســی بیمۆل و ســی سروشتە لەسەر سـێیەم هێلی کلیلی سۆل*Treble clef*.

Breath mark(E) — نیشانەی هەنسک کە لە سـەروو هێلاسۆ*Stave*دادەنرێت

ئاماژەیە بۆ هەلوێسـتە*Break*یەکی کورت بەئەندازەی هەناسـەیەک کە مۆزیکدانەر پێویستێتی بۆ دەربرِینی ئەو رِستەیەی کە دەخوازێت دیاربێت.

Breit(G), Largo(I), Broad(E) — بەرین، پان.

Breve(L,S), Short, Double Whole-note(E) — بیف، بریف، کورت، (|𝅜|)

لە مۆزیک نۆتێن*Musical notation*دا یەکسانە بە دوو نۆتەی تەواو*Whole-note*. هاودەمانی بریڤیس*Brevis*ی رِۆژگارانی سەتەی سیانزەمە کە لە شـێوەی دا بووە.

Breve rest(L), Short pause(E) — کورتە وچان، وچانە بریف، یەکسـانە بە دوو نۆتەی تەواو*Double whole note*.

Brevis, Breve(L), Short(E) — بریڤیس زاراویەکی رِۆژگارانی سـەتەی سـیانزەمە کە بەمانای کورتەنۆتە دێت، برِوانە/*Breve*.

Brevemente(I), Brief(E) — کورت.

Brevissimo(I) — زۆر بە کورتی.

Bridge, Carpette(F) — پرد، دامە، خەرەک، ئەو پارچە تەختەیەی ژێیەکانی بەسـەردا دەبرێت و دەبێتەهۆی گەیاندن و گەوراندنی دەنگ لەناو ســنگی ئامێرەژێدارەکان.

Bridge passage(E) — رِابوردەی لاوەکی، پاســاوی لاوەکی کە دوو بابەت*Subject*بەیەکەوە دەبەسـتێتەوە.

Brillante(F,I), Brilliant, Vivacity(E) — شــادی و درەوشــانیی.

Brillantemente(I) — شــادی و درەوشــەند.

Brillantissimo(I) — زۆر شـاد و درەوشەن.

Brindisi(I), Drinking song(E) — ئاوازی مەســتانە.

Brio(I), Free, Vigour(E) — ئازاد، گەرموگورِ، توند.

Brioso(I) — بە گەرموگورِی، توند و بەجۆش.

Briosissimo(I) — زۆر بە جۆش و زولاڵ.

Brisé(F), Broken, Detached(E) — شـکاو وەک لە ئارپێجیو*Arpeggio*دا بەکاردێت، ژەنینی کورت لە کەمانچەدا بەشـێوەیەکی کەوان لێدانێکی ناپەیوەستە*Detached bow strokes*.

Broderie(F) — نۆتەی لاوەکی بۆ رِازانەوە. برِوانە/*Auxiliary note*.

Broken Chord(E), Accord Arpège(F) — شـکسـتە کۆرد، ئاکۆردی نەشــاز*Discord*



کۆردێکی زۆر باوە، نۆتەکانی تاکە تاکە بەدوای یەکدا دێن. زیاتر لە کۆردی زاڵ حەوتەمـدا*Dominant seventh*دا

بەدیدەکرێت کە پێکهاتووە لە تۆنی زاڵ لەگەڵ سێیەم و پێنجەم و حەوتەمیدا، بۆ نموونە لە کلیلی/C وە کۆردەکە لە G-B-D-Fپێکدێت.

Broken consort, Broken Music(E) شکستە کۆنسۆرت، کۆنسۆرت...وشەیەکی کۆنی ئینگلیزییە و دوایی بۆتە کۆنسێرت*Concert*، شێوەی ئەم کۆنسۆرتە دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی شانزەم و هەڤدەم، لەو سەردەمانەدا گروپی ژەنیاران یەک جۆر ئامێریان دەژەند بۆ پێشکەشکردنی کۆنسۆرتێک. واتە یان لە ئامێرە فووپیاکەرەکان یاخود لە ژێدارەکان.

Broken octave(E) شکستە ئۆکتاڤ. لەباری ئاسایی*Normal*دا نزمترین ئۆکتاڤی لە تۆنی/Cیەوە دەسپێبکات و بە تۆنی/Cی تەواو دەبێت، ئەو تۆنە نزمەی دۆ/Cیەیش کە نابێت تیژبێت دەبێتە ژێدەرێک بۆ تۆنی/Aی خوارەوە. لە سەرەتای سەتەی نۆزدەمەو ئەم جۆرە ئۆکتاڤە تەواو ئاستەنکراوە و کاری پێناکرێت.

Broken time(E) ڕەزمی شکاو. چوونەناوییەکی چەند کورتە بەشێکە{بەگشتی باڕ*Bar*ێکە یاخود دوان} لە ڕەزمێکی جیاوازدا بۆ نموونە کێشی7/8یاخود 13/16.

Bruit(F), Noise(E) لەنگە دەنگ، دەنگی ناهەموار، هەراوهوریا.

Brume, Buée(F), Mist(E) پۆشیو، لێڵ، نادیار.

Brummstimmen(G) دەنگ کپکردن.

Bruscamente(I), Short and abruptly, Brusquely(E) کورت و کتوپڕ، ئاکسنتێکی توند.

Brushes(E) دەسکەفڵچە، بڕوشە، دەسکی تەپڵ لێدان کە سەرێکی شێوەفڵچەیی کانزاییە کە بە پیاکێشانی بەسەر تەپڵەکەدا دەنگێکی نەرم دەدات.

Bruststimme(G), Chest voice(E) دەنگی دەرهاتووی پیشخواردوو لە سنگەوە.

B-sharp(E), His(G) سی ـ دێز.



B-sharp major(E) سکێلی سی دێز ـ مێجەر.



Buccia(L), Bugle(E) بووکسیا، بووق، گوایە جۆرە بووقێکی سەردەمی جەنگی خاچدروشمەکان بووە کە ئاروپاییەکان بە زوانی لاتینی بەم ناوە گۆیان پێکردووە.

Boccolico(I, Buccolique(F) ), Rustic(E) ڕۆستەکی، گوندەکی.

Buffet(E,F) کیف، هەگبە بۆ هەڵگرتنی پارچەی ئۆرگن.

Buffo, Buffa(I), Comic(E) شۆخی و گاڵتە، کۆمیک.

Buffoneggiando(I) بە شۆخی و گاڵتەکی.

Buffonesco(I) گاڵتەی پێکەنینی.

Bugle(E),Clairon(F), Signal horn(G), Cornetta segnale(I) بووگڵ، بووق. بووقی لە مس سازکردە کە لە دوو تا شەش دەنگی پێلێدەدرێت.

Bugle calls(E) بووقی بانگ له ســـەربازیدا بە مەبەستی بێدارکردنەوە بەکاردەهێنرێت.

Buisine(E) ئامێرێکی هەوایی دروستکراو لە مادەنی براس{ڕێژەی کانزای زیو/ی تیادا زیاترە}کە بە ترۆمپێت دەچێت. لە سەتەکانی ناوەڕاستدا درێژیەکەی لەنێوان یەک مەتر بۆ دوو مەتر بووە.

Bull fiddle, Double bass(E) کەمانچەی دەبڵ باس.

Bull roarer, Thunder stick(E), Schwirrhölzer(G) گرمەدار، سـەردەمێکی زۆر دێریندا ســـوورەهیندی و ئافریکاییەکان لە سـرۆتی تایبەتیدا بۆ بەجۆش هەستاندنیان لە بۆنەی دینی و دونیایاندا، ئێســـتا بەشـێوەیەکی هونەریانە لە بەرهەمە مۆزیکیەکاندا بەدیدەکرێت.

Bund(G), Bind(E) پەردە، بەند. بڕوانە/*Fret*.

Buonaccordo(I), Small spinet(E) جۆرە پیانۆیەکی بچووک تایبەتە بۆ منداڵان.

Buona nota(I), Accent note(E) نۆتەی دروست و ئاکســـنت*Accent*.

Burden, Burthen, Refrain(E,F) ویرد، وتـنەوەی سـەرزمان.

Burla(I), Joke(E) گاڵتە و شـــۆخیکردن.

Burlando(I) بە شـــۆخی و گاڵتە.

Burletta, Burlesco(I), Musical frace(E) مۆزیکی پێکەنین و شـــۆخیانە.

Burlesque symphonie(I) ســـیمفۆنی شـــۆخی.

Buselik(Ar,Fa,Kr,Tr) بوسەلیک،

پێدەچێت وشـەیەکی زۆر دێرینی یۆنانی بێت. یەکێکیشە لەو هەشـت دەسگایەی کاتی خۆی فەیلەسوفی یۆنانی فیسـاگۆرس*Pithagoros*دایهێنابوو و کردبوویشیە یەکێک لە کەڵوە گەردوونیەکان{بورجی فەلەکی}بەناوی کەڵوی تەرازوو{یەکێکە لەو دوانزە بازنە گەردوونیەی کە بەختی لێوەڕا دەخوێنرێتەوە}، وشــەکەیـش گوایە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئەو غولامەی کە لە خزمەتکردنی فیسـاگۆرس/دا بووە{ئەم جۆرە ئاکارە لەنێو ماڵەخانەدانەکاندا چ وەک خزمەتکار لە شـار و چ وەک ڕەنجبەر لە لادێکاندا باوبووە، ئێســـتا ئەمە زۆر کەمبۆتەوە}.

بوسەلیک....لێرشـتەیەکی سـەربە دەسـگای نەهاوەندە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی نەهاوەند لەســـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی، گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی نەوا.سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشـی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی ئەویش بە گۆڕینی پلەتۆنی شاناز{دۆ دێز$C^{\#}$}بە پلەتۆنی گردان{دۆ بـێکار}، ڕەگەزی نەهاوەند لەسـەر پلەتۆی نەوا، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




Button(E), Bottone(I) دوگمە{گیرە}ی ژێر ئامێری کەمانچە کە تەلەکانی لێتوندەکرێت.

Bühne(G), Stage(E), Scena(I), Stade(F) شـــانۆ.

Byzantine music notes(E)

مۆزیک نۆتەی بیزەنتی کە لە کلێسەکانی ســەردەمی ئیمپراتۆریێتی بیزەنتی/دا برەوی هەبووە.

| C | D | E | F | G | A | B |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Pa | Vu | Ga | Di | Ke | Zo | Ni |



باســـوون/ فاگــوت
Fagott/Bassoon



بوزوک
Buzuq

-------------------------------------

-----------------------

------------



کلارنێت/کەرەنای
Clarinet

# C



چێللۆ
Cello



کلاڤیار پیانۆ
Claviar piano



کۆرنێت
Cornet



کرۆوت
Crwth



ساج/سەنج
Cymbal



یەکەم نوتە (پایە Tonic)لە سکێلی دۆ مێجەر.
Do(I), C-natural(E,G), Ut(F)
$C_1$ C c $c^1$ $c^2$ $c^3$ $c^4$ $c^5$
Hz: 32.703 65.406 130.81 261.63 523.25 1046.50 2093.00 4186.00
Middle C




Di(I), C-sharp(E), Cis(G)
$C\#_1$ C# c# $c\#^1$ $c\#^2$ $c\#^3$ $c\#^4$ $c\#^5$
Hz: 34.648 69.296 138.59 277.18 554.36 1108.73 2217.46 4434.92
Middle C

# C

یەکەم دەنگێک کە مرۆڤ پێی ئاشنابێت.... ترپەی دڵی دایکە!!!

پەندی دانایان

---

C(E,G), Do(I), Ut(F) نۆتەی دۆ*Do*ی دیاتۆنیک*Diatonic*.



یەکەم نۆتەیە لە سکێڵی مێجەر بەپێی سیستەمی سۆلفێج. بەپیتی گەورەی C هێمایەکە بۆ کێشی4/4.

C دۆ/*Do*...بە پیتی گەورەی لاتینی/*C* ئاماژەیە بۆ کۆردی دۆـ مێجەرسیانیی*C-major triad*.

c دۆ/*Do*...بە پیتی بچووکی لاتینی/*c* ئاماژەیە بۆ کۆردی دۆـ ماینەر سیانیی*C-minor triad*.

Cabaletta, Cabbaletta(I), Couplet(E) هەندێکجار دەبێتە سەرناوی کورتە ئاریا*Aria*یەکی سادە و ڕەزمێکی دڵتەنگی و ڕەپاتکردنەوە بە گشتی، میلۆدییەکی سادەیە بە هاویاری ڕەزمێکی تریۆلێت*Triolet*ی. چەشنە ئاوازێکی ئۆپێراییە بە فۆرمی ڕۆندۆ*Rondo form*.

Cabaret(F) کابارێت،یانەی شەوان*Nightclub*ی ڕابواردن کە دەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی نێوان1930-1880ز بە تایبەتی لە شارەکانی پاریس و بەرلین.

Cabinet d'orgue(F), Organ case(E) سنووقی ئۆرگن.

Cabinet organ(E) هارمۆنیۆم*Harmonium*، یاخود میلۆدیۆم(*Melodeon*(*Melodium*، گچکە ئۆرگی وەستاو باربەر{واتە بەئاسانی باردەکرێت و دەگوێزرێتەوە و بەدەم ڕێوە دەژەنرێت}ناسراو بە ئۆرگی ئامریکایی*American organ*کە کۆمپانیای ئەلێکساندەر هارمۆنیۆم ساڵی1834ز دایهێنا.

Cabiscola(L), Choir leader(E) ڕابەری ئاوازخوانان{کۆرس}.

Cabrette(I), Cheverette(F) جۆرە مەشکەنای/ێکی یەک ئۆکتاڤی فەڕەنسایی زۆر کۆنە.

Caccia(I), Chase, Hunt(E) جۆرە ئاوازێکی تایبەتە بە ڕاوشکار کە بەزۆری ئامێری هۆڕن یاخود ئۆبوا بەکاردەهێنرێت.

Cacofonia(I), Cacophonie(F), Cacophony(E) کاکۆفۆنیا، دەنگی نەساز و ناگونجاو.

Cacophonique(F), Cacophonous, Discordant, Dissonant(E) نەساز، نەگونجاو.

Cadence(E,F), Cadenza(I), Kadenz(G), Close, Fall(E) کادەنس، بەستن، کەوتە.

ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی کادێنشیا*Cadentia*ی لاتینی کە بەمانای کەوتن*Falling*دێت واتە کۆتایی پێکهێنانی پارچە مۆزیکێکی میلۆدیی*Melody* یاخود هارمۆنی*Harmony* بە کەوتنەوەی

تۆنێک کە پێناسـەی ئەو پارچە مۆزیکە بدات. لێکدانەوەی زاراوەزانیی*Terminology*سـەردەمی ئێسـتا ئەم وشـەیە وەک مۆزیکزاراوەیەک وا لێکدەدرێتەوە کە هەر ئاوازێک چ لە شـێوەی میلۆدیدا بێت یاخود هارمۆنـی، دەبێت کۆتاییەکەی بە ڕستەیەکـی*Phrase*مۆزیکـی بکەوێتەوە، یاخود بڵێین گیرسـانەوەی ئەو ئاوازە بۆ باری کڕبوون*Stable*ی، ئەویش بە بەسـتن{داخستن}و کەوتنەوەی بە کۆتاییەک، داخستنی ئەو کەوتە*Fall*یەیش پێیدەوترێت کادەنس. لە مۆزیکی جاز*Jazz*دا بە خۆگەڕانەوە*Turnaround*ناودەبرێت. بڕوانە/*Turnaround*.

نیگارێکی گشتی لە کادەنس:ـ




بەپێی ڕێساکانی مۆزیک دەشێت کادەنس بۆ چوار جۆری سـەرەکیەوە بپۆلێنرێت:ـ

1. بنیادە کادەنس*Authentic cadence* یاخود جێگیر. ئەم جۆرە دوو پەلی لێدەبێتەوە:ـ

**a.** بنیادە کادەنسی تەواو{دروست}*Perfect authentic cadence*

هەندێک هاومانای تریشـی هەیە وەک پڕبەسـتە*Full close*، پایانە کادەنس *Final cadence*، تەواوە کادەنس*Complete cadence*، گشتگرە کادەنس*Whole cadence*.




کۆردەکان*Chord* لە جێی ڕەگدان*Root position*، ڕەگەکانیش لە هەردوو کۆردەکەدا لە جێگای باس*Bass*دان و ڕەگی دواکۆرد*Final chord*یش لە بەرزترین دەنگیدا دەبێت. ئەمەیان بەگشتی بە بەهێزترین جۆری کادەنس دادەنرێت.

**b.** بنیادە کادەنسی ناتەواو*Imperfect authentic cadence*کە هەندێک هاومانای تریشـی هەیە وەک زاڵە کادەنـس*Dominant cadence*، نیوبەسـتە کادەنس *Half close cadence*، نیمچە کادەنس*Semi cadence, Demi cadence*، یاخود فریوەکادەنس *False cadence*، یەکێک لە کۆردەکان یاخود هەردووکیان هەڵدەگێڕدرێنەوە*Inverted*{نەوەک ڕەگەتۆن*Root-tone*کە وەکو خۆی دەمێنێتەوە}، ڕەگی دواکۆرد*Final chord*لە بەرزترین دەنگیدا نابێت دەبێت. هەندێجار نیوبەستە کادەنس بۆ پلاگاڵ کادەنس کاریپێدەکرێت ئەویش لەکاتێکـدا کە کۆردەکە لە جێی ڕەگـدا نەبێت یاخود میلۆدییەکە بە پایەتۆن*Tonic*کۆتایی نەیەت.

2. نیوەکادەنس{ناتەواوە کادەنس}*Half(imperfect)cadence*،کادەنسـێک کە بە کۆردی زاڵ/V، کۆردی ڕەگ یاخود هەر کۆردێکیـتر کۆتاییەکەی بێت.



جۆرێکی تر لە نیوەکادەنس*Half-cadence* هەیە کە کادەنسێکی نابنیادە*Not authentic* و تەنیا لە کلیلەکانیماینەردا هەیە....پێیدەوترێت فریجیەن کادەنس*Phrygian cadence*. کە دانانی دەگەڕێتەوە بۆ ســەردەمەکانی چەرخی باڕۆک*Baroque time*. دەشێت یەکەم هەڵگەڕاوە




ژێرزاڵ$IV^6$*First inversion of Subdominant-*ی ماینەرکۆردی لا/A/{c-E-A}بێت بەرەو زاڵ*Dominant(V)*ی کۆردی ســی بیمۆڵ ـ مێجەر*B-major chord*{یاخود سـی ـ ڕێ دیێز ـ فا دێز$B-D^\#-F^\#$}.

3. پلاگاڵی بنیادە کادەنس*Plagal authentic cadence*، کادەنسـێکی ئایینیە و لە سـرۆتە کڵێسـەییەکاندا زۆر باوە. هەندێک هاومانای تریشی هەیە وەک




کڵێسە کادەنس*Church cadence*،
ئامینە کادەنس*Amen cadence*،
تەواوە کادەنس*Complete cadence*،
ڕاسـتە کادەنس *True plagal*یاخود یۆنانیـیە کادەنس*Greek cadence*.

4. نابنیادە{پچڕپچڕە}کادەنس *Deceptive non-authenic(Interrupted)cadence*،




پێکهاتوە لە کۆردی زاڵV بۆ هەر کۆردێکیــتر بێجگە لە پایەتۆنیّ/I. بۆ نموونە:ـ لە کۆردی سـۆڵ مێجەر *G-major chord(G-B-D)*بەرەو سـەرزاڵ*Superdominant(VI)*ماینەر کۆردی/لا *A-minor(A-C-E)*دەجووڵێت.

هەندێک هاومانای تریشی هەیە وەک کادەنسی ناڕێک*Irregular cadence* ، دوورخراوە کادەنـس *Avoided cadence*، شـکستە کادەنـس *Broken cadence*، فریوە کادەنـس*False cadence*، سـوڕهێنە کادەنـس*Surprise cadence* و کتوپڕە کادەنـس*Abrupt cadence*. کۆردی ئەم جۆرەیان لاوازترین کادەنســە چونکە لە کۆتایی پێهێناندا هەسـت بە هەڵاویزە کۆرد *Suspension chord* و ناچاوەڕوانکراو دەکرێت.




هەندێک کادەنـسی تر هەن لەوانەیــش:ـ

* هارمۆنیە کادەنـس *Harmonic(Armonica) cadence* بریتیە لە زنجیرە کۆردێک،

* بنیادە کادەنسـی تێهەڵکێـش*Mixture authentic cadence*....لە دوو زنجێرە یاخود زیاتر پێکهاتووە کە هەردووکیان ئەوەندەیش پێویست نین*Superfluous*. بۆ نموونە: **V-VI-V-I** .

* ڕادیکاڵە کادەنس*Radical cadence*....هەر کۆردێک کە لە جێی ڕەگ و باسـدا بێت.

* هەڵگێڕاوە کادەنس*Inverted cadence*....بۆ کادەنسی تەواو و ناتەواو کاریپێدەکرێت کە دەبێت کۆتاییەکەی لە هەردووکیاندا بە هەڵگێڕاو بـێت{نەوەک لە ڕەگەتۆنەوە*Root-tone*}.

کادەنس...بەپێی توندی و نیانی/یشی بۆ دوو جۆر دەپۆلێنرێت:ـ

1. نێرینەکادەنس*Masculine cadence*...لێدانێکی بەرەوخوار*Downbeat*ی هەیە کە بە لێدانێکی بەهێز دادەنرێت.
2. مێیینەکادەنس*Feminine cadence*.....لێدانێکی ناسکئامێزە و بە لێدانێکی لاواز دادەنرێت{پاش ئاپۆجیاتۆرا*Appoggiatur* یەکی درێژ}.




ئەو کادەنسەی کە زۆر باوە و لە دانراوە*Composition* مۆزیکاییەکاندا بەکاردەهێنرێت جۆری بنیادە کادەنسی تەواو*Perfect authentic cadence*.

Cadenza(I) کادەنزا. لە تەکنیک زاراوەی ئینگلیزیدا بەمانای ڕازانەوە و گوڵین*Flourish*ی پێش کادەنس دێت ئەویش لەسەر کۆردێک کە بە شەش-چوار لەسەر زاڵ*Dominant*دەسپێدەکات کە دەکاتە دووەم هەڵگەڕاوە لە پایەکۆرد*Tonic Chord*دا.

Cadenzato(I), Rhythmic cedenced (E) ڕەزمی بە کادەنسکراو.

Cadence boucle(F), Turnaround, Turnback(E) گەڕانەوە.

Cadence évitée(F), Avoided cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.

Cadence imparfaite, Cadence irrégulière(F),Imperfect cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.

Cadence interrompue(F), Interrupted cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.
Cadenza sfuggita(I)

Cadence pleine(F), Full cadence(E) پڕە کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

شەکانەوەیەک*Shake*کە بە یاوەرەنۆتە*Auxiliary note*ی سەرەوە وەک درێژە ئاپۆجیاتۆرا *Long appogioatura*یەک پێشگری بکرێت.

Cadence rompue(F), 'Broken or Deceptive cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.
Cadenza d'inganno,Cadenza finta (I)

Caisse(F), Drum, Box(E) تەپڵ.

Caisse Claire(F), Snare drum(E) دومبک، گچکەتەپڵ، تەپڵۆکە.

Caisse grosse(F), Bass drum(E) باسە تەپڵ، تەپڵی گڕ.

Caisse roulante(F), Side drum(E) تەپڵی یەکلا.

Caisse sourde(F), Tenor drum(E) تینۆرە تەپڵ.

Calamus(L), Reed pipe(E) زوڕنای سەردەمانێکی دێرین بە سێ یاخود چوار کونەپەنجە لە جۆری ئامێرە زوڕنای شاوم*Shawm*.

Calando(I), Lowering(E) کالاندۆ، *.Cal*کورتکراوەیەتی، بەرزکردنەوەی دەنگ و لە هەمان کاتدا کەمکردنەوەی تێمپۆ.

Calandrone(L) ئامێری کالاندۆ بە مەشکەیەکی بچووکەوە بۆ پیشخواردنەوە.

Calcando(I), Accelerando, Hurring in time(E) پەلە، خێرایی لە تێمپۆدا.

Calmando, Calmandosi(I), Growing calm(E) بەرەو هێمنی.
Calmato(I), Calmed, Calming(E) هێمنکراو، هێمنکردنەوە.
Calme(F), Calm(E) هێمن.
Calore(I), Heat, Passion(E) بەجۆش و گەرم، کالۆریَ.
Caloroso(I) بە بژێوی و گەرمی.
Cambiare(I), To change(E) بگۆردرێت، گۆڕینی ئامێرێک بە ئامێرێکی ژێدار.
Cambiata(I), Change in counterpoint(E) گۆڕاو، گۆڕین لە کۆنتراپۆنت/دا، ئاخنینی تۆنێکی ناهارمۆن لەنێوان ناساز*Dissonance* و تۆنە شیکراوەکەی*Resolution*دا.
Camera(I), Chamber(E) هۆڵ{ســالۆنی بچووک}، کۆنسـێرتی بچووک، ئاهەنگی تایبەت کە لە هۆڵێکدا بکرێت.
Camerata(I), Society(E) کامێراتا، جڤاتی نووسەران و مۆزیکزانان لە دوا سەتەی/16.
Camminando(I), Walking(E) پیاســە. لە ڕیشە وشەی کامیناریَ*Camminare*ی ئیتالیاییەوە هاتووە کە بەمانای پیاسە دێت. هاومانای ئاندانتیَ*Andante*یە.
Campana, Campane(I), Bell(E) زەنگ{لەو جۆرەی کە لە ئۆرکێســترا بەکاردەهێنرێت}.
Campagnuolo(I), Rustic, Pastoral(E) ڕۆســتایی، شــوانی، پاســتۆراڵی.
Campana(I), Bell(E) زەنگ.
Campana Tubolare(I), Cloches Tubulaires(F) لوولەزەنگ، بریتیە لە چەند لوولەیەکی نیوئۆکتاڤ{لە تۆنی*Do*تاکو تۆنی*Fa* بە نیوەتۆنەکانیشــیەوە}.
Campanella(I), Little bell(E) زەنگۆڵە، گچکەزەنگ.
Campanetta(I), Set of bells, Carillon(E) دەستەیەک لە زەنگ. کاریللۆن.
Campanile(I) زەنگی کەڵو{بورجی کڵێسە}.
Campanology(E) زانســتی زەنگ، زەنگزانیی.

لە ڕۆژگارێکی زۆر دێرینەوە زەنگ ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەبووە ژیاندا، لە کڵێســەکاندا وەک ســیمبولێکی بانگێشــتن زۆر بایەخیان پێداوە، هەر لە مێژیشــەوە وڵاتانی ئاوروپا بەشـێوەیەکی زانســتانە و هونەریانە لە چۆنیەتی دروستکردن و ژەنینیدا کارسـازیـیان تیاداکردووە.

Canard(F), Wrong note(E) نۆتەی هەڵە.
Canaries, Canarie, Canary(E) کەناری، سـەمای کێش3/4 یاخود6/8 کە سـەمایەکی فەڕەنســایی سـەتەی/17م و 18مە لە لەندەکانی کەناری/یەوە وەرگیراوە و پاشــان بە ئینگلتەرە و ئیســپانیا{بە ئامێری کەســتانێت*Castanets*ەوە}/یشدا بڵاوبووەوە.
Can-can, Chahut(F) کان ـ کان، ســەمایەکی فەڕەنســایی چوارکەسـیە کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیک ســاڵی1840ز.

Cancion(S), Song(E) ســتران. ئاماژەیەکیشە بۆ ســێ کورتە سـترانێک کە بریتین لە:ـ *Cancioncica, Cancioncila, Cancioncita*، جاروباریش سـەمای لەگەڵدا سـازدەکرێت بەناوی *Cancion Danza*.

Canna(I), Reed, Pipe(E) قامیش، لەڤەن، لەوەن.

Canne a lingua(I), Reed-pipes of organ(E) زمانە لوولەکانی ئامێری ئۆرگن.

Canne d'anima(I), Flue-pipe(E) لوولەی فلووت لە ئامێری ئۆرگنـدا.

Canne d'organo(I), Organ pipes(E) لوولەکانی ئۆرگن.

Canon(L,F), Canone(I), Kanon(G) کانون، گوزارەیە بۆ مۆنۆکۆرد*Monochord*ی یۆنانی لە سـەردەمانێکی زۆر دێریندا. وشــەکە مانای ڕۆڵ*Rule* یاخود ڕێسـا:قانون دەبەخشێت، بەڵام لە دیدەیەکـی مۆزیکیەوەڕا کە کارپێدەکرێت بە شـێوەیەک لە شـێوەکانی کۆنتراپونت*Counterpoint*دادەنرێت، بە چەشـن*style*ێکی زۆر جوانی وا هونەریانە کە ڕەدووی دەنگ*Voice*ێک بکەوێت{کە دەشـێت پارچە میلۆدییەکی بە ئامێر بێت}و نۆتە پەی نۆتە بە دەنگێکیتر لاســایی بکرێتەوە، ڕەوتـی کارەکەیش بەو چەشـنە دەبێت کە دەسـپێکردنی لاســایی بە درەنگی و چوونەوەسـەریەک*Overlapping*ی بێت. ئەگەر لە بارێکدا کانون دوو دەنگی بوو ئەوا چوونە سـەریەکیـش چەندلایی*manifold*دەبێت.

لەدوای ســاڵانی1300ز یەوە کانون بەچەشنێکی تەکنیکانە پەرەپێدرا و بەرەبەرە کەوتە گێڕانی ڕۆڵێکی گرنگ لە بواری هونەری مۆزیکدا بەتایبەتی لە کلێسە. لەم چەرخەی ئیســتادا سـتران کانون*Songcacon* لەنێو مۆزیکی لاواندا بایەخێکی زۆری پێدەدرێت.

چەندین جۆریتری کانون هەیە کە بە فراوانــی لە بواری هونەری ســتران و مۆزیکدا پەنای بۆ دەبرێت. لەوانەیـش کە گرنگـن:ـ کانونی بـێـپایان{بێکۆتا}*Infinite Canon*کە کانونی بەردەوامی*Perpetual Canon*یــشی پێدەوترێت، کانونی کۆتا*Finite Canon*. کانونـی دوو دەنگی لە یەک دەنگدا*Canon two in one*یاخود ســێ لەناو یەک و چوار لەناو یەک...هتد، کانونی چوار لە دوو*Canon four in two*کە بریتیە لە دەنگی ســۆپرانۆ*Soprano*و تینۆر*Tenor* لە کانونێکدا و دەنگـی ئالتۆ*Alto* و باس*Bass*یش لە کانونێکیـتردا، کانونێک کە دەنگە لاسـاییەکە میلۆدییەکی لێدەرچووی نۆتەی درێژ پیشـاندەدات پێیـدەوترێت کانون بە زێدە*Canon by Augmentation*، کانونێک کە دەنگە لاسـاییەکە میلۆدییەکی لێدەرچووی نۆتەی کورت پیشــاندەدات کە پێیدەوترێت کانون بە گەستن*Canon by Diminution*. سـەردەمانێکی زۆر زوو وشـەی فیوگە*Fugue* بۆ کانون بەکاردەهێنرا بەڵام لەدواییــدا وەک زاراوە*Term*...مانایەکی ڕوون و جودا و ســەربەخۆی درایە.

Canonic imitation(E) کانون لاســایی، میلۆدی بەشـێکی لە بەشـێکیتریدا لاســایی دەکرێتەوە.

Canoro(I) خۆشـخوانیی، خۆشـنمایانکردن.

Cantabile(I), To sing(E) بســترانێت، ***Cantab.*** کورتکراوەیەتی

Cantamento(I), Singing, Air(E) سـترانبێژیی، ئاریا، هەوا{مەبەست سترانە}.

Cantando(I), In a Signing style(E) بەچەشنێکی ســترانبـێژیی.

Cantata,Cantato(I), Cantate(F,G), Song(E) ســتران.

Cantante Basso(I) وەک سـۆپرانۆیەکی شـەیدایی*Lyrical Soprano* کە چەشـنە خۆشـسترانێکی سـووکەڵە.

Cantare(L), To sing(E) بسترانێت بە مەبەستی سـتایش*Praise* و بۆنەگێڕان*Celebrate*. ئێســتا...بەزۆری گۆزارە لە کارێکـی ئایینـی*Sacred*یاخود نائایینـی *Secular* چ بە تەنیا و چ بە کۆرس دەکات، هەروەها بە هاویاریکردنی ئۆرکێسترا بەچەشنێکی ئۆپێراڵـی*Opera*ی شـــانۆگەریانە*Scenery* و کـردەییانە*Action*یاخود ئۆراتۆریۆ*Orotorio*یانە.

Cantata da camera(I), Chamber cantata(E) سترانی هۆڵ{دیوان}کە لە ســەتەی/17م و دوانیوەی/18مدا پێکهاتبوو لە ســترانی تەنیایی و هەندێجاریـش بەکۆمەڵ کە تیایدا گێڕانەوە*Recetative* و ئاریا*Air*ی لەخۆگرتبوو.

Cantatilla(I), Short cantata(E) کورتە ستران.

Cantata da chiesa(I), Church cantata(E) سترانی تایبەت بە کڵێسـە ئامادە دەکرێت.

Cantatore(I), Singer(E) ســترانبێژ.

Cante Flemanco(I), Flemanco song(E) ســترانی فلامێنکۆ، چەشنە میلۆدییەکی میللی ســەر بە هەرێمی ئەندەلوســیا*Andalusia*ی شـانشینی ئیسپانیا*Spain*یە کە بە ســتـران و ســەما بەئەنجامدەدرێت. وشەی فلامێنکۆ*Flamenco*(*Flemish*)یش کە زۆر باوە ستران ســەمایەکی بەتایبەتە بە مۆزیک هونەری قەرەجانی ئیسپانیا.

Cante hondo, Cante jondo(S) ســترانی هۆندۆ، وشـەی هۆندۆ*Hondo* بەمانای کوور: قووڵ: ناخ*Deep*، چەشــنە ســترانێکی میللــی ئیســــپانیاییە کە ڕەپاتێن*Reputation* و دیکۆرێن*Decoration* لە تۆنەکانیدا دیارە.

Cantellerando(I), Singing in a low voice(E) ستران بە دەنگێکی نزم.

Cantica(I), Cantici,Canticum(L), Hymns(E) چەشنە ســروودێکی ئایینـزای گاهی دێرینە لە کڵێســەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا.

Cantiga(S) کانتیگا، سـترانێکی میللی ئیسپان/ پۆرتوگاڵـیە،چەشنە ســروودێکی ئایینی مۆنۆفۆنییە

Cantilena(I), Cantiléne(F), Sing-song(E) کانتیلێنا، گوزارە لە نووسـینێکی میلۆدیی ناســکئامێزی لە سـەرخۆ{نەوەک خێرا}دەکات، کورتە ســترانێکی سـووکی بەهەست، جاروبایش بۆ بەشی باڵا لە پارچەمۆزیکێکی کۆڕاڵدا کارپێدەکرێت، یاخود بۆ بەشـێک لەگەڵ تۆن*Tone*ی ســەرەکیدا بە چەشــنە ســروودێکی ناســراو بە کانتـۆ فێرمۆ*Canto Fermo*.

Cantino(I), Chanterelle(F), Top string(E) بەرزترین ژێ لە ئامێرە ژێدارەکاندا، بۆ نموونە ژێی/e'' کە بەرزترین تۆنە لە ئامێری کەمانچەدا.

Cantio(L) سترانی مۆنۆفۆنی ئایینی سـەتەکانی ناوەڕاسـت بە زوانی لاتینی.

Cantillation(E) سـروود بە ڕەزمێکی ڕەها لە ســرۆتێکی کڵێســەییدا.

Canto(I), Cantus(L) Song(E) **کانتۆ، ســـتران، ســترانبێژیی، میلۆدی،**
**دەنگی ســۆپرانۆ بەرزترین ژێ لە ئامێرەژێدارەکاندا. بەرزترین بەشـە دەنگەوار لە کۆنسێرتێکدا، هونەری سـترانبێژیی.**

Canto Prima(I), First soprano(E) **یەکەم ســۆپرانۆ.**

Canto recitativo(I), Recitative(E) **گۆیندە، گێڕانەوەی بابەتێک بەدەنگەوە.**

Canto secondo(I), Second soprano(E) **دووەم ســۆپرانۆ.**

Cantor(I) **ڕابەری ئاوازخوانان و مۆزیک لە کڵێســەی مارتن لۆتەری/یدا.**

Canto Secondo(I) **سۆپرانۆی دووەم.**

Cantus Choralis(I) **کۆڕاڵە ســروود.**

Cantus Fictus(L) **ســروودی هەڵبەســتراو. بڕوانە**/*Musica Ficta*.

Cantus Figuratus(L), Florid song(E) **ســروودی گوڵاو و نەخشــین کە چەشنێک لە کۆنتراپونت و میلۆدی نەریتی***Traditional melody***یشی خراوەتەسەر.**

Cantus Fermus(L),Canto Fermo(I), Firm(E) **سـروودی بە ویسـت و ئەزمەند، بەمانای ســکالاخوانییش دێت.**

Cantus gregorianus(L) **ســروودێکی ئایینــزایی ســادەیە لە کڵێســەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا.**

Cantus mensurabilis(L), Mensurable song(E) **ســروودی مەنزوراڵی{سکالا}، ســروودی پێوراو، چەشنە ئاوازێکی ڕەزمینی هارمۆنییە.**

Cantus Planus(L), Plainsong(E) **ســروودی ســکالا. سـکالاخوانی.**

Cantus Prius Factus(L) **بڕوانە**/*Canto Fermo*.

Canzo a ballo(I), Dancing song(E) **ســترانی سـەما.**

Canzona, Canzone(I) **لە سەردەمانی ترۆبادۆراندا بە چەند جۆرە ســتران وێژە***Poem***یەکی بڕگەهۆنراوە***Stanzas***ی کورت ڕەواجـی هەبووە، بەڵام ســەردەمانی دوای ترۆبادۆران جۆری هاوکاریکردن لە گەڵیدا گۆڕدرا و بووە چەشــنە میلۆدییەکی ئامێریی وەک کانزۆنا کانتانا** *Canzona Cantata*، **کانزۆنا ســۆناتا***Canzona Sonata*، **کۆی وشــەکە کانزۆنی***Canzoni***یە.**

Canzonicina(I), Short song(E) **کورتەســتران.**

Canzone scara(I), Scared song(E) **لاقژ، ســروودی ئایینی.**

Canzonet, Canzonetta(I) **بەندۆکە{بچووکراوەی بەند}، کورتە هۆنراوەیەک لە سـتراندا.**

Capella(I), Chapel(E), Capelle, Kapella(G), Chapelle(F) **کاپێللا، ڕەچەڵەکی وشــەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی کەشــیش مارتین***St. Martin* **ناســراو بە کاپا***Cappa***کە نازناوی***Cappella***و دوایی بووە***Capella*. **ئەم ناوە وەک زاراوەیەکی مۆزیکی کڵێســەیی بڕا بەسەر دەستەی کەشیشان و مۆزیکژەنان کە پێکەوە ئۆکێســترایەکی کڵێســەییان پێکهێناوە.**

Capellmeister(G) **ڕابەری دەسـتەی کۆڕاڵ.**

Capo(I), Head, Begining(E) **سـەر، دەســپێک.**

Capocchia(I), Head note(E) سـەرنۆتە.

Capotasto,Capodastro(I), Capodastére(F),Capodaster(G) سـەرەتای دەست، مەبەست لە دانان و هەسـت پێکردنی سـەری پەنجە لەسەر ئەو تەختە پانەی ژێی ئامێرە مۆزیکەکەی بەسـەردا دەڕوات و پەنجەی لەسـەر دادەنرێت کە پێیـدەوترێت پەنجەتەختە *Finger-board* بۆ دیاریکردنی تۆنی دەنگ لە ئامێرە ژێدارەکاندا.

Cappriccietto(I), Short capriccio(E) کاپریچیتۆ، کورتە کاپریچیۆ.

Capriccio(I), Caprice(F,E), Quick, Light(E) کاپریچیۆ، ئاوازێکی ئارەزووانەی ناپەیڕەو، لە سـالانی سـەتەی/16مدا وەک ئاوازێکی مادریگالی کاریپێدەکرا. سـالانی سـەتەی/17م وەک جۆرێک لە فیوگەیەکی ئازاد *Free Fugue*، بەزۆری بریتیە لە تێمپۆیەک بە خێرایی لارگۆ *Largo*، پاشان پیناسـەدەکرا بە جۆرە فانتازیا *Fantasia* یەک لە مۆزیکـی ئازاد. سـەرەتای سـەتەی/19مەوە بۆ کادەنس *Cadence* بەکاردەهێنرا.

Capricciosamente (I), Capricieusement(F),Capriciously(E) بە ئارەزوو و هەوەسەوە،

Capriccioso(I), Capricieux(F), Capricious(E) ئاوەزوو و هەوەس {حلحلی}.

Caressant(F) دڵنەوایی، نەرمی و نیانی.

Carezzando(I), Caressing(E) دڵنەوایی، نەرمونیانی.

Carezzevole(I), Caressingly (E) دڵنەواییانە، نەرمونیانانە.

Caricato, Caricatura(I) کاریکاتۆ، نواندنێکی کاریکاتۆریانە بە مەبەستی پلار و گازندەکردن.

Carillon(F), Campanette(I), Turmglockenspiel(G) ئامێری کاریللۆن،

Carita(I), Affection(E) هەسـتیاری، خرۆشـــی.

Carmen(L) تۆن، سـتران، بەندان، هۆزان. شـێوازێکی گوزارەکردنی سـەتەکانی/14م و 15م چ وەک بەشە دەنگێک لە ئاوازێکی دانراو بە هاوبەشـــی لەگەڵ ئامێرەمۆزیکیەکاندا چ بە دەنگێکی سەرەوەی ئاوازێکی دانراو بۆ چەند دەنگێک. بەرهەمێکـی ئۆپێراییە *Opera* لەلایەن مۆزیکدانەر و ئۆپێـرادانەری فەڕەنسـایی جـۆرج بیزێت *G. Bizet* سـاڵی 1874-1873ز کە لە چوار دیمەنی شـانۆیی پێکهاتووە.

Carnival(I) کارنەڤاڵ، خۆپیشـادانێکی گەلەری گەورە لە شـێوەی میهرەگان *Festival* دا کە چین و توێژەکانی گەل بە بەرگ و پۆشـاکی ڕازاوەی سـەیر و سـەمەرە لە شـێوەی گیانلەبەران و پەچە {دەمامک *Mask*} بە ڕوویاندا لە ڕێپێوانێکی خۆشی خرۆشیدا خۆیان دەنوێنن.

Carols(F) جۆرە سـتران سـەماییەکی فەڕەنـسـایی سـەتەکانی ناوەڕاستە کە دەسـتەیەک لە سـەماکاران لەشـێوەیەکی بازنەییدا دەستی یەکدەگرن و لەسـەر بەزمی سـترانێک ئەنجامیدەدەن.

Carrée(F) بڕوانە/*Breve*.

Cartina(I) پارچە مۆزیکێک کە تەنیا یەک سـۆڵۆ یاخود دەنگێکی کۆرسی تیادابێت.

Cassa(I), Caisse(F), Box, Drum(E) کاسـە، سـنووق، تەپڵی گەورەی یەکلا پێسـت.

Cassa Grande, Grand Cassa(I), Large drum(E) گەورە دەهۆڵی یەکلای دەنگ گڕ/*Bass*.

Cassa rullante(I), Tenor drum(E) دەهۆڵی یەکلای دەنگ تینۆر/*Tenor*.

Cassation(E,F), Cassazione(I) فۆرمێکی مۆزیکسازی سـالانی سـەتەکانی/17م و 18مە کە لەسـەر سـەکۆیەکی کراوە و کەشـوهەوایەکی ئازاددا بەئەنجامدەدرا. بە جۆرێک لە سـویت/*Suite*یاخود سـینفۆنیا/*Sinfonia*یش دادەنرێت کە لە چەند پارچۆڵە مۆزیکێکی لەیەکتر جیاجیا پێکهاتووە.

Castanets(E), Castagnettes(F), Kastagnetten(G),Taĺ(Kr) کەسـتانێت، تاڵ
Castagnette, Nacchere(I)
ئامێرێکی ڕەزمیی ئیسپانیاییە کە لە دوو پارچە تەختە لە شێوەی لەپک دەکرێتە پەنجە گەورە و پەنجە شایەتمان، بۆ گرتنی ڕەزم دەدرێن بەیەکدا و وەک چەقەنە دەنگی دێت. ئەم ئامێرە لە ناوچەی لۆڕستان/کوردستانی خۆرەلاتیش باوە

Cassettina(I) بڕوانە/*Wood block*.

Castrato(I), Castrated(E) سـروودخوانی خەسـیو، دەنگەواری کوڕی تەمەن هەرزە و پرۆڤە پێکردنیان بۆ دەنگـی سـۆپرانۆ*Soprano*و کۆنترائالتۆ*Contralto* لە کلێسەکانی ئیتالیای سەتەکانی ناوەڕاست، ئەویش بە خەساندنی کوڕە سروودخوانەکان بەرلەوەی بگەنە هەرەتی ڕەسیو*Puberty*یان. ئەم دەنگەوارانە لە چەرخی ئێستادا بە ڕەگەزی مێیینە بەئەنجادەدرێن.

Catch(E) کەچ، چەند میلۆدییەکی کۆمێدی و خەندەیی کە بە سـێ یاخود چوار دەنگ ببێژرێت، کۆڕاڵ کانون*Coral canon* کە لە سالانی سەتەکانی1600 و 1700ز لە ئینگلتەرەدا زۆر باو بووە.

Catena di trilli(I), Succession of trills(E) زنجیرە تریللە.

Catgut(E) ژێی دروستکراو لە ڕیخۆڵەی گیانلەبەرانی وەک مەڕ و بزن.

Cattivo tempo(I), Unaccented part of a bar(E) پارتێکی نائاکسـنت لە باڕێکدا.

Cauda(L), Tail, Stem of a note sign(E) ملی نۆتەیەک.

Cavalry Trumpet(F), Natural trumpet(E) ترومپێتی سـروشـتی.

Cavatina(I), Cavatine(E) کاڤاتینا، تا ڕادەیەک بە ئارییێتا*Arietta*دەچێت، کورتە ئاریا*Aria*تەنیا یەک بەش بێت کە پێیـدەوترێت لیریک ئاریۆسۆ*Lyric Arioso*ی کورت.

***C.B.*** کورتکراوەی کۆنتراباس *Contra bass*.

C - Clef (G,E) کلیلی دەنگەواری دۆ/Do.



C-double flat key(E), Ceses(G), Do-doppio bemolle(I), کلیلی دۆ ـ دەبڵ بیمۆڵ.
.Ut-double bémol(F) لە سـکێڵی دۆ ـ مێجەردا.



C-double sharp key(E), Cisis(G), Do-doppio diesis(I), Ut-double dièse(F) — $C^x$/ کلیلی دۆ دەبڵ دێز له سکێڵی دۆ ـ مێجەردا.



Cedendo(I), Cédant(F), Getting slower(E) — بەرەو خاویی.

Cedendo Molto(I) — زۆر بەرەو خاویی.

Cedendo un poco(I) — کەمێک بەرەو خاویی.

Cédez(F), Slow dwon(E) — هێواشبوونەوە بەر لە گەڕانەوە بۆ تێمپۆی پێشووتر.

Celere(I), Quick(E) — پەلە.

Celerissimo(I), Very quick(E) — زۆر پەلە.

Celerità(I), Speed(E) — خێرا.

Celeramente(I), Speedily(E) — بەخێرایی.

Celesta(I), Céleste(F) — ئاســمانی، مۆزیک ئامێرێکی کۆنە بە پیانۆ دەچێت، نزیکەی ساڵی1886ز لەلایەن ئۆگوستی موستلAuguste mustel لە پاریس و بەدوای خۆی خێزانی شیدمایەرSchiemayer family لە شاری شتوتگارد. مەودای دەنگەواری لەنێوان ئۆکتاڤی $C^1$- بەلام بە $C^5$ $C$-$C^4$ دەنۆتێنرێت.

Celeste pedal(F) — جۆرە پێداڵpedalێکی نەرمی ئاخنراو بە پارچە کوتاڵێک لەنێوان چەکوشەکان و ژێیەکانی هەندێک پیانۆ.

Celestiale(I) — ئاسـمانی. بەها و بڵند.

Celstic harp, Minstrel harp, Troubaduor harp(E) — هارپی سێڵستیک، چەنگی شایەران گچکەهارپێکی24ژێ/یە، دەخرێتەسەر ئەژنۆ بۆ ژنین.

Cello(E) — چێللۆ، کورتکراوەی ڤیۆلینسێللۆViolincello.

Cembali(I) — هارپسیکۆردی ئیتالیایی، گچکە سیمباڵۆ.

Cembalist, Harpsichordist(E) — هارپسیکۆردژەن.

Cent(L) — سەنت، سیستەم پێوانەیەکی لۆگاریتمیLogaritmicیە کە ساڵی1885ز لەلایەن ئێلیسA.J.Ellisوە بە ئەنجامدرا، میانەی یەک نیوەتۆن یەکسانە بە 100سەنت یاخود بە 1/1200ی ئۆکتاڤێک.

| Tone | C1 | C# | D | Eb | E | F | F# | G | G# | A | Bb | B | C2 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Cents | 0 | 100 | 200 | 300 | 400 | 500 | 600 | 700 | 800 | 900 | 1000 | 1100 | 1200 |

Cento(L), Centone (I) — ڕەنگاواز، هەڵگۆزاندنی چەند نەوایەکی هەڵبژاردە لە چەند ئۆپیرایەکی جۆرانجۆر و بەستنیان پێکەوە و ڕێکخستنەوەیان بەشێوەیەکی جوانئاوێز.

Cetera tedesca(I), German zithar(E) — زیتاری ئاڵمانی کە دە ژێی لەسەر بەستراوە.

Ces(G), Flat(E), Bemolle(I), Bémol(F) — دۆ ـ بیمۆڵ/$C^b$.

C-double flat(E), Ceses(G), Do-doppio Bemolle(I), Ut-double bémol(F) دۆ ـ دەبڵ بیمۆڵ/$C^{bb}$.



C-flat major(E), Do-bemolle maggiore(I), Ces-dur(G), Ut- bémol majeur(F) **کلیلەکانی دۆ بیمۆڵ/$C^{b}$ ـ مێجەر**



C-flat major scale(E) **سکێلی دۆ بیمۆڵ/$C^{b}$ ـ مێجەر.**



Cetera, Cetra(I), Cittern, Zither(G) **سیتار، ئامێرێکی ژێداری سەتەی/16مە کە لە چوار بۆ پێنج ژێی جووت تەل پێکهاتووە، جۆرێکی هەبووە کە ئاستی پەردەکانی تیادا دانراوە کە بریتین لە تریبڵ***Treble***و تینۆر***Tenor***و باس***Bass*.

Chace(F) **چێیس، زاراوەیە بۆ کانون لە ساڵەکانی سەتەی/14م کە لە دوو یاخود سێ دەنگی کانون***Canon***پێکهاتوبوو.**

Chaconne(F), Ciacona(I), Chacony(E) **شاکۆن، میلۆدیەکی سەمائامێزی کێش3/4 ی پڕجۆش و خرۆشە کە لە دواسەتە/16م لە ئیسپانیا باو بووە پاشان لە سەرەتا سەتەی/17م لە فەڕەنسا بە شێوەیەکی سەنگین و ڕەزین وەدەرکەوتەوە.**

Chain(E) **زنجیرە دەنگ.**

Chaleur, Chaleureux(F), Wormth(E) **گەرمی.**

Chaleureusement(F), With warmth(E) **بەگەرمی.**

Chalumeau(F), Shawm(E) **شالومیو، شاوم، زوڕنایەکی سەتەکانی/17م و 18مە بە شەش بۆ هەشت کونە پەنجەوە کە ئۆکتاڤێک لە کلارنێتی ئاسایی نزمترە.**

Chamade(F) **بانگێشتن و ئاگادارکردنەوە بە لێدانی تەپڵ و دەهۆڵ.**

Chamber Concert, Chamber Music(E) **کۆنسێرتی هەیوان{دیوان}.**

**مێژووی ئەو شێوازە هونەرییە دەگەڕێنرێتەوە بۆ سێ چەرخ:ـ**

1. **سەتەی/16م ناسراو بە مۆزیکی مادریگاڵ***Madrigal music***یاخود بە سەردەمی کۆڕاڵ کە لە کڵێسەدا بەئەنجامدەدرا، جاروباریش پێیدەوترا مۆزیکی هەڤاڵان** *The Music of Friends*.
2. **سەتەی/17م و سەرەتا نیوەی/18م، ئاوێزاندنی بە هارپسیکۆرد***Harpsichord-basis* **بەشێوەیەکی سەرەکی لەگەڵ باسی نمرێنراو***Figured bass***وەک بەشێک لە دەقەمۆزیک***Score***ەکە ئەم بەشەیان لەسەر شانۆ بەئەنجامدەدرا.**

3. دوانیوەسەتەی/18م و دواتر کە لەسەر خاڵی یەکەمەوە بناخەی سەرەکی بۆ دانراو پەرییێدرا بەشێوەیەکی زۆر ڕێکوپێکتر و هونەریانەتر کە بەزۆری لە کۆشکی پاشایان و میران و بۆرەپیاوان*Aristocracian*بەئەنجامدەدرا.

ئەو پێکهاتە سەرەکیانەی کە سەردەمی ئێستا لەبەر چاودان و دەبیسترێن ئەمانەن:ـ

1. دویت سۆناتا*Duet Sonata* بۆ یەک کەمانچە و پیانۆیەک.
2. ژێی سیانیی*The String Trio*کە لە سێ ژەنیاری کەمانچە*Violin*، ڤیۆلا*Viola*، چێللۆ*Cello* پێکهاتووە، پێیشیدەوترێت پیانۆ سیانیی*The Piano Trio*ی پێکهاتوو لە کەمانچە، چێللۆ، پیانۆ.
3. ژێی چواریی *The String Quartet* بۆ دوو کەمانچە، ڤیۆلا، چێللۆ.
پیانۆ چواریی*The piano Quartet* بۆ کەمانچە، ڤیۆلا، چێللۆ، پیانۆ.
4. ژێی پێنجیی *The String Quintet*وەک ژێی چوارییە و هەندێکجار لەگەڵ کەمانچەیەکی تر یاخود چێللۆیەک دەبێت. یاخود پیانۆی پێنجیی*The Piano Quintet* وەک: چوار ئامێری ژێدار لەگەڵ پیانۆیەک. یاخود کلارێنێتی پێنجیی*The Clarinet Quintet* وەک: چوار ئامێری ژێدار لەگەڵ کلارێنێتێکدا.
5. ژێی شەشیی*The String Sextet* بۆ دوو کەمانچە، دوو ڤیۆلا، دوو چێللۆ.

بێجگە لەم شێوەیەی سەرەوە، پێکهاتە هەوایییەکانیش هەن کە ئەمانیش گرنگی خۆیان هەیە. باشترین زاراوەیش کە لەبار و شیاو بێت بۆ ئەم جۆرە پێکهاتانە و ڕەنگ و شێوەیەکی مۆزیکیانەیش لەخۆبگرێت زاراوەی هەیوان ئۆرکێسترا*Chamber Orchestra*یە.

Chamber duet(E), Duetto da camera(I) دویتی هۆڵ{هەیوان} کە لە دواسەتەی/17مدا زۆر باو بووە، لە ناوەڕاستی سەتەی/18مدا وەک دوو دەنگیی توخمێکی سەرەکی بووە لە ئۆپێرادا.

Chamber opera(E) ئۆپێرای دیوان(هەیوان)، لە چەند مۆزیکژەن و ئۆپێراچڕێک پێکهاتووە.

Chamber orchestra, Small orchestra(E) ئۆرکێسترای بچووک.

Chamber Sonata(E), Sonata da camera(I) سۆناتای هەیوان، بابەت*Suite*ێکی سەتەکانی/17 و 18مە بۆ دوو سۆلۆژەن یاخود زیاتر بەهاوپاریی*Accompaniment* ئامێرانی تر.

Chamber symphony(E) سیمفۆنی بۆ کۆمەڵێکی بچووک لە ژەنیاران.

Champêtre(F), Rustic(E) گوندەکی.

Chang, Çeng(Fa,Kr), Harp(E) چەنگ، هارپ، ئامێرێکی ژێداری زۆر دێرینە لەنێو میللەتانی کورد و فارسدا کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی 2000پ ز.

Changes(E), Changez(F) گۆڕین، گوزارەی میلۆدییەک کە هەنگاو بە هەنگاو لە نۆتە هارمۆنیەکەوە بۆ یەکێکی باڵاتر بەڕێبکرێت، ئەم چەشنە*Style* زۆر باو بووە لە دواسەتەی/16مدا.



Chanson(F) شـــانســـۆن، كورتە سـتران، جۆرێک لە بەیتە لیریک*Lyric poem*ێکی زۆر کورت کە لە وڵاتی فەڕەنســا و باکووری ئیتالیا لە سـەتەی/14مدا سـەری هەڵداوە و پاشان لە دواسەتەی/16مدا بە چەندین چەشـن*Style*ی ڕازاوە والاکاری تیاداکراوە.

Chanson á boire(F), Drinking song(E) سـترانی نۆشین.

Chanson d 'amour(F), Love song(E) سـترانی ئەڤین.

Chanson de geste(F) سـترانی نێو دێر و کۆشـکەکانی سـەتەی/10م کە تایبەتبووە بە پیاداهەڵدان و ســتایشـاندنی پاڵەوانە نەمرەکانی نیشــتمان.

Chanson de marche(F), Marching song(E) ســروودی مارش{سـوپایی}.

Chanson de toile(F) ســترانی خیابان{جادەکان}ی تایبەت بە پیاهەڵدانی خانمانی زۆر جوان.

Chanson de travail(F), travel song(E) ســترانی گەڕیان.

Chansonette(F), Little song(E) ســترانۆکە.

Chanson folklorique(F), Traditional folksong(E) ســترانی میللی.

Chansonnier(F), Song writter, Song-book(E) سـتراننامە، ئەلبوومی سـتران.

Chanson sans paroles(F), Song without words(E) سـترانی بێ هەڵبەسـت.

Chant(F,E), Cantus(L), Song, Plainsong(E) خوێند، شـاند(چاند)، ســروودی کڵێســەیی. هێڵێکی دەنگ لە سـتران وەک هاویارییەک.

Chantant(F), Cantabile(I), Singing(E) ســترانخوانـیی.

Chant à plusiers voix(F), Part-song(E) پارتە- سـتران. پارچەسـتران.

Chanter(F), Singer(E) سـروودبێژ.

Chanteur(F), Singer(E) ســترانبێژی نێرینە.

Chanteurse(F), Singer(E) ســترانبێژی مێـیینە.

Chanter en canon(F), Singing around(E) سـترانی بەسـووڕ{بە نۆبە}، واتە چەند دەنگـبێژێک هاوکاری نۆرەیی لە سـترانێکدا بکەن. لە کوردیدا ئەم چەشنە زۆر باوە.

Chanter en choeur(F), Choral singing(E) ســـترانی کۆڕاڵ.

Chanting(E) ســـرووده داوودخوانیەکان کە لە کڵێســـەدا دەســازێنرێن.

Chanty, Shanty(E) ســـتران و سـەمای فۆڵکلۆریی، سـترانی تایبەت بە دەریاوانان.

Chant nuptial(F), Wedding song(E) ســـترانی زەماوەن.

Chaque(F), Every, Each(E) هەریەکە.

Characteristic note, Characteristic tone(E) بڕوانە/*Leading note*.

Charivari(F), Chiasso(I), Rough music(E) مۆزیکی زەبروزەنگ.

Chasse(F), Hunting style(E) ســەمای ڕاونان، جۆرە سـەمایەکی وەرزی ڕاوشکارە.

Chasse de cor(F), Hunting horn(E) بـووقی ڕاوشـــکار.

Che(I) کێ، کام، چ.

Chelebi, Çelebi(Kr) **چەلەبی، وشەیەکی هەرە کۆنی ئارامی/کوردییە**
**کە خواوەندی هۆنیاران(شاعیران)و خوێنیاران بووە، ئەو پیرەی کە هەمیشە لە خزمەت دەرباری خواوەندا بووە و بە دەنگێکی خۆش لە سرۆتەکاندا بەیتی چڕیوە پێیوتراوە چەلەبی واتە خۆشخوانی خوداوەند، پێدەچێت ئەو پیرانەیش کە لای خەڵک بە خاوخێزانیانەوە لە پلەوپایەیەکی بەرزدابوون، خۆیان و بنەماڵەیان بەچاوێکی زۆر ڕێز و باوەند{نەجیب}و شەریف تەماشادەکران، بەلام بەرەبەرە بە کزبوونی ئەو پیشە ئاپینیە ناوەکە وەک پیشە پووکایەوە و تەنیا بووە ناسناوێک بۆ ئەو بنەمالانە و نەوەکانیشیان بە ئەرڤەند و نەجیبزادە ناودەبران. ئەم جۆرە وشەیە لەنێو ئاپینی ئێزدی/یاندا قەووال/ی پێدەڵێن.**
Chassé(F), Chase(E) **دوورخستنەوەی پێ/یەک لە پێ/یەکەی تر لە سەمای باللێت/دا.**
Chef d' oeuvre(F), Concert master(E) **سەرۆکی ئۆرکێسترا، سەرتیپی سترانخوانان.**
Chef d'orchestre(F), Orchestral conductor(E) **ڕابەری ئۆرکێسترا، ڕابەری مۆزیکژەنان.**
Chelys(E) **شەلیس، ئاماژەیە بۆ دەستەی ڤیۆل***Viol family***لە سەتەکانی**16 و 17.
Chemeri, Çemeri(Kr), Kurdish Dirge(E) **چەمەریی، دەربڕینی شین و شەپۆڕ و واوەیلا بەزمی هۆرە بەلام هۆنینەوەیەکی لاوانەوە. بەڕێوەچوونی ئەم ڕێونیشانە لەنێو ئاپۆرە خەڵکدا و بە دەهۆڵ و زوڕنا دەبێت، ئەویش لە کاتی پرسە و بە خاکسپاردنی کەسانی میرخاس و ناودار.**
Cheng, Shang(Ch) **شەنگ، ئامێری ئۆرگن***Orgon***ی ڕیشەداری فووپیاکەری چینی/یە کە بە ئاسانی هەڵدەگیرێت.**
Chest(E) **کودەک، قەوارەی سنگ، سنووق.**
Chest of viols(E) **دەستەیەک لە شەش قەوارە جیاواز لە ئامێری ڤیۆل لە سەتەکانی/**16 و17، **هەر دوو دانەیەک لە تۆنەکانی تریبڵ، تینۆر و باس.**
Chest tone, Chest voice(E) **ئەو تۆنەی لە پیشخواردنەوەی سنگەوەڕا دێتەوە دەردەپەڕێت.**
Chevalet(F) **بڕوانە/***Ponticello*.
Cheville(F), Peg(E) **پەگ، پێگوشە، ئەو پارچەتەختەیەی کە لە کۆتایی دەستەکی ئامێرەژێدارەکاندا تەلەکەی لەسەر توند دەکرێت.**
Chevrette, Biniou, Cornemuse(F) **زوڕنا، سوڕنا.**
Chévrotement(F), Bleat(E) **دەنگ لەرینەوە وەک باڕەی بەرخۆلە.**
Chiamandolo(I), Calling(E) **بانگکردن.**
Chiaramente(I), Clearly(E) **بە ڕوونی.**
Chiarina(I), Clarion(E) **کلاریۆن.جۆرێکە لە ترومپێت.**
Chiamare(I) **دەنگی زەنگ(سەنگ، سەنج).**
Chiara(I), Clear(E) **ڕۆشن، ڕوون(بۆ مێیینە).**
Chiaro(I), Clear(E) **ڕۆشن، ڕوون(بۆ نێرینە).**
Chiaramente(I), Clearly(E) **ڕۆشنی، ڕوونی.**

Chiarezza(I), Clearity(E) ڕۆشـــنایەتی، ڕوونێتی.

Chiave(I), Clef(F) کلیل بۆ کردنەوەی سـکێڵەمۆزیکەکان، کلیلی کۆککردنی ئامێرەکان.

Chiave di baritono(I), Baritone clef(E) کلیلی باریتۆن.

Chiave di basso, Chiave de fa(I), Bass clef(E) کلیلی باس،

هێمایە بۆ پیشاندانی جێ تۆنی فا/F لەسـەر هێڵاسۆ*Staff*یەکە.

Chiave di contralto(I), Alto clef(E) کلیلی ئاڵتۆ.

Chiave di do(I), Alto clef(E) کلیلی ئاڵتۆ، پیشاندانی تۆنی دۆ/C لەسـەر هێڵاسـۆ*Staff*یەک.

Chiave di sol, Chiave di violino(I), Treble clef(E) کلیلی تریبڵ،

هێمایە بۆ پیشـاندانی جێ تۆنی سـۆڵ/G لەسـەر هێڵاسـۆ*Staff*یەکە.

Chiave di tenore(I), C-clef(E) کلیلی دۆ/C،

هێمایە بۆ پیشـاندانی جێ تۆنی دۆ/C لەسـەر هێڵاسـۆ*Staff*کەدا.

Chiesa(I), Church(E) کڵێســـە.

مۆزیکی هەیوان لە گاهی بارۆکدا کە بریتی بووە لە چوار جووڵە بە ڕەوشی:ـ خاوـ پەلەـ خاوـ پەلە.

Chiffrage(F), Time signature, Figuring(E) نمراندن، بەژمارەکردنی نۆتەکانی کۆردێک

بۆ دیاریکردنی شـوێنیان.وەک:ـ کۆردی*C-dur*بە 7-5-3-1 بـبێتە1-7-5-3...وە هەروەها.

Chiffré(F), Figured(E) بەنمرەکراو.

Chime(E) کۆمەڵێک لە هەمەجۆرە زەنگێکی دانراو{16بۆ22دانە}کە زایەڵەیان

بە زەنگی کڵێسـە بچێت.

Chifone(F) ناوی دێرینی ئامێری هوردی ـ گوردی*HurdyGurdy*.

Ch'in(Ch) لوتـ*Lute*ی چینی، ئامێرێکی ژێداری میللی چینی و ژاپۆنییە.

Chinese Music notes(E) نۆتەی چینـــی،

پێکهاتەی ســـکێڵی نۆتەکان لە مۆزیکی چینیـــدا لەسـەر بناخەی پێنجـــتۆنی*Pentatonic*دانراوە کە پلەتۆنی فا/Fوە دەسـپێدەکات بریتین لە:ـ فا/F، سـۆل/G، لا/A، دۆ/C، ڕێ/D. چینەکان هەر لە دێر ڕۆژگارەوە دەنگی مۆزیک*Ingwe*یان بە دین و دەوڵەت و ڕەوشت و پەروەردەوە گرێداوە، تاکو ئێسـتایش بڕوایان وەهایە کە هونەری مۆزیک پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ڕۆح و پاککردنەوەی دەروونەوە هەیە. هەر لەسەر ئەم بڕوایەوەڕا ناوی تۆنەکانی مۆزیکیان بەم شـێوەیە ڕیزبەندکردوە:ـ

| F | G | A | B | C | D | E |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Kung | Cheng | Qew | Ben Tsche | Tsche | Yoo | Yin Kung |

Chinese Pentatonic Scale سـکێڵی پێنجـــتۆنی چینی، ئەو سـکێڵەی کە زۆر باوە

پلەتۆنەکای لە ڕێ/Dوە بەم شـێوەیە دەسـپێدەکات:ـ D- E- F#- A- B- D

Chin rest(E) چەناگە، شـوێنی دانانی چەنەی ژەنیار لەسـەر ئامێری کەمانچە.

Chitarra(I), Guitar(E), Guitare(F), Guitarre(G) ئامێری گیتار.

Chitarrone(I), Big guitar(E) کەتەگیتار، گیتاری گەورە.

Chiusa, Chiuso(I), Closed(E) **کیوســه، بەســتراو ، دوایین بەشێکی پارچەمۆزیکێک بە ئامێری بووق***Horn*.

Chiusura(I) **دوایین ڕستەی پارچەمۆزیکێک.**

Choeur(F), Choir, Chorus(E), Chor(G) **کۆرس.... لە ڕیشەوشـەی خۆردیا***Xordia* **و پاشـان خۆرەس***Xoros***ی هەرە کۆنی یۆنانییەوە وەرگیراوە. گوزارە لە کۆمەڵێک دەنگبێژانی نێرینە و مێیینە دەکات کە ئاوێزاندنی دەنگەوارەکانیان بەشێوەیەکی هەنداز و ڕێکوپێک بێت. ئەو دەنگەوارانەی تایبەتن بە ژنان دوو بەشن:ـ دەنگەواری گڕ و نزم کە پێیدەوترێت ئاڵتۆ***Alto* **و دەنگەواری تیژ و بڵند کە پێیدەوترێت سـۆپرانۆ***Soprano*. **ئەو دەنگەوارانەی کە تایبەتن بە دەنگەواری پیاوان دوو بەشن: دەنگەواری گڕ و نزم کە پێیدەوترێت باس***Bass* **و دەنگەواری تیژ و بڵند بە تینۆر***Tenor* **ناودەبرێت. هەر بەشێکیش لە دوو تا پەنجا کەس یاخود زیاتر بەشـداریدەکات.**

Choirmaster, Churus master(E) **ڕابەری ســروودبێژانی کڵێســه.**

Choir organ(E), Chor orgel(G) **ئۆرگۆنی ئینگلیزی ســەتەی/19م لە شـێوەیەکی پەرەپێنەدراو، بەڵام لەدواییدا شێوەیەکی باشتر خاسکاری تێداکراو تاکو دەنگێکی نەرموناسک بدات.**

Choir pitch(E), Kepelleton(G) **پلەدەنگی کۆرس.**

Choragus(Gr) **کۆراگۆس، ڕابەری کۆرس لە سـەردەمانی دێرینی درامای یۆنانی/دا.**

Choral(G), Chorale(E) **کۆڕاڵ، ئاوازی ئایینی***Hymn*. **لەســەرەتای ســەتەی/16مدا، مانگرتنی کەشــیش مارتن لۆتەر***M.Luther* **لە ڕووی کڵێســەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا و ســەرهەڵدانی بزاڤە خاســکاری***Reform***یەکـی و پەیدابوونــی ڕێبازگەی پرۆتســتاند***Protestant*، **کڵێســە بۆ لایەنگیرانی دروستبوو و ســرووده ئایینیەکانیش بەچەشنێکی نوێتر خوێندران کە ئەویش هارمۆنیزاندنی***Harmonized***ســروودەکان بوو بۆ چوارده نەوا، وێڕای ئەوەیش کە بە زوانی ئەڵەمانی دەبێژرا نەوەک بە لاتینی، وشەی کۆڕاڵ***Choral***یش کە هاتەنێو ڕێبازگەکەوە، بووە زاراوەیەکی تایبەت بۆ گوزارەکردن لە فرەســترانێکی ئەنجامدراو لە ســرۆتێکی کڵێســەییدا کە پێیدەوترێت سـرۆتەکڵێســەی فرەستران***Ecclesiastical plainsong*.

Choral Cantana(E) **کۆڕاڵ کانتانا. جۆرە ســروودێکی کۆڕاڵ ســترانیه.**

Chorbuch(G), Choir book(E) **کۆڕاڵنامه، ئەو تیانووســەی کۆڕاڵی تیادا تۆمارکراوه.**

Chorale prelute(E), Coralvorspiel(G) **دەســپێکی کۆڕاڵ.**

Chorlied(G) **ئاوازی بە کۆڕاڵکراو.**

Choralist, Chorister(E) **کۆڕاڵیسـت، کۆڕاڵچڕ، ئەو کەسـەی ئەندامە لە گرووپی کۆڕاڵچڕاندا.**

Choral music(E) **مۆزیکێک تایبەت بۆ کۆڕاڵ نووسـرابێت.**

Choral notation(E) **کۆڕاڵ نۆتاندن، لە سـەتەکانی ناوەڕاسـتدا برەوی هەبوو و بەڕێگەی کانتۆس بلانۆس دەنووسـرایەوە.**

Choral symphony(E) **کۆڕاڵە سـیمفۆنی.**

Chord(E), Accord(F), Accordo(I), Akkord(G) کۆرد، ئاویز.

هاوسازاندنی دوو تۆن یاخود زیاتر لە یەک کاتدا ئەویش بەزمێکی فیزیکانە*Physicaly* و ڕێسایەکی ژمێرکایی{ماتتیۆ*Matematic*یی}و چێژێکی هونەریی{خۆشبیستە و هەستبزوێن بێت، لێرەدا هونەرمەندی بەهرەمەند پەی بەو چێژە هونەرییە دەبات}کە سێ پێوەری سەرەکین لە دامەزراندنیدا. چۆنیەتی فێربوونی کۆرد دامەزراندن و بەکارهێنانیشی لە گوزارەی مۆزیکدا پێیدەوترێت هارمۆنی*Harmony*.

نۆتە لاوەکیەکان*Incidental notes* و نۆتە پاساوەکان یاخود ڕاگۆزەرەکان*Passing notes* و پێش نۆتەکان*Appoggiatura* و مانەندیان بە بەشێک لە کۆرد دانانرێن. ڕەوشی ئەو ڕێسا ژمێرکارییەی کە تۆنەکانی کۆردێکی سادەی وەک*C-Major*ی تیادا هۆگر دەبێت بە ژمارەی تاکی خۆی بەم شێوەیە ڕیزبەند دەکات:ـ...1-3-5. وە هەروەهایش بۆ حەوتەم*Seventh*یش کە دەبێتە...1-3-5-7.

کۆردی سێ نۆتە کە پێکهاتووە لە نۆتەکە خۆی و لەگەڵ سێیەم پێنجەمەکەیدا کۆردێک دەسازێنێت پێیدەوترێت سیانیی*Triad*، زۆرجاریش بە کۆردی باو*Common Chord*. ئەو کۆردە باوەی کە سیانییەکەی مێجەر*Major*بێت پێیدەوترێت*Major Common chord* و ئەو کۆردە باوەی کە سیانییەکەی ماینەر*minor*بێت پێیدەوترێت*minor Common chord*.

ئەو نۆتەی شێوە کۆردەکەی لەسەر دادەمەزرێت پێیدەوترێت ڕەگrootیاخود بنکە*Base*. بۆ نموونە ڕەگی کۆردەباوی مێجەر C,E,Gبریتیە لە دۆ/C/، یاخود ڕەگی کۆردی حەوتەم*Seventh*ی G,B,D,Fبریتیە لە سۆڵ/G/. وەهەروەها... . ئەگەر جێگای ڕەگی کۆردێک لە باس*Bass*دا بوو ئەوا کۆردەکە لە جێگەی ڕەگەکەیدا*Root Position*دەبێت. ئەگەر نۆتی باس*Bass*ەکە لەجێی خۆی ترازا، ئەوا پێیدەوترێت هەڵگەڕاو*Inversion*. بۆ نموونە ئەگەر لە کۆردی سیانییدا*Triad* نۆتەی سێیەمی کۆردەکە لەجێی باس*Bass*دا بوو شێوەی کۆردەکە دەگۆڕدرێت و پێیدەوترێت هەڵگەڕاوی یەکەم*First inversion*. ئەگەر نۆتەی پێنجەمی کۆردەکە لە جێگەی باس*Bass*دا بوو شێوەی کۆردەکە دەگۆڕێت و پێیدەوترێت هەڵگەڕاوی دووەم*Second inversion*. بەدوای هەڵگەڕاوی دووەمدا کۆردەکە دەچێتەوە سەر دۆخی جارانی. لە کۆردی چوارنۆتەییدا*Quadriad* پێیدەوترێت کۆردی حەوتەم*Seventh:Septiem* نۆتەی سێیەمی کۆردەکە لە جێگەی باس*Bass*دا بوو شێوەی کۆردەکە دەگۆڕێت و پێیدەوترێت هەڵگەڕاوی یەکەم*First inversion*. ئەگەر نۆتەی پێنجەمی کۆردەکە لە جێی باس*Bass*دا بوو شێوەی کۆردەکە دەگۆڕێت و پێیدەوترێت هەڵگەڕاوی دووەم*Second inversion*. ئەگەر نۆتەی حەوتەمی کۆردەکە لەجێی باس*Bass*بوو شێوەی کۆردەکە دەوازێتە سێیەم هەڵگەڕاو*Third inversion*. بەدوای هەڵگەڕاوەی سێیەمدا کۆردەکە دەچێتەوە سەر دۆخی جارانی.

*Trial of C- chord* کۆردی سیانیی



*Quadriad of C- chord* کۆردی چواریی




ئەو کۆردانەی کە زۆر باون{ لەسەر ئامێری پیانۆ}ئەمانەن:ـ

**Chords - C and C#:**

**Key: C**
C = C E G
Cm = C Eb G
C7 = C E G Bb
CM7 = C E G B
Cm7 = C Eb G Bb
Csus = C F G
Csus7 = C F G Bb
C6 = C E G A
C2 = C D E G

**Key: C#**
C#= C# E# G#
C#m = C# E G#
C#7 = C# E# G# B
C#M7 = C# E# G# B#
C#m7 = C# E G# B
C#sus = C#F#G#
C#sus7 = C# F# G# B
C#6 = C# E# G# A#
C#2 = C# D# E# G#

**Chords - Db and D**

**Key: Db**
Db: Db F Ab
Dbm: Db Fb Ab
Db7: Db F Ab Cb
DbM7: Db F Ab C
Dbm7: Db Fb Ab Cb
Dbsus: Db Gb Ab
Dbsus7: Db Gb Ab Cb
Db6: Db F Ab Bb
Db2: Db Eb F Ab

**Key: D**
D: D F# A
Dm: D F A
D7 : D F# A C
DM7: D F# A C#
Dm7: D F A C
Dsus: D G A
Dsus7: D G A C
D6: D F# A B
D2: D E F# A

**Chords - Eb and E**

**Key: Eb**
Eb = Eb G Bb
Ebm = Eb Gb Bb
Eb7 = Eb G Bb Db
EbM7 = Eb G Bb D
Ebm7 = Eb Gb Bb Db
Ebsus = Eb Ab Bb
Ebsus7 = Eb Ab Bb Db
Eb6 = Eb G Bb C
Eb2 = Eb F G Bb

**Key: E**
E = E G# B
Em = E G B
E7 = E G# B D
EM7 = E G# B D#
Em7 = E G B D
Esus = E A B
Esus7 = E A B D
E6 = E G# B C#
E2 = E F# G# B

**Chords - F and F#**

**Key: F**
F = F A C
Fm = F Ab C
F7 = F A C Eb
FM7 = F A C E
Fm7 = F Ab C Eb
Fsus = F Bb C
Fsus7 = F Bb C Eb
F6 = F A C D
F2 = F G A C

**Key: F#**
F# = F# A# C#
F#m = F# A C#
F#7 = F# A# C# E
F#M7 = F# A# C# E#
F#m7 = F# A C# E
F#sus = F# B C#
F#sus7 = F# B C# E
F#6 = F# A# C# D#
F#2 = F# G# A# C#

**Chords - G**

**Key: G**
G = G B D
Gm = G Bb D
G7 = G B D F
GM7 = G B D F#
Gm7 = G Bb D F
Gsus = G C D
Gsus7 = G C D F
G6 = G B D E
G2 = G A B D

**Chords - Bb and B**

**Key: Bb**
Bb = Bb D F
Bbm = Bb Db F
Bb7 = Bb D F Ab
BbM7 = Bb D F A
Bbm7 = Bb Db F Ab
Bbsus = Bb Eb F
Bbsus7 = Bb Eb F Ab
Bb6 = Bb D F G
Bb2 = Bb C D F

**Key: B**
B = B D# F#
Bm = B D F#
B7 = B D# F# A
BM7 = B D# F# A#
Bm7 = B D F# A
Bsus = B E F#
Bsus7 = B E F# A
B6 = B D# F# G#
B2 = B C# D# F#

Chorda(L), String, Note, Tone(E) **کۆردا، ژێی، نۆتە، تۆن.**

Chordae essentialis(L), Tonic, First and Third and fifth of any key(E) **پایەتۆن، تۆنیک،یەکەم و سـێیەم و پێنجەمی هەر کلیلێک.**

Chordal harmony(E) **فۆرمێکی مۆزیکە کە تیایدا کۆمەڵە کۆردێک هاویاری میلۆدیەک دەبێت.**

Chord notes(E) **نۆتەکۆردەکان، مەبەست لە ڕەگەتۆن، سـێیەم، پێنجەم و حەوتەمی کۆردێکە کە درێژکردنەوەی نۆیەمەکان***Ninths***، یانزەیەمەکان و سـیانزەیەمەکانە.**

Chordal, Chordal harmony(E) **کۆرداڵ، کۆرداڵ هارمۆنی، شـێوەیەکی مۆزیکە کە تیایدا تاک میلۆدی بە کۆمەڵێک کۆرد هاویاری دەکرێت.**

Chordal Style(E) چەشـــنی کۆردالْ،

شـــێوازێک لە ئاهەنگســـازیی کە بەشـــێک لەو کۆردانە *Predominant* بێت.

Chord of dominant seventh(E) کۆردی زالْ حەوتەم/$D^7$.

کۆردێکی چوارتۆنی لە پایە*Base* و سـێیەم*Ters* و پێنجەم*Quinte* و حەوتەم*Septima*.

Chordophone(E) کۆردۆفۆن، مۆزیک ئامێرێکی ژێداری کۆنە.

Choreography(E) نەخشەکێشـانی ئاواز بۆ سـەما بەتایبەتی سـەمای باللـێ.

Choreographer(E) نەخشەکێشی سـەما، سـەماکێش.

Chorus(E) کۆرۆس، کۆمەڵێک لە سـترانخوانان.

Chroma(I,L), Quaver(E) کرۆما، هەشـتەک1/8ی نۆتەی تەواو.

Chroma duplex(L), Double sharp(E) x دەبلْ دێز، بەرزکردنەوەی نۆتەیەک،

بە بڕی دوو نیوەتۆن، بەمانای ڕەنگ*Colour*یش دێت.

Chroma simplex(L), Sharp sign(E) # هێمای دێز، بەرزکردنەوەی نیوەتۆنێک.

Chromatic(E),Chroma(Gr),Chromatique(F), Chromatisch(G),Cromatic(I) ڕەنگین،

لە وشـــەی کرۆما*Chroma*ی یۆنانی/یە هاتووە کە بەمانای ڕەنگ*Colour*دێت، ئاماژەیە بۆ ئەو سـێ تۆنە نزیک لەیەکتریەی کە لە دیاتۆنیک*Diatonic* و هارمۆنیەکەی پێکهاتووە. مۆزیکێک کە بە تەکنیکێکی نیوەتۆن و سـۆزێکی ئەڤینـئاوێزی لەخۆگرتبێت.

Chromatic alteration(E) کرۆماتیک گۆڕین کە بەهۆی هیمای دێز و بیمۆلْ...وە دەگۆڕدرێت.

Chromatic Chord(E) کرۆماتیک کۆرد، بڕوانە/*Altered chord*. لەڕێـی وەرگرتنەوە کە بۆ گوێ پەسـەند بێت...زۆر کۆردی بەکاردەهێنراو هەن نۆتەکانیان نە ئەوەیە بەشـێک بن لە کلیلێکی زالْ نە ئەوەیشـە ببێتە شـێواندنی هەسـتی*Feeling* ئەو کلیلە.

زێدە شـەشـەم*Augmented sixth*نموونەیەکی دیار و لەبەرچاوە بۆ شێوەی ئەو کۆردە.

نموونە بۆ ئەم جۆرە کۆردە{بە وەرگرتنی کلیلی*C-key*}لەم چەند شـێوەیەدا دێتە بەرچاو:ـ

- ماینەر کۆرد لەسـەر پایەتۆن*Tonic*ی کلیلی مێجەر*Major*:ـ $C$- $E^{flat}$- $G$.
- مێجەر کۆرد لەسـەر پایەتۆن*Tonic*ی کلیلی ماینەر*Minor*:ـ $C$- $E$- $G$.
- مێجەر کۆرد لەسـەر بیمۆلْ سـەرپایەتۆن*Supertonic*ی کلیلی مێجەر*Major* یاخودکلیلی ماینەر*Minor*:ـ $D^{flat}$- $F$- $A^{flat}$.
- مێجەر کۆرد لەسـەر سـەرپایەتۆن*Supertonic*ی کلیلی مێجەر*Major* یاخود کلیلی ماینەر*Minor*:ـ $D$- $F^{\#}$- $A$.

Chromatic drums(E) تەپڵە کرۆماتیکەکان،

بریتیە لە کۆمەڵە تەپڵێک کە لەسـەر میلۆدیەک کۆکدەکرێن. لەو نموونانەی کە لەبەرچاون:ـ

**نەقارە تەپڵەکان***Kettledrums(E), Timbales(F), Timpani, Tympani(I), Pauken(Gr)* کە لە دواسـەتەی/18 و سـەرەتای سـەتەی/19م بە جووت تەپڵ لەبەردەستدابوو بەڵام بەرەبەرە

پەرەیـپێدرا تا کرایە ئۆکتاڤێک، زاراوەی تیمپانی کۆپەرتی*Timpani coperti*وەک زاراویەکی مۆزیکی جێی تەپڵەکێتل*Kettledrum*ی گرتۆتەوە.

**زەنگەکان** *Bells(E), Cloches(F), Campane, Campanelle(I), Glöckchen,Glocken(G)*

**زەنگبار.***Bell play(E), Glockenspiel(G), Jue de timbres(F)*ئامێرێکی پۆلاسازکردەیە بە دوو چەکوش*Hammer*ی دەسکدرێژ لێدەدرێت.

**سـێلـستا** *Celesta(E), Celeste(F)* بە ئامێری زەنگبار دەچێت بەلام شێوازی لێدانی جیاوازە.

**تیمپۆفۆن** *Dulcitone(E),Tympophone(F)*زیاتر ئامێرێکی ئۆرکێسـترالیانەیە، کیبۆردێکی چەتاڵ*(Frok-keyboard(gabelklavier)*ی هەیە.

**زایلۆفۆن** *Xylophone(E), Claquebois(F), Zilafone(I), Xylaphon(G)*

**تەپڵی یەکلایی، تەپڵی سوپایی** *Side drum(E), Tambour militaire(F), Militärtrommel(G), Tamburo militare(I)*

**تینۆر تەپڵ** *Tenor drum(E), Caisse roulante(F), Tamburo rullante(I), Wirbetrommel(G)*

**باس تەپڵ** *Bass drum, long drum(E), Grosse caisse(F), Cassa grande(I), Grosse trommel(G)*

**تامبوورین** *Tambourine,Tabor(E), Tamburino(I), Tamburin(F,G)*

**سـێگۆنا** *Triangle(E,F), Triangolo(I), Triangel(G)*

**سـیمباڵەکان** *Cymbals(E), Cymbales(F), Piatti,Cinelli(I), Shallbecken(G)*

**تام تام** *Gong(E), Tam tam(F,G)*

**کاسـتانێتەکان** *Castanets(E), Castagnettes(F), Castanette(I), Kastagnetten(G)*

**خەشـخەشـە، گێلگێلە**، ئامێرێکی ڕەزمیە. *Rattle(E), Crécelle(F), Knarre(G)*

**ئامێری کرۆماتیک،** Chromatic instrument(E)

**ئەو ئامێرە ژێدارانەی کە میانەی نیوپەردە کرۆماتیک دەیانگرێتەوە.**

**میانە کرۆماتیک، نۆتەیەک کە نە بەشـێکە لە سکێڵەکانی مێجەر یاخود سـروشت، وە نە میلۆدی یاخود هارمۆنی. وەک دۆ دیێز لە سـکێڵەکانی دۆ ـ مێجەر و دۆ ـ ماینەر.** Chromatic interval(E)

**کلیکی کرۆماتیک.** Chromatic Key(E)

**کرۆماتیکی ناوەند، سـێیەم بەش لە دوو کۆرد یاخود لە دوو کلیلدا کە هەمان جۆری تۆنیان هەبێت** Chromatic mediant(E)

**کرۆماتیک مۆدیولێن، گواسـتنەوەی تۆناڵیتێک بۆ تۆناڵیتێکیـتر ئەویش بەهۆی گۆڕین*Altera*کردنی نۆتەیکی لە کۆردیک بە ئەندازەی نیوپەردە.** Chromatic Modulation(E)

**جووڵە کرۆماتیک، جووڵەی نیوەتۆنێک کە یەک بنەنۆتە*Basic note* بیانگرێتەوە وەک دۆ/C بۆ دۆ دیێز/$C^{\#}$.** Chromatic movement(E)

**کرۆماتیکی نیوەتۆن، میانە نیوەتۆنێک کە هەردوو نۆتە هەمان ناویان هەبێت وەک دۆ/C بۆ دۆ دیێز/$C^{\#}$.** Chromatic semitone(E)

Chromatic scale(E), Chromatische tonleiter(G), Gamme chromatique(F) سـکێڵی کرۆماتیک.

پێکهاتووە لە دوانزە نیوپەردە کرۆماتیک و دیاتۆنیک، واتە حەوت نیوپەردە دیاتۆنیک و پێنج نیوپەردە کرۆماتیک.



Do Di Re Ri Mi Fa Fi Sol Si La Li Ti Do Do Ti Te La Le Sol Se Fa Mi Me Re Ra Do

Chromatic Scale Ascending(E) کرۆماتیکی سـکێڵـی هەڵبەزیو.



Chromatic Scale Ascending

Chromatic Scale Descending(E) کرۆماتیکە ســکێڵـی دابەزیو.



Chromatic scale descending

Chromatic signs(E) هیما کرۆماتیکەکانی وەک دێز، بیمۆڵ و بێکار، بڕوانە/*Accidental*

Chronos(Gr), Quater-note(E) چارەکە نۆتە.

Church cadence(E) بڕوانە/*Cadence*، کڵێســە کادەنس، پلاگاڵ کادەنس.

Church modes(E) دەســگا کڵێســەییەکان.

Chwarga, Ĉwarga(Ar, Fa, Kr, Tr) چوارگا. واتە ئاوازی چوارەم،

لێرشتەیەکی ســەربە دەسگای بەیاتە، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی گردان. لە هاتنەخوارەوەدا ڕەگەزی ڕاست دەبێتە نەهاوەند لەسەر گردان پاش گۆڕینی پلەی زیل سێگا بە شەنگوڵە{ســونبولە}.

ئەی مانگ لەلا خۆت تاکی بەجوانی وا دەماخ بەرزی لەسەر ئاسمانی

کەمالــی، بەدەنگی:عەلی مەردان




Chwarga suĺtany, Ĉwarga suĺtany(Ar, Fa, Kr, Tr) چوارگا سـوڵتانیی.




لێرشتەیەکی سەر بە دەســگای ئەجەمە کە پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی گردان.

Cinfone(E) ســـینفۆنی، بڕوانە/*Hurdy-Gurdy*.

Cinq(F), Cinque(I) پێنج.

Cinquiéme(F) پێنجەم.

Cinquiéme Position(F) پێنجەم چێی پەنجەدەست لە ژەنینی ئامێرێکی ژێداردا.

Cioé(F), That is(E) ئەوە.

Cipher, Ciphering(E) ســفر، تێکچوونێکی میکانیکی لە ئامێری ئۆرگۆندا کە ببێتەهۆی بەردەوامبوونی دەنگە نۆتێکی لەنگین.

Cis(G,E) دۆ دێز /C#.

C-dur(G) دۆ دێز ـ مێجەر.

Circle(Cycle) of fifths, Spiral of fifths(E), Qvint Circle(F) بازنە{سوورە}پێنجەمەکان.

دەشێت بپرسـرێت بۆچی دەوترێت بازنە پێنجەمەکان، بۆچ ناوترێت بازنە چوارەمەکان یاخود بازنە ســێیەمەکان؟ ئەم پرســیارە دەمانباتەوە بۆ دێرینێتی چوارکۆرد*Tetrachord*ی یۆنانیەکان کە دەڵێت:ـ ڕیزبوونی چوار نۆتە لەسەر ڕیزەمیانەیەک*Interval sequence*دا بەم ڕەوشە دامەزراوە:ـ

تۆن*Tone*_تۆن*Tone*_ نیوەتۆن*Semitone*

لە مێجەر سـکێڵی دۆ*C-major scale*دا دوو تێتراکۆرد*Tetrachord*ی یەکلەدویەکی تیادایە کە پێکهاتووەن لە:ـ

1.یەکەم تێتراکۆرد:ـ *C - tone - D - tone - E - semitone - F*

2. دووەم تێتراکۆرد:ـ *G - tone - A - tone - B - semitone - C*

ئەگەر سـەرنجبدرێت...یەکەم نۆتە لە یەکەم تێتراکۆرددا بەتەواوی یەک ئۆکتاڤ لەژێر چوارنۆتەی دووەم تێتراکۆردە.

لە دووەم سـکێڵ*Scale*دا کە لەسـەر کلیلەنۆتەی سـۆڵ/*G*دەسـپێدەکات....لە یەکەم نۆتەی دووەم تێتراکۆردی سـکێڵی دۆ/Doەوە دەسـپێدەکات واتە لە پێنجەم پلە*Fifth degree*وە.

دوو تێتراکۆرد بۆ ســکێڵی ســۆڵ/*G*ی مێجەریش ئەمانەن:ـ

یەکەم تێتراکۆرد:ـ *G - tone - A - tone - B - semitone - C*

دووەم تێتراکۆرد:ـ *D - tone - E - tone - F sharp - semitone - G*

پێکهێنانی کلیلە پانۆکەکان*Flat keys*یاخود بیمۆڵەکان بە دانانی یەکەم تێتراکۆرد وەک دووەم تێتراکۆرد و پانکردنەوەیان بە یەک گێڕگۆڕین دەکرێت.

بۆ نموونە تێتراکۆردی دۆ/*C*بریتیە لە:ـ

یەکەم تێتراکۆرد: *C - tone - D - tone - E - semitone - F*

دووەم تێتراکۆرد: *G - tone - A - tone - B - semitone - C*

تێتراکۆرد بۆ مێجەر سکێڵ*Major scale*ی تۆنی فا/*F*یش بریتیە لە:ـ

دووەم تێتراکۆرد: *C - tone - D - tone - E - semitone - F*

دوانۆتەی دووەم تێتراکۆردیش یەکەم نۆتەی یەکەم تێتراکۆردە کە بریتیە لە:ـ

یەکەم تێتراکۆرد:ـ *F - tone - G - tone - A - semitone - B flat*

ئەمەیش نموونەیەکی ڕوونتری بازنەپێنجەمەکانە:ـ




Cittern(E), Cistre(F), Cetera(I), Zither(G) ســیتار، ئامێرێکی ژێدار کە تا دواســەتەی/16م لە ئاوروپادا بە پێلێدەPlectrumدەژەنرا، لە دواییدا بەرەبەرە گۆڕدرا بەوەی کە پەنجەکان لەباتی پێلێدە بەکاربهێنرێن. تاڕادەیەک بە ئامێری لووت*Lute* دەچێت بەڵام کودەک/ەکەی خرترە و پشتەوەی پانە و بە ئامێری گیتار دەچێت.بە چەند ناوی تری زوانی ئاوروپایی هاتووە لەوانەیش:ـ

*Cither, Cithern, Cithren, Citharen, Citole, Sitole, Sittron*

Civetteria(I), Coquetry(E) لەنجەولار.

Civettando(I), Coquetring(E) لەنجەولاریی.

Civettescamente(I), Coquetishly(E) بە لەنجەولارەوە.

***CL.*** کورتکراوەی کلاڕنێت*Clarinet*.

Clappers(E) چەپچەپە، لە دوو پارچە لەپکەدارە یاخود لەپکەکانزا پێکهاتووە، ئامێرێکی ڕەزمیە بە کەستانێت*Castanets*دەچێت کە دەدرێن بەیەکدا دەنگێکی وەک چەپڵەی لێوەدەردەچێت.

Clarabel flute(L), Hohlflöte(G), Hollow flute(E) کلۆرە فلووت کە درێژیەکەی هەشت پێ/یە8ft ناوەکەی کلۆرە{بۆشە}، لە دار و لە کانزایش دروسدەکرێت. وشەیەکی لێکدراوە لە *Clarus*ی لاتینی واتە ڕۆشن*Bright*، ئەویتر لە*Bellus* واتە جوان.

Clarinet(E), Clarinette(F), Clarinetto(I), Klarinette(G) کلاڕنێت،کەرەنای، ئامێرلوولەییەکی فووپیاکەری تەختەســازکردەیە{لە داری ئابەنوس دروســتدەکرێت}، پانتایــی دەنگــی بە دیۆدێســیمان*Duodeciman*ە دادەنرێت کە بریتیە لە ئۆکتاڤێک+پێنجەم*quint*ێک. لە ساڵەکانی1690-1700 لەلایەن دێننەر*Chr. Denner* لە شــاری*Nuremberg*داهێنرا کە پێکهاتووە لە هەژدە نیوەتۆن. لە پێنج دەنگی بنچینیی پێکهاتووە/*A, C, B, Ess, D* بەڵام بەپێی پێکهاتەی

دەنگەکانی دەکرێت بە ئالتۆ*Alto*، باســکلارنێت*Bassclarinet* و باســێت هۆرن*Bassethorn* جیابکرێنەوە. بۆ یەکەم جار لە سـەردەمی مۆزارت/دا هێنرایە ئۆرکێستراوە. بەگشتی بە ئامێرێکی ترانسپۆزە*Transposing instrument*دادەنرێت و بۆ خۆی خێزانێکی پێکهێناوە کە بەم جۆرانە دەپۆلێنرێن:ـ

1. کلارنێت لە/ *C*, *B* flat, *A* کە بە تریبڵ ئامێرێکی ئاسایی دادەنرێت.
2. باس کلارنێت/*Clarone(I), Bass Clarinet*کە یەک ئۆکتاڤ لە کلارنێتی ئاسیی نزمترە.
3. کلارنێتی می بیمۆڵی بڵند/*High E-flat Clarinet*.
4. کلارنێتی رێ بیمۆڵی بڵند/*High D-flat Clarinet*.
5. ئالتۆ کلارنێتی می بیمۆڵی و تۆنی فا/*Alto Clarinet in E-flat and F*.
6. باس هۆرن/*Basset horn* بە ئامێرێکــی تینۆر دادەنرێت، پێنجەم دەنگ لە کلارنێتی/ *Clarinet-C*نزمترە.
7. پێداڵ کلارنێت*Pedal Clarinet*یاخود کۆنتەرباس کلارنێت*Conterbass Clarinet* کە دەبڵ باس کلارنێت*Double-bassClarinet*یشی پێدەوترێت. ئامێرێکی زلە، یەک ئۆکتاڤ لە باس کلارنێتی*B*-flat نزمترە. هاوشێوەیەکی هەیە لەگەڵ دەبڵ باسـسوون-*double-Bassoon* و ئامێرەژێی دەبڵ باس ڤیۆلێنسیلۆ*double-bass violencillo*.

ســێ جۆریــتری مۆدێرن هەن کە بریتین لە:ـ کلارینا*Clarina*کە دەنگێکــی زۆر باڵای هەیە. هێکلکلارینا*Heckelclarina*{یاخود*Heckelkarinette*}.هۆڵز ترومپێت*Holztrompete*{یاخود تەختە ترومپێت*Woodentrumpet*}کە مۆزیکدانەری ئاڵمانیایی ڤاگنەر*Wagner*داهێنەریتی.

Claro(E) کلارۆ، جۆرە ئامێرێکی ترومپێت*Trumpet*ی ئینگلیزییە کە لە سـەتەکانی ناوەڕاستدا باوبووە، لە لوولەیەکی پێچاوپێچ *Zigzag*ی زمانەدار پێکهاتووە، پاشان دەســـکاری تیاداکرا و ناوی بووە کلاریۆن*Clarion*.

Classical music(E) کلاسیک مۆزیک، چەشـن و شـێوازێکی هونەری دواســەتەی/16م تاکو دواسەتەی/18م. بەوە پێناسەدەکرێت کە گەڕانەوەیەکە بۆ ئەوپەڕی جوانی کە بەگشتی لە هونەرەکانی بیستن و دیتن و کۆڵێن و وێژەدا ڕەنگیداوەتەوە. ئەم جوانیەیش لە چەند ڕوخسارێکدا دەناسرێتەوە وەک سـەنگین و ڕەزمین، نەخشین و ڕەنگین، پاکوێگەرد. پێکهاتەیەکی ئارەزومەند و بە زارشــت*Logic*، ســاکار و نایاب، شــێک و هەنداز، هۆشــپەروەر و دوور لە هەموو هەڵپە و هەڵەشــەیی و نائاوێزییەک، پڕ لە بڕستێکی هێمنی ڕێکوپێک.

Clave(L,S), Chlare(I), Clef(F), Schüssel(G) کلیل.




ئەو کلیلانەی کە لە سەردەمی ئێستاماندا بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:ـ

1. کلیلی سۆڵ/*G*{کلیلی تیژ*Treble-clef* سـەروو کلیلی دۆ/*C*یە، بە دۆ/ی ناوەڕاست*Middle-C* ئاماژەی پێدەدرێت.

2. کلیلی دۆ/$C${کلیلی ئالتۆ*Alto-clef*}بە دۆ/ی ناوەڕاست*Middle-C*ئاماژەی پێدەدرێت.

3. کلیلی فا/*Fa*{کلیلی باس*Bass-clef*}لە ژێر کلیلی دۆ/*C*یە، بە دۆ/ی ناوەڕاست*Middle-C* ئاماژەی پێدەدرێت.




Clavecin(F) — کلاڤێسن، هارپسیکۆرد، ئامێرێکی سـەتەکانی/15م تاکو 18مە.

Clavicembalo(I) — کلاڤێسیمباڵۆ، هارپسیکۆردی ئیتالیایی.

Clavicytherium(E) — کلاڤیسیتێریەم، جۆرێکە لە هارپسیکۆردی وەسـتاو{سـتوونی}.

Clavier(L), Klavier(G) Keyboad(E) — کلاڤیێر، کیبۆرد.

Cloche(F), Bell(E) — زەنگ.

Clochette(F), Glöckchen(G), Small bell(E) — زەنگۆڵە.

Clog Box(E) — ئامێرێکی ڕەزمی جاز*Jazz*ی چینی/یە، نزیکەی 8ئینج درێژە دەنگێکی ڕەق و زبری هەیە و بە دار لێدەدرێت.

Close(E) — نزیک، بەسـتن، بڕوانە/کادەنس*Cadence*.

Close harmony(E) — هارمۆنی بەسـتە.

مەبەست ڕێکخستنی نۆتەی کۆردەکانە لە بەرینێکی تەسـکدا واتە نزیک بە یەکتر.




C-major key(E), C-dur(G) — کلیلی دۆ/*Do*ی ـ مێجەر*Major*.



C-major scale(E), C-dur skala(G) — سـکێلی دۆـ مێجەر.



C-minor(E), C-moll(G) — دۆ ـماینەر.



Close repeat(E) داخراوە ڕەپات کە لە کۆتاییدا دادەنرێت ئاماژەیە بۆ دووبارەکردنەوە.

Coach-horn, Post-horn(E) بووقی بەرید، پۆستە بووق.
ئامێرێکی فووپیاکەری بچووکی زۆر کۆنە، کاتی خۆی لە ئاوروپادا کە بەرید لە شـــارەوە بۆ گوندە و بەپێچەوانەیشـــەوە ڕەوانەدەکرا، بەریدهەڵگرەکە لە دەڤەری شـــارەکە یاخود بەرلەوەی بگاتە گوندەکە فوویەکی بە بووقەکەدا دەکرد بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵکەکە بە هاتنی بەرید.

Coda(I), Tail(E) کۆتا، کۆدا، زاراوەیەکە بۆ هەموو پاساو/*Passage*ێک بەکادەهێنرێت ئیتر کورت بێت یاخود درێژ، وەک کلکە کۆتا{پاشکۆ}دەخرێتە سەر کۆتایی دانراوەیەکی مۆزیک. دوابەشی کۆتایی لە ڕستەمۆزیکێکی سۆناتا*Sonata*دا کە دەکرێت لە جۆری ئەڤینیدا وەک سەروبەندێک بکەوێتەبەر دووبارە*Reprise*بوونەوە.

Coda sign(E) هێما کۆدا، هێمایەکی بازنەیی یاخود هێلکەیی لەگەڵ هێڵێکی ئاڕاستە کە پیشانی ژەنیار دەدات بۆ بازدان لەو خاڵەوە بۆ ئەو بەشەی بە کۆدا*Coda*نیشانەکراوە.

Codetta(I), Short coda(E) کورتەکۆتا. پاساوێکی پەیوەستە لەنێوان دەسپێکەکانی فیوگە*Fugue*یەکدا. لە شـێووگە فیوگە*fugue form*یەکی سـێ دەنگیدا....لە یەکەم گروپی هاتنەناوەوەدا پاساوێکی لاوەکی*Episodical passage* دێتەپێشـەوە کە دەکەوێتە نێوان دووەم دەنگ و سـێیەم دەنگ. پاساوێکە لەناو دانراوەیەکی سـۆناتا شێوە*Sonata form* کە لە کۆتاییدا هەیە.

Cogli(I), With the(E) بە هاویاری، لەگەڵ{بۆ شتێکی کۆ}.

Cogli stromenti(I), With the instruments(E) لەگەڵ ئامێرەکاندا.

Col, Colla, Coll', Colle(I), With the(E) بە هاویاری، لەگەڵ{بۆ شتێکی تاک}.

Col basso(I), With the bass(E) لەگەڵ باسدا.

Col Canto(I), With the Song(E) لەگەڵ ستران.

Colla destro(I), With The right(E) بە دەستی ڕاست کە *C.D.* کورتکراوەیەتی

Colla parte(I) لەگەڵ بەشـێکی سـۆلۆژەن*Solist* و بەدوایدا سـترانێکی خێرا.

Colla punta dell'arco(I) لێدان بە سـەری کەوان{بەسـەر ژێیەکادا دەبرێت}.
With the point of the bow(E)

Colla voce(I), With the voice(E) لەگەڵ دەنگ{ئاواز}دا.
واتە لەگەڵ بەزمێکی خێرای سـترانبێژدا بڕوات.

Col legno(I), With the wood(E) بە دارک، شووڵ*Stick*ی کەوانەکە بەسـەر ژێی ئامێرەکەدا بدرێت.

Coll'ottava(I), With the octave(E) به ئۆکتاڤ، یەک ئۆکتاڤ بەرەو ژوور یاخود بەرەو خوار، که *Coll'ott,C/ 8-va*کورتکراوەیەتی.

Colofonia,Colophonia(I), Colophane(F), Kolophon(G) کۆڵوفان، ڕۆسین، چۆک
Colophony, Bow resin, Bow rosin(E)

ماددەیەکی چەوری کەتیرەیی چەوری ڕەقە بۆ نەرمکردنی یاڵی کەوان بەکاردێت تاکو کەوانەکە بە لووسی بەسەر ژێیەکاندا بێت و دەنگێکی خۆش و ناسک بدات.

Coloratura(I), Coloured music(E) مۆزیکی ڕەنگیو، لە دەنگێکی میلۆدیدا کارپێدەکرێت ئەویش بە بەشبەشکردنی نۆتە درێژەکان*Long notes*بۆ کورتتر بە خێراشێوە*Runs*یاخود بۆ کورتەنۆتەی خێرای یەکبەدواییەک لە ڕستەیەکدا*Roulades*یاخود بۆ کادەنس بە جۆرەکانیەوە. هەندێک زاراوەیتر هەن کە هەمان مانا دەبەخشن وەک ئارایشکردنی*Figurato*دەنگی نێرینە بە ئارایشتکردنی*Figurata*ی دەنگی مێیینە. مۆزیکی ڕەنگێنراو*Music colorata*یاخود ئاوازی ئاڕایشتکراو*Musica figurata* ، *Canto figurato*.

Coloratura soprano(I) ڕەنگینە سۆپرانۆ، نەرمە دەنگێکی مەودا بەرز کە بە سیمایەکی خوێنشیرینانە خرۆشبەبەخش بێت و لەنجەولاری و شۆخوشەنگی تیادا بنوێنرێت.

Colpo(I), Stroke(E) ژەن، لێدان.

Colpo d' arco(I), Strike with bow(E) لێدانی ژێ بە کەوان.

Colour, Colouration(E) ڕەنگ، زاراوەیەک بۆ فرۆزەکردنی شێوەی پەردەکان، بڕوانە/*Timbre*. وەک زاراوەیەک لەلایەن فیلیپ دی ڤیرتی فەڕەنسایی1291-1361ز *Philippe de Virty* پێشنیاریکرا ئەویش بە بەکارهێنانی دویتی ڕەنگ*Ink colour* بۆ پیشاندانی گۆڕینی کێشەکان وەک لە کێشی دووتایی بۆ کێشی سێتایی یاخود بە پێچەوانەوە.

Colpo(I), Stroke, Blow(E) فوو، لێدان.

Col punta d'arco(I), With the tip of the bow(E) بە سەری کەوان.

Col sinistra(I), With the left(E) بە چەپ.

Combined Counterpoint(E) کۆنتراپۆنتی بەیەکەوەبوو.
کارپێکردنی چەند بەشە میلۆدییەک لە یەک کاتدا و یەکلەناویەک دەنگدا.

Combination note(E) نۆتەی بەیەکەوە، تۆنی بەئەنجام، سێیەم نۆتەیەکی بیستراو کاتێک دوو نۆتە لە یەک کاتدا بژەنرێت، یەکەم کەسێکیش پەی بەمە برد مۆزیکزانی ئیتالیایی تارتینی*Tartini*بوو لە ساڵی1714زدا.

Combination pedals, Composiyion pedals(E) پایدەرە پێکەوەکان، جۆرە سیستەمێکی میکانیکیە لە ئامێری ئۆرگۆن/دا کە پایدەرەکانی بەیەکترەوە دەبەستێت بۆ ڕێخستنی دەنگی کۆمەڵێ لوولەتۆن. سێ جۆریش لە پایدەر هەیە:ـ
پێداڵی توند*Forte pedal*، میزۆ پێداڵ*Mezzo pedal*، پیانۆ پێداڵ*Piano pedal*.

Come(I), Comme(F) As, like, As if(E) وەک، مانەند، هەمان.

Come da lontano(I) هەمان چەشنی ناڕاست.

Come prima(I), As at first(E) وەکو لە یەکەمدا.

Come retro(I), As before(E) وەکو پێشو{گەڕانەوە}.

Comes(I), Dux(F), Attendant, Companion, Consequent(E) کۆمێـس، ئاڕاستەبەر، زاراوەیەک لە کانونەکان*Canons* و فیوگە*Fugues*کاندا بەکاردەهێنرێت بۆ دەسـنیشـانپێکردنی یەکەم بەشـی هاتنەناوەوە و دووەم بەشـی هاتنەوەناوەوە. بۆ نموونە لە چوار پارچەی فیوگ/دا سـەرەتای هاتنەناوەوە بەڕیز بەم چەشـنە دەبێت:ـ

بابەت{سـوژە} - *Subject* بەرسـڤ*Anawer*- سـوژە*Subject* - بەرسـڤ*Anawer*، دەشـێت سوژە و بەرسـڤ/یـش بە پێشـەنگ*Dux(Leader)* و ئەویتریان هاویار*Comes(Companion)*ی پێشەنگ یاخود بەدوایەک*Consequent*بناسـرێت.

Come sopra(I), As above(E) وەکو سـەرەوە.

Come sta(I), As it stands, A it is written(E) هەروەکو نووسراوە.

Comic(E), Comico(I), Comique(F) گاڵتە و شـۆخی.

Comic opera(E), Comique opera(F) ئۆپێرای کۆمیک.

Come un eco(I) مانەندی یەک زایەڵە(دەنگدانەوە، ئێکۆ).

Comicissimo(I) زۆر پێکەنیندار، شـۆخیـئاوێز.

Comicita(I) بە خەندەیی و شـۆخی.

Cominciando(I), At begining(E) لە سـەرەتا، لە دەسپێک.

Cominiciare(I), Begining(E) دەسـپێکردن.

Comma(L), Cut, Crack(E) کۆمما، کۆما، بڕ، کەرت، دەنگ پێوانەیەکی ماتماتیکانەیە کە یەکسانە بە1/8ی پەردەیەک، نیوپەردە کرۆماتیک یەکسانە بە پێنج کۆما و نیوپەردە دیاتۆنیکیش یەکسانە بە چوار کۆما. هەر میانەیەک کە نزیک بێت لە 1/8ی تۆنێک یەکسانە بە25Cents، لەو پێوانانەی کە هەن ئەمانەن:ـ کۆمای سـینتۆنی*Syntonic comma(or comma of didymus)* و کۆمای فیساگۆریی*Pythagorean comma(or comma ditonicum)*{یەکسـانە بە24Cents}کە جیاوازییەکە لەنێوان دوانزە پێنجەمی تەواو*Twelve perfect fifths*، ئۆکتاڤە حەوتیەکان *Seven octaves* و کۆمای حەوتی*Septimal comma*{یەکسـانە بە27Cents}دا.

بەڵام لە مۆزیک سیسـتەمی خۆرەڵاتیدا تاڕادەیەک جیاوازی هەیە. ئەو جیاوازییەیش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی چارەکە تۆن.کە یەک کۆما*Comma*یەکسانە بە1/9ی تۆنێک، تۆنێکی تەواو یەکسانە بە نۆ پلە کە دەکاتە**90Cent**. بەڵام بە پێوانی سیسـتەمی خۆراوایی یەک پلەتۆنی تەواو یەکسانە بە**100Cent**. هەر لەمەوەڕا دەتوانرێت میانەی تۆنەکان بپێورێن. بەمەیـش میانەکۆی سـەرانسـەری سـکێڵێکی خۆرەڵاتـی دەکاتە53کۆما کە یەکسانە بە **1200Cent**.

ئەگەر دەســگای ئەجەم وەک نموونەیەک وەربگرین کە هاوســکێڵی مێجەر*Major scale*ی خۆراوایـی دەبێتەوە{1-1-1/2-1-1-1-1/2}، ژمارەپێوانەی پلەتۆنەکانی بە کۆما*Coma*بەم چەشـنە دەبێت:ـ

1.میانەتۆنی نێوان دۆ/C بۆ ڕێ/D یەکسانە بە نۆ کۆما.
2. میانەتۆنی نێوان ڕێ/D بۆ می/E یەکسانە بە نۆ کۆما.
3. میانە تۆنی نێوان می/E بۆ فا/F یەکسانە بە چوار کۆما.
4. میانە تۆنی نێوان فا/F بۆ سـۆڵ/G یەکسانە بە نۆ کۆما.
5. میانە تۆنی نێوان سـۆڵ/G بۆ لا/A یەکسانە بە نۆ کۆما
6. میانە تۆنی نێوان لا/A بۆ ســی/Bیەکسانە بە نۆ کۆما.
7. میانە تۆنی نێوان ســی/B بۆ دۆ/C یەکسانە بە چوار کۆما.

میانەکۆی سـەرانسـەری سـکێڵەکە دەکاتە53کۆما.

ئەگەر دەســگای نەهاوەند/یش وەک نموونەیەک وەربگرین کە هاوسـکێڵی ماینەر*Minor scale*ی خۆراوایی دەبێتەوە{1-1/2-1-1-1/2-1-1}، ژمارەپێوانەی پلەتۆنەکانی بە کۆما*Comma*بەم چەشنە دەبێت:ـ

1.میانەتۆنی نێوان دۆ/C بۆ ڕێ/D یەکسـانە بە نۆ کۆما.
2. میانەتۆنی نێوان ڕێ/D بۆ می/$E^b$ یەکسـانە بە چوار کۆما.
3. میانە تۆنی نێوان می/E بۆ فا/F یەکسـانە بە نۆ کۆما.
4. میانە تۆنی نێوان فا/F بۆ سـۆڵ/G یەکسـانە بە نۆ کۆما.
5. میانە تۆنی نێوان سـۆڵ/G بۆ لا/$A^b$ یەکسانە بە چوار کۆما
6. میانە تۆنی نێوان لا/$A^b$ بۆ ســی/Bیەکســانە بە نۆ کۆما.
7. میانە تۆنی نێوان ســی/B بۆ دۆ/C یەکسانە بە نۆ کۆما.

میانەکۆی سـەرانسـەری سـکێڵەکە دەکاتە53کۆما.

Common Chord(E) کۆردی باو، کۆردێک کە پێکهاتبێت لە ڕەگ، ســێیەم و پێنجەم. هەر کۆردێکی باو/یش ســێیەمی مێجەر*Major*بێت پێیدەوترێت مێجەر کۆردی باو، هەر کۆردێکی باو/یش ســێیەمی ماینەر*Minor*بێت پێیدەوترێت ماینەر کۆردی باو.

Common flute(E) فلووتـی باو کە بە لادا فووی پیادا دەکرێت.

Common Consonant(E) دەنگانی هاوســاز، مانەندی میانە چوارەمی دروست.

Common metre(E) کێشی باو، بڕوانە/*Metre*.

Common note, Common tone(E) نۆتەیەک کە لەنێوان دوو کۆردی جیاوازدا بمێنێتەوە.

Common time(E) کێشی باو کە ڕەزمی4/4 دەگرێتەوە بە هێمای/C.

Comodamente(I), Comfortably, Moderately(E) بە ئاسـوودەیی، مامناوەندی.

Comodo, Commodo(I), Commode(F), Quietly(E) کۆمۆدۆ، بە هێمنی.

Compass(E) مەودا*Range*ی ئامێرێک یان دەنگێک.

Compiacevole(I), Pleasing(E) شـادی، خۆشی.
Compiacevolmente(I), Plreasingly(E) به شـادییه‌وه.
Compiacimento(I), Pleasure(E) شـادیی و خۆشـحاڵیی.
Composed(E), Componirt(G), Composto(I) دانراو{بابه‌تێکی مۆزیک}.
Composer(E), Composista(I), Compositeur(F) مۆزیکـدانه‌ر.
Composition(E,F), Composizione(I) مۆزیکدانان.

**له‌ ڕووی چاووگه‌زوانزانیی*Etymology* و کارپێکاریی*Practicability*یه‌وه‌ به‌مانای پێکه‌وه‌ دانان دێت، به‌ لێکدانه‌وی مۆزیکیانه‌ وشه‌لێکدراوه‌که‌ به‌مانای دانانی نۆته‌کانه‌ پێکه‌وه‌ بۆ ســازکردنی هه‌ر پارچه‌ مۆزیکێک. بۆ نموونه: ڤاڵـس*waltz*، سـیمفۆنیی*Symphony*..... .**

Compound chords(E), Accords combinés(F) کۆرده‌ تێهه‌ڵکێشـه‌کان.
Compound harmony(E) هارمۆنی تێهه‌ڵکێش.

**کۆردێکی سـتانده‌ر ئۆکتاڤێکی بۆ بخرێته‌سـه‌ر به‌ باس*Bass*دا.**

Compound intervals(E), Accords en intervalles(F) میانه‌تێهه‌ڵکێشـه‌کان،

**میانه‌یه‌ک که‌ له‌ ئۆکتاڤێک گه‌وره‌تربێت، واته‌ میانه‌یه‌کی گه‌وره‌ و ئۆکتاڤێک. وه‌ک نۆیه‌م، یانزه‌یه‌م، سـیانزه‌یه‌م......میانه‌ی تۆنی دۆ/*C* بۆ ئۆکتاڤێک و ئینجا تۆنی ڕێ/*D* بخرێته‌ســه‌ر پێیده‌وترێت تێهه‌ڵکێشی دووه‌م *Compound second*. ئه‌گه‌ر هه‌مان ئۆکتاڤ وه‌ربگیرێت و تۆنی مـی/*E*یشی بخرێته‌سـه‌ر پێیده‌وترێت تێهه‌ڵکێشی سـێیه‌م *Compound third* وه‌هه‌روه‌ها... .**

Compound times(E) **کێشــی تێهه‌ڵکێش، پێکهاتووه‌ له‌ لێکدانی چه‌ند کێشێک پێکه‌وه‌ که‌ شــێیاوی به‌شکردن بێت، وه‌ک6/8، 9/8،12/8....وه‌ هه‌روه‌ها. بڕوانه‌/*Time signature*.**

Con(I), With(E) له‌گه‌ڵ، به‌.
Con-8(I) **به‌ ـ8، له‌ کیبۆرد مۆزیکدا ئه‌گه‌ر نۆته‌کان بۆ ژه‌نین به‌ ده‌سته‌ڕاست بوو، ئه‌وا نۆته‌کان بۆ ئۆکتاڤێک به‌ره‌و ژووره‌، ئه‌گه‌ر نۆته‌کان بۆ ژه‌نین به‌ ده‌سته‌چه‌پ بوو ئه‌وا نۆته‌کان بۆ ئۆکتاڤێک به‌ره‌و خواره‌.**

Con abandono(I), With self-abandment, With passsion(E) ده‌روێشـانه‌.

**ده‌روێش وشه‌لێکدراوێکی زۆر ڕه‌ســه‌نی کوردییه‌ که‌ له‌ ده‌ر واته‌ له‌ و وێش به‌ لاوژه‌ی هۆرامی واتای خۆد یاخود زات ده‌به‌خشێت، چه‌مکی وشه‌که‌ ژانێکی یه‌زدی و لێکدانه‌وه‌یه‌کی ڕۆحی و ده‌روونیی که‌سێکی ناسک{عیرفان}له‌گه‌ڵ خودی خۆیدا ده‌گه‌یه‌نێت بۆ خۆنزیکردنه‌وه‌ له‌ خودێ.**

Con accento(I), Accented, Marked(E) ئاکسنتکراو، نیشانه‌کراو.
Con affanno,ma lieta(I), Breathless with excitement(E) تاسه‌، کاریگه‌ری هه‌ناسه‌بڕاو.
Con affetto(I), With passion(E) به‌ داخ و په‌روشه‌وه‌.
Con afflizione(I), Sorrowfully(E) به‌ داخه‌وه‌.
Con agevolezza(I), With ease(E) به‌ ئاسـان.
Con alcuna licenza(I) به‌پێی تێمپۆ، به‌ڕاده‌یه‌کی دیارکراو له‌ ئازادی.

Con allegrezza(I), Joyfully(E) خۆشــڕابوێرانه.
Con allegria(I), With vivacity, In a lively manner(E) به ڕەوتارێکی بژێوانه.
Con alma, Con anima(I), With soul, Ardenly(E) بەڕەوانی، بەجۆشەوە.
Con alterezza(I), Proudly(E) به شـانازییەوە.
Con amabilità(I), With sweeetness(E) به شـیرینی.
Con amarezza, Con tristezza(I), With sadness(E) به خەمگینیەوە.
Con amore(I), With love(E) به ئەڤینی.
Con arditezza(I), Boldly(E) به مەردانه.
Con ardore, Con calore(I), With warmth(E) به گەرم.
Con attenzione(I), In a marked style(E) بەچەشنێکی دیارکراو، بەئاگایی.
Con bellezza(I), With beauty, Gracefully(E) به جوانی و شـەنگی.
Con bizzarria(I), In a fantastic style(E) بەچەشنێکی فانتازیانه.
Con brio(I), With spirit(E) به ڕەهایی.
Con calma, Con tranquillità(I), Calmly(E) به هێمنی.
Con celerità(I), Quickly(E) به پەله.
Con chiarezza(I), Clearly(E) به ڕوونــی.
Con delicatezza(I), Delicately(E) به چەش و خۆشـبارەوە.
Con delirio(I), Deliriously(E) به تاوگێرییەوە، بەدڵگەرمیەوە.
Con diligenza(I), Carefully(E) به بایەخەوە، بەئاگاداریەوە.
Con disprezzo(I), With contempt(E) به تێڕامانەوە.
Con disprezzo esagerato(I), With exaggerated contempt(E) به تێڕامانێکی لەڕادەبەدەر.
Con dolce maniera(I), In a sweet manner(E) به شـیرین ڕەوت.
Con dolcezza, Con suavità(I), With softness or sweetness(E) به ناسکی، بەشیرینی.
Con dolore(I), Mournfull(E) به دڵگرانی.
Con duolo(I), With an expression of grief(E) به پەژاره دەربڕینەوە.
Con delicatezza(I), Wih sweetness(E) به شــیرینی.
Con elevazione(I), In a lofty manner(E) به لووتبەرزیەوە.
Con energia(I), Energetically(E) به وزەوە.
Con entusiasmo(I), With enthusiasm(E) به گوڕ و جۆشەوە.
Con esaltazione(I), With exultation(E) به هەلهەلەوە.
Con espressivo(I), With expression(E) به گوزارەوە، بەهەســتدەربڕینەوە.
Con facilità(I), With facility(E) به ئاسـانکاریی.
Con fermezza(I), With firmness, With decisively(E) به پێداگرتنەوە، بەبڕیارەوە.

Con fiochezza(I), Hoarsely(E) به دەنگێکی زوڵاڵەوە.
Con forza(I), Vigorously(E) به توندی.
Con freddezza(I), With coldness(E) به ساردیەوە.
Con frella(I), Hurrieddly(E) به هەڵەداوانیی.
Con fuoco(I) به گەرمی.
Con furore(I), Furiously(E) به جۆش و تووڕەیەوە.
Con garbo(I), Gracefully(E) به شۆخوشەنگیەوە.
Con grazia(I) به خۆشی و نیانی.
Con gusto(I), With taste(E) به چێژەوە.
Con impeto(I), Impetuously(E) به هەڵەشەیی و سەرکێشانە.
Con intenso sentimento(I), With intense feeling(E) به پڕهەستەوە.
Con ira(I), With expression of anger(E) به تووڕەییەوە.
Con isdegno, Con sprezzo(I),With indignation(E) به سووکایەتیەوە.
Con l' arco(I), With the bow(E) به کەوان، به ئارشە.
Con la replica(I) به گەڕانەوە.
Con la voce(I), With voice(E) به دەنگەوە.
Con larghezza(I), Broadly(E) به فراوانیەوە{به هەناسەیەکی درێژ}.
Con leggerezza(I), With lightness, Airily(E) به سووکی، بەهەوای شان.
Con lenezza(I), Quiet manner(E) به ڕەوشێکی هێمن.
Con lentezza(I), Slowly(E) به خاوی.
Con maestà(I),With majesty(E) به شکۆیەوە.
Con mano destra(I), With the right hand(E) به دەستەڕاست.
Con mano sinistra(I), With left hand(E) به دەستە چەپ.
Con molto passione(I), Very Passionately((E) زۆر به سۆز{ئازار دەربڕینەوە}.
Con molto(I); With quick motion(E) زۆر به خێرا.
Connecting note(E) نۆتەی بەستوو، ئەو نۆتەیەی کۆردەکان دەبەستێت بەیەکەوە.
Con Passione(I), Play with emotion(E) به ژەنینێکی بەسۆزەوە.
Con paura(I), With timidness(E) به نامەردیەوە{ترسنۆکییەوە}.
Con precisione(I), With precision(E) به خۆپابەندییەوە{وەک کەسێکی ئایین توندڕەو}.
Con prestezza, Con rapidità(I), With rapidity(E) به خێرایەوە.
Con spirito(I) به گیانێکی بزێویەوە.
Con serietà(I), Seriously(E) به بایەخەوە، بەگرنگیەوە.
Con semplicità(I), With simplicity(E) به ئاسانیەوە.

Con sensibilità, Con sentimento(I), With feeling(E) به هه‌سته‌وه.

Con solennità(I), With solemnity(E) به پیرۆزیه‌وه، به ڕه‌زینیه‌وه.

Con sordini, Con sordino(I), With mute(E) به کپی، به‌دانانی پێکپه*mute*.

بۆ نموونه بۆ کپکردنی پیانۆ پایده‌ری نه‌رم*Soft pedal* به‌کاردێت، بۆ کپکردنی ئامێره‌ژێداره‌کانی وه‌ک که‌مانچه پێکپه‌که له‌سه‌ر پرد*Bridge*ه‌که‌ی گیرده‌کرێت، له ئامێره براسه‌کاندا *Brass instruments*پێکپه‌که ده‌خرێته ناو ده‌مه‌ی بڵندگۆکه‌یه‌وه.

Con stupore(I), With astonishment(E) به سه‌رسامیه‌وه.

Con tinto(I), With various shade of expression(E) پڕ له هه‌موو جۆره هه‌ستێک.

Con tenerzza(I), With tenderness(E) به خۆشی و دڵۆڤانیه‌وه.

Con tristato(I) به په‌ست و خه‌مگینی.

Con tristezza(I), Saddly(E) به دڵته‌نگی.

Con tutta forza(I) به هه‌موو بڕسته‌وه.

Con una puna di stizza(I), With a vexation(E) به شپرزه‌وه.

Con un voce un po' nasale(I), With a nasal sounding voice(E) به ده‌نگێکی لووت شۆڕییه‌وه

Con veemenza(I), With vehemently(E) به توندی.

Con voce di paura(I), In a fearful voice(E) به ترسه‌ده‌نگه‌وه.

Con voce di pianto(I), In a whisper(E) به چرپه‌وه.

Con voce fioca(I), In a faint voice(E) به ده‌نگێکی دڵه‌ڕاوکێوه.

Con voce natural(I), In a natural voice(E) به ده‌نگێکی سروشتییه‌وه.

Con voce selvaggia(I), In a frantic voice(E) به ده‌نگێکی زۆر به‌جۆشه‌وه.

Con voce soffocata(I), In a suppressed voice(E) به ده‌نگێکی زۆر په‌سته‌وه.

Con velocità(I), With velocity(E) به خێراییه‌وه.

Con voce cupa(I), With intense tone(E) به تۆن گرژییه‌وه.

Con vulsivo(I) به‌یه‌کدادراو.

Concento(I), Concentus(L) کۆنسێنتۆس، هارمۆنی، کۆنکۆرد، به‌شێکه له سروده نزایه‌کی گریگۆریی که له کڵێسه‌ی کاتۆلیکدا به کۆرس ئه‌نجامده‌درێت.

Concert(F), Konzert(G) کۆنسێرت، *Cto.*کورتکراوه‌یه‌تی له وشه‌ی

کۆنسێرتاری*Concertare*ی لاتینیه‌وه هاتووه پاشان بۆته کۆنسێرتۆConcertoی ئیتالیایی که به‌مانای پێکه‌وه‌به‌جێهنان دێت یاخود ئه‌رکبه‌جێهێنانی سرۆتێکی هه‌وه‌روه‌زی کڵێسه‌یی پڕ ته‌وس و په‌رۆش که له چه‌ند سروودێکی به کۆمه‌ڵدا ڕه‌نگده‌ده‌نه‌وه. له دواییدا وه‌ک زاراوه‌یه‌کی نێونه‌ته‌وه‌یی په‌یبردنێکی هاوچه‌رخانه*Modern sense*ی پێبه‌خشرا بووه*Concert* که بریتیه له چه‌لاندنی کۆمه‌ڵه ده‌نگئاوازێکی کڵێسه‌یی له شێوه‌ی مادریگالیه‌کان*Madrigals*. هه‌ر وه‌ک

زاراوەیەکـی ئایینی و مۆزیکی، دوو کەشیشـی مۆزیکزان بەناوی گابریـێلیس*Gabrielis(1587)* و بانچیـێری*Banchieri(1595)* و ڤیادانا*Viadana(1602)* لە چەند ئاوازێکــی کڵێســەییدا بەناوی مۆتێت*motet*بە شـێوەی کۆراڵ*Choir* لەگەڵ ئامێری ئۆرگـن*Organ*دا بەناوی کۆنسێرتی ئایینی*Concerti sacri*یاخود *Concerti ecclesiastici*کەوتە سـەر زاری بیسەران. بەڵام لە ســەرەتای ســەتەی/18مەوە بەرەبەرە لە چێوەی کڵێسەدا دەربازبوو و لە کۆشکی پاشایان و دیوانی خانەدان و بۆرەپیاواندا بەشـێوەی ســتران و مۆزیک بە چەند ئامێرێک کەوتەبەرچاو.

Concertant(F), Concertante(I) کۆنسـێرت ئاسا، واتە لە شـێوەی کۆنسێرت/دا.

کۆنسـێرتۆیەک بۆ دوو سـۆڵۆژەن یاخود زیاتر ئەنجامبدرێت.

Concertata(I) کۆنسـێرتاتا، بڕوانە/*Aria-8*.

Concerted music(E) کۆنسـێرت مۆزیک، مۆزیکێک بە چەند

دەنگێک یاخود ئامێرێک بە ئەنجامبدرێت وەک ژێـدارە چوارقۆڵـیەکان*String quartets*، پیانۆ پێنج قۆڵـیەکان*Piano quintets*، فوودارە هەشت قۆڵـیەکان*Wind octetes*....هتد.

Concertenart(G), Concerto style(E) لە چەشنی کۆنسـێرتۆ.

Concert en plein-air(F), Open-air concert(E) کۆنسـێرت لە کەش و هەوایەکی کراوەدا.

Concert Grant(E), Lagre grang piano(E) پیانۆفۆرتی لە گەورەترین قەواریدا.

Concertina(E) کۆنسـێرتینا، ئامێرێکی بچووکە بە ئۆکۆردیۆن دەچێت بەڵام شێوەیەکی شـەشلایی هەیە، سـەرەتای دەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵانی نزیک1829ز لە ئینگلتەرەدا.

Concertino(I) کۆنسـێرتینۆ، کۆنسـێرتی بچووک،

کۆنسـێرتێک کە لە چەند ژمارەیەکی کەم لە مۆزیکژەنان پێکهاتبێت.

Concertmaster(E), Konzertmeister(G) یەکەم کەمانچەژەنی ئۆکێسـترا، ڕابەری ئۆرکێسـترا.

Concerto(E) گروپێکی مۆزیک پێکهاتوو لە چەند دەنگ و ئامێرێک،

بەئەنجامدانی پارچە مۆزیکێک کە سـۆڵۆژەن بەهاوپاریی ئامێرەکانیـتر بەشـێوەیەکی ئۆرکێستراڵی ڕۆڵی ژەنینی دەگێڕێت. داهێنانی ئەم شــێوەیە دەخرێتە پاڵ مۆزیکرانــی ئیتالیایــی جیوســیپێ تۆرێللی*Giuseppe torelli*کە لە سـاڵی1708زدا مردووە.

Concerto da camera(I), Chamber concerto(E) کۆنسـێرتۆی هەیوان.

وشـەی کامێرا*Camera*...بەمانای ژوور یاخود هەیوان دێت، دەســپێکی ئەم چەشنە هونەرەیش دەگەڕێتەوە بۆ ســەرەتاکانی ســەتەی/19م ئەویش بە وەدەرکەوتنی گروپی بچووک لە نەواسازان و پێشــکەشــکردنی کاری مۆزیکیان لە هەیوانـی خانەدان و بۆرەپیاواندا.

Concerto da chiessa(I), Church cencerto(E) کۆنسـێرتۆی کڵێســەیی.

Concerto doppio(I) کۆنسـێرتۆی دوو ئامێرژەن بە هاویاری ئۆرکێسترا.

Concerto grosso(I) کۆنسێرتۆی گەورە، شێوەیەکی ئۆرکێستراڵیە کە بەتایبەتی لە سەتەکانی/17 و 18م/دا باوی هەبووە، پێکهاتووە لە گروپێکی بچووک لە ژەنیاران کە پێیدەوترێت کۆنسێرتینۆ*Concertino*و ئەوانیتر لە مۆزیکژەنانی ئۆرکێستراکە بە پڕاوپڕ هاویاری ئەو گروپە دەکەن پێیدەوترێت ڕیپیێنۆ{بڕوانە/*Ripieno*}.

Concerto for orchestra(E) کۆنسێرتۆی ئۆرکێسترا، کارێکی سیمفۆنی گەورە کە سۆلۆژەنان ڕۆڵی تێدابگێڕن.

Concert overture(E) بەرایی کۆنسێرت، بەرکۆنسێرت کە لە هەگبەی ڕۆمانتیکدا باوبووە.

Concert pitch(E) کۆککردنی ئامێرەکانی ئۆرکێسترا لەسەر تۆنی/*A* بە فریکوێنسی440Hz لە پلەگەرمی68 فەرهەنهایت/دا.

Concert de salle(F), Concert hall(E) بڕوانە/*Concerto da camera* .

Concervaturium(L), Conservatory(E) کۆنسێرڤاتۆریەم، ئامۆژگای باڵای مۆزیکخوێندن.

Conservatori(I), Conservatoire(F)

Conclusion feminine(E) ئاکامی مێیینانە، واتە کۆتایی میلۆدییەک بەچەشنێکی ناسکونەرمونیان.

Conclusion masculine(E) ئاکامی نێرانە، واتە کۆتایی میلۆدییەک بەچەشنێکی زبر و بەهێز.




Concitato(I) پەشێو.

Concitamento(I) پەشێوانە.

Concitazione(I), Agitation(E) پەشێوی.

Concrete Music(E), Musique concréte(F) کۆنکرێت مۆزیک.

چەشنە مۆزیکێکی داهێنراوە لەلایەن پییێر شاوفەر*Piere Schaeffer*ساڵی1950ز کە دەنگی جیهانی سروشتی وەک ڕەشەبا و باوبۆران و هەراوهوریا و دەنگی ناوبازاڕ و گیانلەبەران و ئامڕازە ئەلەکترۆنیەکان و...هتد تیادا دەبیسترێت.

Conducting(E) ڕێبەرێتی ئۆرکێسترا. سروشتی ڕێبەرێتی... بە پەیوەندییەکی ڕۆحی گشتی دادەنرێت لەنێومەیدانی هونەری مۆزیکدا کە هەستونەستێکی کاریگەری فرەلایەن لە گوزارە دەربڕینی تیا بەدیدەکرێت. جڵەوگیری ئەم گوزارە دەربڕینەیش کە لەلایەن ڕێبەرە*Conductor*وە بەئەنجامدەدرێت لە بەرهەمێکی ئۆرکێستراڵی و کۆراڵ/دا بەدیدەکرێت.

Conductor(E) رابەری ئۆرکێسترا، ئەو کەسەیە کە جڵەوی ئەندامانی مۆزیکژەنان و کۆراڵچڕان لە ئۆرکێسترادا دەگرێت. جڵەوگرتنی کێشی مۆزیک لەلایەن رابەرەوە، ئاژ{شووڵ}*Stick*ێک دەگرێت بە دەستی ڕاستی/یەوە لەسەر بەزمی ئەو بەرهەمەمۆزیکە نووسراوەی*Score* کە لەبەردەمیدایە دەستی دەجووڵێنێت و فەرمان بە مۆزیکژەنان دەدات کە نزیکایەتیەکی رۆحی لەگەڵدا سازبکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەهونەریە.



Conjoint degrees(E) پلە پێکەوەبەستەکان، دوو نۆتەی یەکسەر بەدوایەک لە سکێلێکدا.

Conjugate(E) هاوگرتە{هاوبەش}، لە دیمانەی تۆن*Tuning theory*یدا، هاوبەشــی سـیانیی*Triad*...هەر سـیانیی و زاڵی تەواو*Dominant complement*ی نێوەند*Mediant*ێکیش جێی نێوەند دەگرێتەوە. واتە بۆ نموونە: هاوگرتەی مێجەری سـیانیی بەڕێژەی3/2 5/4 1/1... مانەری سـیانییە بەڕێژەی3/2 6/5 1/1 کە تیایدا 6/5بریتیە لە 3/2ی تەواوکەری5/6.

Conjunct(E) کۆبەستە، دوو تێتراکۆرد لە تۆنێکی لاوەکیدا*External tone* هاوبەشبن. ئەم جۆرە هاوبەشـییە لە سـکێڵ و دەسـگاکاندا دەبینرێن.

Conjunct succession(E) زنجیرە نۆتەیەکی پێکبەســتەی بەدوای یەک.

Conjunct tetrachords(E) پێکبەستە تێتراکۆرد، بەستنی تێتراکۆردێک بە تێتراکۆردێکی نزمتر.

Conjunct movement جوولەپێکبەست. پێشبەرییەکی میلۆدیانەیە*Progressing melodically* بە میانە دووەمەکان*Second intervals*. پێچەوانەکەی جوولەی ناپێکبەستە*Disjunct movement*، بڕوانە/*Disjunct movement*.



Connecting note(E) نۆتەی پەیوەند.

Conque(F), Shell trupmet(E) ترومپێتی پێچەک کە دەگەڕێتەوە بۆ سەتەکانی چاخی بەردین.

Consecutive chords(E) کۆردە بەدوایەکەکان.

Consecutive fifths(E) پێنجەمە بەدوایەکەکان.

Consecutive interval(E) میانەی بەدوایەک.

Consecutive octaves(E) ئۆکتاڤە بەدوایەکەکان.

Conserver(F), Preserve(E) ڕاگرتن، هێشتنەوە.

Conservant le rhythme(F), Preserving rhythm(E) ڕاگرتنی ڕەزم.

Consolate(I) دڵدانەوە.

Consonance, Concord(E), Conconanza(I) دەنگی هاوســاز، کۆنکۆرد. بە دوو تۆن دەوترێت کۆنسونەنت*Consonant* ئەگەر پێکەوەبوونیان بە هاوسـاز و هۆگر بێت بەگوێ،دیســۆنەنت*Dissonant*یش {واتە ناهاوساز} ئەگەر ناساز و ناهۆگربێت، ئاسانترین ڕێگە بۆ پێوانەی بڕی دوو تۆن کە پێیبوترێت کۆنسۆنەنت

پەیوەندییەکی فریکوێنسیانەیە{ئەو دوو تۆنەیە}بە ڕێژە ژمێرکارییەکی ورد. هەر ئەو ڕێژەیەیش میانە مۆزیکیەکان دیاریدەکان. بۆ نموونە:ـ ئۆکتاڤ بەڕێژەی2:1، پێنجەم بە ڕێژەی3:2 و چوارەم بەڕێژەی4:3 کە دەشێت پێیانبوترێت مۆزیک میانە هاوسازەکان. سـێیەمی فیسـاگۆرسـی کە ڕێژەی یەکسانە بە 81/64دادەنرێت بە میانەیەکی ناهاوسـاز*Dissonant*. بڕوانە/*Harmony*. بەڵام لە سکێڵێکی پێنج تۆنیدا، نیوەتۆنێکی وەک میانەی می/*E* بۆ فا/*E-F* کە ڕێژەکەی دەکاتە*256/243* بە دوو تۆنی ناهاوساز*Dissonant* دادەنرێت. بڕوانە/*Harmony*.

Consonance imperfect(E) هاوسـازی نادروسـت،

لە میانەکانی سـێیەم و شـەشـەمی مێجەر یاخود ماینەردا دەردەکەوێت.

Consonance perfect(E) هاوسـازی دروسـت.

لە میانەکانی چوارەم و پێنجەم و هەشـتەمی مێجەر یاخود ماینەردا دەردەکەوێت.

Consonant, Notes harminising together(E) هاوساز، دوو نۆتەی پێکەوە هارمۆنکراو.

Consonare(I) دوو تۆنی هاوسـاز.

Consort(E) کۆنسـۆرت، وشەیەکی کۆنی ئینگلیزییە بۆ کۆنسێرتێکی تەواو لە یەکجۆر ئامێر.

Conte(F), Tale(E), Märchen(G) دیرۆک، داسـتان.

Contemplativo(I) بە تێڕامانەوە.

Contemplazione(I) تێڕامان.

Contemporary(E), Contemporian(F) هاوچەرخ.

Continuando, Continuato(I), Continuing(E) بەردەوامی.

Continua(I), Continue(E) بـێبڕینەوە.

Continance(I) درێژەپێدان.

Continuate(I) بە درێژەپێدان.

Continuato(I) بەردەوامدار.

Continus(I) بێوەستان، بەردەوام.

Contra(I), Opposite(E) هەمبەر، بەرابەر کە دەکرێت یەک ئۆکتاڤ نزمتر بێت.

Contralto(I), Alto voice(E) کۆنترائاڵتۆ زاراوەیەکە بەرزترین دەنگی پیاو و نزمترین دەنگی ژن و کوڕی هەرزەکار. هەر هەمان دەنگ پێشیـدەوترێت ئاڵتۆ یاخود کۆنتەر تینۆر-*Counter-tenor*. مەودای کۆنتراڵتۆ/ی مێیینە دەکەوێتە یەک ئۆکتاڤ سەرووتر لە یەک ئۆکتاڤ لەژێر پلەتۆنی می/Eی نزم لە کلیلی تریبڵ/دا. بڕوانە/*Treble clef*

Contrabass, Double bass(E), Contrabasso(I), Contrebass(F), Kontrabass(G) کۆنتراباس،

گەورەترین مۆزیک ئامێری ژێدارە کە لە چوار *E1-A1-D-G*یاخود پێنج ژێ پێکهاتووە. بۆ یەکەمجار لە دوای ساڵەکانی1700ز/وە بە سـێ ژێ هێنرایە نێو ئۆرکێستراوە.

Contrabass flute(E) کۆنتراباس فلووت کە دوو ئۆکتاڤە{ژێر کۆنسێرت فلووتی ئاسایی}.

Contra bassist, Double bass player(E) **ژەنیاری کۆنتراباس،کۆنتراباسـژەن.**

Contra bassoon, Double bassoon(E), Contrebasson(F), Contrafagotto(I), Kontrafagott(G) **کۆنتراباسـسـوون.**

**ئامێرێکی لوولە فووپیاکەری چوارپێچ پێدراوە، ئۆکتاڤێک لە باسـسـوون***Bassoon***نزمترە.**

Contrabassonist(E) **ژەنیاری کۆنتراباسـسـوون، کۆنتراباسـسـوونـژەن.**

Contrabass trombone, Octave-posaun, Double-bass trombone(E), Contra posaune(G) **کۆنتراپۆساون.**

**کۆنتراباس ترۆمبۆن، ئامێرێکی مۆدێرنە، یەک ئۆکتاڤ لە تینۆر ترۆمبۆن نزمترە، بەزۆری بۆ ئۆکتاڤی گەورە و کۆنترائۆکتاڤ بەکاردێت.**

Contrabass tuba(E) **کۆنتراباس تووبا، لەسەر دوو دەنگەوار دروستکراوە**

**کە بریتین لە پەردەی دۆ/***C* **و سـێ بیمۆڵ/**$B^b$**. دوو شـێوەیشـی هەیە یەکێکیان شـێوەی ئاسـایی کە هەر پێیدەوترێت تووبا***Tuba form***، ئەیتریان پێچاوپێچ شـێوە***Spiral form* **کە هێلیکۆنـس***Helicons***یـشی پێدەوترێت.**

Contraltino(I), High, Light tenor voice(E) **بەرز، دەنگی تینۆری سووک.**

Contrapoint(E),Contarpunctus(L), Contrapunto(I), Contrepoint(F) **کۆنتراپونت.**

**وشـەیەکی لێکدراوی وەرگیراوە لە زوانی لاتینییەوە کە پێکهاتووە لە***Contra***واتە بەرابەر و پنت***Punctus* **واتە خاڵ:پنت، چەمکی وشەلێکدراوەکە- پنت بەرامبەرێن ـ دەبەخشێت. واتە دانانێکی تەکنیکانەی میلۆدیەک یاخود زیاتر و بەستنی بە یەکێکی ترەوە بەپێی ئەو ڕێسایانەی بۆی داڕێژراوە.**

**بنەڕەتی ئەو دانانەیش بریتیە لە نۆتە***note* **بەرابەر***Opposite* **نۆتە***Note***، یاخود میلۆدیەک بەرابەر میلۆدیەکی هەڵگێڕاو***Invertible***. چەشـنە مۆزیکێکـی زۆر کۆنـی پۆلیفۆنـی***Polyphoni***یشە و پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیشی هەیە بە کانتۆس فێرمۆس***Cantus fermus***/ەوە چونکە ڕەوشی سروودەکانی لەسەر ڕێسـاکانی کۆنتراپونتە.**



**چەند جۆرێکیش لە کۆنتراپونت هەیە کە بریتین لە:ـ**

- **کۆنتراپونتی دوو دەنگیی کە پێکهاتووە لە:ـ**

1. **نۆتەیەکی تەواو***Semibreve* **بەرابەر نۆتەیەکی تەواو بەشـێوەیەکی تەریبی.**
2. **دوو نیوەنۆتە***Half-note* **بەرابەر نۆتەیەکی تەواو***Whole-note***.**
3. **چوار چارەکەنۆتە***Quartet notes***بەرابەر نۆتەیەکی تەواو.**

- **کۆنتراپونتی سـێ دەنگی کە پێکهاتووە لە:ـ**

1. **نۆتەیەکی تەواو***Semibreve* **بەرابەر نۆتەیەکی تەواو.**
2. **دوو نیوەنۆتە***Half-note* **بەرابەر نۆتەیەکی تەواو.**
3. **چوار چارەکەنۆتە***Quartet notes***بەرابەر نۆتەیەکی تەواو.**

4. **کۆنتراپونتی سینکۆپکراو***Syncopated counterpoint*...**دووەم نیوەنۆتەی یەک باڕ***Bar***بەستراو بە یەکەم نیوەنۆتەی باڕی دوای بەرابەر بە نۆتەیەکی تەواو لەسەر یەکەم بەشی هەر باڕێک.**
5. **کۆنتراپونتی ڕازاوە***Florid counterpoint*...**تێکەڵێکە لە سێ بەش.**

**ئەمانەیش چەند جۆرێکی ترن لە کۆنتراپونت:ـ**

- **جووت کۆنتراپونت ، واتە دوو بەشی پێچەوانە بۆ یەکتر.** *Double counterpoint(E)*
- **هەڵگەڕاوە کۆنتراپونت.***Invertible counterpoint(E)***واتە گۆڕینەوەی دەنگی سەرەوە و خوارەوە لەگەڵ یەکتردا بۆ زیاتر خۆشکردنی کاریگەریێتی.**
- **سیانە کۆنتراپونت. واتە سێ بەشی بەرابەر***Triple Counterpoint(E)***بۆ یەکتر کە دەشێت بۆ پێنج جێ***Position***ی بەرابەر و بە هەموویشی شەش جێ پێکبهێنێت.**
- **چوارە کۆنتراپونت***Quadruple counterpoint(E)* **کە دەشێت بۆ بیستوچوار***Twenty-four possible* **جێ{پۆزە}***Position.*
- **پێنجە کۆنتراپونت***Quintuple counterpoint(E* **کە دەشێت بۆ سەدوبیست** *One hundred and twenty* **جێ{پۆزە}***Position.*

**کۆنترائۆکتاڤ کە مەودای دەکەوێتە لەنێوان تۆنی/**C[1]**تاکو تۆنی/**C[2]. Cotra octave(E)

**کۆنتراپونتنووس، ئەو مۆزیکزانەی لە توانایدایە کۆنتراپونت بنووسێت.** Contrapuntist(E)

**گوڵینە کۆنتراپونت.** Contrapunto colorato(I) Florid countrapoint(E)

**جووڵەی دژوار، جووڵەی دوو دەنگ بە ئاڕاستەی دژوار.** Contrary motion(E)

**دژە تێمپۆ، سینکۆپێن، پاش لێدان.** Contrat tempo(I), Against beat, Syncopation, After beat(E)

**کۆنتراڤیۆلین، ئامێرێکی کەمێک لە کەمانچەی ئاسایی گەورەترە، نزیکەی ساڵی**1930**ز لەلایەن هێربرد نیوبۆڵد***Herbert Newbold***ی ئایسلاند/یەوە داهێنرا. لە ئۆرکێسترادا لە ڕیزی ڤیۆلا/ دایە.** Contra-Violin(E)

**کۆنتراڤیۆلینۆ، ئامێرێکی داهێنراوە لەلایەن ڤالێنتینۆ دی زۆرزی***Valentino de zorzi* (1837-1916)**، ئامێرێکی گەورەیە کە یەک ئۆکتاڤ لە کەمانچە نزمترە و وەک ئامێری چێللۆ دەژەنرێت.** Contra-violino(E)

**پۆشیو، بێدەنگی، کپکردنی تەپڵەکان بە پارچە کوتاڵێک.** Coperti(I), Covered(E)

**کۆپلە، جۆرە هەڵبەستێکی میللی ئیسپانیایی لەگەڵ ستراندا بە سەروبەندێکی کورت.** Copla(S)

**پێکپەی ئامێرە تەپڵەکان***Drums* **بەهۆی پارچە کوتاڵێکەوە.** Copreto(I), Covered(E)

**پەیوەست، بەستنی ئۆکتاڤێکی نزم یاخود ئۆکتاڤێکی باڵاتر کە کاریگەرییان بەیەکتریەوە هەبێت لە ژەنیندا، بۆ نموونە بەستنی** *Sub-Octave* **و** *Super-Octave.* Coppel(G), Copula(I), Copule(F), Coupler(E)

Cor(F), Cornet(F), Corno(I), French horn(E), Horn(G) **کۆڕنۆ، هۆڕن، بووق کە***Cor.*
**کورتکراوەکەیەتی، ناسراو بە بووقی فەڕەنســایی کە لە شـێوەی شــاخی گیانلەبەران سـەردەمانێکی زوو بۆ ڕاوشکار بەکاردەهێنرا بەڵام پاش دەسکاری و چاککاری ئێستا بۆتە ئامێرێکی وا مۆدێڕن کە لە ئۆرکێسترادا بژەنرێت.**

Corale, Coralo(I), Plain Chant(E) **ســروودی ســادەی بێ هاویار لە ئامێری مۆزیک کە لە کڵێسە ڕۆمان ـ کاتۆلیکەکاندا دەسـروودێنرێت.**

Cor anglais(F), Corno ingelese(I), English horn(E), Englisches horn(G) **هۆڕنی ئینگلیزی، ئۆبوا ئاڵتۆ کە بە شـەش تۆن لە ئۆبوا** *Oboe***ی ئاسـایی نزمترە.**

Coranto, Corrente(I), Courante(F) **کۆرانتۆ،**
**ســەمایەکی ئاوروپایی ڕەشبەڵەکییە کە بە شـێوەی ئەڵقە ســەرە پەنجەی یەکتر دەگیرێت. بەزمە فەڕەنســاییەکەی کە لەســەر کێـشی6/4 دەگەڕێتەوە بۆ سـەرەتاکانی سـەتەی/16م و لەسەردەمی شــا لویسی/14م دا زۆر باو بووە. بەزمە ئیتالیاییەکەی لەسەر کێشی3/8 و 3/4.**

Cor á pistons(F) **هۆڕنی فەڕەنســایی، بڕوانە/** *Cornet*.

Corda(I), Corde(F,I), String(E) **ژێ، ســیم، تار، تاڵ، تەل، دەمار.**

Cor des Alpes(F) **هۆڕنی شـوان نشینانی زنجیرەچیاکانی ئاڵپ***Alpe* **لە ئاوروپا.**

Cor de basset, Basset horn, Clarinette basse(F), Bass clarinet(E) **باس کلاڕنێت.**

Cor de chasse(F), Hunting horn(E), Trompe(F) **بووقـی ڕاوشکار لە شێوەیەکی ســاکاریدا.**

Corista, Diapason(I,F), Pitch fork(E), Stimmgabel(G) **دیاپازۆن، پێکۆک، وشەیەکی**
**هەڵێنجراوی زۆر کۆنی یۆنانییە، مۆزیکژەنان و هۆزاننوســان ئەم وشەیان لە زۆر بواری هەســتدەربڕینیاندا بەڕوونـی و ناڕوونی بەکارهێناوە، لەبەرئەوە بەلایەنەوە زۆر ئەســتەم بووە پێناسەیەکی تەواوی پێبدەن. ئەوەی کە ڕۆژگاری ئێســتا مۆزیکژەنان گوزارەی لێدەکەن ئەوەیە کە مانای بە هەموویەوەڕا***Through All***بگەیەنێت. واتە پێوانەی ئەو پەیبردنە هونەریە کە نۆتە و ژێیەکان بگرێتەوە. شێوەی ئەم گوزارە دەربڕینە لە ئامرازێکی شـێوەU/دا پیشاندەدرێت بۆ پێکۆک کردنی دەنگەســەرەکیەکانی مۆزیک، دانانـی پلەدەنگی لاLaیش وەک یاخود پێوەرێک بۆ ئەوانیتر بە فریکوێنسی***Frequency***ی 440Hz لە پلەگەرمای15°C یاخود پلەگەرمای59F(فەهەرێنهایت)بە بڕیاری ئاکادیمیای فەڕەنسایی ســاڵی1859ز کە بەم مەرجانە پێیـدەوترێت پێکۆکی ئاســایی***Diapason normal***. دەنگی لا/***La***یش بۆیە دانراوە لەبەرئەوەی کە لە ڕووی فیزیکیەوە لەو بوارە ئۆکتاڤەدا لە هەموو دەنگەکانیتر بۆ بیستن خۆشــتر و بەچێژترە. بڕوانە/***Diapazon*.

Cor mixte(F), Corno alto, Corno basso(F) **هۆڕنی تێکەلەدەنگ، کۆڕنۆ ئاڵتۆ، کۆڕنۆ باس،**
**بووقێکی سەردەمانی دێرینی ئاڵمانیاییە کە تایبەتە بە دەنگەواری بەرز و نزم. لە سـەرەتای سـەتەی/19مدا لەلایەن ژەنیاریکی فەڕەنســاییەوە بەناوی دوڤێرنۆی***Duvernoy***خاسکاری تیاداکرا.**






بەرمیلەتەپڵی چینی
Chinese Barrel drum



کۆنتەرباس
Contrabass



Concertina کۆنسێرتینا



کلاریۆن{سەتەکانی ناوەڕاست}
Clarion

Cornamusa(I) Cornamuse(G) کۆڕناموسە، ئامێرێکی هەواییە بە مەشکەنای *Bagpipe* دەچێت. دەنگێکی خۆشی نزمی بە چەند قەوارەیەک هەیە وەک لەم خشتەیەدا:ـ

| دەنگەوارەکان Size | نزمترین نۆتە Lowest Note |
|---|---|
| Soprano | c' |
| alto | g',f' |
| tenor | c |
| Bass | F |
| Great Bass | C |

Cornet(F), Cornetta(I), Small horn, Post horn(E) کۆڕنێت، بووقی بەرید، گچکەهۆڕن.

Cornettino(I), Small cornet(E) کۆڕنێتی بچووک.

Cornetto(I), Crooked horn(E) بووقی چەماوە{کۆلاپی}.

Corno da caccia(I) بڕوانە/ *Cor de chasse*.

Cornone,Corno torto(I), Great cornett(E) کەتەهۆڕن، هۆڕنـی گەورە.

Corno pieno(I), Full Chorus(E) کۆرسی تەواو لە هەموو دەنگەوارەکان.

Coro(I), Choir,Chorus,Great chorus(E) کۆڕۆ، کۆرس.

Coro spezzato(I) کۆرسی بچووک، دابەشکردنی سترانخوانان بۆ گروپی بچووکتر.

Corona, Fermata(I), Couronne(F), Fermate(G), Pause(E) تاج، کڵاوە،

هێمای هێوربوونەوەی ڕەزم بەرەو کۆتایی و پشوو. بڕوانە/*Fermata*.

Cor simple(F), Natural horn(E) هۆڕنی سادە.

Corrido(I) جۆرە باللاد*Ballad*ێکی فۆلکلۆری مۆزیکئاویزە.

Corta, Corto(I), Short(E) کورتە.

Cortamente(I), Shortly(E) بەکورتی.

Cortége(F), Proccession(E) کەژاوە، کوردۆس.

Coryphaeus(L), Coryphée(F), Leader of dramatic chorus(E) ڕابەری کۆرسی دراما.

Cosaque(F), Cossack dance(E) سەمای کازاک ی{کازاچۆ}/ سەر بە ناوچەی کەزاخستانە

لەسەر کێشی2/4 *With two in a measure*.

Constretto(I), Forced, Constrained(E) زۆرلێکراو، فشارکراو.

Cotillion(E), Cotillon(F) جۆرە سەمایەکی دوو کەسی سەردەمانی سەتەی/19م.

Cottage piano, Small Upright pianoforte(E) پیانۆفۆرتی وەستاو.

Coulé(F), Slur(E) بڕوانە/*Legato*، ئۆرنامێنت*Ornament*ێک کە بریتی بێت لە دوو نۆتەی

هەڵبەزیو*Ascending notes*یاخود دابەزیو*Descending notes*بۆ پێکهێنانی ئاپۆچیاتۆرایەکی

دەبڵ*Double* یاخود سێتایی*Triple*.

Coulisse(F), Slide trumpet(E) دەنگخزان،

دەنگ خزاندن*Tuning-slide* لە ئامێرە فووپیاکەرەکاندا بەتایبەتی لە ئامێری ترومپێت.

Couac(F), Quack, Squack(E) کواک، واقەواق، دەنگی نەشازی ئامێری کلارنێت

کە فووی پیادا دەکرێت دەنگێکی وەک قیرەی باڵندەی قاز و مراوی لێوەدەردەچێت.

Couched harp, Spinet(E) هارپی بچووک کە کارپێکردنی

دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی دواسەتەی/17م.

Count(E), Compter(F) ژماردنی لێدان لە کێشێکدا.

Counter exposition(E) دووەمین بەش لە فیوگە*Fugue*.

Coup d’ archet(F) کەوانژەن، لێدانی کەوان بەسەر ژێی/دا.

Countersubject, Counter theme(E) کۆنتەرسوژە،

دووەم بابەتی فیوگە*Fugue* کە بەرسف*Answer*بەرابەرەکەیەتی.

Courrone(F), Pause(E) وچان، پاوس.

Coup d’ archet(F), Bow-stroke(E) لێدانی کەوان بەسەر ژێی/دا.

Couple flute(E) چووت فلووت.

Crécelle(F), Knarre(G), Rattle(E) خڕەسیللا، خشخشە، خڕنگە، ئامێرێکی ڕەزمییە.

Credo(L), Belief(E) کرێدۆ، باوەڕ، سـێیەم سـروودە لەو شـەش کۆنوێژ*mass*ەی کە لە کلێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا بەجێدەهێنرێت. بڕوانە/*Cycle*

Crescendo(I), increasing(E) ,Wachsend(G) کرێشـێندۆ، تۆن بردن بەرەو توندژەنین. کورتکراوەیەتی*Cresc.*.



Crescendo a poco a poco(I) کرێشـێندۆ بەرەو کەمکەمی.

Crescendo molto(I) کرێشـێندۆ بەرەو دەنگ بەرزبوونەوە.

Crescendo pedal(I) پایدەری دەنگبەرزکردنەوە لە ئامێری ئۆرگن و پیانۆ.

Crescendo poco(I) کرێشـێندۆ بەرەو کەمی.

Crescendo sempre(I) هەمیشە کرێشـێند، واتە بەردەوامبوون لەسەر کرێشـێندۆ.

Crescendo sino al fine(I) کرێشـێندۆ تا کۆتایی.

Cretique(F), Critic(E) کریتیک، ڕەزمی پێنج تایی، کێـشی5/4.

Croche(F), Quaver(E), Croma(I), Achtel(G)  کرۆش،1/8ی نۆتەی تەواو*Whole-note*.

Crochet, Quatrer note(E), Simiminima, Nera(I), Noire(F)  نوار، 1/4ی نۆتەی تەواو.

Croiser(F),To Cross(E) تێبپەڕێت.

Croisant(F), Crossing(E) تێپەڕین.

Croisé(F), Crossed(E) تێپەڕیو.

Croisant les mains(F), To cross hands(E) تێپەڕینی دەسـتان.

Crook, Shank(E) ترومپێتی لوولەچەمیو{کۆلاپ}کە لە داڕشـتەی براس*Brass* دروسـتکراوە.

Cross-flute(E) فلووتی لاوەکی، کە بەلادا فووی پیادادەکرێت.

Croon(E) کرۆون، نەرمە سـتران بە دەنگێکی نزم{وەک زەمزەمەکردن}.

Crotal(E) کرۆتاڵ، کۆنترین جۆری زەنگە.

Crotales(E,F), Cortali(I) چەقچەقە، ئامێرێکی ڕەزمیە لە شـێوەی کەسـتانێت.

زۆر جۆری بە چەند دەنگەوارێکی جیاواز هەیە بەڵام بەتێکڕا مەودای دەنگەواریان لەنێوان/$C^6$ بۆ $C^8${دۆ/ی ناوەڕاست بریتیە لە$C^4$}.

Crotalum(Gr) کرۆتالوم، کۆنترین ئامێری کەستانەی یۆنانی/ڕۆمانییە کە لە تەختە، ئێسک و برۆنز...دورسـتدەکرا، بەتایبەتی لە سـەمادا بەکاردەهێنرا.

Crochet rest(E)  وچانە نوار کە یەکسـانە بە1/4ی پەردەیەک.

Crowder, Crwth,Crowd, Hrotta کراودەر، ئامێرێکی دێرینی هەرێمی وێڵز/بەریتانیایە لە شێوەی کەمانچە. Crouth, Crowth, Cruit(E)

Crumhorn(E), Cromorne(F) کرۆم هۆڕن، جۆرە ئامێرێکی بووقی زۆر کۆنی فەڕەنسـاییە شـێوەیەکی چەماوەی هەیە کە لە سەردەمەکانی سـەتەی/15م تاکو 17م برەوی زۆر بووە.

C-Sharp keys(E) کلیلەکانی دۆـ دیێز.



C-sharp major keys(E) کلیلەکانی دۆ دیێز ـ مێجەر.



C-sharp major scale(E) سـکێڵی دۆ ـ دیێز.



C-sharp minor keys(E) کلیلەکانی دۆ دیێز ـ ماینەر.



Cuadro flamenco(S) کوادرۆ فلامێنکۆ، گروپێکی فلامێنکۆیە کە لە سـەماکاران و سـترانبێژان و گیتارژەنان پێکهاتووە.

Cue note(E) کیو نۆتە، دەخرێتە سـەر بەشە جیا*Separate part*کانی پارچەمۆزیکێک یاخود سـترانێک،پیشـانیدەدەات کە لە کوێدا ئەو بەشـە دەسـتپێدەکات، دەشـێت ئەم نۆتیلانەیش لە ناو بەشـەکەدا یاخود لەسـەروو سـکێڵەکەدا دابنرێن.

Cuivre(F), Copper-Brass(E) براس، دارِشتەیەکی مادەنی پێکهاتووە لە 70%مس و30%توتیا کە زۆر لەبارە بۆ ئامێرە فووپیاکەرەکان.

Cuivré(F), Coppery-Brassy(E) مسیی ـ براسـیی، مەبەست ئامێرە فووپیاکەرەکانە کە لە ئۆرکێسترادا پێپاندەوترێن ئامێرە براسـیەکان*Brass instruments*.

Cup, Mute(E) کەپ. ئامرازێکی دەنگکپکردنی ئامێرە براسـەکانە پارچەیەکە بۆ داخسـتنی ئەو بەشـەی کە دەمی لەسـەر دادەنرێت بۆ فووپیاکردن کە پێیدەوترێت پارچەدەم*Muothpiece*لە سـەرکەپامێرە براسـەکاندا.

Cupo(I), Dark, Sombre, Morosely(E) تاریک، تار، بـێهەوەس، مات.

Curtal(E), Dulzian(G) کورِتاڵ، ئامێرێکی هەوایی شـێوە قووچەک زورِنایی سەردەمی هۆریزانە*Renaissance* کە مەودای دەنگەوارەکانی تاڕادەیەک بە ئامێری باسـسـوون دەچێت.

Curwen handsigns(E) کوروێن دەستەهێما، شـێویەکە لە مۆزیک نۆتاندن کە لەلایەن مامۆستای وانەی مۆزیک جۆن کوروێن(1816-1880)*John Curwen*ەوە پەرەپێدرا، ئەویش دانانی هێما بەدەست بۆ حەوت نۆتە سـەرەکیەکە کە بەم شـێوەیە ئاماژەی پێدەکرێت:ـ




Custos(L) کوســتۆس، هێمای ســکێڵەکە لە کۆتایی هێڵاسـۆ*Staff*کەدا بە مۆنۆفۆنی*Monophonic*{دەنگێکی تاک}دەردەکەوێت. پێشی پەردە*Pitch*ی یەکەم نۆتەی هێڵی بەدوا*Following line*دەکەوێت کە دەبێتە یاریدەیێک بۆ ژەنیار و سـترانبێژ تاکو گۆڕینی لەکاتی جێبەجێکردنی کارێکدا بزانێت. ئەم هێمایە لە هێڵەکانی مۆزیک نۆتاندن*Music notation* دا تا کۆتایی سـەتەی/16مدا کاریـپێدەکرا. بەڵام لە مۆزیکی مۆدێرندا تاڕادەیەک ئاسـتنکراوە.



Cut-time(E), C-barré(E) کاتبڕ، کێشی2/2. ₵

Cycle(E, Cyklus(G) چەرخە، ئەڵقە. مەبەست لەو شەش کۆنوێژ*mass*ەی کلێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکە کە یەکبەدوایەکدا فراهمەدەکرێن و بریتین لە:ـ

*Kyrie*, *Gloria*, *Credo*, *Sanctus*, *Bendictus*, *Agnus dei*

چەند جووڵەیەک لە بازنەیەکدا. سترانی بازنە، بازنەیەک لە ئۆپێرا، کۆبەند.

Cycle des le quartes(F), Circle of descending fourths(E) بازنەی دابەزیوە چوارەمەکان.

Cycle des le quintes(F), Circle of asceding fifths(E) بازنەی هەڵبەزیوە پێنجەمەکان.

بڕوانە/*Circle of fifths*.




Cyclic(Cyclical) form(E) بازنەشـێوە، زاراوەیەکی دوو مانابەخشـە یەکێکیان بەمانای گشـتی*General*دێت و ئەویتریان بەمانای پەرتاڵ*Particular*.کە لە پەیبردنە گشـتیەکەدا گوزارە لە شـێوەسـاکاری هەر کارێک لە چەندین جووڵە*Movements*یەکدا دەکات،

بۆ نموونە:سویت*Suite*، سۆناتا*Sonata*، ژێی چوارینە *String quartet*، سیمفۆنی*Symphony*.
لە پەیبردنە پەرتاڵیەکەیشدا گوزارە لە شێوەی هەر کارێک دەکات کە جووڵەکان*Movements* لە هەندێک بیرۆکەی مۆزیکی*Musical theme*یەوە بیستراییتەوە. پەیڤی جووڵە*Movement*یش وەک مۆزیکزاراوە چەند مانا لەخۆدەگرێت لەوانەیش:ـ تێمپۆ*Tempo(I)*، تێز*Thesis*{لە دیدەی فەیلەسوفی یۆنانی ئەقلیدس*Euclid*} هەروەها*Set(E)* و *Satz(G)*.

ئامێری قانوون. Czimbal, Czimbalom, Czimbalon, Zimbalon(H), Dulcimer(E)

ئامێرێکی ژێدارە کە لەنێو زۆر میللەتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی ئاوروپای خۆرهەڵاتی وەک ڕۆمانیا و هەنگاریا/دا باوە.

سیمباڵ، Cymbal(E), Cymbale(F), Becka, Schale(G), Kymbala(Gr) Piatti cinelli(I)

زەنگۆڵە، دوو لەپکی مادەنی/یە کە دەکرێتە دوو پەنجەوە و دەدرێن بەیەکدا بۆ ڕەزم ڕاگرتن لە ئۆرکێسترا و بەزمی تردا. هەندێک جۆر کە پێیدەڵێن سیمباڵی کراش*Crash cymbals*، دەوریان بە چەرم دادەپۆشرێن دەدرێن بە یەکدا تاکو زرنگە کانزایەکەی زۆر کەمبێتەوە.

سیمباڵژەن، سەنجژەن. Cymbalist(E), Cymbalista(I)

------------------------------------
----------------------
------------



Def دەف



دەفزنجان
Defzengan

# D



دیجەریدوو
Didjeridoo



دومبوک/زەرب
Dumbuk


دووەم نوتە{سەروو پایەSupertonic}لە سکیلی دۆ مێجەر.
Re(I), D(E,G)
D1 D d d1 d2 d3 d4
Hz: 36.708 73.416 146.83 293.66 587.33 1174.70 2349.30
Middle C


Ra(I), Des(G), D-flat(E)
Hz: 34.684 69.296 138.59 277.18 554.36 1108.73 2217.46
Middle C


Ri(I), Dis(G), D-sharp(E)
Hz: 38.891 77.782 155.56 311.13 622.25 1244.51 2489.02
Middle C

# D

مۆزیک...خۆراکی گیانە...پەی ڕەوێنە......ئارامبەخشــی دڵ و دەروونە.
پەندی دانایان

---

D(E,G), Re(I), Ré(F) تۆنــی ڕێ*Re*، دووەمین پلەدەنگی دوای تۆنی دۆ/ *C*.
دووەم نۆتەیە لە سکێڵی دۆ ـ مێجەر*C-major*دا.



D ڕێ/*D*...بە پیتی گەورەی لاتینی*D* ئاماژەیە بۆ کۆردی ڕێ ـ مێجەرسـیانیی*D-major triad*.

D ڕێ/*d*... ئاماژەیە بۆ کۆردی ڕێ ـ ماینەر سیانیی*d-minor triad*.

D-flat(E), Des(G), Re-bemolle(I), Ré-bémol(F) ڕێ ـ بیمۆڵ.



D-minor key, D-moll(G), Re-minore(I) کلیلی ڕێ ـ ماینەر.



D-flat major keys(E) کلیلەکانی ڕێ بیمۆڵ ـ مێجەر.



D-Sharp-minor keys(E), Dis moll(G) کلیلەکانی ڕێ دێز ـ ماینەر.



D-flat minor keys(E) کلیلەکانی ڕێ ـ بیمۆڵ ماینەر کە یەکسانە بە دۆ دێز ـ ماینەر.

D-minor keys(E), D-moll(G) کلیلەکانی ڕێ ـ ماینەر.



D-flat major scale(E) ســکێڵی ڕێ بیمۆڵ ـ مێجەر.



D-double flat(E), Deses(G), Re-bemolle(I) ڕێ ـ دەبڵ بیمۆڵ لەسـەر سکێڵی دۆ ـ مێجەر.



D-major scale(E), D-tonalitet(G), Re-maggiore scala(I) سـكێڵى ڕێ ـ مێجەر.



D-sharp(E), Dis(G), Re-dièse(F) ڕێ ـ دێز.



D-sharp major scale(E) سـكێڵى دۆـ مێجەر ،هەمان كليله بۆ مى بيمۆڵ ـ مێجەر *E-flat major*.



D-double sharp(E), Disis(G), Re-double-dièse(F) ڕێ ـ دەبڵ دێز.



D-major keys(E) كليلەكانى ڕێ ـ مێجەر.



Da(I), De(F), From, Of(E) له.

Da capo(I), From the head(E) له سـەرەتاوە.




*D.C* كورتكراوەيەتى.

Da capo al coda(I) له سـەرەتاوە تاكو كۆتا/***D.C. al coda***.

Da capo al fine(I) له سـەرەتاوە تاكو كۆتايى/***D.C al Fine***.




گەڕانەوە بۆ دەسـپێک و كۆتايى بوون لەو شـوێنەى بە پايان*Fine*نيشـانەكراوە.

Da capo al segno(I), from the beginning to the sign(E) له سـەرەتاوە تاكو هێماكه كه بە/***D. C. Al segno*** ئاماژەى پێدەدرێت.

Da capo al segno poi segue(I) ديســانەوە له سـەرەتاوە تاكو هێماكه و ئينجا درێژەپيدان.

Da capo senza replica(I) له سـەرەتاوە بەبێ ڕەپاتبوونەوە*Repeat*.

D' accordo(I), In tune(E), D' accord(F) له ئاواز{هارمۆنى}دا.

Dach(G), Sound board(E) ئاڕاسـتەكەرى دەنگ.

Da chiesa(I), In church style(E) له شـێوازى مۆزيكى كلێســە.

Dactyl(E,Gr), Dactylus(L) داكتيل، وشەيەكى يۆنانيـيە بەماناى پەنجە*Finger*.



گوزارە له كێشێكى سـێتايى دەكات چ له هۆنراوە چ له مۆزيكدا، پێكهاتووە له يەک بڕگەى درێژ و دوو بڕگەى كورت ∪ ∪ —.

Dactylion(E) داکتیلیۆن، ئەم زاراوەیە نزیکەی1835ز ساڵی لەلایەن هێنری هێرتز*Henri Herz*وە داهێنرا کە ئاماژەیە بۆ دە ئەڵقە*Ring*ی پۆڕاو بۆ پەنجەکانی پیانۆژەن، هەر ئەڵقەیەیش بەستراوە بە سپرینگ*Spring*ێکەوە بۆ گەڕانەوەی دوگمەی دەنگەکان لەکاتی لێداندا.

Dadayi(Fa,Kr) دادایی، دەهۆڵی زۆر گەورە.

Dafri(Hn) دەفری، ئامێرێکی تەپڵی زۆر بچووکی هیندی زۆر جوان نەخشێنراو بە ئەندازەی دەفرێکی چەند سانتیمەترێک کەمتر لە دەمە تیرەی تەپڵەکە و چەرمەکەیشی لە پێستی مارە.

Dal, Dall, Dalla, Dallo, Dagla(I) لە، بەهۆی، لەڕێی.

Da lontano(I) دوور لە دەست.

Dal segno(I), From the sign(E) لە هێماکەوە *Dal S.*، کورتکراوەیەتی. 𝄋

Ab dem Zeichen(G), Depuis le signe(F)




Da segno al coda(I) لە هێماوە تا کۆتا/***D.C. al Coda***.

Da segno al fine(I) لە هێماکەوە تا کۆتایی/***D.S. al Fine***.

Damp(E), Dämpfen(G), Muffle(E) ⨁ کپ{کپاندنی دەنگ لەرینەوە}.

Damp all(E) ⨁ کپی سەرانسەری.

Damper, Mute(E) پێکپە.

Damper pedal(E) کپە پایدەر، کپاندنی دەنگ پیانۆ بەو پایدەرەی کە هەیەتی.

Dampers(E) پێکپەکان، کۆمەڵە کلیلێکە دەکەونە نێوان چەکوشەکان و ژێیەکان، کە لە ئامێری پیانۆدا پێ بە پایدەردا دەنرێت دەنگەکان کپ دەبن.

Dämpfer absetzen(G), Without mute(E) بێ پێکپە.

Dämpfer nach und nach abnehmen(G), لابردنی پێکپە یەکبەدوایەک.

Remove the mutes one by one(E)

Dance(E), Danse(F), Danza(I), Tanz(G) سەما. بەزمێکی گیانییە کە بەشێوەیەکی هەنداز و بەڕەزم گشت ئەندامانی بەدەن دەهێنێتە بزە و ڕاوەشاندن.

Dance band(E) تیپی سەما.

Darabuka, Darbucca(Br) تەپڵی یەکلاچەرمی هەڵگیراو کە بە پەنجەکان لێدەرێت.

Darmsaite(G), Gut string(E) ژێ/ی دروستکراو لە ڕیخۆڵەی گیانلەبەران.

Dash(E) داش، توندلێدان، ستاکاتۆ*Staccato*.

بریتیە لە تیرێکی ستوونی*Vertical dash* لەسەر نۆتەیەک کە ئاماژەیە بۆ ژەنین بەشێوەیەکی زۆر ستاکاتۆ*Very staccato* لەکاتێکدا بە پنت{دۆت}*Dot* لەسەری نۆتە بەمانای هەر ژەنینە بە ستاکاتۆ. بەڵام تیری ئاسۆیی*Horizantal dash* لەسەر نۆتە ئاماژەیە بۆ درێژەپێدان لەسەر هەمان نۆتە کە پێیدەوترێت تینوتۆ*Tenuto(I):Sustain(E)*، ئەگەر هەمان تیرەی ئاسۆیی لە بەشی باسێکی فیگیورکراودا*Figured bass* دەرکەوت مانای هەر هەمان درێژەپێدانە لەسەر هارمۆنیەکە.

Dasseble(G), The same(E) هەروەکو، هەمان.

Dauer(G), Duration(E), Étendue(F), Durata(I) بڕوانە/*Duration*.

Daumen(G), Thumb(E), Pouce(F), Pollice(I) پەنجەگەورە.

Daumenaufsatz(G), Thumb position(E) جێی پەنجەگەورە.

Daumenklavier(G), Thumb piano(E) جێی پەنجەگەورە لەسـەر پیانۆ.

Debile, Debole(I), Débile(F), Weak(E) لاواز، بێــهێز.

De La(F), From the(E) لە( بۆ دەنگبێژانی مێـیینە).

Debile, Debole(I), Weak(E) لاواز.

Debolezza(I), Weakness(E) لاوازیی، ســســتیی.

Début(F), Debut, Beginning, Opening(E) یەکەم دەرکەوتنی کارێکی هونەری بۆ جەماوەر.

Débutant, Debutante(F) دەســپێکار، کەسێک بۆ یەکەم جاری کارێکی هونەری بنوێنێت.

Decachord(G) ئامێری دێکاکۆرد کە دە ژێ/ی لەسـەر بەسـتراوە، تاڕادەیەک بە گیتار دەچێت.

Deceptive cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.

Decibel(L) دێسـیبێڵ، یەکە پێوانەی دەنگ زرنگانەوە. زاراوەکە لە کورتکراوەی داهێنەری تەلەفۆن ئەلێکساندەر گراهام بێڵ*A.G.Bell*وە هەڵێنجراوە کە شـێوازێکی لۆگاریتمی هاوکێشەییە گوزارە لە پێوانەی دەنگەکان دەکات بە ڕێگەیەکی ماتماتیکانە.

$I(dB) = 10\log_{10}\left[\frac{I}{I_0}\right]$ Intensity in decibels *I=Sound intensity* دەنگچڕیی

$I_o$= پێوانەڕادەی بیسـتن*Standard threshoold of heareing*.

بەم هاوکێشەیە دەتوانرێت دەنگ زرنگانەوەی هەموو ئامڕاز و ئامێرێک دیاریبکرێت.

$I(dB) = 10\log_{10}\left[\frac{10,000\, I_0}{I_0}\right] = \mathbf{10x4 = 40}dB$

بۆ نموونە ئەگەرI=10,000جای ڕادەی بیسـتن بێت، ڕێژەی چڕی بۆ ڕادەی بیسـتن دەکاتە $10^4$، واتە چڕیی*Intensity*دەنگ دەکاتە*40dB*.

پێوانەی یەک دێسـیبێڵ*1dB*زرنگانەوەی دەنگێکی ئاســایی و لەبارە بە گوێی مرۆڤ.

Decided(E), Deciso(I) بڕاوە، بڕیاردراو.

Decima(L), Tenth(E) میانەی دە پلەی سـکێلێک کە پێکهاتووە لە ئۆکتاڤ و سـێیەمێک.

Decima nona(I,L), Nineteenth interval(E) میانەی نۆزدەیەم.

Decima octava(L), Eighteenth interval(E) میانەی هەژدەیەم.

Decima quarta(L), Fourteenth interval(E) میانەی چواردەیەم.

Decima septima(L), Seventeenth interval(E) میانەی حەڤدەیەم.

Decima sesta(L), Sixteenth interval(E) میانەی شـانزەیەم.

Decima tertia, Decima terzia(L), Thirteenth interval(E) میانەی سـیانزەیەم.

Decimette(F) پارچەمۆزیکێک بۆ دە ژەنیار سـازکرابێت.

Decisivo(I), Perform in a bold(E) بەجێهێنانێکی بوێرانە.

Decke(G), Soundbox of stringed instruments(E) سـنووقە دەنگی ئامێرە ژێدارەکان.

Declamando, Declamato(I), Declamated(E) وتار یاخود چامە خوێندنەوە، یاخود سـترانێک بە جۆش و تاوگێرانە بوترێت.

Declamation(E) هونەری خوێندنەوەی وشـەیە *Word* کە هەنک:نەبرە *Accentuation*، گۆکردن *Pronunciation* و دەربڕین *Expression*...هەرسێکیان پێکەوە ڕۆڵی سـەرەکی دەگێرن لە خوێندنەوەی وتار و چامە و سـتراندا.

Decoration(E), Décoration(F), Onorificenza(I) دیکۆراندن، ڕازانەوە.

Decrescendo, Decresciuto(I), Decreased(E), Abschwellen(G) دیکریشـێندۆ، دەنگ بەرەو کزی،. *Decr* کورتکراوەیەتی.

Decrescendo molto(I) دەنگ زۆر بەرەو کزی.

Decrescendo poco(I) دەنگ کەم بەرەو کزی.

Decrescendo a poco a poco(I) دەنگی کەمکەم بەرەوکزی.

Déclaver(F) گۆڕینی مایەدەنگ{بنەدەنگ}، گۆڕینی تۆناڵیتی.

Défault(F), Fault, Lack(E) فاوڵ، هەڵە، نەنگ.

Def, Daf, Daff(Ar,Fa,Kr,Tr) ئامێری دەف، ئامێرێکی ڕەزمگری زۆر گرنگ و باوە لە مۆزیکی کوردیدا، یەکێکە لەو ئامێرە هەرە دێرینانەی کە لە سرۆتە و بۆنە ئایینیەکاندا ڕۆڵێکی کاریگەری یەزدی{ڕۆحی}دەگێڕێت.

Defective consonant(E) هاوسـازی لەنگ{کە لە میانەی سـێیەمیماینەردا دەردەکەوێت}.

Deficiendo, Diluendo(I), Diminishing in loudness(E) بەرەو دەنگ خامۆشـی.

Degli, Dei, Del, Della, Delle, Dello(I) جگە لە، بێجگە لە.

Degree, Step, Staff space(E), Dégré(F) پلە، هەنگاو، نێوان هێڵەکانی پەیژەیی مۆزیک.

جێی تۆنەکان لە پلەکانی پەیژەی مۆزیکدا کە لە حەوت پلەدەنگی سـەرەکی پێکهاتووە:ـ

| بە نمرەی ڕۆمانی Roman | ناو Name | ناوی بە *Tonic Sol-Fa* |
|---|---|---|
| I, i | 1. پایە *Tonic, Key-note* | *Doh, Ut, C* |
| II, ii | 2. سەرپایە *Supertonic* | *Ra, Re, D* |
| III, iii | 3. نێوەند *Mediant* | *Me, Mi, E* |
| IV, iv | 4. ژێرزاڵ *Subdominant* | *Fah, Fa, F* |
| V, v | 5. زاڵ *Dominant* | *Sol, G* |
| VI, vi | 6. ژێرزاڵی یەکەم *Subdominant*[1] یاخود ژێرنێوەند *Supermediant* | *Lah, La, A* |
| VII, vii | 7. تۆنەنما *Leading note* یاخود ژێرپایە *Subtonic* | *Se, Te, H* |

I II III IV V VI VII VIII

پلەکانی ســکێڵ کە نۆتەکانی بەپێی بنەتۆنی پارچە مۆزیکێک دەژنرێت و دیاریکردنی کلیلەکانیشی بەگوێرەی ئەو دەســگامۆزیکانەی کە لە مۆزیک سیســتەمی خۆراوادا هەیە، وەک لەم خشتەیەدا:ـ

| دەسپێکی پلەکان | | دەسپێکی دەســگاکان | |
|---|---|---|---|
| ناوی پلەکان | سکێڵی نۆتەکان | سکێڵی تۆنەکان | ناوی دەسگاکان |
| Do Tonic | C G D A E B | C F Bb Eb Ab Db | Major (Ionian) |
| Re Supertonic | D A E B F# C# | D G C F Bb Eb | Dorian |
| Mi Mediant | E B F# C# G# D# | E A D G C F | Phrygian |
| Fa Subdominant | F C G D A E | F Bb Eb Ab Db Gb | Lydian |
| So Dominant | G D A E B F# | G C F Bb Eb Ab | Mixolydian |
| La Submediant | A E B F# C# G# | A D G C F Bb | Minor (Aeolian) |
| Ti Subtonic | B F# C# G# D# A# | B E A D G C | Locrian |

Dehnen(G), Étendre(F) — کشــان، فراوانکردن.

Dehors, En dehors(F), Outsite(E) — دیمەنی دەرەوە.

DehoĺKr,Daouli(G) دەهۆڵ، دوولاچەرمی دروستکراو لە پێستی گیانلەبەران وەک بزن و مەڕ، ئامێرێکی ڕەزمی زۆر هەرە کۆنـی میللی کوردییە و لەنێو میللەتانی تریشـدا زۆر باوە. ئەو دوو دەسکەدارەیش کە بەکاردەهێنرێن بۆ لێدانی پێیاندەوترێت دارکە و گۆچەک *Darke u Goçek* یەکێکیان شـێوەچیلکەیی و درێژە بەناوی دارکە *Darke* کە بە دەستی چەپ و ئەویتریشیان گۆچەک *Goçan* کە شـێوەگۆچانیە و ئەسـتوورترە بە دەسـتی ڕاسـت دەگیرێن.

Deholek(Kr), Small drum(E) — دەهۆڵەک، لە دەهۆڵ بچووکترە.

Deliberatamente(I), Deliberately(E) — لەسـەرخۆ، بەمەبەسـت.

Deliberato(I), Deliberate(E) — بە ڕەوتارێکی هێواش.

Delicatamente(I), Delicately(E) — شـیرینێتی.

Delicato(I), Delicate(E) — شـیرین.

Delicatezza(I), Delicacy(E) — شــیرینمەند.

Delicatissimo(I), As delicately as possible(E) — تا بتوانرێت بە شـیرینی،

Délié(F), Untied, Detached, Supple(E), Staccato(I) — نابەسـتوو،

دەشـێت گوزارەکە چەند مانایەک لەخۆ بگرێت:ـ

1. نۆتەیەک لە نۆتەیەکیتر جیابکرێتەوە، وەک سـتاکاتۆ *Staccato*.
2. بەسـووکی *Lightly* و بەئاســانی *Easily*، بەبێ شـپرزەیی *Unconstrainedly*.

Delirio(I), Frenzy(E), Frénésie(F) — هەڵچوون.

Delirante(I), Frenzied(E) — هەڵچوو.

Delizioso(I), Delicious, Sweet(E), Délectable(F) — شـیرین.

Demande(F), Subject of fugue(E) — بابەتێکی فیوگە.

Demi(F), Half(E), Mezzo, Metà(I) — نیمە، نیوە.

Demi-bâton(F) — بڕوانە/ *Multi-rests*.

Demi-cadence(F), Half-cadence, Imperfect cadence(E) نیوەکادەنس، ناتەواوە کادەنس، لەنگە کادەنس، پێکهاتووە لە پێوەندبوونی ژێرزاڵSubdominantو پایەTonic و پاشان کۆتایی بە زاڵDominantی لەنگ(ناتەواو) .




Demi-diminué, Demi-diminuée(F), Half-diminished(E) نیوەگەستوو.

Demi-jeu(F), Mezzo voce, mezzo forte(I), Half-strength(E) نیوەتوند.

نیوەژەنین، واتە ژەنین بە نیوەهێز{بۆ نموونە لە ئامێری ئۆرگنOrgen و Harmonium...هتد}.

Demi-mesure(F), Half a bar(E) نیوە باڕێک، نیوە مازۆرێک.

Demi-pause(F), Minim rest, Half-rest(E) نیوە وچان، نیوەپاوس.



Demisemiquaver(E),Triple-croche note(F) 1/32ی نۆتەی تەواوWhole-note.



Demisemiquaver rest(E), Biscroma pausa(I) 1/32ی وچانی تەواو.



Demi-soupier(F), Eighth-note rest(E) هەشتیەکی وچان.



Demi-ton(F), Semitone, Half-step, Interval of minor second(E) نیوەتۆن، نیوەهەنگاو، میانەی ماینەری دووەم.

Demi-voix(F), Half-voice(E), Mezza voce(I) نیوەدەنگ، نیوەتیندان بە دەنگ.

Démancher(F) دێمانشێ، تایبەتە لە ئامێرە ژێدارەکان کە بریتیە لە جێگۆڕینی پەنجەکانی دەستەچەپ لەسەر دەستەک بە دوورخستنەوەیان لە مفتەک{دەستەک}تاکو دەگاتە نزیک پردBridgeکە سیمەکەی بەسەردا تێپەڕدەبێت.

Dependent Chord(E) کۆردی وابەستە.

Derivated Chord(E) لێرشتە کۆرد ئەویش بە کۆرد هەڵگێڕانەوە، بڕوانە/Inversion.

Depress(E), Déprimer(F), Angustiare(I) داپەستن ئەویش بە نزمکردنەوەی پەردەی نۆتەیەک بە بەکارهێنانی هێمای بیمۆڵ یاخود دەبڵ بیمۆڵ.

Derayi(Kr) دەرایی، زەنگی زۆر گەورە.

Derb(G), Massive, Vigorous, Blunt(E) بەزۆری، بژێویەکی بەهێز، بێ پسوو.

Deritta, Deritto(I), The right hand(E) دەستەڕاست.

Derniére fois(F) دوایین بار، دوایین نۆره.

Derselbe(G), The same(E) هەمان.

Des(G,E), Re(I,F) ڕێ بیمۆڵ.

Desbend(Kr) دەسبەند دەستگرتنی یەکتر لە سەما و هەڵپەڕکێدا.

Désaccordé, Désaccordée(F), out of tune(E) لە تۆن بەدەر، وا لە شتێک بکرێت لە تۆن دەربچێت.

Descending chromatic(E) کرۆماتیک دابەزین.



Des-dur(G) ڕێ بیمۆڵ ـ مێجەر.

Des-moll(G) ڕێ بیمۆڵ ـ ماینەر.

Desga(Fa,Kr), Maqam(Ar,Tr) دەسگا، ـ بڕوانە/*Mode*.

گەر بمانەوێت وشەی دەسگا بەواتایەکی کوردییانە و شیکردنەوەیەکی هونەریانە لێکبدرێتەوە...دەشێت بڵێین کە وشەیەکی لێکدراوی ئاڤێستا/کوردییە و بریتیە لە دەس کە لە وشەی داس یان داش/ەوە هاتووە، ئەمیش لێکەوتووی وشەلێکدراوی مەزـ داش/ە، داش بەمانای دانشت/دانست{حیکمەت}دێت. وشەی گاهـ/یش بەمانای گاز و ڕاز و بانگوهاوار. پاراوی وشەلێکدراوەکە ڕازێکی دانست{سرودێکی بەحیکمەت}دەبەخشێت. بەیتێکی کاریگەر لە بنەماسرۆتێکی ئایینیەوە هەڵێنجرابێت و سیمایەکی بەها و پیرۆزی لەخۆگرتبێت کە ئەگەر نەوا *Tune*ی ئەو بەیتانە بخرێنە چێوە و شێوازێکی کەیف و خۆشیشەوە، مۆرگ و ئاساواری ئەو بۆنوبەرام و ڕۆحە ئایینیەی تیادا هەر دەمێنێتەوە. بۆیە وەک مافێکی زارشتانە(لۆجیکانە) وشەی دەسگا وەک زاراوەیەک لە هونەری مۆزیکدا پێویستی بەو لێکدانەوەیە هەیە تاوەکو وەک چەمکێکی زاراوەیی مانای پڕاوپڕوی خۆی بدات. بەڵام لەدواییدا بە نزیکبوونەوەی میللەتانی دەوروبەر و کاریگەری ئەم چەشنە هونەرە بەرەبەرە واتایتری پێبەخشرا و بەوە لێکدەدرایەوە کە بریتیە لە دەستگاە، واتە پێکهاتوو لە دەست ـ گاە کە مانای شوێنی دەست بدات لەسەر دەسکی مۆزیکئامێرێکی وەک تەموور و ساز و کەمانچەی کوردی کە ژێیەکانی بەسەردا دەبرێت و تۆنە پەردەکانی لەسەر دیاریدەکرێت. هەر دەشێت لەم لێکدانەوەیڕا بەرەبەرە مانا پیرۆزە ئایینیەکەی تاڕادەیەک ئاستنکرابێت و چەمکە زارشتییەکەی خۆی لە دەست دابێت و شێووگێکی زانستانەی دونیایی لەخۆ گرتبێت. ئەم جۆرە دیاردەیە لە کوردستانێکی بەشبەشکراوی داگیرکراودا زۆر لەبەرچاوە کە زۆر وشەی کوردی بۆ ماوەیەکی زۆر لەلایەن میللەتانی دەوروبەرەوە سەرنگومکرابێت و پاشان وەک وشەیەکی نامۆ بهێنرێنەوە ئامێزی زوانەکەمان.

Desiderio(I), Desire(E), Désir(F) ئارەزوو.

Desinvolto, Desinvoltura(I), Ease(E) ئاسان، ئاسوودە و دڵنیا.

Desk, Music stand(E) ستاند بۆ دانانی نۆتە نووسراوەکان.

Dessous(F), Under, Lower part(E) ژێر، بەشی خوارەرە.

Dessus(F), Above, Upper part(E) سەر، بەشی سەرەرە.

Dessus de Viole(F), Descant Viol, Treble Viol(E) تریبڵ کەمانچە، دیسکانت کەمانچە.

Destan(Ar,Kr) دەستان، وشەلێکدراوێکی کوردییە کە لە دەست- دان /ەوە هاتووە، دان بەمانای شوێن یاخود جێگە دێت، هەروەک لە زۆر وشەی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت وەک، شەکردان، گوڵدان، ئاگردان، زیندان...هتد. بەرەبەرە پیتی د کە بەدوای پیتی ت/دا هاتووە ونبووە و پیتی ت لەسەر زار بەسەر د/دا زاڵبووە تەنیا بە دەستان لەباتی دەستدان ماوەتەوە کە سووک و خۆشترە لەسەر زمان. کۆی وشەکە شوێنی دانانی پەنجەکانی دەست دەگەیەنێت لەسەر ئەو دەنگەی مەبەستە دیاریبکرێت، زۆر جاریش وشەی دەستان هاومانای وشەی پەردە/یش دەبێتەوە کە ئەمیش هەر هەمان چەمک دەگەیێنێت. ئەو تەختەدارە درێژەی کە تەلەکانی تەموور و ساز و تار بەسەریادا دەڕوات پێیدەوترێت دەستەک.

Deşt(Ar,Fa,Kr,Tr) دەشت، لێرشتەیەکی سەر بە دەسگای بەیاتە، هەوایەکی زۆر سازگار و دڵگیری هەیە، دەنگێکی زوڵاڵی دەوێت بۆ چڕینی.




فەلەک ئەتناسم کارت چەپ گەردە چەپۆکت زۆرە بۆ باوک مەردە

مەولەوی، بەدەنگی: علی مەردان

Desto(I), Sprightly manner(E) بە ڕەوتارێکی زۆر بژێوەوە.

Destra, Destro(I), Dextra(L), Droite(F), Right(E) لای ڕاست

Destra mano(I), The right hand(E) دەستە ڕاست، *D.M*کورتکراوەیەتی.

یاخود*Manus dextra(L), The right hand(E)*.

De suite(F), One following the other, Immidiatly(E) یەکبەدوای یەکدا، هەنووکانە.

Detached note(E) ناپەیوەستەنۆتە، ستاکاتۆ.

Determinato(I), Determined(E) بە نەخشەی بڕیاردراو.

Detonieren(G) تۆنی توند و بەهێز، تۆنی دەرەکی لە کۆک بەدەر.

Deutlich(G), Distinct(E), Net(F) ڕووناک، ئاشکرا.

Deux(F), Due(I), Two(E) دووان، مەبەست لە دوو دەنگ یاخود دوو ئامێر بەڵام جاروبار بۆ کورت*Short*کردنەوە پێیدەوترێت دووانە تێمپۆ*Á deux temps*. لە مۆزیک ئۆرکێسترادا، هەروەها دوو مانای پێچەوانەیشی هەیە:ـ

1. دوو بەشی ئامێرالی*Instrumental-part*لە یەک هێڵی جیادا بکرێنە یەک.

2. یەک بەشی ئامێرالی بکرێتە دوو بەش.

Deux temps(F) **تێمپۆی**2/2.

Deuxième position(F), Second position(E) **دووەم پۆزە،**
**مەبەست دانانی دەستە لە پۆزیشنی دووەمدا.**

Di(I), By, From,Of(E) **بە، لە، پەیوەستە پیتی{ی}. هەروەها گوزارە لە دووەم تۆنی سۆلفێج{لە تۆنی دۆ/C وە}دەکات لە سکێلێکی کرۆماتێکدا کە دەبێتە دۆ ـ دیز/***C-sharp*.

Diabolus in musica, Tritone(E) **ترێتۆن، دوو نۆتەی وەک گەستووی پێنجەم***Diminished fifth* **یاخود زێدەی چوارەم***Augmented fourth* **کە لەژێر تێمپێرامێنتێکی یەکساندا ڕێژەی فریکوێنسیەکەیان دەکاتە**$\sqrt{2}:1$.

Diad chords(E) **دایکۆردەکان، کۆردە دووانیەکان، لەو جۆرە کۆردانەیە کە لە مۆزیکی میللیدا زۆر بەکاردەهێنرێت و بەم چەشنەیش پیشاندەدرێت:ـ** D G A Am....**وەهەروەها.**
**ئەمانە دوو نۆتە کۆردن و پێویستیان بە سێیەم نۆتە هەیە لە کۆردێکدا. ئەمانە نە کۆردی مێجەرن نە کۆردی ماینەر، بەڵکو تەنیا هەر وەک مۆدال***Modal***ێک بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە:ـ لە مێجەر کۆردی ڕێ/D دا کە بریتیە لە** D$F^{\#}$ A **دەکرێت نۆتەی فادێز/**$F^{\#}$ **لاببرێت کە ئەو کاتە کۆردەکە دەبێتە ڕێ ـ لا، واتە تۆنی یەکەم و پێنجەم.**

Dialogue(E), Spoken words, Conversation(E), Dialog(I) **دواندن، ئاخاوتن.**

Diapason(G,L), Corista(I), Whole octave(E) **پێکۆک، دیاپازۆن.***.Diap* **کورتکراوەیەتی. دێرین وشەلێکدراوێکی یۆنانییە کە پێکهاتووە لە دیا***Dia***واتە لێوەڕا***Through* **و پازۆن***Pason* **کە کۆوشەی پاز***Pas***ە کە لە وشەی***Pant***ی زوانەکانی هیندو- ئاوروپاییەوە هەڵێنجراوە بەمانای هەر***Every***دێت. وەک زاراوەیەکی مۆزیک بە هەندێک مانا هاتووە کە تاڕادەیەک هەمان چەمک دەبەخشن وەک:ـ**

1. **پڕ و تێر هەڵڕژاوێکی دەنگی هارمۆنییە.**
2. **نماوەری تەواوی دەنگ و ئامێرەکانە***Compass of voice and instrument*.
3. **مەودا***Interval* **و هاوساز***Consonance***ی ئۆکتاڤە کە ڕێژەی فریکوێنسییەکەی بۆ پایەتۆن***Tonic* **دەکاتە**2:1.
4. **پیشاندەری ستاندەری پەردە***Pitch***کانە.**
5. **وەک ئامرازێک، چەتاڵ***Fork***ێکە کە تۆنێکی تایبەت تیایدا دەزرنگێتەوە و پێیدەڵێن چەتاڵە تۆن***Tuning fork***کە لە شێوەی/U دایە و بەزۆریش تۆنی لا/A وەک پێوانەیەک بۆ تۆنەکانیتر بەکاردەهێنرێت.**
6. **بە بناخەی تۆنی ئامێری ئۆرگن***Organ***دادەنرێت کە کراوە بە دوو جۆرەوە، یەکێکیان پێیدەوترێت دیاپازۆنی کراوە***Diapason open* **واتە لولەکراوە***Open pipe* **کە درێژیەکەی چوار پێ***2-feet***یە و تۆنی دۆ/ی ناوەڕاست***Middle-C***دەدات. ئەویتریان پێیدەوترێت دیاپازۆنی سەرپۆش***Diapason stop* **واتە لولە داخراو یاخود پۆشراو***Cover pipe* **کە درێژیەکەی نیوەی پێشووە.**

Diapason cum diapente(L) ئۆکتاڤێک و پێنجەم کە دەبێتە میانەی دوانزەم.

Diapason cum diatessaron(L) ئۆکتاڤێک و چوارەم کە دەبێتە میانەی یانزەم.

Diapason normal, Standard pitch(E) دیاپازۆنی ئاسایی.

Diapente(Gr,L), Interval of a perfect fifth(E) پێنجەم. میانە پێنجەمی تەواو کە ڕێژە فریکوێنسییەکەی بۆ پایەتۆن*Tonic*ی دەکاتە 2/3.

Diapente cum ditono(L), A major seventh(E) مێجەری حەوتەم.

Diapente cum semidítono(L), A minor seventh(E)ماینەری حەوتەم.

Diapente cum semitono(L), A minor sixth(E) شەشەم ماینەر.

Diapente cum tono(L), A major sixth(E) مێجەری شەشەم.

Diapentisare(I), Progressions of fifths(E) ڕەچەپێنجەمەکان، واتە پێنجەمە بەدوایەکەکان.

Diaphonia(Gr), Diaphony(E) دیافۆنی، وشەیەکی سەتەی/9مە کە بەمانای ناهاوسازی*Dissonance*دێت کە پێچەوانی سیمفۆنی*Symphony*یە کە بەمانای هاوسازی*Consonance*دێت و هاوپەیڤی ئۆرگانۆم*Organum(Organon)*دەبێتەوە کە بەمانای پۆلەدەنگیی*Polyphony*دێت، واتە زۆری و بەشبوونەوەی دەنگەکان.

Diastema(Gr), Musical interval(E) میانەی مۆزیک.

Diatessaron(Gr), Interval of perfect fourth(E) چوارەم میانەی تەواو کە ڕێژەی فریکوێنسیەکەی بۆ پایەتۆن*Tonic*ی دەکاتە 4:3.

Diatonic(E), Diatonico(I), Diatonique(F), Diatonisch(G) دیاتۆنیک، وەک زاراوەیەک بۆ فرۆزاندنی جۆری سکێل*Type of scale*ێک کە پێکهاتبێت لە پێنج تۆنی تەواو و دوو نیوەتۆن. سکێلە سروشتیەکانی مێجەر و ماینەر و دەسگا*Mode*کان دیاتۆنیکن.



زاراوەی دیاتۆنیک...لە وشە لێکدراوی دیاتۆنیکۆم*Diatonicum*ی لاتینییەوە هاتووە کە پێکهاتووە لە دیا/*Dia* واتە ڕابوردن{تێپەڕین لێوەیڕا}*Passing through* و پاشگری تۆنیکۆم/*Tonicom*یش کە لە دواییدا بۆتە تۆن/*Tonic* بەمانای دەنگەکان یاخود هەر تۆنەکان*Tones*دێت. چەمکی زاراوەکە مانایەکی تەواو لە سکێلێکی دیاتۆنیک دەبەخشێت کە ڕابوردنی تۆنەکانە لە سکێلێکی مێجەردا.

Diatonic interval(E) میانەی دیاتۆنیک، میانەیەک لەنێوان دوو نۆتە کە هەردووکیان لە سکێلەکانی مێجەر و ماینەردا. بۆ نموونە تۆنی دۆ/C بۆ می بیمۆڵ/$E^b$ میانەیەکی دیاتۆنیکە چونکە هەردوو نۆتەکە لە سکێلی دۆ ماینەردا*C-minor*دا دەردەکەوێت، بەڵام دۆ بۆ ڕێ ـ دێز/$D^\#$ بە میانەیەکی دیاتۆنیک دانانرێت چونکە ڕێ ـ دێز لە هیچ سکێلێکی دۆ/Cدا دەرناکەوێتەوە.

بەگشتی....ئەو میانانە دیاتۆنیکانەی کە هەن ئەمانەن:ـ

Diatonic intervals میانە دیاتۆنیەکان

**Perfect** unison(0) | fourth(5) | fifth(7) | octave(12)

**Major** second(2) | third(4) | sixth(9) | seventh(11)

**Minor** second(1) | third(3) | sixth(8) | seventh(10)

**Augemented** unison(1) | second(3) | third(5) | fourth(6) | fifth(8) | sixth(10) | seventh(12)

**Diminished** second(0) | third(2) | fourth(4) | fifth(6) | sixth(7) | seventh(8) | octave(11)

*semitones of equal temperament are given in brackets*

نیوە تۆنەکانی یەکسانە تیمپیریمێنت لەنێو کەوانەکاندا دراوە

Diatonic modulation(E) **دیاتۆنیک گۆڕین، مۆدیولێن بریتیە لە جووڵە میلۆدییەکی دیاتۆنیک** *Diatonic melodic movement* **و تیایدا کۆردی تەوەر** *Pivot chord* **دەگرێتەوە کە کۆردی دیاتۆنیکە** *Diatonic chord* **لە هەر دوو کلیلەکەدا{گۆڕینی چینی دەنگەکانە بە بەکارهێنانی کلیل** *Key* **و میانەکان}.**

Diatonic Scale(E), Gamme diatonique(F) **ســکێڵی دیاتۆنیک، لە ســکێڵی مێجەردا نیوەتۆنەکان دەکەونە نێوان تۆنەکانی سـێیەم و چوارەم و حەوتەم و هەشتەم.**




**لە سکێڵی ماینەردا نیوەتۆنەکان دەکەونە نێوان تۆنەکانی دووەم و سـێیەم و پێنجەم و شـەشـەم.**




**هەر بەگشتی ســکێڵە دایاتۆنیکەکان بریتین لە چوار جۆر:ـ**

1. **ســکێڵی مێجەر** *The major scale*.
2. **ســکێڵی دەسگای ئایۆلیەن{سروشتە ماینەر}** *Aeolian mode (the natural minor)scale*.
**یەکەم و دووەم بە دوو تۆناڵ سـکێڵی کاریگەر دادەنرێن.**
3. **ســکێڵ ماینەری هارمۆنی** *Harmonic minor scale*.
4. **ســکێڵ مێجەری هارمۆنی** *Harmonic major scale*.

**لە مۆزیکی خۆرەڵاتیدا...هەندێک لەو مۆزیک دەســگایانەی هاوتای ســکێڵی دیاتۆنیکی خۆراوایی دەبنەوە ئەمانەن:ـ**

**دەســگای کورد، حیجازکارکورد، ئاسـارکورد، نەوئاسـار، حیجازکار، سـەباکورد، ســێگا.... .**

Diatonic scales and Keys(E) **سـکێڵە دیاتۆنیکەکان و کلیلەکان.**




| | Flat پاتۆک | | Sharp تیژ | |
|---|---|---|---|---|
| | major | minor | major | minor |
| 0 | C, a | | | |
| 1 | F | d | G | e |
| 2 | B♭ | g | D | b |
| 3 | E♭ | c | A | f♯ |
| 4 | A♭ | f | E | c♯ |
| 5 | D♭ | b♭ | B | g♯ |
| 6 | G♭ | e♭ | F♯ | d♯ |
| 7 | C♭ | a♭ | C♯ | a♯ |

Diatonic-semitone, Half-step(E) **نیوەتۆنـی دیاتۆنیک، وەک دۆ/**$C$ **و ڕێ بیمۆڵ/**$D^b$.

Diatonic seventh chords(E) **کۆردە حەوتەمە دیاتۆنیکەکان.**

Diatonische tonleiter(G) **بڕوانە/***Diatonic scale*.

Diaulos(Gr), Double flute(E) **دەبڵ فلووت.**

Diazeuxis(Gr) **جیابوونەوەی دوو تێتراکۆرد بە میانەی تۆنێک لە مۆزیکی یۆنانی زۆر زوودا.**

Di buono gusto(I), Tasteful(E) **بەچێژ.**

Dichord(E) **دوو ژێی ئامێرێک یاخود ژێ/یەکی دوو یەک تۆن.**

Dichtung(G), Poem(E) **هۆنراوە.**

Dick(G), Thick(E) **ئەســتوور.**

Di coipo(I), Suddenly(E) **کتوپڕ، چاوەڕوان نەکراو.**

Dieci(I), Dix(F), Ten(E) **ژمارە دە.**

Diesare(I), Diéser(F) **دانانی هێمای دیز/# لە پێش نۆتەدا.**

Dièse(F), Diesis(I), Sharp(E) **تۆنی دێز{تیژ}/#.**

Dietro(I), Behind(E) **لەدوا.**

Dieselbe(G), The same(E) **هەمان.**

Different pentatonic scale(E) **ســکێڵی پێنجتۆنیکی جیاواز.**



Difficile(I), Catchy(E) سـەخت و ئاڵۆز.

Di fretta(I) فرتە، زۆر بەخێرا.

Digitorium(E) دیجیتۆریەم، کیبۆردێکی پێنج دوگمەیی بێدەنگە بۆ ڕاهێنانی پەنجەکان.

Dignita(I), Grandeur(E) شـکۆمەند، مەزن.

Di Grado(I), By degrees, Step by step(E) بە پلە، هەنگاو بە هەنگاو.

Dijeridu, Didgeridoo(E) دیژەریدۆ، دیدیجەریدوو، دیژێریدو، ئامێرێکی زۆر کۆنی دانشیتوانی وڵاتی ئۆسترالیایە کە لە کلۆرەدارێکی درێژی گەورە دروستکراوە و زمانەیەک لەناو سـەرێکی کلۆرەدارەکەدا بۆی سازکراوە کە فووی پیادەکرێت ونگەونگی لێوەڕا دەردەچێت.

DıÍruba(Hn) دلڕوبا، ئامێرێکی ژێداری میللی هیندیە بە کەوان دەژەنرێت،

Dillettande, Delectare(I), Amateur(E) ئاماتۆر، ئارەزومەند.

Diluendo(I), Diminished in loudness, Dying away(E) بەرەو دەنگ کەمبوونەوە.

Dilungando(I), Lengthening(E), Allongeant(F) درێژاندن، بەدەمەوەدان.

Di minuendo, Decrescendo(I), Diminishing(E) گەسـتن، کەمکردنەوە.

Diminished(E), Diminué, Diminuée(F), Diminuire(I) گەسـتوو، *Dim.* کورتکراویەتی. لێقرتاندن لە بەهای ڕەزم*Rhythmic value*دا بە مەبەسـتی کورتکردنەوە و لێکەمکردن.




Diminished chords(E) کۆردە گەسـتووەکان.

| Symbol هێما | Symbol هێما | Chord Name ناوی کۆرد | Chord Intervals میانەی کۆردەکان |
|---|---|---|---|
| C° | Cdim | C diminished | 1 b3 b5 |
|  | C½dim7 | C half diminished seventh | 1 b3 b5 b7 |
| C°7 | Cdim7 | C diminished seventh | 1 b3 b5 6 |

ئەو کۆردە گەسـتووانەی کە باون

**Common Diminished chords**

Cdim = Co = C Eb Gb
Dbdim / C#dim : Db Fb Abb or C# E G
Ddim = D F Ab
Ebdim = Eb Gb Bbb
Edim = E G Bb
Fdim = F Ab Cb
F#dim / Gbdim = F# A C or Gb Bbb Dbb

Gdim = G Bb Db
Abdim = Ab Cb Ebb
Adim = A C Eb
Bbdim = Bb Db Fb
Bdim = B D F

Diminished fifth(E) پێنجەمی گەسـتوو، میانەیەکە کە نیوەتۆنی لە پێنجەمی تەواو بچووکترە. زاراوەی گەسـت بۆ میانەیەک بەمانای کەمکردنەوە دێت بە دوو نیوە هەنگاو لە مێجەر*Major* و بە یەک نیوەهەنگاو لە تەواو*Perfect*دا. وەک لە شـەشەمی گەسـتوو*Diminished sixth*{C-$a^{bb}$}،

یاخود لە پێنجەمی گەستوو*Diminished fifth*{C-G$^b$}دا، هەروەها بۆ سیانیی*triad*ی$C^b$ لە ماینەر سـێیەم*minor thied*{C-e$^b$}و لە پێنجەمی گەستوو{C-G$^b$}دا بەکاردێت.

Diminished Chord(E), Accord diminuée(F) کۆردی گەستوو.

لە کۆردێکی سیانیی/دا.... نزمکردنەوەی نۆتەی سێیەم3rd و نۆتەی پێنجەم5th بەئەندازەی نیوە تۆنێک. وەک لە کۆردی سیانیی دۆ/C کە پێکهاتووە لە:ـ C Eb Gb.

Diminished fifth chord(E) کۆردی پێنجەمی گەستوو.

Diminished intervals(E) میانەی گەستوو بریتیە لە میانەیەک کە بە نیوەتۆنێک لە میانەی تەواو یاخود میانەی ماینەردا بچووک دەبێتەوە.بۆ نموونە:ـ گەستووی چوارەم بە یەک نیوەتۆن بچووکترە لە چوارەمی تەواو*Perfect fourth*، گەستووی حەوتەم*Diminished seventh*بە یەک نیوەتۆن لە ماینەر حەوتەم بچووکترە.

Diminished scale(E) بڕوانە/*Octatonic scale*.

Diminished seventh(E) حەوتەمی گەستوو کە یەک نیوەتۆن لە ماینەر حەوتەم بچووکترە.

Diminished seventh Chord(E) کۆردی حەوتەمی گەستوو.

دوو جۆر لە گەستووە کۆردی حەوتەم هەیە:ـ

1. کۆردی حەوتەمی نیوەگەستوو*Half diminished seventh chord*:ـ ئەو میانانەی لە ڕەگەوەن*Root*بریتین لە:ـ ماینەر سـێیەم{ڕەگ بۆ سـێیەم}، ماینەر سـێیەم{ڕەگ بۆ پێنجەم} و مێجەر سـێیەم{پێنجەم بۆ حەوتەم}. کۆردی نیوەگەستووی حەوتەم *Half diminished seventh* کە هێمای سلاش*Slash sign*{/}لەگەڵدا دەنووسرێت پێیشیدەوترێت ماینەری حەوتەم ـ بیمۆڵ پێنجەم*Minor7 flat5*.
2. کۆردی حەوتەمی گەستووی تەواو*Fully diminished seventh chord*:ـ ئەو میانانەی لە ڕەگەوەن بریتین لە: ماینەر سـێیەم{ڕەگ بۆ سـێیەم}، ماینەر سـێیەم{ڕەگ بۆ پێنجەم} و ماینەر سێیەم{پێنجەم بۆ حەوتەم}. بۆ نموونە لە دۆ ماینەر*C-minor*دا بەشێوەی $vii^o/7$ دەنووسرێت کە دەبێتە *B-D-F-A flat*.

   یاخود...دەشـێت تەنیا لە شـێوەی سێ نۆتەی جیاوازدا هەبێت وەک C, C$^\#$, D. کۆردی گەستووی حەوتەم لە حەوتەم پلە سکێڵی ماینەری هارمۆنیکدا هەیە.

Diminished third(E) سـێیەمی گەستوو کە میانەیەکی نیوەتۆن*Semitone*یە لە سـێیەمی ماینەر بچووکترە. بۆ نموونە: C- E$^b$- G، وەهەروها... .

Diminished triad(E) سـیانیی گەستوو کە پێکهاتووە لە دەرە میانە*Outer interval*یەکی پێنجەمی گەستوو و بنەمیانە*Bottom interval*یەکی سـێیەمی ماینەر*(minor 3rd Dim5th)*.

بۆ نموونە سـیانیی گەستوو لە دۆـ ماینەر سیانیی C- E$^b$- G دا...دەبێتە C- E$^b$- G$^b$کە بە هێمای $C^o$دەنۆتێنرێت....وە هەروەها بۆ تۆنەکانیــتر.

Diminished whole note scale(E) سـکێڵی تۆنە تەواوی گەستوو، بڕوانە/*Altered scale*.

Diminuendo(I), Diminishing in loudness(E) بەرەو کورتکردنەوە.

Di minuendo a poco a poco(I) کورتکردنەوەی پلەبەپلە و بە نەرمی.

Di minuendo Sino al fine(I) کورتکردنەوە تا کۆتایی.

Diminuendo sempre(I) هەمیشە کورتکردنەوە.

Di minuendo sempre Sino al fine(I) هەمیشە کورتکردنەوە تا کۆتایی.

Di minuendo a poco(I) هێواش کەمکردنەوە.

Diminution(E), Diminuzione(I), Diminutio(L) گەستن، قرتاندن، کورتکردنەوەی بەهاکانی نۆتە*Shortening of note values*. پێچەوانەکەی پێیدەوترێت زێدە*Augmentation*. لە هەندێک کانون*Canon*دا دەنگی لاسایی*Imitative voice*تیایدا میلۆدیەکی نۆتە کورتتر *Shotrer notes*دەدات کە پێیدەوترێت کانون بە گەستن*Canon by diminution*.

Di molto(I), Very(E), Très, Tout(F) زۆر.

Di nuovo(I), A new(E) لە نوێوە، سەرلەنوێ.

Direct, Straight(E), Diritta(I), Droit(F) ڕاستەوخۆ، ڕاست، یەکسەر، ئاڕاستە. بۆ نموونە کە دەوترێت لە جووڵەیەکی ڕاست*Alla diritta(I):In direct motion(E)* مانای جووڵەیەکی بە پلە دێت نەوەک بە بازدان*Leaping*.

Directuer(F), Director, Conductor(E), Bigliettaio(I) ئاڕاستەکار، ڕابەر.

Dirge(E), Complainte(F) چەشنە ئاوازێکە بۆ بۆنەی بە خاکسپاردن و شین و واوەیلا.

Dirigir(F), Dirigieren(G), Dirigiere(I) بڕوانە بۆ/*Conducting*.

Dirigeur(F), Dirigent(G) بڕوانە بۆ/ *Conductor*.

Dis(G), D-sharp(E), Ré-Dièse(F) نۆتەی ڕێ– دێز.

Di Salto(I), Proceeding by leaps(E) بە بازدان.

Discant(E), Descant(L), Déchant(F), Discantus(L) دیسکانت، ئاوازێکی میلۆدی هاوڕەوت لەگەڵ ئاوازێکیتر. دەنگی سەرەوەی ڕستە مۆزیکێکی وەک دەنگی سۆپرانۆ*Soprano* و تینۆر*Tenor*. دەنگەکانی هێڵاسۆی خوارەوە پێیدەوترێت کلیلی باس/*Bass clef*.

Disc(E), Disque(F) دیسک، قەوانی گرامەفۆن.

Discant Clef(E) کلیلی دیسکانت، بۆ کلیلی سۆپرانۆ{کلیلی/*C*کە لە یەکەم هێڵاسۆ*Staff*دا}دادەنرێت.

Discantist(G), Soprano singer(E) سۆپران بێژ، سترانبێژ لە دەنگەواری سۆپرانۆدا.

Disciolto(I), Dexterous(E) زرنگ، چالاک، زەبر بە دەست.

Discord(E), Discorde(F), Discordanze(I) ناساز، کۆردێک دەنگی ناکۆک بە یەکتر، ئەو دەنگە شپرزانە*Sounds unsert*ن لە میانە دووەم*Secound* و حەوتەم*Seventh*ەکاندان، پێیشی دەوترێت ناسازەدەنگ*Dissonance*، پێچەوانەکەی پێیدەوترێت هاوسازەدەنگ*Consonance*.

Discreto(I), Discreet(E) پەرێز. خۆلادان.

Discrezione, Discretezza(I), Discretion(E) پەرێزیی.

Disdiapaison(Gr), Fifteenth, Interval of two octaves(E) میانەی دوو ئۆکتاڤ، پانزەم.

Disis(G), D-duoble-sharp, E-flat major(E) تۆنی ڕێ/دەبڵ ـ دێز.

Disjunct(E), Diezeugmenon(Gr) ناپێکبەست، لە مۆزیک دیمانە*Music theory*ی سەردەمانێکی زۆر زووی یۆناندا وەک زاراوەیەک بۆ جیاکردنەوەی تێتراکۆردێک لەوەی خوارتری بە میانەتۆنێک بەکاردەهێنرا. زاراوەیەکی بەکارهاتوە بۆ ئەو نۆتانەی کە لە میلۆدیەکدا بە باز*Leap* دەجووڵێن، یاخود بڵێین...بۆ ئەو میانانەی بەدوای خۆیاندا بە نیوتۆنێک یاخود تۆنێک گەورەترن دێن، پێچەوانەکەی پێیدەوترێت پێکبەست*Conjunct* .

Disjunct movement(E), Moto disgiunto(I), Movement disjoint(F) جووڵەی ناپێکبەست پێشبەریەکی میلۆدیانەیە بۆ ئەو میانانەی کە لە مێجەری دووەم گەورەترن.

D-Sharp-minor(E), Dis moll(G) ڕێ دێز ـ ماینەر.

Di sopra(I), Above(E), Dessus(F) سەرەوە.

Disperato(I), Desperate(E) نائومێد.

Disperazione(I), Despair(E) نائومێدیی.

Dissonance(E,F), Dissonanz(G), Dissonanza(I) ناهاوساز. بڕوانە/*Consonance*.

Distanza(I), Distance(E,F) مەودا، دووری.

Distinto(I), Distinct, Clear(E) بە ڕوون و ئاشکرا.

Distonare(I), Singing or playing out of tune(E) دەرچوون لە دەنگ، دەنگی نەشاز.

Diteggiatura(I), Doigté(F), Fingering(E) دیتێجیاتۆرا، هەست پێبردن لەڕێی پەنجەوە.

Dithyramb(E), Dithyrambe(F,G), Ditirambo(I) سروودێکی کۆراڵیە بۆ ستایشکردنی خواوەند دیۆنیسۆس*Dionysus*کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر دێرینی یۆنان دەلام لە سەتەی/19مدا وەک زاراوەیەک بەکاردەهێنرا بۆ مۆزیکێک کە چەشنێکی مەستئامێز*Bacchus*ی لەخۆگرتبێت.

Dito(I), Doigt(F), Ditto, Finger(E) پەنجە، ئەنگوشت، قامک، پیلک.

Ditone(E), Ditonos(Gr), Ditonus(L) دووتۆنە، وشەیەکی یۆنانییە کە لە سەتانێکی زوودا زاراوەیەکبووە بۆ مێجەر سێیەم*Major third* کە بریتیبوە لە دوو تۆنی مێجەر*Major tones*، بەلام مێجەر سێیەمی مۆدێرن*Modern major third*بریتیە لە یەک مێجەر و یەک تۆنی تەواوی ماینەر. وشەیەکی سەرزاری سەتەکانی ناوەڕاستە بە میانەسێیەمی گەورە وتراوە کە یەکسان بووە بە دوو ڕۆند*Ronde*.

Ditonic comma(E) بڕوانە/*Phythagorean comma*.

Ditty, A short simple song(E) کورتە سترانێکی سادە.

Diva,Donna(I), Goddess, Prima donna(E) دێو، خواوەندە، ئافرەتێکی شۆخوشەنگ، ئۆپێراچڕ{ئافرەت}ی سەرەکی لە ئۆپێرادا.

**دایڤێرتاسیمێنت، زاراوەیەکی سێ واتایە:ـ** Divertimento(I), Divertissement(E,F)

1. **سەمایەکی شۆخیانە***Sardonic* **و بەستنەوەی بە سترانەوە وەک ئۆپێرا ، باللێت و دیمەنی تراژیدی/دا نمایاندەکرێت.**
2. **فانتاسیا***Fantasia* **کە چەشنێکی میللی ئامێزی لەخۆگرتبێت.**
3. **ناوکارە***Enter'acte(F)***بریتیە لە میانە***Interval***ی نێوان بەشەکانی ئۆپێرایەک کە بە چەند سەما و سترانێک ناوکۆ کرابێت.**

**بەشکراو، .***Div***کورتەیەتی، ئاماژەیە بۆ بەشێکی ئۆرکێسترا** Divise(I), Divisés(F), Divided(E) **{بە زۆری لە دەستەی کەمانچەی یەکەم یاخود دووەمدا}کە کاتێک دوو هێڵی مۆزیک دەژەنرێت بەگشتی وەک دەبڵ نۆتە لە پارچەیەکی تەنیادا دەنووسرێت{یەک لەسەر یەک}بە مەبەستی دووکەوتنەوە لە دووجار وەستان{واتە پەنجەیەکی گیرکردبێت لەسەر یەکێک لەو دوو نۆتەیە}.**

**دابەش، بەخش، شێوەیەک لە جۆرانجۆر/***Variation***، چەند هێڵەدەنگێکی درێژی نەخشێنراو***Ornamented*. Division(E,F), Divisione(I)

**لە خەڵوەتدا.** Divoto(I), Devout(E)

**خەڵوەتیی.** Divotamente(I), Devoutly(E)

**خەڵوەت.** Divozione(I), Devotion(E)

**دیوان، وشەی دیوان کە بە دیڤان***Divan***یش هاتووە** Diwan(Ar,Fa,Kr), Octave(E) **لە وشەلێکدراوی دیپوان***Dip wan***ی ئاڤێستا/ییەوە وەرگیراوە. دیپ**Dip**{بە دەپ**Dep**، دیڤ**Div **یاخود دیو/یش هاتووە}بەتەنیا بەمانای ڕووپێوێک کە نووسراوی تیادا تۆمارکرابێت، پێدەچێت پاشگری وان کە چۆتەسەری بۆتە دیوان کردویەتە کۆ کە ئاماژیە بۆ کۆمەڵە نووسراوێکی تۆمارکراو {وشەی دەفتار یاخود دەفتەر وشەزای دیپوانە}.**

**ئەم وشەیە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئەمەوییەکاندا وەک زاراوەیەکی کارگێڕیی نێو خەلافەتەکە بایەخی پێدرا. بەتایبەتی بەهاتنی خەلیفە عبدولمەلیک بن مەروان{ناسرابوو بە دەمارگیرێکی عارەبپەرست}بۆ سەر تەختی خەلافەت، سەیری دەوروبەری خۆیکرد کە دەسەڵاتی خەلافەتەکەی وەک ڕۆمەکان ئارام دەبێت ئەگەر خۆڕێخستنی کاروباری ئیداریی هەبێت، یەکێک لەو کارانەی پێی هەستا گۆڕینی ئەو زاراوە سیاسی و ئیداریانە بوو کە ڕۆمی و عەجەمین{واتە غەیری عەرەب کە یەکێک لەوانەیش کوردی دەگرتەوە، لەو سەردەمەیشدا هەندێجار لە نەزانینیان کوردیان بە عارەبی فارس ناودەبرد}، بەڵام پاش هێنانوبردەیەکی زۆر بۆیدەرکەوت جگە لە وشەی خەلیفە و حاشیە و جاریە....هەندێک وشەیتر هیچ شتێکیتری بۆ نامێنێتەوە. لەبەرئەوە ناچاربووەوە کە دەسەودامێنی ئەو زاراوانە ببێتەوە بەڵام گۆڕینیان بەشێوەیەکی وەها کە بگونجێنرێن لەگەڵ خوێندنەوە و نووسینی زوانی عارەبیدا، لەوانەیش وشەی دەستوور، وەزیر، گزیە{کراوە بە جزیە}، یاوەر، بەند، هەیوان و سەدان وشەیتر، لەسەرو ئەو هەموانەیشەوە وشەی دیوان/ە. سەردەمی عەباسیەکانیش و بەدەرکەوتنی زۆر لە زانایانی وەک سەفەدینی ئورمێیی و بەهرەمەندانی وەک ئیبرایمی موسڵی و کەسانیتری ئەو سەردەمە ئەم وشەیە بۆ گوزارەکردن لەو هەشت دەنگەمۆزیکییە خرایە نێو**

**هونەری مۆزیکەوە کە دەشێت لەبری ئۆکتاڤ بووترێت دیوان. ئەم زاراوەیەیش زیاتر لە دەسـگامۆزیکییەکاندا دێتە سـەرزار. لە سەردەمانەدا ئەو نووسـینە هونەرییانە هەمووی فەرمان و ڕاسپاردەیی دەرباری پاشا و میر و سـوڵتانی لەپشتبوو، ئەوەندە بایەخی پێدەدرا کە دادەنرایە ڕیزی کارنامە گرنگەکانیتری دەربار. یاخود بڵێین ئەو کار و نووسراوە هونەرییانە گەیشـتە ئاسـتێکی وەها کە دیوانێکی تایبەتـی بۆ بکرێتەوە لە دەربار‌دا. ئەو وشـەیە بەرەبەرە پێگەیی و لە مەیدانی هونەری مۆزیکدا وەک زاراوەیەک بەو شێوەیە خۆی سـەپاند کە گوزارە لەو بوارە بکات کە دەنگەکان تیادا تۆماربکرێت و بەرانبەر وشەی*Octave*ی زوانە ئاوروپییەکان ببێتەوە**

**بۆئەوەی ئەم دەنگە بنچینەییانە بخرێنە چێوەمۆزیکێکی دەسـگاییەوە، بایەتە هەر دەنگە و کە لە تۆنی دۆDoوە دەسـپێدەکات، هەر یەکە و بەم چەشـنە ناوێکی تایبەتی خۆی بدرێتی:ـ**

| | |
|---|---|
| **یەکەم دەنگ** | **یەکـگا واتە یەکەم ئاواز یاخود دەسگای ڕاست کە بناخەی پلەتۆنەکانە.** |
| **دووەم دەنگ** | **دووگـا واتە دووەم ئاواز کە دەبێتە دووەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **سـێیەم دەنگ** | **سـێگا واتە سـێیەم ئاواز کە دەبێتە سـێیەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **چوارەم دەنگ** | **چوارگا واتە چـوارەم ئاواز. کە دەبێتە چـوارەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **پێنجەم دەنگ** | **پێنجـگا واتە پێنجـەم ئاواز. کە دەبێتە پێنجـەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **شـەشەم دەنگ** | **شەشگا واتە شەشەم ئاواز. کە دەبێتە شـەشـەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **حەوتەم دەنگ** | **حەوتـگا واتە حەوتەم ئاواز. کە دەبێتە حەوتەم پلەتۆن بۆ ڕاسـت.** |
| **هەشـتەم دەنگ** | **هەشـتگا واتە هەشتەم ئاواز کە لەم دوا پلەدەنگەدا دەبێتە دەنگێگی تیژ بۆ یەکەم دەنگ کە پلەتۆنی ڕاستە و پێیشی دەوترێت گردان.** |

**بەم چەشنە...سـووڕ(بازنە، خولگە)ێکی تۆن نمایاندەبێت کە بە هەشـتەم دەنگ گرد دەکرێتەوە. ئەم گردکردنەوەیە کە پێـدەوترێت گردان دیوانیکی تەواو پێکدێنێت. هەر بەم شـێوەیەیـش دەکرێت دیوانی یەکەم و دووەم و.....یەکبەدوایەک پێکبهێنرێت. وشـەی گڕدان/یـش لە گەرتانیستەن، گەرتانیـیەتەن/وە هاتووە و پاشـان بۆتە گەرتان و گەردان کە بەمانای گڕخواردنەوە، سووڕان، چەرخان{ڕۆژگار پیتی/ڕـ ی لەسەر زمان سـووککردوە و لە گڕدان/ەوە بۆتە گردان. خۆ ئەگەر هەر بە گردان/یش لێکبدرێتەوە ئەوا لە چاووگە وشـەی گرد/ەوە هاتووە کە بەمانای خڕ یاخود کۆ دێت}واتە سـووڕاندنەوە بۆ هەمان شـوێنی دەنگ بەڵام لە فریکوێنسیFrequencyیەکی بەرزتردا. لە دەنگەوارێکی ئاسـاییدا کە فریکوێنسـی لا/La تیایدا یەکسـان بێت بە 440Hz. دەکرێت دانانی پلەدەنگەکان لە ئامیرە ژێدارەکانی وەک عوود و کەمانچە و سـەنتوور و مانەندیان لە دیوانی یەکەمدا، بەم چەشنە ڕیزبکرێن:ـ**

**یەکەم دەنگ : دەسـگای ڕاسـت. دووەم دەنگ : دەسـگای دوگـا.**
**سێیەم دەنگ : دەسـگای سـێگا. چوارەم دەنگ: دەسـگای چوارگا.**
**پێنجەم دەنگ : دەسـگای نەوا. شەشەم دەنگ: دەسـگای حوسێنی(هۆسیانی).**
**حەوتەم دەنگ: دەسـگای ماهوور. هەشـتەم دەنگی: دەسگای گڕدان{گردان}یان گەردان.**
**{واتە گڕخواردنەوە یاخود گەڕانەوە بۆ پلەتۆنی ڕاست}.**

یاخود بەم شێوەی خوارەوە:ـ




بەگشتی...ئەگەر لە دیدەیەکی مۆزیک دەسگای خۆرەلاتییەوە و بەچەشنێکی کرۆماتیکانە ڕیزبەندی پلەتۆنەکان بەناو بکەین، ئەوا بەم چەشنە دەبێت:ـ




لە سکێلێکی خۆرەلاتیدا....میانەی پلەتۆنەکان بە سەنت*Cent* و کۆما*Coma* و لەرینەوەیان بە فریکوێنسی*Frequency*یە. ئەگەر سکێلێک لە پلەتۆنی یەکگاوە بەبێ چارەکەتۆن وەربگیرێت،، پێوانەیان بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:ـ

| پلەتۆن | یەکگا | عەشیران | ئاراک | ڕاست | دووگا | سێگا | چوارگا | نەوا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەنت | 0 | 203.77 | 135.85 | 158.49 | 203.77 | 158.49 | 135.85 | 203.77 |
| کۆما | 0 | 9 | 6 | 7 | 9 | 7 | 6 | 9 |
| هێرتز | 97.99 | 110.24 | 119.24 | 130.67 | 149.99 | 161.08 | 174.23 | 195.99 |

دەیەم. Dixième(F), Tenth(E)

DĺnıŞin(Ar,Kr) دڵنشین، لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای ڕاستە. پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا، ڕەگەزی سەبا لەسەر پلەتۆنی حوسێنی، بە زێدێکردنی ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی گردان لێڕشتەی دڵنشین دەردەکەوێت.

ڕاست
دووگا
سیگا
چوارگا
نەوا
حوسێنی
ئاوج
گردان
شاناز
بوسەلیک
ماهوران

Doh(I), Ut(F), C(E,G) تۆنی دۆ/C.

Doch(G), Still, Yet(E) هێشتا.

Doit, Doivent(F), Must(E) دەبێت، پێویست، بایەت.

Dolce(I), Sweet, Soft(E) ناسک و شیرین، *Dol.*کورتکراوەیەتی.

Dolcian(E), Dulcian(I) دۆڵسی، لوولەدەنگی ئۆرگن بە درێژی هەشت پێ بەناوی *Dulciana*کە دەنگێکی ناسکی هەیە.

Dolciano(I) گچکە باسسوون کە بەکاردەهێنرێت وەک دەنگێکی تینۆر بۆ ئامێری ئۆبوا.

Dolcissimo(I), Very sweet, Very softly(E) زۆر بە ناسکی، زۆر بە شیرینی.

Dolcemente(I), Sweetly(E) بە شیرینی.

Dolcezza(I), Sweetness(E) شیرین.

Dolent(F), Dolente(I), Doleful, Sorrowful(E) خەمناک. مەخابن.

Dolentemente, Dogliosamente(I), Sorrowfully(E) بە خەمناکی، بە دڵتەنگی.

Dolentissimo(I), Very sorrowful(E) زۆر بەدڵتەنگی.

Dolore(I), Pain(E), Douleur(F) ئازار، ناڵە، دڵتەنگی.

Dlorosamente(I), Painfully(E) پڕئازاریی.

Doloroso(I), Painful(E) پڕئازار.

Dolzflöte(G), Soft flute-tone(E) نەرمەتۆنی فلووت لە ئامێری ئۆرگن/دا.

Dombuk(Ar,Kr)Donbuk, Derbeka (Br) دومبک، تەپڵی شێوە لوولەیی کە دادەنرێتە سەر ڕان بۆ لێدان.ئامێرێکی زۆر باوە لەنێو میللەتانی خۆرەڵاتدا.

Domes(I), Effect on sound(E) کاریگەری بۆ سەر دەنگ.

Dominando(I), Dominant(E) زاڵبوون بەسەر دەنگیتر.

Dominant(E), Dominante(F,G,I) زاڵ، پێنجەم پلەیە لە سکێڵی دیاتۆنیکدا. پێنجەم پلەتۆنی سکێڵی مێجەر و سکێڵی ماینەر کە بە دەنگێکی کاریگەر و زاڵ دادەنرێت.

Dominant diminished(E) گەستووەزاڵ. گەستەزاڵ، زاڵی گەستوو کە بریتیە لە تۆنی تەواو*Whole-step*ـ نیوەتۆن*Half-step*ـ تۆنی تەواو. سکێڵی گەستوو*Diminished scale* یاخود هەشتتۆنی*Octatonic scale* کە بە نیوەتۆن دەسپێبکات.

Dominant eleventh chord(E) کۆردی یانزەیەمی زاڵ کە بریتیە لە

کۆردی شەش نۆتە*Six-note*ی دامەزراو لەسەر زاڵ/V لە سێیەمەکاندا*Thirds*.

Dominant Major ninth(E) زاڵ مێجەر نۆیەم.

Dominant minor ninth(E) زاڵ ماینەر نۆیەم.

Dominant ninth chord(E), Accord de neuvième dominante(F) کۆردی نۆیەمی زاڵ

Accordo di nona di dominante(I)

بریتیە لە کۆردی پێنج نۆتە*Six-note*ی دامەزراو لەسەر زاڵ/V لە سێیەمەکاندا.

Dominant relation(E) زاڵی پەیوەند لەنێوان کۆردی زاڵ و پایەتۆن*Tonic*یەکەی.

Dominante secondaire(F), Secondary dominant(E) ژێرزاڵ، دواتا زاڵ، لازاڵ.

Dominant seventh chord(E),Accord de septième dominante(F) کۆردی حەوتەمی زاڵ.

Accordo di settima di dominante(I)

بریتیە لە کۆردێکی سیانیی و تۆنی حەوتەمی دەخرێتەسەر وەک:ـ G-B-D-F.

Dominant seventh chord with lowered fifth(E) کۆردی حەوتەمی زاڵ لەگەڵ پێنجەمی

نزمکراو کە یەکسانە بە کۆردی شەشەمی فەڕەنسایی دامەزراو لەسەر دووەم پلە نزمکراوە{پێنجەمی نزمکراو*Lowered fifth*}ی سکێلێک.

Dominant thirteenth seventh(E) کۆردی حەوتەمی زاڵ.

بریتیە لە کۆردی حەوت نۆتە*Six-note*ی دروستبوو لەسەر زاڵ/V لە سێیەمەکاندا.

Dominant triad(E) زاڵی سیانیی.




Domra(Ru) دۆمرا، جۆرە ئامێرێکی دووجوت ژێداری میللی ئاسیایی و ڕوسیایی

سەتەکانی/16م و 17مە، کەمێک بە ئامێری بالالایکا و ماندۆلین دەچێت. ئێستا ئەم ئامێرە بە سێجووت ژێ و چوار جووت ژێ بەناوی پیککۆلۆ دۆرما، ئالتۆ دۆرما، تینۆر دۆرما، باس دۆرما...زۆر میللییانە بەکاردەهێنرێن.

Dopo(I), After, Afterward(E), Après(I) لەدوایی، لەپاشان.

Doppel(G), Double(E,F) دەبڵ، دوان.

Doppeln(G), To double(E) بە دەبڵ کردن، بە دەبلاندن.

Doppelschlag(G), Turn, Double stroke(E) دبڵ لێدان،بڕوانە/*Turn*

Doppel takt not(G), Double measure note, Two bar note(E) دەبڵ باڕی نۆتە.

Doppel triole(G) دەبڵ تریۆلە یاخود سێکستولە، ئەنجامدانی دوو تریۆلەی جیاواز لە یەک کاتدا.

Dopplet so schnell(G) دوو چەنجای زۆر خیرا.

DoppelChor(G) دەبڵ کۆرس کە دوو سترانخوان لە ئۆپێرایەکدا دەگرێتەوە.

Doppia Corda(I) دەبڵ ژێ، جووت سیم.

Doppio movimento(I), Double as fast(E) دەبڵ خێرا.

Doppio Suono(I) دوو دەنگی.

Dorian(E), Dorien(F) دۆریەن، بنیادە دەسـگایەکی کلێسەیی*Authentic church mode*. یۆنانیـیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی ناوەڕاست. بڕوانە/*Mode*.



Dorian tetrachord(E) دۆریانی تێتراکۆرد کە پێیشـیدەوترێت مێجەر تێتراکۆرد بە ڕیزەمیانەیەکT-T-S {تۆنی تەواو= Tone، نیوەتۆن= Semitone}.




Dot, Dotted note, Point(E) دۆت، پنت، خاڵ. دانانی پنتـێک بەلای دەسـتەڕاتەوە بەتەنیشـت نۆتەیەکەوە.







نۆتە و وچانە مۆزیکیە پنتدارەکان
**Dotted Musical Notes and Rests**

| Dotted Notes & Rests | Note نۆتە | Rest وچان | Value بەها (number of beats) {ژمارەی لێدان} |
|---|---|---|---|
| Whole | 𝅝. | | 6 |
| Half | 𝅗𝅥. | | 3 |
| Quarter | ♩. | | 11/2 |
| Eighth | ♪. | | 3/4 |
| Sixteenth | 𝅘𝅥𝅯. | | 3/8 |

Double(E,F), Doppio (I) دەبڵ، دوان. وشـەی دەبڵ یاخود جووت لە سـەتەکانی/16 و 17مەوە وەک زاراوەیەک بۆ ئەو ئامێرە مۆزیکانەی پەردە*Pitch*یان نزمە وەک ئۆبوا.

Double appoggiatura(E), Doppelter vorschlag(G) دەبڵ ئاپۆجیاتۆرا.

Double bar(E), Doppia barra(F) دوو هێڵی سـتوونی دۆتێنراو*Dotted* لە کۆتایی پارچەیەک مۆزیک کە ئاماژە دەدات بە ژەنینەوە*Played twice*ی ئەو بەشە.



Double bass, Contra bass(E) **دەبڵ ـ باس، یەک ئۆکتاڤ لە باس کەمانچە نزمترە.**

**گەورەترین ئامێری ژێدارە.**

Double-bass(Pedal, Contra-bass) Clarinet(E) **دەبڵ ـ باس کلارِنێت.**

Double-bass flute, Alto flute(E) **دەبڵ ـ باس فلووت.**

Double-bass viol, Violone, Concert viol(E) **دەبڵ ـ باس کەمانچە.**

**یەک ئۆکتاڤ لە باس کەمانچە نزمترە.**

Double bassoon(E), Doppel fagott(I) **دەبڵ باسـسـوون***Bassoon*.

**پێشیدەوترێت کۆنتراباسـسـوون***Contrabassoon* **کە ئۆکتاڤێک لە باسـسـوونی ئاسایی نزمترە.**

Double harmonic scale(E) **سـکێڵی دەبڵ هارمۆنی کە بریتین لە دوو جۆر:ـ**

**یەکەمیان دەبڵ هارمۆنـــی سـکێڵی مێجەر***Double harmonic major scale*.

**دووەمیشیان دەبڵ هارمۆنی سـکێڵی ماینەر***Double harmonic minor scale*.

Double horn(E), Doppel horn(G) **دەبڵ هۆڕن.**

Double(Contra)-bass trombone(E) **دەبڵ ـ باس ترِۆمبۆن.**

**گەورەترین ئامێری خێزانەکەیەتی، یەک ئۆکتاڤ لە تینۆر ترِۆمبۆن نزمترە.**

Double(Contra)-bass tuba(E) **دەبڵ ـ باس تووبا.**

**لەسـەرکلیلی**/C **و نزمتری نۆتەی لە می ـ بیمۆڵ**/*E-fat* **دایە کە پێنج میانە خوارتر لە کلیلی**/C.

Double contrapoint(E) **دەبڵ کۆنتراپونت، کۆنتراپونتی هەڵگێڕاو***Invertible*.

Double curtall, Bassoon(E) **دەبڵ کۆرتاڵ،**

**ناوی ئامێری باسـسـوونە بە زوانی ئینگلیزی لە سـەتەی**/16**مدا.**

Double Concerto(E) **دەبڵ کۆنسـێرتۆ، بەشداربوونی دوو ژنیار لە ئۆرکێسترایەکدا.**

Double Counterpoint(E) **دەبڵ کۆنتراپونت، بڕوانە**/*Counterpoint*.

Double Croche(F), Semi-quaver(E) **دەبڵ کرِۆش، نۆتەی دوولاچنگ، 1/16ی نۆتەی تەواوە.**

Double demisemiquaver(E) **1/64ی نۆتەی تەواو***Whole note*

Double emploi(F) **دەبڵ ئیمپلۆی،**

**زاراوەیەکە لەلایەن مۆزیکزانی فەرِەنسایی***Rameau* **سـازێنراوە، فرۆزەی کۆردێک دەکات کە لە یەک کاتدا دوو رِەگ***Root***ی هەبێت. بۆ نموونە بەپێی ڕامیو***Rameau* **لە کۆردێکـی دۆ ـ مێجەر-***C major***دا**{F-A-C-D}. **لە کۆردی ژێرزاڵ***Subdominant chord***دا تۆنی فا**/*F***ی ژێرزاڵ دەبێتە رِەگ لەگەڵ خسـتنەسـەری میانەی شـەشـەم یاخود لە کۆردی سـەرپایەتۆن***Supertonic chord***دا تۆنی رِێ**/*D* **دەبێتە رِەگ***Root* **لەگەڵ خستنەسـەری میانەی حەوتەم.**

Double diapason(E) **دەبڵ دیاپازۆن،**

**لوولەدەنگی ئۆرگن/ە کە یەک ئۆکتاڤ نزمترە، شـانزە پێ** *16-foot***درێژییەکەیەتی.**

Double dot(E) **دەبڵ دۆت، جووت پنت.**



Double dotted note(E), Doppelt punktierte note(E) دەبڵ نۆتەی دۆتێنراو.

Double drum(E) تەپڵی دوولا{لە هەردوو سەری دەدرێت}.

Double flageolet(E) ئامێری فلاگیۆتی دوو لوولە.

Double flat, Natural tone(E), Doppio bemolle(I) دەبڵ ـ بیمۆڵ/*bb*، دوو نیوەتۆن نزمتر.

Double fugue(E) پارچە فیوگەیەک بە دوو سوژە*Sujet* یاخود تێم*Theme*.

Double guitar(E) گیتاری دوو دەسک کە هەر دەسکەی دەنگێکی تایبەتی خۆی هەیە.

Double handed(E) ژەنیارێک بتوانێت دوو ئامێری جیاواز لێبدات.

Double harmonic major scale(E) سکێڵی دەبڵ هارمۆنیک ـ مێجەر.



Double harmonic minor scale(E) سکێڵی دەبڵ هارمۆنیک ـ ماینەر.



Double note(E) دەبڵ نۆت.

Double octave(E) دەبڵ ئۆکتاڤ، بریتیە لە پانزە نۆتی یەکلەدوایەک.

Double pedal-C(E) سێ ئۆکتاڤ خوراتر لە تۆنی ناوەند*Middle-C*.

Double quartet(E) دبڵ چوارینە، پارچە مۆزیکێک کە بە جووت چواری نووسرابێتەوە.

Double reed(E) دەبڵ زمانە، دەبڵ ڕیشە، لە هەندێک ئامێری وەک

ئۆبوا، فاگوت، کرانگلە، باسسوون کارپێدەکرێت.

Double-sharp(E), Doppelkreuz(G), Double dièse(F) دەبڵ ـ دێز،

بەرزکردنەوەی تۆنێک بە ئەندازەی دوو نیوپەردە.

Double stam(E) جووت لق، کاتێک دوو دەنگ یاخود پارچەیەک لەسەر هەمان

هێڵاسۆ*Staff*بنووسرێت و هەمان نۆتە بژەنرێت. نۆتەی سەرەکی دوو لقی لێدەبێتەوە، یەکێکیان

دەبێتە دەنگی سەرەوە*Upper voice* و ئەویتریان دەبێتە دەنگی خوارەوە*Lower voice*.

Double stopping(E) جووت داخستن، تەکنیکێکی ژەنیارە لەسەر ئامێری ژێدار دەیکات ئەویش

دانانی دوو پەنجە لەسەر دوو ژێ و پیاهێنانی کەوان بەسەر هەردوو ژێ/یەکەدا لەهەمان کاتدا.

Double trill(E), Doppeltriller(G) دەبڵ تریللە.

Double Whole note(E), Carrée(F) دەبڵ نۆتە کە یەکسانە بە دوو وچانی*Rest* تەواوا4/4.

Double top-C(E) دەبڵ تۆپ دۆ، سێ ئۆکتاڤ سەروو تۆنی دۆی ناوەڕاست/*Middle-C*.

Double trill(E) دەبڵ تریللە، ئەنجامدانی دوو نۆتی جیاواز لە یەک کاتدا.

Double triplet(E) دەبڵ تریۆلە{کێشی3/2}، بڕوانە/*Doppel triole*.

Doubly augmented six four three chord(E) کۆردی دەبڵ زێدەی شەش/ چوار/ سێ،

کۆردی شەشەمی ئەڵمانی لەگەڵ پێنجەمی تەواو سەروو دەنگی ڕەگ*Root*کە وەک دەبڵ چوارەمی

زێدە بەشێوەیەکی ئێنهارمۆنیکانە*Enharmonically* بژەنرێت.

Doubly augmented sixth chord(E) کۆردی دەبڵ زێدەی شەشەم،

کۆردێکە دووەم دیێزکراو*Sharpened second* لە پایەتۆنە*Tonic*وە

Douce, Doux(F), Sweet(E) شیرین.

Doucement(F), Sweetly, Softly(E) شیرینی و نیانی.

Douleur(F), Sadness(E) خەم.

Douze(F), Twelve(E) دوازدە، دەرزەن.

Down beat(E) لێدانی بەرەونەرم، جووڵە دەستی ڕابەرە*Conductor*یاخود بە شووڵ*Baton*ەکەی دەستی بۆ نیشانەکردنی لێدانە توندترەکان*Stronger beats* لە بارِەکەدا. بۆ نموونە لە کێشی 4/4 دا یەکەم لێدان*First beat*کە توندە بۆ بەرەو نەرمتر لە سێیەم لێدان*Third beat*ی هەر بارێک.

Down bow(E) کەوان بەرەو خوار، بە کەوان لێدان لە پاژنەوە تاکو نووکی کەوان.

بە کەوان لێدانیش بە پێچەوانەوە پێیدەوترێت کەوان بەرەوسەر*Up-bow*.

Down-bow sign(E) هێمای خشاندنی کەوان بەرەو خورەوە.

Doxology(E) ستایشگەریی، زارشت(مەنطق)ی ستایش کە ئەرکێکی پێویستە لە ئایینەکاندا.

Drama(E), Le drama(F,G,L), Dramma(I), Toneelstuk(G) دراما

زۆر لە شارەزایان زاراوەی دراما*Drama* وا پێناسە دەکەن:ـ گوزارە لە ڕووداو و کارە دەرەکیەکان دەکات کە لەنێوان کەسایەتیەکاندا دەنوێنرێت. بەڵام دەبێت ئەوەیش بزانرێت کە مەرج نیە هەر ئەو ڕووداوانە لە دەرەوەڕا بێن و دەروونی مرۆڤ بهێنێتە ژان، بەڵکو ڕووداویتر هەیە یاخود بڵێین ژانی دەروونی تریش هەیە وەک کارلێکێکی ناوخۆیی ویژدانانە کە لە ناخی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت، ئەم ژانە کە دەیهاژێنێت بە گوزارەیەکی تایبەتی دەیداتەوە بە جیهانی دەوروبەری. ئەم گوزارەیەیش دەگاتە ئاستێکی ئەوپەڕی وەها کە تەنانەت شیعریش کە چەند هێما و سیمبۆلێکی هزری خۆی هەیە بۆ دەردەبڕین ناتوانێت ناخی ئەو ژانە وەک پێویست بگەیێنێتە مەبەست. تاکە هونەرێک بتوانێت ئەو ژانە ویژدانیە پڕاوپڕ بگەیەنێتە مەبەست هونەری....مۆزیکە. هەر مۆزیکە دەتوانێت بە ڕاستە درامایەکی ڕەها ئەو هەست و نەستانەی تری مرۆڤ ببزوێنێت و ژانی دابمرکێنێتەوە.

دەکرێت بوترێت کە مۆزیک{چ لەڕێی هەنگەرە(حەنجەرە)وە بێت یاخو ئامێرێکی مۆزیکییەوە} دەساوێزێکە گوزارە لەو کارانە دەکات کە لە ویژداندا گێژیخواردووە.

Dramatic music(E), Dramatische musik(G), Dramatico musica(I), Musique dramatique(F) دراماتیک مۆزیک.

Dramma per musica(I), Drama by music(E) دراما بە مۆزیک.

یاخود دراما لە مۆزیکەوەڕا//*Drama Through music(E)* کە هەمان مانای ئۆپرا دەبەخشێت.

Dramatic soprano(E) ئاوازی سۆپرانۆ بە شێوازی دراما.

Dramatic tenor(E) ئاوازی تینۆر بە شێوازی دراما.

Dramma lirico(I), Drame lyrique(F) **دراماى ئەڤینی.**

Drehleier(G), Hurdy-gurdy(E) **بڕوانە**/*Hurdy-gurdy*.

Drei(G), Three(E), Trois(F) **ژمارە سـێ**/3.

Dreiachteltakt(G) **کێشی**3/8.

Dreihalbetakt(G) **کێشی**3/2.

Dreiklang(G) **بڕوانە**/*Triad*.

Dreivierteltakt(G) **کێشی**3/4.

Drittel(G), One-third(E) **سـێیەک**1/3.

Driving(E) **ڕانین، مۆزکێکی ئامادەکراو بە جوولەیەکی بەرەو پێشـی بەهێز.**

Driving note(E) **نۆتە ڕانین، نۆتەیەک لە سـەرەتادا بە لێدانی لاواز دەسـپێبکات و پاشـان بە لێدانێکی ئاکسـنت***Accented beat*.

Droit(F), Right(E), Destro(I) **ڕاسـت.**

Droite(F), Right-hand(E) **دەستەڕاسـت.**

Drone(E) **بلوێری ئامێری مەشـکەنای***Bagpipe***یاخود ژێـی ئامێری هوردی ـ گوردی.** **لە تیغەنای***Reed pipe***ی مەشکەنای***Bagpipe***دا کە چەند کونێکی لەسـەری کراوە بۆ ئاوازی پێـلێدان. جاروبار لوولکێک یەکێک یاخود زیاتر لەســەر مەشـکەنایەکە دەبەســترێت کە هەر یەکەو تاکە دەنگێکیـشی بۆ دیاریکراوە و دەبنە دەنگێکی پاڵپشـتی بەردەوام بۆ دەنگە سـەرەکیەکە، ئەم جۆرە لوولکانە پێیـاندەوترێت درۆن**/*Drone*.

Drone-bass(E) **هاوپارییەکی بەردەوام بە تۆنێک یاخو دوو تۆن لە دەنگەواری باس***Bass***دا وەک پێکەوە دەنگی پایەتۆن***Tonic* **و زاڵەتۆن***Dominant* **لە سـکێڵی دیاتۆنیکدا.**

Drum(E) **تەپڵ، ئامێرێکی دروسـتکراوە لە پێست و چەوێڵ بە چەندین شـێوە و جۆر. لە ڕیزی کۆمەڵە ئامێرێکە کە بە خێزانە نەگرە{فینتگ}یـیەکان***Percussion family* **ناودەبرێن.**

Drut(Hn), Fast tempo(E) **دروت، تێمپۆی خێرا.**

Dudelsack(G), Bagpipe(E) **مەشکەنای.**

Duduk, Balaban(Kr) **دودوک، باڵابان، ئامێرێکی زۆر کۆنی میللەتانی خۆرەڵاتە، مەودایەکی یەک ئۆکتاڤی هەیە، لە مۆزیکی کوردیدا لە زۆر بۆنە و ئاهەنگدا هاوپاری ستران و هەڵپەڕکێدا ڕۆڵێکی گەرم و بەجۆش دەگێڕێت.**

Due pedali(I) **دوو پایدەری، بەکارهێنانی دوو پیداڵ.**

Due volte(I), Twice(E) **دووجار.**

Duet(E,F), Duett(G), Duetto, Duo(I) **دویت، دوو قۆڵی، پارچە مۆزیکێک بۆ دوو ژەنیار.**

Duettino(I),Little duet(E) گچکە دویت. دولسـیەن، ئامێرێکی هەواییە لە سـەتەکانی17/ و 18مەوە داهێنراوە، پێیشـیدەوترێت کورتاڵCurtalیاخود باژۆنbajónکە بە ئامێری باسـسـوون دەچێت. ڕیشەزمانەی نەرم لە ئۆرگن/دا کە درێژییەکەی.8ft یاخود.16ft دەبێت. چەند شـێوە و قەوارەیەکی هەیە کە بەگوێرەی دەنگەوارەکانیان بەکاردەهێنرێن.

| Size قەوارە | Range مەودای دەنگ Top/ Bottom |
|---|---|
| sopranino | f'/c |
| soprano | c'/g |
| alto | g/D |
| alto | f/C |
| tenor | c/G |
| quartbass | C/GG |
| quintbass | BBflat/FF |
| contrabass | FF/CC |

Dukka(Hn), Indian double drum(E) دوککا، نەقارەی دوو تەپڵەی هیندی.

Dulcimer(E), Dulzimer(G), Sentoor(Fa,Kr) دۆلسـیمەر، بڕوانە/Sentoor.

Dulcimette(E) گچکە سـەنتوور کە یەک ئۆکتاڤ بەرزترە لە سـەنتووری ئاسایی.

Dumbuk(Ar, Kr) دومبوک، تەپڵی بچووک.

Dumbéleki(Gr), DumbeĺekKr), Greek drum(E) دومبەڵەک، وشـەی دومDum گوزارە لە دەنگی گڕ یاخود پانوبەرین دەکات، پاشـگری بەڵەکBaĺekوشەیەکی دێرینی سـۆمەرییە بەمانای باڵا یاخود گەورە دێت. کۆی وشـەکە تەپڵی گەورە و باڵادەنگ دەگرێتەوە کە لە بۆنە ئایینیەکانیاندا بەکارهێنراوە.

Duodecima(I), Douzième(F), Twelfth interval(E) میانەی دوانزەیەم.

Duo sonata(I) سـۆناتا دیو، شـێوەیەکی مۆزیکایی هەگبەی بارۆکە بۆ سـۆڵۆی ئامێرێکی وەک کەمانچە کە پێویسـتی بە سـێ ژەنیار هەیە{بە سـۆلۆژەنەکەوە}.

Duole(G), Doulet(F), Duplet(E) دیولە، نۆتەی دووتایی. لێدانی دوو نۆتە لە هەمان کاتی سـیانییدا.



Duplet(E), Duina(I), Duole(G), Duolet(F) دەبڵ.

Duple meter, Duple time(E) کێشی دووانی.




Duplet, Couplet(E) دوپلێت، جووت نۆتەیەک یاخود جووت وچانێک لە ڕەزمی سـیانییدا. بڕوانە/Hemiola.




Dur(G), Dura(I), Hard, Major(E) مێجەر، سـکێڵی گەورە، سـەخت، زبر.

Dura, Durum, Durus(L), B-natural(E) تۆنی سـی سـروشتی.

Durackord(G), Major chord(E) کۆردی مێجەر.

Durament(F), Duramente(I), Hardness(E) سـەختـیی.

Duration, Length(E), Dureé(F) پێچـوون، خایاندنی کات درێژەپێدانی نۆتە چ دەنگ بێت چ وچان کە بە هێما ئاماژەی پێدەدرێت. ســەتەی/16م ســەرەتایەک بوو بۆ دانان و دیاریکردنــی ئەو هێمایانە، ئەمەیش خشـتەیەکە بۆ ئەو گۆڕانکارییەی کە بەسـەریادا هاتووە:ـ

16th Century Note Durations
نۆتە پێچووەکانی سەتەی شانزەم

Maxima
Longa
Breve =
Semibreve =
Minim =
Semiminum =
Fusa =
Semifusa =

Modern equivalent
سەردەمی هاوچەرخ

پاش پەرەپێدان و پێشکەوتنێکی لەبەرچاو....ناوی پێـچوونەکان*Durations*گەیشتە ئەو ئاستەی کە سەردەمی ئێستا بەم خشتەیەی خوارەوە کاری پێبکرێت:ـ.

| US | English | Italian | French | German |
|---|---|---|---|---|
| longa | longa | longa | longa | Longa |
| breve | breve | breve | brève | Brevis |
| whole | semibreve | semibreve | ronde | Ganze |
| half | minim | minima | blanche | Halbe |
| quarter | crotchet | semiminima | noire | Viertel |
| eighth | quaver | croma | croche | Achtel |
| sixteenth | semiquaver | semicroma | double croche | Sechzehntel |
| thirty-second | demisemiquaver | biscroma | triple croche | Zweiunddreissigstel |
| sixty-fourth | hemidemisemiquaver | semibiscroma | quadruple croche | Vierundsechzigstel |

بۆ کات وەرگرتن و بەکارهێنانی هەندێک پیت وەک هێمایەک بۆ ڕەزمگرتن{وەک تا ta، تی ti، توو too، تیکا tika، توم tum،....وەهەروەها} دەکرێت پەنا بۆ دوو جۆر پێچوون ببرێت:ـ

1. پێچوونی کاتی سادە*Simple time duration*.

| Duration پێچـوون | Rhythm Name ناوی ڕەزم |
|---|---|
| Simple time کاتی سـادە | |
| crotchet (quarter note) | ta |
| 2 quavers (2 eight notes) | ti-ti |
| 4 semiquavers (4 sixteenth notes) | tika-tika |
| 3 triplet quavers (3 triplet eight notes) | tre-o-la |
| quaver + 2 semiquavers (eight note + 2 sixteenth notes) | ti-tika |
| 2 semiquvers + quaver (2 sixteenth notes + an eighth note) | tika-ti |
| semiquaver+quaver + semiquaver (sixteenth note + eighth note + sixteenth note) | syn-co-pa |
| minim (half note) | too |
| dotted crotchet (dotted quarter note) | taam |
| dotted crotchet + quaver (dotted quarter note + eighth note) | taam-ti |
| dotted quaver + semiquaver (dotted eighth note + sixteenth note) | tim-ka |

2. پێچوونـی کاتی پێکەڵ*Compound time duration*.

| Duration پێچـوون | Rhythm Name ناوی ڕەزم |
|---|---|
| Compound time کاتی پێکەڵ | |
| 3 quavers (3 eighth notes) | ti-ti-ti |
| crotchet + quaver (quarter note + eighth note) | ta-ti |
| quaver+2 semiquavers + quaver(eighth note+2 sixteenth notes+eighth note) | ti tika ti |
| 4 semiquavers + quaver (4 sixteenth notes + eighth note) | ti-ka-ti-ka ti |
| dotted minim (dotten half note) | toom |

Durch(G), Through(E), Per mezzo di ciò(I) لێوەیڕا.

Durchgang note(G), Passing note(E) نۆتەی پاسـاو.

Durchkomponiert, Durchführung(G) وەڕاڕ، پەرەپێدان.

Through-leading, Development(E)

Durchweg(G), Altogether(E) سـەرانسـەر، هەمووی پێکەوە.

Durdreiklang(G), Major triad(E) مێجەری سـیانیی.

Doreté(F),Durezza(I), Hardness, Severity(E) سـەختیی، زبریی، بێسـۆز.

Düster(G), Sombre(E) دڵتەنگین، تەمومژ.

Dutar(Fa,Kr), Du corde(I) دوتار، دوو سـیم، دوو تەل کە لەنێو کوردانی خۆراسـاندا زۆر باوە.

Dux(L), Leader(E), Guida(I) — ئاڕاســتەبەر، بڕوانە/*Comes*.

Dynamics, Varying degrees of loud & soft(E) — دینامیکەکان، ڕەنگی دەنگەوارەکان.
جۆرانجۆرەپلەی گرژ و نەرمی دەنگەکان.

| Symbol هێما | Term زاراوە | Meaning واتا |
|---|---|---|
| ***ppp*** | *pianississimo* | extremely soft |
| ***pp*** | *pianissimo* | very soft |
| ***p*** | *piano* | soft |
| ***mp*** | *mezzo piano* | medium soft |
| ***mf*** | *mezzo forte* | medium loud |
| ***f*** | *forte* | loud |
| ***ff*** | *fortissimo* | very loud |
| ***fff*** | *fortississimo* | extremely loud |
| ***cresc.*** | *crescendo* | gradually becoming louder |
| ***decresc.*** | *decrescendo* | gradually becoming softer |
| ***dim.*** | *diminuendo* | gradually becoming softer |
| *messa di voce* | becoming louder then softer | |


Dehoî دەهۆڵ


Dukka دوککا
دوو تەپڵە

-------------------------------------
-----------------------
------------

# E



ئامێره کاریگەرەکان
Effect instruments



ئۆرگنی کارەبایی
Electrical Orgel

سێیەم نۆتە (نێوەند Mediant) لە سکێلی دۆ مێجەر.









# E

مۆزیک....بەرلەوەی جیهانی بێت........دەبێت نەتەوەیی بێت.
ئارام خەچەدۆریان.

---

E, ed(I), Et(F), And(E) و، پیتی پەیوەست.

E-tone(E,G), Mi(I,F) ئـی...، یاخود تۆنی می/Mi کە سـێیەمین پلەدەنگی دیاتۆنیکە لە پایە*Tonic*ی پلەتۆنی دۆ/Cوە.



E *E-major triad*. می...بە پیتی گەورەی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی مـی مێجەری سـیانیی

E *e-minor triad*. می...بە پیتی بچووکی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی مـی ماینەری سـیانیی

E-double flat(E), Eses(G), Mi-double bémol(F), Mi-doppio bemolle(I) می ـ دەبڵ بیمۆڵ.



E-double sharp(E), Eisis(G), Mi-double dièse(F) Mi-doppio diesis(I) می ـ دەبڵ دیێز.



E-flat(E), Es(G), Mi-bémol(F), Mi-bemolle(I) می ـ بیمۆڵ.



E-flat major key(E) کلیلی می بیمۆڵ ـ مێجەر.



E-flat minor key, Es-moll(G) کلیلی می بیمۆڵ ـ ماینەر.



E-flat major scale(E) سـکێڵی می بیمۆڵ ـ مێجەر.



E-sharp(E), Eis(G), Mi-dièse(F), Mi-diesis(I) می ـ دیِز.



E-sharp major(E) سـکێڵی می دیِز ـ میٚجەر کە هاوتایە بۆ کلیلی فاـ میٚجەر.



E-major key(E), E-Dur(G), Mi-Majeur(F) کلیلی می ـ میٚجەر.



E-major scale(E) سـکێڵی می ـ میٚجەر.



E-minor, E-moll(G), E-mineur(F), E-minore(I) کلیلی می ـ ماینەر.



E-sharp minor(E) می دیِز ـ ماینەر کە دەبیٚتە هاوتای می ـ ماینەر.

Ebbro(I), Groggily(E) مەسـت.

Ebony(E) درەختی ئابەنووس، کەوان خشـاندن بەسـەر ژێدا تاکو پاژنە و یەکسـەر بەدوایدا بە پەنجە لیٚبدریٚت.

Ebollimento, Ebollizione(I), Ebullation(E) هەڵچوون، جۆشـان.

Écart(F), Stretch of the hand when playing(E) کشـاندنی دەسـت لە ژەنیندا.

Eccedente(I), Augmented(E) زێدەکراو.

Ecclesia(L), Ekklesia(Gr), Church(E) کڵێســە.

Ecclesiastical modes(E) دەســگا مۆزیکیەکانی کڵێســەی سـەتەکانی ناوەڕاسـت.

Ecem, Ejem(Ar,Kr,Tr) ئەجەم.




دەســگایەکی سـەرەکی و باوە لە مۆزیکی کوردیدا. لە مۆزیکی خۆراوادا دەبیٚتە هاوســکێڵی میٚجەر*Major*. بوژاندنەوەی ئەم دەســگایە دەگەڕیٚتەوە بۆ زانای ئیســلامی قوتبەدینی شیرازی کە لە پەڕاوەکەیدا{درة التاج لغرة الدیباج}ئاماژەی پیٚداوە. ســەفەددینی ئورمیٚـیی/یش ناوی بردووە و خستبوویە ناو بازنەی شـەسـتوشـەمینەوە.

سکێڵی ئەم دەسگایە پێکهاتووە لە ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی ئەجەم عەشیران و ڕەگەزێکی لاوەکی کە بریتیە لە ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا.

کە دڵ ئەتوێتەوە بۆ تۆ ئەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا

کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لەخۆ بڕوا

مەحوی، بەدەنگی:علی مەردان

یاخود سۆزی مامە سێوە کە دەڵێت:ـ

ئەوەڵ سەحەرە............................

سەحەر سەدای منی غەریبە ماری

وەزی هەرگێرم............................

ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن

ئەمن بەبێ برین خوێنی دەڕێژم..........

گەلێ برادەرینە ئەمن هەرچەند دەکەم

لەوێ کۆنە دنیایێ..............................

قاسیدەکی بەمتمانیم بە دەستناکەوێ

بنێرمە کن بەژنێ باریک و دووچاوی بەرەک

ڕاستی درێ خۆمی لە بۆ ببێژم

وەیلێ.................سەحەرە

**ئەجەم عەشیران، ئەجەم کورد** Ecem Eşeyran, Ecem Kurd (Ar,Kr,Tr)

لقێکە لە دەسگای ئەجەم، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی ئەجەم عەشیران، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا. سکێڵی هاتنەخوارەوەیشی بە هەر هەمان زنجیرە تۆن دێتەخوارەوە بەڵام بە دوو ڕەگەزی سەرەکی جیاواز:ـ ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی ڕاست.



ئەی ڕەقیب هەرماوە قەومی کورد زوبان          نای ڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان

دڵدار، ئاوازی:شێحسەین بەرزنجی



Echo(E), Eco(I), Echos/Gr) زایەڵە، پەتان، دەنگدانەوە.
Echo attachment(E) جۆرە ئامێرێکی هەواییە کە بە شـەپیووری مامناوەندی دەچێت.
Echo cornet(E) جۆرە ئامێرێکی هەوایی دەنگ نەرمە.
Écharpe(F), Scarf(E), Scialle(I) پۆشیدە، بەستەیەکی درێژەپێدان.
Échelle, Gamme(F), Scale(E) سـکێڵی مۆزیک، سـکێڵ، بڕوانە/*Scale*.
Échelette(F), Xylophone(E) زایلۆفۆن.
Éclatant(F), Brilliant(E) درەوشـــاو.
École(F), School(E) خوێندگە.
École de chant(F) خوێندەگەی ئاواز و ســـاز.
Eco(E) زایەڵە، سەدا.
Eco lontano(I) زایەڵەی دوور.
Eco lontanissimo(I) زایەڵەی زۆر دوور.
Écossise(F) جۆرە ســـەمایەکی کێش3/4ی سـکۆتلاندەییە، دوایی خرایەسـەر کێشی2/4بە هاویاری ئامێری مەشکەنای*Bagpipe*، ئەم سـەمایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی سەتەی/18م.
Edel(G), Noble(E) خانەدان، نایابف باوەند.
EDO ئیدۆ، کورتکراوەیە بۆ بەشـەیەکسـانەکانی ئۆکتاڤ*Equal divisions of octave*کە تیایدا تێمپێرامێنتی یەکسان بەشـێوەیەکی ئاسـایی یەکسانە بە ئۆکتاڤێکی دابەشبوو بۆ دوانزە پارچە 12 *parts*کە بە کورتکراوەی*12edo*ئاماژەی پێدەدەرێت لە کاتێکدا کە **768edo** زۆر گرنگە بۆ بەکارهێنانی میدی/MIDI، چونکە تۆنی ستاندەردی هەموو دەنگەکان لە میدی/دا دیاریدەکرێت هەندێک لە شارەزایان و دیمانگەران*Theorister*بە کورتکراوەیED2 ئاماژەی پێدەدەن ئەویش دەیگەڕێننەوە بۆ ڕێژەی ئۆکتاڤ کە بریتیە لە2:1.
Effects(E), Effet(F), Effeto(I) کاریگەرەکان،
وەک زاراوەیەک مەبەست لەو دەنگەدەرەکیانەیە کە لە کاری مۆزیکدا بەکادەهێنرێن وەک فیکە، دەنگی باوباران، باڵندە و گیانەبەران، شـەپۆلی دەریا، گریانی منداڵ.... .
Effleurer(F), To touch very lightly(E) بەرکەوتن زۆر بە سـووکی.
Effects pedals(E) کاریگەرە پایدەرەکان کە لە ئامێرە کارەباییەکانی وەک گیتاری کارەبایی بۆ یاریکردن بە تۆنەکان بەکاردێن.
Égal, Égale(F),Eguale(I), Equal(E) یەکســان.
Également(F), Egualmente(I), Equally(E) بەشـێوەیەکی یەکســانی.
Egualità(I), Egualezza, Equality(E) یەکســانی.
Eifer(G), Zeal, Heat(E) بەجۆش و گەرم.
Eifrig(G), Zealous(E) بە گەرمی.

Eighth-note(E), Croche(F), Croma(I), Achtel(G) هەشتیەک1/8ی نۆتەی تەواو.



Eighth-rest(E) وچانی هەشتیەک، هەشتیەک وچان.

Eile(G), Haste(E) هەڕە، پەلە.

Eilen, Eilig(G), Hurry, Speedy(E) هەڕانە*Herane*، بەپەلە.

Eilend(G), Hurrying(E), Accelerando(I) پەلەکردن.

Ein, Eine(G), One(E), Uno(I) یەرێ، یەک.

Eight note Spanish scale(E) سکێڵی جوویی، دەسگایەکی ئایینی جوویی*Jewish scale*یە کە لە نوێژەکانیاندا دەیخوێنن. هەشت نۆتەی ئیسپانیایی کە بە ئاهاڤا ڕابۆهـ *Ahava Rabboh* یاخود بە فرەیگیش*Freygish*ناودەبرێت.



Eight to the bar, Continuous rhythm(E) ڕەزمێکی هەشتیەک نۆتەی بەردەوام نموونەیەکی بە دەستەچەپ ژەنینە کە لە مۆزیکی بووگیی ـ ووگیی*Boogie-Woogie*دا ڕەچاو دەکرێت. بڕوانە/*Boogie-woogie*.

Einfach(G), Simple, Single(E), Singolo(I) ئاسان، تاک.

Einmal(G), Once(E), Una volta(I) یەکجار.

Einschlafen(G) خامۆشکردنی کات و کورتکردنەوەی تۆن و تێمپۆ.

Einstimmig(G), For one-voice or voice, Monophonic(E) یەکدەنگی(بۆ یەکبەش).

Eintritt(G), Intrance, I(E) دەسپێک، سەرەتا.

Einzeln(G), Single(E) سەڵت، ڕەبەن.

Ektar, Ektara(Hn) یەکتار، یەکتارە، ئامێرێکی ژێداری میللییە لە هیندستان.

E-La(E) ئی ـ لا، لە سۆڵفێجدا ئاماژەیە بۆ ناوە نۆتەی/e’’ .

E-La-fa(E) ئی ـ لا ـ فا، لە سۆڵفێجدا ئاماژەیە بۆ ناوی می بیمۆڵ*E-flat*.

E-La-mi(E) ئی ـ لا ـ می، لە سۆڵفێجدا ئاماژەیە بۆ دوو نۆتە کە یەکێکیان می**e** ـ گڕ(*Elami grave*) ، ئەویتریان می´**e** ـ تیژ(*Elami acutum*) .

Élan(F), Dash, In the sense of impetuosity(E) لە هەستێکی هەڵەشەییدا.

Élargir(F), To broaden, Make more slowly(E) زۆر هێواش بکرێتەوە، فراوانبکرێت.

Élargissant(F), Broadening(E) فراوانکردن.

Electric violoncello(E) چێللۆی کارەبایی کە چوار ژێی لەسەر بەستراوە.

Elegant(E), Elegante(I) شەنگ و جوان.

Élégamment(F), Elegantmente(I), Elegantly(E) بەشێوەیەکی شۆخوشەنگ.

Elegiaco(I), Elegiac(E), Ělégiaque(F) شۆخ و شەنگیی.

Élégie(F), Elegy, A song of lament(E) سترانی خەمگین.

Elementary music(E) بنەڕەتی مۆزیک، وانە سـەرەتاییەکانی مۆزیک بۆ فێرکاران.

Elements of music(E) توخمەکانی مۆزیک، ئەو توخمانەی دەبنە پێکهێنانی بەرهەمێکی مۆزیک کە بریتین لە:ـ پەردە{میلۆدی*Melody*}، ڕەزم*Rhythm*، هارمۆنی*Harmony*، دینامیکەکان*Dynamics*، ڕەنگی تۆن*Timbre(tone colour)*، دەق*Texture*، شـێووگ*Form* و تێمپۆ*Tempo*.

Elenco artistico(I), Catalogue of artisters(E) ئەلبوومی هونەرمەندان.

Elevation(E), Elevazione(I) خۆخستنە هەستێکی دەروونی بڵند لە فراهمکردنی ســرۆتێکی کڵێسەیی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا.

Elevatio(I), Upbeat, Unaccented part of the bar(E) پارچە نائاکسنتی بارێک، لاوازە لێدان.

Elevato(I), Elevated in spirit(E) لە هەستێکی بەها و بڵنددا.

Eleventh(E) یازدەیەم تۆن، ئۆکتاڤێک و چوارتۆن لەسەری، واتە بۆ نموونە لە تۆنی/Cیەوە ئۆکتاڤێک و چوارتۆنیش زێدەتر تا دەگاتە تۆنی فا/F.

Eleventh chord(E) کۆردی یازدەیەم کە پێکهاتووە لە شـەش نۆتەی سـيانییـەکان. لە مۆزیک یاخود تیۆری مۆزیکدا...بە نۆتەی یانزە پلەی سـکێلێک لە ڕەگی کۆردێکەوە و هەروەها لە میانەی نێوان ڕەگ و یانزەم پێناســەدەکرێت کە لە سـکێڵی دیاتۆنیکدا تەنیا حەوت پلە دەگرێتەوە. پلەی یانزەم هەروەک تۆنی ژێرزاڵە*Subdominant*و میانەکەیشی{واتە میانەی یانزەم} دەبێتە چوارەمێکی ناسـادە کە پێکەلێکی چوارەم*Compound fourth*پێکدێنێت.

ئەمەیش چەند نموونەیەکە لە کۆردی یانزەم لەسـەر تۆنی دۆ/C:ـ




Emotion(E), Emozione(I), Empfindung(G) هەستێکی هەژاو.

Emphasised(E), Accusé, Accusée(F) پاگیربوو، جەختکراو.

Emozionato(I),Excited(E) بەهەســت و کاریگەر.

Empotré(F), Carried away, Excitedly(E) دوورە پەرێز، ورووژاوانە.

Empressé(F), Eager(E), Ansioso(I) بە پەرۆش و حەز.

Ému(F), Moved, Affected(E) بزێو، بەکار.

En(F), In(E), Negli(E) لەناو، دەر.

En accélérant(F), Accelerando(I) بە پەلە.

En augmentant(F) لە زێدەدا.

En badinant(F), Playfully(E) بە گاڵتە و گەمەوە.

Enarmonico(I) بڕوانە/*Enharmonic*.

Enchiridon(G), Hand-book(E) بەرنووس، نووسـراوی بەردەست.

Enclume(F), Anvil(E) بڕوانە/*Anvil*.

Encore(F), Again(E), De capo(I) جارێکیتر.

Encore une fois(F), Once again(E) یەکجاریتر.

End(E), Fin(F), Ende(G), Finire(I) کۆتایی، پایان.

En diminuant(F), Decrease volume and tempo(E) کزکردنی دەنگ و تێمپۆ.

Energico(I), Energetic(E) بەوزە و تواناوە.

Energia(I), Energy(E) وزە.

Enfasi(I), Emphase(F,G), Emphasis(E) پاگیر، جەخت.

Enfatico(I), Emphatic(E) پاگیری، جەختکردن.

Enfaticamente(I), Emphatically(E) بەپاگیریی، هەستدەربڕین بەشێوازێکی جەختکردن.

English fingering(E) پەنجاندنی ئینگلیزی، سیستەمی پەنجەدانان لەسەر ئامێرە کیبۆردەکان کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی هەگبەی باڕۆک لەبەرئەوە پێیشیدەوترێت پەنجەکاری باڕۆک*Baroque fingering*، وەک لەم خشتەیەدا:

| نمره Number | پەنجەی بەکارهاتوو Finger to be used |
|---|---|
| x | thumb پەنجە گەورە |
| 1 | index شایەتمان |
| 2 | middle ناوەند |
| 3 | ring موستیلە |
| 4 | small پەنجە تووتە |

بەڵام بەپێی سیستەمی کیبۆردی مۆدێرن وا دانراوە کە پەنجەگەورە نمرە یەک/1 بێت نەوەک پیتی/x و بەدوایدا نمرەکانی 2، 3، 4، 5 دێن بۆ پەنجەکانیتر.

English horn, Alto-oboe(E), Cor englais(F), Corno inglese(I) هۆڕنی ئینگلیزی، پێیشیدەوترێت ئاڵتۆ ئۆبوا کە پێنج پەردە لە ئۆبوای ستاندەر نزمترە.

Enharmonic, Quarter tone(E), Enarmonica(I), Enharmonique(F) ئینهارمۆنیک، بۆ ئەو نۆتانەی هەمان پەردە*Pitch*یان هەیە بەکادەهێنرێت بەڵام جیاوازن لە ناوەکاندا، بۆ نموونە:ـ

دۆ ـ دیێز ، ڕێ ـ بیمۆڵ$C^{\#}$ - $D^{b}$ فاـ دیێز ، سۆڵ ـ بیمۆڵ$F^{\#}$ - $G^{b}$.




English handbells(E) زەنگەدەستی ئینگلیزی، کۆمەڵە زەنگۆڵەیەکە بە ڕیزبەندییەکی میلۆدیانە سازکراوە، کاتی خۆی لەنزیک سەتەی/17مدا لە کڵێسەکاندا بەکاریاندەهێنا.

Enharmonic genus(E) بڕوانە/*Genera*.

مۆدیولێنی ئێنهارمۆنیک، زاراوەیەکە بۆ کلیلێک کە گۆڕانی دەنگی تیادا نەبێت، بەڵام بە کۆرد*Chord* دەنووسرێتەوە ئەویش بە بەکارهێنانی یەکسانە ئێنهارمۆنیکەکان*Enharmonic equivalents*.

دوو جۆری سەرەکیش لە مۆدیولێنە ئێنهارمۆنیکەکان هەیە:

1. حەوتەمی زاڵ/شەشەمی زێدە*Dominant seventh/augmented sixth*.
2. حەوتەمی گەستوو*Diminished seventh*.

Enigmatical canon(E) کانونی پەردەک{لەغز}، چەشنە کانونێکە کە دەسپێکردنی بە زنجیرە پارچەیەک لە سیمبۆڵە نهێنیەکانی ئاماژەی پێدەدرێت{لە سەتەکانی/15م و 16م زۆر باوبووە}.



سکێڵی پەردەک، سکێڵێکە لەلایەن مۆزیکار جیوسپی ڤێردی(1813-1901)*Giuseppe Verdi*وە داهێنراوە و یەکەم بەکارهێنانیشی لە بەرهەمەیکیدا ساڵی1897ز بووە بەناوی/*Ave Maria*.

Enlevez(F), Remove, Take off by pedal or mute(E) دەنگ کزکردن ئەویش بە پێداڵ یاخود بە پێکپە*Mute*.

En mourant, En s'effaçant(F), Dying away(E) مراندن، خوامۆشکردن.

Ensalada, Salad(S) سەلاد، چەشنە کۆراڵێکی کۆمێدی ئیسپانیایی سەرنجڕاکێشە کە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی سەتەی/15 و 16م.

Ensemble(F), Together, Team work(E) پێکەوە، تیم، مەبەست لە پێکەوەبوونی گروپێک لە مۆزیکژەنان، پارچەیەک ئۆپێرا کە دوو سترانخوێن یاخود زیاتر پێکەوە بسترانێن.

Entendre(F), To hear(E) ببیستیت، بشنەویت، گوێبگریت.

Entendu(F), Heard(E) بیستن، شنەوتن، گوێگرتن.

Entfernt(G), Da Lontano(I), Distance(E) میانە، درێژی، دووری.

Entracte, Entr'acte(F) بڕوانە/*Divertimento*.

Entrain(F), Vigour, go(E) هاتنەناوەوە بە توندی.

Entrainment de l'oreille(F), Ear training(E) گوێ ڕاهێنان.

Entrata(I), Entrée(F), Entrada(S), Prelude(E) هاتنەناوەوە، دەسپێک.

Entrechant(F) جۆرە سەمایەکی بالێت*Ballet*ە کە سەماکاران لە بەرزبوونەوەیاندا هەردوو لاقیان لە هەوادا دەکەنەوە و دیکێشنەوە بەیەکدا.

Entry, Prelute(E) دەسپێکی میلۆدییەک، زاراوەیەکی سەتەی/17مە لە کارێکی مۆزیکدا.

Entschieden(G), Resolute, Decided(E), Risoluto(I) بە ئەزمەند و بڕیارەوە.

Entschlossen(G), Determined(E) دیارکراو.

Entschlossenheit(G), Determination(E) دیارکردن.

Entusiasmo(I), Enthusiasm(E) جۆش و پەرۆشی.

Entusiastico(I), Enthusiastic(E) بەجۆش و پەرۆش.

Envoi, Envoy(E) ئینڤۆی، دوابەشە لە بەیتی شایەر/*Troubadour poem*. کە بە بەستە کادەنس*Close cadence*کۆتایی دێت.

Eolien(F), Aeolian(E) بڕوانە/*Mode*.

Epicède(F), Epicede(E), Epicedio(I), Epicedium(L), Epiodion(Gr) سترانی پرسە، پارچە مۆزیکێکی تێڕامانیی.

Epidiapente, A canon at the fifth(E) کانونێک لە میانەی پێنجەمدا.

Epigoneion, Epionion(Gr) ئێپیۆنیۆن، ئامێری گیتار*Kithara*که 40 ژێی لەسەر بەستراوە و دەخرێتەسەر ڕان لەکاتی ژەنیندا.

Épinette(F), Spinet(E), Federclavier(G) ئامێری سپینێت*Spinet*کە جۆرێکە لە ئامێری هاپسیکۆرد و بە زۆری لە فەڕەنسا باوە.

Epinicion(Gr), A song of victory(E) سروودی سەرکەوتن.

Épiglottis, Epinette, Clavecin(F), Spinett(G), Harpsichord(E) هارپسیکۆرد.

Episode(E), Épisode(E) ئێپیسۆد، چەند پارچە ئاوازێکی تراژیدی لاوەکیە کە ناوژەنکراوەتە ڕەپاتبوونەوە*Repetition*ی تۆنە*Tune*سەرەکیەکان لە فیوگە*Fugue* و ڕۆندۆ*Rondo*دا.

Epithalamion(Gr), Epithalamium(L) سترانی شایی و زەماوەن.

Epilogue(F), Coda(I) بەشی کورتەکۆتایی پارچەیەک.

Epithalamium(G), Marraige song(E) سترانی زەماوەند.

Epitrite(E) ڕەزمی چوار بڕگەیی{تن □ تن □ تن □ تە ∪} بریتیە لە سێ درێژە سیلاب و یەک کورتە سیلاب.

Epode(Gr) بەیت، هەڵبەستەستران، دوابەشی کۆڕاڵێک بە بەیتێکی درێژتر لە پێشوو.

E poi(I), And then(E) و..پاشان.

E poi segue la coda(I) و...پاشان کۆدا*Coda*ی بەدوادێت.

Eptacorde(F), Ettacordo(I) سکێڵی حەوت نۆتە، میانەی حەوتەم، ئامێری لیر*Lyre*ی یۆنانی بە حەوت ژێ/وە.

Equabile(I), Equable(E) شیاوی یەکسانی.

Equal voices(E), Voci eguali(I), Voces aequales(L), Gleiche stimmen(G) دەنگە یەکسانەکان، مەبەست چەند گروپێکی دەنگە لە هەمان دەنگەواردا، بەگشتی بۆ دوو یاخود سێ سۆپرانۆ.

Equale, Eguale, Eguali(I), Equal(E) یەکسانان، پارچەمۆزیکێکی بۆ چوارینەی ترۆمبۆن *Quartet of trombones* کە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی سەتەی/18 و سەرەتای سەتەی/19.

Equal temperament(E), Tempérament égal(F) Temperamento equabile(I), Gleichschwebende stimmung(G) یەکسانە تێمپێرامێنت، سیستەمێکی نەواسازییە*Tuning system*کە ئۆکتاڤ دەکات بە دوانزە بەشی نیوەتۆنەوە{هەر نیوەتۆنە یەکسانە بە100Cents}. مۆدێرن سیستەمێکی دەنگەکانە بۆ جێ دیاریکردنی میانەی ئۆکتاڤ بەتەواوی و میانەی نێوان هەر نیوەتۆنێکی یەکبەدوایەکیشی کە دەبێت یەکسان بێت بە ڕەگی دووجای دوانزە ئەویش بە لابردنی ڕەگی دوانزەی کۆمای فیساگۆریی *Pythagorean comma*لە هەر میانەیەک لە زنجیرەیەکی دوانزە پێنجەمی{3/2}دا.

وەک لەم خشتەیەدا نمایانکراوە:ـ

| نۆتەکان Notes | فریکوێنسی (ئۆکتاڤەکان) Frequency(Octaves) | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| A | 55.00 | 110.00 | 220.00 | 440.00 | 880.00 |
| A# | 58.27 | 116.54 | 233.08 | 466.16 | 932.32 |
| B | 61.74 | 123.48 | 246.96 | 493.92 | 987.84 |
| C | 65.41 | 130.82 | 261.64 | 523.28 | 1046.56 |
| C# | 69.30 | 138.60 | 277.20 | 554.40 | 1108.80 |
| D | 73.42 | 146.84 | 293.68 | 587.36 | 1174.72 |
| D# | 77.78 | 155.56 | 311.12 | 622.24 | 1244.48 |
| E | 82.41 | 164.82 | 329.64 | 659.28 | 1318.56 |
| F | 87.31 | 174.62 | 349.24 | 698.48 | 1396.96 |
| F# | 92.50 | 185.00 | 370.00 | 740.00 | 1480.00 |
| G | 98.00 | 196.00 | 392.00 | 784.00 | 1568.00 |
| G# | 103.83 | 207.66 | 415.32 | 830.64 | 1661.28 |

ئەمەیش نموونەی خشتەیەکــی ترە لە یەکسـانە تێمپێرامێنت:ـ

| Number of Semitones | Interval Name | Nontes | Consonant | Just Intonation | Equal Temperament | % Difference |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 0 | Unison | C-C | Yes | 1/1=1.000 | $2^{0/12}$=1.000 | 0.0% |
| 1 | Semitone | C-C# | No | 16/15=1.067 | $2^{1/12}$=1.059 | 0.7% |
| 2 | Whole tone | C-D | No | 9/8=1.125 | $2^{2/12}$=1.122 | 0.2% |
| 3 | Minor third | C-Eb | Yes | 6/5=1.200 | $2^{3/12}$=1.189 | 0.9% |
| 4 | Major third | C-E | Yes | 5/4=1.250 | $2^{4/12}$=1.260 | 0.8% |
| 5 | Perfect fourth | C-F | Yes | 4/3=1.333 | $2^{5/12}$=1.335 | 0.1% |
| 6 | Tritone | C-F# | No | 7/5=1.400 | $2^{6/12}$=1.414 | 1.0% |
| 7 | Perfect fifth | C-G | Yes | 3/2=1.500 | $2^{7/12}$=1.498 | 0.1% |
| 8 | Minor sixth | C-Ab | Yes | 8/5=1.600 | $2^{8/12}$=1.589 | 0.8% |
| 9 | Major sixth | C-A | Yes | 5/3=1.667 | $2^{9/12}$=1.682 | 0.9% |
| 10 | Minor seventh | C-Bb | No | 9/5=1.800 | $2^{10/12}$=1.782 | 1.0% |
| 11 | Major seventh | C-B | No | 15/8=1.875 | $2^{11/12}$=1.888 | 0.7% |
| 12 | Octave | C-C' | Yes | 2/1=2.000 | $2^{12/12}$=2.000 | 0.0% |

Equalmente(I), Alike(E) ویکچوون، هاوسان، وەکویەک.

Equilibre(F), Balance(E) هاوسەنگ، هاوسان.

Ergriffen(F), Gripped, Emotion(E) دڵگیری، پەرێشانی، وروژاندن.

Erhaben(G), Sublime(E), Elevato(I) بڵند و شکۆ.

Erhabenheit(G), Sublimity(E) بڵندی و شکۆیی.

Erleichterung(G), Easing(E) ئاسانی.

Erlöschend(G), Becoming weaker, Softer(E) نەرمتر، لاوازبوون.

Ermattend,Ermattet(G), Tired out(E) بێزار و ماندوو.

Erniedrigen(G), Lower`pitch`(E) پەردە نزمکردنەوە.

Eroica, Eroico(I), Heroic(E) پاڵەوانیی.

Erst, Erste(G), First(E) Premier(F) یەکەم.

Erschüttert(G, Shaked(E) ڕاچەنیو، ڕاوەشاو.

Erstickt(G), Suffocated(E) خنکاو، خەفەبوو.

Erweckung(G), Widened, Slower with steadiness(E) فراوان، کە مەبەست هێدیبوونەوە بەرەو کرِی*Stability*، فراوانکردنی یەکێک لە میانەکانی ڕشتە*Theme*یەک.

Erzürnt(G), Irritated(E) تووڕە و هاژ.

Es(G), E-flat(E) می بیمۆڵ/$E^b$ .

Esacordo(I), Sixth interval, Hexachord(E) میانەی شـەشـەم، هێکسـاکۆرد.

Esaltato(I), Excited(E) بە جۆش و وروووژاو.

Esaltazione(I), Exactement(F), Excitation(E) جۆش و وروووژان.

Esattezza(I), Exactness(E) وردی و تەواوی.

Esatto, Esatta(I), Exact(E,F) ورد و تەواو.

Escape note, Escape tone, Non-harmonic note(E) نۆتەی هەڵاتوو، بڕوانە/*Non-harmonic note*.

Eschallot, Shallot(F), Brass tube(E) لوولەی براس لە ئامێری ئۆرگن/دا.

Esecuzione(I), Execution(E) چەلاندن، فراهمکردن.

Escercizio(I), Exercise(E,F) ڕاهێنان، مەشـقاندن.

Escercizi(I), Exercises(E) ڕاهێنانەکان، مەشقەکان.

Es-dur(G), E-flat major(E) می بیمۆڵ ـ مێجەر.

Eseguendo(I) لە جێبەجێکردندا، لە فراهمکردندا.

Eses(G), E-flat(E) می ـ دەبڵ بیمۆڵ/$E^{bb}$.

Esfehan(Ar,Kr,Tr) ئەسـفەهان، لقێکی پەیوەستە لەنێوان دەسگای بەیات و ڕاست. پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا.




Espace(F), Space(E), Spazio(I) بۆشـایی نێوان هێڵەکانی پەیژەی مۆزیک.

Espirando, Extinguiendo(I), Ersterbend(G), Dying away(E) پەژمردەبوون، خامۆشـبوون.

Espressivo(I), Expreessively(E) بە گوزارەییانە، *Espr.*کورتکراوەیەتی.

Espressione(I), Expression(E,F) گوزارە، دەربڕین.

Esquisser(F), Sketch(E), Abbozzo(I) نەخشە، کۆمێک دیمەنێکی شانۆگەریی.

Essential harmonies(E) هارمۆنیە سەرەتاییەکان،

بریتیە لە پایەتۆن*Tonic*و زاڵ*Dominant*و لازاڵ(ژێرزاڵ)*Subdimenant*.

Estinto(I), As soft as possible(E) ئەوپەڕی نەرم، ئەوپەڕی پلەی نەرمی*Pianissimo*.

Estompé(F), Toned down(E) تۆن هاتنەخوارەرە.

Estravaganza(I), Extravagance(E) سەرکێش، سەهەند.

پارچەمۆزیکێک یاخود نمایشێکی ئەندێشەیی بەچەشنێکی نابویار{نا ـ واقیع}.

Estrema(I), Extreme(E) بێڕادە، بێئەندازە، توندمەند.

Estremamente(I), Extremely(E) توندمەندانە، بێڕادەییانە.

Esuberante(I), Exuberant(E) ڕێژەن، پڕ لە بژێوی.

Esultazione(I), Exultation(E) شادی و خرۆشی.

Et(F,L), And(E), E(I) و(پیتی پەیوەند).

Éteindre(F), Extinguish(E) خامۆشدەبێت.

Éteint(F), Extinguished(E) خامۆشبوو.

Étendue(F), Range, Extent(E) ڕانژ، بەرینی تۆن، مەودا.

Etereco(I) ئاسمانی.

Ethos(Gr), Character(E) ئێتۆس، کارەکتەر ڕیشەپەیڤێکی یۆنانییە

بەمانای ڕەفتار یاخود کەسایەتی دێت، واتە چۆنیەتی نواندنی کەسێک لە هەر وێستگەیەکی جیاوازدا بێت، بۆ نموونە لە مۆزیکدەسگا دێرینەکانی یۆنانیدا:ـ لە دۆریەن*Dorian mode*دا ئەو کەسە دەبێت بەشێوەیەکی پیاوانە و بەهێزانە*Manly and strong*خۆی بنوێنێت، یاخود لە دەسگای فریجیەن*Phrygian mode*دا دەبێت شادیبەخش و سەرگەرم بێت، لە دەسگای لیدیەن*Lydian mode*دا ژنانی و هەراش*Feminine and Lascivious* و لە دەسگای میکسۆلیدیەن*Mixolydian mode*دا خەمبار و ڕەشپۆش.

Étouffé(F), Damper, Muffled, Muted(E) کپێنراوە.

Étouffer(F), Damp(E), Umido(I) کپکردن بە پێکپە*Mute* لە کەمانچە و پێداڵ*Pedal* لەپیانۆدا.

Étouffoirs(F), Dampers on a piano(E) پێکپەکانی سەر ئامێری پیانۆ.

Étude(F), Study(E) ئێتود، ڕاهێنان و مەشقکردن لەسەر هەر پارچەمۆزیکێک ئەویش

بە مەبەستی تەکنیک بەهێزکردن و بەرزکردنەوەی توانای هونەری فێرخوازان.

Etwas(G), Some, Something(E) هەندێک، وانێک، شتێک.

Eu(Gr), Good, well(E) باش.

Eufonia(I), Euphony, Concord(E) خۆشنەوا، خۆشدەنگ، دەنگی هاوساز.

Eumelia, Glass harmonica(E) جامە هارمۆنیکا، هارمۆنیکای شووشە.

Eunuch flute, Kazoo(E) ئامێری کازوو کە گچکەئامێرێکی هەواییە.

Euphonic on, A kind of upright piano(E) ئامێری پیانۆی وەستاو.

Euphonium(E), Euphoniun, Baryton(G), Bombarda(I) ئامێری تووبا تینۆر/*B-flat* کە سێ ئۆکتاڤ مەودایەتی بە سێ میانە خوارتر لە کلیلی باس*Bass staff*.

Eurhythmics, Musical rhythm expression(E) جووڵەپێکردنی بەدەن بە ڕەزمی مۆزیک، سیستەمێکە کە لەلایەن ئێمیل دالکرۆزە(1865-1950)*Emile H.J.Dalcroze*پەرەپێدرا، ئەویش مەشقپێکردنی بەدەنە لەسەر ڕەزم، نزیک ساڵی1910ز توانی ئامۆژگایەک بکاتەوە بۆ ئەو مەبەستە.

Euterpe(Gr) خواوەندی هۆزانی مۆزیک لە داستانی یۆنانیدا.

Euterpion(E) جۆرە ئامێرێکی میکانیکی زۆر کۆنی ئینگلیزییە، کەمێک بە ئۆرگن دەچێت.

Éveillé(F), Awakened(E) بێدار.

Even tuning, Equal temperament(E) جووت دەنگ، تێمپێرامێنتی یەکسان.

Eveningsong(E), Abendlied(G) شەوگارەستران، نوێژنامە لە کڵێسەی ئانجلیکانی و کاتۆلیکدا.
Evening music(E), Abendmusik(G)

Evirato(I), Unmanned(E) دەنگی خەسیوو. بڕوانە/*Castrato*.

Eversio, Evolutio(L), Inversion(E) هەڵگەڕاوەی پارچەکان لە دەبڵ کۆنتراپونت/دا.

Evocación(S), Evocation, Invocation(E) هانابردنێکی پڕ لە سۆز.

Exaltation(E), Soulèvement (F), Elevamento(I) ستایش، سەرفەرازی.

Exalté(F), Exalted, Very excited(E) ستایشی زۆر کاریگەر.

Execution(E), Exécution(F), Realizzazione(I) فراهمکردنی کارێکی هونەری.

Exposition, Enunciation(E) پێشەند. لە بەشێکی یەکەمی فیوگە*Fugue*دا چەشن*Style*ێک دێتە پێشەوە، کاتێک کە دەنگەکان دێنە ناوەوەی میلۆدییەکە پێیدەوترێت ڕشتە*Subject*و سەرەتا بەشێک لەمە پێیدەوترێت پێشەند. هەروەها سەرەتا بەشێکە لەو دوو بەشەی لە سۆناتا*Sonata* بەناوی پێشەند و کورتەگێڕانەوەی ڕستەسەرەکیەکان*Recapitulation*.

Expressionism(E) گوزارەیی، فەلسەفەی گوزارە، شێوازێکی دەروونییە لە هونەری وێنەکێشاندا کە لە سەتەی/19مدا سەریهەڵدا و پاشان لە سەرەتاکانی سەتەی/20م ڕەنگی لە هونەری مۆزیکیشدا دایەوە و بووە سەرۆبەخشی مۆزیکاران.

Expression(E), Espressione(I) هەست دەربڕین، گوزارە.

Expression marks(E) هێماگوزارەییەکان، ئاماژەیە بۆ مۆزیکار لە چۆنیەتی هەستدەربڕینی لە دەقێکی مۆزیکدا ئەویش بە گۆڕینی دینامیکی دەنگ و ناسکێتی، گۆڕینی تێمپۆ لە خاو و خێرایی، گۆڕینی باری دەروونی لە پەژارە و شادی....هتد.

Extempore(L), Without prior preparation(E) بەبێ ئامادەکارییەکی پێشتر.

Extemporanneous(E) سەرپێیانە.

Extemporizatiion, Improvisation(E) سەرپێیی.

Extended chords, Extended tertian sonorities(E) **کۆردە کشـاوەکان،**
**دەنگە سـیانییە کشاوەکان کە بریتین لە کۆردەکانـی نۆیەم**9th**، یانزەیەم**11th**، ســـیانزەیەم**13th.
**پێیشـــیاندەوترێت کۆردە درێژەکان***Tall chords*. **کۆردەکانیش ئەمانەن:ـ**

| Extended chords کۆردە کشاوەکان | | | |
|---|---|---|---|
| **Cma9** | C major ninth | C, E, G, B, D | **Cma7** plus major ninth |
| **Cmi9** | C minor ninth | C, E flat, G, B flat, D | **Cmi7** plus major ninth |
| **C9** | C dominant ninth | C, E, G, B flat, D | **C7** plus major ninth |
| **C+9** | C dominant ninth augmented fifth | C, E, G sharp, B flat, D | **C+7** plus major ninth |
| **Cmi9(flat5)** | C minor ninth (flat five) | C, E flat, G flat, B flat, D | **Cmi9** with flat five |
| **C9sus** | C ninth suspended fourth | C, F, G flat, B flat, D | **C9** with suspended fourth |
| **Cmi11** | C minor eleventh | C, E flat, G, B flat, D, F | **Cmi9** plus eleventh |
| **Cmi11(flat5)** | C minor eleventh (flat five) | C, E flat, G flat, B flat, D, F | **Cmi9(flat5)** plus eleventh |
| **Cma13** | C major thirteenth | C, E, G, B, D, F | **Cma11** plus major thirteenth |
| **C13** | C dominant thirteenth | C, E, G, B flat, D, F, A | **C11** plus eleventh and major thirteenth |
| **C13sus** | C thirteenth suspended fourth | C, F, G, B flat, D, F, A | **C13** with suspended fourth |

Extended harmony(E) **هارمۆنی کشاو کە پێچەوانەی هارمۆنی داخراوە***Close harmony*.

Extraneous(E) **دەرەکی**.

Extension(E,I) **کشان، هێڵێکی ئاسۆیی کە بەدوای حونجەکاندا درێژدەکرێتەوە بۆ بەردەوامبوون لەسەر ئەو نۆتە{یاخود ئەو تۆنە}**.




Extravaganza(I) **کارێکی مۆزیکی بۆ کەسـایەتیەکی ئەندێشەیی دانرابێت**.

Extreme interval(E) **میانەی زێدە**.

Extreme Key(E) **تۆنالیتی دەرەکی کە هیچ پەیوەندەیەکی نزیکی تێدا نەبێت**.

Extreme part(E) **ئەوپەڕی نزمترین بەشی پارچەمۆزکێک**.

Extremely quick(E), Aeusserst rasch(G) **ئەوپەڕی خێرا**.

Extrémemet(F), Extremely(E) **ســەهەندانە، پەرگرانە**.

------------------------------------
----------------------
------------

چوارەم تۆن ⟨ژێرزاڵ Subdominant⟩ لە سکێلی دیاتۆنیک Diatonic

چوارەم تۆن ⟨ژێرزاڵ Subdominant⟩ لە سکێلی دۆ مێجەر.

نۆتەکەی ئاماژەیە بۆ کلیلی باس Bass clef.

F(E,G), Fa(F,I)




Fa-bémol(E), Fes(G), F-flat(E)




Fi(I), Fis(G), F-sharp(E)



# F

مۆزیک....زوانی هەستە....وشەی/یش زوانی ئاوەز.... .

شۆپنهاور

---

F(E,G), Fa(F) — تۆنی فا/Fa،چوارەمین پلەدەنگە لە دۆ ـ دیاتۆنیکە*C-Diatonic scale*وە، پێشـیدەوترێت لازاڵ(ژێرزاڵ)*Subdominant* لە پایە تۆنی دۆ/Cیەوە.



F — فا...بە پیتی گەورەی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی فا مێجەری سـیانیی*F-major triad*.

F — فا...بە پیتی بچووکی لاتینی ئاماژەیە بۆ کۆردی فا ماینەری سـیانیی*f-minor triad*.

***F.*** — کورتکراوەی/*forte*.

***F.*** — کورتکراوەی/*fine*.

F-major key(E), F-Dur(G) — کلیلی فا ـ مێجەر.



F- major scale(E) — سکێڵی فا ـ مێجەر.



F-sharp major key(E), Fa dièse majeur(F) — کلیلی فا ـ دێز.



F-sharp(E), Fa-Dièse(F), Fa-Diesis(I), Fis(G) — فا ـ دێز.



F-sharp major scale(E) — سکێڵی فا دێز ـ مێجەر.



F-double flat(E), Feses(G) — فا ـ دەبڵ بیمۆڵ.



F-double sharp(E), Fisis(G) فاـ دەبڵ دێز.



F-flat(E), F-bémol (F), F-bemolle(I),Fes(G) فاـ بیمۆڵ.



F-flat major scale(E) سکێڵی فا ـ بیمۆڵ.



F-minor(E), Fa-mineur(F), F-moll(G) فا-ماینەر.



F-sharp minor key, Fa-dièse mineur(F), Fis-moll(G) کلیلی فادێز ـ ماینەر.



F-minor key(E), F-moll(G) کلیلی فاـ ماینەر.



F-Clef(E), Clef de fa(F), F-Schlussel(G), Chiave di Basso(I) کلیلی/F، کلیلی باس.




Fa altrettanto(I), In a similar manner(E) بە هەمان شـێواز، بە هەمان ڕەوتار.

Faburden(E), Fauxbourdon(F), Falsobordone(I) بڕوانە/*Drone-bass*.

Fach(G),Fold(E) دەستە، گروپ، بۆ نموونە یەکەم دەستەی کەمان*First violens* لە ئۆرکێسترا.

Faces d’un accord(I), Chord positions(E) پۆزیشەکانی کۆردێک،

بۆ نموونە پۆزیشنی ڕەگ*Root position*، یەکەم هەڵگەڕاوە*First inversion*....هتد.

Facile(I,F), Easy(E) ئاســان، ناسک.

Facilement(F), Facilmente(I), Easily(E) ئاسانی.

Facillissimo(I), Very easy(E) زۆر ئاسان، زۆر ناسک.

Facilità(I), Facilité(F), Ease(E) ئاسـان.

Fa- feint(F), Fa-fictum(L), Feigned-Fa(E) **فا-فیکتەم، زاراوەیەکی سەتەکانی ناوەڕاستە له سیستەمی هێکساکۆرد/دا کە گوزارە لە هاتنەخوارەوەی تۆنێک دەکات بە بڕی نیوەتۆنێک وەک وێکچوونی پەیوەندی تۆنی فا/***F*** **بە تۆنی می/***mi*** **یەوە، بۆ نموونە تۆنی سی ـ بیمۆڵ/**$B^b$ **بۆ تۆنی لا/***A***. نۆتەیەک کە نیوەتۆنێک بێتەخوارەوە ببێتە بیمۆڵ و پەیوەندی لەگەڵ تۆنێکی پێش خۆی.**

Fagott(G),Fagotto(I) **بڕوانە/***Bassoon*، **فاگوت، ڕیشەوشەیەکی ئیتالیاییە بەمانای لێژنەچیل***Bundle of sticks* **واتە پێکهاتوو لە کۆمەڵێک چیلکەدار.**

Fagottino(I) **فاگوتینۆ، سۆپرانۆ باسسوون کە پێنج پەردە لە فاگوتی ئاسایی بەرزترە.**

Fagottista(I), Bassoon player(E) **فاگوتژەن.**

Fagottone(I), Contra-bassoon(E) **کۆنترافاگوت، کۆنترا{دەبڵ}باسسوون، ئامێرێکی فووپیاکەرە، نزیکەی ساڵی1660ز بۆ یەکەمجار هێنرایە گروپی ئامێرەکانەوە.**

Fahren(G), Go on at once(E) **ڕۆیین یەکسەر.**

Faible(F), feeble, Weak in tone(E) **بێبڕست، بێتوانا، لاواز لە تۆندا.**

Faire(F), To do, To make(E) **ئەنجامبدرێت، بکرێت.**

Faites(F), Do, Make(E) **بکە، ئەنجامبیدە.**

Fa-La(I) **نەرمە سەمایەکی***Dance-like lilt* **ڕەزمی ڕەپات***Repeat* **ئامێزە و کە زۆرجاریش بە بە سترانەوە دەکرێت، ئەم چەشنە دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی/16م.**

Fall(G), Cadence(E) **کەوتن، کۆتاپێهاتن، لە ڕووی زاواوەوە کادەنس زۆر باوترە.**

Fall,Falle(G), Case(E) **بار، دۆخ.**

False, Wrong(E), Falsa(I), Falsch(G), Fausse, Faux(F) **ساختە، ناڕاست، فریو. مەبەست لادانە لە دەنگ***Out of tune*.

False Cadence(E) **فریوە کادەنس، بڕوانە/***Cadence*.

False fifth, Diminished fifth(E), Fausse quinte(F), Falsche quinte(G) **فریوە پێنجەم.**

Falsettist(E) **سترانبێژی ئاڵتۆ بە دەنگی نێرینەی خەسیو***Castrato*.

Falsetto(E,I), Fistel, Falsett(G), Fausset(F), Head voice(E) **دەنگی سەرەکی یاخود دەنگی ئاڵتۆ***Alto* **بە دەنگی نێرینە{کە لە بنەڕەتدا بە دەنگەواری مێیینە دادەنرێت}پاش خەساندنی بە نژداریی***Surgical operation* **بەرلەوەی بگاتە تەمەنی ڕەسیو. هەندێجار بۆ گاڵتە و خۆشمە***Comic* **و وەک دەنگێکی تینۆر بەکاردەهێنرێت. ئەم جۆرە دەنگانە زیاتر بەو کەسانەوەیە کە خەسێنراون(بڕوانە/***Castrato*).

False relation(E), Fausse relation de voix(F) **فریوە پەیوەند، جاروبار لە هارمۆنیدا ڕەوشێکی وا دەبێت کە سی ـ بیمۆڵ**$B^b$ **لە کۆردێکدا دەردەبکەوێت و سی/***B* **ی ئاساییش لە کۆردێکی ئایندەیدا، هەروەها فا/***F* **ی ئاسایی لە کۆردیکدا و فاـ دێز**$F^\#$ **یش لە کۆردێکی ئایندەیدا. دوو نۆتە کە لە هەما ن نووسیندان و جیاواز بە ئەندازەی نیوپەردە لە دەنگدا. بۆ نموونە لە کۆڕاڵێکی**

چواربەشــیدا کۆردێکیـان لە دۆ ـ دیێز $C^{\#}$ی تینـۆر *Tenor*دا بـێت و کۆردی ئایندەی لە دۆ/*C*ی ئاسـاییـ*Normal*ی سـۆپرانۆ.

Falstaff(I) فاڵستاف، ئۆپێرای سێ بەش(ســێ پەردە)کە لەلایەن مۆزیکزان ڤێردی*Verdi*ساڵی1893ز لە شـاری میلان/ئیتالیا هێنرایە بەرهەم.

Fa-mi(F,I) فاـ می، سـیستـەمێکی کۆنە بۆ پیشـاندانی نیوەتۆنێک لە دوو تۆنی بەدوایەکدا. وەک تۆنی فا بۆ می، سـی ـ بیمۆڵ بۆ لا/A، می ـ بیمۆڵ بۆ ڕێ/D..وە هەروەها.

Family(E) خێزان، دەسـتە، زاراوەیەکە بۆ ئەو ئامێر و دەنگانەی کە تاڕادەیەک هەمان ڕەوشـی ژەنینیان هەیە. وەک خێزانی کەمانچە*Violin family*کە بریتین لە کەمانچە، ڤیۆلا، چێللۆ و دەبڵ باس. خێزانی سـاکسۆفۆن*Saxophone family*یش بریتین لە سـۆپرانۆ، ئاڵتۆ، تینۆر، باریتۆن و باس سـاکســۆفۆن.

Fandango(S) فاندانگۆ، سـەمایەکی ئەندەلوس/ئیسپانی دوو کەسـییە، لەسەر کێشی3/4 یاخود 6/8 بە هاویاری ئامێری گیتار و کاسـتانێت و جاروبایش هاویاری سـتران دەبێت.

Fancy(E) فانسی، بڕوانە/*Fantasia*.

Fanfara(I), Fanfare(E,F), Tusch(G) زەخرەفەکاریی بە ئامێری ترۆمپێت،

A flourish of Trumpet(E)

لە فەرەنسا بە باندی ئامێرەبراسەکان*Barss band* ناودەبرێت کە لە گاردی پشکنین/ی جەماوەریدا لە بۆنەی گەورە و تایبەتیدا بەکاردەهێنرێت، ئێستا ئەم جۆرە باندە لە ولاتاندا بۆتە نەریتێکی فەرمی بۆ پێشـوازیکردن لە کەسـێکی گەورەولات. باندی براس و تەختەکان پێکەوە پێیدەوترێت هارمۆنیەباند *Harmonie band*.

Fantasia(I), Fantaisie(F), Fantasie(G) Fantasy(E) فانتازیی.

ئەم چەشنە هونەرە...بەگشتی وا لێکدەدرێتەوە کە خۆدوورخسـتنەوەیەک بێت لە ڕێسا مۆزیکیەکان بۆئەوەی مۆزیکسازان هزری هونەری خۆی ڕەهایانە بوەشێنێت.

لێرەوەڕا دەشێت جۆرەپێناسەیەکی بەوە بکرێت کە:

1. چەشنە مۆرگ و هەوەس*Mood*ێکی مۆزیکسازانی ســەتەی/19م بێت.

2. پارچە کۆنتراپونتاڵ*Contrapuntal piece*ێک بێت لە چەندین بەشـــدا کە بۆ یەک ژەنیار یاخود زیاتر دانرابێت، ئەم ڕەوتە لە سـەتەکانی/16م و/17م بەشـێوەیکی ســەرپێـیانە*Improvisatory*بە ناوێکی فانســی*Fancy*. سـەرەتاکانی سـەتەی/20 وەک شـێوەیەک لە شـێوەکانی هونەری مۆزیک بەناوی فانتاسـی*Phantasy*بوژایەوە و کارپێدەکرا و تا ئێستایش ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێت.

Fantasiestück(G), Phantasy picture(E) فانتازیی نیگار، پارچە مۆزیکێکی کورت کە تاڕادەیەک بە کاپریچیۆ*Capriccio*یاخود ئینتەرمیزۆ*Intermezzo*دەچێت.

Fantasticamente(G),Fantastically(E) بەچەشنێکی فانتاسـیانە.

Farsa(I), Farce(E) نواندنی خۆشمەئامێز*Comic*.

Fast(G), Almost(E) بە زۆری، خێرا.

Fastosamente(I), Pompously(E) بەچەشنێکی ڕالەخۆ.

Fastoso(I), Pompous(E) ڕالەخۆ، پڕشــکۆ.

Faticando(I) بە بێزاری.

Febbre(I), Fever(E) تا، گەرم و جۆش.

Febbrilmente(I) بە گەرم و جۆشـییەوە.

Fein(G), Fine(E) جوان، ناسک.

Feier(G), Make a party(E) ئاهەنگێڕان.

Feierlich(G), Holy day, Holiday(E) ڕۆژی جەژنی ئایینی، چەژنەوار.

Feldpartita(G) پارتیتای مەیدان، جۆرێک لە پارتیتا*Partita*یاخود دیڤۆرتیمێنتۆ*Divertimento*بۆ باندە هەواییەکان.

Felice(I), Happy(E) دڵخۆش.

Felt(E) لباو، بۆ داپۆشینی چەکوش*Hammer* و پێکپە*Damper*کانی ئامێری پیانۆ.

Feminine Cadence, Weak Cadence(E) ناسکە کادەنس، لاوازە کادەنس.

کۆتایی پێهێنانی پارچە مۆزیکێک بە لێدانە کۆردێکی ناسک، هەروەک کادەنسەکانی تر چەند جۆرێکی هەیە وەک ناســکە کادەنسی تەواو*Feminine perfect Cadence*، ناسکە کادەنسی پچر*Feminine Interupted Cadence*...وە هەروەها.

Fereĥfeza(Ar,Kr,Tr) فەرەحفەزا، شادکەش، واتە کەشوهەوایەکی پڕ لە شــاد و خۆشی.

لێرشتەیەکی سـەر بە دەسـگای نەهاوەندە، پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی یەکگــا، ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگــا.




Fereĥnak(Ar,Kr,Tr) فەرەحنـاک، لێرشتەیەکی سەربە دەسـگای سـێگایە کە پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ســێگا لەسەر پلەتۆنی ئاراک و ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی دووگــا.




Ferial(L), Feast-days(E) هەفتەجەژنـی کڵێسەی کاتۆلیک لە ڕۆژانی دووشەمو تا هەینی کە تەرخانە بۆ پەرستن و ستایش.

Ferma(I), Firm(E) چەسپاو، مەتین، وەستاو.

Fermamente(I), Firmly(E) بە چەسپاویی، بە مەیبوی، بە وەستاوی.

Fermando(I), Stopping(E) ڕێکخستنی دەنگ بە پەستان یاخود دانانی پەنجە لەسەر تۆن.

Fermata(I), Point d'arrêt(F), Fermate(G), Bird's eye, Pause(E) پۆز، پاوس، وچان، چاوەمەل، خاوکردنەوەی تێمپۆ بەرەبەرە تاکو بە وەستان کۆتایی دێت، هەندێجار هێمای پاوس لە شوێنی تایبەتی خۆیدا بەچەشنێکیتر

لەسەرەوە یاخود لە ژێرەوە



لێکدەدرێتەوە وەک لە هەندێک کۆنسێرتۆدا دەسپێکردنی کادەنزە*Cadenza*پیشاندەدات. هێمای فێرماتا*Fermata*لەسەر وچانە بێدەنگەکانیش دادەنرێت، وەک لەم دوو نموونەیەدا:ـ




Fermato(I), Steadily(E) بەجێهێنانی پاساوێک بە چەسپاویی.

Fermer(F), To close(E) کۆتایی پێهێنان.

Fermo(I), Fermamente(F), Firm(E) زۆر بەویست و ئەزمەندەوە.

Fern(G), Distant(E) مەودا، دوورک.

Ferne(G), Distance(E) دووریی.

Fernwerk(G), Echo organ,Aniphonal organ(E) دەنگدانەوەی ئۆرگن، زایەڵەی ئۆرگن.

Feroce(I), Force, Violence(E) توند، هێز.

Ferocemente(I) بەهێزەوە، بەتوندییەوە.

Fercissimo(I) زۆر بەهێز، زۆر بە گەرم و توند.

Ferocitá(I), Violently(E) بەهێز، بەگەرموتوندیی.

Fertig(I), Ready(E) گورج، ئامادە، گورجە پەنجە، لێهاتووی ژەنیار بۆ بەکارهێنانی پەنجە بە شێوەیەکی تەکنیکانە.

Fervente(I), Fervent(E) بە هەڵپە، گەرم و گوڕ.

Fervore(I), Fervour(E) هەڵپە، گەرموگوڕیی.

Fest(G), Festività(I), Festival(E) ئاهەنگ، جەژن.

Festevole(I), Merry(E) شــادی و خوڕەم.

Festevolemente(I), Merrily(E) بە شێوەیەکی شــادیانە.

Festevolezza(I) بەشــادییەوە.

Festiglich(G), Festoso(I), Festive(E) شادیانە.

Festosissimo(I), More festive(E) زۆر بە شــادیانە.

Festspiel(G), Festival play(E) نمایشە ئاهەنگ، نمایشێک کە بۆ ئاهەنگ ئامادەکرابێت.

F-fa-ut(E) له سیستەمی سۆڵفێجدا ئاماژەیە بۆ ناوی دوو نۆتە،
یەکێکیان تۆنی فا/ی گڕ(*F faut grave*) ***f*** ، ئەویتر تۆنی فا/ی تیژ(*F faut acutum*)***f’*** .

Fetura(I), Caesura(L), Tramline, Railroad tracks(E) فێتورا، گچکەوچان،
لە مۆزیکدا هێمایەکە لەسەروو هێڵی هێڵاسۆ*Staff*دا دادەنرێت ئاماژەیە بۆ وچانێکی زۆر کەم. لە ویژە*Poetry*دا لە ناوەڕاستی سەروبەندێکی هۆنراوەدا دادەنرێت، جا هەندێک دێڕ هەن کە بەهێزن {ئاسان پەییان پێدەبرێت}بەهۆی ئەم هێمایەوە{ / / }لە دێرە لاوازەکان جیادەکرێنەوە.

Feuer(G), Fire(E) ئاگر، ئاور

Feuerig(G), Fiero(I), Fiery(E) ئاگرین، خوێنگەرمانە.

***Fg.*** کورتکراوەی وشەی فاگوت.

Fi فی، بەرزکردنەوەی چوارەم نۆتەی سکێڵی مێجەر یاخود حەوتەم نۆتەی سکێڵی کرۆماتیک لە تۆنی دۆCی جێگیر/*fixed do*کە بریتیە لە فا/ی تیژ*F-sharp*.

Fiaccezza(I), Weakness(E) سستی و لاوازی.

Fiacco(I), Weak(E) سست، لاواز.

Fiaccamente(I), Weakly(E) بەسستی و لاوازی.

Fiata(I), Time(E) دەم، کات.
بۆ نموونە دەوترێت دەمێک، جارێک*Una fiata(I), Once(E),Premiére fois(F)*
یاخود دوو دەمانێک، دوو جارێک *Due fiata(I), Twice(E), Deux fois(F)*

Fiato(I), Breath(E) هەناسە،
مەبەست لە ئامێرە هەواییەکانە کە پێیشیاندەوترێن*Stromenti a fianto*.

Fiddle(E), Fiedel(G) فیدڵ، بە ئامێری ڕەبەک*Rebec*دەچێت، یەکەم دەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ دوا سەتەی/10م و بەرایی سەتەی/11م. بەو ئامێرە مۆزیکانە دەوترێن کە ژێ و کەوان/یان هەیە وەک کەمانچە و چێللۆ...هتد.

Fidicen(L), Stringed player(E) ژەنیاری ئامێرە ژێدارەکانی وەک عوود، هارپ، لیرا...هتد.

Field music(E), Feldmusik(G) مۆزیکی مەیدان، مەبەست لە پێشکەشکردنی بەرهەمێکی مۆزیکییە لە کەش و هەوای دەرەوە.

Fier(F), Proud(E) شاناز، ڕالەخۆ{بۆ نێرینە}.

Fierté(F), Pride(E), Fierezza(I) شانازیی، ڕالەخۆیی.
هەندێجار ڕاڤەدەکرێت وەک گوزارە دەربڕینێک لە ڕێی ژەنین یاخود نواندنەوە.

Fife, Swiss pipe(E) گچکەفلووت کە شەش کونی بێ کلیلی لە خوارەوەی هەیە،
ئامێرێکی سەردەمانی سەتەی/16مە و لە وڵاتی بەریتانیا بە هاویاری چەند ئامێرێکی ڕەزمی وەک تەپڵ و دەهۆڵ هەندێک مارش*March*ی سوپایی پێپیلێدراوە، ڕۆژگاری ئێستا وەک گچکە فلووتێکی هاوچەرخ کارپێدەکرێت.

Fifteenth(E) پانزەیەم، هەنێکجار بە$15^{ma}$ دەکورتێنرێت کە گوزارە لە ژەنینی دوو ئۆکتاڤ سەروو لە پەردە*Pitch*ی نۆتێنراو دەکات.

Fifth(E) پێنچەمین، پێنجەمین پلەدەنگ لە سکێلی دیاتۆنیک، هەروەها میانەی دەنگێک بۆ دەنگی پێنجەمی چ سەرەوە چ خوارەوە، بۆ نموونە تۆنی/C بەرەو ژوور بۆ تۆنی/G یاخود هەر تۆنی/C بەرەو خوار بۆ تۆنی/F. میانەکانی پێنجەم دەشێت بۆ تەواو*Perfect*{لەسەر سکێلی مێجەر}، گەستوو*Diminished*، زێدە*Augemented*.

Fifth chord, Power chord(E) کۆردی پێنجەم،

پێیشیدەوترێت کۆردی بەهێز*Power chord* کە لە پلەنۆتەی ڕەگ و پێنجەم پێکهاتووە.

Figur(G), Figure(E) فیگیور، نیگار.

کورتە مۆزیک فراس*Phrase*ێکە{نەوەک بابەت*Theme*ێکی درێژ}کە بە مەبەستی جوانکاری و ڕازانەوە ڕەپاتدەکرێتەوە، هەر بەو ڕپاتکردنەوەیەیش لە دانراوەیەکی مۆزیکدا دەناسرێتەوە. لە پێکهاتەی مۆزیکدا هەمان مانای مۆتیڤ*Motif*یش دەبەخشێت.

فیگیور یاخود نیگار...شێوەیەکە لە بنیادنانی ڕستەیەکی مۆزیک کە وەک زنجیرەتۆنێک هاویار دەبێت لەتەک میلۆدییە سەرەکییەکەدا. دەشێت بکرێت بە سێ جۆریشەوە: میلۆدییە فیگیور، هارمۆنییە فیگیور، ڕەزمە فیگیور. ئەمەیش نموونەیەکە لە فیگیورێکی میلۆدی ـ هارمۆنی:ـ



ڕەزمە فیگیور*Rhythmic figure*



Figura(I), Shape of not or ligature(E) فیگیورا، مۆزیک نۆتاندنی سەتەکانی ناوەڕاستە کە گوزارەی لە شێوەی نۆتە یاخود لکاندن*Ligature*دەکرد.

Figura muta(I,L), Rest(E) پشـوو، وچان.

Figural, Figured(E), Figuré(F), Figurato(I), Figural, Figuriert(G) نیگاراو، ڕازاوە،

بەشێکی دەنگییە*Vocal*یە کە پارچەکانی میلۆدی تیایدا بە نۆتەی خێراتر لە میلۆدیەکە هاویاریدەکرێن ، ئەم چەشنە هەمان مانای ڕازانەوە*Coloratura*یش دەگرێتەوە.

Figuration(E) نیگاردن، فیگیورێن، چەشنە جوانکاری و ڕازانەوەیەکە کە ڕەزم و میلۆدیەکان بۆ شێوەی وردتر و زەخرەفێنراوتر شـیدەکرێنەوە.

فیگیورێن، گوزارە لە فرەجۆری*Variations*ڕەزمی و میلۆدی لە پارچە مۆزیکێکی ساکاردا دەکات، وەک بەکارهێنانی نۆتە وردکردنەوە*Diminution*، زەخرەفاندن*Ornamentation*.

Figured Bass, Through bass(E), Basse chiffrée(F), Basso continuo(I) باسی ڕازاوە،
Basso numerato(I), Bezifferter bass(G) باسی نیگار، باسی بەردەوام، باسی گوزار
باسی نمرێنراو{بەژمارەکراو}، میتۆدێکە*Method*کە تەنیا باس نۆتەکان*Bass notes*ڕۆڵی بەشی هاوپاریی*Accompaniment part*تیادا دەگێڕن، ئەو نۆتیلانەی کە کۆرد*Chord* و میانە سەرەکییەکانیان ژمارێنراون{فیگیور*Figure*}پێکەوە لەگەڵ باس نۆتەکاندا دەژەنرێن.




کورتە هارمۆنییەکە کە لە سەرەتای سەتەی/17م دەستپێکراو، لە کاتێکدا کە کۆڕالی بێهاوپاری*Unaccompanied* مۆزیک بەشێوە و شێوازێکی پەرەپێدراو کە تەنرابوە یەک و ڕەواجی هەبوو....بەرەو نەمان دەچوو و دەنگی سۆلۆی ڕێسیتاتیڤ*Solo vocal recitative*یش بە هاوپاری*Accompanied* کۆردی سادە*Plain chord* بەرەبەرە وەدەردەکەوت. مۆزارت، باخ و ڕۆسینی لە هەندێک کارنامەیاندا نموونەی وایان بەئەنجامداوە.
پارچە مۆزیکێکی ڕازاوە لەژێر نۆتەکاندا دەنووسرێت تاکو پێکەوە بەشێوەیەکی هارمۆنی لێبدرێن.ئەم سیستەمە لە هەگبەی بارۆک *Baroque*(1600-1750)وەک هاوپارییەک بۆ تاکژەنیاران*Soloister* یاخود زیاتر وەک پێکهاتە ڕازانەوەیەکی گشتی لە دانراوە مۆزیکەکاندا بەکاردەهێنرا.
Figured melody(E) میلۆدییەک لە بالاترین شێوەی زەخرەفەیدا.
Filar la voce(I), Filar la voix(F), To draw out the voice(E) هێنانەدەرەوەی دەنگ بەرەبەرە بە یەک هەناسە یاخود کەمکردنەوە تا بەرەو قووتدانەوەی هەناسە.
Filo(I) دێڕێک لە پارچەمۆزیکێکدا.
Filo di voce(I) دێڕ دێڕکردنی دەنگ، دێڕاندنی دەنگ.
Filar la voce(I), Filar la voix(F), Draw out the voice(E) نۆتەیەکی سترێنراو و درێژکردنەوەی بەبێ گۆڕان لە دەنگ، واتە ستراندنی نۆتەیەک بە یەک هەناسە بەبێ بەرز و نزمی.
Fin(F), Fine(I), End(E) پایان، کۆتایی، هەندێجار لە ناوەڕاستی پارچەمۆزیکێکدا دەنووسرێت
Final(E), Finalis(L) زاراوەیەکی سەتەکانی ناوەراستە، واتە کۆتایی نۆتەیەکی میلۆدی لە دەسگا کڵێسەییەکان*Church modes*، کۆتایی لەسەر پایە*Tonic*ی دەسگا بنیادەکان*Authentic modes*. کۆتایی یاخود کەوتنەوەوە لەسەر پلەتۆنی چوارەم لە دەسگا لاوەکییەکان{پلاگاڵ*Plagal*}کان کە بریتین لەو دەسگایانە کە بە ئامین*Amen*کۆتاییان دێت}.
Final cadence, Perfect cadence(E) کادەنسی کۆتایی، بڕوانە/*Cadence*.
Finale(I), Final section(E) کۆتایی بەشی کارێکی فرەبەش یاخود فرەجووڵەی وەک بابەتێکی سۆناتا و سیمفۆنی و کۆنسێرتۆ، یان دوابەش پاساو*Passage*ی ئۆپێرایەک.
Finendo(I), Final(E) کۆتایی پێهاتن.

Finger board(E), Clavier(F), Tastiera(I), Griffbertt(G) دەسـکە پەنجە، پەنجەدان.
ئەو دەسکەدرێژەی کە ژێ/یەکانی بەسـەردا تێپەڕدەبێت و پەنجەکانی لەسـەر دادەنرێت بۆ گۆڕینی تۆنەکان لە ئامێرەژێدارەکاندا.
Finger holes(E) ئەو کونی دەنگە*Sound-hole*ی کە بەشـێوەی پیتی*f* لەسـەر سـینەی ئامێری کەمانچە و خێزانەکەیدا سـازکراوە بۆئەوەی دەنگ لێوەیڕا بێتە بەربیسـتن. شـوێن پەنجەی ئامێرە هەواییەکان کە تۆنی لێوەرا پەیدادەبێت.
Fingering(E), Fingersatz(G) پەنجەگێڕی، پەردەگێڕی، پەنجەسـازی،
واتە یاریکردنی پەنجە لەسەر ژێیەکان و جێ پەنجەی ئامێرەهەواییەکان.
Finito(I), Finished(E) تەواوبوو.
Finire il tuono(I) کەمکردنەوەی دەنگهێزی نۆتەکان بەرەو کۆتایی.
Finite canon(I) کۆتاپێهێنانی پارچەیەکی کانون.
Fino(I), Till, As far as(E) تاکو، بە دووری.
Fino al segno(I), As far as sign(E) بە دووریی هێماکە. تا کۆتایی هێماکە.
Finto, Finta(I), Feigned(E) بڕوانە/*Fa-feint*.
Fioretto(I), Melodic ornaments(E) میلۆدیە زەخرەفاوەکان، بڕوانە/*Grace notes*.
Fiorito(I), Ornamented, Florid(E) زەخرەفێنراو، گوڵێنراو.
Fioritura(I), Flowering(E) گوڵاندن، واتە گوڵپژێنی میلۆدیەک بە نۆتیلەی خۆشـئاواز، نۆتیلەی ڕازانەوە وەک بەکارهێنانی تریللە*Trill* کە لەبەری نۆتەکەدا ئاماژەی پێدەدرێت، لە سەتەکانی/17م و 18مدا لە ئۆپێراکانی ئیتالیادا وەدەرکەوت بە مەبەسـتی دیکۆراندنی میلۆدی ئۆپێراکە.
Fipple flute(E), Blockflöte(G) کەتەبلوێر.
First-ending(E) یەکەم کۆتایی، مازۆر*measure*یاخود زیاتر
کە لە کۆتایی بڕگەیەکی هۆنراوەدا بێت کە بەهێمای 1 2 ئاماژەی پێدەدرێت.
First inversion(E) هەڵگەڕاوەی یەکەم ، بۆ نموونە:کۆردێکی ڕەگ1,3,5,7 ببێتە 3,5,7,1
بڕوانە/*Inversion*.
Fis(G), F-Sharp(E), Fa-dièse(F), Fa-diesis(I) فادێز/$F^{\#}$
نیوپەردە تۆن بەرزتر لە تۆنی سروشتی خۆی.
Fischio(I) فیشە، سـووت، فیکە.
F-dur(G), F-major(E) فادێز ـ مێجەر.
Fesses(G), Fa-doppio bemolle(I), Fa-double bémol(F), فاـ دەبڵ بیمۆڵ.
F-double flat(E)
First movement form(E) ناوێکی لەبری*Alternative*یە بۆ شـێوەیەکی سـۆناتا.
Fisis(G), Fa- doppio diesis(I), Fa-double dièse(F), F-double sharp(E) فا ـ دەبڵ دێز.
Fis moll(G), F-Sharp minor(E) فادێز ـ ماینەر.

Fistula(L), Pipe(E) فیستولا، ناوی ئامێری فلووت لە سەتەکانی ناوەڕاستدا.

Five notes chord(E) کۆردە پێنج نۆتەکان.

| Chord as written<br>کۆرد بە نووسین | Chord as named<br>ناوی کۆرد | Chord notes<br>نۆتەکانی کۆرد |
|---|---|---|
| Cm6/9, Cmi6/9, Cm69, Cm6(add9), Cm9/6 | C minor six ninth | C E♭ G A D |
| Cm9, Cmi9 | C minor ninth | C E♭ G B♭ D |
| C7♭9 | C seven flat ninth | C E G B♭ D♭ |
| C9 | C ninth | C E G B♭ D |
| C7#9 | C seven sharp ninth | C E G B♭ D# |
| Cmaj9 | C major ninth | C E G B D |
| C6/7, C67, C6(add7), C7/6 | C six seventh | C E G A B♭ |
| C6/9, C69, C6(add9), C9/6 | C six ninth | C E G A D |
| C7♭ 9+, C+7♭ 9 | C seven flat nine augmented | C E G# B♭ D♭ |
| C9+, C+9 | C ninth augmented | C E G# B♭ D |
| C7# 9+, C+7#9 | C seven sharp ninth augmented | C E G# B♭ D# |
| C9sus4, C9sus | C ninth suspended 4th | C F G B♭ D |

Five- three Chord(E) کۆردی پێنج ـ سێ،

ئەو نۆتەی بناخەی کۆردێکی لەسەر دابنرێت پێیدەوترێت ڕەگ*Root*، ڕەگی مێجەر کۆردێکی باوی پێنج –سێ کۆرد*five-three chord*لە شێوەی C-E-G...بریتیە لە تۆنی دۆ/C.

Fixed-do(E) سیستەمێکە کە پایەی سۆڵ- فا/*Tonic Sol-fa*یشی پێدەوترێت

گشت سکێڵەمۆزیکیەکان لەسەر نۆتەی دۆ/Doh وە بناخەی دادەنرێن.

Fixed Pitch(E) پەردەی چەسپاو لە لوولە دەنگیەکانی

ئۆرگن و ژێیەکانی پیانو کە مەودای دەنگەکان تیایاندا نەگۆڕن.

Fixed syllables(E) سیلاب، بڕگەدەنگی چەسپاو کە نۆتەکان دەگرێتەوە.

Flag(E) نۆتەی کرۆش و دەبڵ کرۆش و...هتد.

***Flag.*** کورتکەوشەی ئامێری فلاجیوت*Flageot* .

Flageolet(E,F),Flageolett(G), Flagioletta(I) فلاجیولێت، ئامێرێکی هەوایيە بە کەتە

بالابان دەچێت.شەش کونە تۆنی لە خوارەوەی هەیە کە دوانی لە پشتەوەیە بۆ دانانی پەنجەگەورە.

Flam(E) تەپڵ لێدان بە دوو دار، یەکێکیان بەدەنگی دم و ئەیتریان بە دەنگی تک.

***Fl.*** کورتەوشەی ئامێری فلووت*Flute*ە لە نووسراوێکی هارمۆنیدا.

Flamenco(S) فلامێنکۆ،

سەمایەکی مۆزیکسترانی قەرەچەکانی ئیسپانیایە کە ئێستا لە سەرانسەری ولاتدا زۆر باوە.

Flat(E), Bémol(F), Bémolle(I) پانۆک، بیمۆڵ.

Flat chord(E) کۆردی پان، کۆردێک کە هەر نۆتەی لەیەک کاتدا بژەنرێت.

Flatter(F), To caress(E) سۆز پیشاندان.

Flatter la corde(F), To caress the string(E) بە نەرمی و ناسکی ژێ/یەکان لێبدرێت،

Flatterzunge(G), Flutter tonguing(E) له ژەنینی ئامێرە فووپیاکەرەکاندا پرژە هەوا بە زمان بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی لە ژەنینی نۆتە خێراکاندا.

Flautando, Flautato(I), Fluting(E), Flûté(F) فلووتاندن، یاخود لاساییکردنەوەی دەنگی فلووت بە ئامێری کەمانچە ئەویش بە نزیکردنەوەی سەرەکەوانی کەمانچەکە بە دەسکەپەنجە*Finger board*کەیەوە{دوورکەوتنەوە لە پردەکەی}.

Flautino(I), Sopranino recorder, small flute(E) گچکە فلووت.

Flauto(I), Flute(E), Flöte, Fluit(G), Flûte(F), Fluta(L) ئامێری فلووت.

Flautone(I), Altflöte(G), Flûte alto(F), Bass flute(E) فلاوتۆن، فلووت ئالتۆ.

Flauto piccolo(I) فلووت پیککۆلۆ کە ئۆکتاڤێک لە فلووتی ئاسایی بەرزترە.

Flauto traverso, Flauto tedesco(I), Querflöte(G), Flûte traversiére(F) فلووتە تراڤێرسۆ، جۆرە کەتە فلووتێکی سەردەمانێکی دێرینە، بەڵام لە دوای سەتەکانی دوای/17وە وەک ئامێرێکی ئۆرکێسترالّی خاسکاری تیاداکرا و گەیاندرایە ئەو ئاستەی کە هەندێک لە مۆزیکزانانی وەک هاندڵ*Handel* و باخ*Bach*لە شاکارەکانیاندا بەکاریبهێنن.

Flebile(I), Mournful(E) سووگە و پرسە ، گریە و زارئامێز.

FlebilmenteI), Mournfully(E) سووگ و پرسەیی.

Flehend(G), Entreating(E) پاڕانەوە.

Flessibile(I), Flexible(E) بسـاز، گونجاو، بسازێت لەگەڵ لە هەموو بارێکدا.

Flessibilità(I), Flexibility(E) سـازاوێتی.

Flexa(L) فلێکسا، هێمای دوو نۆتەیی بە هێمای ئاماژەیە بۆ دەنگی بالا و پایین لە سیستەمی نۆتە نووسینی کۆن ناسراو بە نووسینی نیومەن*Neumen*کە لە سەردەمی خۆیدا ئاوازە گریکۆریەکانی پێ نووسراوەتەوە.

Flexa resupina(L) ڕەوشی نووسینی سێ نۆتەیی بە هێمای گوزارەیە لە دەنگی بالا_ پایین_ بالا.

Flexion(G), Inflection(E) گۆڕین لە پلەی دەنگەوارەکان.

Flicking(E) نەگرەیەکی زۆر خێرا و سووک کە جۆرە تەکنیکێکی تایبەتە بە ئامێری باسسوون، کاتێک کە لە دەنگەوارێکی نزمدا دەژەنرێت. وەک لەم نموونەیەدا



Fließend(G), Flowing(E) ڕۆیین، ڕۆوەند.

Fließender(G), More flowing(E) ڕۆوەندتر.

Flicorno(I), Flügelhorn(G) ئامێرێکی هەواییە کە بە چەند دەنگەواری جیاواز هەیە، لەوانەیش:ـ

1. سۆپرانۆ فلووگڵ هۆرن*Soprano flügelhorn*ی می ـ بیمۆڵ/*E-flat* کە بە فەڕەنسایی گچکە شەیپوور*Petit bugle*ی پێدەوترێت.

2. ئاڵتۆ فلووگڵ هۆڕن*Alto flügelhorn*ی سی ـ بیمۆڵ/*B-flat*.
3. تینۆر فلووگڵ هۆڕن*Tenor flügelhorn*ی می ـ بیمۆڵ/*E-flat*، ئاڵتۆ فلووگڵ هۆڕن *Alto flügelhorn*ی می بیمۆڵ/*E-flat*.

Flip(E) فینتگ، نەگرە، نەقرە، لێدانی ژێ بە سەری پەنجە وەک لە ژەنینی ســاز و تەمبوور و پیانۆ و مانەندیان.

Florid counterpoint(E) گوڵینە کۆنتراپونت، کۆنتراپونتی ڕازاوە.

سـیستەمی کۆنتراپونتی دروست*Strict counterpoint* لە پێنج پارچەی جیاجیا پێکهاتووە و پاشان پاراوی هەمووان لە پێنجەمین پارچەدا بەشـێوەیەکی ڕازاوە و درەخشاو کۆتای پێدێت.

Flottant(F), Floating(E) شــەپۆلێن، مەبەست لە جووڵەی کەوانە بەشـێوەیەکی شـەپۆلی*Undulating* لە ژنینی کەمانچەدا.

Flourish(E), Fanfare(E,F) ڕازانەوە بە ترومپێت، دیکۆراندنی فیگیورێکی مۆزیکایی.

Flötenbass(G), Flûte d' Amour(F), Bassflute(E) باس ـ فلووت.

Fluido(I), Fluid(E), Flössig(G) شـلرەو.

Flute(E), Flûte(F), Flöte(G) فلووت، ئامێرێکی هەوایی بێ ڕیشـەیە.

Flute stops, Flute pipes(E) لوولەدەنگ فلووتیەکانی ئۆرگن، لە دوو کۆمەڵە لوولە پێکهاتووە، یەکێکیان لوولەدەنگ کراوەکان*Open pipes*و ئەویتریان لوولەبەستراوەکان*Close pipes*.

Flutist, Flautist(E), Flûtiste(F) فلووتــژەن.

Flutpiano(E) نایـپوور، فلووتپیانۆ.

Flutter tonguing(E) زمان لەرینەوە زۆر بەخێرایی بە ئامێرە هەواییەکان وەک تریللاندن*Trilling*.

Flut~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~~

Flûte à bec(F), Flauto a becco(I), Beak flute, Recorder(E) فلووتی نووکدار، جۆرە فلووتێکی زۆر کۆنی ئینگلیزییە.

Flûte à cheminée(F), Cheminey flute(E) جۆرێکە لە لوولەدەنگ فلووتیەکی ئۆرگن کە دەنگێکی گڕی هارمۆنی دەدات.

Flûte d' Amour(F), Bass flute(E) ئەڤینەفلووت کە لە دەنگەواری لا/*A*دایە.

Flûte douce(F) بڕوانە/*Flûte á bec* .

Flûte traversière(F) فلووتی ئاسۆیی/*Transverse flute*.

Flûtiau(F), Pipe(E) لوولک، بۆری.

Flüchtig(G), Fleet, Agile(E) سـووکە جووڵە، خێرادەرپەڕین.

Flügel(G), Grand piano(E) پیانۆی گەورە.

Foco(I), Force and speed(E) توند و خێرا.

Fois(F), Time(E) دەم، کات.

Folge(G), Succession, Series, Continuation(E) زنجیرە، یەکبەدوایەک.

Folgen(G), To follow(E) بەدوایدا، لەدوو.

Folklore(E) میللی، فۆلکلۆر، ئاکار و نەریتی میللی.

Folk music(E) مۆزیکی میللی کە ستران و سـەما دەگریتەوە.

Folk song(E) سـترانی میللی.

Fondamental(E,F), Fondamentale(I), Root(E) بنەڕەت، ڕەگ.

Foot, Metre(E), Fuss(G) کێش، پێ، یەکەی پێوانەی ڕەزم لە هەڵبەست و پەردەی مۆزیکـدا، وەک زاراوەیەک...چەند چەمکێک دەگریتەخۆ:ـ

1. ژمارەی دێڕەکان لە برگە هۆنراوە*Stanza*یەکدا.

2. ژمارەی حونجە*Syllable*کان{ تاس{تن} ∪ و تەخت{تا} — } لە دێڕدا.

3. ڕێخستنی برِی حونجەکان و پێداگرتنیان بۆ دیاریکردنیان لە برگەکاندا.

وەک دەڵێـت: خوایە هەڵکەنی{خوا /یە/ هەڵ/ کە/ نی} ئەو کێوە لەبن{ئەو/ کێ/ وە/ لە/ بن}

تن تا| تن تا تا تن تا| تا تا تن

— ∪ | — ∪ ∪ — ∪ | ∪ ∪ —

بەڵکە دەرکەوێ{بەڵ/کە/دەر/کە/وێ} نوری چاوی من{نو/ری/ چا/ وی/ من}

هەروەکو ئاشکرایە کە پەردە*Pitch*زاراوەیەکە بەکاردەهێنرێت بۆ فرۆزەکردنی ئاستی دەنگێک کە ئەمەیش لە برێکی مۆزیکدا لەڕووی ڕەزمەوە پێویستی بە شیکردنەوەی هەیە بۆ ڕاگرتنی کێش لە دێڕێکدا، ئەم دێڕەیش کە شـیدەکرێتەوە پێویستی بە حونجەکردن{سیلابکردن} هەیە واتە پێویستی بە برگاندنی نۆتەکان هەیە تاکو بتوانرێت هاوکێش بێت لەگەڵ هەڵبەستدا. بۆ ئەم مەبەستە دەشێت گۆ{ڤۆکاڵ}*Vocal* بخرێتە ژێر ڕکێفی پێوانەی برگەوە ئەویش بە کردنی بە دوو بەشەوە:ـ

1. ڤۆکاڵی کراوە{گۆگوشاد *Open vocal*}، واتە کۆتایی بە پیتە دەنگییەکان بێت وەک: سێ، بی، دا، بۆ، جو...ئەمانە بە هێمای کورت تا/ ∪ ئاماژەی پێدەدرێت.

2. ڤۆکاڵی داخراو{گۆبەستە*Consonant vocal*}کە کۆتایی بە پیتە بێدەنگییەکان دێت و بە هێمای درێژ تن/ — ئاماژەی پێدەدرێت. وەک: دڕ، تن، دین، خان.... .

هەر بۆ ئەم مەبەستەیش دەشێت ئەم برگانە{سیلاب}لە چەند پێ/یەکدا بپۆلێنرێن:ـ

**1.** پێــی دوو برگە*Disyllables*: دەشێت لە چوار باردا خۆی بنوێنێت:ـ

| | | | |
|---|---|---|---|
| کورت ـ درێژ | ∪ — | درێژ ـ درێژ | — — |
| درێژ ـ کورت | — ∪ | کورت ـ کۆرت | ∪ ∪ |

2. پێــێ سـێ برگە*Trisyllables*: دەشێت لە هەشت باردا خۆی بنوێنێت:ـ

| | | | |
|---|---|---|---|
| کورت ـ درێژـ درێژ | ∪ — — | کورت ـ درێژ ـ کورت | ∪ — ∪ |
| درێژ ـ درێژـ درێژ | — — — | کورت ـ کورت ـ کۆرت | ∪ ∪ ∪ |
| کورت ـ درێژـ درێژ | ∪ — — | کورت ـ کورت ـ درێژ | ∪ ∪ — |
| درێژ ـ درێژ ـ درێژ | — — — | درێژ ـ کورت ـ کۆرت | — ∪ ∪ |

3. پێـی چوار بڕگە*Tetra syllables*: دەشێت لە شانزە باردا خۆی بنوێنێت....وەهەروەها.

هەندێجار لە بڕگەی هەڵبەســتەکەدا یاخود پەردەی ڕسته مۆزیکیەکەدا پێویســت بە پێداگرتن*Accent*دەکات کە بە هێمای هێڵێکی لار / لەسـەر درێژەهێما  ئاماژەی پێدەدرێت.

ئەم هێمایە پێیدەوترێت سـەنگین *Gravis(Gr),Ponderous(L), Heavy(E)*

Forefall(E) پێشکەوتە، ئاپۆجیاتۆرایەکی هەڵبەزیوە.*Ascending appoggiatura* کە پێچەوانەی ئاپۆجیاتۆرای دابەزیوە*Descending Appogiatura*.

Form(E) فۆرم، شێووگ، پێچەوانەی ناوەڕۆک*Content*دەبێتەوە، داهێنراوێکی مۆزکییە. زاراوەیەکە گوزارە لە زۆر جۆر و چەشــنی چەندین پارچەمۆزیکییەکان دەکات لەوانەیش: سۆناتا، فیوگە، سـیمفۆنی، کۆنسـێرتۆ..... . جۆرە واژەیەکـی زارشــت*Logic*ییە لە هونەری مۆزیکـدا کە وەک واڕسـک و کەرەسـەیەکی خاو لە مۆزیک و ستران و سـەمای میللـی لە ئاوازە فرەدەنگە*Plainsong*کاندا ڕەنگی داوەتەوە. ئەم جۆرە گوزارەیە بەرەبەرە پەرەیپێدرا و خرایە ئەو چێوەیەی کە بۆ نموونە کاتێک مۆزیکسازێک چەشنێکی وەک سـۆناتا یاخود ســیمفۆنی دەهێنێتەبەر، دەبێت خۆی بەو ڕێسا و پێداویستیە هونەری و تەکنیکانەوە پابەندبکات کە لە داڕشتنی سـۆناتا یاخود سیمفۆنی/دا پەیڕەودەکرێن. لە هونەری مۆزیکی کوردیدا زیاتر لە بواری دەسگامۆزیکییەکاندا دەهێنرێتە سـەر زار و وا لێکدەدرێتەوە، بۆ نموونە:بەیتی لاوک، حەیران....کە بە شــێوە دابنرێن گوزارە لە لێرشــتەی دەســگامۆزیکییەکی ســەرەکی بکات.

Forme de sonata(F), Sonata form(E) سـۆناتا شێوە.

Forme du mode mineur(F) زاراوەی مینۆر سـکێڵی سروشت لە سـەردەمانێکی زۆر کۆندا.

Formation(F), Group, Band(E) گروپ، باند.

Formare il tuono(I) شـێوەتۆنێکی بێزار بە گوێ.

Formule mélodique(F) Melodic form(E) شـێواز میلۆدی، دەنگی بەدوایەک.

Fort(G), Forte(I), Strong(E) بەرەوپێش ، بەهێز، توند ***f*** .

***F.*** هێمای کورتکراوەیە بۆ مانای"بەهێز"، بڕوانە*Forte*.

***Ff.*** هێمای کورتکراوەیە بۆ مانای"زۆربەهێز"، بڕوانە*Fortissimo*.

***Fff.*** هێمای کورتکراوەیە بۆ مانای"زۆر زۆر بەهێز"، بڕوانە*Fortississimo*.

***Ffff.*** هێمای کورتکراوەیە بۆ مانای"زۆر زۆر زۆر بەهێز"، بڕوانە*Fortissississimo*.

***Fffff.*** هێمای کورتکراوەیە بۆ مانای"یەجگار زۆر بەهێز". بڕوانە*Fortissississississimo*.

Fortemente(I), Strongly(E) بەشـێوەیەکی بەهێز.

Forte piano(I) بەهێز و یەکسەر بە نەرمونیانی ***fp***.

Forte possibile(I) بە دەنگێکی بەهێز تا بتوانرێت.

Fortezza(I) بڕسـت و توانا.

Fortfahren(G), To go forward(E) بەرەوپێشەوە چوون.

Forza(I), Force,Vigour(E) هێز، زۆر، توند.

Forzando, Esforzando (I), Strongly accented, Forcing(E) جەختکردنی بەهێز ***fz sf,sfz***.

Forzar la voce(I), Forcing the voice(E) زۆرکردن لە دەنگ.

Frozare(I), Stronger(E) بەزۆرتر، بەهێزتر.

Frozato(I), Forced(E) بەزۆرکراو، بەهێزکراو کە دەکورتێنرێت بە/***Forz.***

Fouette(F) جووڵەقامچی بە لاق لە سـەمای باللێت/دا کە بریتیە لە بازدان و گەڕانەوە.

Fougeux(F), Imeptuous(E) بێپەروا، سەرکێش.

Four-beat(E) چوارلێدان،

گوزارە لە ڕەزمینی چوار لێدانی باس بەشـێوەیەکی توند و یەکسان دەکات لە مۆزیکی جازدا.

Four-foot pitch(E) چوار- پێ پیانۆ، پەردەی دەستەیەک لە ئامێرە ژەیدارەکان کە دەنگیان بە ئۆکتاڤێک لە پیانۆی ستاندەرد بەرزترن. لوولەداخراوەکانی ئۆرگنی هەشت پێـیی/*Eight-foot pitch* لە پەردەی چوار پێـییدا/*Four-foot pitch* کە بە ئۆکتاڤێک لە دەنگی سـتاندەر بەرزترە

Four-hand piano music(E) پیانۆ ژەنینی جواردەستی کە دوو ژەنیار پێکەوە پێیهەڵدەستن.

Fourniture(F), Mixture stop(E) لوولەداخراوێکی تێکەڵە لە ئۆرگن *Organ*ی کڵێسـەدا.

بڕوانە/*Mixture stops*.

Four notes chord(E) کۆردی چوار نۆتە.

| Chord as written<br>کۆرد بە نووسین | Chord as named<br>ناوی کۆرد | Chord notes<br>نۆتەکانی کۆرد |
|---|---|---|
| Cm6/9, Cmi6/9, Cm69, Cm6(add9), Cm9/6 | C minor six ninth | C E♭ G A D |
| Cm9, Cmi9 | C minor ninth | C E♭ G B♭ D |
| C7♭9 | C seven flat ninth | C E G B♭ D♭ |
| C9 | C ninth | C E G B♭ D |
| C7#9 | C seven sharp ninth | C E G B♭ D# |
| Cmaj9 | C major ninth | C E G B D |
| C6/7, C67, C6(add7), C7/6 | C six seventh | C E G A B♭ |
| C6/9, C69, C6(add9), C9/6 | C six ninth | C E G A D |
| C7♭9+, C+7♭9 | C seven flat nine augmented | C E G# B♭ D♭ |
| C9+, C+9 | C ninth augmented | C E G# B♭ D |
| C7#9+, C+7#9 | C seven sharp ninth augmented | C E G# B♭ D# |
| C9sus4, C9sus | C ninth suspended 4th | C F G B♭ D |

Fourteenth(E) چواردەیەم، میانەیەکی پێکهاتوو لە ئۆکتاڤێک و حەوتەم.

Fourth(E) چوارەم، چوارەمین دەنگ لە سـکێڵی دیاتۆنیکدا،

چوارەمین میانە لە نۆتەی پایە*Tonic*وە چ بۆ سەرەوە چ بۆ خوارەوە. بۆ نموونە:ـ تۆنی/C بەرەو ژوور بۆ تۆنی/F یاخود لە تۆنی/C یەوە بەرەو خوار بۆ تۆنی/G. میانە*Interval*کانیشی دەشێت ببێتە میانەتەواو*Perfect*، کورتکردنەوە*Diminished*، زێدەکراو*Augmented*.

Frappé(F), Struck(E) لێدان.

Frapper(F)To strike(E) لێـبدات.

Fraseggiare(I), To phrase(E) گوزارەبکات، بڕستێنێت{بـبێتە ڕستەیەکی مۆزیکایی}.

Fraseggio(I), Phrasing(E) ڕستاندن{کردن بە ڕستە}.

Frauenchor(I), Women`s choir(E) دەستە کۆرسی ژنان.

Freddo(I), Froid(F), Cold(E) سارد و سڕ.

Freddamente(I), Froidement(G), Coldly(E) بە ساردی.

Freddeza(I), Coldness(E) ساردبوون.

Fredon(F), Trill(E) تریللە.

Fredonner(F), To hum(E) گمەکردن، زەمزەمەکردن.

Free(E), Frei, Freie(G) ڕەها، ئازاد.

Free canon , Free fugue(E) ئازادەکانون، ئازادە فیوگە، ڕەها کانون. پارچەکانون کە ئەوەندە گوێ نادرێتە ڕێسا و چێوەی کانون و فیوگە.

Free note, Nonharmonic note(E) نۆتەی ناهارمۆنی کە بە بازدان *Leaping* نزیکدەبێتەوە و هەر بە بازدانیش دووردەکەوێتەوە.

French violin clef(E), Sol-Clef(F) کلیلی سۆل بۆ ئامێری کەمانچە بە سیستەمی فەڕەنسایی.

French horn(E), Cor(F), Horn(G), Corno(I) هۆڕنی فەڕەنسایی.

French sixth chord(E) کۆردی شەشەمی فەڕەنسایی کە پێکهاتووە لە مێجەری سێیەم،زێدەی چوارەم و زێدەی شەشەم، هەندێجار پێیشیدەوترێت زێدەکۆردی شەش ـ چوار ـ سێ *Augmented six four three chord*.

Frenetico(I), Frenzied(E) دڵپەرێشان.

Frequency(E),Fréquence(F) فریکوێنسی، ژماردنی لەرینەوە لە چرکەیەدا *Vibrations per second* کە یەکەی پێوانەی بە هێرتز *Hertz* و هێمای Hz/ یش کورتکراوەیەتی، یەک هێرتز بریتیە لە یەک لەرە لە چرکەیەکدا *One vibration per second*.

Fresco(I), Fresh(E), Frisch(G) تازە، بە گیانێکی بژێو.

Fret(E), Bund(G) کەمە، بەرزەهێڵ، پەردە، ئەو مەودا هێڵە ئاسۆییانەی کە لەسەر دەستەکی ئامێرە ژێدارەکاندا کەمێک بەرزبۆتەوە و پەنجەی لەسەر دادەنرێت بۆ دیاریکردنی پەردەکان. گیتار، عوود، ساز، تار، بانجۆ.... لەو ئامێرانەن کە ئەم بەرزەهێڵانەیان تێدایە.

Fretta, Furia(I), Haste(E) هەڵەداوان، فرتەڕەوی.

Frettolosamente, Frettevole (I), Hurried(E) بە هەڵەداوان.

Freude(G), Joy(E), Consolazione(I) شاد.

Freudig(G), Joyfull(E) پڕشاد.

Frog, Nut(E), Frosch(G) پاژنەی کەوان، ئەو سەرە کەوانەی کە یاڵەکەی پێتوند دەکرێت.

Fröhlich(G), Joyous, Happy(E), Allegro(I) خۆشی، بەڕەزمێی شادی.

Frottola(I) فرۆتۆللا، پارچە هۆنراوەیەکی*Strophic*ستراني ميللی /ئيتاليايیە
بۆ چەند دەنگێک کە ميلۆدييەکە تێدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێرێت بەبێ ئامێری مۆزيک، ئەم شێوازە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی سالانی1500کە تايبەتبووە لەنێو کۆڕی خانەدان و بۆرەپياواندا.

Früher(G), Earlier, previous(E) زووتر، پێشتر.

Frühlingslied(G), Spring song(E) بەهارەستران.

F-Schüssel(G), F-Clef, Bass Clef(E) کليلی/فا، کليلی باس.



Fuga(I,L,S), Fuge(G), Fugue(E,F) فيوگە، ڕيشەواژەيەکی لاتينييە کە مانای فڕين*flight*، هەلاتن*Run away*، دەربازبوون*Fleeing*دەگەيەنێت. چەشنە کانونێکە دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی/15م و 17م{.لە سەتەکانی/15م و 16مدا واژەی*Fuga*گوزارەی لە کانون*Canon*کردووە}.
وەک زاراوەيەکی هونەری لە مۆزيکزانييدا...پێکهاتەيەکە لە چەشنێکی دروست و هاوکۆکدا کە لە چێوەی ڕێساکانيدا تێيدا ڕشتەيەک بەهۆی بەشێک*Part*وە دەردەکەوێت و بە بەشێکيتر بەرسڤ {وەلام}دەدرێتەوە. دەشێت وەها ڕاڤەبکرێت کە پێکهاتەيەکی کۆنتراپونتالی/يە بۆ دوو دەنگ ياخود زياتر، ياخود چەند بەشێکی بنياتنراوە لە بيرۆکەيەکی مۆزيکدا کە پێيدەوترێت تێما*Theme*کە بە دوابەدوايەکتر لاسايی*Imitation*دەکرێتەوە ئەويش بە هاتنەناوەوەی هەريەک لەو دەنگانە لە دەسپێکردندا و ئينجا بەرەو گۆڕانکاری بڕوات لە ڕێی بەشەکانەوە.
سەرەتادەسپێکی هەر دەنگێک لە کليلی تۆنيکدا*Tonic-key*پێيدەوترێت ڕشتە*Subject*. دووەم دەسپێک لە پلەی زاڵدا*Dominant* پێيدەوترێت بەرسڤ*Answer*. ئەگەر ئەم بەرسڤە چەشنە تەواوييەکی بەخۆوە گرت{واتە نۆتەی زاڵ لە نۆتەی بەرسڤەوەڕا هەڵێنجرابێت}ئەوا دەبێتە بەرسڤێکی ڕاست و دروست. خۆ ئەگەر بەرسڤ تاڕادەيەک گۆڕدرا*Modified*بۆ تۆناڵيتی*Tonality*يەکی پارێزراو ئەوا پێيدەوترێت بەرسڤی تۆناڵ *Tonal answer*.
پاشئەوەی ڕشتە*Subject* و بەرسڤ ڕەوشيان وەدەرکەوت...هەر دەنگێک جۆرە توخمە تيمايی*Thematic element* لەخۆ دەگرێت کە پێيدەوترێت ڕووبە ڕشتە*Countersubject*.
سەرەتای دەسپێکی هەر دەنگێکی پێکهاتوويش کە بە بەشی يەکەم دادەنرێت پێيدەوترێت پێشەنگە*Exposition*فيوگەيەکی تەواو. ئينجا بە هاتنەناوەوەکان ڕشتەکە دەردەکەوێتەوە و بە کۆنتراپونتاڵە ئێپيسۆدەکان*Conterpuntal episodes*{ئێپيسۆدە:ـ پارچەيەکی تراژيدياييە کە دەئاخنرێتە نێوان دوو کۆڕاڵ ياخود زياترەوە}جياجيادەکرێنەوە و بابەتەکەيش بە زێدەکاريی*Augmentation*، گەستوويی*Diminution*، هەڵگێڕاويی*Inversion*....هاوکاری لەگەڵدا دەکرێت. مۆزيکسازی بەناوبانگ يۆهان سيباستيان باخ*J.S.Bach*يەکێکەبووە لەو کەڵە هونەرمەندانەی دەستێکی بالای هەبووە لەم بوارەدا. بەگشتی...دوو جۆر فيوگە هەيە:ـ

1. فيوگەی ڕاست*Real fugue*...کە بەرسڤ تيايدا بريتيە لە ترانسپۆزەيەکی تەواو *Exact transposition* لە ڕشتە*Subject*.

2. فیوگەی تۆناڵی*Tonal fugue*...کە بەرسـف تیایدا بریتیە لە لاسـاییکردنەوەی بابەت بە مەبەسـتی هێشـتنەوەی لە هەمان کلیلدا.

Fuga ad octavam(L), A fuga at the octave(E) فیوگە لە میانەی ئۆکتاڤێکدا.

Fuga ad quintam(L) فیوگە لە میانەی پێنجەمدا.

Fuga authentica(L) فیوگەی بنیاد لە بابەتێکی هەڵبەزیو*Ascending subject*دا.

Fuga canonica, Fuga totalis(L),Fuga in consequenza(I), A canon(E) فیوگە کانون.

Fuga composita(L) فیوگەی بابەتێک بە پلە بەئەنجامبدرێت نەوەک بە بازدان.

Fuga contraria(L) فیوگەیەک کە بەرسف لاسایی بابەت بکاتەوە بە جووڵەیەکی پێچەوانە.

Fuga doppia(I), Double fugue(E) دەبڵ فیوگە، فیوگەیەکی دوو بابەت ئامێز.

Fuga irregularis(L), Irregular fugue(E) فیوگەی ناڕێک.

Fuga libera(L) فیوگەیەک چەند ئێپیسـۆد*Episode*ێکی ئازادی لە ئامێزگرتبێت.

Fuga mixa(L) تێکەڵە فیوگەیەک کە چەند بەرسـڤێکی جیای بە زێدەکردن*Augmentation*، بە کەمکردن*Diminution*، بە جووڵەی پێچەوانە*Contrary motion*ی ... هتد تیادابێت.

Fuga per augmentationem(L) فیوگەیەک کە بەرسـڤێکی جووڵەزێدەکراوی هەبێت.

Fuga per diminutionem(L) فیوگەیەک کە بەرسـڤێکی جووڵەگەستووی هەبێت.

Fuga per motum contrarium(L) فیوگەیەک کە بەرسـڤێکی جووڵەپێچەوانەی هەبێت.

Fuga plagalis(L) فیوگەی لاوەکی{پلاگاڵ}، فیوگەیەکی بابەت دابەزیو*Descending fugue*.

Fuga regularis, Fuga propria(L), Regular fugue(E) فیوگەیەکی ڕێک.

Fuga reditta(I) فیوگەیەک کە دوو بەش یاخود زیاتری لە ناوەڕاستدا یاخود لە کۆتاییدا بەشـێوەیەکی کانونی*Canonically*بەئەنجام بدرێت.

Fuga retrograda(L) فیوگەیەک کە بەرسـڤەکەی بە جووڵەی گەڕاوە*Retrograde motion*ی بە ئەنجامبدرێت.

Fuga retrograda per motum contrarium(L) فیوگەیەک کە بەرسـڤەکەی بە هەردوو جووڵەی گەڕاوە و پێچەوانە ئەنجامبدرێت.

Fuga ricercata(I), Elaborate fugue(E) فیوگەیەکی ئاوێزاو لە کانونێکی لاسـایی*Canonic imitation*، لاسـایی بە جووڵەی زێدەکردن، کەمکردن، پێچەوانە و گەڕاوە.

Fuga sciolta(I), Fuga soluta(L) بڕوانە/*Fuga libera*.

Fughetta(I) Short fugue(E) کورتە فیوگە.

Fuging tune(E) بە فیوگەکردنی ئاوازێک، ئاوازێک لەسـەر فیوگە بناخە بەستێت.

Fugitive(F) پەڕواز، فیوگیتیف، لە فەڕەنسـایی*Fugitif*ەوە هاتووە کە ئەمیش لە فیوگیتیڤۆس*Fugitivus*لاتینییەوە هەڵێنجراوە کە مانای تەواوی هەڵاتن*Run away*دەگەیەنێت. بە زوانی یۆنانی/یش فیوگین*Pheugien*ی پێدەوترێت.

Fugato(I) فیوگاتۆ، فرۆزە*Describe*ی پارچە دانراوەیەک دەکات لە چەشنێکی فیوگاڵی*Fugal style*دا بێت بەڵام لە ڕاستیدا فیوگە نەبێت. زۆر لە ئۆپێرا و کۆمێک ئۆپێراکان لەم چەشنەیان تێدایە.

Fugata(I) بڕوانە/*Aria fugata* .

Fugio(I), Flee, Escape(E) هەڵدێت.

Fugue, Free(E) ڕەها فیوگە، ئازاد لە گشت ڕێسا و قانونیکی فیوگە.

Fugue, Perpetual(E) فیوگەی بەردەوامی، کانونی بێکۆتایی.

Fugue, Simple(E) سادە فیوگە، فیوگەیەکی یەک ڕشتەدار.

Fugue, Strict(E) دروستە فیوگە، لەسەر یاسا و ڕیساکانی فیوگە دانرابێت.

Führend(G), Leading(E) ڕێنمایی، پێشەوایی.

Führer(G), Subject of a fugue(E) ڕشتەیەکی فیوگە، بابەتێکی فیوگە.

Fulgente(I) درەخشاو.

Fulgidezza(I) درەخشاندن.

Fulgido(I) درەخشان.

Full(E) پڕ، کۆردی تەواو.

Full-close, Perfect cadence(E) پڕە کادەنس، دروستە کادەنس، کادەنسی تەواو.

Full orchestra(E) ئۆرکێسترای تەواو کە گشت ئامێرە هەوایی و ژێدارەکانی تێدایە.

Full Score(E) سکۆر، تێنووسێک نۆتەی هەموو دەنگ و ئامێرە مۆزیکیەکانی تێدابێت.

Full trichord(E) سێکۆردەی تەواو، لێدانی سێ ژێ بۆ هەر تۆنێک{جگە لە نزمترین تۆن}لە پیانۆفۆرتی*Pianoforte*دا.

Fulmine(I) خێرایی چاوتروکان، بروسکە.

Fulmineo(I) ناگەهان، چاوەنواڕنەکراو.

Function(E) کارنما، ڕەوتێک کە تێیدا کۆردەکان و تۆنەکان لەکۆردێکدا ڕێنمایی جوولە بکات بەرەو کۆردێکیتر

Functional harmony(E), Armonia funzionale(I), Étude des functions(F), Funktionslehre(G) هارمۆنی کارا

سیستەمێکی هارمۆنی شیکارییە لەسەر بیرۆکەی کلیلی دیاریکراو بناخەی بەستووە کە تێیدا.

سێ کۆردە کارای جیاوازی هەیە:ـ

1. پایەتۆن*Tonic* بە هێمای/T... بە بناخەی کۆرد و یەکەم نۆتەی سکێڵ دادەنرێت.

2. ژێرزاڵ*Subdominant* بە هێمای/S...بە چوارەم نۆتەی کۆرد دادەنرێت.

3. زاڵ*Dominant*...بە هێمای/D...بە پێنجەم نۆتەی کۆرد دادەدنرێت.




ئەوانیتر کە هەن بە گۆڕاوی*Variant* بنە کۆردەکان*Base chords* دادەنرێن.

Fundamental(E) بنچینه، یەکەم یاخود نزمترین نۆته له ڕەچەهارمۆنی*Harmonic serier*یەکدا

Fundamental bass, Root note of chord(E) ڕەگەنۆتەی کۆرد.

Fundamental chord(E) بنچینه کۆرد، کۆردێک که نزمترین نۆتەی ڕەگەکەی بێت.

Fundamental discord(E) بنچینەی ناساز، مەبەست له بوونی

کۆردێکه{وەک کۆردێکی ئاسایی حەوتەم*Seventh*} لەگەڵ خودی خۆیدا، کۆردەکانی نۆیەم و یانزەیەم و سیانزەیەم....چەند نموونەیەکی ئەم جۆرەن.

Fundamental key(E) کلیلی بنچینه.

Fundamental notes(E) بنچینه نۆتەی هەر کۆردێک.

Fundamental tones(E) تۆنه بنچینەییەکان، که ئەمانه دەگرێتەوە:ـ

پایه*Tonic*، زاڵ*Dominant*، لازاڵ{ژێرزاڵ}*Subdominant*.

Funébre(F), Funebre(I), Funeral(E) ڕەزمی چەمەری که کێشێکی سەنگینی هەیە.

Fünf(G), Five(E) پێنج.

Fünf stimmig(G), Five voices(E) پێنج دەنگ.

Fucco(I), Force and speed(E) توند و خێرا.

Für(G) لەبەر، بۆ.

Furente(I) توند و خەشمگین.

Furia(I), Fury(E) به گیانیکی تووڕە و تۆڵەوە.

Furibondo, Furioso(I), Furiously(E) به تووڕەیی.

Furiosomente(I), Furious(E) تووڕە.

Furniture stop, Mixture stop(E) لوولەدەنگیەکانی ئۆرگن که به دیاپازۆن دەچێت.

Furore(I), Enthusiastic, Fury(E) تووڕەییەکی توند. به جۆش.

Fusa(L), Quaver(E) فیوزە، کرۆش، 1/8ی نۆتەی تەواو*Whole note*.

هێمایەکه دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی/14م. یاخود

Fusella(L), Demisemiquaver(E) فیوزێللا، سێپلەکرۆش، 1/32ی نۆتەی تەواو.

Fusellala(L), Hemidemisemiquaver(E) فیوسێللالا، چوارپلەکرۆش، 1/64ی نۆتەی تەواو.

Fût de batterie(F), Tom-tom Drum(E) تەپڵی توم ـ توم.

------------------------------------
----------------------
------------



گایچەک
Ghychek



Gungroos خرخاڵ

# G



گۆپیچاند/ی هیندی
Indian Gopichand



گیتار و ڕیشە
Guitar with Plectrum

پێنجەم تۆن {زالDominant}ی سکێلی دۆ مێجەر.
نۆتەکەی ئاماژەیە بۆ کلیلی تیژ Treble clef.









# G

مۆزیک....هەمیشە لە باخەکاندایە، بین
بەڵام دەبێت دڵانمان ئارام بێت تاکو ببیستین.. .        مینی ئامۆنێ

---

سـۆڵ، پێنجەمین پلەدەنگ لە سـکێڵی دیاتۆنێک. سـۆڵ، یاخود سـۆ/*So*،        G(E,G), Sol(F,I)
پێنجەم پلەی زاڵ لە مێجەر سـکێڵ. لە تۆنی دۆ/ی سـۆلفێجی چەسپاودا*Fixed-do solfeggio*بە پێنجەم تۆن دادەنرێت.



سـۆڵ/*Sol*...بە پیتی گەورەی لاتینی*G* ئاماژەیە بۆ کۆردی سـۆڵ مێجەر سـیانیی*G-major triad*   G

سـۆڵ/*Sol*...بە پیتی بچووکی لاتینی*g* ئاماژەیە بۆ کۆردی سـۆڵ ماینەر سـیانیی*G-minor triad*.   G

کلیلی سـۆڵ.        G-clef(E), G-Schüssel(G)

سـۆڵ ـ دەبڵ بیمۆڵ.        G-double flat(E), Geses(G)



سـۆڵ ـ دەبڵ دێز.        G-double sharp(E), Sol-double dièse(F), Gisis(G), Sol-doppio diesis(I)



سـۆڵ ـ بیمۆڵ.        G-flat(E), Ges(G), Sol-bémol(F), Sol-bemolle(I)



کلیلی سـۆڵ بیمۆڵ ـ مێجەر.        G-flat major key(E), Ges(G)



سکێڵی سـۆڵ بیمۆڵ ـ مێجەر.        G-flat major scale(E), Ges-dur skala(G)



G-flat minor(E), Ges-Dur skala(G) **سکێڵی سـۆڵ بیمۆڵ ـ ماینەر**

**کە هاوتای فا دێز ـ ماینەرە**/*F-sharp minor*.

G-major key(E), G-Dur(G) **کلیلی سـۆڵ ـ مێجەر**.



G-major scale(E), G-dur skala(G) **سـکێڵی سـۆڵ ـ مێجەر**.



G-minor key(E), G-moll(G), Sol-mineur(F), Sol-minore(I) **کلیلی سـۆڵ ـ ماینەر**.



G-sharp(E), Gis(G) **سـۆڵ ـ دێز**.



G-sharp major scale(E), Gis-dur skala(G) **سـکێڵی سـۆڵ دێز ـ مێجەر**.



G-sharp minor key(E) **کلیلی سـۆڵ دێز ـ ماینەر**.



Galiarda(I), Gaillarde(F), Galiard(E), Gailliarde(G), Galliarda(S) **گالیارد،**

**دلاوەر، جۆرە سـەمایەکی سـەردەمی سـەتەی**/16**مە لەسـەر کێشێکی**3/4 **کە پڕ جۆش و بزێوە و هەمیشەیش بەدوایدا سـەمایەکیتر بەناوی پاڤان***Pavane* **ئەنجامدەدرێت، ڕیشەی وشەکەیش لە پاڤۆ***Pavo***ی ئیتالیاییەوە هاتووە کە بەمانای باڵندەی تاووس***Peacock***دێت**.

Gai(F), Gaio(I), Gay(E) **بەشـوش، شـۆخ**.

Gaiemente(I), Gaily(E) **بەشـوشی**.

Gaida(Gr) **مەشـکەنایەکی یۆنانییە کە یەک لوولکی هەشـت کونە پەنجەی هەیە**.

Gallant(E,F), Galante(I) **خۆشرِو، شەنگ**.

Galantment(F), Galantmente(I), Gallantly(E) **خۆشرِوانە، بەشـێوەیەکی شـەنگیانە**.

Galop, Hopper(E), Galopp, Hosper(G), Galoppo(I) **گالوپ،**

**خێراسـەمایەکی پڕجۆشی سـەتەی**/19**می ناو هۆڵە***Ballroom***لەسـەر کێـشی**2/4.

Gamba, Viole da gamba(F), Leg viol(E) **گامبا،**

**کورتکراوەیە بۆ کەمانچەی باس. ئامێری کەمانچەی پادار کە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستەکانی سەتەی/17م. کەمانچەی سەرشان***Viole da braccio(F), Arm viol(E)*. **بە زوانی ئیتالیایی بەمانای ملی نۆتە***Stam of note***دێت.**

Gamma(Gr), Gamme(F), Scale(E), Skala(G) **گاما، سکێڵ، پێوانگ، بڕوانە/***Scale*.

Gamut(Gr) **گاموت، لە مۆزیکدا... پڕمەودا***Full range***ی پەردە***Pitch***کان و چێوەڕێژی ئامێرە و دەنگەکان دەگەیەنێت لە سیستەمی مۆزیکدا، هاوردنی وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەشیش گویدۆ/ی ئارێزۆ** *Guido d'Arezzo***تاکو بتوانێت سیستەمی سۆڵفێن***Solmization(Sol-Fa)***ی پێ پێناسەبکات تاوەکو بەهۆی سیلابەکان***Syllables***ی ناو سکێڵ***Scale***ەکان ئاماژە بە نۆتەمۆزیکیەکان بدات. هەروەها بشتوانێت چۆنیەتی بەجێهێنانی شەشەمین تۆن لە سکێڵی هێکساتۆنیکدا وەک دەنگێکی زاڵ**A **G** F E D C **بەئەنجامبدات.**

**ڕیشەی وشەی***Gamut***یش کە لە گاما ئوت/***Gamma ut***ی لاتینی سەتەکانی ناوەڕاستەوە هاتووە کە ئەمیش لە گاما/***Gamma* **یۆنانییەوە هەڵێنجراوە. هەر ئەم وشەیە لە سەتەکانی ناوەڕاستدا بووە زاراوەیەکی مۆزیکی پێکهاتوو لە***Gamma* **و** *Ut* **کە بەمانای نزمترین نۆتە دێت لە سکێڵ مۆزیکێکی شەش نۆتەییدا، واتە پلەیەکی ژێرتۆنی لا/**A **کە ئەویش تۆنی سۆڵ/** G**ی نزم دەکات، یاخود دەشێت بووترێت**A+Ut**ی یەکەمین دەسپێکی نۆتە***Note* **کە لە کارنامە تیۆریەکانی سەتە دێرینەکانی ناوەڕاستدا***medieval scale* **بەرچاودەکەوێت.**




**لەم نموونەدا جێ نۆتەی گاموت***Gamut***کە بۆتە سکێڵی دەنگەوارەکانی مۆزیک توانراوە بخرێتەسەر شێوەی نۆتەنووسین و بەراوردکردیشی لەگەڵ هەندێک سکێڵەکانیتردا.**

**لەم نموونەیشدا نۆتەی سۆڵ/**G **لە سکێڵی گاموت***Gamut***دا لەسەر کلیلی فا/**F.




**گاموت** GAMUT **سالی**1654**ز لە پەڕاوی**
Playford`s skill of music **نووسراوە**

Ganz(G), Whole(E), Tutta(I) تەواو.

Ganze note(G), Ronde(F), Semibreve(I,E), Whole note(E) گردە نۆتە، ڕۆند.

Ganzer bogen(G), Whole bow(E) کەوانی تەواو، ئارشـەی تەواو، واتە پێداخشـانی ڕیشـەی کەوان بەسـەر ژێیەکاندا.بەتەواوی

Ganze pause(G), Whole rest(E) گردە وچان، پشووی تەواو.

Ganzton(G), Whole tone(E) تۆنی تەواو، گردە نۆت.

Gänzlich(G), Completely(E) بەتەواوی.

Gapped scale(E) سـکێلێکی پێنجتۆنیک کە تایبەتە بە نیگرۆ ـ ئامریکاییەکان.

Garbo(I), Grace(E), Grâce(F) میهرەبان.

Garbato(I), Elegantly(E) شـۆخ و شـەنگانە.

Garbatamente(I), Gracefully(E) بەشـێوەیەکی میهرەبانی.

Garbatissimo(I), Very graceful(E) زۆر میهرەبان.

Garder(F), To keep,To hold(E) بـیهێڵێت، بـیگرێت.

Gathering note(E) نۆتە گردکراوەکان، مەبەسـت لە کێشی دەنگە زیل و بەم{تیژ و گڕ}ەکانە کە لە سـرۆتەئایینیەکانی ناو کڵێسە بەجێدەهێنرێت.

Gauche(F), Left(E) گەوچ، چەپ، پیتی/Gکورتکراوەیەتی.

Gaucher(F), Left-hand(E) دەسـتەڕاسـت.

Gaudio(I), Merry, Fest(E) جەژن، شـادی.

Gaudioso(I), In a merry manner(E) شـــاد و خۆشـبار.

Gauge(E), Jauge(F**)** گێجی ژێ، ئەسـتوورایی ژێ،

Gavot(E), Gavotte(F), Gavotta(I) گاڤوت، سـەمایەکی کێش4/4ی فەڕەنساییە بە تێمپۆیەکی مامناوەندی و جاروباریش خێرا، چۆنیەتی ئەم سەمایە ئەگەڕچی گوندەکیانەبوو کە زیاتر وەدەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی/16م و زیاتریش لە کۆشکی لویسی/16دا نمایشدەکرا بەڵام لەدواییدا بووە سـەمایەکی زۆر باو و میللی، لە نیوەسـەدەی نۆزدەمیشـەوە بووە سـەمایەکی کێش2/2.

Gebet(G), Prayer(E) نوێژکار، نزاکار.

G-clef(E) کلیلی سـۆڵ، کلیلی تیژ کە لەسـەر هێڵی سـۆڵ دادەنرێت.

Gebrauch musik(G), Utility music(E) مۆزیکی بەسـوود و بەکەڵک.

Gebrauch(G),Use(E) بەسـوودبێت، بەکاربێت.

Gebrochen(G), Broken(E) شـکسـتە، شـکاو.

Gebrochen akkord(G) بڕوانە/*Broken chord*.

Gebunden(G), Legato(I), Bound,Slur,Tied(E) بەندکردن، لکاو.

هێڵی لکاندنی دوو نۆتە بەیەکەوە، بڕوانە/*Legato*.

Gedämpet(G), Damped, Muted(E) کپیو، کپاندنی دەنگەژێیەکان بە ئامڕازێکی تایبەتی، کورتکراوەیەتی*Ged*.

Gedackt, Gedeckt(G), Covered, Roofed(E) پۆشیو، جۆرە لوولەدەنگ بەرزێکی فلووت ئاسا لە ئامێری ئۆرگندا و لوولەداخراوە*Stopped pipe*کان کە بە لوولەهەشتپێ*8-foot stop* لە ئامێری ئۆرگن*Organ*دا ناسراوە.

Gedackt curtal(G) بڕوانە/*Curtal*.

Gedämpft(G) کپکراو، سێ جۆر زاراوە بۆ کپکردنی ئامێرەکان بەکاردێت:ـ

1. کپیو*Damped* بۆ ئامێرەهەواییەکانی وەک ترومپێت و مانەندی.
2. میوتە*Muted* بۆ ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە و مانەندی.
3. مەفڵە*Muffled* بۆ لێدەرەکانی وەک تەپڵ و مانەندی.

Gedehnt(G), Stretched out, Prolonged(E) نۆتەی درێژەپێدان، کشان.

Gefährte(G) بەرسڤ لە فیوگە*Fugue*دا، هاویار، هاوکار.

Geffallen(G), Pleasure(E) خۆشنوود.

Gefühl(G), Feeling(E) هەست.

Gefühlvoll(G), Full of feeling(E) پڕ لە هەست.

Gegen(G), Towards, Near, Against, Counter(E) پێشڕەوی، نزیک، دژ، بەرابەر.

Gegenharmonie(G) بەرابەرە بابەت{هارمۆنی} وەک لە فیوگەیەکدا.

Gegensatz(G), Countersubject(E) بەرابەرە بابەت.

Gehalten(G) Helt out, Sustained(E) مانەوە لە درێژەپێدان.

Gehaucht(G), Whispered(E) چرپەکردن، سۆسەکردن.

Gehiemnisvoll(G), Mysterious(E) ڕازئامێز.

Gehend(G), Going, Andante(E) نەرمەڕەوت.

Gehörig(G), Proper, Suitable(E) لەبار و گونجاو.

Geige(G), Violin(E) کەمانچە، یاخود هەر ئامێرێکی ژێدار کە کەوانی هەبێت.

Giegenbogen(G), Violin bow(E) ئارشە{کەوان}ی کەمانچە.

Geist(G), Ghost, Spirit, Soul(E) جن، ڕۆح، یەزد.

Geistlich(G), Spiritual(E) ڕۆحانی، یەزدانی.

Geistliches lied(G), Spiritual song(E) سروودی یەزدانی، سرۆش.

Gekneipt(G), Plucket(E), Pizzicato(I) نەگرە، پزیکاتۆ، ژێ لێدان بە سەری پەنجە.

Gekopelt(G), Coupled(E) جووتگرتوو.

Gelassen(G), Quite, Calm(E) هێور، ئارام، ستار.

Geläufig(G), Fluent, Nimble(E) ئاسان و ڕەوان.

Geläufigkeit(G), Fluency(E) ئاسانی و ڕەوانی.

Gemächlich(G), Comfortable, Unhurried(E) دڵئارام و ئاسوودە.

Gemässigt(G), Moderate with regard to speed(E) مامناوەندیەکی بە ئەندازە.

Gemendo, Gemebondo(I), Moaning(E) نالاندن، زاریکردن.

Gemente(I) نالان، زارین.

Gemessen(G), Measured(E) پێوراو کە لە سێ باردا پێویستە:ـ

1. بەوردی *Precise*.
2. بەخێراییەکی مامناوەندی *At a moderate speed*.
3. بەچەشنێکی سەنگین *Heavy in style*.

Gemüth(G), Feeling(E), Toccare(I), Sentiment(F) هەست.

Gemütlich(G), Easy-going, Comfortable(E) ئاسانڕەو، ئاسوودە.

Genau(G), Exact(E;F), Minuzioso(I) تەواو، دروست.

Genauigkeit(G), Exactitude(E) دروستی، تەواوی.

Genera,(L), Genders, Kinds, Sorts(E) ڕەگەزەکان، جۆرەکان، بە تاک پێیدەوترێت ڕەگەز:جنس *Genus*{بە لێکدانەوەیەکی مۆزیکیانە}. لە سەردەمانێکی زۆر زوودا دیماندانانی *Theorists*{دیمانە:*Theory*}یۆنان پێیانوابوو کە زانستی مۆزیک سێ ڕەگەز *Genera:Genus*ی جیای لەخۆوە گرتووە،

ئەوانەیش بریتین لە:-

1. دیاتۆنیک *Diatonic*... میانەپێوانەکەی لە نیوەی کۆ میانەی تێتراکۆرد{کە یەکسانە بە *249cent*}کەمترە. ئەم کۆ میانانە *Total interval* کە تاڕادەیەک بچووکن و نزیکن بە *200cents* دەبنە تۆنی تەواو *Whole tone*.
   کلاسیکانە *Classically*... میانەپێوانەکەی لە دوو میانەتۆن *Interval tone* و یەک نیوەتۆن *Semitone* پێکهاتووە.
2. کرۆماتیک *Chromatic*... میانەپێوانەکەی لە کۆ میانەی تێتراکۆرد گەورەترە کە لە میانەی چوار-پێنجەم {لەنێوان *249-389cents* دایە} گەورەتر نیە.
   کلاسیکانە.... میانەپێوانەی بریتیە لە ماینەر سێیەم{کە یەکسانە بە *200cents*} و دوو میانەی بچووک کە یەکسانن بە نیوەتۆنەکان.
3. ئینهارمۆنیک *Enharminic*... میانەپێوانەکەی لە چوار-پێنجەم میانە{گەورەترە لە *389cents*}گەورەترە.
   کلاسیکانە... میانەپێوانەکەی بریتیە لە دایتۆن *Ditone* و دوو میانەی بچووک لە چارەکەتۆن *Quatertones*.

General bass(E) باسی گشتی، باسی نمرێنراو، بڕوانە/ *Basse chiffrée*.

General pause, Complete silence(E) **وچانی گشتی، بێدەنگیەکی تەواو.**
**بەلایەنی کەمەوە یەک بارِ***Bar* **بۆ گشت ئۆرکێسترا کە بە کورتکراوەی***GP/***ئاماژەی بۆ دەدرێت.**
General probe(G), General proof(E) **مەشـقی گشــتی، پرۆڤەی گشــتی.**
Générateur, Generator(F), Fundamental note, Root(E) **نۆتەی بنچینە، ڕەگە نۆتە.**
Generoso(I), Generous, Lofty in style(E) **سـەلار و ڕەزین.**
Genre(E,F), Genus(L), Geschlecht(G) **ڕەگەز، جنس، بەگشتی... فرۆزە لە سـروشتی شــتێک دەکات. زاراوەیەکی هونەرییە کە گوزارە لە پۆلاندنی جۆرە مۆزیکێک دەکات ئەویـــش بە هاوبەندی و هاوگرێدانی کار***Function*، **نێوەند***Medium*، **شـێووگ***Form***یاخود شـێواز***Idiom*.
**بۆ نموونە:ـ ئۆپێرا{دەنگەکان، ئۆرکێسترا، دراما، شـانۆگەریی***Staging*}، **ئیتود***Etude*، **مۆزیکی چەمەری***Dirge*{*Funeral music*}....**هتد.**
**ئەگەر لە دیدەیەکی هونەری خۆرەلاتیانەوەڕا لێکبدرێتەوە، دەشێت بڵێین کە جنس یاخود ڕەگەز لە هونەری مۆزیکدا....گوزارە لە میانەی تۆنێک بۆ تۆنی چوارەم دەکات کە لە زاراوەی خۆراواییدا تێتراکۆرد***Tetrachord***ی پێدەوترێت.یاخود بڵێین پێکهاتووە لە چوار پلەتۆنی یەکبەدوایەکدا و ســێ میانەیش کەوتبێتە نێوانیانەوە.**
**بەشێوەیەکی گشــتی ڕەگەز بەپێی میانەکانی، چەند چەشنێک لەسـەر ســکێڵ***Scale***وەردەگرێت:ـ**

1.**ڕەگەزی ناتەواو***Imperfect genre*،
**بەو ڕەگەزە مۆزیکیە دەوترێت کە کۆی چوار پلەتۆنەکانی بکاتە** 8/4، **وەک ڕەگەزی وەک ڕەگەزی ســەبا، ڕەگەزی سـەبا زەمزەم.**




2.**ڕەگەزی نێوەند***Medium genre*،
**بەو ڕەگەزە مۆزیکیە دەوترێت کە کۆی چوار پلەتۆنەکانی بکاتە** 9/4.
**وەک ڕەگەزی خەزان{هوزام}لەسـەر پلەتۆنی ســێگا.**




3.**ڕەگەزی تەواو***Perfect genre*، **بەو ڕەگەزە مۆزیکیە دەوترێت کە کۆی چوار پلەتۆنەکانی ڕەگەزی تەواو***Perfect genre*، **بکاتە** 10/4، **وەک ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی دڵکەش لەسەر پلەتۆنی ڕاست،**






4.ڕەگەزی سەرتەواو*Supper perfect genre*،
بەو ڕەگەزە مۆزیکیە دەوترێت کە کۆی
چوار پلەتۆنەکانی بکاتە 11/4، وەک ڕەگەزی
دەسگای سێگا.لەسەر پلەتۆنی سێگا.




5.ڕەگەزی زێدە*Augmented genre*
بەو ڕەگەزە مۆزیکیە دەوترێت کە کۆی
چوار پلەتۆنەکانی بکاتە 12/4،
وەک ڕەگەزی ئەسەر کورد لەسەر پلەتۆنی ڕاست.




ڕەگەز...بەپێی ڕێسای تۆنەکانیش لە دەسگامۆزیکیەکاندا دەشێت بە سێ جۆر بپۆلێنرێت:ـ

1.ڕەگەزی سێکۆردیی*Trichord*کە لە ئاوێزاندنی سێ تۆن پێکهاتووە. هەندێک لەو دەسگا مۆزیکیانەی کە لەم ڕەگەزەیان لە ئامێزدایە بریتین لەمانە:ـ

A. ئەجەمی سێکۆردیی:ـ
لە مۆزیک کلاسیکی خۆراوادا....بە یەکەم
سێ نۆتەی سکێڵی مێجەر دەچێت.




B. چوارگای سێکۆردیی:ـ
لە مۆزیک کلاسیکی خۆراوادا....بە یەکەم
سێ نۆتەی سکێڵی مێجەر زۆر دەچێت.




C. سێگای سێکۆردیی.




D. موستەعاری سێکۆردیی.




2.ڕەگەزی چوارکۆردیی*Tetrachord*:ـ لە ئاوێزاندنی چوارتۆن پێکهاتووە.
هەندێک نموونە لەو دەسگامۆزیکیانەی کە لەم ڕەگەزەیان تێدایە ئەمانەن:ـ

A. بەیاتی چوارکۆردیی.




B. بوسەلیکی چوارکۆردیی.
{هەندێجار بە عوشاق ناودەبرێت}




C. حیجازی چوارکۆردیی.




D. کوردی چوارکۆردیی.




E. نەهاوەندی چوارکۆردیی.



3.ڕەگەزی پێنجکۆردیی*Pentachord*:ـ لە ئاوێزاندنی پێنجتۆن پێکهاتووە.

هەندێک نموونە لەو دەســگامۆزیکیانەی کە لەم ڕەگەزەیان تێدایە ئەمانەن:ـ

A. نەوئەســەر{نەواســار}ی پێنجکۆردیی. B. ئەسـەرکوردی پێنجکۆردیی.







Genial(G), Cleaver, Spirited(E) زرنگ، زیرەک.

Gentil(F), Gentile(I), Gentle, Delicate(E) خـۆشخو، ئارام، شیرین.

Gentilmente(I) خـۆشخویی، ئارام.

Gentilezza(I) خـۆشخویی.

Gens(L), Clan, Race, People, Tribe(E) ڕیشـە، گەل، هۆز، تیرە.

Genus(L), Kind, Sort, Class, Category(E) جنس، ڕەگەز، جۆر، بەرە، پۆل.

Gerade bewegung(G), Similar motion(E) جوولەی وێکچوو.

Gerührt(G), Gerquält(I), Emotional scene(E) سـۆزێکی بەجۆش.

German flute(E), Flauto traversa(I) مۆدێرنە فلووتی لابەلا، فلووتی کلیلدار، فلووتی تراڤێرسا. کە لە سـەتەی/18م و بەرایی سـەتەی/19مەوە میللێتی پەیداکرد.

German scale(E) مۆزیک سـکێڵی ئەڵمانیایی کە پێکهاتووە لە:ـ

A H(B) C D E F G، پیتی B گوزارە لە سـی ـ بیمۆڵ $Si^b$دەکات.

German Sixth Chord(E) شـەشـەم کۆردی ئەڵمانیایی، بڕوانە/*Augement sixth*، هەندێجار پێیشیدەوترێت زێدەکراوی کۆردی شـەش ـ پێنج*Augmented six-five chord*.

Gesang(G), Melody, Song(E) ســتران، تەرانە، میلۆدی.

Gesangbuch(G), Song book(E) ســترانامە کە سـترانی تێدا نووسرابێت.

Gesangsgruppe(G) سـۆناتا شـێوە، دووەم بابەتی یەکەم جوولەی سـۆناتایەک.

Gesangverein(G), Choral society(E) جڤاتی کۆڕاڵ، دەستەی سترانخوانان.

Gesangvoll(G), Song-like(E) سـترانئاسـا، ئاوازێک لە چەشـنی کانتابێل*Cantabile*.

Geschlagen(G), Struck(E), Asséna(F) لێدان بە کەوان.

Geschleift(G), Slurred(E) بەندێن، بڕوانە/*Legato*.

Gesschlossen(G), Closed(E), Fermés(F), Bloccato(I) داخراو.

Geschmack(G), Taste(E), Goûtez (F), Gustare(I) چێژ.

Geschmackvoll(G), Tastefully(E) بەچێژ.

Geschwind(G), Quick(E), Rapide(F), Rapido(I) بلەز، خێرا.

Gesprochen(G), Spoken(E) **وێژراو، وتراو.**

Gesstopet(G), Stopped(E) **وەستاو{بە مەبەستی کپکردن*Gedämpft*}، ژەنینی هۆڕن و ئامێرەزەنگیەکان کە بە لەپی دەست یان بە ئامڕازێکی تایبەت دەنگیان دەوەستێنرت.**

Gesteigert(G), Crescendo, Esforzando(I) **کریشاندۆ.**

Gestossen(G), Detached(E), Staccato(I) **پچڕپچڕ، ستاکاتۆ.**

Gettando(I), Throwing(E) **گێتاندۆ، زاراوەیەکی داهێنراوە**

**لەلایەن پرۆکۆفییێف*Prokofiev*ەوە{سێرگی پرۆکۆفیڤ1891-1952ز...پیانۆژەنی ئۆکرانیا/یی کە لە تەمەنی پێنج ساڵیدا پارچە مۆزیکی داناوە}. چەشنە پزیکاتۆیەکی سێکوچکە *Troika pizzicato style*ییە واتە جیاکردنەوەی ستاکاتۆ کرۆشەکان*Staccato Quavers(Croche)* بە پشووە کرۆشەکان*Quaver rests* کە جووڵەیەکی زۆر خێرای پێویستە و پێیشیدەوترێت*Staccatissimo*.**

Gettando l'arco(I) **گێتاندۆ بە کەوان(ئارشە).**

Getheilt, Geteilt(G), Divided(E), Divisi(I) **بەشکراو، .*Geth*کورتکراوەیەتی.**

Getragen(G), Sostenuto(I) Slaw and sustained(E) **نۆتەکشان و درێژەپیدان، پەیوەستە.**

Gettato(I) **ناڕێکوپێک، ناگەهان.**

Gewaĺ(Kr), Big drum(E) **گەواڵ، دەهۆڵی گەورە.**

Gewırge(Kr)ö Very big drum(E) **گەورگە، دەهۆڵی زۆر گەورە.**

Gewidmet(G) Dedicated(E) **تەرخانکراو.**

Gewiss(G) **بێگومان، دڵنیا.**

Gewır, Gewre, Gor(Kr), Great, Noble(I) **گەور، گۆر،**

**ئەو دەمەی کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامی گەیشتە ناوچەکانی کوردستان، سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ساسانیەکان بوو. ئایینی زاردەشتی کە ئایینێکی سەرانسەری بوو کەوتە کزولاوازی، زۆرینەی گشتی خەڵک بوونە موسوڵمان. ئەوانەی موسوڵمان نەبوون تا توانییان لە ئاوەدانی دوورکەتنەوە و ڕوویانکردە کەژ و کێوەکان. زۆریان بەماڵوحاڵیانەوە بەرەو هیندستان باریانکرد و لە هەرێمی گوجرات بە ڕەهەندێکی زۆر تیادا نیشتەجێ بوون. ئەو بۆرەپیاو و خانەدانانەیش کە وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی و ماددی بە گۆران*Noblemen*ناسرابوون و دینە نوێکەیان لاپەسەند نەبوو و نەیاندەتوانی دەست لە بەرژەوەندی ژیانیان هەڵگرن، ئەوانەی هەر لەسەر ئایینی خۆیان مابوونەوە ناچاردەکران گزیە{جزیە}بدەن، ئەم گۆرانانە ئاوا بەم شێوەیە توانییان چ بەرژەوەندی خۆیان و چ دەسوپێوەندیان بۆ سەردەمانێک بپارێزن، ئەوەی کە لێرەدا مەبەستە نمایان بکرێت ئەوەیە کە هەر یەکێک لەو گەورەپیاوانە بمردنایە، کەسوکار و دەسوپێوەند بە ئاکار و نەریتێکی کۆمەڵایەتی چەمەرییەکی تایبەتییان بۆ دەگێڕا. لەو ئاهەنگی بەخاک سپاردنەدا کەسانی دەنگخۆشی چەمەرچڕ هەڵدەکەوتن کە بە سۆزێکی تایبەت و بەئاوازی کاریگەر دەیالاواندەوە و دەهاتن بە ستایشکردن و شانوشەوکەتی بەرزیدا و ئینجا نزاکردن و پاڕانەوە لە مزدای ئاهۆرا کە لە گوناهەکانی خۆشبێت و بە بەهەشتی شادبکات. بە جێگیربوونی ئایینی ئیسلام بەرەبەرە و نەوە دوای نەوە هەندێک لە**

**بنەماڵەی ئەم گەورانە وەک دەسەلاتێکی ساماندار لەنێو ڕەویەکانیاندا پووکانەوە و توانەوە و وشەی گۆران/یش بووە ناسـناوێک بۆیان. ئەگەرچی وەک هێزێکی ڕۆحـی دەسـبەرداری ئەو ئایینە و هەندەک ئایینیتری نەبوون بەلام پیر و ڕابەرانیان توانییان چاوبخشێننەوە بە بەرنامەیاندا بە شێوەیەکی وەها کە بسازێت لەگەڵ ئایینی نوێدا. تا ئێسـتایش لەم ئاکار و نەریتە لەنێو هەندێک هۆزی وەک جاف/دا بەدیدەکرێت کاتێک کە بەگزادەیەکی ناسراویان لێدەمرێت.**

**گۆران لە ڕووی زوانەوە....وشەیەکی کۆیە و تاکەکەی دەبێتە گۆر{گۆرە بە لاوژەی هۆرامی}یاخود گەور کە بەمانای گەورە و مەزن دێت ناسـناوێکە بۆ کەسانی شکۆمەند و بۆرەپیاو و خانەدان. بارامـی گۆر یاخود گەور کە پاشایەکی ساسـانی بووە نموونەیەکە بۆ ئەم وشەیە.**

**لە ڕووی باری کۆمەلایەتیشەوە...بە بەرەیەکی خانەدان و بە دەسەلات و ڕۆشنبیر دانراون کە چێوەی بیرکردنەوە و ئاخاوتن و گوزەرانی ژیانیان لە ئاستێکی بەرزدان. ئەمانە لە بەرەکەیـتر جیاوازترن کە پێیانوتراوە کورد یاخود کوردان کە خەڵکێکی بێسـەواد و مسـکێن و ڕەوەندن.**

**سـەیر لەوەدایە...سـەرەتاسـاڵی1992ز، لە ناوچەی پێنجوێن/سـلێمانی هەندێک گۆڕ دۆزرانەوە کە لاشەی مردووەکان بەخۆیان و جلوبەرگو خشڵەمەنیانەوە خرابوونە کووپی گەورەوە، ئەمەیش دەشێت ئاماژەیەک بێت کە کاتی خۆی ئەمانە لەو گۆران/انە بوون.**

**ئاوازی گەور....ناسـراوە بەوەی کە چەشن و شـێوازێکی زار و پەرێشـانی و لاوانەوە و چەمەری لەخۆگرتووە، گەر کەسـێکی بەتوانا و شارەزا بەم هەوایە کزەیەک بکات هەسـتی پێدەکرێت کە تا چ ڕادەیەک هۆگری خەمناکیە و چۆن بەو چەشنە ئاوازە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو سەردەمە دێرینانە.**

**لە ڕووی پۆلاندنی مۆزیکیەوەی...دەکرێت بڵێین کە فۆرمێکە لە دەسگازای بەیاتی شوور.**

Gezogen(G), Draw out(E), Portamento(I) **درێژەکێشانی مامناوەندی، پەیوەندی دوو تۆن بەشـێوازێکی نەرم.**

Ghavaĺ, Gewaĺ(Kr,Az), Frame dram with jingles(E) **گەواڵ، دەهۆڵی یەکلای خڕنگەدار.**

Ghost note(E) **سـایەنۆتە، بەو نۆتەیە دەوترێت کە ڕسـتەیەکی مۆزیکادا هەبێت بەلام یان لێنادەدرێت یان کە لێدەدرێت دەبێت زۆر بە لاوازی{هەر وەک تارماییەک بەلادا تێپەڕبێت}.**

Ghirbizzo(I), Humour, Caprice(E) **هەوەس.**

Ghiribizzoso(I), Humorous, Capricious(E) **بەهەوەس.**

Ghironda(I), Hurdy-gurdy(E) **بڕوانە**/*Hurdy-Gurdy*.

Giacoso(I), Play in a merry(E) **زۆر بە دڵخۆشی.**

Gigelira(I), Xylophone(E) **ئامێری زایلۆفۆن.**

Giocando(I) **شـۆخ و بەخەندە.**

Gioco(I), Game, Play(E) **گەمە، وازی.**

Giochevole(I), Playfull(E) **شـادباش، شـۆخیهێن.**

Giochevolmente(I), Playfully(E) **شـادباشی، شـۆخیهێنی.**

Giocondo(I), Jocund(E) **شـاد، خوڕەم.**

Giocondevole(I), Joculary(E) به خوڕەمـی.
Giocondezza(I), Jocularity(E) خوڕەمی.
Giocoso(I), Jocose(E) خۆشبار، شـاد، شۆخیـباز.
Giocosamente((I), Jocosity(E) شـۆخیانه.
Gioia, Gioja(I), Joy(E) زۆر شــاد.
Giojante, Gioioso, Giojoso, Giojosamente(I), Joyful(E) زۆر بەشـادی.
Gioviale(I), Jovial(E) شـۆخیباز، ژۆپیتەر*Jupiter*کە تایبەتە بە گەورەخواوەندانی ڕۆمان.
Giovialitá(I), Joviality(E) شــۆخیبازی، ژۆپیتەریی.
Giraffe(E) جۆرە پیانۆیەکی زۆر ســەرەتاییە، هارپسیکۆرد.
Giro(I), Turn(E), Tournons(F) گەڕانەوە کە بە هێمای کولاپ گوزارەدەکرێت، بڕوانە/*Turn*.
Giú(I), Down(E), Duvet(F) خوارەوە، کەوانلێدان بەرەو خوارەوە.
Giubilo, Giubilio(I), Joy(E) جۆشـەنگێز، شــادمانی.
Giubiloso(I), Joyous(E) شــادمان، جۆشەنگێز.
Giubilante(I), Jubilnat(E) بە شـادمانی.
Giulivo(I), Joyous(E) خۆشـنوود و شـاد.
Giulivissimo(I) خۆشـنوود و شـادتر.
Giusta, Giusto(I), Just, Perfect, Suitable(E) تەواو بە ڕێکوپێکی، گونجاو.
Giustamente(I), With exactitude(E) بە تەواوی.
Giustazza(I), Exactitude(E) بێ گۆڕینی تەواو لە خێرایی و ڕەزمدا.
Ghychek, Geyĉek, Keyjık(Fa,Kr,Tr) کەیژک، گایچەک، قیچەک، غیشەک.
کەمانچەی کەیژیک*Kejik*{واتە کەمانچەی ئاوریشم}، ئامێرژێ/یەکی زۆر دێرینی چینی/هیندییە و گوایە لەسـەردەمی سـاسـانیەکان زۆر بەکارهێنراوە. لە زوانی سـانسکریتیدا بە گوشکا*Ghoshka*هاتووە. ڕەچەڵەکی وشەکەیش نزیکە لە کەژ/ەوە کە وشەیەکی کۆنی کوردیشە بەمانای ئاوریشم دێت و پیتی ک/یش خراوەتە پاشگری{هەروەک لە زۆر وشـەی کوردیدا ڕەچاودەکرێت}. جا لەبەرئەوەی پشتەکاسەی ئامێرەکە بە پارچەیەک کەژێک{ئاوریشم}ی نەخشین داپۆشراوە، ناوی کەمانچەی کەژک/ی براوە بەسـەردا و لەدواییدا هەر بەناوی کەژک ناسـرا. بەرە بەرە ئامێرەکە چووە نێودەسـتی ژەنیارانی میللەتانی ترەوە و هەر میللەتیش بە زوانی تایبەتی خۆی بە پیتگۆڕکێـی وشەکە ناوی تری بۆ هێنایەپێشەوە.
Glass harmonica, Muoth organ(E), Glasharmonika(G) هارمۆنیکا، ئۆرگنی دەم.
Glareanus(L) گلارینۆس، دەسـگایەکی مۆزیکی کلێسەییە، ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەشیشێکی ســویسرایی هێنریکۆس گلارینۆس*H. Glareanus* نزیکەی ساڵی1547ز کە توانی لە سـکێڵەدەسگای ئایۆلین*Aeolian* دا دوانزە ئەکۆرد*Dodecachordan*بهێنێتەکایەوە. بڕوانە/*Mode*.
Glatt(G), Smooth(E) لووس.

Glätte(G) Smoothness(E) لووسیی.

Gläzend(G), Brilliant(E) درەوشان، بریسکان.

Glee(E) گلی، لە*Gliv*یاخود*Gleo*ی کە وشـەیەکی دێرینی ئینگلیزییە بەمانای مۆزیک دێت، پارچە سترانێکی کورت و سـادەی بەریتانیایی چەندین بەشە بە دەنگە نێرینەکان کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند سـاڵانێکی نێوان1830-1650ز.

Gleich(G), Like, Equal, Similar(E) وەکو، مانەند، یەکسان.

Gleiche stimmen(G), Equal voices(E) یەکسانە دەنگەکان.

Glissando(I), Gleitend(G), Gliding(E), Glisser, Glissant(F) گلیساندۆ، خلیساندۆ، پەیڤێکی ڕەسەنی ئیتالیاییە کە لە گلیسێ*Glissé*وە هەڵێنجراوە بەمانای گلان:خزان*Sliding*دێت و پاشان ئەم وشانەی***Glissando***, *Glissato, Glissicando, Glissicato*وەک زاراوە بۆ داڕێژراوە و لە بواری مۆزیکدا کارپێدەکرێت.

خلیسکاندن بەرەو سەروو و بەرەو خواروو لە سکێڵدا کە بە کورتکراوەی.*Gliss*ئاماژەی بۆ دەکرێت، هەروەها بە هێڵێکی شـەپۆلین*Wavy*یاخود لێدانێکی ڕاست لەنێوان بەرزترین نۆتە و نزمترین نۆتە لە ئۆکتاڤێکدا، زۆر بەدەگمەن لە سـێدەنگی*Triple*دا بەکاردەهێنرێت.

لە پراکتیکدا....بریتیە لە ژەنینی ئۆکتاڤێکی خێرا ئەویـش بە خلیساندنی نینۆکی پەنجەگەورە یاخود سـێیەم پەنجە بەسـەر دوگمە سـپیەکانی پیانۆدا،

بە زۆریـش لە ئامێرەژێیەکانـی وەک هارپ و قانوون/دا بەکاردەهێنرێت،

بۆ ئامێرەکەوانیەکانی وەک کۆمەڵەی کەمانچە گوزارە لە ڕۆ*Flowing* و ژەنینێکی پاساو *Passage playing*ی ناجەخت*Unaccented*دەکات، ئەم چەشـنە تەکنیکە لە ژەنیندا زۆر لە مۆزیک و سـترانەمیللی کوردیدا بەدیدەکرێت. هێمای دەسـتەچەپ ئاماژەی گلیساندۆیە بەرەو سەرەوە و هێمای دەسـتە ڕاسـتیش ئاماژەی گلیساندۆیە بەرەو خوار.

Glocke, Glocken(G), Bell, Bells(E) زەنگ.

Glöckchen(G), Small bell(E) زەنگۆڵە، گچکە ناقووس.

Gloria(L), Fame, Renown, Glory(E) شـکۆ.

نزای شکۆمەندی بۆ خودێ، دووەم سـروودێکی کۆڕاڵی کڵێسەیی کاتۆلیکە لەو شەش سروودەی کە لە سـرۆتی کۆنوێژ*Mass*دا ئەنجامدەدرێت. بڕوانە/*Mass*.

Gloriosamente(I) شـکۆییانە.

Gloriosissimo(I) زۆر بە شـکۆیی.

Glorioso(I), Glorious(E) شـکۆیی.

Glottis(G) گلۆتیس، کردنەوەی گرژی و خاوی ماسـولکەکانی هەنگەرە{هەنکەڕێ} بۆ تونگ و گوشـادی ژێیەکان و ئەندامەکانیـتری ناو دەم بۆ ڕێخسـتن و گۆکردنی دەنگەکان.

Gnacchere(I) بڕوانە/*Castanets*.

Goffaggine(I) سـەنگینی، ناپوختەیی.

Goffo(I) سـەنگین، چەپ.

Gong, Tam-Tam(Ch) گۆنگ، تام-تام، کۆنەئامێرێکی ڕەزمی چینی/یە لەشێوەی ساجێکی مادەنییە و بە هەڵواسراوی بە دەسکێکی لا سەر خڕ پیدا دەکێشرێت و دەنگێکی سامناکی هەیە.

Goofus(E) گووفوس، ئامێرێکی سالانی1930-1910ز، زۆر بە ئامێری سـاکسـۆفۆن دەچێت، بەڵام بیستوپێنج کونەپەنجەی لەسەرە.

Gorge(F), Throat(E) قورگ، هەنگەرە{هەنکەڕێ}.

Gorgheggio(I), Trill, Warble(E) زمزمەکردن، تریللەکردن بۆ هەر پاساوێکی خێرا و درێژ بە دەنگێکی نەرم کە چەند نۆتەیەکی لەخۆ گرتبێت.

Goshe, Goşe(Kr,Fa), Léřşte(Kr),Derivative(E) لێڕشتە، گۆشە. زاراوەیەکی کوردی/فارسی/یە لە هونەری مۆزیکدا. هەر مۆزیک دەسـگایە لە چەند گۆشە{لێڕشتە}یەک پێکهاتووە. هەر لێڕشتەیەکیش ڕەنگ و مۆرگی خۆی بە یەکێک یاخود زیاتر لەمانە دیاریدەکات:ـ دەسـگا*Mode*، دەسـپێک*Starting*، کۆتایی*Ending*، نۆتە پاگیرەکان*Emphasis notes*، چێوەی میلۆدیی*Melodic shape* و ڕەزم*Rhythm*.

لێڕشتە....لە دەسگا خۆرەلاتییەکاندا گوزارە لە پاشکۆ، بەش یاخود لق دەکات. واتە هەر مۆزیک دەسگایەک چەندین دەسگازایـتری لێدەکەوێتەوە کە پێیدەوترێت لێڕشتە*Derivative*.

Goweşt, Kowesht(Ar,Fa,Kr,Tr) گۆوەشـــت ، مۆزیکدەسـگایەکی زۆر کۆن و دێرینی سـەردەمی بارامی پێنجەمی سـاسـانی/یە و هەر لەسەردەمی ئەویشدا بە هەشتەمین ئاواز پۆلێنراوە، گوزارە لە حەوت دەسـگا دەکات کە بە هەشتەمین دەسـگا وەک کۆبەندێک کۆتایی پێدەهێنرێت. سـەفەدینی ورمێیی/یش لای خۆی بەیەکێک لە مۆزیکدەسـگاکانی داناوە. پێدەچێت ڕەچەڵەکی وشەکە لە گائـوەش{گاو ـ وەش}ی ئاڤێستاییەوە هاتبێت کە بەمانای جیهانی{خەلیقەت}خۆش دێت. یاخود وشەلێکدراوی گۆ و وەشت(یاخود واشت) هاتبێت. گۆ بەمانای کۆسـتێرەی چلچرا یاخود لالە{کە بە یۆنانی پێیدەلێن*Thoria* و بە عارەبی ثریا}و پاشـگری وەشـت/یش مانای پرژەبارانێکی بەتاوی جوانوڕەنگینی دلڕفێن و پەلکەزێڕین ئاسـا دەبەخشێت وەک گومەز{تاقدیس}بەسـەر شـوێنێکی زۆر سـازگاری بەهەشت ئاسـادا، کەش و هەوایەکی خۆشبەخشی دلڕەوێن و ڕۆمانسیناک بخاتە ناخی دڵودەروونی خۆشخوانان و ژنەوان. کاریگەری میللەتانی دەرودراوسێ وای لێکردووە کردوە کە بە چەندین زار گۆی پێبکرێت وەک گۆوەشت، کوشت، گەوەشت، جاوشت...هتد.

لە خۆرەلاتی کوردستانی وەک دەسـگایەکی سەربەخۆ پۆلێنراوە، بەلام لە باشووری کوردستان وەک ناساوێکە بۆ پلەتۆنی سی ـ باس*B-Bass*ی ناوەڕاست. بڕوانە ڕیزبەندی پلەتۆنەکان لە/*Diwan*.

شوعبە ژ مەقامێ دڵ بـ ئاواز گوڵگشتێ بکەن گەوەشت و شەهناز

ئەحمەدی خانی

General pause(E) وچانی گشتی، ***G.P***کورتکراوەیەتی.

Grabble(S), Ornamental note, Short passage(E) **گرابلە، نۆتەی زەخرەفە یاخود**
**کورتە پاسـاو کە: یان لەلایەن ژەنیارەوە فراهەمدەکرێت، یاخود لەلایەن مۆزیکدانەرەوە لە نۆتاندندا بەشـێوەی نۆتە ڕازاوەکان***Grace notes***، ئاپۆجیاتۆراکان***Appoggiaturas***، کۆلاپەکان***Turns***...هتد ئاماژەی پێدەدرێت.**

Grace notes(E) **نۆتیلە ڕازاوەکان، هەر وەکی ئۆڕنامێنت***Ornament* **بۆ زەخرەفاندنی هێڵە میلۆدییەکان. ئەم جۆرە نۆتیلەیە لە سـەتەی/15م تاکو کۆتاییەکانی سـەتەی/17م زۆر لەبەرچاو بوو.**




Gracile(I), Small, Thin(E) **بچووک، تەنک.**

Gracieux, Gracieuse(F), Gradevole(I), Graceful(E) **دڵپەسـەند، بەخشـندە.**

Grad(G), Grado(I), Degree, Stop(E) **پلە.**

Gradatamente(I), Gradually(E) **پلەپلە، پەیدەرپەی.**

Gradation(E) **هەڵبەزینی دیاتۆنیک** *Diatonic ascending* **ی کۆردەکان یاخود زنجیرە دابەزینێک***Descending succession***ی کۆردەکان.**

Gradino(I), Step, Note, Range of notes(E) **هەنگاو، نۆتە، مەودای نۆتەکان.**

Grado ascendente(I), Ascending step(E) **نۆتەی هەڵبەزین{بەرەو ژوور}.**

Grado della scala(I), Degree of the scale(E) **پلەی سـکێڵ.**

Grado descendente(I), Descending step(E) **نۆتەی دابەزین{بەرەوخوار}.**

Gradual(E), Graduale(L) **کورتە سـروودێکی کۆنوێژە لە کڵیسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا کە لەنێوان سـروودی مژدە***Gospel***و سـروودی ئێپیستل***Epistle***دایە.**

Grand, Grande(I), Great, Large, Big(E), Grosso, Grosse(G),Gros, Grosse(F) **گەورە، کاڵ، زل، مەزن، بەگ.**

Grand bugle(F), Flügelhorn(G) **کەتە شـەیپوور لە کلیلی/***B-flat***، بووقـی گەورە. پێیشیدەوترێت ئاڵتۆ شـەیپوور***Alto-Flügelhorn***یاخود ئاڵتۆی سـادە***Simple Alto***.**

Grand cassa(I), Bass drum, Big box(E) Grosse caisse(F), Große trommel(G) **دەهۆڵی باس، کەتەدەهۆڵ کە هەردوو لای پێستە.**

Grand choeur(F), Full Choir(E) **کۆرسی تەواو و پڕ.**

Grand Détaché(F) **بڕوانە/***Détaché*.

Grandemente(I) **گەورەیی، بەشەوکەت، شـکۆیی.**

Grand flûte(F), Grösse flöte(G) **کەتەفلووت، فلووتی گەورە، پێیشیدەوترێت کۆنسـێرت فلووت***Concert flute***یاخود فلووت/ڕێ***Flute-D*.

Grande pausa(I), Great pause(E) **وچانی گەورە کە چەندین کێش پێکەوە لەخۆدەگرێت.**

Grandezza(I), Dignity(E) **شـکۆ، مەزن.**

Grandiosamente(I) بەشـێوەیەکی مەزن.

Grandiosissimo(I) زۆر مەزن.

Grandioso(I), Grandiose, Majestic(E) بە شـکۆوە.

Grand messe(F), Great mass(E) کۆنوێژی گەورە.

Grand opera(E) گەورە ئۆپێرا لەسـەر سـکێلێکی گەورە کە دەشێت بە چەشنی بێ ئاخاوتن بێت و تەنیا مۆزیکیش بە بابەتێکی تراژیکانە*Tragic subject* هاویاریتی بکات،یاخود بەچەشنێکی ستران لە شـێوەی شۆخی*Comic*.

Grand orchestre(F), Großes Orchester(G), Full orchestra(E) گەورەئۆکێسترا، ئۆکێسترایەک کە گشـت پێداویستییەکی ئۆرکێسترالی لەخۆگرتبێت.

Grand orgue(F,I), Full organ, Great organ(E) کەتەئۆرگ، ئۆرگنی گەورە.

گەورەپیانۆ، شـیپان*Shape*ێکی پان، چێوە*Frame*یەکی ئاسۆیی هەیە.

Grand(great) pause(E) گەورە وچان، وچانێکی تەواو بۆ دەستەیەک.

Grand piano(E) گەورە پیانۆ، پیانۆیەک کە ژێیەکانی بە شێویەکی ئاسۆیی بەستراون.

Grand staff, Great staff(E) گەورە هێڵاسۆ، لێکدانی کلیلی سـۆڵ/G *Treble clef*و کلیلی/F *Bass clef*هێڵاســۆیەکی گەورە پێکدێنێت




Gran tamburo(I), Bass drum, Big tambourine(E) باس دەف، دەفی گەورە.

Grappa(I) بڕوانە/*Brace*.

Grave(F,I), Low, Slow speed and solimenity, Solemn(E) گڕ، سـەنگین و زۆر نزم،

Gravement(F), Gravemente(I), Gravely(E) بە گڕی، بە سـەنگینی.

Gravicembalo(I), Harpsichord(E) ئامێری هارپسیکۆرد.

Gravissimo(I), Very low(E) زۆر گڕ و سـەنگین.

Gravitá(I), Gravity(E) گڕیی، سـەنگینی.

Grazia(I), Grace(E), Grâce(F) شـەنگی، بەخشـندەیی.

Grazioso(I), Graceful(E), Graziös(G) شـەنگ، بەخشندە، قەشـەنگی، *Graz^o^* کورتکراوەی.




Graziosamente(I), Gracefully(E) بەخشـندانە.

Great octave(E) گەورە ئۆکتاڤ، ئۆکتاڤێک لە تۆنی/دۆ $C^2$ تاکو نۆتەی تۆنی/دۆ $C^3$.

ڕەوشی نۆتاندنی سەردەمێکی زۆر دێرین کە نۆتەکان تێیدا بە ئەندازەی دوو ئۆکتاڤ نزمتر لە کلیلی دوو میانە*Interval* دەنووسرایەوە. بڕوانە/*Tablature*،

Great organ(E), Great Orgue(F) گەورە ئۆرگن،

زلەئۆرگن، زلەئۆرگ کە ***G.O***کورتکراوەیەتی.

Greek modes(E) مۆزیک دەسگا یۆنانییەکان.

Gregorian chant(E) سروودی گریگۆری. چەند سروودێکی کڵێسەیی ڕۆمان ـ کاتۆلیکە کە بەناوی پاپا گریگۆری یەکەم{590-604}ناسراوە. ئەو سروودانەیش لە چەند دەسگا*Mode*یەکدا ئاوێزێنراوە، بڕوانە/*Mode*..

Gridando(I), Shouting, Calling out(E) هاوارکردن.

Grido(I), Shout(E) هاوار.

Griffbertt(G),Finger broad(E) دەسک پەنجە، مەبەست لە ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە، چێللۆ، ساز، تەمبوور...هتد کە بە دەستی چەپ دەگیرێت و پەردەکانی لەسەر دیاریدەکرێت.

Grimmig(G), Grim, Furious(E) مۆن و ڕوگرژ.

Großer durseptakkord(G), Major seventh chord(E) کۆردی مێجەری حەوتەم.

Großer mollseptakkord(G) کۆردی مێجەر ـ ماینەر/ی حەوتەم
Major-minor seventh chord(E)

Großer ton(G), Large tone(E) تۆنی گەورە.

Große sekunde(G), Major second(E) مێجەری دووەم.

Große septime(G), Major seventh(E) مێجەری حەوتەم.

Große sexte(G), Major sixth(E) مێجەری شەشەم.

Großes intervall(G), Major interval(E) میانەی مێجەر.

Grossartig(G) بەشکۆ و مەزن.

Grosse flöte(G), Grand flute(E) کەتەفلووت.

Grosse bass geige(G), Double bass(E) دەبڵ باس.

Grosse terz, Große terz(G), Major third(E) مێجەری سێیەم.

Grottesco(I), Grotesk(G), Grotesque(F) هونەری زەخرەفە کە وێنەی مرۆڤ و گیانلەبەران و شێوەی سەیری ئەندێشەیی تری تیدا بەیدەکرێت.

Groupe(F), Group, Band(E) گروپ، باند، تیپ.

Grundakkord(G) کۆردی بنچینە کە بە ڕەگ دەسپێبکات نەوەک هەڵگێڕاو*Inverted*.

Grundbass(G), Grund bass(E) بنچینە باس.

Grundton(G), Root, Tonic, Key note(E) بناخە تۆن، ڕەگ، پایە، کلیلی نۆتە.

G-sol-re-ut(E) لە سـیسـتەمی سـۆڵـفێجدا ئاماژەیە بۆ دوو نۆتە:ـ

یەکێکیان سـۆڵـی گڕ*(G-solreut grave)***G**، ئەویتر سـۆڵـی تیژ(*Gsolreut acutum*)***g’*** .

Gruppetto, Gruppo(I) گروپۆ، جۆرێکە لە ئۆرنامێنت، بڕوانە/*Turn*.

Guerriero, Guerriera(I), Warlike(E) جەنگ ئاسا.

Guida(I), Guide(E), Guidon(F) ڕێنما، نماوەر § مەبەسـت لە نۆتانەیە کە زیاتر لە سـوژە*Sujet*، ڕشتە*Tema* و پارچە فیوگە*Fugue* کاندا بەکاردەهێنرێت. بابەتێک لە فیوگە، پێشبەری لە کانون*Canon progression*، یاخود هەر جۆرێک لە لاساییکردنەوە. هێمایەکە لە کۆتایی هێڵ یاخود پارچە مۆزیکێکدا دادەنرێت ئاماژەیەک بۆ یەکەم نۆتە لەسەر هێڵ و پەڕەی بەدوایدا.

Guido d’Arezzo(F) گویدۆ ئارێتینۆس*Guido Aretinus*ناسراو بە گویدۆ دی ئاریزۆ.ئەو مێرخاسەیە.کە بەبێ ئەو، ئەم نووسینە مۆزیکانەی کە ئێستا مۆزیکزانان و ژەنیاران بەکادەهێنرێنن بەو شێوەیە نەدەبوو. ئەو داهێنانەی بووە بنەما و ڕێسا بۆ نۆتاندنی بەرهەمە مۆزیکەکان.

گویدۆ...کەشـیـشێکی بەنێدیکتـڕەوی*Benedictine*فەڕەنسـانشـین و ئیتالیانەژاد، سـاڵی995ز لە پاریس/فەڕەنسا لەدایکبووە و ساڵی1050ز لە شاری ئاڤێللانۆ*Avellano*/فەڕەنسا بە خاکسپێرراوە.

گویدۆ...وێڕای کەشیشایەتی وەک پیشەی خۆی، مامۆستایەکی مۆزیکزان*Music theorist*، پەروەرناس*Pedagog* و کۆرس ڕاهێن بووە. لە کاتێدراڵی ئاریزۆ*Arezzo*یەکێک بووە لەو مۆزیکزانە ڕۆشنبیر و هەڵکەوتوانەی کە پەرەی بە لایەنی دیمانەی مۆزیک دەدا، زۆر بلیمەتانە و لێزانانە توانی بنەما بۆ حونجەی دەنگەکان بەهێمای Ut, Re, Mi, Fa, Sol, La دابنێت. سـەرەتای ئەمانە هەمووی لە سـەرناوی چەند سـروودێکی کاریگەری کڵێسـەییەوەڕا بەناوی*Ut queant laxis* یاخود *Hymnus in Ioannem* وەرگێراوە کە ئاخاوتنێکی خۆ بەزۆر بەندەزانینە لە دەرباری خودێ/دا و بەو ئاوازە دەنگ بەکۆمەڵە لە کڵێسەدا بە گوزارەی:ـ" ئەو خزمەتکارانەت*That(ut) your servants*کە سۆزی بەندایەتیت بۆ بڵنددەکەنەوە" توانی گۆڕانکارییەکی تەواو بکات لەم بوارەدا.

ئەو سـرۆ{ئیلهام}و داهێنانانەی....جوانکاری و والاکارییەکی زۆر گرنگ و بالا و نوێـی دا بە چەشن و شـێوە و چێوەی ڕێسایی سـرۆتە کڵێسەییەکان و بە سەرانسەری مێژووی مۆزیک.

لەو داهێنانە مەزنانەی....دانانی سیسـتەمێک بوو بەناوی سیسـتەمی دەنگ*Tone system* کە بریتیبوو لە دانانی چوارهێڵ و ڕیزبەنکردنی شەش تۆن و سـێ میانە لەسەری.

UT- Queant Laxis
RE- Sonare Fibris
MI- Ra Gestorum
FA- muli Tuorum
SOL- Ve Polluti
LA- bii Reatum

تۆنیUT دەبێتە بنەما بۆ هەموو میلۆدییەک و دەبێتە پێگەیەک بۆ پلەتۆنەکانیــتر. ئەم بیرۆکەیەی گەلاڵەکرد و ساڵی1028ز خستیە بەردەم پاپا جۆنـی نۆزدەم/*John* XIX، ئەویش پەسەندیکرد.
ئیتر هەر بەدوایدا بەرەبەرە بە ســەرانسەری ئاوروپادا بڵاوبووەوە بووە سەرەتایەک بۆ نووسینەوەی ســروودەکڵێســەییەکان.
بەدوای دوادەنگدا کە بریتیە لە ســیSe/ دەنگێکیـــتری دەخرێتەسەر کە هەر هەمان دەنگی دۆDo/دەکات بەڵام لە پلەدەنگێکی تیژدا، بەمەیش دەبێتە هەشت دەنگ کە پێیدەوترێت ئۆکتاڤOctaveواتە هەشت تاکە دەنگ. کاتی خۆی لە نزیکەی ساڵانی800زدا ئەم سـروودانە کە بەناوی کەشیش یۆحەننای موبەدان *Saint John the Baptist* ناسرابوو، ئەمیش لە نزیکەی ساڵانی799-720ز لەلایەن پارسایەکی ئیتالیایی بەناوی پاولۆ دیاکۆنۆ*Paolo Diacono*نووسرابووەوە.
گویدۆ ناوی سـرووده نۆتێنراوەکانی بەکورتکراوی هێنا و لەسـەر چوار هێڵ*4-line staff*تەریبی ئاسـۆییدا دەنگەکانی یەکبەدوایەک بەرەو نۆتەی بەرزتر دەسـنیشانکرد، هەر هێڵەیش نۆتەناوێکی گەورەسکێڵ*Major scale*ی لە سیسـتەمی سـۆڵفێج بۆ دانا تاکو گەیاندیە دواهێڵ کە گەڕانەوەیە بۆ دەنگی ســۆڵ*Sol*.
ڕیزبەندی ســروودەکانیش بەم چەشنە:ـ

. **Ut** queant laxis : That [ut] your servantsئەو خزمەتکارانەت

Ut que – ant la- xis
(C D F DE D)

. **Re**sonare fibris: May freely sing [resonare]با ڕەهایانە بسۆزێین

Re – so – na – refi – bris
(D E C DE E)

. **Mi**ra gestorum: The miraclesفەڕجوەکان

Mi – ra ges - to – rum
(E GE D E DE)

. **Fa**muli tuorum: Of your deedsلە ڕاستیەکانتدا

Fa – mu – li tu o – rum
(F G A G FDD)

. **Sol**ve poluti: Remove [solve] all stains [of sin]لابەری هەموو پیسییەک

Sol- -ve pol- lu – ti
(G AEG F G D)

. **La**bii reatum: The guilt from our stained lips [Labii],
گوناه لە لێوە پیسەکانمانەوە

La – bi – i re –a – tum.
(A G A F GAA)

. **S**ancte **I**oannes! : Saint John!بۆ کەشیش یۆحەننا

Sanc- te Jo – han-nes.
( G FD C E D)

کورتکراوەی یەکەم بریتیە لەUt و لەدواییدا بووە/Do کە کورتکراوەی دۆمینەس*Dominus*ە بەمانای مەزن*Lord*، وە هەروەها بۆ ئەوانی تریش بە کورتکراوەی La, Sol, Fa, Mi, Re کە هەندێکجار بەElaناودەبرێت.

زاراوەی ســۆڵمیزاندن*Solmization*یش لە لێکدراوی دەنگی چوارەم و پێنجەمەوە هاتووە کە بریتین لەSol-mi. لەدواییدا حەوتەم تۆن لە سـکێڵی دیاتۆنیکدا بووە دەنگێکی بەکارهێنراوی باو.

سـەرەتای واژە لاتینیەکان لە دواهێڵی سـروودەکەدا بە کەشـیش یۆحەنناکان*Sancte Ioannes*یە کە بە لێکدانی پـیتی یەکەمی هەردووکیان دەبـێتە Si کە پاشـان لە زوانی ئینگلیزیدا بووە Ti.

ئەمەیش دەقـی ســروودەکەیە:ـ

ئەو خزمەتکارانەت....بە هەنگەرەیەکی پڕسـۆزەوە.....

فەرجووی ڕاسـتیەکانت دەچڕن......

تاوان لەسـەر لێوە پیـسەکانیان وەلا دەدەن......

هاوار هۆۆۆووو.....ئەی یۆحەنناى سـپەنتا{موقەددەس}.......




ئەم داهێنانە...بووە بەردی بناخە بۆ ئەو سـیسـتەمە سـۆڵفێج*Solfege*ەی کە ئێستا بەکاردەێهنرێت.

داهێنانی ئەم سـیسـتەمەکەیش دەگەڕێتەوەبۆ لێهاتووی گویدۆ کە کاتی خۆی ڕاهێنانی بە سـروودخوانەکانی کلێسەی دەکرد بە بەکارهێنانی دەســتی کە ناسراوە بە دەستی گویدۆنی *Guidonian Hand*. هێڵکێشان و نووسین لەسـەر لەپی دەسـت...وەک یادەوەری*Memory*یەکبوو بۆ وەبیرهێنانەوەی پەردەکان*Pitches* و نووسـینەوەیان لەسـەر سـکێڵی مۆزیکەکە کە لەو سـەردەمەدا لە چوار هێڵ پێکهاتوبوو.



لەسـەر لەپی دەستدا هێڵ و نۆتەکان دەنووسرێن و لەسەر هەر گرێی پەنجەیەکیش ناوی نۆتەکان لەسەر ئاسـتە بەرز و نزمی و کلیلە دەنگەکانیان دەنووســرێن. جا هەر کاتێک پرۆڤەی بە شــاگردەکانی بکردایە بۆ ئەزبەرکردنی ســروودێک چ بە تاک و چ بە کۆمەڵ دەبوایە هەر یەکە پەیڕەوی ئەو هێڵکارییەی لەپی دەستی بکردایە تاکو بزانێت لە چ دەنگەوارێدا پەردەی دەنگی خۆی دەخوێنێتەوە.

ئەو حەوت دەنگە سـەرەکییەی کە لەنێو هونەری مۆزیکی کوردیدا باوە و بەکادەهێنرین لەسەر سـیسـتەمی ئیتالیایی و فەرەنســایی بریتین لە:ـ

دۆDo، ڕێRe، میMe، فاFa، سـۆڵSol، لاLa، سـیSe

سـیسـتەمی گویدۆن، بریتیە لە پێنج هێڵاسۆ بۆ نۆتاندنی پارچە مۆزیکێک. Guidion system(E)

Guitar(E), Guitare(F), Gitarre(G), Ghitarra(I) **گیتار، ڕچەڵەکزوانی وشەکە لە وشە لێکدراوی سانگیت***Sangeet***ی سانسکریتیەوە هاتووە کە پێکهاتووە لە سان***San* **و گیت***Geet* **یاخود گویت***Guit* **کە بەمانای یاخود سەما و ستران دێت. وشەی گیت{بڕوانە/***Beyt***} بەمانای ستران و سروود دێت، دوا وشەی تار***Tar***یش بەمانای ژێ. بەهاتنی زۆریاب بۆ هەرێمی ئەندەلوسیا و بردنی ئامێری بارباد{کە لە دواییدا بووە عوود}و گۆڕانسازی بەسەر ئامێری بارباد/دا، ناوی گیتار بە بەسەر ئەم ئامێرە نوێسازکراوەدا برا.**

**ئامێرێکی شەش ژێیی/یە میللییە لەنێو گەلی ئیسپانیا***Spain***دا، سنووقێکی دەنگبەخشی پشت پانە، ڕووی سینە و پشتەوەی بە شێوەی ئامێری کەمانچە دەچێت، دەسکێکی درێژی نەخشینی هەیە و شەش ژێی لەسەر بەستراوە. بە تێکالاندنی فلامێنکۆگیتار و کلاسیک گیتار...نیگەرگیتاری فلامەنکۆ***Flamenca negra guitar***ی لێسازکرا. ناوەکەیشی لە دارکی گوڵ***Rosewood***ەوە هاتووە کە ڕەنێگێکی تارقاوەی زۆر جوانی هەیە و پشت و لایەکانی ئامێرەکەی پێنەخشێنراوە.**

Guitare basse(F), Bass guitar(E) **باس گیتار.**

Guitare classique(F), Classic guitar(E) **کلاسیک گیتار.**

Guitar d'amour(F), Bow-guitar, Knee-guitar(E) **کەوانە گیتار، گیتارێکی شەش ژێ/یە کە بە ستوونی دەخرێتەسەر ئەژنۆ و بە کەوان لێدەدرێت. ساڵی1823ز لەشاری ڤییەنا لەلایە جۆرج ستاوفەر***George staufer***ەوە داهێنرا.**

Guitare èlectrique(F), Electric guitar(E) **کارۆگیتار. گیتاری کارەبایی.**

Guitare folk(F), Acoustic guitar(E) **گیتاری میللی{گەلەری}.**

Guitarist(E), Guitariste(F) **گیتارژەن.**

Guitar notation(E) **نۆتاندنی گیتار.کە باوترینی لە سێ جۆرەدایە:ـ**

1. **نۆتاندنی کلاسیکی***Classical notation*...**لەم نووسینەدا کلیلی تریبڵ***Treble clef* **بەکاردێت بەڵام دەنگەکان یەک ئۆکتاڤ لە نۆتەکە نزمترن.**
2. **نۆتاندنی دیاگرام کۆرد***Chord diagram notation*...**نووسینەوەیەکی سەرەتایی باوە. کۆردێک لە پەنجە هێڵ** *Grid line***ی شەش بە شەشدا پیشاندەدرێت، کۆردەکان بە هێما و دۆتەکان***Dots* **لە سەرەوەی سکێڵەکە دەنووسرێت، دەنگەکپێنراوەکان بە هێمای**X **ئاماژەی پێدەدرێت، نیشانەی لکاندن***Slur***یش بەکاردێت تاکو نۆتە لە یەککاتەکاندا** *Simultaneous notes* **پیشان بدرێن کە بە هەمان پەنجە لێدەدرێن.**

**بەگشتی...هێڵکاریی دیاگرام بۆ نۆتە نووسینەوەیەک سازدەکرێت و ئەو پێداویستیانەیش کە بەکاردەهێنرێن بە هێما ئاماژەیان پێدەدرێن.**

3. **نۆتاندنی سلاش***Slash notation*...**بەزۆری بۆ گیتاری ڕەزمگر بەکاردێت، کۆردەکان لە سەرووی سلاشەکەوە بە هێمایەک ئاماژەی پێدەدرێت و هەر سلاشەیش ژمارەی دەدرێتێ. هەندێجاریش سلاش دەبەسترێتەوە بە ملی نۆتەکانەوە تاکو جۆری ئەو ڕەزمە یاخود پەنجانە دیاریبکرێن.**

نۆتاندنی تابلاچوراTablature notation...{بڕوانه/Tablature}.ئەم جۆرە تایبەتە بەو ژەنیارانەی کە نازانن نۆتە بخوێننەوە و لە نۆتاندنەکەدا هیچ پێویستیان بە ڕەزمێکی تایبەت نیە. لەباتی کلیلی تیژTreble clef کورتکراوەیTAB.دەنووسرێت ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لێرەدا ڕەزم پیشان نادرێت. بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ژەنیارە گوێی مۆزیکی زۆر باش بێت تاکو بتوانێت لەگەڵ ڕەوشی مۆزیکەکەدا بڕوات.

Gungroos(E,Hn), Pamure, Xřxaĺ(Kr) گەنگرووس، خڕخاڵ، پامووره، ئامێرێکی زۆر کۆنی هیندییە کە بە پاوانە یاخود خڕخاڵی کوردی دەچێت و بە جووڵاندنەوەی خڕنگەی لێوەدێت.

Gusto(I), Expression, Taste(E) چێژ، چێژوەرگرتن کە هەستێکی هونەری بەرزی دەوێت.

Gustoso(I), Expressively(E) هەست دەربڕینانە.

Gut(G), Good, Well(E) باش.

Gut(E) ژێی دروستکراو لە ڕیخۆڵەی بزن و مەڕ...، بڕوانە/Catgut.

Guter taktheil(G), Accented part of the bar(E) پارچەیەکی ئاکسنتکراو لە باڕێکدا.

Gymel, Gemellus(L), Twin(E) جمک، دووانە، جۆرێک لە دوو بەشە مۆزیک، دەنگ سیستەمVoice systemێکی ئینگلیزییە کە دەگەڕێتەوە بۆ دواسەتەکانی ناوەڕاست ئەویش بە بەکارهێنانی مێجەری دەنگە سێیەمەکانThirdsو شەشەمەکانSixths.

Gypsy(E), Gitan, Tsigane(F), Gitano(I) جیپسی، قەرەچ، خەجەر. بە سکێلێکی هارمۆنیک ماینەر دەچێت بەڵام زێدە چوارەمAugement fourthی لەگەڵدایە بەم شێوەیە:ـ C, D, E$^{b}$, F$^{\#}$, G, A$^{b}$, B, C. بۆیە پێشیدەوترێت سکێلی خەجەری لەبەر دەنگە سەیر و سەرنجڕاکێشەکەی و زۆر بەکارهێنانیشی لە مۆزیکی هەنگاریدا بەدیدەکرێت.

SCALE STEPS (IN SEMITONES OR HALF STEPS)
پلە سکێڵەکان {لە نیوەتۆن یاخود نیوە پلە کاندا}

| 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| c | | d | eb | | | f# | g | ab | | | b | c' |

Gypsy scale سکێلی جیپسی

Gypsy tetrachord(E) تێتراکۆردی خەجەری کە لە تۆن بەرزکردنەوەی چوار نۆتە هەڵبەستراوە و میانەکانی بەم شێوەیە ڕیزبەندن:ـ نیوەتۆن ـ تۆن و نیوێک ـ نیوەتۆن.

*Semitone – Tone and a half – Halt semitone*

------------------------------------
----------------------
-----------



Harmonica هارمۆنیکا


هارپ گیتار
Harp guitar



چەنگ
هارپ


(Harmonium Indian)
Faqeer فەقیر

# H


Horn crook کۆڵپە هۆڕن


Hurdy-Gurdy هوردی ـ گوردی

# H

مۆزیک...بۆ هاوسۆزی و یەکگرتوویی مرۆڤ ئافرێنراوە.

لۆرانس دیورالّ

---

H(G,E) — نۆتەی ســی، حەوتەمین پلەدەنگە لە پایەتۆن*Tonic*ی دۆ/Cوە، کورتکراوەی ئامێری هۆڕن*Horn*، *Hand heel*.



Hasten(G), Hurry, Rush(E) — هەڕە، دەو، خێرا.

Hachi(I), Cymbals(E) — ئامێرێکی نەگرەیی*Percussion*ژاپۆنییە زیاتر لە سرۆتەکانی ئایینی بۆزایـیدا بەکاردەهێنرێت.

Hahenbüchen(G), Coarse, Heavy(E) — گران، زبر.

Hair(E), Chevelure(F) — یالّ، تیسک، یالّ یاخود کلکی ئەسـپ کە درێژ و توندە و لەبارە بۆ دروستکردنی کەوانی ئامێرە ژێدارەکان، لە پەشـمەشـووشـە*Fiberglass*یش دروستدەکرێت.

Halb, Halbe(G), Half(E), Semi(I,L) — نیمە، نیوە.

Halb-cadenz(G), Half-close, Semi-cadence(E) — نیوەکادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Halb-prinzipal(G), Half-diapason(E) — نیوە دیاپازۆن کە پێکهاتووە لە ئۆرگۆنی چوارفووتی پرینسیپالّ.

Halbe-note(G), Minim, Half tone(E), Minima(I), Blanche(F) — نیوەتۆن.

Halbe pause(G), Minim rest, Half rest(E)  — نیوە وچان، نیوەپشوو.

Half-diminished seventh chord(E) — کۆردی نیوەگەستووی حەوتەم، جۆرە کۆردێکی چوار دەنگیە کە لە ســەر بناخەی کۆردێکی سـیانیی گەستوو*Diminished* پێکدێت و ماینەر حەوتەم*Minor-seventh* ی دەخرێتەســەر و بەو پێیە میانە*interval* تۆنەکانیانیش دەبنە1,5-1,5-1,5.




Halb-soprano(G), Mezzo soprano(E) — میزۆ ـ سـۆپرانۆ.

Halb-tenor(G), Baritone(E) — نیوە ـ تینۆر، دەنگی باریتۆن.

Hallen(G), Clang(E) — زرنگانەوە، ترینگانەوە.

Half-cadence(E) نیوه ـ کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Half-position, Half-shift(E) نیوه ـ گوازتنەوە، نیوەپۆزیشن، گوازتنەوەی پەنجەدەستی چەپ لەنێوان گوازتنەوەی کراوە و یەکەم گوازتنەوە لە ئامێرەژێدارەکاندا.

Half-step, Semitone(E) نیوەهەنگاو، نیوەتۆن، بچووکترین میانەیە لە سـکێلێکی مامناوەنیدا*moderated scale*کە یەکسـانە بە دووەمێکی بچووک{*minor second*میانیەکی نیوەتۆن پێکهێنە} وەک:ـ $C$-$C^{\#}$ ، $E$-$E^{b}$ ، B-C.

Half-valve, Half-stop(E) نیوە دەمەوانە، کردنەوەی دەمەوانە*Valve*ی ئامێرەکانی وەک ترومپێت، هۆڕنی فەرەنسایی، کۆرنێت و تووبا لەلایەن جازژەنەکان*Jazz musician* بەکاردەهێنرێن کاتێک کە نزیک دەبنەوە لە خلیساندۆ*Glissando*بە مەبەستی گۆڕینی پلەتۆن *pitch of a tone*بەبێ ئەوەی لە نۆتەکە یاخود لە نزیکترین میانە بدات.

Haidi(Ch) هایدی، ئامێریکی هەوایی چینی جووت زمانە*Double reed*یە کە لە سـەتەی/19مدا بەشـێوەیەکی زانستی و هونەریانە پەرپێدرا و بەناوی ئۆبوا*Oboe*ی چینی بووە ئامێرێکی ئۆرکێسترالّی.

Halt, Fermate(G), Fermata(I), Pause(E) پاوس، وچان، هێواشبوونەوەیەکی بەرەو پشـــوو.

Hellelujah(Hb), Alleluia(L) ئەڵلا ئەڵلا، هەللێلویا، سترانی سـتایشکردنی خودێ.

Hammer(E) چەکوش، چەکوشی پیانۆ، دوگمەدەنگەکانی پیانۆ هەریەکەو بە چەکوشێکەوە بەسـتراوە، دەسـت بخرێتەسەر هەر دوگمەیەک بەشێوەیەکی میکانیکانە چەکوشەکە دەدات لە ژێیەکان و دەنگەکە پەیدادەبێت.

Hammerklaveir(G), Fortepiano(E) چەکوشەکاڤییر، ناوی یەکەم ئامێریکی پیانۆیە کە بووە بناخەیەک بۆ پەرەپێدانی بەو جۆر و شـێوانەی ئێسـتا لەبەر دەسـتدایە.

Hammer santur(E) پێلێدەی ســەنتوور.

Hammond electric organ(E) جۆرە ئۆرگنێکی ئەلەکترۆنیە کە لە ئامریکا دروستکراوەو زۆر رەواجی هەیە، تا ڕادەیەک بە ئۆرگنی لوولەدارە کۆنەکان دەچێت.

Handtrommel(G), Tambourine(E) گچکەدەفی ئەڵقەدار.

Hand-Aeoline(E) بڕوانە/*Konzertina*.

Hand-bell(E) زەنگی دەسـتی، لە ئامێرە نەگرەییەکانە بە چەند قەبارەیەکی جیاواز و هەر یەکەیش تۆنێکی خۆیی بۆ کۆککراوە.

Hand-horn(E) هۆڕنی دەستی، بە هۆڕنی فەرەنسـایی/یش ناودەبرێت کە ژەنیار دەسـتی دەخاتەناو زەنگەکەوە تاکو دەنگی لێوەدەرچێت.

Handharmonika, Handorgel(G), Handpiano(E) بڕوانە ئاکۆردیۆن/*Accordion* ،

Handtrommel(G), Tambourine(E) تەپڵی دەستی، گچکەدەفی زەنگۆڵەدار.

Haotong(Ch), Chinese trumpet(E) هاوتۆنگ، ترومپێتی چینی.

Hardanger fiddle(Sc) کەمانچەی میللی نەرویجـی*Norwegian folk fiddle*کە تەلێکی زیاتری لەسـەر بەسـتراوە و پانتایی دەسکەکەی کە ژێیەکانی بەسەردا دەڕوات و پەنجەی لەسەر دادەنرێت کەمێک لە کەمانچەی ئاسایی باریکترە.

Hardiment(F), Bold(E) بوێر و بێـباک.

Harmonic(E), Harmonique(F) هارمۆنیک، زاراوەیەکی پەیوەندیدارە بە زاراوەی هارمۆنیەوە، وەک دەوترێت سـکێڵی ماینەر هارمۆنی*Harmonic minor scale*.

Harmonica, Mouth organ(E), Harmonica á bouche(F) هارمۆنیکا، ئامێرێکی فووپیاکەرە.
Harmonika(G)

Harmnica de bois(F), Xylophone(E) زایلۆفۆن، هارمۆنیچێللۆ،

Harmonicello(I) ئامێرێکی پێنج جووت ژێداری دەنگ باریتۆنی/یە.

Harmonic hand(E) بڕوانە/*Guidonian hand*.

Harmonic chord(E) هارمۆنیک کۆرد، ناسـراویشە بە:ـ پیانۆ ـ کەمانچە*piano-violin*، کەمانچە ـ پیانۆ*violin-piano* و تێتراکۆردان*Tetrachordon*، ئامێری کلیلکراو *keyed-instrument*کە سـاڵی1810ز لەلایەن تۆماس کاوفمان*Thomas Kauffman*ەوە داهێنرا و تاڕادەیەکیش بە پیانۆ دەچێت، لە ڕواڵەتدا و وەک پیانۆ دەژەنرێت بەلام دەنگی وەک کەمانچەیە.

Harmonic figuration(E) ئارپیجیۆ، کۆردی شکستە و ڕیزکراو.




Harmonic interval(E) هارمۆنیک میانە، میانەیەکە لەنێوان دوو نۆتەی کۆردێک.

1 2 3 4 5 6 7 8 9 10 11 12 13
Octave, Fifth, Fourth, Major third, Minor third, Whole tone*
1200¢ 702¢ 498¢ 386¢ 316¢ 267¢ 231¢ 204¢ 182¢ 165¢ 151¢ 139¢

Whole tone: نۆتەی تەواو
Minor third: ماینەر سێیەم
Major third: مێجەر سێیەم
Fourth: چوارەم
Fifth: پێنجەم
Octave: ئۆکتاڤ

میانەکان بە سەنت لە نێوان زنجیرە هارمۆنیەکاندا
Intervals between successive harmonics in Cents
* Just or Pythagorean

Harmonic Major scale(E), Scala maggiore armonia(I) سـکێڵی مێجەر هارمۆنیک.

T-T-S-T-T-T-S{Tتۆنی تەواوە، Sنیوەتۆنە}



*Scale of F Major- Harmonic form*

سـکێڵی ماینەر هارمۆنیک، Harmonic minor scale(E), Scala minore armonica(I)

دەســگا*mode*یەکی پێکهاتووە لە بەرزبوونەوەی میانەیەکی یەکلەدوایەک:ـ

T-S-T-T-S-T+S-S{Tتۆنی تەواوە، Sنیوەتۆنە، T+Sسێ نیوەتۆنە}






*Scale of D Minor – Harmonic form*

ڕەپاتکردنەوەی هارمۆنی، کۆردالێکی کورت و ڕەپاتکراو Harmonic ostinato(E)

*Short and repeated chordal*کە پێویستدەکات بە درێژی لەگەڵ میلۆدییەکدا بەئەنجامبدرێت

هارمۆنی گەڕانەوە چەند ڕەچە*sequence*کۆرد گەڕانەوەیەکی Harmonic regression(E)

نارێسابیە کە بە پێچەوانەوەی ڕێسا تیۆرییەکانی هارمۆنی بەجێدەهێنرێت.

ڕەزمی هارمۆنیی، ڕادەی هارمۆنی گۆڕین Harmonic rhythm(E)

زنجیرە هارمۆنی. Harmonic series(E)

| زنجیرە هارمۆنیەکان<br>Harmonic series | فرەلەرزە<br>Frequency | ناساییکراو<br>Normalized | ناوی نۆتە<br>Note name | ڕێژەنزیکیی %<br>Closeness in% |
|---|---|---|---|---|
| 1 | 440Hz. | 440Hz | A | 100% |
| 2 | 880Hz. | 440Hz | A | 100% |
| 3 | 1320Hz. | 660Hz | E | 100% |
| 4 | 1760Hz. | 440Hz | A | 100% |
| 5 | 2200Hz. | 550Hz | C# | 99% |
| 6 | 2640Hz. | 660Hz | E | 100% |
| 7 | 3080Hz. | 770Hz | G | 98% |
| 8 | 3520Hz. | 440Hz | A | 100% |
| 9 | 3960Hz. | 495Hz | B | 100% |
| 10 | 4400Hz. | 550Hz | C# | 99% |
| 11 | 4840Hz. | 605Hz | D | 103% |
| 12 | 5280Hz. | 660Hz | E | 100% |
| 13 | 5720Hz. | 715Hz | F# | 97% |
| 14 | 6160Hz. | 770Hz | G | 98% |
| 15 | 6600Hz. | 825Hz | G# | 99% |

بریتیە لە چەنجای بنچینە فریکوێنسی*Fundamental frequency*کە پێیشیدەوترێت یەکەم هارمۆنیک*First harmonic*یاخود پێکهێنەر*Generator*. دامەزراندنی تۆنەکانیــتر لەســەر بناخەی بنچینەفریکوێنسـی440Hzدەبێت، واتە تۆنی لا/*A4* بە بنچینەفریکوێنسـی440Hzکە کراوەتە سـتاندەرێک بۆ تۆنەکانیتر. ئەگەر بە ئۆکتاڤێک تۆنی لا/*A4*بەرزبکرێتەوە فریکوێنسـیەکەی دەکاتە

دووجا، واته880Hz و سـێجا/یش دەکاته1760Hz....وە هەروها بۆ تۆنەکانیــتر، بەو شــێوەیە دەبێتە زنجیرەیەک لە یەکەم هارمۆنی و دووەم و سـێیەم و ....تا دواهارمۆنی.... .




کۆردی سـیانیی کە لە نۆتەی پایە و سـێیەم و پێنجەم{زاڵ} پێکدێت. Harmonic triad(E)

هارمۆنی، هاوسـازی، Harmonie(F,G), Harmony(E), Armonia(I)

گوزارە لە سـازاندنی چەند تۆنێکی جیاواز دەکات لە دەنگەوارياندا بەشـێوەیەکی هونەری هەنداز کە بە گویٚ هۆگربێت. بریتیە لە چەند میلۆدییەکی پێکەوەچنراو. زانسـتێکە لە هونەری مۆزیکدا گوزارە لە ئەزگاریی*progression* و پێکهاتە*Structure* و پەیوەندی کۆردەکان بە یەکتریوە دەکات، دەبێت ئەو پەردانەیش*Pitches* لەگەڵ یەکتر هاوکۆک و هاوسـازبن.

دوو نۆتەی هارمۆنی دەکەونە دوو بەرەوە: یەکێکیان هاوسـازەکان*Consonances*، وەک لەم نموونەیەدا:ـ




ئەویتریان ناهاوسـازەکان*Dissonances*، وەک لەم نموونەیەدا:ـ




وە هەروەها بە هەمان ڕەوش بۆ ســـێ نۆتەهارمۆنیەکان..... .

هارمۆنی چواریی. Harmonie de quartes(F), Quartal harmony(E)

هارمۆنی پێنجیی. Harmonie de quintes(F), Quintal harmony(E)

هارمۆنی دووانیی. Harmonie de secondes(F), Secondal harmony(E)

هارمۆنی سـیانیی. Harmonie de tierces(F), Tertial harmony(E)

تۆنی ناهارمۆنی. Harmoniefremder ton(G), Non-harmonic note(E)

هارمۆنێن، هارمۆنیزاندن{هارمۆنیزەکردن}. Harmonisation(F), Harmonization(E)

هارمۆنیـک کادەنس، بڕوانە/*Cadence*. Harmonic cadence(E)

هارمۆنیک مێجەر. Harmonic major(E), Harmonischer dur(G)

هارمۆنیک ماینەر. Harmonic minor(E), Harmonischer moll(G)

هارمۆنیۆم، ئامێرێکە بە ئۆرگن دەچێت، بەهۆی پێداڵ*Pedal*ەکەیەوە پێی پیادادەنرێت تاکو لە ڕێیەوە فووبکات بە زمانەکانی ناوەوەی و دەنگی لێوە دەربچێت، دەشـێت پێشیـبووترێت ئۆرگنـی زمانەدار*Reed organ*. Harmonium(E)

Harmonimeter(G,E), Hamonimétre(F) **هارمۆنیمەتر، کۆنەئامێرێکی ئاستنکراوە جاران بۆ پێوانی ئەوپەڕی ڕادەی دەنگەکان بەکاردەهێنرا.**

Harp(E),Harfe(G) **چەنگ، هارپ، ئامێرێکی ژێدارە.**

Harp Guitar(E) **هارپگیتار، ئامێرێکی فرە-ژێی دروستکراو لە ئامێری گیتار و هارپ، دوو دەسکی درێژی هەیە کە یەکێکیان شەش ژێی پێوە بەستراوە کە گیتارە، دەسکەکەی تریان حەوت ژێ کە تایبەتە بە ئامێری هارپ**

Harpicordo(I) **بڕوانە**/*Harpsichord*.

Harpiste(F), Harpist(E) **هارپـژەن، چەنگژەن.**

Hastig(G), Hasty(E) **پەلە.**

Haupt(G), Head, Chief(E) **سەرۆک، خێو، کاڵ.**

Hauptmelodie(G), The principal of melody(E) **بنچینە میلۆدی.**

Hauptmanual(G), The key board of great organ(E) **دەستاتووری زلەئۆرگن.**

Hauptnote(G), Principal note(E) **بنچینە نۆتە.**

Hauptschluss(G), Full close(E) **تەواو داخراو.**

Hauptwerk(G), Great organ(E) **زلە ئۆرگن.**

Hauptzeitmass(G), Original tempo(E) **ئۆرجیناڵ تێمپۆ.**

Hausse(F), The nut of a bow(E) **سەری کەوان.**

Haut, Haute(F), High(E) **بالا، بلند، هاوگ.**

Hautbois(F), Hautboy(E), Hoboe(G), Oboe(E,I) **ئامێری ئۆبوا.**

Haut instruments(E) **ئامێرە بالا دەنگەکان وەک زڕنا و شەیپوور...و مانەندیان.**

Haut-contre(F), High tenor voice, Alto, Contralto voice(E) **بالادەنگی تینۆر ، دەنگی تینۆرنما***Leading tenor***لە ئۆپێرای هەگبەی باڕۆک***Baroque***دا.**

Hauteur(F), Pitch of tone(E) **پەردە***Pitch***ی تۆن.**

Haut-dessus(F), High soprano(E) **سۆپرانۆی بالا..**

Haut-taille(F) **بڕوانە**/*Taille*.

H-dur(G) **بڕوانە**/*B-major*.

Head(E), Tête(F) **سەرەدار***Stick***ی تایبەت بۆ لێدانی تەپڵ، بەشە پێچەک** *Scroll***ی ئامێری کەمانچە کە پێیدەوترێت سەرەپەنجە.**

Heckelfon, Heckelphon(G), Heckelphone(E) **هێکلفۆن، ئامێرێکی فووپیاکەری جووتـزمانەی جێپەنجە ئۆبوا/یە، ئۆبوا باریتۆن.**

Heel(E), Alinea(I), Alinéa(F) **پاژنە{پاژنەی کەوان، ئەو سەرەی کە پێیـدەگیرێت}.**

Heftig(G), Violent(E,F**),** Violento(I) **سەخت، توند.**

Hiess(G), Hot(E**),** Brûlant(F), Torrido(I) **گەرم.**

هێلیکۆن، سـۆزافۆن، باس تووبا لە سـی ـ بیمۆڵ/*B-flat*. Helicon, Sousaphone(E)
سـاڵی1845ز لەلایەن ژان فیلیپ سـۆزاJ.P.Sousa داهێنرا.

ڕۆشن و درەخشان. Hell(G), Clear, Bright(E), Clair(F), Brillante(I)

هەڵپەڕکـــێ، HeĺpeřkéSema(Kr), Dance(E)

سـەما...یاخود زوانـی جووڵە و بزواندن، هەست دەربڕین بە بزواندنی ئەندامانی بەژن. پەیوەندی بە دیاردەیەکی ڕاسـتەقینەی ژیانی مرۆڤەوە هەیە، جۆرە مۆتیڤ*Motive*ێکە کە لە ناخی ڕۆحی مرۆڤدا پەنگ دەخواتەوە، دەیەوێت بجۆشـێت و لەو پەنگی/یە ڕەها بێت، ڕەهابوونی بە زوانێکیـتر نەوەک زوانی وتار و هەڵبەست، بەڵکو زوانی بزواندن و ڕاتەکاندنی گشت ئەندامانی بەدەن بۆ گوزارەکردن لەو مۆتیڤە. دەشێت بە لێکدانەوەیەکی ئاوروپاییانە پێیـبوترێت کورتە باللێ/یەکی میللی.... .

سـەما....لەو کۆڵەکە سـەرەکیانەیە هونەری میللی کوردی لەسەر بەندە. هەر لە سەردەمانێکی زۆر مێژینەوە ئاوێزەی سـروشتی ژیانی ڕۆژانەی بووە. بۆ سـەلماندنی ئەو ڕاسـتیەیش بوونی ئەو وشـە هاوتایانەیە کە گوزارەی پێدەکرێت وەک دیلان، هەڵپەڕکێ، دەبکە...یاخود ئەو وشانەیـتر کە سـەما توخێکی سـەرەکییە لە پێکهێنانیاندا وەک شـایی، چەمەری، زەماوەند{سـەماوەند}، گۆڤەند، ڕەشـبەڵەک...هتد. بەڵام زیاتر وشەی هەڵپەڕکێ و ئەوانیـتر زیاتر لە وشەی سەما لەسەر زمانە لەنێو خەڵکدا. بەڵام لە بواری ئایینیدا هەر بە سـەما ناودەبرێت، ئەگەرچی لە ئیجازە پێدانی مەلای دوانزە عیلمدا ئاهەنگ دەگێڕدرێت و بەشداربوان بە چەند هەڵپەڕکێیەکی ئاسایی خۆشی و شادی خۆیان دەردەبڕن. لێرەدا پێویست دەکات هەندێک وشە وەک زاراوە لەم بوارەدا لێکبدەینەوە:ـ

هەڵپەڕکـــێ... لێکدراوە وشەیەکی کوردییە کە لە هەڵ ـ پەڕ ـ کـێ پێکهاتووە. پێشگری هەڵ لە زۆر وشەی کوردیدا بەرچاودەکەوێت کە گوزارە لە جووڵەیەکی بەرزبوونەوە دەکات وەک هەڵچوون، هەڵبەز، هەڵکشان....،پەڕ{کە زۆر مانای تری هەیە}بەمانای پەڕین لەجێگەیەک بۆ جێگەیەکیـتر بەشـێوازێکی جۆش و خۆڕاتەکان، پاشگری کـێ/یش وەک چاووگێک گوزارە لە زاراوەیەک دەکات وەک پێشبڕکـێ، خۆبڕکـێ و چەندین نموونەیـتر.

دەبکە/یش وشـەیەکی کوردییە لە دەپ یاخود دەب/ەوە هاتووە کە بەمانای دەنگی زرمە دێت، وەکی دەوترێت: گوێم لە تەپەیەکە، یاخود دەڵێت گوێم لە تەپەی پێ/یەتی. جا لەبەرئەوەی پیتی پـ لە زوانی عارەبیدا نیە بۆتە پیتی بـ ، واتە لەبری دەپ دەوترێت دەب. پیتی کە/یش کە وەک زاراوەیەک بۆتە پاشگری گوزارە لە چاووگی وشەکە دەکات. کە کورد دەڵێت دەبکە یەکسەر مەبەستی لە هەڵپەڕکێ/یە. ئەو ناوچە عارەبانەی نزیکن لە کوردەوە ئەم وشەیان وەرگرتووە و لەبری رقص بەکاریدەهێنن.

گۆڤەند/یش هەر وشـــەیەکی کوردییە بە گۆبەند، کۆبەند..کۆوەند هاتووە کە گوزارە لە کۆبوونەوەیەکی ڕیزبەندە بۆ کارێکی گرنگی وەک بەمانای شـایی و زەماوەند. ڕیز بەندییەکی بەکۆمەڵ یاخود بڵێین هەڵپەڕکێیەکی بە کۆمەڵی دەسـت لەنێو دەسـت کە هەر باوە لە ڕەوتێکی بازنەییدا بێت.

ڕەشبەڵەک Reşbeĺek...وشە لێکدراوێکی پێکهاتووە لە ڕەش کە لێرەدا بەمانای تێکەڵێکی زۆر و بەڵەک یاخود باڵاک واتە گەورە و فراوان . ئەمەیش هەڵپەڕکێیەکی تێکەڵە لە هەردوو ڕەگەزی نێرومێ بە گەورە و بچووک. چەشنە هەڵپەڕکێیەکیش هەڵدەبژێردرێت کە بۆ هەموو سووک و ئاسان بێت وەک هەڵپەڕکێی چەپێ کە جۆرێکی ناسکە و زیاتر خانمان هۆگریەتی.

دیلان...ئەمیش بە لاوژەی کوردستانی باکوور هەر مانای هەڵپەڕکێ دەبەخشێت.

ئەمانە بەگشتی هەمووی سەربە جۆرە هونەرێکن کە پێیدەوترێت هونەری سەما.

لە هەر لەم تێڕوانینەوەڕا دەشێت هەڵپەڕکێی کوردی بۆ دوو جۆر بپۆلێنرێت:ـ

1. هەڵپەڕکێی نەرمە جووڵە و بەڕەوت کە بەزمێکی سووک و لەسەرخۆیە.
2. هەڵپەڕکێی بە جووڵەی خێرا کە بەزمێکی کرژ و توندە.

زۆر لەو هەڵپەڕکێیانەیش وێڕای ئەوەی کە بەرگو پۆشاکی تایبەتی خۆی هەیە. بۆنە و سرۆتی تایبەتی خۆیشی هەیە، لە زۆر بواردا ستران و هەندێک ئامێری میللی/یش هاویاری ئەم هەڵپەڕکێیانەن بەتایبەتی دەهۆڵ و سورنا و چەپڵە، ئینجا ساز و بلوێر و دەف و نەقارە. جاروبار لە گەرمەی هەڵپەڕکێکەدا قریوە یاخود هەلهەلە بەرزدەبێتەوە کە گوزارە لەوپەڕی خۆشی و خرۆشی دەکات. ئەو هەڵپەڕیوانەیش کە جڵەوی بازنەکەی بەدەستە پێیدەوترێت **سەرچۆپیوان** یاخود سەرچۆپیکێش. لێرەدا پاشگری کێش دوو مانا دەبەخشێت، یەکەمیان ڕاکێشانی بازنەی هەڵپەڕکێکە بەرەوپێشەوە و ئەیتریان ڕاگرتنی ڕەزم و بەزمی هەڵپەڕکێکە بەشێوەیەک کە هاوسەنگی تێکنەچێت چونکە زۆر جاری وا دێتەپێشەوە کە دەستگرانی هەڵپەڕکێ زۆر دەبن بەتایبەتی لە ڕەشبەڵەکدا کە لە سەد کەس زیاتر بەشداری هەڵپەڕکێکە دەبێت. ئەو کەسەی کە دەکەوێتە دوا ڕیزی هەڵپەڕکێکە پێیدەوترێت **گاوان** کاری ئەویش ئەمسەری ڕیزەکە دەگرێت تاکو قەفی زنجیرەی هەڵپەڕکێکە و بەزمەکەی تێکنەچێت چونکە جاری وا پێویست دەکات کە سەرچۆپیکێش دەست لە ڕیزەکە بەربدات و جووڵەی جوان و شۆخوشەنگی بنوێنێت و پاشان بێتەوە سەر چەشنی هەڵپەڕکێکە. لێرەدا گاوان تاڕادەیەک شیرازەی ئەمسەری ڕیزەکە ڕادەگرێت. جاری وایش دێتە پێشەوە کە ئەوەی هەڵپەڕکێ نەزانێت دەیخەنە دواییەوە کە شوێنی گاوانە بۆ ئەوەی پێشەنگی هەڵپەڕکێکە تێکنەچێت.

زۆربەی هەرە زۆری هەڵپەڕکێی کوردی گوزارە لە خۆشی و شادمانی و شەیدایی بۆ جوانی سروشتی کوردستان دەکات. دەشێت هەر شەیدایی ئەو جوانیە بێت لەنێوان دڵی دڵدار و دڵبەرێکدا ئارامی گرتبێت و بە ئەڤینی ڕەنگی دابێتەوە.

لەو ئاهەنگ و بۆنانەی هونەری هەڵپەڕکێی تیادا دەکرێت:ـ

بۆنەی ئایینی و کار:ـ لەبری ئەوەی دەست بەرزبکرێتەوە بۆ دەرباری خودێ و بە زاری سەرزمان سوپاس و ستایشی بکرێت، بە جۆرە هەڵپەرکێیەک هەست دەردەبڕدرێت وەک لە بەزمی هەڵپەڕنێی هەوشار کە لەسەر خەرمان بازنە دەبەستن و بەدەوری خەرمانەکەدا دەسووڕێنەوە و لە تەواوبوونی هەر سووڕێکدا سەماکەران هەموو پێکەوە کڕنووش دەبەن و سەری بەندەیی و

سـوپاسـگوزاری بۆ خودێی بە ڕۆز و فەڕ بەخش دادەنەوێنن. یاخود هەڵپەڕکێی ناسک {زوهد}ی لە ناوچەی هۆرامان لە جەژنی پیرشـالیاردا دەکرێت کە جۆرێکە لە زیکر و حاڵ لێهاتن.

بۆنەی شـین و چەمەری...زیاتر لەنێو ئافرەتاندا باوە، ئەویش بەبێ ئەوەی دەستبگرن بەڵکو بە بەزمێکی تایبەت دەکەونە لاوانەوە و خۆلێدان و سـنگکوتان و هەلەکەسەمایەکی هەڕەمەکیانە، لەنێو هەندێک خێڵاندا ئامێری دەهۆڵ یاخود نەقارە بەکاردەهێنرێت.

بۆنەی شەڕوشۆڕ...کە نێگارێکی جەوامێری و نەبەردی دەنوێنێت وەک هەڵپەڕکێی زەنگی و کۆتایی پێهاتنی بە هەڵپەرکێی شـەلانە کە لە ناوچەی سـنە باوە.

زۆری تریش هەیە وەک بۆنەی شـایی و زەماوەند و خەتەنەسـووران، خەنەبەندان، یادی نەورۆز جەژنی نەتەوەیی کورد.

ئیتر ئەمانە و چەندین و چەندین چەشن و بۆنە هەیە کە هەڵپەڕکێی تیادا دەکرێت، بەڵام زوربەی زۆری ئەو هەڵپەڕکێـیانە گوزارە لە خۆشی و شادی، جۆش و خرۆشی دەکات. لەوانەیش کە زۆر لەنێو کوردەواریدا باوە ئەمانەن:ـ گوڵشێنی، بابلۆکان، یارگولـێ، کۆچەری، شەنگاری، مامـهەباسی، هەڕە گمگم، سـێپێیی، چەپـی، سـوێسکەیی، حیلانێ، فەقیانی، سورانی، هەیشۆکێ، ڕاست، چۆپـــی، چەپـــی، بەروپشت، سەنگین سێ، ڕەزایی، شـانەشەکـی، فەتاحـپاشایی، شێخانی، ملانی، سێـگاڤ، بێستانی.... .

Hemidemisemiquaver(E), Semi-biscroma(I) نۆتەی چوارلاچنگ، 1/64ی نۆتەی تەواو.

Hemidemisemiquaver rest(E) وچانی چوارلا چنگ، وچانی1/64ی نۆتەی تەواو.

Hemidiapente(Gr), Imperfect fifth(E) پێنجەمی نادروست.

Hemiditone(G), Minor third(E) ماینەری سـێیەم.

Hemitone, Hemitonium(G), Semitone(I), Half-step(E) نیوپەردە، نیوتۆن.

Hemiola(E), Hemiole(G), Emiola(L) هێمیۆلا، ڕیشە پەڤێکی یۆنانییە بەمانای یەک و نیوێک*One-and-a-half*دێت، پێیشیدەوترێت ڕەزمی تێپەڕیو*Cross-rhythm*، نموونەیەکی ڕەزمیە کە تیایدا دوو نۆتە لە کاتێکی بەشکراودا بە سـێ نۆتە بژەنرێت، یاخود سـێ نۆتە لە کاتێکی دوو نۆتەییدا بژەنرێت کە پێشیدەوترێت تریپلێت*Triplet*، بۆ نموونە لە ڕەزمێکی3/4 دا دوو باڕ لە سێ نیوە*Three minims* دروست دەبێت.ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن:ـ






Heptachord(E) حەوت تۆنیی، وەک سکێڵە لە مێجەر و ماینەرەکان*Major and minor scales*.

**حەوتدەنگی، ســکێڵ حەوت تۆنەکان.** Heptatonic, Seven-tone scales(E)

**ســکێڵەکانیش بریتین لە:ـ**

1.**سـکێڵی مێجەر ئایۆنیەن***Major Ionian*:-



**میانەکان***Intervals***یشی پێکهاتوون لە** M2, M2 , m2, M2, M2, M2, m2.

**دەروازەی میانەکان***Interval legend***یشی ئەمانەن***d=diminished, m= minor, M=Major*
*A= Augmented, dA= Doubly augmented*

**سـکێڵی بەرەوخوار***Descending scale***ی هەمان سکێڵی بەرەو ژوورە***Ascending scale*.

2.**سـکێڵی سروشتە ماینەر**{**ئایۆلیەن**}*Natural Minor, Aeolian*:ـ



**میانەکان***Intervals***یشی پێکهاتوون لە** M2, m2, M2, M2, m2, M2, M2.

**سـکێڵی بەرەوخوار***Descending scale***ی هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە***Ascending scale*.

3.**مێجەر میلۆدی بەرەو ژوور** *Ascending Melodic Major*:ـ



**میانەکان***Intervals***یشی پێکهاتوون لە** M2, M2, m2, M2, m2, M2, M2.

**سـکێڵی بەرەوخوار***Descending scale***ی هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە***Ascending scale*.

**لە ماینەر سـکێڵی میلۆدی***Melodic minor scale***دا پلەکانی شەشەم و حەوتەمی دەسگای دیاتۆنیک ئایۆلین تیژن، بەڵام لە ماینەر سکێڵی میلۆدی***Melodic major scale***دا پلەکانی شەشەم و حەوتەمی دەسـگای دیاتۆنیک ئایۆلین پانۆک***Flat***ن.**

4.**ماینەر میلۆدی بەرەو ژوور***Ascending Melodic Minor*:ـ



**میانەکان***Intervals***یشی پێکهاتوون لە** M2, m2, M2, M2, M2, M2, m2.

**ماینەر سـکێڵ میلۆدی بەرەو خوارە***Descending Melodic minor scale*،**هەمان ماینەرسـکێڵ سروشتی/یشی بەرەو خوارە***Descending Natural minor scale*.

5.**سـکێڵی نۆتەی تەواوی گەسـتوو**{**گۆڕیو**}*Diminished Whole Tone(Altered)*:ـ



**میانەکان***Intervals***یشی پێکهاتوون لە** m2, M2, m2, M2, M2, M2, M2.

سـكێڵی گۆڕپو بریتیە لە میانەی حەوتەم لە ماینەر سـكێڵی میلۆدی بۆ/$D^b$ی ماینەر میلۆدی{كە پێكهاتووە لە $D^b$, $E^b$, $F^b$, $G^b$, $A^b$, $B^b$, C, $D^b$}. حەوتەم دەسـگای بریتیە لە تۆنی دۆ/Cگۆڕپو{كە پێكهاتووە لە C, $D^b$, $E^b$, $F^b$, $G^b$, $A^b$, $B^b$, C}.

سـكێڵە*Scale*كە هەردوو ماینەر سـێـیەم*minor third C-$E^b$*ی هەیە، چونكە تۆنی/$F^b$یەكسانە بە/E. سـێـیەمی گەورە*major third* لە جاز*Jazz*یشدا سـكێڵی گۆڕپو*Altered* لە سەروو كۆردەكانی زاڵ حەوتەمدا دەژەنرێت.

6.سـكێڵی لیدیەن بیمۆڵ/7{لیدیەنی زاڵ}*Lydian flat/7(Lydian dominant)*:ـ



میانەكان*Intervals*یشی پێكهاتوون لە:ـ M2, M2, M2, m2, M2, m2, M2 .

ئەم سكێڵە بریتیە لە چوارەم دەسـگای ماینەر سكێڵی میلۆدی.

7.سـكێڵی هارمۆنیك ماینەر *Harmonic Minor*:ـ



میانەكان*Intervals*یشی پێكهاتوون لە:ـ M2, m2, M2, M2, m2, A2, m2.

سكێڵی ماینەر هارمۆنیكی بەرەو خوار هەمان سكێڵی بەرەو ژوورە.

8.سـكێڵی دەبڵ هارمۆنیك مێجەر*Double harmonic major*:ـ



میانەكان*Intervals*یشی پێكهاتوون لە:ـ m2, A2, m2, M2, m2, A2, m2.

مێجەرسـكێڵی دەبڵ هارمۆنیكی بەرەو خوار هەمان سكێڵی بەرەو ژوورە.

9.ماینەر سـكێڵی دەبڵ هارمۆنیك*Double Harmonic Minor*:ـ



میانەكان*Intervals*یشی پێكهاتوون لە:ـ M2, m2, A2, m2, m2, A2, m2.

ماینەر سكێڵی دەبڵ هارمۆنیكی بەرەو خوار هەمان سكێڵی بەرەو ژوورە.

10.سـكێڵی دۆریەن *Dorian*:ـ



میانەكان*Intervals*یشی پێكهاتوون لە:ـ M2, m2, M2, M2, M2, m2, M2.

سـكێڵی بەرەو خوار هەمان سـكێڵی بەرەو ژوورە.

11.سـكێڵی فریجیەن *Phrygian*:ـ



میانەکان*Intervals*یشـی پێکهاتوون لە:ـ  m2, M2, M2, M2, m2, M2, M2.

سـکێڵی بەرەو خوار هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە.

12 سـکێڵی لیدیەن*Lydian*:ـ



میانەکان*Intervals*یشی پێکهاتوون لە:ـ  M2, M2, M2, m2, M2, M2, m2.

سـکێڵی بەرەو خوار هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە.

13. سـکێڵی میکسـۆلیدیەن*Mixolydian*:ـ



میانەکان*Intervals*یشی پێکهاتوون لە:ـ  M2, M2, m2, M2, M2, m2, M2.

سـکێڵی بەرەو خوار هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە.

14 سـکێڵی لۆکریەن{هایپەرئایۆلیەن}*Hyperaeolian*:ـ



میانەکان*Intervals*یشی پێکهاتوون لە:ـ  m2, M2, M2, m2, M2, M2, M2.

سـکێڵی بەرەو خوار هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە.

Hervortretend(G), Emphasised a melody(E) پێداگرتن لە میلۆدیەک.

Herabstrich(G), Down-bow(E) داخشـاندنی کەوان لەسـەر کەمانچە و ڤیۆلا.

Heraufstrich(G), Up-bow(E) هەڵخشـاندنی کەوان لەسـەر کەمانچە و ڤیۆلا.

Hesar, Ĥesar(Ar,Kr,Tr) هەسـار، حەسـار.

یەکێکە لە دەسـگاوازەکانی زانا سـەفەدینی ورمێیی و هەر بەخۆیشی ئەم ناوەی بۆ داناوە.

لە لێکدانەوەی زوانەوانیەوەڕا....وشەی هەسـار بەو کات و دەمە دەوترێت کە ئاوهەوایەکی سازگار و پڕئاودار و پڕخێروبەرەکەت بێت. لە کوردەواریدا هەفتەگارێکی وا لە سـەرەتای مانگی نەورۆزدا بەناوی هەفتەی باشمباز(یاخود باسـمباز) کە هەفتەبارانێـکی ئاڤـدارە، مزگێنەبەخشی خۆشـی و بوژانەوەی ژیانە. ئەم دیمەنە دلڕفێنە پرجوان و ڕازاوەیە لە هزرو ئەندێشەی ئەم زانایەدا نەخشێنراوە و بەشێوەیەکی ئاواز گوزارەی لێکردووە. هەر بۆ کوردێتی وشەکە دەبینین کە هەندێک ناوچە ناوی هەسـار/ی لێنراوە وەک چیای هەسارڕۆست(کراوە بەحصار ُست) کە وشـە لێکدرای هەسـار ڕۆسـت/ە واتە زنجیرە چیایەکی هەمیشە کوێستان و سـازگاز.

هەسـار...بەشێکە لە دەسـگای حیجـاز. سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ
گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی.
سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشـی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی دووگا.



هێرتز، یەکەی پیوانەی فریکوێنسـیFrequencyیە کە شـەپۆلی دەنگەکە بە Hz Hertz(E)
سـیمبۆڵدەکرێت. داهێنانی زاراوەکەیش دەگەڕێتەوە بۆ فیزیکزانی ئەڵمانیای هێنریک ڕۆدۆڵف هێرتز *H.R.Hertz* (1857-1894)کە بۆ یەکـەم جار شـەپۆلەڕادیۆ*Radio waves*یيـەکانـی بە ڕێگەیەکی سـازکردانە*Artificially*دانا، بۆ نموونە مەودای گوێـبیستنی مرۆڤ دەکەوێتە نێوان20Hz بۆ 20KHz(20,000Hz) .

هێترۆفۆنیی، تۆنی ناگونجاو، Heterofonie(G), Hétérophonie(F), Heterophony(E)
زاراوەیەکی فەیلەسـوف ئیفلاتونـە کە گوزارە لە بەجێهێنانی هاوکاتیی دوو میلۆدی جیاواز دەکات.

هێکساکۆرد، ڕیشەپەیڤ*Hexachordum*ێکی لاتینییە کە لە شەش نۆتەی Hexachord(E)
یەکلەدوایەک پێکهاتووە و بە تۆنیکی تەواو*Whole-tone*یاخود نیوەتۆن*Semitone* جیادەکرێنەوە، سـێ جۆر هێکساکۆردیش هەیە کە بریتین لە:ـ
یەکەم:ـ زبر و گەورە*Hard or Durum* لە تۆنی سۆڵ/*G*ەوە، وەک *G, A, B-natural, C, D, E*.
دووەم:ـ سـادە و سـروشت*Natural* لە تۆنی دۆ/*C*وە، وەک *C, D, E, F, G, A*.
سـێیەم:ـ نەرم و ناسک*Soft or molle* لە تۆنی فا/*F*وە بەڵام سـی ـ بیمۆڵ بەکاردەهێنرێت، وەک *F, G, A, B-Flat, C, D*

Hewshar, Hewşar(Kr), Abşar(Ar,Fa) **هەوشـــار**

**خۆزگە جوانیەکەم ئەگەڕایەوە دەردی پیریم بۆی ئەگێڕایەوە**

**دڵســۆز، لەدەنگی:علی مەردان**

**وشەیەکی لێکدراوە، بریتیە لە هەو یاخود هاو لەگەڵ شــار. هەو، هاو بەمانای خۆر یاخود ڕۆشناییەکی زۆر بەتینی وەک خۆر یاخود ئاگر وەک سیمبۆلێکی ڕۆشنایی. لە هەندێک جاردا بەمانای زۆر بەرز و بڵند و پیرۆز دێت. ئەم وشەیە لە زوانی کوردیدا زۆر بەرچاودەکەوێت وەک هەولێر، هۆرامان، هۆرێن.و...هیتر. وشەی شـار/یش بەمانای ناوەندێک لە کۆمەڵە خەڵکێک تێدا نیشتەجێ بوون. کۆی وشـەکە شـاری پیرۆز و سـپەنتا دەگرێتەوە، یاخود ناوەندێکی زۆر بەرز و پیرۆز کە لە بۆنەیەکدا ئاپۆرەی خەڵکی تێدا کۆبوبێتەوە. مێژووی دێرینی کوردســتان ئاماژە بۆ ئەوە دەدات کە ناوچەیەک هەیە بەناوی هەوشــار لە دەوروبەری ســاینقەڵا. لەم ناوچەیەدا ئاسەواری هورمزگای گەنج شـیز/ی لێوەنزیکە، کاتی خۆی گوندێک بووە و دەیشڵێن گوایە زادگای زاردەشت/ە کە کەوتۆتە ناوچەی تیکان تەپە و ئێســتا پێیدەڵێن تەختی سلێمان.**

**ئەم جێگایە گوایە پیرۆزترین و پاراوترین جێگەیەکی پەیڕەوانی زاردەشـــتییان بووە. لەم ڕێزگرتن و پیرۆزڕاگرتنەوەیرا....پێدەچێت وەک ئەرک و بۆنەیەکی ئایینی لە وەرزێکی تایبەنی و دیاریکراودا پۆل پۆل پەیڕەوانی و مریدانی سـەردانی ئەم ڕووگەیەیان کردبێت و هەر لەو شـوێنەیشـدا بە سرۆتە ئایینیەکی تایبەت و بەزم و ئاهەنگێکی خۆشـوڕازاوە و ســازکردنی خوانی جۆراوجۆری سازکراو لە گەنم، یادی سـاڵگەردی ئەم پەیامبەرەیان کردۆتەوە.**

**وەک نەریتێکی زۆربەی ئەو ئایین و ئایینـزایانەی کە لەنێو میللەتاندا لەبەرچاوە، لە ڕۆژێکی وا پیرۆزدا زۆر ســروود و ئاواز دەچرِڕێت و لەدوایشـدا کە هەموو دڵوهۆشیان پڕدەبێت، بە نەوایەکی پڕســۆز و گاریگەر تایبەت بەو ڕۆژە کۆتایی بە سـرۆتەکە دێت.**

**لەم بۆچوونەوەڕا...دەشێت لای زاردەشـتیان، لەنێو ئەو هەموو ئاوازانەدا کە زۆر کاریگەرتر و دیارتربوبێت ســروودی هەوشـــار بووە. هەر بەدەم ئەم ســروودەوە پەیڕەوانی دەکەونە جۆرە سـەمایەکی وەهاوە کە لای دەروێشــانی ئێســتا بە حاڵگرتن ناودەبرێت. جا کاتێک کە دەروێش دەکەوێتە یادەوە(زیکر) حاڵ دەیگرێت و دەگاتە ئەوەی بکەوێتە وەشت و هەلەکەسەما.**

**لەوانەیە ئەم جۆرە نەریتە کە تائێســتا لەنێو دەرویشــانی کوردســتاندا پەیڕەودەکرێت، بگەڕێتەوە بۆ ئەو ســەردەمە دێرینە بەڵام بە دیدە و ڕێبازێکیتر.**

**هەوشــار...لە وەرزی خەرمان(گەنمی ســوور)هەڵگرتندا، هەمووان لەدەوری خەرمانەکە کۆدەبنەوە. لە بازنەیەکی تەواودا دەسـتدەخەنە سـەرشـانی یەکتر و دەکەونە ســەما و هەڵپەڕکێیەکی نەرم، لە تەواوبوونی هەر سـوورِێکیشـدا سـەر دادەنەوێنن و کڕنووشبردن بۆ سـوپاسـگوزار دەربڕین بۆ ئاهۆرامزدا{خودێی تەعالا} بۆ ئەو خێر و ڕۆزەی کە بەخشیویەتی.**

**ڕەنگبێت هەوشــار هەر لەو ســرووده هاتبێت بەڵام سینەبەسـینە و زاربەزار گۆڕانی بەسەردا هاتبێت و بوویێتە ئەو ئاوازەی کە ئێستا بە لقێک لە دەسگای ســێگا دادەنرێت.**

ئەم هەوایە...لقێکە لە دەســگای ســێگا، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ  ڕەگەزی ســێگای ســیانیی لەســەر پلەتۆنی ســێگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا. ســکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی حوسێنی، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




هەیتوهوت، گێلگێلە، ئامێرێکی میللی ڕەزمیـیە Heytuhut, Gélgéle(Kr)

حەیران، یاخود بەیتی حەیران. وشەزاراوەیەکی ڕەسەنی کوردیێنکراوە. Ĥeyran(Kr)

هەوایەکی زۆر دێرنە و لەوانەیە زۆر لە ناوەکەی کە حەیرانە کۆنتر بێت دەشێت بە چەند گوزارەیەک لێکبدرێتەوە....گیرۆدە و ســەرسوورمان و وێڵ و شەیدای ئاوهەوا، ئاخ و دەشـتودەر، ڕەز و مێرگوزاری کوردسـتان ئاوێزاو بە ئەوینێکی پاکوبێگەردی قەتیسماو لە دڵودەروونی دڵبەر و دڵدارێکی شـەیدا بە یەکتر کە بە هەوایەکی بەســۆز و ســازگاری هەڵبەسـتراو بۆ یەکتر بڕازێن.گوزارە لە ڕەوشـت و ئاکار و ڕووداوی ژیان لە هەموو ڕوویەکەوە. گێڕانەوەی پەیوەندی نێو خێزان و تیرە و هۆز, چۆنیەتی داب و نەرێت و شـێوەی شـەڕ و کێشـە ئازایەتی، دۆسـتایەتی و لێکدابڕان...وە هەروەها

بەیتی حەیرانۆک...نازندە و خنجیلانکردنەوەی حەیرانە، تایبەتە بەدەنگی خانمان بۆ پیاهەڵدانی لاوی شـۆخوشەنگ و ئازا و دلێر و مانەندیان.

لە ڕووی هونەرییەوە....بەگشتی، لێڕشتەیەکی سـەربە دەســگای بەیاتە. بە دەگمەن لەسەر هەوای حیجاز/یش دەربێژرێت ئەویش دەکەوێتەسەر لێهاتوویی حەیرانـبێژەکە.

بەگشتی...بە دوو چەشن حەیران دەبێژرێت:ـ یەکێکیان تایبەت بە کۆڕ و دیوەخانان کە نەرمەنگیکی ئارامی هەیە، بگونجێت بۆ جێگایەکی داخراوی وەک دیوەخان:ـ



ئەویتریان حەیرانی هەوایی/یە کە پێویستی بە دەنگێکی زولاڵ هەیە، لەبەرئەوەی کە تایبەتە بە دەشـت و دۆڵونشێوان و کەژ و چیایان. دەستەی ڕەوەندان بۆ لەوەڕ و کەندنی شــینەگیای بەهاران ڕوودەکەنە هەوارگەیان، لەوێندەرێ بەدەم ڕێوە دەکەونە چڕینی حەیران، هەم بۆ ڕەهابوونی ڕۆحی پاراویان و ئاوێزبوونی بەو سـروشتەجوانە خودێکردەیە و هەم بۆ ئاگابوون لەیەکتری. یاخود بانگوهاوار بۆ ڕەوەندان دەڤەرەی نزیک وەکی بڵێیت هۆو....وا لێرەدا ئێمەیش هەین. ڕێدەکەوێت چریکە دەنگێکی زولاڵی خۆش لەنێویاندا بڵند ببێتەوە و شــەپۆلی بدات بەگوێی کیژە نەوبەهارێکی ناسکدا بەشەیدای ئەو دەنگە گرفتاری ئەوینی ببێت.



دێرینی ئەم جۆرە بەیتە...پێدەچێت هەروەک ئەوانیتر لە ڕۆحێکی ئایینیەوە چەکەرەی کردبێت و پاشـان بەرەبەرە ڕووبەڕووی جیهانی سروشت بووبێتەوە و بۆنەیتری لەخۆ گرتبێت. وەک ئەڤینی، نامۆیی و دابڕان لە خزموخوێش، پیری و ترسی بەرەو مردن، ڕووداوی مێژوویی و داستانی شۆڕەسواران و نەبەردان و لاوانەوەیان....هتد.

ئەمەیش نموونە بەیتێکی ئەویندارییی محمودی سەید بەسێ{1807-1918}ی حەیرانبێژە کە دەڵێت:

کیژ دەرێ:ـ کوڕە حەیران هەردووچاوەکەم، ئەمن نێچیری توومە لەناو خەلک و عالەمی گوندی خۆمان پەلامارم ماوێ.
ئەمن هەر دەگرم جەڕێ خۆ دەچمە سەرکانی بەرماڕێ
کورە حەیران هەردا چاوەکەم
دەوەرە هەر لە بۆ خۆتم بگرە بە تۆڕ و داوێ

کوڕ دەرێ:ـ دەوەرن گەلی برادەرینە، ئەگەر کیژۆرە حەیرانەکەی من ناناسـن
ئەوەتانە کارمامزەکەی کوڕەکەی شـاپەڕ
بەخۆناوە دەلەوەڕێ
لە بنەبنەی زۆر گەزراوی
شـۆڕدەبێتەوە بەسەر دارەبزمارە و
کلکەی حوسـێنی غازی کێشـتاوی
خۆی دەکا لە ئاوی بن ئەردێ و
کاو لە مەخموری شـۆڕ دەبێتەوە
بەسـەر سوڵتان عەولای عارەبی
وەکی کوڕ دەچنە سـەری
لە بۆ خۆیان دەخوازن هەرامە لەگەر مرازی.......

شـەشـتۆنی، سـکێلە شـەش نۆتەکان. Hexatonic, six-note scales(E)

1.تۆنی تەواو*Whole Tone*



میانەکان*Intervals*یشی پێکهاتوون لە:ـ M2, M2, M2, M2, M2, d3

لەم سـکێڵەدا دەشـێت گەسـتووی سـێیەم میانە*Diminished third interval* لەهەر شوێنێکدا دابنرێت بە مەرجێک بەلایەنی کەمەوە بۆ جارێکیش بووبێت...دەبێت دەربکەوێت.

2.بلووز*Blues*



میانەکان*Intervals*یشی پێکهاتوون:ـ لە.m3, M2, m2, A1, m3, m2

سکێڵی بەرەو خوار هەمان سـکێڵی بەرەو ژوورە.

Ĥicaz, Ĥigaz (Ar,Kr, Tr), Niweşew(Kr) **حیجاز، نیوەشەو**

**یەکەم کەسێک کە ئەم ناوەی بە حیجاز وەک مۆزیک زاراوەیەک بوژاندیێتەوە زانای ئیسلامی کوردنەژاد سەفەددینی ورمێیی بووە کە لە پەڕاوی الادوار و الرساله الشرفیه/دا ناوی بردووە و پەنجاوچوارەمین بازنەیشە لە بازنە مۆزیکیەکانی کە دایناوە.**

**وشەی حیجاز لە حِجْز/ی عارەبیەوە هاتووە کە ناوچەیەکە کەوتۆتە نێوان وڵاتی شام و بیابان و دەریاوە. لێکدانەوەیەکی تری هەیە کە بەمانای کەشی یاخود پشتێن دێت. بەڵام ئەگەر هونەریانە لێکیبدەرێتەوە و زارشتانە بۆی بچین، دەردەکەوێت کە هیچ پەیوەندی بەوەوە نیە تەنیا هاوڕێکەوتی لێکی نزیککردوونەتەوە، وەک لە زۆر وشەدا بەرچاودەکەوێت لەنێوان چەند زوانێکدا کە هەر زوانە بەلای خۆیدا دەیباتەوە. ئەگەر لەم ڕۆشناییەوەڕا بوێرم و دەرگای لێکدانەوەم والابکەمەوە دەڵێم:ـ وشەی حیجاز کە دەسگایەکی زۆر خۆشو لەبارە...لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە:ـ حیج ئەویش نزیکە لە حەج، هەج، هەگ، هەوج. ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی خاجیا*Chagiah*ی عیبری پاشان بۆتە هاجیا*Hagia*کە مانای سووران و ئاهەنگ*Festival*ی بەرزڕاگرتن دێت. خستنەسەرباری بۆ زوانی عارەبی، وشەکە بۆتە حیج یاخود حەج.**

**حیج یاخود حەج...یەکێکە لە ئەرکە پیرۆزە سەرەکیەکانی ئیسلام کە ئەویش وەرزی پیرۆزکردن و بەشکۆکردن و زۆربەرز ڕاگرتنی خودێی مەزنە لە ئاهەنگ و سرۆتێکی تایبەتیدا کە لەو وەرزەدا وەک ئەرکێکی سالانە بەجێدەهێنرێت.**

**دوا وشەی جاز/یش کە بۆتە پاشگری جاز...لە گاس:گاز/ەوە هاتووە کە بەمانای بانگ و هاوار دێت. کۆی وشەکەیش کە دەبێتە حیجـگاز یاخود گازی حیج:گازی هاوگ واتای بانگی ئاسمانی و شکۆدان، بانگی حاج دەبەخشێت کە ئاوازێکی زۆر بەسۆز کاریگەرە.**

**پێدەچێت ئەم بانگی حەج/ە هەر لە سەردەمی دەسەلاتداریتی ئەیوبیەکانەوە کە کورد تیایدا دەسەلاتداربووە{وەک کەس و بنەماڵە نەوەک لایەنی نەتەوەیی}کرابێتە ئاهەنگ و بۆنەیەکی وەها کە بە ئاوازێکی سەرنجڕاکێش شێیاوی بەرێکردن و پێشوازیکردنی حاجیان بێت، دەشێت هەر لەو دەمەیشدا ئەم دەسگایە بەم ناوە وەک یادخستنەوەیەک بوژابێتەوە و هەم بۆ وەبیرخستنەوەکی خەڵکیش کە وا وەرزی حەجکردنە.**

**ئەم دەستگایە سۆزێکی کاریگەری وای هەیە کە دەشێت هۆگر و ئاڵوودەی ڕازونیازی دەروێشان و خەڵوەتگار و گۆشەگیران و وەیسان بێت کە بە چەند پەیڤێکی ڕاستوڕەوان و سەروبەند هەندازی ڕەزمین ژانی ڕۆحی بەو ئاوازە دابمرکێنێتەوە و دەروونی کەسانی گوێبیستان بهەژێنێتەوە. ڕەنگە لە شەوگارێکی زۆر درەنگدا کە دنیا کشوماتە و لە ئامێزی شەودا خەڵک لە شیرینەی خەودان و ئەمان بێدارن و ژوانیان لەگەڵ خەڵوەتگەری و خودێ پەرستیدا هەیە. هەر ئەو تەنیاییەی نیوەشەو دەبێتە سرۆ و دەروویەک بۆ شەیدایان کە بە ئەندێشەیەکی تەنیایی لەگەڵ وێشی خۆیاندا لەگەڵ دڵبەرانیاندا بکەونە ژوان، هەر بەو نیوەشەوە سۆزی پڕ لە حەسرەت و کزەبای پیشخواردووی ناو سینەیان هەڵبکات و بیکەنە پەیکێک بۆ دڵی دڵبەرانیان. هەروەک مەولەوی دەفەرموێت:ـ**

**شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن ئالەم گشت خەفتەن، دۆس خەوەردارەن**

**لەنێو میللەتانی دراوسـێدا بە حیجاز ناســراوە، ئەویش لەبەرئەوەی کە زۆربەی ســروود و ســتایشە ئیسلامیەکان لەســەر ئەم دەســگایەیە.**

**سـکێڵی بەرزبوونەوەی ئەم دەسـگایە پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ڕاست لەسـەر پلەتۆنی نەوا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشـی ڕەگەزی ڕاسـت دەگۆڕێت بە نەهاوەند لەگەڵ گۆڕینی پلەتۆنی ئاوج بۆ پلەتۆنی ئەجەم. لە سـکێڵی خۆراواییدا پلەتۆنی فادێزە/F#.**




**فاتیمە دوو چاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانیە      پڕ شەرابی خۆشەویستی و ئارەقی یەزدانیە**

**ئەحمەد هەردی، بەدەنگی: عەلی مەردان**

**دەســگای حجازدیوان، لێڕشــتەیەکی سـەر بە دەســگای حیجازە.** ĤicazDiwan(Ar,Kr)

**هەندێک بە دەسـگایەکی ســەرەکی دادەنێت و چەند دەسـگایەکیــتری لێدەکەوێتەوە لەوانەیەش:ـ هومایۆن، حجازکار، مەسـنەوی، مەدمی.... . دەسـگاکە مۆرگێکی تایبەتی خۆی هەیە بەوەی کە لە حجازەوە بە پلەتۆنی لا/حوسێنیـدا تێپەڕدەبێت کە پێیدەوترێت دیوان، بەسـتەکەیشی لە پلەتۆنی فادێز/حیجازدا هەڵوێستەیەک دەکات و بەرەبەرە دەگەڕێتەوە و لە تۆنی ڕێ/دووگادا دەگیرسێتەوە.**

**نیشتمان جەستەم بسوتێ من بە هەژگ و داری تۆ      کۆت و زنجیرم بکەن بیکەن بە دڵما خاری تۆ**

**دڵشــاد مەسرەف، بەدەنگی: عەلی مەردان**

**حیجازکار، خۆرشــیدی.** Ĥicazkar(Ar,Kr,Tr)

**حیجازکار، یاخود حیجازگار...وشــەیەکی لێکدراوە لە حیجاز{بڕوانە/Ĥicaz}و پاشگری کار یاخود گار کە بە دوو واتا هاتووە، یەکێکیان بەواتای کار و پیشە وەک پەروەردگار، ئامۆژگار، حیجازگار/یش لەسەر ئەو بەزمە بەو کەسە وتراوە کە ئاوازی حیجازی بەچەشنێکیــتر چڕی بێت و ئیتر بەرەبەرە لە حیجاز جیاکرابێتەوە و خانەیەکی لە دەسگای حجازدا بۆ کرابێتەوە. ئەویتریان بەواتای ماوەیەک لە کات وەکو شـەوگار، ڕۆژگار کە لەوانەیە گوزارە لە سەرەتا ڕۆژی ئەرکەکانی وەرزی حەج بکات، وەک بانگەوازێک لەو ڕۆژەدا بۆ دەسپێکردن بەو ئەرکە پیرۆزە.**

**ئەگەر ئەو دیمەنە بخرێتە پێشــچاو و بەراورد بکرێت لەگەڵ وشەی خۆرشــــید/دا، تاڕادەیەک پێدەچێت لە هەمان تێڕامانی ڕۆحــیدا گرێبخواتەوە بەڵام هەر دیمەنە و بە ڕێونیشانێکی جیاواز.**

**وشەی خۆرشید...لە وشـەی هۆرخشــت: هڤار خشــەئیتە/ی ئاڤێستای/یەوە هەڵێنجراوە و لە زوانــی کوردیدا زارەوزار هاتووە تاکو بۆتە خۆرشید کە پێکهاتووە لە خۆر و شـید واتە شیکراوەی ڕۆشــنایی خۆر، یاخود بلێین تیشــکی خۆر. ئەو تیشــکە ئاسمانییەی کە ئاهۆرامزدا کردویەتیە خێر و بەرەکەت**

له گەرمی و ڕۆشنایی و بەخشیویەتی بە سـەرانسـەری جیهانی پسـاتدا. له ئاڤێسـتادا وەک پەیڤێکی پیرۆزی چاوەزار دژ بە فێڵ و دز و درۆزن، جادوگەر و بەدکاران بەکارهاتووە. جا هەر کەسێک پەیڤی خۆرشیدی بەسەر زاردا بهاتبا، وەک پەنا و هاوار بردن بووە بۆ ئاهۆرامزدا دەبات. پەیڕەوانی زاردەشتیی پێیانوابووە پڕتەوی خۆر بەخشیشێکی ئاهۆرامزدایە کە تینی ڕۆشـنایی، پاکوبێگەردی و فەڕ و پڕڕۆزی دەوەشـێنێت بەسەر جیهاندا. له یەشتەکانی ئاڤێستادا وشەی خۆرشید هاتووە. کە بە سـروتێکی بەزم هەشت بڕگەیی بەڕێوە دەبرێت.

حیجازکار...لقێکە لە دەسـگای حیجاز،.سـکێڵی هاتنەخوارەوەی پێکهاتووە لە ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی ڕاسـت، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی نەوا. هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە گرێ نێکرێز لەسـەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی سـەبازمزم لەسەر پلەتۆنی بوسـەلیک.




سەدای زیل و بەم مەینەت سـەد تەرزەن  خەفەت شـادی شەن خەم دەماخ بەرزەن

مەولەوی، بەدەنگی: عەلی مەردان

حیجازکارکورد، کورد خورشیدی، شـەد کورد. ĤicazkarKurd(Ar,Kr,Tr)

لێڕشتەیەکی سـەربە دەسـگای کوردە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی ڕاست و ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی چوارگا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی نەوا، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی کورد.




حیجاز مەسنەوی، لێڕشتەیەکی سـەربە دەسگای حیجازە و Ĥicaz Mesnewy(Ar,Kr,Tr)
هەر هەمان بەرزبوونەیشی هەیە بەڵام لە هاتنەخوارەوەدا لەسـەر پلەتۆنی دۆ(ڕاسـتدا) کرِدەبێت.

دڵم لەرزی لە ناکاوا کە دەرکەوت ماهی دیداری
خومار و مەستی کردم وەک دوو چاوی مەست و خوومماری

مەلا مەسعود بێـبەش، بەدەنگی:عەلی مەردان

نۆتەی لاوەکی. Hilfs(G), Leger note(E)

زێدە هێڵی سەرین و ژێرین. Hilfslinie(G), Leger line(E), Léger line(F)

وشـەی*Leger*لە زوانی فەڕەنسـاییدا بەمانای سـووک*Light*دێت، مەبەسـتیش لەو کورتە هێڵانەیە کە نۆتەکانی لە سەر و خواری سکێڵە مۆزیکەکەدا دەنووسرێن.



Hindustani music(E) مۆزیکی هیندی، لە هونەرە هەرە دێرینەکانە لە مێژووی پسـاتدا، یاخود زاراوەی سـۆڵفێج*Solfege*ی هیندسـتانی کە دەنگەوارەکانی لە حەوت تۆن پێکهاتوون و بە نۆتە ئاماژەی پێدەدرێت کە لە باکووری هیندسـتان پێیدەوترێت سـارگام*Sargam* و بریتین لە:ـ

| حونجە Syllable | کورتە.*Abb* | Tones | دەنگەکان |
|---|---|---|---|
| Sa | Shadj | Shadjamam | 1. شادجام |
| Re | Rishabh | Rishabham | 2. ڕیشهام |
| Ga | Gandhara | Gandharam | 3. جاندهارام |
| Ma | Madhyam | Madhyamam | 4. مادهیام |
| Pa | Pancham | Panchamam | 5. پەنچام |
| Dha | Dhaivat | Dhaivatam | 6. دهایڤاتام |
| Ni | Nishadam | Nishad | 7. نیشاد |

یەکەم نۆتە کە بە دەنگی/ Saدەسپێدەکات بەرابەر بە نۆتەی دۆ /C و دەنگی/Pa بەرابەر بە دەنگی سـۆڵSolدەبێتەوە کە پێنجەمی تەواو *Perfect fifth*پێکدەهێنێت. دەنگی سروشتی*Natural* پێیدەوترێت سـوددا*Shudda* واتە دەنگی سـادە. بیمۆڵ یاخو پانۆک*Flat* پێیدەوترێت کۆمال*Komal*، دێز یاخود تیژ *Sharp* پێیدەوترێت تیڤار*Tivar*. هەر دەنگێکیش لەم حەوت دەنگانە بەناوی باڵندەیەک یاخود گیانلەبەرێکەوە ئاماژەی پێدراوە:ـ

| نۆتە Note | هێما | Expansion بەرینێتی | Meaning مانا | بەناوی گیانلەبەر/باڵندە Animal/bird |
|---|---|---|---|---|
| C | Sa | Shadjam (षड्जं) | -- | Peacock تاووس |
| D | Ri | Rishabham (रिषभं) | Bull | Bull کەڵ |
| E | Ga | Gandharam (गान्धारं) | -- | Goat مامز |
| F | Ma | Madhyamam (मध्यमं) | Middle ناوەڕاست | Dove کۆتر |
| G | Pa | Panchamam (पंचमं) | Fifth پێنجەم | Cuckoo وەقواق |
| A | Da | Dhaivatam (धैवतं) | -- | Horse ئەسپ |
| H | Ni | Nishadam (निषादं) | Outcast/Hunter نیشانچی | Elephant فیل |

هەمان سـکێڵ*Scale* لە باشـووری هیندسـتان بەکادەهێنرێت بەڵام بەناوی سوارا*Swara*{وشەیکی سـانسـکریتییە بەمانای دەنگ*Sound* دێت}لەگەڵ کەمەزارگۆڕانێک،

Hirajoshi(J), Pentatonic Japanese scale(E) سـکێڵی هیرایۆشـی، پێنجـتۆنی ژاپۆنـی. زیاتر لەسـەر ئامێرژەنینی گیتاردا کاریـپێدەکرێت




His(G) بڕوانە/*B-sharp*.

His-Dur(G) بڕوانە/*B-sharp major*.

Hisis(G) بڕوانە/*B-double sharp*.

His-moll(G) بڕوانە/*B-sharp minor*.

H-moll(G) بڕوانە/*B-minor*.

Hoarse(E), Rauque(F) , Rauco(I) **باخە، دەنگی نووساو.**

Hoboe(G), Oboe(E) **ئامێری ئۆبوا.**

Hoboy(E) **ناوی دێرینی ئامێری ئۆبوا.**

Hoch(G), High, Sharp(E), Haut(F), Altissimo, Elevato(I) **بەرز، تیژ، زیل.**

Höchest(G), Highest(E) **بەرزترین، تیژترین.**

Höhe(G), Hight(E) **بەرزیی.**

Hold(E), Pause, Fermato(I) **ڕاگرتن، وچان.**

Holding note(E) **نۆتەی ڕاگرتوو،**

**نۆتەیەک لە پارچەیەکدا ڕابگیرێت و لە هەمان کاتدا پارچەکانیتر بجوولێت.**

Holz(G), Wood, Woodwind(E) **تەختە، تەختەبا.**

Holzbläser(G), Woodwind player(E) **تەختەبا ژەن، ژەنیاری ئامێری تەختەبا.**

Holzblasinstrumente(G), Woodwind instrument(E) **ئامێری تەختەبا.**

**ئەو ئامێرە فووپیاکەرانە دەگرێتەوە کە لە تەختە دروستکراون وەک کلاڕنێت، ئۆبوا، باسوون... .**

Homofonia(S), Homofonie(G), Homophonie(F,G), Homophony(E) **هۆمۆفۆنی،**

**پێکهاتەیەکی مۆزیکیە بۆ دوو بەش یاخود زیاتر، بەشێکیان لە هێڵەمیلۆدییەکی سادەدا و بەشەکانیتر وەک هاویارێک بن. دەقێکی مۆزیکالی کە بە کۆردالChordal پاڵپشت بە هێڵی میلۆدی ڕەفتاری پێدەکرێت. گوزارە لە دوو ژێ دەکات کە یەک نۆتە بدات.**

Hook, Flag(E), Crochet, Accrocher(F), Gancio(I) **چنگ، پەرچەم.**

**ڕایەڵە**=*Beam* **پەرچەم**=*Flag*

**سەرەنۆتە**=*Head note*

**ملە**=*Stem*




Horaman(Kr) **هۆرامان، بەیتی هۆرامان، زانای ناودار شەمسەدینی قەیسی ڕازی**

**بەرلە نزیک**800**ساڵی کۆچیدا لە کتێبی "**المعجم في معاير اشعار العجم**"دا لەسەر هۆرامان دەڵێت:ـ**

**لحن اوارمان و بیت پهلوی زخمهء رود و سماع خوسروی**

**یەکێکە لەو خۆشترین ئاوازە دەروێشیانەی کە بە بەزمی دوو بەیتی وتراوبێت. پێدەچێت هەر مەبەستی لە هۆرە و سیاچامانە بووبێت کە لە ڕاستیشدا دوو شێوە ئاوازی هەڵێنجراون لە یەک سەرچاوەوە کە ئەویش دەشێت بگەڕێنرێتەوە بۆ سەردەمی سرووده زاردەشتییەکان، بە ئومێدی زیاتر نزیکبوونەوە و زیاتر ناسین و ئاشنابوون بە خودێی پەروەردگار.**

**هەندێک ڕاوبۆچوون هەیە لەسەر ناوی هۆرامان لەوانەیش پێدەچێت کە لە سێ بڕگە پێکهاتبێت:ـ ئاهو ـ را ـ ئامان. ئاهو**Ahu **کە وشەیەکی سانسکریتی/ئاڤێستاییە بەمانای خودێ هاتووە، ڕا**Ra **یاخود ڕا بەمانای سروود دێت کە لە سانسکریتیدا بە ڕاگ هاتووە{بڕوانە/**Rast**}، کۆی دوو بڕگەی سەرەتایی کە دەبێتە ئاهۆرا**Ahura**{هاومانای وشەی ئاسورا**Asura**ی زوانی هیندی کۆنە}بەمانای ڕێی خودێ دێت واتە ئەو ڕێگەیەی کە بەو سرووده مرۆڤ بەرەو دەرباری خودێ دەبات.**

دوا بڕگەیش کە بریتیە لە مان/*man* کە بەمانای یاگە یاخود شـوێن دێت. کۆی وشە لێکدراوەکە یاگەی ئاهۆرا{وەک چۆن کەعبە لە ئیسلامدا خانەی خودایە}دەبەخشێت واتە جێگەی خودێ پەرسـتن بەو سـرۆتە تایبەتیانە. لەو سـرروودانەی کە مابوویێتەوە ڕەنگبێت هەر هۆرە و سـیاوجامانە بێت کە بەداخەوە بەر شـالاوی وشەگۆڕکێ و.پیتگۆڕکێ بوون{وەک لە سـیاوجامانە کە بۆتە سـیاوچەمانە}.

ڕاوبۆچوونێکیـتر دەیباتەوە سـەر دوو بڕگەی لێکدراو کە پێکهاتووە لە هۆر+ئامون واتە خۆری سپەنتا یاخود نووری موقەدەس کە یەکێکە لە سـیفەتەکانی ئاهۆرامزدا. یاخود هۆرئامون کە پاشـگری ئامـوون/ە بە زوانی فرعەونیی بەمانای شـارراو/*Hidden* یاخود نادیار/*Mystery*هاتووە{واتە خودێ/یەکی نەبینراو}، دەشێت تاڕادەیەکیش نزیکبێت لە وشەی مینوویی ئاڤێستایی کە هەر هەمان مانای شـارراو دەدات. چەمکی وشە لێکدراوەکەیش مانای سـروودی خودێی نادیار *The hymn of mysterious god*دەبەخشێت. سـەرجەمی ئەم لێکدانەوە و بۆچوونانە ئەوە دەگەیێنن کە ناوچەی هۆرامان ئاخێکی زۆر پیرۆز و سـپەنت بووە، لانک و زێدی بلاوبوونەوەی ئایینی زاردەشتیی و ئایین و ئایینـزایــتر بووە.

هۆرە، یاخود بەیتی هۆرە کە هەر بە هۆرە ناسـراوە، ناوچەیەکی زۆر Hôre(Kr) بەر بلاو و فراوانی لەخۆگرتووە. ئاوازێکی زۆر باوە لەنێو خێلانی لەک و کەلهوڕ و جافــدا کە بە ناوچەکانی بەختیاری و لوڕستان و کرماشـان و دۆلی زەنگنە و شـارەزووردا بلاوبوونەتەوە.

کزەیەکی هەرە دێرینی کوردەوارییە کە لە زۆر بۆنە و سرۆتەئایینیەکاندا بە زۆر چەشن و جۆر بێژراوە و دەبێژرێت. ئەو چەشن و جۆریشی دەگەڕێتەوە بۆ هەلبژاردنی ئەو وشانەی بۆی هەلدەبەسترێت، بۆ نموونە ئەگەر گوزارە لە جوانی سـروشت و شـەیدایی بکات بە فۆرمێکی سەربە دەســگای ســەبا دەبێژرێت. ئەگەر لە هێز و توانا و دەنگی زولال پیشان بکات بە فۆرمێکی سەربە دەســگای نەهاوەند دەبێژرێت. یاخود گوزارە لە نزا و تکاکاری بکات بە فۆرمێکی سـەر بە دەســگای بەیات دەبـێژرێت. مەرجیش نیە ئەو هۆرانەی کە چڕاون و دەچڕدرێن لەسـەر بنەمای ئەو دەســگا مۆزیکانە بپۆلێنرێن. ئەمەیش پارچەیەکە لە هۆرەیەکی شەیدایی کە دەلێت:ـ

| | |
|---|---|
| بنووڕە وەی قاقەز دووس دورەوە | بزانن چووە نوساس وە دلگیرەوە |
| بلبل تو مەگیر وە زار زارەوە | بەشی تۆ ماگە گول وە دارەوە |
| زڕەی شەمال تیەی لەلا قەسرەوە | دەمچەو لابریاگە هاوە ئەسرەوە |
| چەتر چو لەولاو بخە وەلاوە | کوچکانگ چەن کەس نایدە وەکاوە |
| نە قاقەز دیرەم نە قەلەم دەوات | ڕاز دلەگەم بنوسم ئەڕاد |

پێدەچێت ئەم هەوایە کە بەناوی هۆرا یاخود هۆرە/وە هاتووە هانایەک بوویێت بۆ خودێـی کردگار بە مەبەستی پاراستن لە ڕۆحی بەد و کارەساتی وێرانکەر. بەهاتنی زاردەشت چێوەیەکی ئایینی پیرۆز و سـپەنتای لەخۆگرتبێت و بوویێتە سـروودێکی ڕێکوپێک. بڕوانە/*Yesna*.

بەیتی هۆرە...کە پێشگری ڕیشەوشەی هۆرامانە، یادگارێکــی سـۆزناکی هەرەدێرینی کوردەواریمانە کە سینەبەسـینە هاتووە پێمانگەیشتووە بەلام تەمومژی ڕۆژگار زۆری بۆ هێناوە کە چێوەیەکی

دونیایی بەخۆدا بپۆشێت. ئەو کەسەی کەوتبێتە ڕازونیاز لەگەڵ ئاهۆرا پێیوتراوە هۆرەچڕ، هۆرەچڕین/یش واتە هاوارکردن لە ئاهۆرا واتە خودێ تاکو بە هانایەوە بێت. کزەدەنگی نەرموناسکی تایبەت بە ڕەگەزی مێیینە/یش لەسەر ئەم بەزمە پێیــوتراوە موورەچڕ.

دێرینی وشـەی هۆرە...زاراوە وشەی کۆرس*Chorus*/مان دەهێنێتەوەیاد کە ئاوروپاییەکان بە چەند شـێوەزوان و دیالێکتیان گۆیان پێکردووە. ڕیشــەی وشەکەیش{مەبەست کۆرس}لە خۆرەس/ی یۆنانییەوە هەڵێنجراوە. ئەگەر پیتی خ بکرێتە پیتی هـ ، پاشگری س/یش چزبکرێت{لەبەرئەوەی زۆرینەی وشـەنهادیەکان بە پاشگری/us یاخود/os تەواودەبێت}دەبێتە هۆرە کە ڕەنگبێت نزیکایەتییەکی ڕۆحـی تیادا بەدیبکرێت، چونکە بە لێکدانەوەی چ زوانەوانی و چ فەلسـەفییانە بێت هەر هەمان چەمک دەبەخشـێت. ئەم وشەیە هاتۆتە نێو عارەبە مەسیحیەکان گۆڕاوە بە خوری*Khuri*کە بەمانای ســرودچڕی کڵێسە دێت.

پرۆفیسۆر د. فەرەیدونی جنیدی کە ئوستادێکی زانکۆیە لە ئێران لە کتێبی " زمینەی شناخت موسیقی ایرانی" دا دەڵێت:ـ هۆرە ئاوازێکی ڕەسەنی خەڵکی کوردە، کاتی خۆی بارباد و نیکیسا بە بەزمی هۆرە ئاهەنگیان شیرین و خەسرەو ســازکردووە".

**هۆڕن، بووق،** Horn(E,G), Cor(F), Corno(I)

ئامێرێکی هەواییە کە لە کانزا و شـاخی گیانلەبەر و تەختە دروسـت دەکرێت. دەشـێت وشەی هۆڕن*Horn*کە کۆنترین ئامێری مۆزیکاییە تاڕادەیەک خزمایەتی هەبێت لەگەڵ وشەی هۆرە. هۆرە کە هاوارێکە لە ئاهۆرا بە دەنگی مرۆڤ، هۆڕن/یش هاوارێکە لە ئاهۆرا بە دەنگی ئامێرێکی مۆزیک کە لە چاخێکی زۆر دێریندا لە شـاخی گیانلەبەران دروستــدەکرا.

**هۆڕنی پێچەک. کۆلاپە هۆڕن.** Horn crook(E), Ton de cor(F)

**هۆسە یاخود گۆسە...**وشەیەکی زۆر دێرینی لوڕی/کوردییە Hôse(Ar,Kr)

کە بەمانای ئاوازی هەراوهوریا دێت ڕەوشێکی بانگەشەیی بەجۆشی لەخۆگرتووە. واتە یەکێک بە دەنگێکی زوڵاڵی مۆنۆتۆنیک گوزاریەک دەڕبڕێت بۆ پیاهەڵدانی گەورەیەک یاخود بۆ هاندان بەرەو کارێکی وەک شەڕوشۆڕ و کۆمەڵە خەڵکێکی تایبەتیش وەک کۆرس لەنێو ئاپۆرەیەکدا بەهەمان بەزم و ڕەزم بۆی بسەننەوە. سـەردەمی سـاسـانیەکاندا ئەم چەشنە ئاوازە زۆر باو بووە و هەر بەو کۆمەڵەیش وتراوە هۆسیان واتە خوێنیاران یاخود سـترانبێژان. جۆری ئەم بەزمەئاوازە کەوتۆتە ناوچەکانی کوت و ناسـریە و عەمارە کە ئێستا سـەر بە وڵاتی عێراقن زۆر باوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ناوچەکانی کرماشان و ئیلام/ی سەر بە وڵاتی ئێران لەسەریان.

**هۆسیانە،** وشەیەکی زۆر کۆنە لە زوانی عیبری/دا و بەمانای Hosianna(Hb), Hossanna(L)

هۆۆۆ...لێتدەپاڕێمەوە دەبەخشێت کە گوزاریەکی هانابردن بۆ خودێ. لە بنەڕەتدا دەسگاوازێکی عیبری/یەهودییە کە تاکو ئێستا لە کڵێسەکانیاندا دەخوێنرێت، هەر لەوێوەڕا هاتۆتە ناو کڵێسەی کاتۆلیکەوە و دواییش بۆتە بەشــە ســروودێکی ئایینی ســانکتۆس*Sanctus*، سروشتی ئەم دەسگایە لە سەرەتادا بە ڕەوتێکی نەرم و هێواش دەسپێدەکات و بەرەبەرە بەرەو بژێوی و زوڵاڵ. پێدەچێت چ وەک ناو و چ وەک ئاواز پەیوەندی لەگەڵ دەسگای حوسێنی/دا هەبێت بەڵام چەرخی ڕۆژگار

کاریگەری هونەریانەی بەسەردا هێنابێت. دووریش نیە کە هەر لە وشەی هۆسیان{بڕوانە/Hôse}ی کوردییەوە هاتبێت کە ئەویش جۆرە هەوایەک بووە و تایبەتیش بووە بەو هاوارچڕانەی{پێیانوتوون هۆسیان}کە لەو بۆنە و ڕێونیشانانەدا دەردەکەوتن.

Huit(F), Eight(E) هەشت.

Huitiéme de soupir(F), Demisemiquaver, Thirty-second rest(E) 1/32ی وچانی تەواو.

Humayon(Ar,Kr,Tr) هومایۆن. لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای حیجازە.

پێکهاتووە لە:ـ گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی یەکگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا.




Hummel(G), Drone(E) لوولک، لوولکی مەشکەنای،

ئۆرگنی داخراو*Organ stop*بە دوو لووک لەسەر کلیلی/C,F یاخود/C,G

Hum note(E) گیزە نۆتە. نزمترین فریکوێنسی زەنگ*Bell*،

لە زەنگی کاریللۆن*Carillon*دا یەک ئۆکتاڤ لە نۆتەی سەرەتا*Prime note*نزمترە.

Hunder und achtundzwanzigstel(G), 1/128 note(E) 1/128ی تۆتەی تەواو*Semibreve*

Hunder und achtundzwanzigste, pause(G) 1/128ی وچانی تەواو

1/128Semibreve rest(E)

Hungarian Minor(E) بڕوانە/*Gypsy scale*.

Hurdy-gurdy(E), Vielle(F), Leyer, Bauernleyer(G), Rota(L) هوردی-گوردی،

ئامێرێکی ژێدارە کە بەهۆی دەستەک{هاندل*Handle*}ێکەوە بادەدرێت دەنگەکەی دەزرنگێتەوە.

Ĥuseyni(Ar,Fa,Kr,Tr) حوسێنی. لە دیدەی هونەرییەوەڕا هەندێک ڕاوبۆچوون لەسەر وشەی حوسێنی دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕیشەی هۆسە و هۆسەچڕیش پێیوتراوە هۆسیان. ئەو چەشنی ئاوازەیش پێیوتراوە هۆسیانی، ئیتر لەوانەیە گۆڕانی ڕۆژگار و کاریگەری زوانی عارەبی کردبێتیە حوسیانی و پاشان بە حوسێنی گیرسابێتەوە. هۆسیانی لەسەردەمی ساسانیەکاندا ئاوازێکی تایبەت بووە بۆ پیاهەڵدان و بەشکۆکردنی کیسرا.

لە ڕووی هونەریەوە....لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای بەیاتە.

سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا،ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی حوسێنی. سکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی حوسێنی دەبێتە ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی حوسێنی.



Ĥuseyni Eşyran(Ar,Fa,Kr,Tr) **حوسێنی عەشیران.**




**لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای بەیاتە، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی عەشیران، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی دووگا. سکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە ڕەگەزی سێگای سیانیی لەسەر پلەتۆنی سێگا، ڕەگەزی سێگای سیانیی لەسەر پلەتۆنی ئاراک، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست.**

Huzam(Ar,Fa,Kr,Tr), Xezan(Kr) **هوزام، خەزان.**

**پێدچێت ئەم وشەیە گۆڕانکاری زۆر بەسەردا هاتبێت، چونکە لەهەندێک سەرچاوەدا بە حوزام، حزّان، حوزن، خەزام، خەزان....هاتووە کە لە ڕووی هونەرییەوە ڕەنگێکی خەمەنگێز و پەژارەیی پێوەدیارە، جا هەر لە ڕاستیشدا کە وەرزی پایز دێت سروشت و ڕەوشی زیندەوەران بەگشتی و مرۆڤ بەتایبەتی بەرەو کشومات و دڵداگیران دەڕوات. لەو نیشانە و دیاردانەی وەرزی پایزیش گەڵاڕێزانە کە لە زوانی کوردیدا پێیدەوترێت خەزان{بریتین لە مانگەکانی ڕەزبەر(خەزەلوەر)، گەڵاڕێز، سەرماوەز}، وەک لەم هۆنراوەیەدا مەولەوی دەفەرموێت:ـ**

**ڕەنگ زەردی خەزان خەتای پایزەن     ڕەنگ زەردیەکەی من دووری ئازیزەن**

**لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای سێگایە و بە سێگای تورکی/یش ناسراوە. سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە ڕەگەزی سێگای سیانیی لەسەر پلەتۆنی سێگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی نەوا. سکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی چوارگا.**

**نامەی جوانیم پیری زوو دڕی     خونچەی بەهاری شادی هەڵوەری**

**شێخ سەلام، بەدەنگی:علی مەردان**




Hülfsnote(G), Auxiliary note(E) **یاوەر نۆتە.**

Hüpfend(G) **بڕوانە/***Spiccato*.

Hwistle, A bone whistle(E) **فیکەنە، فیقەنە، فیکفیکە. وشەیەکی زۆر کۆنی ئینگلیزییە کە بە فیکەنەی لە ئێسک درووستکراوی شەش کونی وتراوە{بەڵام سێ کونی زیاتر باوە}.**

Hyper(G), Over, Above(E), Au delà de(F) **سەروو، باڵا، بەرز، ئاوج، ئەوگ، هەوگ. زاراویەکە بۆ سکێڵە ترانزپۆزە***Transposition***کان.**

Hyperaeolian mode(E) **دەسگای ئایۆلیەنی سەروو، بڕوانە/***Mode*.

Hyperdorian mode, Hypodorian mode(E) **دەسگای هایپەردۆریان{هایپۆدۆریان}. بڕوانە/***Mode*.

Hyperlydian, Hypolydian mode(E) دەسگای هایپەرلیدیەن{هایپۆلیدیەن}، بڕوانە/*Mode*.

Hypermeasure(E) مازۆری بالا، کۆمەڵە باڕ*Bar* و یاخود مازۆر*Measure*یک کە باڕ یاخود مازۆر تێیدا وەک لێدە*Beat*یەک کاردەکات.

Hyperphrygian mode, Hypophrygian(E) دەسگای هایپەرفریجیەن، بڕوانە/*Mode*.

Hypo(Gr), Under(E) هایپۆ، بەمانای ژێر*Under*دێت، دێرینە وشەیەکی یۆنانییە کە دەکرێتە پێشگر بۆ ناوی دەسگا سەرەکیەکان*Authentic* و لە شێوەی لاوەکی/لاویز*plagal:Sideway*دا بێت. بڕوانە/*Hyperdoria mode*.

Hypoaeolian mode, Fifth plagal mode(E) هایپۆئایۆلیەن، یاخود دەسگای پلاگاڵ پێنجەم کە دەسگایەکی کڵێسەیی سەتەکانی ناوەڕاستە.

Hypodiapente(Gr), Subdominant(E) هاپۆداپیێنتە، ژێرزاڵ، پێنجەمی نزم.

Hypoiastian mode, Hypoionian mode(E) دەسگا پلاگالی حەوتەم، دەسگایەکی کڵێسەیی سەتەکانی ناوەڕاستە.

Hypolydian mode(E) بڕوانە/*Hyperlydian mode*.

Hypomixolydian mode(E) دەسگا پلاگاڵ چوارەم، دەسگا کڵێسەییەکی سەتەکانی ناوەڕاستە.

Hypophrygian(E) بڕوانە/*Hyperphrygian*.

Hypoproslambanomenos(Gr) نۆتەی نزم لە پرۆسلامبانۆمینۆس کە پلەتۆنی سۆڵە/G. بڕوانە/*Prosalambamenos*.

Hymn(E), Hymne(F) سروودی کڵێسە کە بەزۆری لە چەشنی کۆڕاڵ/دایە، شێوەیەکی ئایینی کڵێسەییە کە تایبەتە بە ستایشکردنی خودێ

Hymnal(E) سروودنامە، پەڕاوێک کە سرووده ئایینیەکانی تیادا نووسراوەتەوە لە کڵێسەدا.

------------------------------------

----------------------

------------

# I

جوانی سروشتی شتێکی جوانە....

بەڵام جوانی هونەری...نیگارگرێکی جوانە لە شتێک. پەندی جوانناسان

---

**ئیامبیک،** Iambic(E), Iambique(F), Iambisch(G), Iambus(L,Gr)

**پێوانەی کێشی هەڵبەست و مۆزیک کە بە دوو جۆر سیلاب{حونجە}*Syllable*ی سەرەکی ئاماژەی پێدەدرێت، یەکێکیان کورت{تە} ∪ ، ئەویتریان درێژ{تن} —.**

**ئیاستێین،** Iastain(Gr)

**یەکێکە لە دەسگا مۆزیکە یۆنانیەکان کە تا ڕادەیەک بە دەسگای ئایۆنیەن*Ionian mode* دەچێت.**

**نیگارزانیی، زانینی نیگارکێشان و بەتایبەتی لە هونەری مۆزیکدا بۆ چۆنیەتی** Iconography(E)
**دیاریکردنی ئامێرەمۆزیکیەکان و ژەنینیان، چ کات و لە کوێ و لەلایەن کێ/وە بەکاردەهێنرێن.**

**ئیکۆنۆناسیی، وانینی*Study*ی نیگارەکان، بەتایبەتی لە بواری مۆزیکدا کە بڕیار** Iconology(E)
**دەدرێت لەسەر ئەوەی چۆن ئامێرەمۆزیکیەکان بژەنرێن، لە چ کاتێکدا و لە کوێدا و لەلایەن کێ/وە دەژەنرێن، ئەم ڕوونکردنەوانە لە نووسراوێکی تایبەتیدا تۆماردەکرێن تاکو بە زیندوویی بمێننەوەوە و بتوانرێت بە هەمان شێواز کاریان لەسەربکرێت.**

**نمایاندن بەچەشنێکی گرافیکانە لەباتی ئەو هێما*Symbol*مۆزیکیانەی کە باون، بۆ نموونە** Icons(E)
**مەودای تۆنەکان*Pitch* و ڕەزمەکان*Rhythm* و بەکارهێنانیان بە شێوەی هێما بۆ ئامێرە مۆزیکیەکان.**

**بیرەک، پێکهاتەتەلاری پارچەمۆزیکێک دەگرێتەوە لە شێوەی بابەت، ڕشتە، سوژە...** Idea(E)

**ئیدیۆفۆن، ئەو ئامێرە مۆزیکیانە دەگرێتەوە کە بە ئامرازێکی تایبەت دەنگیان** Ideophone(E)
**دەلەرێنەوە بەبێ بەکارهێنانی زمانە*Reed* و ژێ یاخود هەر دەرەئامرازێکی لەرێنەر. بەم ڕێگایانە خوارەوەیش دەنگە ئیدۆفۆنیەکان دەردەچێت:ـ**

1. **ئیدیۆفۆنە پێاکێشەکان*Concussion ideophones*:ـ بریتین لە پێکەوە پیاکێشانی دوو شتی لەرێنەوە، وەک ئامێری جووت ساجەکان*Cymbals*، ئامێرە کلاڤیەکان*Claves*...هتد**
2. **ئیدیۆفۆنە لێخشێنەکان*Friction ideophones*:ـ بریتین لە پەستان و لێخشاندنی بەسەر ئامێرێکی لەرێنەوە، وەک شووشە ئارمۆنیکا*Glass armonica*، مشاری مۆزیکایی*Musical saw*...هتد.**
3. **ئیدیۆفۆنە نەگرەییەکان*Precussion ideophones*:پیاکێشانی ئامێرێکی لەرێنەوە بە چەکوش*Hammer*، چیلەدار*Stick*، بلۆکەدار *Wood block* یاخود هەر شتێک کە بێ لەرە*Non-vibrating* بێت، وەک زەنگ، گۆنگ*Gong*ی چینی...هتد.**

4. ئیدیۆفۆنە گرتەڕاکێشەکان*Plucked ideophones*:ـ بریتین لە ئامێرەکانی وەک هارپی پەنجە*Thumb piano*، مۆزیک بۆکس*Music box* یاخود هارپی چەناگە*Jew´s harp*...هتد .

5. ئیدیۆفۆنە ڕاوەشێنەکان*Rattle ideophones*:ـ ڕاوەشاندنی ئامێرە لەرینەوەکان، وەک ماراکاس*Maracas*، وردە زەنگۆڵەکان*Pellet bells*...هتد.

6. ئیدیۆفۆنە ڕووشێنەکان*Scraped ideophones*:ـ بریتین لە ڕووشاندنی ئامێرێکی لەرینەوە بە هەلووکێک یاخود شوولێکی ڕەقی بێ لەرە*Non-vibrating*، وەک:ئامێری ڕاشێت*Ratchet*، گویرۆ*Güiro*، تەختەڕنە*Washboard*...هتد.

Idiliaco(I) — ستراني شەیدایی.

Idyl, Idyll, Idylle(F) — مۆزیک دانراویەکی پاستۆراڵی ئاشتیـئامێز.

Ilare(I), Pleased(E) — شاد و خۆشبار.

Ilarita(I) — شادي و خۆشباری.

Il doppio movimento(I) — تێمپۆیەکی دوو چەندجا خێرا لە پێشوی.

Il faut(F), There is needed(E) — پێویستدەکات.

Il fine(I), The end(E) — پایان، کۆتایی.

Il medesimo tempo(I), The same time(E) — هەمان دەم.

Il più(I), The most(E) — زۆرترین.

Il più forte possibile(I), As strong as possible(E) — تا بتوانرێت بەهێز.

Il più presto possibile(I), As quick as possible(E) — تا بتوانرێت خێرا.

Il più piano possibile(I), As soft as possible(E) — تا بتوانرێت نیان.

Il squente(I), The following(E) — ڕەدوو.

Imbarazzato(I), Embarassed(E), Confuse(F) — شڵەژاو.

Imbedarfsfalle(G), In case of need(E) — لە باری پێویستدا.

Imboccatura(I), The mouthpiece of a wind instrument(E) — ئامێرەهەوای دەمی.

Imbroglio(I), Intricate rhythm(E) — ڕەزمێکی سەخت و ئاڵۆز.

Imitando(I), Imitating(E), Imitant(F) — لاساییکردنەوە.

Imitando la voce femminile(I), Imitating the feminine voice(E) — لاسایی دەنگی مێیینە.

Imitatio(L), Imitation(E), Imitazione(I) — لاساییکردن، گوزارەیەک لە تۆن پەردە*Pitch*یەکی جیاواز بە دەنگ یاخود پارچەیەکیتر، بۆ نموونە: فیوگاڵ نووسین*Fugal writing*.

Imitatio canonica(L) — بڕوانە/*Canonic Imitation*.

Imitative counterpoint(E) — کۆنتراپونت/ی لاسایی کە دەقێکی مۆزیکاڵی پۆلیفۆنی/یە و تیایدا هێڵە میلۆدیە جۆراوجۆرەکان تاڕادەیەک هەمان تێما{بابەت}*Theme*{بەکاردێنن.

Immer(G), Ever, Always, Still(E), Toujours(F) — هەمیشە، هێشتا.

Immer begetter(G), Still moving more, Faster(E) هێشتا زیاتر دەجووڵێت، خێراتر.

Immer gestopeft(G), Always stopped(E) هەمیشە وەستاو.

Immer langsamer(G), Always slower(E) هەمیشە هێواشتر.

Immer mit dämpfer(G), Always muted(E) هەمیشەکپ.

Immer offen(G), Always open(E) هەمیشەکراوە.

Immer spring(G), Always spiccato(E) هەمیشە درەخشان، بڕوانە/*Spiccato*.

Immer vorwärts(G), Always pressing forward(E) هەمیشە بەرەو پێشەوە لە توندیدا.

Immobile(I), Motionless(E) بێجووڵە.

Im Orchester(G), In the Orchestra(E) لە ئۆرکێسترادا.

Impair(F), Odd number(E) ناجووت، تاکنمرە.

Impazientadosi, Impatientemente(I), Impatiently(E) بە ئارامی.

Impatiente(I), Impatient(E), Impamtiemment(F) ئارام.

Imperfect cadence(E) کادەنسی ناتەواو، کە بە تۆنی زاڵ*Dominant*یاخود بە تۆنێکیترکۆتایی بێت نەوەک بە پایەتۆن *Tonic*، بڕوانە/*Cadence*، وەک لەم نموونەیەدا:ـ




کادەنسی ناتەواو هەمیشە بە کادەنسی بنیاد*Authentic cadence*دەچێت بەڵام ئێستا سیانییەکان*Triads*لە جێی بنچینەدا نیە و پایەتۆن*Tonic*یش لە بەشی بەرزتریندا نیە، کاتێکیش نۆتەی پایەتۆن لە بەرزترین بەشدا نەبێت ئەوا تاڕادەیەک دەرەنجامێکی لاوازی دەبێت.

Imperfect consonance(E) هاوسازی ناتەواو، میانەکانی سێیەم و شەشەم دەگرێتەوە کە ڕێژەکان کەمترن لەو میانانەی کە لە پێنجەم و چوارەمدا هەن.

Imperfect interval(E) میانەی ناتەواو، میانەیەکی نیوەتۆنە کە لە تەواو کەمترە وەک گەستووی پێنجەم*Diminished fifth*.

Imperfect time(E) کێشی ناتەواو کە بریتیە لە کێشی 2/2 و 2/4.

Imperioso(I), Imperious(E) پڕشکۆ.

Impetuositá(I), Impetuous(E), Impétueux(F) سەرکێش، توند.

Imponente(I), Imponirend(G), Imposing in style(E) بەچەشنێکی سەرکێشی.

Impresario(I) ڕێکخەر و بەڕێوەبەری گروپی ئۆپێرا. لە وشەی*Impresa*ی ئیتاڵیاییەو هاتووە.

Impromptu(I), Impromtü(G) ئیمپرۆمتۆ، زاراوەیەکی ساڵەکانی سەتەی/19مە گوزارە لە دانراوە مۆزیکێکی ئامێراڵی*Instrumental*دەکات بەشێوازێکی سەرپێیی*Improvised*.

Improperio(L) ئایین ئاوازێکی بەرەبەیانە لە کڵێسەی کاتۆلیکدا.

Improvisateur(F), Improviser(E) Improvvisatore(I) کەسێکی نێرینە هونەرکارییەکی سەرپێیانە ئەنجامبدات.

Improvisatrice(F), Improviser(E) Improvvisatrice(I) کەسێکی مێیینە هونەرکارییەکی سەرپێیانە ئەنجامبدات.

Im tempo des scherzo(G) لە تێمپۆی شێرزۆ *Scherzo*، بڕوانە/ *Scherzo*

Im tempo 1 zurückkehren(G), Returning to tempo 1(E) گەڕانەوە بۆ تێمپۆی یەکەم.

In(I,L,E) ناو، دەروون.

In Alt, In Alto(E) بڕوانە/ *Alto*.

In altissimo(I) بڕوانە/ *Altissimo*.

Incalcando(I), Getting louder and faster(E) بەرزتر و خێراتر.

Incalzando(I), Hastening, Pressing forward(E) خێرا، پەستان بەرەو پێشەوە.

Incantation(E) مۆزیکی جادوو ئامێز.

Incantevole(I), Attractive(E) سەرنجڕاکێش.

Incarnatus(L), A part of the Credo(E) بەشێکە لە سروودی کریدۆ *Credo* لە کڵێسەدا.

Incidental music(E) مۆزیکێک بۆ پێشەکی دراما، فلیم و بەرنامەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دانرابێت.

Incipit(E) یەکەم هێڵ، یاخود چەند یەکەم گچکە دەسپێکێک کە بەکاربهێنرێت بۆ پێناسەکردنی کارێکی هونەری.

Incise(F), Incisive, Motive(E), Motif(F,G) نەخشاندن، بەشێک لە پێداویستی ئاوازی سەرەکیی *Thematic material*.

Incisione(I), Engraving(E) هەڵکۆڵین.

Incominciando(I), Commencing(E) هاتن، دەسپێکردن.

Incomplete bar(E) باڕی نادروست، یەکەم لێدان *Beat* کە تێیدا لێدانێکی بەهێزی نابێت، لەبەرئەوە یەکەم باڕ بە ناتەواو دادەنرێت.

Inconsoato(I), Mournful style(E) خەمەنگێز چەشن.

Inconsonant, Dissonant(E) ناساز.

Incrociamento(I), Crossing(E), Traversée(F) تێپەڕین.

Indebolendo(I), Becoming weaker(E) بەرەو لاوازتر.

Indeciso(I), Undecided(E) بێبڕیار.

Indefinite pitch clef , Percussion clef(E) کلیلی پەردەی نادیار، کلیلی پێرکیلوژن. مەبەست لە دانانی کلیلی دەنگە بۆ ئامێرە پێرکیوژنەکان *Percussion instruments*.

Indicanto(I), Indicated, Prominent(E), Indiqués(F) نمایان، دەرکەوتوو.

Indicazione d tempo(I), Tempo indication(E) تێمپۆی نمایان،
خێرا دەرخستنی دانراوەیەکی هونەری کە دەبێت بەجێبهێنرێت.
Infra(I), Below(E), Dessous(F) ژێر، بن.
Indifferente(I), Indifferently, Careless(E) بێــبایەخ.
Infernale(I), Infernal, Hellish(E) دۆزەخـــی.
Infinite canon, A round, Going forever(E) ســـووڕان، کانونێکی بێکۆتا.
Infinito(I), Infinite(E) بێکۆتا، بێپایان.
Inflatilia(I), Wind instruments(E) ئامێرە هەواییەکان.
Inflection(E) تۆنـگۆڕین بەهۆی هێمامۆزیکیەکانەوە،
بۆ نموونە: *#Sharp, XDouble-sharp, bFlat, bbdouble-flat, Natural*

| نۆتاندن Notation | English | French | German | Italian | Kurdish |
|---|---|---|---|---|---|
| × | double sharp | double dièse | Doppelkreuz | doppio diesis | دەبڵ تیژ |
| ♯ | sharp | dièse | Kreuz | diesis | تیژ |
| ♮ | natural, natural sign | bécarre, naturel | Auflösungszeichen, Quadrat | bequadro | سروشتی |
| ♭ | flat | bémol | B, Be | bemolle | پاتۆک |
| 𝄫 | double flat | double bémol | Doppel-B, Doppel-Be | doppio bemolle | دەبڵ پاتۆک |

Infrabass(L,G), Sub-bass, An organ stop of 16ft(E) باسی لاوەکی، داخراوە ئۆرگنی16پێ.
Infretta(I), In Haste(E) بە فرتە، بە پەلە.
Inganno(I), Deceit(E) فریو.
Inharmonic(E) ناهارمۆنی، دوورکەوتنەوەی تۆنەکان لەیەکتر.
In modo di(I), In the style or manner of(E) بەڕەوشی، بەچەشنی.
Innig(G), Heartfelt(E) بەدڵەوە.
Inno(I), Hymn(E) ســـتایش و نزا.
In partito(I), In score(E) لەناو دەقدا.
In punta di piedi(I), Walking on tip toes(E) ڕۆیشتن لەسەر نووکی پێ.
In sen scale(E) سـکێڵی ئین سین، ســـکێڵێکی باوی ژاپۆنییە کە بە دەسـگای فریجیەن دەچێت،



سـکێڵی لا/ئین سین*A-in sen Scale* و
بەزۆریش لە ســەروو لا/ماینەر
فریجیەن*A-minor Phrygian* و ســـی/ـ بیمۆڵ لیدیەن*Bb-Lydian*دا بەکاردەهێنرێت.
Insieme(I), Ensemble(F), Together(E) پێکەوە.
Insistendo(I), Insisting(E) سـووربوون، پێداگرتن.

Insonore(F), Soundproof(E) بێدەنگکەرە، دەنگ نەهێڵ، دەنگپارێز.

Instrument(E), Instrumento(I) ئامێر.

هەر لە مێژەوە...کورد هەر وەک میللەتانیتر زۆر ئامێری مۆزیکیان بەکارهێناوە کە تا ئێستایش چ وەک بوونیان لەنێو سادەی خەڵکدا و چە وەک مۆرگ و سۆزیان لە ئاوازەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. هەندێک لەوانە لەنێو خەڵکدا بەدی دەکرێن و هەندێکیشیان بەداخەو لە بەرچاودا ونبوون.

بوێژی ناوداری کورد دەروێش ئوجاقی کرماشانی{1211ـ1286هـ}بەم بەزمە ڕازاوەیە ناوی هەندێک ئامێری بردووە و دەڵێت:ـ

یاران، یاوەران چەند سازێ داریم
مەبۆ نامیشان یەک یەک بیاریم.
**تەنبوور و عوود و ڕوباب و قیتار**
**باربات و قیژەک، شمشاڵ و سێ تار.**
**قوپۆز و تەپڵ و تاس و کەڕەنا**
**دووزەڵە و دەهۆڵ، دوو تەپڵە و زوڕنا.**
**تووتەک و زەنگ و تار و شاخ نەفیر**
**ڕۆد و باڵەبان، کینارە و سەفیر.**
**دایرە و دەف و کەمانچە و مزمار**
**شەیپوور و گاودەم، چەغانە و چارپار.**
**چەنگ و تیریاڵ و دومبەک و قانوون**
**کۆس و سەنتوور و شانە و ئەرغەنوون.**
یەیانە سازی کوردانی کۆنن
{ئوجاق} نازانم نە بەزما چۆنن.

Instrument á archet(F), A bowed instrument(E) ئامێری کەواندار.

Instrument á cordes(F), A stringed instrument(E) ژێی ئامێر.

Instrumental(E) ئامێراڵی، مۆزیکێک کە تەنیا بۆ ئامێرەکان نۆتێنرابێت.

Instrument á percussion(F), Percussion instrument(E) ئامێرە نەگرەییەکان.

Instrumentation(E) ئامێراندن، دەقێکی مۆزیکاییە کە هەر ئامێرێک لە هێڵەنۆتەکانیدا دەژەنرێت.

Instrument á vent(F), Wind instrument(E) ئامێرە هەواییەکان.

Instrumenti(I), Instruments(E) ئامێرەکان.

مەبەست...ئامێرە مۆزیکەکانە کە دەپۆلرێن بۆ:ـ تەختەهەواییەکان*Woodwinds*، براسیەکان*Brass*، نەگرەییەکان*Percussions*، ژێدارەکان*Strings*، هەندێک جاریش کیبۆردەکان*Keyboards* ئیتر ژێدارە لەرێنەرەکان بێت وەک پیانۆ، هارپسیکۆرد...، یاخود بەهۆی هەواوە وەک ئۆرگن*Organ*، یاخود ئامێرە ئەلەکترۆنیەکان کە لە سەتەی/20مدا پەرەپێدرا.

Intabulation(E) خشتاندن، جەدوەلاندن، ڕێکخستنی دەنگە مۆزیکیەکان

بۆ ئامێری کیبۆرد یان ژێگرتە ڕاکێشەکان*Plucked stringed instruments*.

Intavolatura, Tablature(I) بڕوانە/*Figured bass*.

Interligne(F), Space between lines on a staff(E) ناودێڕ،

بۆشـایی نیوان دێڕەکان لە سـکێڵەمۆزیکیەکان.

Interlude, Interludium(L) کورتەپارچەیەک کە لەنێوان دووانی گەورەدا بژەنرێت.

Intermède(F), Intermezzo(I) پارچە بچووکێکی سـەربەخۆ بئاخنرێتە نێو پارچەیەکی ترەوە.

Intermedio(I) بابەتێکی کورت و مۆزیکئامێز و درامایی.

Interpolation(E) درێژاندنی گوزارەیەکی مۆزیکایی ڕەپاتبوو.

Interprète(F), Performer(E) بەجێهێن.فراهەمکار.

Interprèter(F), To perform, To sing(E) بەجێیـبهێنێت، بسترانێت.

Interrompendo(I), Interrupting(E) تەگەرە، ڕێگرتن.

Interrotto(I), Interrupted(E) ڕێگرتوو.

Interrupted cadence(E) کۆسـپە کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Intersections of scale sets(E) دەستە سـکێڵی هاوبڕەکان، ئەو سـکێڵانەن کە کلیلەکانیان جیاوازە بەڵام لە هەندێک تۆندا هاوکۆکن. لەو کلیلانەی کە نۆتەکانیان زۆر هاوبەشن لەگەڵ یەکتردا بریتین لە:ـ سـکێڵی دۆ مێجەر/*C-major* لەگەڵ سـۆڵ مێجەر/*G-major*، سـۆڵ مێجەر/*G-major* لەگەڵ ڕێ مێجەر*D-major*. ئەو کلیلانەی کە نۆتەکانیان زۆر کەم هاوبەشن بریتین لە:ـ سـکێڵی دۆ ـ مێجەر/*C-major* لەگەڵ سـی ـ مێجەر/*B-major*.



Intertone(E) **دوو تۆنی یەکسان لە فریکوێنسیاندا.**

Interval, Distance(E), Intervallo(I),Intervalle(F), Intervall(G) **دووری، میانە،**

**جیاوازی پەردە لەنێوان دوو نۆتەدا، کە هەر میانەیەک ناو و بەهایەکی ژمارەیی خۆی هەیە وەک میانەی دووەم، چوارەم، حەوتەم...هتد، هەروەها بە چەشـنی جۆرێتـی وەک تەواو***Perfect***، گەورە***Major***، بچووک***Minor***، زێدە***Augemented***، گەستوو***Diminished***...هتد.**

**بەگشتی......میانەکان دەکرێن بە دوو بەشتی سـەرەکییەوە:ـ**

1. **سـادە میانە{میانەی سـادە}***Simple interval*...**بریتیە لە میانەیەک کە مەودای لە ئۆکتاڤێک کەمتـرە. بڕوانە/***Simple interval*.

2. **تێهەڵکێشە میانە{میانەی تێهەڵکێش}***Compound interval*....**بریتیە لە میانەیەک کە مەودای لە ئۆکتاڤێک زۆرتـرە. بڕوانە/***Compound interval*.

**لەو جۆرانەی تریش کە بەکاردەهێنرێن:ـ**

1. **میانەی هەڵبەزیو** *Intervalle ascendant(F), Intervallo ascendente(I)*
*Ascending interval(E)*

2. **زێدە میانە** *Intervalle augmenté(F), Intervallo aumentado(I)*
*Augmented interval(E)*

**هەر گەورە میانەیەک بە نیوەتۆنێک بەرزبکرێتەوە دەبێتە زێدە میانە. بۆ نموونە:** C **بۆ** G **و** C **بۆ** A **دەبێتە** C **بۆ** $G^{\#}$ **و** C **بۆ** $A^{\#}$ **کە پێیدەوترێت زێدە پێنجەم و زێدە شەشەم، یاخود** $C^{b}$ **بۆ** G **و** $C^{b}$ **بۆ** A **وەک زێدە پێنجەم و زێدە شەشەم.**

3. **میانەی تەواوکار** *Intervalle complémentaire(F), Complementary interval(E)*.

4. **میانەی تێهەڵکێش** *Intervalle composé(F), Intervallo composto(I),*
*Compound interval(E)*

**بۆ نموونە تۆنی/**C **بۆ دووەم تۆن/**D **و ئۆکتاڤێکی بخرێتەسەر دەبێتە نۆیەم،تۆنی/**C **بۆ سـێیەم تۆن/**E **و ئۆکتاڤێکی بخرێتەسـەر دەبێتە دەیەم، یاخود چوارەم دەبێتە یانزەم، پێنجەم دەبێتە دوانزەم...وە هەروەها.**

5. **میانەی دابەزیو** *Intervalle descendant(F), Intervalo descendente(I)*
*Descending interval(E)*

6. **میانەی گەستوو** *Intervalle diminué(F), Intervallo diminuito(I),*
*Diminished interval(E)*

**هەر گچکە میانەیەک یاخود تەواوە میانەیەک بە نیوەتۆنێک لێی کەمبکرێتەوە دەبێتە گەستووە میانە بۆ نموونە** C **بۆ** $F^{b}$ **یاخود** $C^{\#}$ **بۆ** F **کە گەستووی چوارەمە،** C **بۆ** $E^{bb}$ **یاخود دۆ دەبڵ دێز** *C-double sharp***بۆ** E **کە گەسـتووی سـێیەمە، وەهەروەها.....**

7. **میانەی دروست، میانەی تەواو** *Intervalle juste(F), Intervallo jiusto(I)* **بریتیە لە میانەکانی یەکەم***Prim*، **چوارەم***Fourth, Quadra*، **پێنجەم***Fifth, Quint*، **هەشـتەم***Eight, Octa*.

8. میانەی سـروشت *Intervalle naturel(F), Natural interval(E)*

بریتیە لە میانەیەکی نەگۆڕ، واتە نە زێدە*Augmented* یە و نە گەستوو*Diminished* .

9. میانەی ناهاوسـاز *Intervalle dissonant(F), Intervallo dissonante(I)*
*Dissonant interval(E)*

10. میانەی مێجەر *Intervalle majeur(F), Intervallo maggiore(I)*
*Major interval(E)*

میانەکانی دووەم*Second*، سـێیەم*Third,ters*، شـەشەم*Sixth*، حەوتەم*Seventh, Septima*.

11. میانەی ماینەر *Intervalle mineur(F), Intervallo minore(I), Minor interval(E)*

هەمان میانە مێجەرە بەڵام کەمکردنەوەیان بە نیوەتۆنێک*Semitone*.

12. میانەی هەڵگەڕاو *Intervalle inversé(F), Intervallo invertido(I)*

| French | Italian | English | Kurdish |
|---|---|---|---|
| Intervalle | Intervallo | Distance | Myane/میانە |
| Intervalle ascendant | Intervalo ascendente | Ascending interval | میانەی هەڵبەزیو |
| Intervalle augmenté | Intervalo aumentado | Augmented interval | میانەی زێدە |
| Intervalle complémentaire | | Complementary interval | میانەی تەواوکار |
| Intervalle composé, Intervalle redoublé | Intervallo composto | Compound interval | میانەی تێهەڵکێش |
| Intervalle descendant | Intervallo discendente | Descending interval | میانەی دابەزیو |
| Intervalle diminué | Intervallo diminuito | Diminished interval | میانەی گەستوو |
| Intervalle juste | Intervallo giusto | Perfect interval | میانەی دروست |
| Intervalle majeur | Intervallo maggiore | Major interval | میانەی مێجەر |
| Intervalle mineur | Intervallo minore | Minor interval | میانەی ماینەر |
| Intervalle naturel | | Natural interval | میانەی سروشت |
| Intervalle dissonant | Intervallo dissonante | Dissonant interval | میانەی ناساز |
| Intervalle reversé | Intervalo invertido | Inverted interval | میانەی هەڵگەڕاو |

میانە سـووڕاوەکان. لەلایەن مۆزیکزانی ئامریکایی Interval cycles(E)
جۆرج پیێرڵ*Goerge Perle*(....-1915ز)داهێنرا، بریتییە لە کۆکردنەوەی پەردەکان ئەویش بە دەسپێکردنی نۆتەیەکی دیاریکراو بەرەو سەرەوە و پەیدابوونی میانە تا دەگاتەوە نۆتەبنەڕەتیەکە.
بۆ نموونە پلەتۆنی دۆ/C دابنرێت بەC1 و بەرەو سەرەوە بە دووبارەبوونەوەی سـێ نیوەتۆن بڕۆین تا دەگەینەوەC2ی بەرزتر. پیتیCیش ئاماژەیە بۆ پێگەی سووڕەکە*Cycle*. بۆ نموونە کۆردی گەستوو بازنەی حەوتەم دەبێتە سـووڕی سـێیەم/C3، سـیانیی زێدە*Augmented triad*دەبێتە سـووڕی چوارەم/C4 وە هەروەها.... .نموونەیەکە لە میانە سـووڕەکانیC1, C2, C3, C4, C6.



Interval numlers(E) **میانە نمرێنراوەکان.**




Intime(F), Intimo(I) Intimate(E) **بە دڵنەرمی.**

Intonation(F,E), Intonazione(I) **ناوتۆنێن، ئاوازێن، زاراوەیەکی مۆزیکدانەرانی ئیتالیاییە لە سـەردەمی تازەگەریی*Renaissance*دا کە گوزارەیەک بوو بۆ پێشکەشکردنی دەنگێکی مۆزیکایی بۆ سـرۆتە کلێسەییەکان و دانانی کلیل و تێمپۆیەکی لەبار بۆ خوێندنەوە و وتنەوەی. بەڵام سەردەمی دوایین و ئێستا بەوە لێکدەدرێتەوە کە پلەیەکە ئەوپەڕی تۆنی بیستن تیایدا ڕاست و دروست و کۆک بێت نەوەک نادروسـت و هەڵە و نەشـاز.**

Introduction(E), Introduktion(G), Introduzione(I) **پێشـەکی،.*Intro*کورتکراوەیەتی، دەسپێکی پارچەمۆزیکێک، ئەم شـێوازە زیاتر لە کارێکی سـیمفۆنی یاخود کۆنسێرتۆیەکدا دەبینرێت.**

Intervals Comparation(E) **میانەی بەراورد.**

Inversion(E), Converso(L) **هەڵگێڕاوە، پێچەوانە، هەڵگێڕانەوەی سـەرەوخواری کۆردێک یاخود تاکە میلۆدیەک بە بەکارهێنانی میانەکان بە ئاڕاسـتەیەکی پێچەوانە، یاخود دوو میلۆدی لە کۆنتراپونتێکدا بە دانانی میلۆدی سـەرەوە لە شـوێنی میلۆدی خوارەوە و بە پێچەوانەیشـەوە. ئەمەی دواییینیان پێیدەوترێت کۆنتراپونتی هەڵگێڕاو. بۆ نموونە: تۆنیC-F لە دابەزیندا دەبێتە تۆنیC-G، یاخود کۆردێکی سـیانیی وەک دۆ ـ مێجەر/C-E-G کە پێکهاتووە ڕەگ*Root* کە نزمترین نۆتەیە لە کۆردەکەدا و نۆتەی سـێیەم و پێنجەم. لە هەڵگێڕانەوەی یەکەمدا*First inversion* دەبێتەE-G-C/ واتە سـێیەم ـ پێنجەم ـ ڕەگ. لە هەڵگێڕانەوەی دووەمدا*Second inversion* دەبێتەG-C-E/ واتە پێنجەم ـ ڕەگ ـ سـێیەم، وە هەروەها... .**

**چەند نموونەیەک لە هەڵگێڕاوەکان**









## میانە هەڵگێڕاوەکان

| | |
|---|---|
| هەڵگێڕاوی/1 | دەبێتە/8 |
| هەڵگێڕاوی/2 | دەبێتە/7 |
| هەڵگێڕاوەی/3 | دەبێتە/6 |
| هەڵگێڕاوی/4 | دەبێتە/5 |
| هەڵگێڕاوی/5 | دەبێتە/4 |
| هەڵگێڕاوی/6 | دەبێتە/3 |
| هەڵگێڕاوی/7 | دەبێتە/2 |
| هەڵگێڕاوی/8 | دەبێتە/1 |
| هەڵگێڕاوی تەواو*Perfect* | هەروەکو خۆی دەمێنێەوە. |
| هەڵگێڕاوی مێجەر*Major*. | دەبێتە ماینەر*Minor*. |
| هەڵگێڕاوی ماینەر*Minor* | دەبێتە مێجەر*Major*. |
| هەڵگێڕاوی گەستوو*Diminished* | دەبێتە زێدە*Augmented*. |
| هەڵگێڕاوی زێدە*Augmented* | دەبێتە گەستوو*Diminished*. |

**میانەی هەڵگێڕاو، بڕوانە/***Inversion*. Inverted interval(E)

**دەشێت ئەم میانانە بە دوو بەشی سەرەکیش بپۆلێنرێن:ـ**

**بەشی یەکەم:ـ میانە هاوسـازەکان***Concordant intervals***کە تەواوە میانەکان، مێجەر و ماینەرە سێیەمەکان و شەشەمەکان دەگرێتەوە.**

**بەشی دووەم:ـ میانە ناهاوسـازەکان***Discordant intervals***کە هەموو گەستوو و زێدەکان، دووەم و حەوتەمەکان دەگرێتەوە.**

**ئەگەر ئەمانە هەڵبگێڕدرێنەوە...هەرچی تەواوە میانەیە وەک خۆی دەمێنێتەوە، هەرچی مێجەرە دەبێتە ماینەر و بە پێچەوانەیشەوە، هەرچی گەستووە دەبێتە زێدە و بە پێچەوانەیشەوە. ئەمەیش نموونەیەکە لە پێوانەی هەندێک لە میانە مۆزیکیەکان بە یەکەی سـەنت***Cent*.

| Scale Interval | Equal Temperad | Just | Pythogorean |
|---|---|---|---|
| Whole tone | 200 Cent | 182<br>204 Cent | 204 Cent |
| Minor third | 300 Cent | 316 Cent | 294 Cent |
| Major third | 400 Cent | 386 Cent | 408 Cent |
| Fourth | 500 Cent | 498 Cent | 498 Cent |
| Fifth | 700 Cent | 702 Cent | 702 Cent |

**دەسگای ئایۆنیەن. مۆزیکدەسگایەکی زۆر دێرینە و تایبەتە** Ionian mode(E)

**بە دەسگای ئایۆنیا***Ionia***، مەبەست لە کلیلە سپیەکانی پیانۆیە لە تۆنی دۆ/**C**بۆ دۆ/**C**{هەمان دۆ/ی لە سـکێڵی مێجەردا***Major scale* **بە زنجیرە تۆنەیەکی بەرزبوونەوە}.**



*T-T-S-T-T-S(T=Tone or Whole-steg, S=Semitone or half-steg)*

Ironico(I), Ironical(E) **شۆخی و گاڵته.**

Irregular rhythmic groupings(E) **گروپی ڕەزمە ناڕێکەکان.**

دوو لە ڕەزمی سێدا
Two in the time of three
Double or couplet
دەبڵ یاخود جووتپل

سێ لە ڕەزمی دوودا
Three in the time of two
Triplet(Triolet)
سێپل

چوار لە ڕەزمی سێدا
Four in the time of three
Quadruplet
چوارپل

پێنج لە ڕەزمی چوار یاخود سێدا
Five in the time of four or of three
Quintuplet
پێنجپل

شەش لەڕەزمی چواردا
Six in the time of four
(Double triplet)
Sixtolet شەشپل
دەبڵ سێپلی ڕاست

حەوت لە ڕەزمی چوار یاخود شەشدا
seven in the time of four or of six
Septolet
حەوتپل

Isorhythm(Gr), Equal rhythm(E) **هاوڕەزم، یەکسانەڕەزم.**

**زاراوەیکی بەکارهێنراوە لە مۆتێت***Motet***ەکاندا لە نزیک نێوان**1300-1450**زدا.**

Istesso tempo(I), As the same tempo(E) **وەک لە هەمان تێمپۆدا.**

Italian overture(E) **ســەرایی، پێشەکی ئیتالیایی، کارێکی ئۆرکێسترالیە کە دەگەڕێتەوە**

**بۆ ســەتەکانی**/17**م و** 18**م کە بریتیە لە ســێ جووڵە:ـ خێرا***Quick***ـ خاو***Slow* **ـ خێرا***Quick*.

Italian sixth(E) **شەشەمی ئیتالّیایی، هەندێجار پێیشیدەوترێت زێدە کۆردی شـەشەم/ســێ.**

$A^{b}$, C, $F^{\#}$ / **جۆرێکە لە کۆردێکی زێدەی شـــەشـــەم کە لەســەر ســێ نۆتە دامەزراوە بۆ نموونە**

**کە جیادەکرێتەوە بەوەی ســیانیی مێجەرە***Major triad* **و هیچ نۆتەیەکی تریش لەنێوانیاندا نیە.**

-----------------------------------
---------------------
-----------

هارپی چەناگە
Jew's Harp

# J

مۆزیک... سـرۆشێکە لە هەموو دانست و فەلسەفەیەک بەهاترە.          بیتهۆڤن

---

Jack(E) **جاک،**

**ئامرازێکی لاکێشەییە، لە دارهەرمێ دروستکراوە، بەشـێوەیەکی سـتوونی بەهۆی دوگمەکانی پیانۆ یاخود هارپسیکۆرد بەرەو سەرەوە دەجوولێت و بەسەر ژێکاندا دەدرێت و دەنگ پەیدادەکات.**

Jack rail(E) **سـککە جاک، پارچەدارێکی بەستراوە بەسـەروو**

**ئامێری جاک***Jack***ەوە تاکو بەرێکی جوولانەوی بەرەو سـەرەوە بکات.**

Jaghorn(G), Hunting horn, Bugle(E) **بووقی ڕاو.**

Jägerchor(G), Hunting chorus(E) **دەسـتەی دەنگبێژان لە مەیدانی ڕاوشـکار.**

Jaleika(Ru) **جالەیکا، ئامێرە هەوایەکی میللی ڕوسـیاییە لە شـاخی گا دروستدەکرێت.**

Japanese Music notes(E) **نۆتەی ژاپۆنی**

| C | D | E | F | G | A | B |
|---|---|---|---|---|---|---|
| I | Chi | Yo | Ra | Ya | A | We |

Jaw harp, Jew´s harp, Trump(E), Guimbarde(F), Maultrommel, Juden harpfe(G) **هارپی چەناگە، چەنەهارپ، جووە هارپ.**

**مۆزیکئامێرێکی زۆر کۆنە، لایەکی بە ددانەکانی هەردوو چەناگەی ناودەم دەگیرێت و سـەرەکەیـتری بە پەنجە یاخود بە گرتەڕاکێشـان***Plucked***ی ژێیەکانی. دەنگ لەرینەوەیەکی کانزایی لێوەڕا پەیدادەبێت.**

Jazz(E) **جاز، چەشنە سـتران و مۆزیکێکی میللی ئافرۆ ـ ئامریکاییە،**

**جیادەکرێتەوە بەوەی کە ڕەزمێکـی زۆر بەهێز، نۆتەب لووزەکان***Blue notes***، سـەرپێیـەک لە هێڵە میلۆدیەکان لەسـەر ڕەچەکۆردێکـی یەکلەدواییەک***Chord progressions***لەگەڵ لێدانێکـی هاوسـەنگ و جێگیر***Steady beat*** و سـینکۆپێکی بۆ دانراوی هەیە. لە سـەرەتای1900ز/یەوە پەرەپێدرا و والاکاری تیاداکرا و چەندین جۆری لێوەڕا کەوتەوە، وەک جاز فلووت***Jazz flute***، جاز پیانۆ***Jazz piano***، جاز ڕۆک***Jazz rock***، جاز پۆپ***Jazz pop***، جاز کیبۆرد***Jazz keyboard***، جاز ڤیۆلین***Jazz violin***....هتد.**

Jazz trumpet(E), Tromba da jazz(I), Trompette de jazz(F) جاز ترومپێت.

Je(G), Always, Each(E) هەمیشە، هەر.

Jeden ton(G), Each tone(E) هەر تۆنێک.

Jeu(F), An organ stop(E) ژیو، ئۆرگنی داخراو.

Jeux(F), Plural of Jeu(E) ژیوکس، کۆی وشەی ژیو.

Jeux doux(F), Soft, Sweet stops(E) نەرم، دەنگی نیانی ئۆرگن.

Jhala(Hn), The final, fast movement of a raga(E) ژالا، کۆتایی، خێراجوولە لە ڕاگ/هیندی.

Jhanj(In), Cymbal(E) ژانج، ساج، سـیمباڵ.

Jouer(F), To play, To perform(E) ژەنین، بەجێهێنان.

Jubelnd(G), Jubilant,(E), Jubiloso(I) شادمان.

Just, Exact, True, Perfect, In tune, Juste(F) تەواو، کۆک، ڕاست، مەبەست لە تەواوی دەنگەکانە بەشـێوەیەکی ڕاست و دروست کە بەپێی ڕێسای ئاوازێن*Intonation* میانەی هەموو دەنگەکان و ئامێرە ژێدارەکان و هەواییەکان بە پەردەی تەواویان دەگرێتەوە.

Just intonation(E), Intonazione giusta(I), Intonation juste(F) ناوتۆنێنی تەواو{ڕاست}.
Reine stimmung(G)

ناوتۆنێنی تەواو{ڕاست}، سیسـتەمێکی کۆککراوە کە نۆتەکان بە زێدەکردن{خستنەسەر*Adding* و لێدەرکردنی*Subtracting*ی پێنجەم و سێیەمە سـروشـتیەکان وەدەسدەکەوێت.

| Note نۆتە | | ڕێـژە Ratio | Interval میـانە | پێوانەی Just intonation به سه نت Cent |
|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ناو | | | |
| 0 | C | 1:1 | Perfect unison | 0 Cents |
| 1 | C# | 135:128 | Major chroma | 111.73 Cents |
| 2 | D | 9:8 | Major second | 203.91 Cents |
| 3 | Eb | 6:5 | Minor third | 315.64 Cents |
| 4 | E | 5:4 | Major third | 386.31 Cents |
| 5 | F | 4:3 | Perfect fourth | 498 Cents |
| 6 | F# | 45:32 | Diatonic tritone | 590 Cents |
| 7 | G | 3:2 | Perfect fifth | 702 Cents |
| 8 | Ab | 8:5 | Minor sixth | 814 Cents |
| 9 | A | 27:16 | Ptthagorean major sixth | 884 Cents |
| 10 | Bb | 9:5 | Minor seventh | 996 Cents |
| 11 | B | 15:8 | Major seventh | 1088 Cents |
| 12 | C | 2:1 | Octave | 1200 Cents |




Just intonation




Just tuning(E) **کۆککردنی دروست کە میانەکانی پوختە و تەواوبن و لە ڕیزی سەرتۆن***Overtone***ەوە لای نەداتبێت، بڕوانە**/*Overtone*.

----------------------------------
--------------------------
-----------------

# K



Kaval کەڤاڵ



کەمانچە سەرئەژنۆی کوردی

Kurdish spike fiddle



کەمانچەی ســێ ژێ

Kemenċe



Keyboard کیبۆرد



Kazzo کازۆ

# k

مۆزیک...هونەری ئەندازەسازی دەنگەکانە لە پێوانەیەکی کاتـدا!!!
فـرێدریک هیگڵ

---

کادەنس/ بڕوانە*Cadence*. Kadenz(G)

دەنگی ناسـاز، دەنگی ناچوونیەک. Kakophonie(G)

دیوان، هۆڵ، هەیوان، سـالۆن. Kammer(G), Chamber(E)

دیوان کۆنسێرت. Kammer concert(G), Chamber concerto(I), Chamber concerto(E)

دیوانی دووانی، Kammer duet(G), Chamber duet(E)

ئاهەنگێک کە بە دوو ژەنیار لە دیواندا پێشـکەشبکرێت.

دیوانـی مۆزیک. Kammer musik(G), Chamber music(E)

دیوانـی مۆزیکار، Kammer musiker(G), Chamber musician(E)

ناسـناوە بۆ ئەو کەسـەی هۆڵی ئۆرکێسـتراکە بەڕێوەدەبات.

دیوانی ئۆرکێسـترا. Kammer orchesta(G), Chamber orchestra(E)

سـترانێژی دیوان{نێرینە}. Kammer sänger(G), Chamber singer(E)

سـترانبێژی دیوان{مێیینە}. Kammer sängerin(G), Chamber singer(E)

دیوانە تۆن، پەردەی دیوان. Kammerton(G), Chamber pitch(E)

لە ئەڵەمانیا...ئەم زاراوەیە لە هەگبەی بارۆک*Baroque period*دا بۆ مۆزیکئامێرە دیوانیەکان بەکاردەهێنرا. واتە جیاوازی پەردەیەک بۆ پەردەیەکیتر و دانانی تاکە تۆنێک وەک پێوانەیەکی ڕەها*Absolute standard*. لەسـەر ئەم ڕێسـایە دەتوانرێت ئەم پەردانە بەپێی سـتاندەری پەردە*Pitch standard*پەیوەندییان بۆ سـازبکرێت. سـتاندەری پەردەیش لە دیوانە تۆن*Kammer tone*دا کە دانراوە دەبێت فریکوێنسـیەکەی لە نزیکە410-425Hzدا بێت کە بە بەهای هاوچەرخی ئێسـتامان کراوە بە440Hz. پەردەی دیوان بە سـێ جۆر دەپۆلێنرێت:ـ

1. کۆرتۆن*Chorton*، پێشـیدەوترێت پەردەی کۆرس*Choir pitch*، پەردەی ئۆرگن *Orgen pitch*، ئەم جۆرە بۆ ئۆرگنـی کلێسـە و کۆڕاڵ مۆزیک بەکاردەهێنرێت، ڕادەی پەردەکەی*Relative pitch*کە دووەمـی مێجەرە لە تۆنی دیوان*Kammerton*بەرزترە.
2. دیوانە تۆن*Kammer tone*، یاخود*Chamber music*، پەردەیەکە کە بۆ مۆزیکئامێرە ناوخانەییـەکان*Domestic instrumental music*}بەکاردەهێنرێت، ڕادەی*Relative* پەردەکەی بە ئەندازەی بیمۆڵ دیوانەتۆن*Flat kammerton*ێک نزمترە.

3. دیوانەتۆنــــی نزم*Tief kammerton*، پەردەیەکــی نزم، قووڵ*Deep*، پان*Flat*، پەردەیەک لە دیوانەتۆن نزمترە.

Kanun, Qanoon(Ar,Fa,Kr,Tr), Canon(E) **قانوون، ژێدارئامێرێک خۆرەلاتی/یە کەمێک بە ئامێری زیتار*Zither*دەچێت، لە سنووقێکی بۆشی لاکێشەیی پان پێکهاتووە، دەنگەکانی سێ بۆ چوار ئۆکتاڤە کە نزیکەی حەفتاوچوار ژێی لەخۆگرتووە، هەر ژێیەکی سێ تەلە، نیوە دەنگ و چارەکە دەنگەکانی بە گێڕ دەگۆڕدرێت کە بریتیە لە پارچە ئامرازێکی مادەنی لە لای دەستی چەپی ئامێرەکەدا چەسپێنراوە.**



Kaval(Bu) **کەڤاڵ، کەتەنای، ئامێرێکی هەوایی میللییە لەنێو گەلانی بولگار و ئەلبان و مەکەدۆنیا، دەمەکەی لە شاخی گا دروستکراوە، تۆنەکانی لەسەر کلیلی/Dیە کە دواجار لەسەر دەستی ئامێرسازانی بولگاریایی*Slavi Ivanov* و *Kameno*دانراوە.**

K.B(G) **کورتکراوەی کۆنتراباسە***Kontrabass(G), Double bass(E)*.

Kasik, Turkish spoons(E) **خاشوگ، کەوچکە ڕەزمییەکان.**

Kazoo, Mirilton(E) **کازوو، میریلتۆن، ئامێرێکی دەمی بچووکە کە دەنگێکی لەرینەوەیی هەیە.**

Kelan(Kr) **کەلان، بە کەسانی دۆم وتراوە کە کۆڵانەوکۆلان بە شار و دێهاتاندا دەگەڕێن و دێنە بەر دەرگای ماڵان، بە دەفژەنین و بەندبێژانەوە نان و خۆراکیان لە پریاسکەکانیاندا کۆدەکەنەوە.**

Kemançe(Ar, Fa,Kr), Violin(E) **کەمانچە، کەمانژە، وشەیەکی لێکدراوی کوردییە پێکاتووە لە کەوان کە شوولێکی چەمیووی هەردووسەر بەستراوە بە لیژنەیاڵێک یاخود کلکەمووی گیاندارێکی وەک ئەسپ، پاشان بە گۆڕانی زوان و کاریگەری زوانانی دەوروبەریش بەتایبەتی زوانی فارسی و پاشان عارەبی بۆتە کەمان. پاشگری چە/یش پێدەچێت لە ڕیشەوشەدا ژێ بوویێت، ئەمیش بە هەمان کاریگەر بۆتە چە یاخود جە، تیکڕای مانای وشەکە ژێی کەوان دەگرێتەوە کە دوو ئامرازی لە ئامێز یەکگتروو و تەواوکەرن بۆ یەکتر. سەردەمانی زۆر زۆر دێرین بریتیبووە لە دەسکەدارێکی سادە کە بەسەرێکیەوە کودە{کاسە}یەکی پێوەبەستراوە و ژێ/یەک یاخود دووانی لێبەستراوە و ئینجا ژێ/یەکە بەسەر کاسەکەدا براوە و لە سەرەکەیتری دەسکەدارەکە بە پێچەکێک توندکراوە، ئینجا کەوانەکەی بەسەردا دەخێشنرا بۆئەوەی دەنگ و ئاوازی پێدەربهێنرێت. زۆر لە ژێدەرانی مێژوو گەواهی ئەوە دەدەن ئەم شێوەیەی کە هەر لە دێر زەمانەوە تائێستایش ماوەتەوە لەنێو کوردانەوەڕا سەری هەڵداوە و میللەتانی دەوروبەریش پێی ئاشنابوون. دەشێت هەر ئەم شێوەیە بوویێت بەرەبەرە گەیشتبێتە ئاوروپا، لەوێش تەواو خاسکاری تیاداکرابێت و پەرەپێدرابێت و گەیشتبێتە ئەو شێوەی ئێستای بەناوی ڤیۆلین*Violin* کە چوار ژێی لەسەر بەندە، دەخرێتە سەرشانی چەپ و دەژەنرێت....بەگشت جیهاندا بڵاوبۆتەوە.**



**ئەو شێوە ساکارەی کە تاکو ئێستا لەنێو کوردەواری و میللەتانی تردا بەرچاودەکەوێت تەنیا دوو ژێی لەسەر بەندە و بە شێویەکی ستوونی لەسەر ئەژنۆ و دەژەنرێت. لەنێو کورد و فارس و ئازەریدا هەر بە کەمانچە ناودەبرێت، لەنێو عارەبدا بە جۆزە ناودەبرێت لەبەرئەوەی کە کاسەکەی لە شێوەی لەتکە گوێزێکی هێندیدایە.**

Kemaycha(Hn) کەمایچە، ئامێرێکی ژێداری هیندی/یە کە نۆزدە تەلی لەسەر بەندە و بەشێوەیەکی ستوونی دەژەنرێت، سێ تەلی لە ڕیخۆڵەی گیاندار دروستکراوە بۆ میلۆدی، دووانی لە سیم/براس*Brass*بۆ گیزەگیز*Drone*کردنی میلۆدیەکە و چواردە تەلی لە سیم/پۆلا*Steel*بۆ زرنگانەوەیەکی نەرم و دڵگیر.

Keras(Gr), Curved horn(E) کێراس، چەمیوە هۆڕن، ئامێرێکی زۆر دێرینی یۆنانییە.

Karaulophone(E) کاراولۆفۆن، نەرمەدەنگی داخراوە ئۆرگان*Organ stop*ی لوولە هەشت پێی/یە.

Keren(Hb), Horn, Trumpet, Cornett(E) قەرن، شاخ، هۆڕنی عیبری.

Key(E) کلیل، مایە، لەڕووی میکانیکییەوە*Mechanically*...ئامرازێکە لە ئامێرەکانی پیانۆ، ئۆرگن، هارپسیکۆرد، قانوون و سەنتوور...هتد کە بۆ کۆککردنی دەنگەکان بەکاردەهێنرێت. لە ئامێرەهەواییەکاندا کە پێیدەوترێت کلیلپۆش*Key flaps* باڵێکی جوولاوەیە و کۆتاییەکەی خڕێکی پانە و ژێرەوەی پارچە لباد*Pad* یاخود چەرم*Leather*ێکی پێوەیە کە ئامێرژەن بۆ داخستن و کردنەوەی دەنگەکان بەکاریدەهێنێت. لەڕووی تۆناڵی*Tonality*یشەوە...پێناسە دەکرێت بەوی کە سکێڵ*Scale*ی پایەتۆنە*Tonic*ەکانی لەسەر بەندە، وەک دەوترێت مێجەر*Major* و ماینەر*Minor*.

Keyboard(E), Tastatur(G) دەستاتوور، کیبۆرد، ئامێرێکە کە بە پەنجەکان لێدەدرێت، یاخود پێدالبۆرد*Pedal board*کە پایەدری هەیە و بە پێلێدەدرێت.

Key note(E) کینۆتە، کلیلە-نۆتە، یەکەم تۆنە کە پێیشیدەوترێت پایەتۆن*Tonic*.

Key signature(E), Armatura di chiave(I) هێما کلیلەکان لە هێڵاسۆ مۆزیکیەکاندا

Armature, Armature de la celé(F)

دەنگی تیژ*Sharp* و پانۆک*Flat*ەکان لە لای دەستەچەپی هەر هێڵێک لە هێڵاسۆ*Staff*کەدا دادەنرێت. تیژ و پانۆکە ئاساییەکانی سکێڵی سروشتە ماینەر*scale Natural minor*لەسەر کلیلەنۆتەکان دادەنرێن. کلیلەکانی تیژی مێجەر و کلیلی دۆ/مێجەر*C-major*نە هێمای تیژ هەیە و نە پانۆک وەک لەم خشتەیەدا:ـ



بۆ نۆتە پانۆکەکانیش هەر بەهەمان چەشن سکێڵی سروشتە ماینەر*Natural minor scale*لەسەر کلیلەنۆتەکانی مێجەر بەشێوەیەکی تەریبی*Parallel* دادەنرێن. بۆ نموونە کلیلەنۆتەی دۆ مێجەر-*C-major* بە سێ تۆن خوار خۆی هەمان کلیلەنۆتەیە لە لا ـ ماینەر*A-minor*دا، کلیلەنۆتەی سی مێجەر*B-major* بە سێ تۆن خوار خۆی هەمان کلیلەنۆتەیە لە سۆڵ/ی تیژ ماینەر *G-Sharp minor*دا. کلیلەنۆتەی سی بیمۆڵ ـ مێجەر*Bb-major* بە سێ تۆن خوار خۆی هەمان کلیلەنۆتەیە لە سۆڵ ماینەر*G-minor*دا.



Khawker, Xawker(Kr) خاوكەر. كزەيەكی زۆر كاريگەر و دڵڕەوێنە،

خەياڵ بردەی خاو ڕەوێنە، دەسـگايەكی تايبەتە بە ناوچەی گەرميان، پێشـيدەوترێت بەرزە قەتار.

شـاخەی شـريخەی بريسكەی دەروون    لە چەم شـەتاوان جاكەرد چوون هون

مەولەوی، بەدەنگی:علی مەردان



Khayal(Hn) خەياڵ، ئەندێشە، ئامێرێكی ژێداری هينديـيە، زاراوەيەكی هينديية

كە بەچەشنێكی دوو بەيتی ئاڵۆز لە سروودەكانی ڕاگا*Raga*دا دەبێژرێت.

Khenabad, Xenabad(Ar,Kr,Az) خەنەباد

لەو كەلە دەنگی سـاز دێ هەلالە و زەمزەمە    دەنگی خۆش ئاواز دێت لەو باخ وچەمە

بەدەنگی:عەلـی مەردان

لێڕشتەيەكی سـەربە دەسگای نەهاوەندە و لەسـەر پلەی نەوا دەوەسـتێتەوە.

خەنەباد....ياخود خاناباد كە بەمانای خانەيەكی تاوستانی، ياخود بڵێين هەوارگەيەكی خۆش و سـازگار لەنێو باخی كۆشک و تەلارێكدا سـازكرابێت كە بەزم و ئاهەنگـپێژێنی خۆشی و دڵڕەوێنی تيادا بوەشێنرێت و دووربێت لە نيگەرانی و دڵپەستـی و سـيوابوونەوە

Kherek, Kharak, Dame(Fa,Kr) خەرەک، دامە، پارچە تەختەيەكی داتاشـراوە لەسەر سـنگی



ئامێرە ژێدارەكانی وەک ساز و كەمانچە و عوود...هتد. بۆ ئەوەی

ژێيەكانی بەسـەردا دەبرێت بۆ گەياندن و زايەڵەپەيداكردنی دەنگەكان

كە لەناو سنگە بۆشاييەكەيدا ئەم نموونەيە تايبەتە بە ئامێری سـەنتووردا دادەنرێت

Kinnor harp, David´s harp(E) هارپی داوودی، ئامێرێكی زۆر دێرينی يەهودييە كە

گوايە دەگەڕێتەوە بۆ سـەردەمی حەزرەتی داوودی پێغەمبەر.

Kithara(Gr) كيتارا، ئامێرێكی زۆ دێرينی يۆنانييە،

شـێوەيەكی خڕی بازنەيی هەيە و نزيكەی يانزە ژێی لەسـەر بەسـتراوە.

Klarinette, Klarinetten(G), Clarinet, ClarinetsI(E), Klarino(Gr) ئامێری كلاڕنێت.

klaroen(G), Bugle(E) ئامێری بووق.

Klassik(G), Classic(E) كلاسيک.

Klassisch epoche(G), Classical period(E) سـەردەمی كلاسـيک.

Klassisch musik(G), Classical music(E) كلاسـيكاڵ مۆزيک.

Klavecimbal(G), Harpsichord, Clavecin(E) ئامێری هارپسـیکۆرد.

Klang(G), Sound, Tone(E) دەنگ، تۆن.

Klappe(G), Key(E) کلاپە، دوگمەی سـەر کونەتۆنی ئامێرە هەواییەکان.

Klavier(G), Keyboard(E) کلاڤیار، ئامێری کیبۆرد.

Klein, Kleine(G), Small, Minor(E) گچکە، ماینەر.

Kleine flöte(G), Piccolo(E) پیککۆلۆ. ئامێرێکی هەواییە و لە فلووت بچووکترە.

Kleine pauke(G), Small timpano, Small kettle-drum(E) گچکەتەپڵ، تەپڵۆکە.

Kleiner mollseptak kord(G), Seventh minor chord(E) گچکە کۆردی حەوتەم.

Kleine sekond(G), Minor second(E) گچکەی دووەم.

Kleines intervall(G), Minor interval(E) گچکە میانە.

Klingel(G), Bell(E) زەنگ.

Knarre(G), Rattle(E) کنارە، ئامێرە کرانەکان.

Komma(G), Comma(E) کۆما، لە ناوی کارڵ میکایل کۆما*Karl Michael komma*وە هەڵێنجراوە لە نووسراوەکانی مۆزیکزان ژان زاک*Jan Zach(1699-1773)*دا هاتووە کە پێوانەیەکی ژمێرکارییە و گوزارە لە یەکەی میانەتۆن دەکات کە دەکاتە1/9ی تۆنی تەواو*Whole tone(step)* واتە نۆ کۆما9-Komma، میانە تۆنێک دەکاتە8/9ی تۆنێک.

Kontra(G) بڕوانە/*Contra*.

Kontraalt(G) بڕوانە/*Contralto*.

Kontrabas(G) بڕوانە/*Double-bass*.

Kontrabassklarinette(G). Contrabass clarinet(E) کۆنتراباس کلارنێت.

Kontrabassposaune(G), Doublebass or Contrabass trombone(E) کۆنتراباس ترۆمبۆن.

Kontrafagott(G), Contra bassoon(E) دەبڵ باسـسـوون، کۆنترافاگوت.

Kontrapunkt(G) بڕوانە/*Contrapoint*.

Konzert(G). Concert(E) بڕوانە/*Concert*.

Kopuz, Koboz(E) کۆپوز، ئامێرێکی ژێداری بچووکە، پێیشیدەوترێت کوڵە عوود*Short lute*. سـەرهەڵدانی ئەم ئامێرە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی453ز لە سـەردەمی ڕۆمانەکاندا، لە سەدەی شانزەم بۆ هەژدەم وەک ئامێرێکـی میللـی بە فراوانـی بەکاردەهێنرا، لە ولاتانی ئاسـیای ناوەندیشـدا زۆر بەکاردەێنرێت.

Kratema(E) کراتێما، میلۆدییەکی سـەربەخۆیە کە بۆ درێژەپێدانی سـروودێک بەکاردەهێنرێت، پێکهاتووە لە تێرپیتیزما*Teretisma*کە لە ڕووی زوانەوانییەوە چەند حونجەیەکی بێ مانایە وەک تێرپرەم*Terirem*، تێنانا*Tenana*، تۆڕۆڕۆن*Tororon*.

Kratematarion(E) چەند کۆنووسراوێکی کراتێمایە بەگوێرەی هەشت دەسگا*Mode*ڕێکخراوە.

Kreis(G), Cycle, Circle(E) بازنە.

Kreuz(G), Sharp(E) **دێز، بڕوانە**/*Dièse*.

Kurd(Ar,Fa,Kr,Tr) **دەسگای کورد.**

**پێدەچێت ئەم دەســگایە....بەناو و مێژووەکەیدا بگەڕێتەوە بۆ خێڵەکانی ناوچەی بەختیاری{کە ئێســتا ئوســتانێکی ســەر بە ولاتی ئێرانە و پایتەختەکەیشــی شــاریکورد/ە و فارس کردوویەتە شهرکرد}کە بەشـێکن لە هۆزی گەورەی لوڕ، بەشێکیان دوچاری دوورخسـتنەوە بوون و لە ناوچەکانی ئەســفەهان و شــوشـتەر و زەردکۆدا نیشـتەجێبوون، لەبەرئەوە شـیمانەی ئەوە هەیە کە ناوەکەی لە ناوچەی شــاریکورد/ەوە هاتبێت. دێرینە کزەبای دەوارنشــینان و کۆچەرییانی ئەو دەڤەرەیە. نووسـەری بەناوبانگ میرزا فرصة الدولة/ی شــیرازی1854-؟ لە کتێبەکەی بەناوی بحور الالحان بە ئاوازێکی کوردی ناوی دەبات.**

**زۆر لە مێژەوە کورد خۆی بە دوو بەرە ناو دەبرد{لە زۆر میللەتاندا ئەم پۆلاندنە کۆمەلایەتییە هەیە} یەکێکیان بە کورد کە بە ڕەوەند و دەوارنشینـن، بەرەیەکی تریان بە گۆران{بڕوانە/*Gewır*}. جا لەنێو بەرەی کوردان/دا ڕەنجی ژیان سـەختی و خەموپەژارە زۆرە. لە پاڵ ئەو سـەختی ژیانەیاندا دەخوازێت هاودەمێکیان هەبێت کە کەمێک لە خەم و ماندوویێتیان بڕەوێنێتەوە ئەویش چرپینی هەوا و نەوایەک کە فرۆزەی ئەو ژیانەیان بکات.**

**کورد.....دەســگایەکی ســەرەکییە لە مۆزیکی خۆرەلاتیدا. ســکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی. لە هاتنەخوارەوەدا هەمان ســکێڵی هەیە بەلام بە دوو ڕەگەزی سـەرەکی جیاواز کە بریتین لە ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا.**




**ئەو لێرشـتانەی کە لەم دەســگایە کەوتونەتەوە ئەمانەن:ـ حجازکارکورد، شـەوقـتەرەب، تەرزیـنوێن، شـانازکورد، هەســارکورد.... .**

Kurdan, Gırdan(Ar,Kr) **کوردان، یاخود گردان....هەمان ســکێل دەســگای ڕاستە، بەلام جیاوازییان تەنیا لەوەدایە کە ڕاسـت لە پلەتۆنی دۆ/ی ناوەڕاسـتەوە دەسـپێدەکات لەکاتێکدا گردان لە پلەتۆنی دۆ/ی زیل{جەواب}ەوە دەسـپێدەکات.**

Kurdeli(Ar,Kr) **کوردەلـی، هەر هەمان دەســگای کوردە بەلام لەسەر پلەتۆنی ڕێ/وە، کوردەلی حجازکار/یش هەر هەمان دەســگای کوردە بەلام لە پلەتۆنی دۆ/وە.**

Kurdén(Ar,Kr) **کوردێن، لێرشتەیەکی سەربە دەسگای کوردە، پێکهاتووە لە ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی نەوا. لای مەقامخوێنانی بەغدا بە مەقامی لامی ناسراوە.**




Kurdish spike fiddle(E) **کەمانچەی نووکدار، سەرئەژنۆ کەمانچەی کوردی**

Kshtaban(Fa), Angustewan(Kr), Thimble(E) **کشتەوان، ئەنگوستەوان.**

**بەو دوو پارچە مادەنە پێچراوە دەوترێت کە دەکرێنە هەردوو سەر پەنجەی شایەتمانی دەستی ڕاست و چەپ، هەر یەکەو ڕیشەیەکی تێئاخنرێت بۆ ژەنینی ئامێری قانوون.**






# L




ڕازی گەوهەری وشـە لە چامەدا.....هونەری مۆزیکە.

ئاندرێ سوراس

---

La(F,I), A(E,G) تۆنی لا، شەشەمین دەنگی مۆزیکییە لە بنەتۆنی/دۆ*C*وە.

Labbile(I), Labial(E) گۆکردن بە لێو.

Labbra(I), lips(E) لێوان.

Labbro(I), Lip(E) لێو.

La-bémol mineur(F), La-bemolle minore(I), A-flat minor(E), As-moll(G) لا بیمۆڵ - ماینەر.

La-bemolle maggiore(I), La-bémol majeure(F), A-flat major(E) As-dur(G) لا بیمۆڵ - مێجەر.

La-mineur(F), La-Minore(I), A-minor, A-moll(G) لا-ماینەر.

Labial reeds(E) ڕیشـە لێویەکان لە لوولە دەنگ داخراوەکانی ئۆرگن.

Labialstimme(G), A flue stop in the Organ(E) تۆنە لێوە داخراوەکان.

Lacrimosa(L), Part of Roman requiem mass(E) بەشـێک لە کۆنوێژی ڕۆمان بۆ مردووان.

Lacrimoso, Lagrimoso, Lagrimando(I), Tearful, Sad(E) پەژارە، بەفرمێسک.

La-dièse(F), La-diesis(I), A-sharp(E), Ais(G) لا-دێز.

La-dièse mineur(F), A-sharp minor(E), Ais-moll(G) لا دێز - ماینەر.

Lage(G), Position(E) پۆزش لە ئامێرە ژێدارەکاندا، بار، شـــوێنپەنجە پەردەی ئامێرێک یاخود دەنگێک، شـوێنی نۆتەیەک لە کۆرد*Chord* ێکدا.

Lagnoso(I), Doleful(E) خەمەنگێز، خەمبار.

Lagouta, Laouta, Laouto, Lavouta(Gr) لاگۆتا، لاڤۆتا، ئامێرژێدارێکی دێرینی یۆنانییە کە تاڕادەیەک بە ئامێری عوود دەچێت، ملێکی درێژ و کاسەیەکی بچووکی هەیە.

La-maggiore(I), La-majeur(F), A-Major(E), A-dur(G) لا-مێجەر.

Lame Musicale(F), Musical saw(E) ئامێری مشـــار، هەرەی مۆزیکایی.

Lament(E), Lamentando, Lamentoso, Lamentabile, Lamentevole(I), Lamento(G) تۆنێکی پەژارە ئامێز.

Landini Cadence(E) لاندینی کادەنس، ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مۆزیکزانی ئیتاڵیایی فرانسیســکۆ لاندینی*Francesco Landini(1325-1397)* و مۆزیک دانەرانی ســەتەکانی/14م و 15م بەکاریاندەهێنا، شێوەی جیاوازی لەوەدایە کە میانەی شــەشەمی سـەروەی ئۆکتاڤێک بۆ تاوێک*Momentarily* دەکەوێتە سەر میانەی پێنجەم، وەک لەم نموونەیەدا:ـ

e' d' f' d' c' e'
g f OR f e
M6-5 8 M6-5 8

Lang(G), Long(E) درێژ.

Langsam(G), Slow, Grave (E), Large(F), Largo, Adagio(I) لارگۆ، ئارامڕەو، سـەنگین.

Langsamer(G), Slower(E) ئارامڕەوتر.

Languendo, Languente, Languemente(I), Languishing(E) هێورییەکی بەسۆز.

Lanto, Lagretto(I), Slower(E) لانتۆ، تێمپۆیەکی خاوترە لە *Largo*.

Largamente(I), Slowish(E) ئارامڕەو.

Larghetto(I), Not as slow as largo(E) لارگیتۆ، کەمێک پەلەتر لە لارگۆ.

Larghissimo(I), An extremely slow tempo(E) لارگیسـیمۆ، خاوتر لە لارگۆ بە ئەندازەی چل لێدان لە خولەکێکدا.*40beats/min*یاخود کەمتر.

Larghezza(I), Larguer(F), Breadth(E) هەناسـە.

Largo(I), Broad(E) لارگۆ، پان و گوشـاد.

Largo assai(I), Very slow(E) زۆر سەنگین.

Larigot(F), Old name for flageolet(E) لاریگۆت، کۆنە ناوی ئامێری فلاجیولێت*Flageolet*ی هەشت کونە کە تاڕادەیەکیــش بە شـمشـاڵ دەچێت

Larynx, The upper part of the trachea in the human throat(E) هەنگەرە، حونجەرە، گەروو، گلو، ئەو بەشە گرنگەی کە دەنگە جۆرانجۆر و جیاوازەکانی لێوە دەردەچێت.

La seguente(I), The following(E) دواینده.

Laúd(S) لاود، ئامێری لووت{عوود}ی ئیســپانیایی پشــتپان کە شەش جووت تەلی پێوە بەستراوە.

لاوک، یاخود بەیتی لاوک، کۆنە وشەیەکی کوردی ڕەسەنە کە Lawık(Kr)
پێدچێت لە لۆ/وە هەڵێنجرابێت و بۆ درێژەپێدان لەسەر زار و هێنانی بۆ سەر باری ڕەزمێکی مۆزیکی بوویێتە لۆلۆ..لۆلۆ کە دەشێت بەمانای ڕۆڵە بێت و گوزارەیش لە دلێری و جوامێری بکات، دوایی وەک نازپێدانێک بۆ ئەو پەیڤە و شێووگێکی زاراوەیی بەسەردا بڕابێت.....بووبێتە لاوک.
لاوک، لە چەند چەشنەبەیتێکی جوراوجۆر و بە چەند دیمەنێکی تراژیدانەی جیاواز لەنێو ژیانی کوردەواریدا ڕەگەژۆی هونەری چاندووە. لەوانەیش یادکردنەوەی کەسێکی دلاوەر و پێشەنگ لە ڕووداوێکی جەنگدا، ڕۆڵەیەکی بەجەرگ و نەبەرد کە جوانەمەرگ بکرێت، یاخود سۆزدەربڕینی کیژەجەوانێکی هەرەت نەوبەهاری شۆخوشەنگ کە پێنابێتە ژینبارێکی ئەندێشەییەوە و لاوە دڵدارەکەی بلاوێنێتەوە. چڕینی ئەم شێوە ئاوازە بەگوێرەی ئەو هەنکەسۆزە*Accent tone*ی کە دەبیسترێت زیاتر لە ناوچەکانی باکووری کوردستان و کوردنشینانی ناوچەی خۆراسان باوە، پاشان بە ناوچەکانیتری کوردستاندا دەنگیداوەتەوە و هەر ناوچەیەیش کالای تایبەتمەندێتی خۆی بەبەردا کردووە.
ئەمەیش بەشێکە لە لاوکێکی شێواز ئەڤینداری کە کاتی خۆی شەریفاغای هەرکی(1975-1895ز) ناسراو بە شەرۆ(واتە شێرۆ) بە دەنگی خۆی تۆماریکردووە:ـ

غەزالەک م ڕاکر، ل شیشانێ، لێ لێ ل بلندیا
غەزالا من، غەریب بی،
بەرێ وێ کەتە هەر چار مالێ وا گوندیا.
بەلێ(سەخمەراتێ)، بەژنا بلند، چاوێ بەلەک،
ئەو سال، سێ سالە
ناو عێل و عەشرەتی مالا بابێ خودا ئەز قەتیام.........غەزال، غەزال، غەزال،
غەزالەک م ڕاکر، ل شیشانێ لێ گرکا،
بەلێ غەزالا من، غەریب بی
بەرێ وێ کەتە هەر چر مالێ وا تورکا
بەلێ سەخمەراتێ، بەژنا بلند، چاوێ بەلەک،
ئەو سێ ساڵە، سێ سالە
ناو عێل و عەشرەتی مالا بابێ خۆدا ئەز تەرکاند.......غەزالم، غەزالم، غەزال،
غەزالەک م ڕاکر، ل شیشانێ لێ وا زۆرگا،
غەزالا من، غەریب بی،
بەرێ وێ کەتە هەر چر مالێ مهاجیرا
بەلێ ئەو سێ ساڵە، سێ سالە
بەر خاترا بەژنا زراڤ، چاوی بەلەک
ناو عێل و عەشرەتی مالا بابێ خۆدا ئەز دابڕام........غەزالم، غەزالم، غەزال.

Laut(G), Laud, A sound(E) دەنگ.

Laute(G), Lute(E,F), Luth(F), Lauto, Leuto(I) ئامێری عوود.

Lautenist(G), Lute-player(E) عوودژەن.

Lauter werden(G), Crescendo(I) بڕوانە/*Crescendo*.

Lavıj(Kr), Sacred chant(E) لاڤـژ، سـروودی ئایینی.

Leader, The first violinist in a conventional orchestra, Concert-master(E) سەرژەنیار، یەکەم کەمانچەژەن لە ئۆکێستـرا.

Leading motive, Fixed idea(E), leitmotif(G) مۆتیڤـنما، بیرۆکێکی چەسـپاو، بابەت. پەیوەندی ڕستەمۆزیکێکی ئاوێزاو بە یادگار و ڕووداوە دێرینەکان*Reminiscence motive* و پەرەپێدان و گۆڕینی بۆ بار و دۆخێکی دراماتیکانە، دەشێت بڵێین بابەتە ئاوازێک یاخود بیرەک*idea*ێکی تایبەت بە کەسـایەتیەک لە دیمەنێکی دراماتیک*Dramatic state*دا.

Leading note, Leading tone, Active note(E) نۆتەی کارا، بڕوانە/*Appoggiatura* تۆنـنما، حەوتەم تۆن لە سـکێلی مێجەر.

Leap(E) بازدان، جووڵەیەک لە نۆتەیەکەوە بۆ یەکێکیتر و بازدان بەسـەر پتر لە میانەیەک.

Legando, Legabile(I), Slurring, bound together(E) پێکەوەبەند.

Legato(I), Legato,Tié(F), Legato, Tie(E), Legato(G) لیگاتۆ، لکاو، بە کورتکراوەی.*Leg* ئاماژەی پێدەدرێت، چەشنە ژەنینێکی بەسەر یەکەوەیە بەبێ پچڕان. بۆ نموونە: لە بەشی/a ژەنینێکی بەسەریەکەوەیە بەبێ پچڕان لەنیوان نۆتەکاندا کە لیگاتۆیە{لکاون بەیەکەوە}، لە بەشی/b بێ لیگاتۆ*Non-legato*یاخود لیگیـێرۆ*Leggiero*، لە بەشی/c بە لێدانی پۆرتاتۆی*Portato* و لە بەشی/d دا بە لێدانی سـتاکاتۆ*Staccato*.

Legatissimo(I), Exceedingly smooth(E) زۆر بە نەرمی.

Legatobogen(G), Legatura(I), Legende(F), Syncopation(E) کەوانەبەند، چەمیوەبەند.

Legatura(L), Tie, Bind(E) بەند، لکان.

Leger line(E) زێدەهێڵ، ئەو کورتە هێڵانە دەگرێتەوە کە پێویست دەبن چ لە سەرەوە وچ لە خوارەوەی پێنچ هێڵاسۆ*Staff*سـەرەکییەکە

Leggendo(I), Reading(E) خوێندنەوە.
Leggeramente, Leggermente(I), Lightly(E) بە ســووکی.
Leggerezza, Leggeranza(I), Lightness(E) ســووکیی.
Leggerissimo(I), As light as possible(E) تا بتوانرێت سـووک و نەرم.
Leggero, Leggiero, Leggiere(I), Léger, Légère(F), Light(E) سـووک.
*Legg.* کورتکراوەی*Leggero*یە.
Leggiadro, Leggiadretto(I), Pretty, Elegant(E) شـۆخ و شـەنگ.
Leggiadramente(I), Gracefully(E) بە شـۆخ و شـەنگی.
Legni(I), Woodwind(E) ئەو جۆرە تەختانە دەگرێتەوە کە ئامێرە تەختەفووپیاکەرەکانی پێدروستدەکرێت.
Legno(I), Wood(E) دارک، تەختە.
Leichen-musik(G), Funeral music(E) مارش مۆزیکی بەخاکسپاردن.
Leicht(G), Light, Easy(E) ئاسان، سووک.
Leid(G), Sorrow(E), Diuleur(F) مەخابن.
Leidenschaft(G), Passion(E) ئاوازێکی ئەشکەنجئامێزە بۆ یادی حەزرەتی مەسـیح.
Leier(G) لیير، بڕوانە/*Hurdy-Gurdy*.
Leise(G), Soft, Piano(E) نیان، پیانۆئاســا.
Leiser(G), Softer(E) نیانـتر.
Leiser werden(G) بڕوانە/*Decrescendo*.
Leiten(G), Conducting(E) ڕابەریی.
Leitton(G), Leading note(E) نۆتەنما.
Lene, Leno(I), Weak(E) لاواز.
Lent, Lente(F), Lento(I) خاو، بڕوانە/*Adagio*.
Lentando, Lentato(I), Slowing(E) خاوبوون.
Lentamente(I), Slowness(E) خاویی.
Lentissimo(I), Very slow(E) زۆر خاو.
Lentement(I), Slowly(E) بەشـێوەیەکی خاو.
Lếŕŝte Kr), Goshe(F,Kr) لێڕشتە، بڕوانە/*Goshe*.
Letzt(G), Last(E) دوا.
Levé, Levée(F), Upbeat(E) بەرلێدان، سەرەتا نۆتەی میلۆدی کە لە یەکەم هێڵ باڕ*Barline*.
Li(I), A-sharp(E) لی، تۆنی لا ـ دێز.
Libramente(I), Librement(F), Freely(E) ئازادانە.
Libro(I), Libre(F),Free(E) ئازاد.

Libretá(I), Librety, Freedom(E) ئازادیی.

Liceo(I), Academy, Lyceum, Musical institution(E) ئامۆژگای باڵای مۆزیک.

Lié(F) بڕوانە/*Legato*.

Lietezza(I), Joy(E) شـادی، خۆشی.

Lieto(I), Joyous(E) شــاد، خۆشـبار.

Levemente(I), Lightly(E) بڕوانە/*Leicht*.

Ligatur(G), Ligature(E) پەیوەسـت، بەند، بڕوانە/*Legatura*.

Light register, Head tone, Head voice(E) ســەرتۆن.

Ligne(F), Line(E), Linea(L,S), Linie(G) هێڵ.

Limma(Gr) لیما، زاراوەیەکی زۆر دێرینی یۆنانییە، لە دیمانەی مۆزیکدا بە لیمای فیساگۆرسی *Pythagorean limma* هاتووە کە لە نیوەتۆن بچووکترە، بۆ نموونە ماینەر نیوەتۆن *minor semitone*. لە مۆزیکی خۆرەڵاتیدا بە میانە*Interval*یەک دادەنرێت کە دەکاتە ســێـیەک1/3ی تۆنێکی تەواو.

Liniensystem(G), Staff, Stave(E) هێڵاسـۆ. سـیسـتەمی هێڵەکان.

Linke hand(G), Left hand(E) دەسـتە چەپ.

Lip(E) لێو، بڕوانە/*Labbro*. ئەو بەشـە تایبەتە لە ئامێرە فووپیاکەرەکان کە دەخرێتە نێو لێوانەوە و فووی پیادا دەکرێت تاکو دەنگ لە ئامێرەکەوە دەرچێت.

Lip trill(E), Lippentriller(G) تریللەکردن{لەرینەوە دەنگی}ی ئامێرە هەواییەکان بە لێو.

Lira(I), Instrument(E) لیرە، ئامێر.

Lira da braccio, Viola da braccio(I) ئامێری براسـیۆ، ئامێرێکی سـەردەمی نوێگەریی. تاڕادەیەک بە ئامێری کەمانچە دەچێت بەڵام بە حەوت ژێ و ملێک و خەرەک{پرد}ێکی پانتر.

Lira da gamba, Lirone perfetto(I) ئامێری گامبا، ئامێرێکی زۆر دێرینی یۆنانـیـیە کە لە سـەتەی/16م و 17میشـدا کەمێک خاسـکاری تیداکرا، تاڕادەیەک بە کەمانچە دەچێت بەڵام گەورەترە و دەخرێتە نێوان ئەژنۆوە و بە پەنچەیش بەسەر ژێیەکاندا دەژەنرێت.

Lira organizzata, Lirone, Lyra(I) لیرۆنێ، لیرا، ئامێرێکی ژێدارە، تاڕادەیەک بە ئامێری *Hurdy-gurdy*دەچێت، دەخرێتەسـەر ئەژنۆ بۆ ژەنین، حەوت بۆ شانزە ژێی لەسـەر بەستراوە.

Lirica(I), Lyric, Small fiddle(E) لیریکا، کەمانچەی بچووک بە سێ ژێ، دەخرێتەسەر ئەژنۆ، تاڕادەیەک بە ئامێری چێللۆ*Cello*دەچێت.

L´istesso(I), The same(E) هەمان.

L´istesso tempo(I), The same time(E) هەمان تێمپۆ.

Loco(I), Place(E) خوێندنەوەی ئەو نۆتەیەی کە لە شـوێنی دیاریکراودا نووسـراوە.

*Lo.* کورتکراوی*Loco*یە.

Locrian mode(E) دەسگای لۆکریەن، ئاوازێکی ســەتەکانی ناوەڕاسته لە کلێسە ـ کاتۆلیکدا.



Long, Longa, Longe(I), Long(E) درێژەنۆتە، هێمای وچان*Rest*کە دوو ئەوەندەی بریڤ*Breve*دەبێتەوە ، لە مۆزیکی مۆدێرندا ئەم جۆرە هێمایە ئاســتنکراوە.



Long meter(E) مەترەی درێژ، مەبەسـت لە یەکەی پێوانی وچانە کە دەکاتە4/4.

Long pause, Rest(E), Longa pausa(I) وچانی درێژ، بڕوانە/*Fermata*، کورتکراوی*L.P*.

Lontananza(I), Distance(E) مەودا، دوورک.

Lontanissimo(I), Very long distance(E) زۆر دوور.

Lo stesso movimento(I), The same movement(E) هەمان جووڵە.

Lo stesso tempo(I) بڕوانە/*L´istesso tempo* .

Loud pedal, Sustaining pedal(E) دەنگە پایدەر، پێداڵی دەنگ کە لە ئامێری پیانۆدا هەیە چ بۆ دەنگ لەرینەوە و چ بۆ دەنگ کپکردن.

Lower auxiliary note(E) نۆتەی یاریدەدەری خوارەوە. یاوەرنۆتەی خوارەوە.

Luftpause(G) Pause for breath(E) پاوس{وچان}بە ئەندازەی هەناسـەیەک.

Lullaby, Cradle song(E) لایەلایە، سترانی لانک.

Lur(E) لوور، ئامێرێی هەوایی زۆر دێرینی وڵاتانی سکاندناڤیاییە
مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی1100-500ســاڵ، لە شـێوەی پیتی/S دایە تایبەتە بە شوانکاران.

Lusingando(I), Coaxing, Alluring(E) بە دلۆڤانی و مەرایی، ژەنین بە ڕەوتارێکی لاساییانە.
*Lusing.*کورتکراوەیەتی.

Lustig(G), Cheerful(E), Allegro(I) ئەللێگرۆ، خۆشحاڵی.

Lutherie(F) پیشەی دانانی مۆزیک بۆ ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە، عوود، گیتار... .

Luttosamente(I), Mournfully(E) بەخەمگینی.

Luttoso(I), Mournful(E) خەمگین.

Lydian(E) دەســگای لیدیەن.

لیدیا*Lydia*...ناوچەیەکی مێژوویی زۆر دێرینە کە بە ئاسیای بچووک وتراوە و پایتەختەکەی ساردیس*Sardis*بووە و میللەتەکەیشی هیندۆـ ئاوروپایی بوون. ئەم ناوچەیە لە سـەردەمی ئێستا خۆراوای ئانادۆڵ/وڵاتی تورکیا دەگرێتەوە و ناوی شـارەکەیش بەرەبەرە بۆتە ســارد*Sard*، بەری نزیکەی 660پ.ز هەرێمێکی سەربە ئیمپراتۆریێتی ڕۆمان بووە، هەر لەو سـەردەمانەیشەوە شارێکی زۆر دێرینی کوردنشین بووە، سەردەمی ئێستا بەناوی سێرت*Sért*ناسراوە.

داســتانی یۆنانیەکان دەیگێڕێتەوە کە لیدۆس*Lydus*کوڕی تانتالۆس*Tantalus* و دیۆنا*Dione*بووە، ئەم کوڕە دێوانە دەبێت و خۆی فڕێدەداتە ناو ئاگرەوە. وشـەی لیدیا لە زوانی عیبریدا بە

لوديم*Ludim*هاتووه، له خوانه ئينجيلەكاندا به لوود*Lud* {له قورئاندا به لوط}كوڕى سام *Shem*كوڕى حەزرەتى نوح/ى پێغەمبەر كه كەشتييەكەى له نغرۆبوون ڕزگارى دەبێت و له دامێنى چياى گۆتى{جودى}دەگيرسێتەوە.

له مۆزيك تيۆرى يۆنانيدا...دەسگاى ليديەن*Lydian mode*كه ناوەكەى هەر دەگەڕێتەوە بۆ شانشينێتى ليديا، لەسەر دوو تێتراكۆردى ليديەن*Lydian Tetrachord*بناخەى هەڵچنيوە و بە تۆنێكى تەواو جياكراونەتەوە. هەر تێتراكۆردێكيشى بريتيه له نيوەتۆنێك*Semitone* و دوو تۆنى تەواو*Whole tone*. ڕيزبەندى تۆنەكان بەم شێوەيە هاونمونەيەكە بۆ مێجەر دەسگاى مۆدێرن:ـ

C D E F | G A B C



Lydian dominant(E) ليديەنى زاڵ، پێيشيدەوترێت ليديەن حەوت/پان*Lydian flat-7*ئەويش به بەرزكردنەوەى چوارەم پلەتۆن ،هەندێجاريش به ليديۆ-ميكسيەن*Lydo-Mixian*ناودەبرێت.



Lyra(Gr), Lyre(L) لير، ليرا. وشەيەكى هەرە دێرينى يۆنانييە، ناوى ئەستێرەيەكى ئاسمانييە كه كەوتۆتە نێو كۆمەڵە ئەستێرەى باكوورەوە. له داستانى يۆنانيدا هاتووە كه خواوەند هورمز *The hero Hermes* ليرا له پشتى كيسەڵ دەئافرێنێت و دەيكاتە ديارى بۆ ئەپۆڵلۆ*Apollo*ى زڕبراى، ئەميش ڕادەستى ئۆرفيۆس*Orpheus*مۆزيكزانى ئارگۆناوتس*Argonauts*دەكات. ئيتر هەر لەو دەمەوە ئەم ئامێرە بەو دەنگە فريشتەييەى هاويارى سۆزى هۆنراوە دەبێت و دەبێتە هاوڕازى شەيدايان و مۆزيكژەنان. ئەم ئامێرە له دارەتوو*Mulberry*اسازدێكرێت و سنگێكى ناوبۆشى سنووق_دەنگى شێوە هەرمێ*Pear*يى بۆ دەتاشرێت، بەشى سەرەوەى ئامێرەكە له دارى سێدار*Cedar*ه و سێ تەلى لەسەر بەندە به دەنگى لا_ مى_ لا ياخود لا_ ڕێ_ لا. زۆر جۆرى هەيە چ به قەوارە و چ به ژمارەى ژێ/يەكانى. بۆ نموونه له ئاسياى بچووك چوار تەلى لەسەر بەندە و هەر وەك كەمانچەى ئاسايى چوار ژێى مى_ لا_ ڕێ_ سۆڵ/ى لەسەر بەندە.

بەگشتى....دوو جۆرى سەرەكى هەيە:يەكێكيان به پەنجەدەست دەژەنرێت كه له شێوەى چەنگ و ئەويتريان به كەوان كه تاڕادەيەك به ئامێرى كەمانچە دەچێت. هەندێك جۆرى هەيە كه بەناوى ئەو ئامێرەوە دەناسرێت وەك ليرا ماندۆلين، ليرا گيتار، ليرا هارپ...هتد.

Lyric(E), Lyrik(G) ليريك، زاراوەكە تايبەتە به ستران له شێوەى سەرگوروشتە و گێڕانەوەى داستانێكى پاڵەوانێتى*Epic form* ياخود درامايى*Dramatic form*، چەشنى ئاواز و بڕگەوشەكان سووك سادەن و خۆش دێن بۆ سەر زمان، دەكرێت بوترێت ئەم شێوەئاوازە تاڕادەيەك به بەيت*Beyt* كوردى دەچێت كه ئەميش مێژوويەكى زۆر دێرينى هەيە له مێتۆلۆژياى كورديدا.

Lyricist(E) ليريكگەر، ئەو كەسەى كه بۆ ليرا بهەڵبەستێت ياخود ليرا بژەنێت.

Lyricism(E) لیراگەرییی، وەک گوزارەیەکی هۆنراوەیی و مۆزیکیی هەستونەست و شەیدا دەربڕینە بە پەیڤی لیرا کە چێوەیەکی هونەری و فەلسەفەیی گرتۆتەخۆ.

Lyric drama(E) لیرایەکی دراماتامێز، ئۆپێرا.

Lyric song(E) لیریک ستران. زۆر بۆنە و ئاهەنگی پێدەگێڕدرێت، لەوانەیش:ـ
سترانی کۆڕاڵی لە ئاهەنگێکی تراژیددا، پیداهەڵدانی کەسێک، ستران بۆ سەرکەوتنێکی سوپایی، ئەڤینیی، زەماوەندیی، نزاوستایشی خودێ، سوپاس و پێزانین، شینو واوەیلا، ستران و سەما پێکەوە بە دەوری قوربانیەکدا.

Lyric soprano(E), Soprano leggiero(I) سترانبێژی مێیینە کە مەوداکەی کەمێک لە درامای سۆپرانۆ بڵندترە.

Lyric tenor(E), Tenor leggiero(I) سترانبێژی نێرینە، مەودای لە درامای تینۆر بڵندترە.

------------------------------------
----------------------
------------



مۆزیکە سـنووق
Music Box






Metronome مێترۆنۆم

# M



ماندۆلین
Mandoline

# M

ژیان بەبێ هونەری مۆزیک.....هەڵەیە.
نیتشــە

---

M. کورتکراوەیە بۆ *Main, Mano, Manual*.

Ma(I), But(E), Mais(F), Aber(G) بەڵام.
وەکی دەوتریت*Allegro ma non troppo* واتە خێرا بەڵام نەک زۆر خێرا*Fast but not too fast*

Macchina(I), Machine(E) مەکینە.

Machine á vent(F), Wind machine(E) مەکینەی با.

Mächtig(G), Powerful(E) بەهێز، توانا.

Madriale(L), Madrigal(E) مادریگاڵ.

Madrigalesso(I), In the style of a madrigal(E) لە چەشنی مادریگاڵ.

Madrialetto(I), Short madrigal(E) کورتەمادریگاڵ.

Madrigal(E) مادریگاڵ، ڕیشەی وشەکە لە ماتریکالێ*Matricale*ی لاتینیەوە هاتووە کە بەمانای لە زمانی دایک*In the mother tongue*دێت، واتە ئەو بەیتەی کە لە زوانی دایکەوەڕا دەکەوێتەوە. وەک سترانێکی مۆزیکئامێزی هەیوان، نزیک کۆتاییەکانی ســەتەی/13م و سەرەتاکانی سەتەی/14م لە باکووری ئیتالیا بەناوی مادریگاڵێ*Madrigale*شـکۆیکرد و لە سـەتەی/15مدا لەبەرچاو نەما، بەڵام بەهاتنی سـەتەی/16م بەشــێوەیەکی ڕەخش و ڕازاو ســەریهەڵدایەوە.
بەگشتی...زاراوەیەکــی هونەرییە لە دوو مۆزیک شــێوەی ئیتالیاییدا. لە ناوەڕۆکدا کورتە هەڵبەسـتـئاوازێکی ئەڤینـئامێزی شـەش بڕگەیی تا سـیانزە بڕگـەیە کە شـێوەیەکی هەنداز و دڵڕاکێـش لە گوزارەدا و ، بژێو و بەڕەزم و میلۆدی ئازاد لە مۆزیکدای لەخۆگرتووە.
لە ڕووی هونەرییەوە...چەشنە هەڵبەستە دونیاییەکی*Secular verse*ئیتالیایی سەتەی/14مە کە لە دوو بەش پێکهاتووە و بۆ دوو یاخود سێ دەنگ دانراوە، بەشـی یەکەم دوو یاخود سێ جاران ڕەپاتدەکرێتەوە بەڵام بەشـی دووەم تەنیا یەکجار لە کاتێکدا هێڵی ســەرەوە کە یەکەمە زیاتر لە دووەم ڕازاوەتر و گوڵاو*Florid*ترە کە بەشی خوارەوەیە. لە ســەتەکانی/16م و 16مدا شێوەیەکی کۆنتراپونتاڵ*Contrapuntal*ی گرتەخۆ بە چەشنە هەڵبەستێکی دونیایی دانراو بۆ زۆر بەشە دەنگێکی یەکسانی گرنگ.

Madrigal comedy(E) مادریگاڵی کۆمێدی، شـێوەیەکی نواندنە بە ئاوازەوە کە لە سـەتەی/16م بە ئاوروپادا ڕەواجی پەیداکرد.

Maestro(I), Teacher, Conductor,(E) مایسترۆ، مامۆستا، ڕابەر. بڕوانە/*Conductor*.

Maestro del coro(I), A choir-master(E) ڕابەری کۆرس.

Maestro di musica(I), A music master(E) ڕابەری مۆزیک.

Magg.(I) کورتکراوەی/*Maggiore*.

Maggiolata(I), Spring song(E) سترانی بەهار.

Maggiore(I), Major(E), Dur(G) مێجەر، گەورە.

Magna, Magno(I), Grand(F), Great(E) مەزن.

Magnificat(L) بەشکۆڕاگرتن، ئایین سرۆتێکی نزائامێزە، لە سەتەی چواردەمەوە کلێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیک بۆ بەشکۆ ڕاگرتنی پاکیزە مەریەم ئەم سرۆتە پەیڕەو دەکرێت..

Magnificamente(I) بە شکۆ و درەخشانیەوە.

Magnifico(I), Wonderful(E) بە شانازی و درەخشان.

Mahur(Ar,Fa,Kr,Tr) ماهـــوور، لە ڕووی زوانەوە وشەیەکی لێکدراوی کوردییە و پێکهاتووە لە: ماه کە کورتکراوەی مانگ/ە و لە پاشگری هووڕ یاخود هوور کە بەمانای کووڕ{چەماوە}دێت. کۆی وشەکە دەبێتە مانگووڕ{مانگکووڕ}کە مانای مانگی کووڕ لە شێوەی دەمەداس/دا دەبەخشێت کە بە عارەبی پێیدەوترێت هیلال.

دەشێت ڕەچەڵەکی وشەکە لە مەیخۆر/یشەوە هاتبێت کە پێکهاتووە لە وشەی مەی{وشەیەکی هەرە دێرین ماد/کوردییە و گوایە بۆ یەکەمین جار مادەکان مەی/یان بۆ نۆشـــین و دەرمان بەکاریانهێناوە} و پیتی/ئا بۆتە پیتی بزوێنی ە ، وشەپاشگری خۆر/یش چاووگە وشەی خواردن ـ خۆردن/ە. کۆی وشەکە بە مانای مەیخۆر و بەرەبەرە پیتگۆڕکێی بەسەردا هاتووە بۆتە ماخۆر و دواجار بۆ خۆشی هەوای گەروو و سەرزار پیتی/هـ جێی بە پیتی/خ لێژکردووە و بە دواوشەی ماهوور گیرساوەتەوە. بۆچوونێکیـــتر دەیگەڕێنێتەوە بۆ هۆزێکی زۆر دێرین لە هیندســتان بەناوی ماهووریا کە بە مانای گەوهەری ناو گەنجینە دێت، واتە فەڕسەنگێکی زۆر جوانی گەوهەرئاسای دیار لە گەنجینەیەکدا.

بە لێکدانەوەیەکی ڕۆمانسیانە....دەشێت گوزارە لە هەستدەربڕینی ناسک*Nasik*{عیرفان}ێک بکات کە تەواو بە بادەی یاد و ویردی یەزدانیی مەست و سەرخۆش بووبێت.

مریدان مەست و سەرخۆشن لە نەشئەی بادەی دەستی

مەلایەک جوملە بێهۆشن بەنازی چاوی پڕ ڕەمزی

حاجی قادری کۆیی

یاخو کەسێکی گرفتار بە ئەوین، کەسێکی دڵدار و شـــەیدا، وێڵ و ســـەرگەردان کە بەجوانی دڵبەرەکەی مەست بووبێت. ئینجا بە هەوایەکی بەسۆز، جوانی دڵبەریان بچوێنن بە مانگی تابان و ماهوور(مانگووڕ)ی ڕۆمانسـئامێز.

ئاســـمانی حوسنی مەحبوبم لە ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو

دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هێنا نالـــی

ماهوور لقێکە لە دەسگای ڕاست، ســکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاســت لەسەر پلەتۆنی ڕاســت و ڕەگەزێکی لاوەکی کە ئەویش ڕەگەزی ئەجەمە لەسـەر پلەتۆنی نەوا. سـکێڵی هاتنە خوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزێکی لاوەکی کە ڕەگەزی نەهاوەندە لەسـەر پلەتۆنی نەوا ئەویش بە گۆڕینی پلەتۆنی ماهوور بە پلەتۆنی ئەجەم.

حەبیبا دڵ گەلێ بیمارە بێ تۆ          لەبەر دەردی لە ڕوی بێزارە بێ تۆ

صـــافی، بەدەنگی: عەلـــی مەردان




Mailloche(F), Mallet, Drum stick(E) — لێدەر، دەسـکەدارێک بۆ لێدانی تەپڵ.

Main(F), Mano(I),Manus(L), Hand(E) — دەسـت.

Main guache(F), Mano sinistra(I), Left hand(E) — دەستە چەپ، بەکوتکراوەی*M.G.* کە مەبەست لە دانانی دەستەکانە لەسەر دەنگەکانی پیانۆ

Mains(F), Mani(I), Hands(E) — دەسـتان.

Maître(F), Master(E) — ماسـتەر، وەستا، مامۆستا.

Maître de musique(F),Music master(E) — ماستەر مۆزیک، ڕابەری مۆزیک.

Maîtrise(F), Choir school(E) — خوێندگەی کۆرس لە کڵێسە.

Magic(E), Magico(I) — جادوویـی.

Majeure(F), Major(E) — مێجەر، گەورە، بۆ میانەکان*Intervals* و سـکێڵەکان*Scales*بەکاردێت.

| Symbol | Symbol | Chord Name | Chord Intervals |
|---|---|---|---|
| C5 | | C- fifth | 1 5 (not really major or minor) |
| C | Cmaj | C- major | 1 3 5 |
| C-5 | Cdim5 | C- major diminished fifth | 1 3 b5 |
| C6 | Cmaj 6 | C- major six | 1 3 5 6 |
| CΔ | Cmaj7 | C- major seventh | 1 3 5 7 |
| CΔ-5 | C maj7-5 | C- major seventh diminished fifth | 1 3 b5 7 |
| $C^{6}_{9}$ | C6 add 9 | C- major six add 9 | 1 3 5 6 9 |

Major flat nine(b9), Pentatonic scale(E) — مێجەر پانۆک نۆ، سـکێڵی پێنجتۆنیی. ئەم پێنجتۆنییە دەشـێت لەسەروو $C7, E^{b}7, F^{\#}7, A7$بێت لەکاتیکداکە ســکێڵی گەستوو*Diminished scale*ی تیادابێت بەکارهێنرابێت.

Major cadence(E) — مێجەر کادەنس، کادەنسی کۆردی سـێـتۆن.

Major common chord(E) — مێجەر کۆردی باو{دۆـ می ـ سـۆڵ}.

Major key(E), Durtonart(G) — کلیلی مێجەر.

Major minor major ninth chord(E) کۆردی نۆیەمی مێجەر ماینەری مێجەر.

نۆیەم کۆرد کە پێکهاتووە لە مێجەر سـیانیی*Major triad*، ماینەر حەوتەم*Minor seventh*، مێجەر نۆیەم*Major ninth*، زاڵ نۆیەم کۆرد*Dominant ninth chord*.

Major minor seventh chord(E) مێجەر ماینەر حەوتەم کۆرد.

بۆ نموونە:ـ لە کۆردی $G – B –D –H$دا لە سـەروو پێنجەم مێجەر سـیانیی*Major triad* لەگەڵ ماینەر سـێیەم*Minor third* دا هەیە، حەوتەمی سـەروو لە ڕەگ*Root*یشەوە ماینەرە.

Major ninth chord(E) مێجەر نۆیەم کۆرد،

هاوسـانە بە زاڵ نۆیەم کۆرد*Dominant ninth chord* لە کلیلی مێجەردا.

Major pentatonic(E) مێجەر پێنجتۆنیک،

سـکێڵی پێنجـنۆتە کە پێکهاتووە لە پلەی یەکەم و دووەم و سـێیەم و شـەشەمی سـکێڵی مێجەر.

Major scale(E), Dur skala, Dur tonleiter(G) سـکێڵی مێجەر.

Major seventh chord(E) مێجەر حەوتەم کۆرد.

پێکهاتووە لە مێجەر سـیانیی*Major triad* و مێجەر حەوتەم*Major seventh*یش لەسەری.

Major seventh plus major ninth(E) مێجەر حەوتەم لەگەڵ مێجەر نۆیەم.



Major scale(E), Scala maggiore(I) سـکێڵی مێجەر. سـیسـتەم سـکێڵێکی ئاوروپاییە کە تاڕادەیەک بەسـەرانسەری مۆزیکی جیهانیدا بڵاوبۆتەوە و کارپێدەکرێت، پێیشیـدەوترێت سـکێڵی گەورە، چونکە وشەی مێجەر بەواتای گەورە دێت. ئەم سـکێڵە میانەکانی پێکهاتوون لە:ـ



*T –T- S – T – T – T – S*

*S=Semitone or half step، T=Tone o whole step*

ئەم سـکێڵە هاوتای هەندێک دەسـگای مۆزیکایی خۆرەڵاتی دەبێتەوە، وەک:ـ دەسـگای ماهوور، چوارگا، ئەجەم..... .

Major sixth(E), Sixte majeure(F) مێجەر شـەشـەم،

میانەیەکی چوارتۆن و نیوەتۆنێک{چوار هەنگاو و نیوهەنگاو}.

Major sharp nine #9, Flat seven b7 مێجەری دۆ دیێز، پانۆکی حەوت،پێکهاتووە لە دوو سـیانیی، دۆ-مێجەر و می-بیمۆڵ مێجەر.



Major triad(E), Accord parfait majuer(F) مێجەری سـیانیی، کۆردێک کە لە سـێ نۆتە پێکهاتبێت پێیدەوترێت سـیانیی*Triad*، پێکهاتەی هەر سـیانییەکیش لەسـەر ڕەگ*Root*دامەزراوە کە نزمترین نۆتەیە لە کۆردەکەدا و بەرەو ژوور بەدوایدا سـێیەم*3rd* و پاشـان*5th* بەڕێژە فریکوێنسی4:5:6{واتە 1:4/5:3/2}دێت. ئەگەر ڕەگەنۆتەکە یەکێک بێت لە پلەکانی سـکێڵی ماینەر و مێجەردا ئەوا سـیانییەکان*Triads* بە نمرەی ڕۆمانی بەم شـێوەیە دیاریدەکرێت:-

I **سـيانيى پايە**(Tonic triad)

II **سـيانيى سوپەرپايە، سەرپايە**(Super tonic triad)

III **سـيانيى نێوەند**(Mediant triad)

IV **سـيانيى لازاڵ، ژێرزاڵ**(Subdominant triad)

V **سـيانيى زاڵ**(Dominant triad)

VI **سـيانيى لانێوەند، ژێر نێوەند**(Submediant triad)

VII **سـيانيى هەستيار، سـيانيى نۆتەنما**(Leading note triad)

**ســيانييەكانى پايە** I **، ژێرزاڵ** IV **و زاڵ** V **پێياندەوترێت سەرەتايى***Primary***،ئەوانيتر پێياندەوترێت دواتايى***Secondary*.



**لە زێدەكردندا، سيانييەكان بەپێى جۆريتى***Quality***ى سـێـيەم***3rd***ياخود پێنجەم***5th* **دەپۆلێنرێن. بۆ نموونە:ـ جۆرەكانـى گەسـتوو***Diminished*{**بۆ ســێيەم***3rd***ياخود پێنجـەم***5th*}**، مێجەر***Major*{**بۆ ســێيەم***3rd*}**، ماينەر***minor*{**بۆ سـێيەم***3rd*}**، زێدە***Augmented*{**بۆ سـێيەم***3rd***ياخود پێنجەم***5th*}.

| جۆرى سيانيى | چۆنيەتى ئاماژەپێدان | چۆنيەتى دامەزراندن |
|---|---|---|
| **سيانيى مێجەر** | ma. | **مێجەرى سـێيەم لەگەڵ پێنجەمى تەواو** |
| **سيانيى ماينەر** | mi. | **ماينەرى سـێيەم لەگەڵ پێنجەمى تەواو** |
| **سيانيى زێدە** | aug. | **مێجەرى سـێيەم لەگەڵ پێنجەمى زێدە** |
| **سيانيى گەستوو** | dim. | **ماينەرى سـێيەم لەگەڵ پێنجەمى گەستوو** |

Mal(G), Time, Occasion(E) **كات، جار، بۆنە**.

Male chorus(E), Männerchor(G) **كۆرسى پياوان**.

Mallet, Stick(E) **پێلێدە، چيل، دەسكەدارى تەپڵ لێدان و ئامێرە پێركيوشنەكان***Percussion*. **ماللێت***Mallet* **كە بە دەسكێكى باريكى سـەرەتۆپى هەيە ئامێرەكانى وەک زايلۆفۆن***Xylophone***، ڤايبرافۆن** *Vibraphone***، ئاريمبا***Marimba***پێلێدەدرێت...هتد. ئەگەر بۆ تەپڵ لێدان بەكاربێهێنرێت پێيدەوترێت***Stick*.

Mancando(I), Diminishing in strength(E) **توند كەمكردنەوە،** *Manc.***كورتكراوەيەتى**.

Mancando a poco a poco(I) **سـستكردنەوە بە هێدى هێدى**.

Manche(F), Manico(I) Neck(E) **دەسـک، مل، وەک لە ئامێرە ژێدارەكانى وەک كەمانچە، سـاز، گيتار، تەمبوور و ماندۆلين....هتد**.

Mandobass, Bass mandolin(E) **ئامێرى باس ماندۆلين**.

Mandocello(E), Mandoloncello(I) **ماندۆچێللۆ، لە ماندۆلا گەورەترە و بە ئۆكتاڤێكيـش لەو نزمترە كە پێشـيدەوترێت ئۆكتاڤ ماندۆلا، بە ئۆكتاڤێک لە ماندۆلين نزمتربـێت پێيدەوترێت ئۆكتاڤ ماندۆلين**.

Mandola, Mandore(I) ئامێری ماندۆلا{جۆری گەورەی}، ئامێری ماندۆرێ{جۆری بچووکی}، ماندۆلینی گەورە کە شەش بۆ هەشت ژێی لەسەر بەستراوە، ئەم جۆرە لە سەردەمی هۆریزانRenaissanceدا زۆر باو بووە. شەش تۆن لە ماندۆلینی ئاسایی نزمترە.

Mandolin, Mandoline(I) ماندۆلین، لە خێزانە ئامێری ماندۆلا، ماندۆ یاخود ماندۆلینە، شێوەی تارادەیەک بە عوود دەچێت، چوار بۆ شەش جووت ژێی لەسەر بەستراوە دەستەکەی خانەخانەکراوە و بە ڕیشە دەژەنرێت، دوو جۆر لە ڕۆژگاری ئێستاماندا بە ناوی ماندۆلینی شێوە بلوگراس*Bluegrass* و ماندۆلینی میللی*Folk* بەکاردەهێنرێن کە قەوارەکەی گەورەترە و لە جۆری پێشووتریش قووڵترە، هەردوو جۆرەکە چوارجووت ژێی بە تۆنی سۆڵ- ڕێ – لا- می/ی لەسەر دەبەسترێت.

Manica(I), Shift on fingerboard(E) گواستنەوە{پەنجەی سەر دەسکی ئامێرەکانی وەک گیتار، ماندۆلین، کەمانچە...هتد.

Manier(G),Manner, Grace, Ornament(E) چەشن، شێواز، ڕەوش، ئاڕایشت.
Maniera(I), Manière(F)

Mano armonica(I), Harmonica hand(E) هارمۆنیکای دەستی.

Manual(E), Manuale(I) کیبۆردی دەستی، بۆ نموونە هارپسیکۆرد یاخود ئۆرگن کە دوو دەستی یاخود زیاتری هەیە وەک کیبۆردی پێداڵ*Pedal keyboard*.

Manubrium(L) دوگمە و دەستەکانی لوولەدەنگی ئۆرگن.

Manuscript(E), Manuscrit(F) نۆتەنووسینی دانراوێکی مۆزیک.

Marcando(I), Marking, Stressing(E) پێداگرتن، نیشانەکردن.

Marcatissimo(I), Very strongly marked(E) توند نیشانەکردن.

Marcato(I), Marked, Accented(E) نیشانەکراو.

March(E), Marche(F,G), Marcia(I) مارش، مۆزیکێکی ئامێراڵیە کە بە ڕەزمێکی بەزمێنراو*Regular* لەلایەن گروپێک ڕەپاتدەکرێتەوە.

March des voix(F), Voice leading(E) مارش بە دەنگەوە.

Marga(Hn) مارگا، کلاسیک مۆزیکی هیندی کە لە نووسیدە پیرۆزەکەیاندا بەناوی ڤیداس*Vedas* و سامڤێداس*Samvedas*دا بە درێژی ئاماژەی پێدراوە.

Marimba(E) ماریمبا، بە ئامێری زایلۆفۆن دەچێت کە بە دوو دەسکەداری تەپڵ لێدەدرێت.

Marimbula, Thumb piano(E) ماریمبۆلا، پەنجەگەورەی پیانۆ.

Marteau(F), Hammer(E) چەکوش.

Martellando(I), Hammering(E) توند پیاکێشان.

Marziale(I), Martial(E) لە چەشنی مارش، بە جۆش.

Mass(E), Messe(F,G), Messa(I), Missa(L) **کۆنوێژ، نوێژی بەکۆمەڵ.**

**چەشنە سرۆت ئاوازێکی کڵێسەیی ڕۆمان ـ کاتۆلیکە کە لە شەش دانەی سەرەکی پێکهاتووە:**

*1.Kyrkie eleison 2.Gloria in excelsis deo 3.Credo*
*4.Sanctus benedictus 5.Agnus dei 6.Ita missa est*

Mässig(G), Moderate(E) **مامناوەندی.**

Mässigen(G), To moderate(E) **بەرەو مامناوەندی.**

Massima(I), Maxima(L), Longest note in notation **هێمای درێژترین نۆتە لە نۆتاندنێکی.**



Maxime(F), Maxima(E)**ماکسیما، پێوانێکی دووجار درێژتر لە نۆتەی ئاسایی**
**پێوانێکی باو لە سەتەکانی ناوەڕاستدا**

Massimo(I), Augemented(E) **زێدە.**

Matinée musicale(F), Morning concert(E) **کۆنسێرتی بەیانیان.**

Matins(L), Mette(G), Early morning(E) **سۆزی، بەرەبەیان.**

**بریتیە لە چەند سرووودێکی نزائامێز کە لە بەرە بەیاندا دەبێژرێت.**

Mattinata(I), Morning song, Aubade(E) **سرووودی بەرە بەیانیان.**

Mazurka(E) **مازورکا، سەمایەکی باکووری وڵاتی پۆڵۆنیا/یە لەسەر کێشی**3/4 **یاخود** 3/8.

**هەندێک جار بە مازۆر***Masur***یاخود ماسورەک***Masurek***لەنێو پۆڵۆنیایەکاندا هاتووە. وشەکەیش لە مازۆوزێ***Mazowsze* **و پاشان ماسۆڤیا***Masovia***ی پۆڵۆنی/یەوە هاتووە کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ دوانیوەی سەتەی هەژدەم.**

Me, Mi(F,I), E(E,G) **سێیەم پلەنزم لە سکێڵی مێجەردا لە دەنگی دۆ/**C**یەوە،**
**بەڵام بە هێماتۆنی***me* **ئاماژەیە بۆ نۆتەی می/**$E^b${**می بیمۆڵ**}.

Meane, interval(E) **میانە***Meane***، زاراوەیەکی سەردەمی سەتەکانی/**16**م و** 17**م لە ئینگلتەرە بۆ دەنگی نێوان تریبڵ***Treble* **و** *Tenor***دا، دەنگی ناوەڕاستی سێ دەنگێکی کیبۆرد.**

Meantone, Mesotone(E),Tono medio(I) **ناوەڕاستە تۆن، باوترین شێوەی ناوەڕاستەتۆنی تێمپێرامێنتەکان***Temperament tunes* **و مێجەر سێیەمەکانە***Major thirds* **بۆ ڕێژەی**5:4.

**بۆ نموونە:ـ ئەگەر تۆنی لا/**A **لە مێجەر سێیەمی** A –$C^{\#}$ - E **فریکوێنسییەکەی یەکسان بێت بە**440Hz **ئەوا فریکوێنسی پلەتۆنی دۆ دیز/**$C^{\#}$**ی دەبێتە**550Hz.

Meantone scale, Mezotonic scale(E) **سکێڵی نیمچەتۆن.**

**سکێڵی ناوەڕاستە تۆن...بەو سکێڵە دەوترێت کە تۆنەتەواوەکانی***Whole tones* **هەمان مەودایان هەبێت و بەتایبەتیش مێجەری سێیەمی کرابێت بە دوو مەودای یەکسان لە تۆنەتەواوەکان.**

**ڕێگەی ڕیزبەندی لەسەر بناخەی تۆنی دۆ/**C **بریتیە لە بەکارهێنانی یەکەم پێنج نۆتە لە بازنەی پێنجەمەکاندا کە ناویان** C, G, D, A, E **یە کە دانانی سێیەمی پوختە{سروشت}***Pur third* **لەنێوان دۆـ می/**C-E **بە تەسککردنەوەی پێنجەمەکان بەبڕێکی کەم لەنێوان ڕێژەی** 3:2 **بۆ ڕێژەی** 2.99:2 .

**تۆنی ڕێ/**D **کە نۆتەیەکی نێوان دۆ/**C **و می/**E**یە وا کەوتۆتەوە کە ڕێژەی نێوان ڕێ/**D **بۆ دۆ/**C

بەڕێژەی نێوان میٍ/E بۆ ڕێ/Dبچێت. لەبەرئەوە دانانی تۆنی ڕێ/D لەو جێگەیەدا کە ناوەڕاست*Mean*ی نێوان دۆ/C و می/Eیە سکێلێک پێکدەهێنێت کە پێیدەوترێت سکێلی ناوەڕاستە نۆتە*Meantone*.
باشە...ئەی چی ڕوودەدات پاش ئەم ڕیزبەندیە بۆ تەواوکردنی سکێلێکی کرۆماتیک و هاتنەوە ناوەوەی چەند نۆتەیەکی جیا؟
بەپێی یاسا لە زانستی مۆزیکدا...نۆتەمۆزیکیەکان بەگوێرەی سیستەمی کلیلەکان C, G, D, F, $B^b$ لەسەر هێڵاسۆ*Staff*یەکان دەنووسرێن، بەڵام دەبینین کێشە و گیروگرفت لەوەی پێشوودا{واتە سیستەمی پێنجەمەکان}بۆ مۆزیکدانەر پەیدادەبێت، کێشەکەیش لەوەدایە کە تاکو بێت زیاتر دووردەکەوینەوە لە تۆنی دۆ/C. لەبەرئەوە مۆزیکدانەر ناچار دەبێت کە نۆتە مۆزیکیەکانی بە سیستەمی کلیلیکان تۆماربکات.

Meantone temperament(E), Accordatura mesotonica(I) تێمپێرامێنتی نێوەندەتۆن.
Tempérament mésotonique(F), Mitteltönige stimmung(G)
تێمێرامێنتێکە کە کەمکردنەوەی پێنجەمی سروشت بە بڕی16Cents دەبێتە سێیەمی پوختە.

Measure, Beat, Time, Bar(E), Mesure(F), Misura(I), Takt(G) مازۆر، کێش،
کات یاخود ڕەزمی پارچە مۆزکێک کەوتبێتە نێوان دوو ستوونە هێڵی باڕێک کە لەدوای کلیل دادەنرێت.



لە چەمکی مۆزیکیانەوەڕا...وشەکە هەمان مانای کات*Time* دەبەخشێت.

Medesimo(I), Same(E) هەمان، وەک دەوترێت لە هەمان کاتدا*Il medesimo tempo*.
Mediaeval, Middle ages(E) میدیاڤاڵ، نێوەند، مەبەست سەتەکانی ناوەڕاستە.
Mediant(E,G,I), Médiante(F) میدیەنت، ناوەند، میانە، سێیەم پلەی سکێڵ، دەکەوێتە نێوان یەکەم پلەی سکێڵ{پایە*Tonic*} و پێنجەم پلەی سکێڵ{زاڵ*Dominant*}.
Mediant seventh chord(E) کۆردی نێوەند حەوتەم، کۆردی لەسەر پلەی سێیەم دامەزراو.
Medium beat(E) لێدانی مامناوەندی، بڕوانە/*Beating*.
Medmi(Ar,Kr) دەسگازای مەدمی، ڕەگەزێکی سەربە دەسگای حیجاز لە پلەی دووەمەوە دەسپێدەکات کە پلەدەنگی کوردە تا دەگاتە پلەدەنگی شەنگوڵە{سونبولە}.




Meend(Hn), Glissando(I) خلیساندۆ، گلیساندۆ.
Mehr(G), More, Many(E) زیاتر، زۆر.
Mehrere(G), Several(E) چەندین.
Mehrfacher kanon(G) کانون کە لە دوو بابەت زیاتر پێکهاتبێت.
Mehrtaktige pause(G), Multibar rest(E) فرەباڕی پشوو.
Mehrstimmig(G), Multivoice(E) فرەدەنگ لە چەندین بەشدا.

Mehrstimmigkeit(G), Polyphony(E) فرەدەنگیی.

Melancolia(I), Mélancolie(F), Melancholy(E) خەمەنگێز، پەست.

Melic(Gr), Lyric, Tuneful(E) تایبەتە بە سترانەوە، لیرایی.

Melisma(Gr), Melism(E), Mélisme(F) مۆزیکی دەنگیی،
دانانی حونجە*Syllable*یەک لەسەر زیاتر لە نۆتەیەک.

Melodeon, Melodium, Cabinet organ(E) میلۆدیۆم، هارمۆنیۆم، گچکەئۆکۆردیۆن.

Melodia(I), Mélodie(F), Melody, Song(E), Melodie, Lied(G), Melos(Gr) میلۆدی، ستران،
یەکێکە لەو چوار توخمەسەرەکیانەی کە مۆزیک پێکدەهێنێت{میلۆدی، هارمۆنی، ڕەزم، دینامیک}
زنجیرە نۆتە مۆزیکێکی ڕێکخراوە بەچەشنێکی یەکلەدوایەک، لە یەکە ڕەزمێکی تایبەتدا.

Melodic Scale(E), Scala melodica(I) سکێلە میلۆدییەکان
بریتین لە دوو سکێڵ:
یەکەمیان سکێلە میلۆدی ماینەر{هەڵبەزیو}*The(ascending) melodic minor scale*
دووەمیان سکێلە میلۆدی مێجەر{دابەزیو}*The(descending) melodic major scale*

Melodic major scale(E), Scala maggiore melodica(I) سکێلە میلۆدی مێجەر،
پلەتۆنی شەشەم و حەوتەم
تیایدا پانۆک*Flat*دەبێت.

Melodic minor scale(E), Scala minore melodica(I) سکێلە میلۆدی ماینەر، یاخود
پایەی ماینەر*Tonic minor*کە لە مۆزیکی جاز*Jazz*دا زۆر زیاتر باوە، پلەتۆنی ماینەر سێیەم*3rd*
پانۆک*Flat* تیایدا دەبێت و پلەتۆنی مێجەر
شەشەم و حەوتەمی تیژ*Sharp*دا دەبێت.

Melodic ostinato(I) ڕەپاتکردنەوەی میلۆدی.

Melodion, Keyboard, Glass harmonica(E) میلۆدیۆن، ئامێری هارمۆنیکای شووشە

Melodiosamente(I), Melodiously(E) بەچەشنێکی میلۆدیانە.

Melodioso(I), Melodious(E) بە میلۆدی، بە ساز، بە ئاهەنگ.

Mélopée(F), Melopoeia, The art of forming melody(E) هونەری سازاندنی ئاواز.

Membranophone(E) ئامێری مێمبرافۆن، کە بە لێدانی دەنگ لەرینەوە پەیدادەبێت.

Même(F), Same(E) بڕوانە/*Medesimo*.

Meno(I), Little(E) کەم، *Men.*کورتکراوەیەتی.

Meno andante(I), Slower(E) خاوتر.

Meno mosso(I), Less quick(E) کەمتر خێرا.

Meno vivace(I), Less movement(E) کەمتر جوولان.

مازۆر، کێش، مۆزیک زاراوەیەکی نزیک سەتەی/13مە، هەمان Mensur(G), Mensura(L)
مانای کات: کیش دەبەخشێت{بڕوانە/*Measure*}، بەلام لەو چەرخە زووەدا ڕەوشێکیتری هەبووە. لەو دەمەدا سیستەمی نۆتەنووسین پێیدەوترا مازۆرێن*Mensuration*کە سیستەمێک بووە بۆ نمایانکردنی پەیوەندی ڕەزمەکان لە نووسراوە مۆزیکیەکاندا.

پەیوەندی لەنێوان پێچوون *Duration*ی نۆتە جیاوازەکانیش بەم خالانەی خوارەوە پێناسە دەکران:ـ

1. پەیوەندی نێوان لۆنگا*Longa* و بریڤ*Breve*کە پێیدەوترا مۆدۆس*Modus*.
2. پەیوەندی نێوان بریڤ و نیوەبریڤ*Semibreve*کە پێیدەوترا تێمپۆس*Tempus*.
3. پەیوەندی نێوان نیوەبریڤ*Semibreve* و مینیم*Minim*کە پێیدەوترا پڕۆلاتیۆ*Prolatio*.

دەشێت پەیوەندییەکان بەڕێژەی3:1{تەواو*Perfect*، یاخود لە باری مۆدۆس یاخود پڕۆلاتیۆ، مێجەر}یاخود بەڕێژەی2:1{ناتەواو*Imperfect*، یاخود لەباری مۆدۆس یاخود پڕۆلاتیۆ، ماینەر}.بۆ نموونە ئەو هێمایانەیش کە بۆ وچانی مۆزیک بەکاردەهێنران و ئێستا ئاستنکراون ئەمانەن:ـ

*Semiminima, Minima, Semibrevis, Brevis, Longa, Maxima*

بەلام هێما و بەهای ئەو زاراوانە لە مۆزیکی مۆدێرندا گۆڕاون.

دەسگای مەنسووری، ڕەگەزێکی سەربە دەسگای سەبایە Mensuri(Ar,Kr)
لەسەر پلەتۆنی سۆڵ{نەوا}. تایبەتمەندی لەوەدایە کە لە بەرزبوونەوەدا پلەتۆنی سەبا دەبێتە پلەتۆنی نەوا لەسەر تۆنی سۆڵ. لە هاتنەخوارەوەدا پلەتۆنی نەوا دەگەڕێتەوە بۆ سەبا. واتە ئەو تۆنە لەنێوان سەبا و بەیاتدا ئالوگۆڕدەکات و دەگەڕێتەوە بۆ سەر پلەتۆنی سەبا.

ئەیا دولبەر لە بریقەی زولفی خاوی تۆ پەرێشانم

شەو و ڕۆژ مات و بێهۆشم لە جوانی تۆیە حەیرانم

سەید محمد غریب جەباری، بەدەنگی:عەلی مەردان

مینوێت، سەمایەکی کۆنی فەرەنساییە، Menuet(F), Menuett(G),Menuetto(I), Minuet(E)
سەمایەکی ڕەزین و سەنگینی 3/4ڕەزمییە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەتەی چواردەم.

ئاوازێکی ڕەنگین، Mescolanza(I), Medley(E), Mélange(F)
ئاوازێک کە لە چەند پارچە ئاوازێکی جۆرانجۆر پێکهاتبێت.

مەقام، دەسگا Meqam(Ar,Fa,Kr,Tr), Desga(Kr), Destgah(Fa)
لە ڕووی زوانەوە مەقام وشەیەکی عارەبی/یە و بەمانای جێی وەستان دێت، ئەو جێگەیەی کەسێک تێیدا دەوەستێت بۆ ئەنجامدانی کارێک یاخود چالاکیەکی دیار وەک خوێندنەوەی بانگەشەیەک، وتارێک، یاخود هۆزانێک لەنێو کۆڕێک یاخود ئاپۆرەی خەلکێکدا. بەلام لەڕووی ڕوحییەوە مەقام*Prestige* پلە و پایەیەکی بەرز و شکۆدار دەگەیێنێت لەناو دلودەروونداو، ئەم وشەیەش تەنیا بۆ ئەو کەسانە ڕەوا دەبینرێت کە جێ و شوێنێکی زۆر بەرز و بێهاوتای گرتبێت لە هزر و دلودەروونی خەلکدا. هەر بە هەمان شێوە لە هونەری مۆزیکدا گوزارە لەو چەشنو جۆرە مۆزیکایە دەکات کە جێ و شوێنێکی زۆر بەرز و بێهاوتای هەبێت لە هونەری مۆزیکدا کە ئەویش هونەری دەسگایە واتە مەقام. دەشێت هەر لەبەر ئەم هۆکارە بووبێت کە هەر لە ڕۆژگارێکی زۆر دێرینەوە

مرۆڤ هۆگری بوویێت. لەوەتەی مرۆڤیش هاتۆتە ژیانەوە و بەدوای نهێنیەکانیدا وێڵە، گەیشتۆتە ئەوەی کە کردگارێک هەیە هەموو گەردوون و ژیانی بەدیهێناوە. بۆ خۆنزیکردنەوەیش لەو کردگارە پێویست بەوە دەکات کە مرۆڤ خودی خۆی بخاتە بارێکی ڕەوانییەوە و ئاوازێکی سەرپێیانەی ڕۆحی و بەسۆزی وای لێبەرزبێتەوە شیاوی ئەو خۆنزیکبوونەوەیە بێت، ئەو چەشنە ئاوازە بە زوانی جیاواز لە فەرهەنگی مۆزیکدا بە دەسگا یاخود مەقام،*Mode*گوزارەی لێدەکرێت.

ئەم وشەیە لە قورئانی پیرۆزدا کە هاتووە و دەفەرموێت: "وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى..." ئاماژەیەکە بە جێی وەستانی حەزرەتی ئیبراهیم لە حەوشی کەعبەی پیرۆزەدا کە مەزارێکی زۆر سپەنتایە لە ئیسلامدا. دەشێت هەر بە خۆشی ئەم ئایەتەوەڕا ئەم وشەیە بوژابوویێتەوە و هاتبێتەسەر زاری کەسانی زانا و دانای وا کە ژیرانە لە بواری هونەری مۆزیکیشدا بیخەنەگەڕ.

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆیەمی هیجریدا زانای ئیسلامی قوتبەدینی کوڕی مەسعودی کوڕی مصلحي شیرازی{نزیک ساڵی1310ز کۆچی دوایی کردووە}لە پەڕاوەکەیدا بە زوانی فارسی بەناوی{الدُّر النَّقي}وشەی مەقام/ی بۆ یەکەمجار چ وەک زاراوە و چ وەک گوزارەیەکیش لە چەشنەمۆزیکێک لە زنجیرە میانە و پلەتۆنێکی دیاریکراودا هێنایە نێوەندی هونەری مۆزیکەوە. هەر بەدوایدا ئەم وشەیە لەبری وشەی نەغمە کەوتە سەرزاری مۆزیکژەنان و نەواسازانی خۆرەلاتی ئیسلامی.

هەر لە کوردەواری خۆیشماندا زۆر باوە کە کاتێک خۆشخوانێک سترانێک دەچڕێت، گەر لە سەرەتادا بە دەنگێکی هێدی و مامناوەندی دەستپێبکات و کەمێک لە سەری بڕوات، پاشان کە بگاتە هەنگاوێک کە پێویست بەوە بکات چەشنی بەزمەکە بگۆڕێت دەنگی بۆ هەڵدەسێنێت یاخودگوێبیستانی کۆڕەکە لێیدەخوازن کە بەزمەکە گەرمتربکات، لەو کاتەدا پێیدەڵێن: ئادەی بۆی هەستە! واتە بە مەقامێک چریکەی لێبڵندبکاتەوە کە جێی دیاربێت لەنێو ئاوازەکەدا. ئەو چریکە بڵندکردنەوە بەو چەشنە تایبەتیە لە هونەری مۆزیکدا پێیدەوترێت مەقام.

پێشتر...وشەی نەغمە/عارەبی کە لە ئارادا هەبوو گوزارەی لە مەقام دەکرد، بەکارهێنانیشی وەک وشەیەکی هونەری دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی کەڵەزانای ئیسلامی سەفەدین عەبدولموئمین کوڕی یوسف کوڕی فاخیری ورمێیی کە شاری ورمێ{613ـ693هـ}زادگایەتی{مەڵبەندی ئوستانی ئازەربایجانی خۆراوا/ئێرانە و زوربەی دانیشتوانیشی کوردن}. لە تەمەنی هەرزەییدا لەگەڵ بنەماڵەکەیدا ڕوودەکاتە شاری بەغدا کە ئەو دەمە موعتەسەم بیللا لەسەر تەختی خەلافەتی عەباسی بوو. بە زرنگی و زوو هەڵکەوتوویی خۆی، زوو نزیکدەبێتەوە لە خەلیفە و دەبێتە هاونشینی دەرباری. ساڵی1258ز کە هۆلاکۆی مەگۆلی هات و بەغدا/ی داگیرکر، سەفەدین توانی بەهەمان شێواز سەرنج و سۆزی هۆلاکۆ بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. هۆلاکۆ/یش بەرابەر بەوە بێستانێکی جوانی دەکاتە دیاری، بەڵام کە دەسەلاتی خەلافەت دەگەڕێتەوە، وەچەکانی خەلیفە ئەو بێستانەی لێدەسەننەوە. ئەم زانا بلیمەتە کە لە ژێدەر و سەرچاوە مێژووییەکاندا بە سەفەدینی ورمێیی ناسراوە وشەی نەغمەی وەک زاراوەیەک هێنایە نێوەندی مۆزیکەوە. نووسراوی زۆرە بەڵام ئەوەی کە لێرەدا مەبەستە لە بواری مۆزیکدا ئەو سێ کتێبە پڕبەهایەیەتی کە بۆی بەجێهێشتووین بریتین لە

" الأدوار، الرّسالة الشّرَفيّة ، رسالة الإيقاع".

کتێبی یەکەمی...دەورە مۆزیکیەکانی کردووە بە دوانزە دەور{بازنە}کە ئەمانەن:ـ ئوشـشاق، نەوا، ئەبوسەلیک{بوسەلیک}، ڕاســت، ئێراق، ئەســفەهان، زیرئەفکەند، بزورگ، زەنگۆڵە، ڕەهاوی، حوسـێنی، حیجاز. لەناو ئەم دوانزە خانانەیشدا چلوهەشت دەســگازای لێدەکەوێتەوە.

کتێبــی دووەمــی...ئەو دوانزە دەورە{نۆبە:نەوبە$Turn$}یەی بەســتۆتەوە بەناوی دوانزە کەڵو/ی چەرخ{فەلەک}ەوە کە لە ســەرەتادا بە نگینی حەوت هەســارە$Planet$وە ناونرابوو{خۆر، هەیڤ، بارام، ناهی، زاوە، کەیوان، بەرجیس}، هەر نەغمەیەکیش لەمانە خراونەتە پاڵ دەنگی پێغەمبەرێک کە گوایە بەو ســۆزە لەگەڵ خودێی پەروەردگادا هاتوونەتە ژوان، بۆ نموونە:ـ حەزرەتی ئادەم بە نەغمەی ڕاســت، حەزرەتی موسا بە ئوشـشاق، حەزرەتی یونـس بە کوچک، حەزرەتی داوود بە حوسێنی، حەزرەتی برایم بە حوسێنی و نەورۆز، حەزرەتی ئیســماعیل بە ئەزا و ڕەهاوی.

هەر لەمێژەوە دەســگا بە باڵاترین پلە دانراوە لە مۆزیکی خۆرەلاتدا، ئەوەی دەســگاخوێن بوایە پلەوپایەیەکی بەرز و تایبەتی هەبووە لای خەڵک. بۆیە دەبینین کە گرێدانی ئەم دەســگایانە بە ناوی پێغەمبەرانەوە بەهایی و بەرزڕاگرتنیانی نمایانکردووە، هەر وەک بڵێیت ئەم جۆرە نەغمانە شــیاوی ئەوەن کە بەناوی ئەو پێغەمبەرانەوە پیرۆز بکرێن. دەڵێن گوایە هەر ئەمیش بووە{واتە سەفەدینی ورمێیی}کە بۆ یەکەمجار مانای وشەی ســاز/ی کوردی بە نەغمە/ی عارەبی لێکداوەتەوە.

گەر بە دیدەیەکی زارشتانە بڕوانینە ناوی ئەو نەغمانە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەیان کوردی و فارسی/ن، هەر لەناوەکان و هێنانیان بۆ تۆمارکردن و نووسینی لە کتێبێکی تایبەت و نووسینیشی لەلایەن کەسانێکی وەک یونس ئیبن کورد ورمێیی{135ـ69هـ}خاوەنی کتێبی:الأغاني، ئەبو سلێمان کوردی{...ـ135هـ}خاوەنی کتێبی"الأغاني و الفهرست"، ئیبراهیمی موسـڵی{188-125هـ}، ئیســحاقی موســڵی{235ـ150هـ}، عەبدولقادری مەراغی{...ـ838هـ}خاوەنی کتێبی:"كنز الألحان و جامع الألحان و مقاصد الألحان". ئەمانە و چەندین و چەندین کەسـایەتیـتر کە لە پێشینەیەکی کوردەواریانەوەڕا کەوتوونەتە نێو ڕۆشنبیرییەکی نوێوە....گەواهی ئەوە دەدەن کە زۆربەی ئەم نەغمانە ڕۆحێکی ناوچەیی/کوردییانەیان تیادا بووبێت.

بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم ڕاستیەیش گەڕانەوەمانە بە زنجیرە هەنگاوێکی تری مێژوویی تا دەگەینەوە ســەردەمی دەســەڵاتدارێتی ســاســانیەکان. دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە لەو ناوچانەدا بووە کە تا ئێسـتایش زۆررینەی سـەرانســەری کوردنشـینن، وێڕای ئەوەیـش کە زۆر سـەرچاوە باس لەوە دەکەن کە ســاســانیەکان بەخۆیان هەر سـەر بە خێڵێکی کوردبوون بەناوی شـوانکارە.

سـووکایەتیـنامەیەک لەلایەن ئەردەوان/نەوە پێنجەم پاشـای ئەشـکانی/فارسـی کە بۆ ئەردەشێر بابەک/ی ناردووە. پاش بەرپابوونی دووەم جەنگ لە نێوانیان کە بە بەزینی ئەردەوان کۆتایی دێت، بە نامەیەک بۆ ئەردەشێر دەڵێت:ـ

تۆ!!! زێدەڕەویت کردووە و مردنت بۆ خۆت هێناوە، ئەی کوردی نێو خێوەت پەروەردەی کوردان. کێ ڕێی پێدایت ئەو تاجی پاشاییە بنێیتە سـەرت؟ لەکاتێکدا پاشانشین داگیرکراوە و پاشــا و ڕەویەی تێدا نەماوە! کێ فەرمانی پێدایت لەو بیابانەدا شــارێک بەناوی خۆتەوە ئاوەدان بکەیتەوە کە من بنیاتنەری بووم؟{مێژووی طەبەری، بەندی یەکەم، لا/478}.

لێرەدا هێنانەوەی ئەم کورتە بەسەرهاتە...ئەوەندە مەبەست لە بە سەلماندنی کوردێتی ساسانیەکان نیە{ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر هەیە و زۆریش پێویستە کە کاری تیادا بکرێت}بەڵکو مەبەست لە بوونی دەسەڵاتی ئەو بنەماڵەیە بە سەرانسەری ئەو هەرێمە پانوبەرینەدا کە لەو دەمەوە بگرە تاکو ئێستایش کوردنشینن. بۆ نموونە شاری قەسری شیرین کە پایتەختی وەرزی بەهار و هاوینیان بووە سەرانسەر کوردنشینە و شاری ماداین{مادیانا:مادئاوا:کوردئاوا}یش کە ناوچەیەکی گەرمەسێرە و پایتەختی وەرزی زستانیان بووە، لەپاش هاتنی عەباسیەکان بۆ شاری بەغدا و پێکهێنانی دەوڵەتیان ئەو شارە بەرەبەرە لە بۆتەی عارەبیدا توایەوە. کاتێک کە ساسانیەکان لە هەرێمی فارسەوە هاتن و لە کوردستانی ئێستادا جێگیربوون، ئاکار و نەرێتی بنەماڵەییان لەگەڵ خۆیاندا هێنا. گومانی تێدانیە کە دەوڵەتێکی وا بەهێز و تازەپێگەیشتوو لەو هەرێمە پانوبەرینەدا، بۆ پتەوکردن و بە زێڕینکردنی سەردەمی دەسەلاترانی ساسانەکانی پێویست دەکات پەنابباتە بەر زۆر هۆکاری گرنگ، لەبەرئەوە زۆر ئاسایی و ئاسان بووە بۆ ئەو بنەماڵە دەسەلاترەوە پەنا بەرێتە بەر کەسانی دەسترەنگین لە هەموو بوارەکانی ژیان، لەوانەیش کەسانی بەتوانا و بەهرەمەندی هونەری ناوچەکە کە پەرە بە بوارەکانی دەوڵەت بدەن. لەو بوارانەیش کە بایەخی پێدەدرا هونەری ئاواز و مۆزیک بوو کە کۆڵەکەیەکی سەرەکییە لە ئاینی زاردەشتیدا، چونکە ئایینێکی فەرمی بوو لەسەرانسەری دەسەلاترانیدا.

ساسانیەکان لە سالانی642-226ز وەدەرکەوتن و ئەردەشێر بابەکان لە کوردانی بارزنگی{ بەرزنجی}سەر بەهۆزی شوانکارەی کوردستانی خۆرەلاتی ئێستا بووە دامەزرێنەری ئەم دەسەلاتەدارێتیە. بابەک{باوکی ئەردەشێر}کە لە بنەماڵەیەکی هیربەد/ی زاردەشتی بووە{سەر بە یەکێک لەو پێنج خێڵەی ماد بووە بەناوی ماگۆی کە بەرەبەرە بۆتە ماگا ـ مووگە کە لە یۆنانیدا بۆتە مەگوس*Magus* لە عارەبیشدا بۆتە مەجوس و هاومانای کاهن دەبێتەوە، پیرانیان کاروباری ڕۆحی و ئایینیان لە ئەستۆدا بووە، واتە مەگ یاخود مووگ بە پیری ئایینی وتراوە و بەگ/یش بە گەورەپیاوی دونیایی}. پیریادێکی ئایینی هورمزگای ناهی بووە لە شاری ئەستاخر/ی سەر بە ناوچەی شیراز کە ئەو سەردەمە ناوچەیەکی جوگرافی بووە نەوەک نەتەوەیی. لەبەرئەوە ئاکار و ڕەوشێکی زۆر ئاسایی و سروشتی بووە کە لە سایەی ئەم دەسەلاتەدا ئاگری هۆرمزگاکان بە مریدان و پەیڕەوانی ڕۆشنبکرێنەوە و ئایینی زاردەشتیی سەرلەنوێ ببوژێتەوە تا وای لێبێت ببێتە ئایینی سەرتاسەر.

جا بەهۆی شکۆداری و بەرز ڕاگرتنی ئایینەکە{کە سروود و زەمزەمە تەوەری بزوێنەری سرۆتەکانێتی} و زۆر نزیکبوونەوە و نزیکردنەوەی مووگانی ئایینەکە لە دەستەی دەسەلاتداران، بەزم و ئاوازیش بووە هاوشانی ئەو نزیکییە، کاریگەرێتی گەیشتە ئەوپەڕی بایەخدان و گەشە و پەرەسەندن. بەرەبەرە کەسانی بەتوانا و لێهاتوو بەناوی نەواگەر و خوانندە پەیدابوون و لە سایە ئەو بایەخپێدنەدا پێگەیشتن تا وایلێهات هەندێک لە مەلیکەکان بەتایبەتی لەدوای فەرمانڕانی بارامی گۆر{438-417ز}ەوە بکەونە بەزموخۆشی دونیاییەوە، ئارەزوویان بۆ بەزمی تەرانە و ئاخشەم{مۆزیک}/یش بگاتە ئەو ئاستەی کە دەستەی نەواساز و خونیاگەرانیش لە پلە و پایەیەکی بالاو شکۆدا تەماشابکرێن.

**هەر وەکو دەگێڕنەوە، دەڵێن گوایە...لای ســاسانەکان بووبووە ڕێونیشانێک کە هەر دەمێک ســان بهاتایە دیوان، دەسـوپێوەندان و خزمەتگوزارانی دەربار لە دوورایی نزیک چەند هەنگاوێکی گونجاو دوور لە تەختی دانیشتنی سان چاوەڕوانی ڕێونیشانی دەربار دەبوون. کارگێڕی دیوانیش کە کەسێکی بەگزادە بووە بە نازناوی خوڕمباشی کاروباری فەرمی و ناو کۆشکی پێسپێردرابوو. پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ مووگەکان و بەگەکان و یاوەرانی ســان/دا سـازدەکرد. جا هەرکە ســان بەڕێوەبوایە بۆ دیوان، خوڕەمباشی لە جێگەیەکی تایبەتی دیواندا بە دەنگێکی خۆشـزوڵاڵ ئامادەبووانی کۆشکی ئاگاداردەکردەوە بەوەی کە خاوەنشـکۆ وا تەشریفی بەڕێوەیە بۆ دەربار. جاروبار پاش تەواوکردنی کاروباری فەرمی، بۆ کاتی بەزمو ئاهەنگــگێڕان پێشتر خوڕمباشی هەڵدەستا بە ئامادەباشی، ئەویش بە پەیوەندیکردن بە بەگەکان و کەسانی خانەدان کە سان پێی باشبێت، ئینجا هێنان و کۆکردنەوەی نەواسازان و خۆشخوانانی بەتوانا و بەهرەمەندی ئەو سەردەمە. لە کۆڕێکی ڕێکوپێکی شــیاو بە دیوان، خوڕمباشی دیسان دانیشتوانی ئاگاداردەکردەوە و هەروەکو بڵێت:ـ**

**هۆۆۆ...ئەی هاونشینانی دەربار.....دەنگوســەنگی خۆتان ڕاگرن!!**

**ئیمڕۆ هاونشینی دەرباری خاوەنشـکۆن..... .**

**پاشــئەوەی هەمووان بێدەنگ دەبن. لە شــوێنلایەکی دیاریکراوی دەرباردا کە بە پەردەیەک دادراوەتەوە، کەسێکیش دانراوە بەناوی پەردەدار بەرپرسێتی ئەمەی پێدراوە.**

**پاش بێدەنگی، بۆ پەردەدار نمایاندەبێت کە ئەمیش دەبێت بانگ بکات و بڵێت:ـ**

**ئێستایش...وا ئاهەنگ دەسـپێدەکات...**

**ئادەی خۆشخوان... بە ســاز و ئاوازتەوە...ئامادەبە!!!!**

**ئێوەیش...ئەی بەزمســازان و نەواسـازان...بەزم و ڕەزمـتان کۆکــکەن!!!!**

**هەر دەمێکیش ئەو بەزم و ئاهەنگە بوازایەتە چەشـن و جۆرێکیتر، پەردەدار هاونشینانی ئاگاداردەکردەوە و بەهەمان دەنگی زلاڵی دەیچڕی کە ئێستا پەردەکردنەوە بۆ فلانە خۆشخوان و فیسارە ئاوازە. دەشێت وشەی پەردە/یش کە ئیستا بۆتە زاراوە لە هونەری مۆزیکدا هەر لێکەوتەی ئەو سەردەمە بووبێت کە بە دەنگ*Pitch*ێکی تەواو مانای لێکدەدرێتەوە.**

**سەردەمی فەرمانڕەوی خەسرەوی پەروێز{628-590ز}....بە سەردەمێکی زێڕین دادەنرێت لە بواری هونەری مۆزیکدا. لە سەردەمی دەسەڵاتیدا چەندین خۆشخوان و چەندین مۆزیکژەنان وەدەرکەوتن و بەزمی زۆر جوان و ڕازاوەیان لە دیوانی کۆشکدا ســازدەکرد بەتایبەتی لەو دەمەی کە خاوەنشکۆ دەکەوێتە داوی ئەوینی شازادە شیرین. لەو بەهرەمەندە هەرە باڵایانەی کە لەو دەمەدا ناویان هەبوو:ـ سـەرکەش، ڕامتین، سەرکەب و ئازادە بامشــاد، بەختیار، نێکگیسـیا و بارباد بوو. ئەم دووانەی دواییبیان دیوانی کۆشکیان بە فرەئاوازێکی دڵگیر خرۆشاندبوو. هەر لەو دەمەدا نیکگیسـیا و بارباد پێکەوە بەو ئاوازانەیان توانیان زۆر بە لێهاتوویی دڵی هەردوو دڵدار و دڵبەر{واتە شـازادە شیرین و خەســرەوی پەروێز}زیاتر بۆ یەکتر ببزوێنن.**

ئەڵماس خانی کەڵهوڕی{1227-1165کۆچی} سەبارەت بە کوردنەژادیی بارباد دەڵێت:ـ

باربادئاما هۆرگرت ســــــاز چەنگ
نە پەردەی ماهوور سازا چەند ئاهەنگ
شـــی وە ناوســـەوڵێ وە ئاواز وەش
ســــــروودێ وانا ســرودێ دڵکەش
گرد نە شگفت مان دین شـــادیش پێیەن
خەسرەو سەرسام مەند واتش یەکێ یەن
بارباد ئاما وێش ناســـــا وە ئەو
وات ئەمن کوردم کە ئامام وە دەو
چەند ســــروودێ تر وانا هەتا شــــەو
خرۆش وست نە بەزم بۆ موشکی خەسرەو
خەسرەو کەردش وە هونیاگەری وێش
هەتا بژەنۆ چەند ئاهەنگ پەرێـــش

دەڵێن گوایە توانیویانە نزیکەی سیی/30 ڕا{لە ڕاگ$Rag$ی سانسکرێتیەوە هاتوە کە بە مانای ئاواز دێت} بۆ سیی ڕۆژەی مانگ دابنێن و سێسەدوشەست ئاوازیش بۆ سێسەدوشەست ڕۆژەی ســاڵ، بۆ زیاتر دڵخۆشبوونی پاشا/یش لە کۆتایی هەر هەفتەیەکدا جۆرە ئاوازێکی دڵگیر و بەخرۆش بســازێنن بەناوی خەســرەوانی{بە هۆرەی خەسرەوانی یاخود تەریق الملوکیە/یش هاتووە}.
ناوی ئەو سیی/30 ئاوازەیش کە گوایە سینەبەسینە و دەماودەم ماوەنەتەوە و کەوتۆتە سەر زاری کەڵەبویژی ناوداری کورد خانای قوبادی{1168-1083کۆچی}کە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:ـ

ئامـا باربەد چون بولـبوڵ ســـرمەست
لە خەندان چون گوڵ باربەطێ بەدەست
نیشت لەپای سەریر خەسرەو بە ئیعزاز
جە سیی دەســتان لەحن خوەش ئاواز
گوزین کەرد پەی شای لاڵپۆش، مەی نۆش
گاهـــێ دڵ مەبرد، گا مەســـتانە هۆش
گاهێ بە نەوای گەنج باد ئاوەرد
ئارام جە دڵ عاشــــقان مەبەرد
گا جە گاوگەنج مەبـی نەغمەسـەنج
زەمین جە شـادی هۆرمەشانە گەنج
جە گەنج ســووختە چـون نەوای بولـبوڵ
مەشکاوا غونچەی دڵ چون دەستەی گوڵ
هەم بە شـــادوروان مـرواری دڵـبەر
پڕمەکەرد بـیساط پەروێز جە گەوهەر

تەخت طاقدیسی چون مەرکەدش ساز
مـورغ دڵ خســـتە ماوەرد نە پەرواز
نەغمەی ناقووســـی و ئەوڕەنـگی نەگۆش
مەبەردەش جە دڵ سەبرو جە سەرهۆش
جە حوققەی کاوس چون قەند مەخێزا
شـــەکەرشیرەی وێـش دەرلاد مەبێزا
جە نەغمەی خوەش مانگ بەرکۆهان
مەشکاوا چون گوڵ ڕۆح و دڵ وگیان
وەختێ کە مەژەند ســاز موشـــــکدانە
مەکەردش خوتەن جە بۆی موشک یانە
تا جە ئارایش خوەرشـید مەدا دەم
مەگورێزا سپای سـەرهەنگان خەم
مەنوازا ئاهەنگ نیمەڕۆ چون ســاز
ماوەردش بە ڕەقس زوهرە بەئاواز
چون سەبزە دەر سەبزە مەژەند بە ئاهەنگ
صـەدای تەئثیرش مەتاو ناســــــەنگ
جە قوفل ڕۆمی دڵ مەکەرد گوشاد
کۆکۆ کۆگای غــەم هەرمەدا وەباد
هەرگا بە ئاهەنگ سـەروسـتان مەژەند
بەزم شـا مەکەرد پڕ جە شـیرەی قەند
ئەر ســـەروســـــەهی مەنوازا بە زەوق
عاشقان تەمام مەست مەبین جە شەوق
گا نۆشــین بادەش چون جام نۆشــین
وەختێ مەکەردش ڕامش گیان مەشـق
جە صەداش مەبی زیاد سۆز عەشق
مەکێــشا چون ناز نەورۆز نە پەردە
مەکەردش ئیمان عاشقان هەردە
موشـــــکۆ چە نەغمـەی موشـــکماڵی ئەو
موشکین بی چون ڕاز شیرین وخەسرەو
میهرەگانیـش سـاز شـاهان مەبێزا
جە سۆز دەنگش مەحشەر مەخێزا
موروای نیکیش مەبەرد عەقڵ و هۆش
بەرزبـی جە هەر لا بانـگ نۆشــا نۆش

مەکەردش جە بانگ دڵ ئارای شـەودێز
بەرزتر جە شـــــــاهان دەماغ پەروێـز
جە شاخەی مەقام شەو فەڕڕوخ تەمام
مەجلسی مەکەرد بێهۆش و سەرسـام
چون جە فەڕڕخ ڕۆژ صـەد مەکەرد بەرز
مەبێزا نەغمەش نەغمـەی ســـــازطەرز
چون بە خونچەی کەوک دەری مەیاوا
بە نەغمەش خونچەی دڵان مەشــکاوا
چون بە ئاهەنـگ نەخجیرگـان ئامـا
زوهرە کەرد نەخجیر ئاوەرد جە سەما
هەردەم بە زەخمەی کین ســــــیاوش
مەوست بە پەردەی جەرگ دڵ کاوش
جە کین ئیرەج چون نەغمەی داود
جە بەزم شــــاهـان مەخێزنا دوود
بە باغ شیرین چون شورووع مەکەرد
زەوق شــیرینی جە شــەکەر مەوەرد
باربەد بەی طـەور دەســتان بە دەســتان
ژەندپەرێ پەروێز زوهرەی سەرمەسـتان
خەســـــرەو بەجارێ باربەد ئەوڕۆ
بەخشا گەنج و ماڵ جواهیر بێ شۆ

ئەو ئاوازانەیش کە گوایە لەو ســەردەمەدا باوبوون ئەمانەن:ـ ئایین، ئاراییــش، ئارجنە، ئارگۆن، ئازادوار، ئەشــکەنە، ئاســاربەهار، ئەفشارسـەگزی(هەوشارســەگزی)، ئانگبین، ئاوج(هاوگ)، باخرەز، بادی نەورۆز، بادە(پەردە)، باروەزنە، باخی سیاوشان، باخی شالیار، بانگ ئونقا، بێســتانی شیرین، بەســتە، بەشکەنە، پەندی شــالیار، بەهاری بەشکەنە، بەهمەن، بەهمەنچە، پاڵێزوان، پەنچەی کەودەری، پێکارگەر، تەختی ئەردەشێر، تکاو، تیژی باخرەز، تیژی ڕاســت، تیفگەنج، جامەدەران، چکەک، چەغان، چەفانە(پەردە)، چەکاوک(چکاو)، چەکۆک، خارکەش، خاکەڕن، خانەی ئونقا، خورەم(پەردە)، خەڕنە، خەسرەوانی، خوماخەسرەو، دادئافەرین، دادئافەرید، دەرخەم، دەرخەم هەفســارسەگزی، دڵەنگێزان(ئاواز)، دنە، دێرســاڵ(پەردە)، دێوڕەخـش، ڕاح(ڕاحڕوح)، ڕاســت(پەردە)، ڕاســت(پەردە)، ڕامشخۆر، ڕاهوی، ڕۆباب، ڕۆشی چرا، ڕۆح(ڕاهڕۆح)، ڕەهاوی، زاخ، زەلزەل(ئاواز)، زەنبوور(پەردە)، زەنگیانە، زێڕەوکەن، زێڕەفکەند، زێڕزورگان، زێڕخوردە، زێڕقەیسەران، زێڕوەستا، ســازگەری، ســەوزەبەهار، سپێبەدان، ســتا، ســاهـ، ســەرەنداز، ســەرکەش(پەردە)، سروودپارتــی، ســارو وەستا، سەرەوناز، ســوارتیر، شــادباد، شــادزوو، شــاوەرد، شــایورد(شــادوەرد)، شــاباب، شــاخچی شــار رود، شــیشــەم، ئوشــشــاق، گاڵووس،

قەلەندەر(ڕاهـ)، قەمەری(پەردە)، کەیســەران، کاسـەگەری، گاوێژنە، کەودەری، کیســـرا، کەیخەســـرەوی،گوڵ(ڕاهـ)، گوڵزار، گوڵنۆش(نەوایی)، گەنجی فەرەیدون، گەنجدار. گەنجی عەرووس، گەنجی کاوس، لەبینا، لەیلا(پەردە)، ماورائەلنەهری(ڕاهـ)، مەجلیسی ئەفروز، مشکەماڵی، مشکەمووی، مشکۆیی، موویەی زاڵ، میهرەبانی، میرەمانی، میهرەبانی بزورگ، میهرەبانی خوردە(گچکە)، مەی بڕی سەربەهار، نارشـیرین، نای، نەخچیرگا، نەغمەی عونقا، نەوبەهاری، نەورۆزی بزورگ، نەورۆزی خارا، نەورۆزی خوردە، نەورۆزی کەیقوبادی، نۆشـباد، نۆشـبادە، نۆش لەبینا(نۆش لێوین)، نۆش لەبیا، نەهاوەند، نیۆڕاسـت، نۆشـینە، وەرشـان، حەفتەگەنج، یاقووت(پەردە).

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە کە ئەویش:ـ بۆچی ئەوەندە باسی زاردەشتیی دەکرێت؟

بۆچی باسی ئێزدیی ناکرێت لەکاتێکدا ئایینێکی زۆر دێرینـترە لە زاردەشتیی؟

دەشێت وەڵامەکەی لەوەدا خۆی مەڵاسـدابێت کە ئەویش زاردەشتیی لە سـەردەمی سـاسـانیەکاندا ئایینێکی فەرمی سـەرانسـەر بووە تا ئەو دەمەی تەختی دەسەڵاتیان دەڕوخێت واتە بەهێزکردنی ئەو ئایینە بە پشتیوانی دەوڵەتەوە بووە کە لە سـەرەتادا لەوپەڕی هێزو توانایدا بووە. ئەم بنەماڵەیش کە لەو ناوچانە دەسەڵاتی خۆیان گێڕاوە هەر لە سـەردەمەوە و زۆر پێشتریش تاکو ئێستا زۆرینەی کوردنشینن.

لە نزیکەی سـاڵی643زدا...دەسەڵاتی سـاسـانەکان بە هەردوو ئێراقی خۆرەڵات و ئێراقی خۆراواوە{کە لە دواییدا بوونە ئێراقی عارەبی و ئێراقی ئەجەم}کەوتەژێر دەسەڵاتی خەلافەتی عەباسـیـیەوە. هاتنی ئەم دەسەڵاتە بە بڕوایەکی ئایینی نوێوە{ئیسلام}ڕووبەڕووی کەلتوورو فەرهەنگێکی فرەلایەن بووەوە. ئەو هەرێم و ناوچانە بەرەبەرە لەژێر سـایەی ئەم ئایینە نوێیەدا بووە ڕوانسەرێک بۆ فێربوون و ئامۆژ و داهێنان و بەهرەوەرگرتن. هەر بە خۆشی قورئانەوە وەک زوانێکی تازە و ئاوێزاو بە دینەکەوە خەڵکان سـەریانکردەسەر فێربوون و خۆڕۆشنبیرکردن بەو زوانە تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە زۆر لە پیران و دانا و زانایانی هەڵکەوتوو لە میللەتانی ناعارەبی وەک کورد و فارس و ئازەر، شیلەی داهێنای زگماکی و تێزنامەی خۆیان هەر بە زوانی عارەبی شیرین بکەن و هەر بەو زوانەیش بکەونە والاگەری و داهێنان لە تێز و چالاکیەکانیاندا. بەمەیش زوانی عارەبی کە کاتی خۆی لە سـەردەمی جاهیلیدا بێجگە لە شیعر و شـاعیران شـتێکی وەهایان نەبوو کە شایانی باسـبێت. بەهاتنی ئیسلام و لە سـایەی ئیسـلامدا زوانەکە پێشکەوتنێکی یەجگار بەرفراوانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەخۆیەوە دیت. هەر ئەم دیاردەی پێشکەوتنەیش بووەهۆی ئەوەی کە بەدوایدا دەسەڵاتدارانی عارەب و دەمارگیرانیان لەژێر پەردەی ئەم ئایینە پیرۆزەدا{کە زۆربەی گەلانی ناوچەکە هۆگریبووبوون}ئەو نووسراوە بەنرخانە بە ژێدەر و سەرچاوەیەکی عارەبی دابنێن و لافوگەزافی پێوەلێبدەن{سـەیر لەوەدایە کە ئەوانەی کە بە ڕەچەڵەک عارەب بوون ژینباریان دیارە یاخود هەچۆنێک بێت بۆیان هەڵبەستوون، بەڵام ئەوانەی لە پێشینەیەکی ناعارەبییەوە هاتوون ژینباریان ونکراوە یاخود چەندین ڕاوبۆچوونیان لەسـەر داوە کە زۆربەیان لەگەڵ یەکتر ناسازێن.

{....تۆ بڵێیت مێژوو هەر ئاوەها نوسـرابێتەوە.....؟؟؟}.

ئەوەی زۆر پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بدرێت ئەوەیە کە زۆر لەو ناودارانە لە مێژووی ئیسلامیدا بە عارەب دانراون کە لە خۆیدا هەڵەیەکی زۆر گەورە و ناپاکییەکی زۆر ناڕەوایە دەرهەق بە مێژوو.
دیار و ئاشکرایشە کە هۆی ئەو هەلانەیش دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێک:ـ

- لەو سەردەمەدا...ئەو نەتەوە و گەلانە چوونە ئامێزی ئیسلامەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەموو بەرهەمەکانیان بە زوانی عارەبی دەنووسییەوە لەبەرئەوەی کە بووبووە زوانی جێبەجێکردنی ئەرکو فەرمانەکانی کاربەدەستانی دەوڵەت و خوێندگە و ئامۆژگەکان.
- زۆر لەو ناودارانە هەر بەخۆشی ئایینی ئیسلامەوە ناوی ئیسلامی و عارەبییان لەخۆ دەنا و وشەیتری بەعارەبیکراویان دەهێنا، پیتەکانیان دەگۆڕی و دەیانگونجاندە سەر وشەیەکی گونجاوی زوانەکە. بۆ نموونە زازا کرایە ظاظا، ئامێدی العمادي، بۆتانی بەالبطاني، شانشین بە شناشيل، خەندەلێو بەعندليب....کەندرە بە قنطرة....گزیە بە جزية. ئیتر ئاوەها بۆ سەدان و سەدان وشە و زاراوەیتر.
- بەهەڵەچوون و تێگەیشتنی لێکۆڵەرانی گەلانی خۆراوا{ئاوروپا}کاتێک هونەر و زانیاری فرەبابەت و وەرگێڕاویان لەڕێی ئەندەلوسیا/ەوە پێگەیشت{کە ئەو دەمە بووبووە ناوەندێکی دەسەلاتی ئیسلامی پێشکەوتوو}، وایاندەزانی ئەمانە هەمووی لە خودی زادەی عارەبەوە کەوتۆتەوە. بێئاگابوون لەوەی کە گەلانی ناعارەبی وەک بەربەر و تەوارق و هیتر بوون کە ڕەسەن نیشتەجێی پانتایی باکووری ئافریکان و بوونە سووری بەرلەشکری ئەم ئایینە پیرۆزە و پاشان هەڵداشتی ئەو دەسەلاتە نوێیە. بێئاگابوون لەوەی کە کەسێکی وەک زۆریابی موسڵی لە ناوچەیەکی کوردنشینەوە پەنامەکیانە هەزاران فرسەخ دەبرێت{وەک دەڵێن لەگەڵ ئیبراهیمی موسڵی کە مامۆستای بووە ناکۆکیان دەبێت، ئەویش لەبەرئەوەی کە پاش ماوەیەکی کورت لێهاتوویی و بلیمەتی لە ڕادەی مامۆستاکەی بەدەرتر دەبێت تا دەگاتە ئەوەی کە مامۆستاکەی پیشی لێبخواتەوە و هەڕەشەی کوشتنی لێبکات، ئەویش لە تاوا بەرەو شاری قیرەوان سەری خۆی هەڵدەگرێت و لەوێیشەوە بەرەو ئەندەلوسیا}و هەرچی کەشکۆڵی پڕ لە بەهرەی هونەری و داهێنان و کەلتووریشی هەبوو کە لە سینەیدا ئارامیگرتبوو بەرەو کۆڕتوبە*Cordoba*/هەرێمی ئەندەلوسیا دەیپێچێتەوە تاکو لەوێ ئاسوودانە بیکاتە دیاری بۆ ئەو هەرێمە{سەردەمی خەلافەتی عەبدولڕەحمانی دووەم}کە لە سەردەمێکی گەش و زێڕینیدا بوو.

سەردەمی دەسەلاتی عەباسیەکان{**750-1358**ز}....سەرانسەری کوردستان کەوتە ژێر دەسەلاتیانەوە، لە دەمێکدا تاڕادەیەک کڕ*Stable*ی و ئارامییەکی بەخۆوە دی، چاوەڕوانی ئەوە دەکرا لەپاش پووکانەوەی دەسەلاتی ئەمەوییەکان و چەوسانەوەی میللەتانی ژێردەستە و فەرمانکردن بەسەریاندا بەناوی ئایینەوە چی ڕوودات؟ ئەگەرچی هەندێک بزاڤ و ڕاپەڕینی ئایینی چ بە نهێنی و چ بەئاشکرا بە بیروڕێبازی پێشینییانەوە دژ بە ڕەوتار و دەسەلاتڕەوی خەلیفەکان پەیدادەبوو بەلام ناشێت ئەو لایەنە گرنگەیش ئاستنبکرێت کە ئەویش وەدەرکەوتنی بزوتنەوەی ڕۆشنبیریی و نزیکبوونەوە بە ژیار و کەلتووری میللەتانی ناو خەلافەتەکە و دەرەوەی. لەو بزاڤانەی بەدی دەکران سەرهەڵدانی هونەری تەرجومانبوو بەتایبەتی لە زوانی یۆنانییەوە بۆ عارەبی کە زوانی ڕۆشنبیریی ئەو

سەردەمەبوو. ئەو نووسینە فەلسەفی و زانستیی و ستێرناسیی و هونەریانە و گەلەک لایەنیتر بوونە ڕێخۆشکەر و هۆکارێکی زۆر گرنگ و کاریگەر لە چۆنیەتی بیرکردنەوە و ئاڵوگۆڕاندن و کەڵکوەرگرتن لە میللەتانیتر. لەم بزووتنەوانەدا کوردستان بووە مەیدانێکی بژێو و پردێکی پتەو. دەڤەری شاری هەڕان*Herran* کە کەوتۆتە سەر ڕوباری گۆلاو*DjuĺÁaw* و نزیک بە شاری ئۆرفا*Urfa*یە{بەو ئاسەوارانەی کە تا ئێستا ناویان ماوە گەواهی ئەوە دەدەن کە گوایە زادگای حەزرەتی برایم پێغەمبەرە}، هەروەها دەڤەری ئافرین*Afrin*و گەلەک ناوچەیتر کە لەوانەیە هەندێکیان لە ئاکامی پەلاماردان و هێرشکردنە سەریەک تەنیا ئاسەوار و کەلاوەکانیان مابووبێتەوە.

هەر بە هەمان ڕەوش، هەندێک لە ئایین و ئایینزا و تەیاری ئایینی لەناو کوردستاندا وەک ئێزدیی و مانیی و ئەلەڤیی و یارسانیی و دەروێشیی و سۆفیگەریی کەوتنەبەر ئەو بزوتنەوە هزرییە ڕۆشنبیرییە و بەهەر چەنوچۆنێک بوو توانیان چ لەگەڵ ڕەوشی ئایینی ئیسلامدا و چ لەگەڵ دەسەلاتداران لە پێناوی مانەوەدا خۆیان بگونجێنن و هاوکۆک بکەن.ئەم ڕەوشی بیروبۆچوونە زەمینەیەکی زۆر پێشکەوتووی لە بوارەکانی ئایینی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ئابووری و گەلێکیتری خستەوە. لەو کەڵە دانا و زانا و هونەرزان و بیرمەندانەی کە لەو سەردەمەدا پێگەیین و بوونە ئەستێرەیەکی گەش و پرشنگدار کە تا ئێستایش پساد یادیاندەکاتەوە و بە سەرەبزوێن دادەنرێن لەو مەیدانەی خۆیاندا....برایمی موسڵی{برایمی کوڕی ماهان ئەرکانی188-125هـ}کە لە خۆشخوانی و مۆزیکژەنیدا زۆر بالابووە، دەڵێن گوایە کۆی ئەو نەغمانەی کە داینابوون خۆی دەدا لە نزیکەی900دانە{بەداخەوە ڕێنووسی مۆزیک لەو سەردەمەدا نەدەزانرا تاکو بنۆتێنرێن و وەک بەڵگەیەکی هونەری بمایە و ئینجا بزانرایە چ مورگ و ڕەنگێکی هونەری هەبووە}، هەروەها ئیسحاقی کوڕی برایمی موسڵی{**235-150**هـ}، مەنسووری زەلزەل{مەنسووری کوڕی جەعفەری ڕازی کە ژنبرای ئیبرایمی موسڵی بووە}، زۆریابی موسڵی{نزیکەی سالی{**238ـ161**هـ}کە شاگردی ئیسحاقی موسڵی بووە. هەروەها هەندێک بنەماڵەی ناوداری وەک خۆراسانی و بەرمەکی و خوڕەمی و تاهێری و دەیلەمیەکان کە بە لێهاتوویی و چوست و چالاکیان لە گشت بوارەکانی ژیانی ئەو سەردەمەدا و بەتایبەتیش بواری کاروباری کارگێڕی و هونەری{کە لێرەدا مەبەستمانە}توانیویان خۆیان لە دەسەلات نزیکبکەنەوە و داهێنان و شاکارەکانیان لەسەر مۆزیکی میللی پێشینیان سازبکەن. هەر بەدوای ئەم گۆڕانکارییە مێژوویيانەدا سەفەویەکان و پاشانیش عوسمانلیەکان لە مەیدانی دەسلاتدا پەیدابوون، ئەمانیش بەکافرکردنی یەکتر و شەڕوپێکادانی سەخت، کورد بووە هەڵداشتی ئەو بارودۆخە ناهەموارە کە دواتر بە کارزاری چاڵدیران سالی**1514**ز کۆتایی هات، ئەمەیش بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کورد و کوردستان{وەک ناوچەیەکی جوگرافی بێسنوور} بە فەرمی لەنێوان ئەم دوو زلهێزەدا دابەشکرا.

بەدرێژایی ڕۆژگار، ئەو دوو دەسەلاتە چەندین میرنشینی کوردی وەک دەسەلاتێکی نێوچەیی دامەزرا و ئەمانیش بە توانای خۆیان گەلێک خزمەتیان بە زانست و هونەر دا و گەلەک پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە دی. جاری وادەبوو کە دەبوونە مەترسی بۆ ئەو دەسەلاتە گەورەیە و دەکەوتنەبەر شالاوی پەلاماردان و ئینجا بە مەڕەی ویران و تالانی دەهاتن بەجۆرێکی وەها کە هیچی وەها نەدەما

بۆ نەوەکانی دواییـن، لەوانەیش میرنشینی ڕەوادی{618ـ 230هـ}لە ناوچەکانی ئازەربایجان، میرنشینی دۆستەکی{350 ـ 478 هـ}لە ناوچەکانی ئامێدی و میافارقین، میرنشینی حوسەنەوی{439 ـ 359هـ }لە ناوچەکانی دیناوەر و زەهاو و ناوەند{نەهاوەند}و شـارەزوور، میرنشینی شەدادیان{465ـ 340هـ }لە ناوچەکانی دوێ و گەنجە. هەروەها میرشینەکانی بۆتان و سـۆران و بابان و ئەردەڵان و......هیتر کە لە سایەی دیوەخانەکانیاندا، لە خانەگا، تەکییان و حوجرەی مەلا و فەقێیان، لە جامخانەی یارسـان و پەرستگەی ئێزدیاندا....هونەری مۆزیک بە هەرچی شـێووگ و چەشنوشێوازێک بووبێت و لەژێر هەر ناوێک بووبێت دەشێت گەشەیکردبێت و توانرابێت تاڕادەیەک بە پیرۆزی ڕاپیگرن و مورگی خۆیی و ڕەسەنێتی تێدا بپارێزرێن. لەو ناودارانەی کە لە دیدەی کوردایەتیەوە پەرۆشی هونەر و بایەخدان بە زانست بوون و لە شاکارەکانیاندا ئاماژەی بە هونەر و مۆزیک داوە حەزرەتی شـێخ ئەحمەدی خانی بووە{1706-1650ز} کە بە داخەوە لەوە دەکات کە یان شارەزاییەکی ئەتۆی نەبووە لە هونەری مۆزیکدا تاکو بە پێی ئەو سەردەمەی لێکدانەوە و شیکاری خۆی تێدا تومار بکات، یاخود هەر نەیویستووە خۆی زۆر لێ نزیک بکاتەوە. ئەو چەند مۆزیک دەسـگایانەی ناویانی بردووە ئەمانەن:ـ عوشـشاق، نەوا، عێراقی، ئاوج، کوردان، ڕەهاوی، گۆوەشت، شەهناز، حەزین، ئاهەنگ، تەرەننم، سەروسەهی، سـەبا، سـەدا، شـاهێن، دڵگۆشـا، نەغمە، نسفیە، هۆزار، ئاوازە، گوڵڕوخ، زەمزەمە، زێڕگوڵە بێت، سـازگار، سـەفا، طەنانە، گوڵسـتان، گوڵعوزار، لالەڕوخ، ناز، نازەنین، نەسـیم، نیگار، نەڕەسیدە، نەورۆز، بەزم پەردە، هەوا، جامەجەم، شـەودێز، زەنگۆڵە، موخالیف، مەقلوب، بێداد، دڵنەواز.

یاخود شاکاری بوێژی کورد شێخ نەزەر عەلی جەناب{1334ـ1251هـ} کە دەڵێت:ـ

ئەخشام هەفت دەسـگا دارۆ یاوەران مەبۆ گردیتان شوون پەیش باوەران

دەسـگای ماهوور و هەم دەسـگای پەنجگـا مەبۆ نا گردتان من بکەم تـکا

هەتا بژەنن وە ڕا و قانوون هەم دەسـگای شوور و دەسـگای هومایۆن

دەسـگای سـێگا و دەسـگای چوارگا وە دەسـگای نەوادڵ مەبۆ ئاگا

هەر دەسـگایێ خۆ چەند ڕاگە دارۆ هەر کەسێ مەبۆ وێش پەیش بسپارۆ

کۆی بێسـتوون و ڕاگەی ئەورامەن پەنجەی کوردی و کوردانیاش نامەن

گوواشت و نەورۆز هەم بەیات کورد بێداد و سرینج چەنی مێردی ورد

گەوری و نەیریز و شیوەن و شایی گردیان جەم وەستەن پەی دڵنەوایی

چۆپانی و سرۆش، نەورۆز خارا باوی و ڕاوەند و ئاواز و دارا

زەنگ وشـتر و دڵتەنگ و نەوا نەهاوەند و خێڵ و مۆرە و ساوا

یەیانە گردیان ڕاگەی ئەخشام بین نە نە هەر ڕاگە و سەوقات شام بین

{سـەرنجۆکە:ـ مەبەست لە وشەی خێڵ دەسگای عەشیرانە }

لە ڕاستیدا عوسـمانلیەکان ئەگەرچی لەگەڵ سـەفەویەکاندا هەمیشە بە خوێنی یەکتر تینووبوون و شـیروتیریان لەیەکتر دەسـوو بەڵام لەلایەکی ترەوە بەئەندازەیەک هوگری هونەر و وێژەی فارسی بووبوون کە هەندێک سـەرچاوەی مێژوویی ئاماژە بەوە دەدەن تەنانەت ئاخاوتنی بنەماڵە

ســولّتانەکان لەنێو خۆیاندا بە زوانی فارســی بووە. جا لەبەرئەوە سـەیرنەبوو کە هەرچی ئەو دەســگامۆزیکیەکان هەبوو لەو سەردەمەدا لەوانەوە وەریبگرن، دیوەخانەکانیان گەرمبکەن و دەستەی سەنعەتچییان لە شوێنێکی لاوەکی دیوەخاندا دابنیشن و بەرهەمی خۆیان تیادا بە ئەنجام بدەن، بەرهەمی وەها کە لە ئاستی پلە و مەقامی دەرباری ســولّتان یاخود پاشــا/دا بێت. دەشێت هەڵبژاردنی وشەی مەقام کە لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە بۆ ئەو پلە و پایە بەرزە بەکارهێنرابێت کە خەلیفە و سولّتان و دواییش میران و پیران و شێخانی ناودار لەنێو دەسوپێوەندان و مریدان و کومەڵگادا هەیانە. ئەم جۆرە کەسە شکۆدارانە شــیاوی مەقامێکی وا بلّندن کە ئەگەر بێتو هۆزانوانێکی ناودار، بەیتـبێژێکی نێو کوردەواریمان یاخود دەستەیەک لە ســنعەتچییان{مەبەست سترانبێژان و ئامێرژەنانی تورکە} لە دەربار و حزوور مەقامی عالیدا بن دەبێت داهێنانێکی وەهای بەسۆز و کاریگەر پێشکەشبکەن کە شــیاوی ئەو جێ هەستانە{واتە ئەو مەقامە}ی دیوەخان بێت.

ســەیر لەوەیشدایە کە ئەو بەرهەمانە لە چوارچێوەی دیوەخانی سـولّتان و دەسـەلاتدارانی نزیک سـولّتان بەولاوە نەدەبیســترا، واتە تەنیا تایبەتـبوون بە دیوەخانی ســولّتان و خزموخوێشی هەرە نزیکیان و ئیتر بۆ ڕەشـۆکی خەڵک نەبوو ئەو دیمەنە چ ببینێت و چ ببیستێت. تائیســتایش هەندێک لەو زاراوانەی کە لای تورکان لەم بوارەدا چ بە وتنو و چ بە نووسین بەکاریدێنن کوردین و هیچیان تورکی نین، وەک وشەی بەســتە واتە ئاوازی ڕەزمین(بەئیقاع) یاخود گوفتە کە مەبەست هەڵبەستە.

بە نەمانی عوسـمانلیەکان، جوانی ئەم هونەرە ئاشـکرابوو و کەوتە سـەر زاری خەڵک. بەرەبەرە کەوتەبەر شـەنوکەوی لێکۆڵینەوەی زانستی، شیکردنەوەیان بەشــێوەیەکی وەها کە{جگەلە ولاتی ئێرانی ئێســتا}سەرانسەری ناوچەکانی خۆرەلاتی ناوەراست و هەندێک لە ولاتانی دەوروبەری بکەونە ژێر کاریگەری مۆزیکناسـان و مۆزیکزانانی تورکەوە.

دەتوانین بلّێین کە مەقام لە ڕووی زوانەوە بە لێکدانەوەی دوا چارەکە یەکەمی ســەتەی بیستەم وشەیەکی عارەبی/یە. بەلام لە ڕووی هونەرییەوە، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان لەسەر دەستی هونەرمەندانی تورک بووە زاراوەیەکی هونەری بژێو و کەوتەسـەر زاری میللەتانی کورد و عارەب و ئازەر و تەنانەت فارس/یش.

ئێمەی کوردی ئەم پارچەیەیش{هەرێمی کوردستانی باشوور} کەوتینە ژێر کاریگەری ئەم ڕۆشـنبیرە هونەریەی تایبەت بە دەســگازانیی{زانســتیی مەقام}کە ئێســتا کارپێدەکەین.

هەر لەو دواچارەکە یەکەمی ســەتەی بیستەمیشدا هەندێک مەقامــبێژانی کورد لە ناوچەی گەرمیان وەدەرکەوتن وەک ڕەحمەتوللا شەلّتاخی مەندەلاوی{بەداخەوە مێژووی ژیانی وەک پێویست نازانرێت}ئیبراهیمی کوردی{1922ـ1877ز}، دەروێش شـێخەلی{شێخەلی بنەماڵەیەکی کوردنشینی شاری بەخدا/ن}، ڕەزای حسـین ئاغای خانەقینی، زەینەلّ کوردی{1918زـ..؟.}کە شـارەزابووە لە قۆریات/دا، علی جوامیری خانەقینی، مەلا عوسـمانی موسلّی{1256ـ1341هـ}و چەندین چەندین کەسانیـتری وەک ڕەشید قوندەرچــی{کە شاری بەغدا زادگایەتی} بوونە پێشەنگێک بۆ بوژاندنەوەی مەقام لە کوردســتانی باشــوور و دواییش بووە مەقامی عێراقی ئێســتادا. ئێستا بەداخەوە ئەم مەقامانە مێژوویەکی زۆر کۆنیان بۆ دروستکراوە و کراوەتە گەنجینەیەکی زۆر کۆنی

عێراقـی و بە مەقامە عێراقیەکان ناســراوە، ناوی ئەو جوامێرانەیش کە ڕۆڵی گرنگ و باڵایان هەبووە لە مەیدانەدا لە کولەکەی تەڕیشدا ناویان نابرێت.

بوژاندنەوە و ڕاستکردنەوەی ئەو ڕاســتیە دەکەوێتە سـەرشانی هونەرمەندانی لەخۆبوردی کورد بۆ نووسـینەوەی مێژووی هونەری کوردسـتان.

بەهەرحاڵ....لێرەدا بە پێویسـت دەزانرێت پاراوی هەندێک پرسـیار سەبارەت بە دەســگای مۆزیک ڕوونبکرێتەوە:ـ

دەســگای مۆزیک چیە؟

چۆن پێناســە دەکرێت؟

لە دیدەیەکی مۆزیکیەوە دەتوانین بڵێین کە دەســگا....ڕەنگاوازێکی زۆر دێرینی خۆرەڵاتیە کە بە هاویاری ئامێرەمۆزیکیەکان بەئەنجاندەدرێت. کەلەپوورێکی مۆزیکی/یە بە ڕەوش و سـروشتیەکی سـەرپێــیی*Extemporaneously* ئیتر چ بە وێژەنی بێت یاخود بە ژەنین لەسەر ســکێڵە جیاوازەکانی مۆزیکدا بە ڕێگە و شێوازێکی ڕێکوپێک.

مەبەست لە سەرپێـیی خۆنەبەستنەوە و لادانە لەو ســنوورە دیاریکراوەی کە دانراوە بۆ ئەنجامدانی کارێک. بۆ نموونە لە هونەری مۆزیکدا کە دەوترێت هونەری دەســگا واتە چڕینی ئاوازێکی بێ ڕەزم و تاڕادەیەک بێســنوور کە بە ئارەزووی وێژەنێک یاخود ژەنیارێک بەدەنجادەدەرێت. بەڵام گەر بەشێویەکی زانستانە و هونەریانە خرایە ژێر ڕکێفی یاسا و ڕێساکانی مۆزیکەوە و بەدەنگی کەسێکی بەهرەمەندی لێزان و یاخود ژەنیارێکی بەتوانا بەجێبهێنرێت ئەوا زۆر بەباشی نەک هەر لەو ســنوورە شــێیاوەدا دەسوورڕێتەوە بەڵکو دەتوانێت والاکاری و فەنتازی جوان و ڕەنگینیشی تیدابکات.

لەنێو ژیانی کوردەواریدا هەر لە مێژەوە بگرە تاکو ئێســتایش لە نێوەندە ئاینییەکاندا چ بە دەنگی مرۆڤ وەک لە بۆنە ئێسلامیەکاندا بەدیدەکرێت، چ بە هاویاری ئامێری مۆزیک وەک لە ئایینی ئێزدی و ئاییـنـزای یارسان کە زۆر لە مێژە وەک ئەرکێکی ئایینی پەیڕەویدەکەن. لە نێوەندە دونیاییەکانیشدا جێی داخە کە کورد وەک گەلانی دەوروبەری ئەوەندە خۆی بەم جۆرە هونەرەوە خەریک نەکردووە. ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆ کە لە هەموویان گرنگتر نەبوونی زەمینە و بوونێکی ڕامیاری کە وەک دەوڵەت گوزارە لە خۆبەسەربەخۆیی بکات، وێڕا ئەویش نەبوونی کەسانی وەها کە لەم بوارەدا شارەزایی تەواوی هەبێت و بکەوێتە شـیکردنەوە و زێدی ئەو دەســگایانە کە زۆرینەیان لە کوردستانەوە سەریانهەڵداوە و میللەتانی دەوروبەریش زۆر لیزانانە و بەئاشکرا لە نووسینەکانیاندا کروویانە بەناوی خۆیانەوە.

چەمکی دەســگا یاخود بڵێین دەســگا چی دەگەیەنێت؟ گوزارە لە چــی دەکات؟

دەســگا...جۆرێکە لە نەوایەکی کلاسیک کە لە چەند پارچەیەکی دیاریکراو سـازێنراوە، بەچەشنێکی وەها کە خوێندنەوەی ڕێسـا و چێوەی خۆی هەبێت. هەوا{ئاوازێکی ئازاد}یەکی سـەرپێـیی تەواوە کە بە هەنگەرە دەردەبڕڕێت و بەڕێگەیەکــی ڕێکوپێک دەخرێتە ســەر هێڵاسـۆ مۆزیکیەکان*Musical staffs*. لەبەرئەوە دەشێت لە دیدەی زانسـتیەوە بە دەسـگا بوترێت سـکێڵ.

بۆ هەڵدانی دەوارێک کە چێوەیەکی دیاریکراوی هەبێت و گوزارە لە دەســگایەکی مۆزیکی بکات و گوێبیستان لە ســایەیدا چێژی لێوەربگرن پێویستی بە ســێ تەوەر هەیە:ـ

تۆن*Tone*، هەڵبەست*Version*، ڕەزم*Rhythm*.

چۆن سـروشتی دەسگایەکی مۆزیک دیاریدەکرێت؟

ئۆکتاڤێکی مۆزیک دەکرێت بە بیستوچوار میانەی ناهەموار*Non.temperate*ەوە

بۆ ئەم مەبەستە زۆر لە دەسگاناسان و دەسگازانان گەیشتوونەتە ئەو نیایی{قەناعەت}و بڕیارەی کە بۆ دیاریکردنی دەسگایەکی مۆزیک چەند مەرجێکی گرنگی پێویستە، لەوانەیش:ـ

1. بوونی پێکهاتەیەکی میانەیی*Structural interval* یاخود پێوانەیەکــی مۆزیکی *Musical measurement* کە بە سیسـتمی ئاوروپایی زاراوەی سـکێڵ*Scale*دەگرێتەوە. واتە هەر دەسگایەک سکێڵێکی تایبەتی خۆی هەیە کە گوزارە لە ســروشت و سـنووری خۆی دەکات، ئەویش بە کۆما*Komma*دەپێورێت کە یەکەی پێوانەی میانە مۆزیکیەکانە.

بۆ نموونە ڕیزبەندی کۆما*Komma*کانی نێوان دەسـگای ڕاســت بریتییە لە{6,7,9,9,6,7,9}، دەســگای ســێگا بریتییە لە {7,9,6,7,9,9,6}، دەسـگای چوارگا{7,7,9,9,4,9,9}، دەســگای بەیات{9,9,4,9,9,7,6}، دەســگای کورد{9,9,4,9,9,9,4}. ئەمانە کۆی کۆمای هەر یەکەیان لە سکێڵی خۆیدا دەکاتە53کۆما، وە هەروەها... .

2. جێگیرکردن و ڕیزبەندی پلەتۆنەکان*Tonal centres*کە بە وێستگەی سەرەکی دادەنرێت بۆ هەر ئاوازگۆڕینێک. واتە هەر دەســگایە بە چەند پلەتۆنێکی ڕیزبەندکراو هەڵچنرابێت. بۆ نموونە ئەگەر دەســگای بەیات و عوشـشاق وەربگرین دەبینین هەردووکیان هەمان سکێڵ/یان هەیە کە بریتیە لە:ـ دووگا، ســێگا، نەوا، حوسێنی، ئەجەم، کوردان، موحەییەر. لە پلەتۆنەکانی دووگا، نەوا، موحەییەر/دا هەمان شوێنی پلەتۆنیان گرتووە، بەڵام جودایی لە ڕیزبەندییاندا لەوەدایە کە دەسپێکی دەســگای عوشــشاق لە پلەتۆنی دووگا بەرەو پلەتۆنی نەوا و پاشان بەرەو موحەییەر بەرزدەبێتەوە لەکاتێکدا دەسپێکی دەســگای بەیات لە پلەتۆنی نەوا/وەیە و بەرەو پلەتۆنی دووگا نزمدەبێتەوە و ئینجا بەرەو موحەییەر بەرزدەبێتەوە.

3. مۆدولێن{گێرِگۆڕین}*Modulation*واتە تێئاخنینی تۆنێک، ڕستەیەکی مۆزیک یاخود پارچەیەکی تەواو لە دەســگایەک تری جیاواز لە خودی دەســگا بنەڕەتیەکە. ئەمەیش وا دەکات کە زۆر لە دەســگایـتر بێنەکایەوە، هەر مۆزیکــزانێکیش بە شــارەزایی خۆی و ڕەچاوکردنی ئەو نێوەندە مۆزیکییەی کە تیایدا گوێی گۆش بووە لێکدانەوەی خۆی بۆ دەردەبڕێت. بۆ نموونە لە لای مۆزیکزانانــی تورک هیچ جیاوازییەک لەنێوان دەسگای ئەســفەهان و دەســگای بەیات/دا نیە تەنیا لە بوونی نیوەتۆنی پلەی حیجاز/دا نەبێت کە ئەویش لە سـکێڵی ئەســفەهان/دایە.

4. بوونی ڕستەمۆزیکێکی تایبەت و دیار کە لە چێوەی دەســگایەکدا گڕبخواتەوە. ئەمە لە مۆزیکی ئاوروپاییدا مۆتیڤ*Motive*دەگرێتەوە.

5. مۆزیک چنین*Musical Texture*یاخود چنینســازی لە مۆزیکدا....واتە نزیککردنەوەی ئەو دەســگایانەی کە نزیکن لەیەکترەوە و بەشــێوەیەکی هونەریانە بە یەکترەوە بچنرێن بە مەرجێک

که هەر یەکەو سـروشـت و مۆرگی پارێزراوبێت. ئەم لایەنە ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت لە دیاریکردنی مورگ و چێژی دەسـگا و جیاوازیشی لەگەڵ ئەو دەسـگایەی کە خزمایەتی لەگەڵدا هەیە، یاخود بڵێین زۆر نزیک و تێهەڵکێشی بێت. بۆ نموونە:ـ دەسـگای بوسـەلیک کە لە پلەتۆنی دووگا/وە دەسپێدەکات، دەسـگای سـوڵتانی یەکـگا کە سـکێڵێکی کتومتی دەسـگا بوسـەلیکە لە پلەتۆنی یەکـگاوە دەسـپێدەکات و بە پێنج پلەتۆن نزمترە{بێجگە لە هەندێک وردە جیاوازییەک} بەڵام مۆرگ و چێژی لە پلەی گرِی*Bass*یاندا زۆر لە یەکتر جیاوازن. هەروەها بە هەمان چەشن بۆ دەسـگای ئوراک کە لە پلەتۆنی ئوراک/ەوە دەسپێدەکات هەر کتومت دەسـگای سـێگا/یە.

ترانسپۆزە*Transposition*.....لە دەسـگامۆزیکیە خۆرەلاتیەکاندا زۆر دێتەبەرچاو{لە زوانی عارەبیدا هاوتای تصویر دەبێتەوە و دەشێت لە کوردیدا بەمانای شـەد لێکبدرێتەوە}.

بۆ نموونە:ـ ڕاسـت کە دەسـگایەکی سـەرەکیە خۆرەلاتیە، ئەگەر لە پلەتۆنی سـۆڵ/Gی گرِەوە بژەنرێت دەبێتە دەسـگازای{یاخود لێرِشتەی}یەکـگا.

یاخود ئەگەر سـکێڵی دەسـگای حیجازکار بگۆرِدرێت و لە پلەتۆنی لا/A عەشیرانەوە وەربگیرێت دەبێتە دەسـگای سـۆزیـدڵ. ئەگەر لە پلەتۆنی سـۆڵی گرِ*Bass* ەوە بێت ئەوا دەبێتە شـەدعوربان، ئەگەر لە پلەتۆنی ڕێ/دووگا وە بێت دەگۆرِدرێت بۆ شـاناز...وەهەروەها.

ئەم چەشـنە گەشـتە گۆرِانکارییە لەناو یەک دەسـگای سـەرەکیدا دەتوانرێت بکرێت.

جیاوازیش لە نێوان دەسـگا*Mode* و هێڵاسـۆ*Staff*. دەسـگا فرۆزە دەکرێت بەوەی کە بریتیە لە ڕیزێک لە حەوت پلەتۆنیەکی مۆزیکی و میانەی جیاجیا. ئەم ڕیزبەندیە بە هەشـتەم پلەتۆن کۆتایی دێت کە دووبارەکردنەوەی پلەتۆنی یەکەمە. جیاوازی لە میانەکاندا وا لەو سـکێڵی دەسگاکە دەکات کە مۆرگێکی تایبەت لەخۆ بگرێت و جیاوازبێت لە دەسـگایەکیـتر. واتە میانەکان جۆر و مۆرگی ئەو دەسـگایە دیاریدەکات.

بەڵام ڕیزبەندی پلەتۆنەکان لە هێڵاسۆیەکی مۆزیکدا کە هەمان شـێوەی دەسـگای هەیە میانەکانی جێگیر و نەگۆرِن. ئەم ڕیزبەندیە بە ڕوونی لە هەموو هێڵاسۆی مێجەر و ماینەرەکاندا دیارە کە هەر یەکەو خاوەنی مۆرگێکی تایبەتی خۆیەتی. تەنیا جیاوازییەک کە هەبێت تیایاندا هەر لە دەنگەوارەکان{چینەکانی دەنگ}دایە.

Messa di Voce(I), Mise de voix(F) پلەپلە زۆرکردن و کەمکردن ژەنینی ئاواز.

Crescendo and diminuendo on a single sustained note(E)

Messing(G), Brass(E) براس، دارِشتەیەکی مادەنیە کە بە ڕێژەیەکی گونجاو لە کانزای مس*Cu* و زینک*Zn* پێکهاتووە. بەو ئامێرانە دەوترێت کە لەم دارِشتەیە دروستکراون.

Mesto, Mestoso(I), Sad, Pensive(E) زویر.

Mestizia(I), Sadness(E) زویریی.

Mesure à cinq-quatre(F) کێشی5/4.

Mesure à deux-deux(F) کێشی2/2.

Mesure à deux-quatre(F) کێشی2/4.

Mesure à la clef(F), Time signature(E) هێمای کێش.
Mesure à neuf-huit(F) کێشی9/8.
Mesure à neuf-quatre(F) کێشی9/4.
Mesure à quatre-deux(F) کێشی4/2.
Mesure à quatre-huit(F) کێشی4/8.
Mesure à quatre-quatre(F) کێشی4/4.
Mesure à six-quatre(F) کێشی6/4.
Mesure à temps inégaux(F), Irregular meter(E) کێشی نارێکە تێمپۆ.
Mesure à trois-deux(F) کێشی 3/2.
Mesure à trois-huit(F) کێشی3/8.
Mesure à trois-quatre(F) کێشی3/4.
Mesure à composée(F), Compound time, triple time(E) کێشی تێهەڵکێشی سـیانیی.
Mesure simple(F), Simple time, Double time(E) کێشی سادە، کێشی دووانی.
Mesure ternaire(F), Triple meter(E) کێشی سـیانیی.
Metà(I), Half(E) نیمە، نیو.
Metallofon(G), Metallophon(F), Metallophone(E) مێتالۆفۆن، ئامێرێکە بە زایلۆفۆن دەچێت کە بە دەسکە مادەن لێدەدرێت لەبری دەسکەدار.
Meter(E), Metre(F), Metro(I) مەترە، یەکەی ڕەزم، کێش.
Meter signature, Time signature(E), Métrique(F) هێمای مەترە، هێمای کێش، ژمارەیەکی کەرتییە کە ژمارەی سـەرەوە گوزارە لەو یەکانە دەکات کە باڕ*Bar*ەکە پێکدەهێنێت و ژمارەی خوارەوەیش گوزارە لە یەکەی پێوانی باڕ*Bar*ەکە دەکات.
Methnewy(AR, Fa, Kr), Mesnewy, Dutayi(Kr) مەسـنەوی، مەثنەوی. چەند چامەیەکی سـۆفێتی دووتایی{دوو بەیتی}یە کە دەبرێتەوە سەر مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی{1207-1273ز}و لەسەر کێشی فاعلاتن ــ ∪ ــ ــ |فاعلاتن ــ ∪ ــ ــ |فاعلن ــ ∪ ــ |هەڵبەستراوە. ئەم شێوازە بەیتە بووە خۆشی سەرزاری زۆر لە هۆنیارانی کلاسیک، هەر لەسەر ئەم بەزمەیش چەندین دەسگای مۆزیکی لەسەر وتراوە، لەوانەیش دەسـگای ڕاست، بەیات، دەشت، ماهوور.....هتد.
Metronom(G), Metronome(E), Métronome(F), Metronomo(I) مێترۆنۆم، ئامێرێکی میکانیکیە کە لە هونەری مۆزیکدا ڕێکخستن و جلەوی تێمپۆی پێدگیرێت. سـاڵی1581ز زانای ئیتالیایی گالیلۆ گالیلی*G.Galilei*خولە نەگۆڕی پەندۆڵ*Isochronism of Pendulum*داهێنا، ئەم داهێنانە بووە ڕێخۆشـکەر بۆ داهێنانی پەندۆڵ{لەهەر درێژییەکدا بێت}کە لە یەک کاتدا بلەرێتەوە، ئیتر فراوانی ئەو لەرینەوەیە گەورە بێت یاخود بچووک. داهێنانی پەندۆڵیش بووە شۆڕشێکی گەورە لە میکانیزمی کاتژمێرسـازییدا و نزیکەی سـاڵی1659ز یەکەم کاتژمێری پەندۆڵدار دروستکرا. سـاڵی1696ز ئیتیونێ لۆولیێ*E.Loulie*تەکنیکار یەکەم داهێننامەی لە کارپێکردنی

پەندۆڵ/دا تۆمارکرد، ئەویش بە زاڵبوون بەســەر چەشن و بە پلەکردنی جووڵەی پەندۆڵەکە و ڕێکوپێک کردنێکی وەها کە لە شــیرازی جووڵە و کات دەرنەچێت. بەدوایدا زۆر لە داهێنەرانیتر کەوتنە خاســکاری و پەرەپێدانی، لەوانەیـش ویبەر*Weber*ســاڵی1790ز، ســتۆکڵ*Stockel* و سـمێسکاڵ*Zmeskall* و سـمارت*Smart*ســاڵی1821ز.

باشترین و پەرەپێدراوترین مێترۆنۆم لەو ســەردەمەدا داهێنراوەکەی تەکنیکار مێلزڵ یۆهان ئێپۆموک(1772-1838)*Mälzel Johann Nepomuk*ی ئەڵمانیایی بوو کە زۆر دۆســتی بێتهۆڤن/یش بوو. ئەم توانی بەشـێوەیەکی زۆر جوان و ڕێکوپێک خاسـکاری لە میکانیزمی ئەو ئامێرەدا بکات و بتوانێت میکانیزمـی هەشــتا لێدان*Beat* لە خولەکێکدا*80m.m*تۆماربکات{واتە هەشـتا مێلزڵ لە خولەکێکدا*m.m*}. داهێننامەکەیشی هەر بەناوی خۆیەوە مێلزڵ مێترۆنۆم *Mälzel metronom*تۆمارکرد. نزیکەی ســاڵی1894ز/یش تەکنیکار هانسن*Hanson*توانی مێترۆنۆمێک دابهێنێت کە لە میلێکی وا درێژ پێکبێت بتوانێت کێشی2/4 و 3/4 و 4/4 و 6/8 ڕابگرێت.

لەدوای ساڵانی1900ز/یەوە لە وڵاتی ســویسرا خاسـکاری خستەناو کاتژمێرسـازییەوە، ئەویش بە بەرهەمهێنانـی زەمبەلەک*Balance-wheel*بۆ تەواو جڵەوگرتنــی تێمپۆ، ئەم بەرهەمەیــش ڕێخۆشکەرێک بوو بۆ زێدەکردنی لێدان لە ئامێری مێترۆنۆمدا کە توانرا پێوانی چل لێدان بۆ دووسەدوهەشت لێدان لە خولەکێکدا ڕابگیرێت*40-208m.m*.

## خشتەی پێوانەکان بە مێترۆنۆم

| لێدان/خولەک | هێمای تێمپۆ بە زوانی ئیتالیایی |
|---|---|
| 40-60 ل/خ | Largo |
| 60-66 ل/خ | Larghet |
| 66-78 ل/خ | Adagio |
| 78-108 ل/خ | Andante |
| 108-120 ل/خ | Moderato |
| 120-168 ل/خ | Allegro |
| 168-200 ل/خ | Presto |
| 200-20 ل/خ | Prestissimo |

Mezzo(I), Half, Medium(E) میزۆ، نیو، نێوەند *.mez*کورتکراوەیەتی.

Mezzo orchestra(E) نیوە ژمارەی ئامێرە ژێدارەکان لە ئۆرکێسترادا.

Mezzo voce(I), Half voice(E) نیوە دەنگ.

Mezzo forte, Mezzo piano(I), Between lod and soft(E) لەنێوان توند و نەرمدا.

Mezzo manico(I), Half-shift, Second position(E) نیوە گواستە،

دووەم جێ{پۆزیشن}ی پەنجە لە ئامێرە ژێدارەکاندا، بۆ نموونە لە کەمانچە یاخود ڤیۆلا...هتد.

Mezzo-soprano(E), Bas-dessus(F) نیوەسۆپرانۆ،



Mezzo staccato(I) میزۆ ستاکاتۆ، کاریگەری لە ستاکاتۆ کەمترە

کە بە پنت{.}*dot*ێک لەسەر

نۆتەکە ئاماژەی پێدەدرێت.




دەنگێکە دەکەوێتە نێوان تۆنی لا *A*/ی ژێرتۆنی دۆ/*C*ناوەڕاست تاکو تۆنی یانزەمین تۆن سەروو دۆ/ی ناوەڕاست کە دەکاتە تۆنی فا/ *F*.

Mezzo soprano(E,I), Mezzosopran(G) میزۆ-سۆپرانۆ، مەودای ئاسایی لە تۆنی لا/Aی ژێر تۆنی دۆ/Cناوەڕاستەوەیە تاکۆ یانزەمین تۆن لەدوای ناوەڕاستە دۆ/*Middle-C* کە دەبێتە پلەتۆنی فا/Fی دووەم{F``}.



Mezzo-soprano clef(E) کلیلی میزۆ-سۆپرانۆ، پێشیدەوترێت کلیلی دۆ/*C*.



Mi(F,I), E(E,G) می، سێیەم تۆن لە پایەتۆنی دۆ/*C*یەوە.

Mi-bémol(F), Mi-bemolle(I), E-flat(E) می - بیمۆڵ.

Mi-bémol majeur(F), Mi-bemolle maggiore(I), E-flat major(E) می بیمۆڵ - مێجەر.



Mi-bémol majeur(F), E-flat major scale(E) سکێڵی می بیمۆڵ - مێجەر.



Mi-bémol mineur(F), Mi-bemolle minore(I), E-flat minor(E) می بیمۆڵ ـ ماینەر.

Mi Contra Fa(I,L). Tritone(E) می ـ کۆنترا ـ فا. بڕوانە/*Tritone*.

Micro interval(E) چارەکە میانە.

Microtonal(E) میکرۆتۆناڵ،

لە سیستەمی مۆزیکدا...پێوانەی ئۆکتاڤێکی تەواو دوانزە نیوەتۆنی گرتۆتەخۆ و یەکسانە بە هەزارودووسەد سەنت{**1200**Cent}. یەک دەنگی تەواو*Whole-tone*یەکسانە بە دووسەد سەنت{**200**Cent} نیوەدەنگێک*Semitone*یش یەکسانە بە سەد سەنت{**100**Cent}، هەر دەنگێکیش لەمانە کەمتربێت پێیدەوترێت میکرۆتۆن*Microtone*. بۆ نموونە چارەکەتۆن *Quarter-tone*ێک پێکهاتووە لە 24پەردە، شەشیەکەتۆن{**1/6**}*Sixth-tone*ێک پێکهاتووە لە 36پەردە، هەروەها بۆ پێنجیەکەتۆن*Fifth-tone* و هەشتیەکەتۆن*eighth-tone* و ...وەهەروەها.

Microtonal notation(E) نۆتاندنی میکرۆتۆناڵ نۆتاندن،

سیستەمێکی مۆزیکییە بۆ دیاریکردن و نیشانەکردنی تۆنەکان بەشێوەی پێنجی، واتە حەوت تۆنی تەواو لەگەڵ پێنچ تۆنی بیمۆڵ و پێنج تۆنی دیێز کە بە هەموویان دەکاتە حەڤدەتۆن.

بەڵام زانا و پســپۆڕی هۆڵەندی د.ئادریان فۆککەر*Dr.Adriaan Fokker*توانی بەشــێوەیەکی دیمانەیی*Theoretical*زیاتر پەرە بە میکرۆتۆن بدا و ســیویەک31تۆنی یەکســان لەســەر ئامێرە مۆزیکییەکان دیاریبکات.

پێنج تۆنــی پانۆک{بیمۆل} Five flats — پێنج تۆنی تیژ{دێز} Five sharps

| | | | | -5 | | | | 0 | | | | +5 | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Gb | Db | Ab | Eb | Bb | F | C | G | D | A | E | B | F# | C# | G# | D# | A# |

| -15 | | | | | -10 | | | | | -5 | | | | | 0 | | | | | 5 | | | | | 10 | | | | | 15 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Gbb | Dbb | Abb | Ebb | Bbb | Fb | Cb | Gb | Db | Ab | Eb | Bb | F | C | G | D | A | E | B | F# | C# | G# | D# | A# | E# | B# | Fx | Cx | Gx | Dx | Ax |
| F♯ | C♯ | G♯ | D♯ | A♯ | E♯ | B♯ | Gb | Db | Ab | Eb | Bb | F | C | G | D | A | E | B | F# | C# | G# | D# | A# | F\| | C\| | G\| | D\| | A\| | E\| | B\| |

سەتەکانی ناوەڕاست، گاهێکە لەنێوان نزیکەی500ز تاکو نزیکەی1430ز Middle ages(E)

کە هەندێجاریش دەکرێت بە دوو بەشەوە:ـ سەرەتای سەتەکانی ناوەڕاستەکان لەنێوان500-1100ز، دواسەتەکانی ناوەڕاست لەنێوان1100-1450ز.

ناوەڕاستە دۆ/*C*. Middle C(E), Milieu-Ut(F), Mitte-C(G)




مێژووی ناولێنان و شــوێن دیاریکردنی نۆتەی دۆ/Cی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی کەشیشی مۆزیکزان گویدۆ دی ئاریزۆ*Guido d'Arezzo*کە لە ســەردەمی خۆیدا یەکەم هێڵی لە هێڵاسۆ*Staff*یەکــی نزمتر بە نووســینی یۆنانی گاما*Gamma*ناودەبرد، نزمترین نۆتەی لە سکێڵە*Scale*کە پێیدەوترا*Ut* و لەسەر هێڵی گاما دایناو لەبەرئەوە یەکەم نۆتە پێیدەوترا گاما ئوت*Gamma ut* و دوایی بە زاراوەی گاموت*Gamut*گیرســایەوە.




مۆزیکژەنە فەرەنساییەکان ئەم زاراوەیان بۆ ســکێڵــی تەواو*Whole scale*دانا{دوایی بووە ئۆکتاڤ*Octave*}بۆ مۆزیک مەودا*Musical range*ی ئامێر و دەنگەکان. لە ئامێری پیانۆدا کە زۆر بەڕوونی دیارە. نۆتەی دۆ/Cی ناوەڕاســت بە فریکوێنسی261.63Hz و بە$C^4$ {واتە چوارەم ئۆکتاڤ} دەناســرێت کە بە یەکەم دۆ/C دەژمێردرێت لەژێر تۆنی لا/A بە فریکوێنســی440Hz.

تریبڵ*Treble*، ئاڵتۆ*Alto*، تینۆر*Tenor*، باس*Bass*، لەکاتێکدا دۆ/Cی ناوەڕاست دەکەوێتە نێوان کلیلی باس و کلیلی تریبڵ، کە پێیشیدەوترێت کلیلی دۆ/C بۆ هەندێک ئامێری وەک ڤیۆلا.

MIDI(E) میدی، کوتکراوەیە بۆ ***M**usical **I**nstrument **D**igital **I**nterface*
واتە ڕووپەرێکی نێوەند کە هاوبەشبێت لە نێوان دوو تەن یاخود دوو شت/دا، لێرەدا مەبەست لە نێوەندە ڕووپەرێکی هاوبەشە لەنێوان دوو دەنگدا کە لە ئامێرە مۆزیکیەکاندا بە ژمارە دیاریدەکرێت و دەشێت پێشیبوترێت میدی پرۆتۆکۆڵ*MIDI protocol* کە بریتیە لە خشتەیەکی ئەلەکترۆنیی بۆ فرۆزەکردنی ئامێرەمۆزیکیەکان ئەویش بە کۆد*Code*کردنی دەنگەکان بە ژمارە کە زیاتر لەسەر کیبۆرد نەخشەی بۆ دەکرێت. لەم ژمێرپێوانەییەدا هەر دەنگە بەگوێرەی ڕەوشتە فیزیکیەکانی لەژێرناوی ژمارەکۆدێکی تایبەتدا بەو دەنگە تۆماردەکرێت. هەر لە سفر ئۆکتاڤی نۆتەتۆنی لا/$A^0$وە بە فریکوێنسی27.500Hzو ژمارەکۆدی21 تا دەگاتە هەشتەم ئۆکتاڤی نۆتەتۆنی دۆ/$C$ بە فریکوێنسی4186.0Hz و ژمارەکۆدی108، نۆتەتۆنی دۆ/$C$ی ناوەڕاست بە نۆتەناوی**C4** ژمارەکۆدی شەست60ی هەیە و فریکوێنسیەکەی دەکاتە261.63Hz،نۆتەتۆنی لا/$A$ی ناوەڕاست بە نۆتەناوی$A4$ ژمارەکۆدی شەستونۆ69ی هەیە و فریکوێنسیەکەی دەکاتە440Hz.
لەم پێوانەییەوەڕا دەتوانین فریکوێنسی هەر نۆتەی تۆنێک بمانەوێت دەریبهێنین، ئەویش بە وەرگرتنی دوو ئەوەندەی فریکوێنسی خودی تۆنەکە.
بۆ نموونە ئەگەر فریکوێنسی تۆنی دۆ/$C$بە تۆنەناوی$C2$ دیاریبکەین، دەبێت تۆنی دۆ/$C$ بە تۆنەناوی$C1$وەربگرێن کە دەکاتە32.703Hz پاشان دوو ئەوەندەی خۆی بۆ بخرێتەسەر دەکاتە32.703x2=65.406Hz،
وە هەروەها...... .

| MIDI number | Note music | Frequency |
|---|---|---|
| 21 | A0 | 27.500 |
| 22 | | 29.135 |
| 23 | B0 | 30.868 |
| 24 | C1 | 32.703 |
| 25 | | 34.648 |
| 26 | D1 | 36.708 |
| 27 | | 38.891 |
| 28 | E1 | 41.203 |
| 29 | F1 | 43.654 |
| 30 | | 46.249 |
| 31 | G1 | 48.999 |
| 32 | | 51.913 |
| 33 | A1 | 55.000 |
| 34 | | 58.270 |
| 35 | B1 | 61.735 |
| 36 | C2 | 65.406 |
| 37 | | 69.296 |
| 38 | D2 | 73.416 |
| 39 | | 77.782 |
| 40 | E2 | 82.407 |
| 41 | F2 | 87.307 |
| 42 | | 92.499 |
| 43 | G2 | 97.999 |
| 44 | | 103.83 |
| 45 | A2 | 110.00 |
| 46 | | 116.54 |
| 47 | B2 | 123.47 |
| 48 | C3 | 130.81 |
| 49 | | 138.59 |
| 50 | D3 | 146.83 |
| 51 | | 155.56 |
| 52 | E3 | 164.81 |
| 53 | F3 | 174.61 |
| 54 | | 185.00 |
| 55 | G3 | 196.00 |
| 56 | | 207.65 |
| 57 | A3 | 220.00 |
| 58 | | 233.08 |
| 59 | B3 | 246.94 |
| **60** | C4 | **261.63** |
| 61 | | 277.18 |
| 62 | D4 | 293.67 |
| 63 | | 311.13 |
| 64 | E4 | 329.63 |
| 65 | F4 | 349.23 |
| 66 | | 369.99 |
| 67 | G4 | 392.00 |
| 68 | | 415.30 |
| **69** | **A4** | **440.00** |
| 70 | | 466.16 |
| 71 | B4 | 493.88 |
| 72 | C5 | 523.25 |
| 73 | | 554.37 |
| 74 | D5 | 587.33 |
| 75 | | 622.25 |
| 76 | E5 | 659.26 |
| 77 | F5 | 698.46 |
| 78 | | 739.99 |
| 79 | G5 | 783.99 |
| 80 | | 830.61 |
| 81 | A5 | 880.00 |
| 82 | | 932.33 |
| 83 | B5 | 987.77 |
| 84 | C6 | 1046.5 |
| 85 | | 1108.7 |
| 86 | D6 | 1174.7 |
| 87 | | 1244.5 |
| 88 | E6 | 1318.5 |
| 89 | F6 | 1396.9 |
| 90 | | 1480.0 |
| 91 | G6 | 1568.0 |
| 92 | | 1661.2 |
| 93 | A6 | 1760.0 |
| 94 | | 1864.7 |
| 95 | B6 | 1975.5 |
| 96 | C7 | 2093.0 |
| 97 | | 2217.5 |
| 98 | D7 | 2349.3 |
| 99 | | 2489.0 |
| 100 | E7 | 2637.0 |
| 101 | F7 | 2793.0 |
| 102 | | 2960.0 |
| 103 | G7 | 3136.0 |
| 104 | | 3322.4 |
| 105 | A7 | 3520.0 |
| 106 | | 3729.3 |
| 107 | B7 | 3951.1 |
| 108 | C8 | 4186.0 |

J. Wolfe, UNSW



Mi-dièse(F), Mi-diesis(I), E-sharp(E) پلەتۆنی می دیز.

Military music(E) مۆزیکی سوپایی.

Military band(E) باندی{جووق}سوپایی. پێکهاتووە لە ئامێرە تەختە فووپیاکراوەکانی وەک فلووت و ئۆبوا و کلارنێت، براس وەک ترومپێت و ساکسۆفۆن، ڕەزمیەکانیش وەک دەهۆڵ و ساج.. .

Millioctave(E) ميليـــئۆكتاڤ،*m8ve, µ8ve, moct, µoct* کورتکراوەیەتی،

**میانەپێوانەیەکە***Interval measurement***کە میانەکانی ئۆکتاڤ دابەشـــدەکات بۆ هەزار**1000**بەشە یەکسانی لۆگاریتمی.**

Mi-majeur(F), Mi-maggiore(I), E-dur, E-major(E) **می- مێجەر.**



Mi-majeur gamme(F), Mi-maggiore scala(I), E-major scale(E) **سـکێڵی می- مێجەر.**



Mineur(F), Minore(I), Minor(E), Moll(G) **ماینەر، بچووک.**

Minim, Semibreve, Whole note(E) **نیوەتۆنی تەواو.**



Minim rest, Half-rest of whole rest(E) **نیوەوچان، نیوەپاوس.**



Minor chords(E) **کۆردە ماینەرەکان.**

| Symbol | Symbol | Chord Name | Chord Intervals |
|---|---|---|---|
| C- | Cmin | C minor | 1 b3 5 |
| Cm6 | Cmin6 | C minor sixth | 1 b3 5 6 |
| C-7 | Cmin7 | C minor seventh | 1 b3 5 b7 |
| C-△ | Cmin/maj7 | C minor/major seventh | 1 b3 5 7 |
| C-7(9) | C9 (b3) | C minor ninth | 1 b3 5 b7 9 |
| Cmin$^6_9$ | Cm$^6_9$ | C minor sixth add nine | 1 b3 5 6 9 |
| C-△(9) | Cmin9(maj7) | C minor ninth major seventh | 1 b3 5 7 9 |
| C-7(11) | Cm11 | C minor eleventh | 1 b3 5 b7 11 |

ئەو کۆردە ماینەرانەی کە باون
Common Minor chords




Minor major seventh chord(E) **کۆردی ماینەر مێجەر حەوتەم،**

**پێکهاتووە لە ماینەر سـیانیی***Minor triad* **و لەگەڵ مێجەر حەوتەم***Major seventh*.

Minor scale(E)    دەسگای ماینەر، سکێڵی ماینەر کە سێیەم و شەشەم تیایدا ماینەرە. لێکەوتەی سکێڵی مێجەر و سەربەخۆییەکی خۆی وەرگرتووە، چونکە زاراوەی ماینەر بەمانای بچووک دێت، هەر لەبەرئەوەیشە کە پێیدەوترێت سکێڵی ماینەر. ئەم سکێڵە میانەکانی پێکهاتوون لە:ـ

{ *S=Semitone or half step، T=Tone o whole step* }*T-S-T-T-S-T-T*

لەو دەسگاخۆرەڵاتیانەی کە هاوتای سکێڵی ماینەر دەبنەوە ئەمانەن:ـ دەسگای نەهاوەند، بوسەلیک، سولْتان یەکگا، فەرەحفەزا....

سێ جۆر سکێڵی ماینەر لە مۆزیکی خۆراواییدا هەیە:ـ

1. سکێڵی ماینەری سروشتی *Natural minor scale*

پێشیدەوترێت دەسگای ئایۆلیەن*Aeolian mode*، میانەکانی پێکهاتوون لە:ـ

T-S-T-T-S-T-T.   {نیوەتۆن=S(Semitone)، تۆنی تەواو=T(Tone)}

2. سکێڵی ماینەری هارمۆنی *Harmonic minor scale* میانەکانی پێکهاتوون لە:ـ

T-S-T-T-S-T+S-S

3. سکێڵی ماینەر میلۆدی *Melodic minor scale* میانەکانی پێکهاتوون لە:ـ

T-S-T-T-T-T-S

**سێ جۆر سکێڵی ماینەر**

1.Natural سروشتی

| natural: | whole step | half step | whole step | whole step | half step | whole step | whole step |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

2.Harmonic هارمۆنی

| harmonic: | whole step | half step | whole step | whole step | whole step | 1-1/2 steps | half step |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

3.Melodic میلۆدی

| (ascending): | whole step | half step | whole step | whole step | whole step | whole step | half step |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| (descending): | whole step | whole step | half step | whole step | whole step | half step | whole step |

Minor ninth chord(E)    کۆردی ماینەر نۆیەم،

یەکسانە بە زاڵی نۆیەم*dominant ninth* لە کلیلی ماینەردا.

Minor ninth diminished fifth(E)    کۆردی ماینەر نۆیەمی پێنجەم گەستوو.



Minor ninth diminished seventh(E)    کۆردی ماینەر نۆیەمی حەوتەم گەستوو.



Minor ninth minor seventh(E)    ماینەر نۆیەم ـ ماینەر حەوتەم.



Minor pentatonic(E)    ماینەری پێنجتۆن.

پێنج تۆنی پێکهاتوو لە یەکەم و دووەم و سێیەم و پێنجەم و شەشەم لە کلیلی ماینەری سروشتی.

Minor seventh chord(E) کۆردی ماینەر حەوتەم،

پێکهاتووە لە ماینەر سـیانیی*minor triad* لەگەڵ کۆردی ماینەر حەوتەم.

Minor six pentatonic scale(E) ماینەر ســکێڵی شـەش ـ پێنـتۆنیک.



Minor sixth, Semitonium cum diapente(I) ماینەر شـەشـەم،

میانەیەک لە چوار تۆن*four tones* ئاوێزابێت.

Minor tetrachord(E) ماینەر تێتراکۆرد،

میانەکانی پێکهاتووە لە:ـ T-S-T{*S=semitone, half-step* ، *T=tone, Whole-step*}

Minor third(E) ماینەر سـێیەم کە پێکهاتووە لە تۆنێک و نیوەتۆنێک.

minor triad(E), Accord parfait mineur(F) ماینەر سـیانیی کە ئاوێزاوە

لە ماینەر ســێیەم*minor 3rd* لەگەڵ پێنجەمی تەواو *perfect 5th*.



Minuet(E), Menuet(F), Menuett(G), Minuetto(I) مینوێت،

ســەمایەکی جووتی کەسی فەرەنســاییە لەســەر کێشی3/8 و 6/8، ناســـراوە بەوەی کە لە کۆشکی لویس/14پاشای فەڕەنسا لەنێو خێزانە ئەرەستۆکراتیەکاندا دەکرا، دوایی بووە هەوێنی زۆر لە مۆزیکە کلاسیکیەکان و کارە ئۆپێراییەکان. بەڵام لەدوای سـەدەی نۆزدەمەوە ئەوەندە بایەخی پێ نەدەدرا.

Mirror chord(E), Accord symétrique(F) کۆردە ئاوێنە، کۆردی هەنداز.

Mishra raga(Hn) میشرا ڕاگا، کلاسیک مۆزیکێکی هیندستانی/یە

کە تێکەڵێکە لە دوو ڕاگا یاخود زیاتر.

Missal(E) سـروودنامە، تیانووسێکی سـالانەی کلێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکە بۆ گشـت سـروودەکان.

Misteriosamente(I), Mysteriously(E) بەچەشنێکی ڕازپۆشـانە.

Mistero, Misterio, Misterioso(I), Mystery(E) ڕازپۆشیی.نادیاریی.

Mistica(I), Mystic(E), Mystique(F) سـۆفیگەریی.

Misurato(I), Measured(E) پێوراو، کێش بەندیی.

Mit(I), With(E), Avec, Chez(F) بە، لەگەڵ.

Mit dämpfer, Mit sordinen(G), With mute(E) بەکپی{بۆ ئامێرە ژێدارەکان}.

Mit dem bogen schlagen(G), Struck with the bow(E) لێدان لە ژێ بە کەوان.

Mit empfindung(G), With feeling(E) بە هەستەوە.

Mit einem finger(G), With one finger(E) بە یەک پەنجە.

Mit grosser kraft(G), With great vigour(E) بە بژێویەکی بەهێز.

Mit humor(G), With humour(E) بە هەوەس.

Mixolydian mode(E) حەوتەم دەسـگای کلێسەییە بە میانەی:ـ



T-T-S-T-T-S-T

Mixture(E), Mélange(F) تێکەڵ، تێهەڵکێش، مەبەست لە سکێڵی مێجەر و ماینەرەکانە کە هەمان پایەتۆن*Tonic*یان هەیە. بۆ نموونە سروشتە تۆنی می/*E* و می بیمۆڵ/$E^b$لە پلەتۆنی سێیەمی دۆ ـ مێجەر/*C-major* و دۆ ـ ماینەر/*C-minor*یاندا هەمان پایەتۆنی دۆ/Cیان هەیە.

Mnemonics(E) یادوەریی، زانستێکە تایبەت بە هونەری یادکردنەوە و بەهێزکردنی، ئەویش بە بەکارهێنانی سیلابەکان*Syllable*{حونجەکردن:بە بڕگەکردن} و پەیڤەکان بۆ یارمەتیدانی و هێنانەوە یاد و گۆ کردنی*Vocalise* دێڕە ڕەزمیەکان.

Modal(E), Modale(F) مۆداڵ، گۆزارەیەکە لە مۆزیکی جاز*Jazz*دا بە تۆنی تەواو بەو مۆزیک جازە دەوترێت کە هارمۆنییەکی سەرەوتی هەبێت*Static harmony* ئەویش بە بەکارهێنانی یەک کۆرد*Chord* و چەند سکێڵێکیش کە وەرگیرابێت لە دەسگایەکی تایبەتی وەک دەسگای دۆریان*Dorian mode*.

Modal change(E) مۆداڵ گۆڕین، گۆڕینی مێجەر*major* بۆ ماینەر*minor* یاخود بەپێچەوانەیشەوە بە مەرجێک لە هەمان تۆناڵ سەنتەر*Tonal centre*دا بێت.

Mode(E), Modo(I), Desga(Fa, Kr) دەسگا. ئاوازی هەڵبەستراو لەسەر سکێڵەکان*Scales* کە لە مۆزیکی خۆرەڵاتیدا خۆیدەدات لە نزیکەی سەدوبیست دەسگا و لیڕشتەکانی کە لەنێو میللەتانی کورد، فارس، تورک، ئازەری، عارەب، بەلووچ و سریان/دا بڵاوبۆنەتەوە. بەڵام تاڕادەیەک وا ڕێکخراون کە هەموویان لە سەر دوانزە دەسگای سەرەکی سەرچاوە ببەستن حەوت دانەیان بە دەسگای سەرەکی دادەنرێن. زۆر لەو دەسگایانە تۆنی چارەکە میانە*micro-Interval*یان تێدایە، ئەم چارەکەتۆنە لە مۆزیک سیستەمی خۆراوایدا بە دەنگێکی ئاوارتە و نامۆ دێتە بەرگوێ.

| دەسگای بنیاد{بناخە}*Authentic* | | دەسگای لاوەکی*Plagal* | |
|---|---|---|---|
| I Dorian | **D** EF G A BC D | II Hypodorian | A BC **D** EF G A |
| III Phrygian | **E**F G A BC D E | IV Hypophrygian | BC D **E**F G A B |
| V Lydian | **F** G A BC D EF | VI Hypolydian | C D E**F** G A BC |
| VII Mixolydian | **G** A BC D EF G | VIII Hypomixolydian | D EF **G** A BC D |

مێژووی دارشتنی یەکەم هەشت دەسگای خۆراوایی دەگەڕێتەوە بۆ سەتەکانی ناوەڕاست کاتێک کە چەند ئاوازێکی ئایینی ناسراو بە سرووده گریگۆرییەکان*Gregorian chants*پەسەندکرا و هەر لەلایەن پاپا گریگۆری یەکەم{604-590ز}ەوە وەک جۆرێک لە چەند سرووددێکی بەکۆمەڵ لە کڵێسەی کاتۆلیکدا ڕەوایی پێدرا کە پاشان بە دەسگا گریگۆریەکان*Gregorian mode*ناسرا. ئەم دەسگایانە بە دوو چواریی و بە ژمارەی یۆنانی پۆلبەندکراون کە بریتین لە:ـ پڕۆتۆس*Protus(1st)* و دیوتێڕۆس*Deuterus(2nd)* و تریتۆس*Tritus(3rd)* و تێتراڕتۆس*Tetrartus(4th)*. چوارتاکی یەکەم بە دەسگای بنیاد*Authentic mode*ناودەبرێن و چوارتاکی دوایینیش بە دەسگای پلاگاڵ*Plagal mode*{لاوەکی}، جیاوازی لەنێوان ئەم دوو پۆلەیشدا بەندە بە کەوتنەوەی سروشتی نۆتەی زاڵ*Dominant note* و بەرینی*Range*تیایاندا. نووسینەوەی ئەم دەسگایانەیش کە خرانە ناو کڵێسەوە و بە هەشت دەسگای کڵێسەیی ناسراون...دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانێکی زووی800ز.

پاشان لەنزیکەی ساڵی 1547ز مۆزیکزانی سویسرایی هێنریکۆس گلاریانۆس *Henricus* (1488-1563) *Glareanus*ز توانی چوار دەسگایتر بخاتەسەر ئەو هەشت دانەی پێشوو تاکو بەمە ببێتە سیستەمێکی مۆدێرن لە هونەری تۆنالیتیی *Tonality*دا. گرنگترین نۆتە *Note*یش لە دەسگایەدا کۆتاکەیەتی یاخود بڵێین ئەو نۆتەی کە کۆتایی پێدێت و پێیدەوترێت کادەنس *Cadence*. کۆتایی *Final*ش لە دەسگا بنیادە *Authentic*کاندا بریتین لە نزمترین نۆتە لە سکێڵەکەیدا لەکاتێکدا لە دەسگا لاوەکی *Plagal*یەکاندا کۆتایی دەکەوێتە نۆتەی چوارەمەوە. دەسگاکانیش بریتین لە:ـ

1. پرۆتۆس ئۆوتێنتۆس *Protus authentus*، پێیشیدەوترێت دۆریان *Dorian*:

ئەم دەسگایە....ئاوازێکی زۆر لەسەر زار و باوە، دادەنرێت بە سەرگوڵی دەسگاکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لە دووەم نۆتەوە کە تۆنی ڕێ/Dیە بناخەی دەنگەوارەکانی لەسەر سکێڵی دۆ ـ مێجەر هەڵبەستووە.




***D*** *E F G A B C D*
*s t t t s t t*

2. پرۆتۆس پلاگیس *Protus plagis*، پێیشیدەوترێت هایپۆدۆریان *Hypodorian*:




*A B C* ***D*** *E F G A*
*t s t t s t t*

3. دیوتێرۆس ئۆوتێنتۆس *Deuterus authentus*، پێیشیدەوترێت فریجیەن *Phrygian*:

لە سێیەم دەسگاکلێسییەکانە و لە سێیەم تۆنەوە دەسپێدەکات، لەسەر سێیەم نۆتەی مێجەر سکێڵ{لە کلیلی دۆ}دا بناخەی دانراوە.




***E*** *F G A B C D E*
*s t t t s t t*

4. دیوتێرۆس پلاگیس *Deuterus plagis*، پێیشیدەوترێت هایپۆفریجیەن *Hypophrygian*:




*B C D* ***E*** *F G A B*
*s t t s t t t*

5. تریتۆس ئۆوتێنتۆس *Tritus authentus*، پێیشیدەوترێت لیدیەن *Lydian*:

پێنجەم دەسگای کلێسەییە و تۆنی فا/Fa بۆتە پایە *Tonic* لەسەر سکێڵی دۆ ـ مێجەر.




***F*** *G A B C D E F*
*t t t s t t s*

6. تریتۆس پلاگیس *Tritus Plagis*، پێیشیدەوترێت هایپۆلیدیەن *Hypolydian*:




*C D E* ***F*** *G A B C*
*t t s t t t s*

7. تێترادرۆس ئۆوتێنتۆس*Tetrardus authentus*،

پێیشیدەوترێت میکسۆلیدیەن*Mixolydian*: حەوتەم دەسگای گریگۆرییە کە لە تۆنی پێنجەمەوە{تۆنی سـۆڵ/*C* } لەسـەر سـکێڵی دۆ مێجەر نۆتەکانی دەسپێدەکات.




***G*** *A B C D E F G*

*t t s t t s t*

8. تێترادرۆس ئۆوتێنتۆس*Tetrardus plagis* پێیشیدەوترێت هایپۆمیکسۆلیدیەن*Hypomixolydian*:ـ




*D E F* ***G*** *A B C D*

*t s t t t s t*

9. ئایۆلیەن*Aeolian*یەکێکە لە مۆزیک دەسـگا خۆراواییەکان کە لەلایەن گلاریانۆس/ەوە بەکاردەهێنرا و شەشەم دەسگای گریگۆرییە کە تۆنی لا/A بناخەی دەنگەوارەکانێتی لەسەر سروشتە سکێڵی ماینەر*Natural minor scale*.




***A*** *B C D E F G A*

*t s t t s t t*

10. هایپۆ ئایۆلیەن*Hypoaeolian*.

ئەم دەسگایە لەسـەر سـکێڵی دۆ ـ مێجەر بناخەی دەنگەوارەکانی لەسـەر تۆنی سـی/*B*دەبێت و پێیشیدەوترێت دەســگای لۆکریەن*Locrian*.

*E F G* ***A*** *B C D E*

*s t t t s t t*

11. ئایۆنیەن*Ionian*، دەنگەوارەکانی دەچنە سـەر سـکێڵی مێجەر*Major scale*.

لە سـیســتەمی دەسـگاکاندا...تەنیا دەسـگای ئایۆنیەن لەســەر تۆنی دۆ/*C* بناخەی دەنگەوارەکانی هەڵبەسـتووە لەبەرئەوە بە سکێڵ مێجەری مۆدێرن دادەنرێت.




***C*** *D E F G A B C*

*t t s t t t s*

12. هاپۆئایۆنیەن*Hypoionian*.

*G A B* ***C*** *D E F G*

*t t s t t s t*

لەدواییـشدا دوو دەســگایتریشی خرایەسـەر کە بریتین لە:ـ

13. لۆکریەن*Locrian*. دەسـگایەکی گریگۆرییە کە لەسـەر سکێڵی دۆ ـ مێجەر تۆنی حەوتەم {تۆنی سـی/*B*}تیایدا بۆتە پایە*Tonic* بۆ دەنگەوارەکانی.




***B*** *C D E F G A B*

*s t t s t t t*

14. هایپۆلۆکریەن*Hypolocrian*.

*F G A* ***B*** *C D E F*

*t t t s t t s*

ســـاڵی1595ز....مۆزیکزانـــی ئەڵمانیایی(1559-1625)*Adam Gumpelzhaimer* لە نووســـینێکیدا بەناوی{تەواو شـــرۆڤەکردنی مۆزیکـــی لاتینۆ ـ جێرمانـــی *Compendium musicae latino germanicum*}ئاماژەی بە پۆلاندنی دەسـگاکان بۆ دوانزە دانە داوە و هەســـت و گوزارەی هونەریشـــی بۆ هەر یەکێکیانی دەربڕیوە:ـ

1. دۆریەن*Dorius(Gr),Hilaris(L),Cheerful(E)*گوزارە لە شـــاد و خۆشـباریيەک دەکات.
2. هایپۆدۆریەن*Hypodorius(Gr),Moestus(L),Sad(E)*ئاوازێکی خەمەنگێزە.
3. فریجیەن*Phrygius(Gr),Austerus(L),Severe(E)*سـروودێکە کە ڕەوشـێکی پاگیری و سـەرسـەختیی لەخۆگرتووە وەک دەربڕینی ڕازوناز بەسـەر خودێ پەروەردگاردا.
4. هایپۆفریجیەن*Hypophrygius(Gr),Blandus(L),Enticing(E)*سـروودێکی دڵڕفێنە.
5. لیدیەن*Lydius(Gr), Asper(L), Harsh(E)*سـروودێکی بەجۆش و نالێبووردەییە.
6. هایپۆلیدیەن*Hypolydius(Gr),Lenis(L),Gentle(E)*سـروودێکی خۆشـــگوی ناسکئامێزە.
7. میکسۆلیدیەن*Mixolydius(Gr),Indignans(L),Impatient(E)*ســـروودێکی ســـەودا و پەرۆشـــئامێزە.
8. هایپۆمیکسۆلیدیەن*Hypomixolydius(Gr),Placabilis(L),Placable(E)*ســـروودێکی بەخشندە و لێبوردەی لەخۆگرتووە.
9. ئایۆلیەن*Aeolous(Gr),Suavis(L),Pleasant(E)*ســـروودێکی خۆشـــنودی نزاخوازە.
10. هایپۆئایۆلیەن*Hypoaeolius(Gr),Tristus(L),Sorrowful(E)*سروودێکی زار و پەرێشان و دڵتەنگـئامێزە.
11. ئایۆنیەن*Ionicus(Gr),Jucundus(L),Delightful(E)*ســـروودێکی پڕدڵخۆشـــئامێزە.
12. هایپۆئایۆنیەن*Hypoionicus(Gr),Flebilis(L),Tearful(E)*سـروودێکی ئاە و گریەئامێزە.

Modal Chord(E) کۆردە دەسگاییەکان.

| Mode | Ionian | Dorian | Phrygian | Lydian | Mixolydian | Aeolian | Locrian |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Chord | Cmaj7 | Dm7 | Esusb9 | Fmaj#4 | G7 | Am7 | Bø(Bm7b5) |

Moderatmente(I), Moderately(E) مامناوەندیانە.

Moderatissimo(I), Very moderately(E) زۆر مامناوەندیانە.

Moderate(I), Moderato(I), Modéré(F) مامناوەندی، *mod.*کورتکراوەیەتی.

Modern music, Contemporary music(E) هاوچەرخە مۆزیک، مۆدێرنە مۆزیک. مۆزیکێکی نووسراو لە سـەتەی بیستەمدا.

Modulation(E), Modulazione(I) مۆدیولێن، کلیل گۆڕین لە سکێڵە مۆزیکیەکان، دەسـگاگێڕیی{واتا گێڕانی ئاوازێک بە دەسـگا جیاجیاکانی مۆزیکدا، یاخود بڵێین گۆڕینی لە سـکێڵێکەوە بۆ سـکێڵێکیـــتر کە دەبێت بەشـێوەیەکی زانستیانە و هونەریانە بێت}.

ســـێ جۆری تایبەت/یش لە مۆدیولێن هەیە:ـ

1. تەریبە مۆدیولێن*Parallel modulation*:ـ واتە گۆڕینی کلیل بۆ کلیلێکی تر بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری لە کلیلی نۆتە*Key note*کاندا ڕووبدات، وەک لا/*A* ماینەر بۆ لا/*A* مێجەر، یاخود می/*E* مێجەر بۆ می/*E* ماینەر.
2. ڕێلاتیڤە مۆدیولێن*Relative modulation*:ـ واتە گۆڕینی کلیل بۆ کلیلێکیـتر بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری لە نیشانە نۆتە*Key signature*کاندا ڕووبدات، وەک وەک لا/*A* ماینەر بۆ دۆ/*C*مێجەر، یاخود سـۆڵ/*G*مێجەر بۆ می/*E*ماینەر.
3. ئێنهارمۆنیک مۆدیولێن*Enharmonic modulation*:ـ تێیدا هیچ گۆڕانکارییەک لە کلیلەکاندا ڕوونادات،

ئەو کۆردانەیش*Chord* دەبێت بە بەکارهێنانی هاوتا ئێنهارمۆنیکەکان*Enharmonic equivalents* بنووسرێت، دوو جۆری سەرەکیش لەم مۆدیولێنە هەیە:ـ یەکێکیان بەناوی زاڵی حەوتەم/زێدەی شـەشـەم*Dominant seventh/ Augment sixth*، ئەویتریان گەستووی حەوتەم *Diminished seventh*.

Modus(L), Measurement of rhythm(E) — مۆدوس، پێوانی ڕەزم.

Moins(F), Less(E), Minore(I) — کەم،

Moll(G), Minor(E), Minore(I) — ماینەر.

Molle(I), Gentle,Soft(E) — نەرمونیان.

Mollemente(I), Gently, Softly(E) — بە نەرمونیانی.

Mollskala(G), Minor scale(E) — سکێڵی ماینەر.

Moll tonart(G), Minor key(E) — کلیلی ماینەر.

Molto(I), Very, Much(E),Très, Rudement(F) — فرە، زۆر.

Molto adagio(I), Very slow(E) — زۆر هێواش.

Molto animato(I), Very animated(E) — زۆر بە چالاکی.

Molto allegro(I), Very quick(E) — زۆر خێرا.

Molto seria(I), Soberly(E), Prosaique(F) — زۆر بە بایەخەوە.

Monochord(E), Monocorde(E), Monocordo(I), Unicordum(L) — مۆنۆکۆرد، جۆرە ئامێرێکی زۆر کۆنی سـەردەمی دانای یۆنانی فیساگۆرس*Pythagoras*ە کە هەر لەلایەن خۆیشیەوە داهێنراوە بۆ تاقیکردنەوەی دەنگ بەکاریدەهێنا، ئامێرەکیش پێکهاتوە لە تاکە تەلێک کە هەردوو ســەری بە دوو سـتوون بەستراوە، پردێکیش لە نێوەندایە و بەگوێرەی ئەو دەنگەی کە پێویستە بەملاوبەولایدا دەجووڵێنرێت.

Monodia(I), Monodie(F,G), Monody(E) مۆنۆدیا،

دانراوێکی مۆزیکییە بە یەک هێڵە میلۆدی کە دەشــێت هاویار*Accompaniment*یی لەگەڵدابێت، ئەم شــێوە میلۆدییە لە وەدەرکەوتنی باللیێت*Balletti*دا بە سترانێکی تاکدەنگی{مۆنۆتۆن}دەناسرا کە سـەردەمانی ئێستامان وەک هونەرێکی گۆیندانە*Recitative*سەیردەکرێت.

Monodrama(E) مۆنۆدراما، میلۆدرامایەکی یەک کەســیــیە.

Monograph(E) مۆنۆگراف، تێنووسێکی ئامادەکراو کە ژینباری مۆزیکدانەرانی تێدایە.

Monophonic, Monophony(E), Monofonisch(G) مۆنۆفۆنی،

دانراوەیەکی مۆزیکییە کە یەک هێڵە میلۆدی هەیە، بۆ چەند دەنگ و ئامێرێک ئامادەکرابێت.

Monotone(E) مۆنۆتۆن، تاکدەنگی.

Montant(F), Ascending(E) بەرزبوونەوە.

Monter(E) بەرزبێتەوە، دانانی تەلەکان لەسەر ئامێرێک، کۆکی تەلەکان لەسەر ئامێرێک.

Montez(F), Raise!(E) بەرزیکەرەوە!

Montre(F), Organ stop(E) لوولەی ئۆرگن کە بە پێشی ئامێرەکەوە بەستراوە دانراوە.

ئەمانەیش چەند لوولەیەکن بە چەند پەردە*Pitch*یەکی جیاواز:ـ

1. دیاپازۆنی پەردە هەشت فووت*8ft. Pitch*.
2. دەبڵ دیاپازۆنی پەردە شـانزە فووت*16ft. pitch*.
3. دەبڵ دەبڵ دیاپازۆنی پەردە سـیودوو فووت*32ft. Pitch*.

Morality(E), Vertu(F) مۆراڵیتیی، ڕەوشتناسیی،

Morality play(E) شــانۆگەرییەکی ڕەوشتــئامێز.

Morbido(I), Gentle, Delicate(E) نەرم و ناســک.

Mordent(L), Biting(E) مۆردێنت، گەستن، تیکە، لە وشەی مۆردیێرێ*Mordere*ی لاتینیەوە هەڵێنجراوە کە بەمانای بـیگەزێت*To bite* یاخود تیکە تێکەی بکات دێت. چەشنە ڕازانەوەیەکی دوو شێوە لەخۆگرە،

1. تیکەی بالا *Upper mordent* یاخود تیکەی هەڵگێڕاو*Inverted mordent*.

2.تیکەی پایین*lower morden* یاخود تیکەی سادە*Simple mordent* و ئینجا خوێندنەوەی نۆتەکە جارێکیتر.

Morendo(I), Sterbend(G), Diminishing in loudness(E) بەرەو دەنگ کزی.

Morendo a poco a poco(I) کەم کەم بەرەو دەنگ کزی.

Morendo lentamente(I) بە هێواشی دەنگ کزکردن.

Morendo subito(I) کزکردنی کتوپڕ.

Morente(I) زۆر کزولاواز، مراندنی دەنگ.

Mormorando, Mormoroso, Mormorante(I), Murmuring(E) زەمزەمە، دەنگی ژێرلێو.

Mosso, Movente(I), Motion(E), Motus(L) جووڵە، بزاڤ، بزاوت

چەند جۆرێ/یش لە بزاوت هەیە:ـ

1. بزاوتی یەکگرتوو*Conjunct motion*کە میلۆدییەکی تاکە و بە هەنگاو هەنگاو دەبزوێت.
2. بزاوتی بەرابەر*Contrary motion* کە دوو میلۆدیە و بە ئاڕاستەی پێچەوانە دەبزوێن.
3. بزاوتی نایەکگرتوو*Disjunct motion*کە میلۆدییەکی تاکە بە بازدان*Leap*دەبزوێت.
4. بزاوتی ناڕاستەوخۆ*Oblique motion*کە تێیدا دەنگێک*Voice*لەسەر هەمان پەردە*Pitch* دەمێنێتەوە و دەنگەکانی تر لە بەرزبوونەوە و دابەزیندا دەبن.
5. تەریبە بزاوتی ڕاستەوخۆ*Direct parallel motion*کە تێیدا دوو میلۆدی دەبزوێت و میانە*Interval* لەنێوانیاندا وەک خۆی دەمێنێتەوە.
6. وێکچوونە بزاوتی ڕاستەوخۆ*Direct similar motion* کە دوو میلۆدی لە هەمان ئاڕاستەدا دەبزوێن.




Mosso meno(I) جووڵەی کەمتر.

Mosso piú(I) جووڵەی خێراتر.

Mostra(I), Direct(E) ڕاستەوخۆ.

Motet, Motette(G), Motetus, Motettus(L), Motetto(I) مۆتێت، لە وشەی مۆتێتۆس*Motetus*ی لاتینییەوە وەرگیراوە، دانراوێکی کۆڕاڵی یاخود پارچە مۆزیکێکی کڵێسەیی ساڵانی1400زیە کە بۆ دەنگەوارێک یاخود زیاتر کراوە.

Motif(F), Motiv(G), Motive, Leitmotif(E), Motivo(I), Motus(L) مۆتیف. لە ڕیشە وشەی مۆتوس*Motus*ی لاتینییەوە هەڵێنجراوە کە بەمانای بزاڤ، جووڵە دێت، وەک زاراوەیەکی مۆزیک کە هەر هەمان مانای پێشووی هەیە گوزارە لە چەمک و ناوەڕۆکێ بابەتێک*Subject* دەکات.



سێ جۆریش مۆتیف هەیە: کورتە مۆتیف، درێژە مۆتیف، ڕەزمە مۆتیف.

Moto misto(I), Mixed motion(E) بزەوتی تێکەڵاو.

Moto perpetuo(I), Continuous movement(E) بزەوتی بەردەوام.

Moto precedente(I), The same speed as before(E) هەمان خێرایی پێشوتر.

Moto retto(I), Motus rectus(L), Similar motion(E) هەمان بزەوت.

Movement(E), Mouvement(F) جووڵە، بەشێکی سەربەخۆ لە هونەرکاریە گەورەکانی وەک سۆناتا*Sonata* و سیمفۆنی*Symphony* و کۆنسێرتۆ*Concerto*کاندا دەبینرێتەوە.

هارپی دەم. Mouth harp, Mouth organ, Harmonica(E)

کورتکراوەی *mezzo piano* و *mezzo forte* کە دەبێتە نیوەڕێ *Halfway* لەنێوان نەرم *Piano* و بەرز *Loud* دا. ***mp., mf.***

کورتکراوەیە بۆ *Mano sinistra* واتە دەستەچەپ لەسەر ئامێری پیانۆ. ***M.S., m.s*(I)**

کپاندنی دەنگ، بە دانانی پارچە کوتاڵێک لەسەر ئامێرەکانی وەک تەپڵ و دەهۆڵ...هتد. Muffle(E)

موحەییەر کورد. لێڕشتەیەکی سەر بە دەسگای کوردە کە پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی حوسێنی. Muĥeyyer Kurd(Ar, Kr,Tr)

دووگا — کورد — چوارگا — نەوا — حوسێنی — ئاوج — گردان — موحەییەر

وچانی فرەباڕ، Multibar-rest(E), Pausa multipla(I), Pause multiple(F)




چەند باڕ *bar*ێک لە یەک پشوو *rest*دا بن و بە ژمارەیەک ئاماژەی بۆ بدرێت. Multi-rests(E)




موسێتە، جۆرێکە لە ئامێری مەشکەنای *Bagpipe* کە ژێرەوەی دوو لوولکی بچووکی پێوە بەستراوە. Musette(I), Musette(F)

مۆزیک. Music(E), Mousikê(Gr) Musica(I,L), Musik(G), Musique(F), Axshem(Kr)

مێژووی دێرین باستانی یۆنان دەیگێڕێتەوە کە گەورەی خواوەندان زیۆس *Zeus* بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ هاوسەری خواوەندی یاد *Mnemosyne (Memory)* دەبێت. بەرهەمی ئەو حەوت ڕۆژەی هاوسەرییەیان حەوت پەری/ی بە نازناوی مۆس *Muse*{بەمانای سرۆ:ئیلهام دێت}دەبێت. لە خۆشی لەدایکبوونی ئەو حەوت پەری/یە سەماوەندێکی زۆر خۆش بە ڕابەری ئاپۆللۆ{خواوەندی مۆزیک و هارمۆنی}ی کۆڕی زیۆس لەسەر بەرزایی 5هەزار پێ/ی ترۆپکی هێلیکۆن *Helicon mount* سازدەکرێت{ترۆپکی ناوبراو نزیکەی 8هەزار پێ لە ئاستی دەریاوە بەرزە}. لەو ئاپۆرەی سەماوەندەدا ناوی ئەو حەوت پەری/یانە دەنرێت و هەر یەکەیشیان سرۆی کارێکی پێ دەسپێردرێت، هەر حەوت دانەیش کە ئەمانەن لەژێر سایە و چاودێری خواوەند ئاپۆللۆ/دا دەبن:ـ
نێیلۆ *Neilo*، ترێتۆن *Tritone*، ئاسۆپۆ *Asopo*، هێپتاپۆرا *Heptapora*، ئاخێلۆیس *Achelois*، تیپۆپلۆ *Tipoplo*، ڕهۆدیا *Rhodia*.

بەڵام ئەوەی کە لە هەگبەی هۆریزاندا *Renaissance* تۆمارکراوە و ئاماژەی پێدراوە ئەوەیە کە ئەو خواوەندانە بریتین لە نۆ دانە، ئەوانیش ئەمانەن:ـ

1. خواوەند کالیۆپێ *Calliope*، سرۆبەخشی داستاننووسینی پاڵەوانان و جەوامێران، بە تابلۆ نووسراوێک *Writing tablet* سیمبۆلکراوە.

2. **خواوەند کلیۆ***Clio*، **ســـرۆبەخشی مێژوو، بە تۆمار***Scroll***سیمبۆڵـکراوە.**

3. **خواوەند ئێراتۆ***Erato*، **سـرۆبەخشی ئەڤین، بە ئامێری لیرا***Lyre* **سـیمبۆڵـکراوە.**

4. **خواوەند یوتێرپـێ***Euterpe*، **سرۆبەخشی هۆزانی ستران، بە ئامێری فلووت***Flute* **ســیمبۆڵکراوە.**

5. **خواوەند مێلپۆمینـێ***Melpomene*، **سـرۆبەخشی تراژیدیا***Tragedy*، **بە تراژیدیا ماسک** *Tragic mask* **سـیمبۆڵکراوە.**

6. **خواوەند پۆلیـهایمنیا یاخود پۆلیمنیا***Polyhymni or Polymnia*، **ســرۆبەخشی هونەری ویژەی ئایینی***Sacred poetry*، **بە سـەیرکردنێکی تێڕاماو***Pensive look* **ســیمبۆڵــکراوە.**

7. **خواوەند تێرپســیکۆرێ***Terpsichore*، **ســرۆبەخشی هونەری ســەما، بە سـەما لەگەڵ ئامێری لیر/دا***Dancing with lyre* **سیمبۆڵکراوە.**

8. **خواوەند سالیا{ثالیا}***Thalia*، **سـرۆبەخشی هونەری کۆمێدیا، بە کۆمێدیا ماسک** *Comic mask* **سـیمبۆڵکراوە.**

9. **خواوەند ئۆرانیا***Urania*، **سـرۆبەخشی هونەری سـتێرناســیی***Astronomy*، **بە گۆی ئاســمان** *Celestial globe* **ســیمبۆڵــکراوە.**

**مۆزیک....زوانێکی بە ئاوازی سەرزارە، دەنووسرێت و دەبێژرێت و دەبیسترێت، لە چەپەوە بۆ ڕاست لەسەر پێنج تەریب هێڵی چوار میانەی سەرەکی دەنگی لەسەر دەنۆتێنرێت. پیتەکانی بریتین لە:ـ دۆ/C، ڕێ/D، می/E،/ فا/Fa، سـۆڵ/Slo، لا/A، ســی/B یاخود H.**

**بەهۆی ئەم پیتانەوە چەندین جۆر و چەشـن لە شـێووگە دەنگییەکان و ئامێراڵیەکان......دادەنرێن.**

**بەگشتی هونەری مۆزیک.... لەسـەر چوار پایەی سـەرەکی بەندە:ـ**

1. **ڕەزم***Rhythm***یاخود بلێین ڕیتم کە لە ژیانی ڕۆژنەدا دەبیسترێت وەک بڕگەکانی وشە، سەما و فڕینی باڵندەکان و هەموو ئەو بزاڤانەی لە ســروشتی دەوروبەردا ڕوودەدات واتە لە ڕێگەیەکی ســروشـتیەوە بێت. ڕەزم بریتیە لە هەڵێنجاندن و شــەپۆلاندنی ئاوازێک بەگوێرەی ئەو هەنک***Accentuation***ە پێکهاتەی کە تایبەتە بۆی، ئیتر ئەو هەنکە تیژ بێت یان گڕ، بەهێز بێت یاخود لاواز. چەندە ڕەزم پەیوەندە بە جووڵە...ئەوەندەیش هزرێکی میلۆدی و هاویاری ئەندێشەییە کە بە بیرۆکەیەک هەستی پێدەکرێت و پاشان دەڕدەبڕدرێت.**

**ڕەزم لە مۆزیکدا کە پێیشیدەوترێت کێش، گوزارە لە ڕێکخستنی دەنگە مۆزیکیەکان دەکات بۆ یەکەکاتیە یەکسانەکان لە ڕستەیەکی مۆزیکدا کە بە هێمایەکی کەرتی لە سەرەتای هێڵاسۆ***Staff***دا دادەنرێت، بۆ نموونە دەوترێت 2/4 و 3/4 و 5/8....وەهەروەها.شمارەی سەرە***Numerator***بریتیە لە وردکردنەوەی کاتەکان لە یەکەکاتـێکی گەورەدا و شمارەی ژێرە***Denominator***بریتیە لە یەکەی کاتی گەورە و یەکسانیشە بە چوار بەشەکات{چوار هەنگاو:گاڤ}و چەنجارەی چوار گاڤ لە مازۆر***Measure***ێکدا.**

2. **میلۆدی***Melody***یاخود ئاواز...بریتیە لەو دەزووە هەســتیارەی کە پارچە مۆزیکیەکان بەیەکەوە گرێدەدات و مانا و یەکانگیرییەکی تەواوی پێدەبەخشـێت، ئەمەیش وەنەبێت لە ڕێگەیەکی سـروشـتیەوە وەدەربکەوێت بەڵکو ئافرێنراو و هەڵێنجراوی ژانێکی ڕۆحــی/یە.**

3. هارمۆنــی*Harmony*...هەڵێنجراو و بەرەبەرە ڕەنگڕێژراوی بیری مۆزیکارە نەوەک ســروشـت. ئەم زاراوەیە بە مۆزیکی هاوئاهەنگی ڕاڤەدەکرێت کە گوزارە لە ژەنین یاخود ویژەنی دوو دەنگ یاخود زیاتر دەکات لە یەک کاتدا کە بە گوێ هۆگر و ئاشـنابێت.

4. ڕەنگ{مۆرگ}ی دەنگ*Temperament*، دەنگرەنگی...وەک ڕۆڵـــی گرنگی ماددەی ڕەنگ وایە کە لە نیگارکێشیدا دەیگێڕێت. لایەنێکی زۆر گرنگ و هەســتگیرە لە هونەری مۆزیکدا کە تێـیدا ئاستی هەست بە چێژی مۆزیک*The level of musical taste* ، ئاســتی هەسـت بە گوزارە *The level of expression* نمایان دەکات کە پێکەوە دەدرێت بەگوێی بیسەردا و هەستی دەهاژێنێت. لە سـەروو ئەمانەیشەوە ئاســتێکی تر مۆزیک هەیە کە تەنیا لە خودی تۆنە مۆزیکیەکان و شـێوازی هاوکاریکردن لەگەڵیاندا هەڵدەقولێت کە دەکرێت بە تەواوکەری ئەو ئاســتە مۆزیکانەی پێشـوو دابنرێت. ئەمەیان هەموو کەسێک ناتوانێت پەی پێــببات تەنیا ئەوانە نەبێت کە بەهرەیەکی باڵای خوداییان تیادایە.

Music drama, Opera(E) مۆزیک دراما، ئۆپێرا، مۆزیکێک کە بۆ درامایەک پـێکهێنرابێت.

Music theory(E) مۆزیک تیۆری، دیمانەی مۆزیک.

Musical bow(E) مۆزیکاڵ کەوان، ئامێرێکی لە تەختە دروسـتکراوی تاک ژێ/یی ســەردەمە هەرە دێرینەکانی مرۆڤە کە تاکو ئێستایش لەنێو هەندێک گەلاندا وەک ئامێرێکی میللی بەکاردەهێنرێت. دەشێت هەر ئەم ئامێرە بووبێت کە گۆڕانکاری تیاداکرابـێت و شێوەی ئامێری وەک کەمانچە و ڕەبابەی لێکەوتبێتەوە.

Musical box(E) مۆزیکاڵ بۆکس، ئامێرێکی ڕەزمی میکانیکیە کە دواسەتەی هەژدەم داهێنرا.

Musical comedy(E) مۆزیکاڵ کۆمێدی، نواندنێکی کۆمێدییە بە هاویاری مۆزیک.

Musicalement(F), Musically(E) مۆزیکاڵی، مۆزیکایی.

Musical glasses(E) مۆزیکاڵە شووشەکان، مەبەست لەو جامە شـووشانەیە کە پڕ دەکرێن لە ئاو یاخود لم پاشان بە لێدانیان دەنگیان لێوە دەردەچێت.

Musical intervals(E) میانە مۆزیکاییەکان، بەزۆری بە یەکە*Unit*پێوانەی سەنت*Cent* گوزارەی لێدەکرێت، یەکەی پەردە*Pitch*یەک کە لەسەر بناخەی تێمپەرد ئۆکتاڤی یەکسان *Equal tempered octave* دانراوە. هەر نیوەتۆنێک*Semitone*کیش یەکسانە بە 100Cents. بەو پێــیە ئۆکتاڤێک یەکسانە بە 1200Cents...وە هەروەها




Musicology(E) مۆزیکزانیی، زانستی هونەری مۆزیک.

Musical periods, Musical eras(E) چەرخەمۆزیکیەکان. مەبەســـت لە مۆزیک چەرخە

مێژووییەکانی خۆراوایە کە چەرخەکانیان تاڕادەیەک بەم چەشــنەی خوارەوە دیاریکراوە:ـ

1. چەرخی بەرلە مێژووPrehistoric/Ancient........-500پ.ز.
2. چەرخی ناوەڕاستMedieval.....................500-1450ز.
3. چەرخی هۆرێزان، نوێگەریی Renaissance.....1450-1600ز.
4. چەرخی باڕۆکBaroque..........................1600-1750ز.
5. چەرخی کلاسیکClassic........................1750-1820ز.
6. چەرخی ڕۆمانتیکRomantic....................1820-1910ز.
7. چەرخی بیستەمTwentieth century............ -1900ز.
8. چەرخی مۆدێرنModern......................... -1945ز.

Musical saw(E) مۆزیکی مشار، مۆزیکی هەڕە، ئامێرێکی مۆزیکیە بریتیە لە هەڕە{مشار}ێک کە کەوانی کەمانچەی بەسـەریا دەخشێنرێت و دەنگەکانی لێوەدەردەچێت.

Musical switch(E) سویچ مۆزیک، میلۆدیەک کە چەند تۆنێکی سـروشتی لێوە دەردەچێت.

Musica parlante(I), Recitative(E) ڕێسیتاتیڤ، مۆزیک گێڕانەوە.

Musica reservata(I), Serious music(E) مۆزیکی گرنگ و بەبایەخ،

چەشنە مۆزیکێکی دوایین سـاڵەکانی سـەتەی شـانزەم و سـەرەتاکانی سـەتەی هەڤدەمە.

Musician(E,F), Musicista(I) مۆزیکژەن، مۆزیشەن.

Music signs, Musical symbols(E) سـیمبۆڵە مۆزیکیەکان.

Music theatre, Music theater(E) مۆزیکی شانۆ.

Musipedia, Music encyclopedia(E) ئینساکلۆپێدیای مۆزیک.

Musique de film(F), Film music(E) مۆزیکی فلیم.

Musique sacrée(F), Sacred music(E) مۆزیکی ئایینی، مۆزیکێکی سـپەنتا.

Muta(I),Change(E) تۆن گۆڕینی ئامێرە دەهۆڵیەکان یاخود هەواییەکان بە گۆڕینی کلیلیانKey.

Mutation(E), Mutazione(I) گواستنەوە لە هێکساکۆردێکەوە بۆ یەکێکیتر، بۆ نموونە:ـ

تۆنی ڕێ/D لە هێکســاکۆرد لەســەر سـۆڵ/G دەشێت ببێتە ڕێ/D لە هێکساکۆرد لەسـەر دۆ/C.

Mute(E), Sordino(I), Sourdine(F), Dämpfer(G) بڕوانە/Damp

Muste´ar(Ar, Kr, Tr) موستەعار. لقێکی ســەر بە دەســگای سـێگایە،

سکێڵی بەرزبوونەوەی لەمانە پێکهاتووە:ـ ڕەگەزی موستەعاری سـیانیی لەسەر پلەتۆنی ســێگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا.سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشـی پاش گۆڕینی پلەتۆنی حیجاز بە چوارگا لەم ڕەگەزانە پێکاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی سـێگای سـیانیی لەســەر پلەتۆنی ســێگا.



Muxalif((Ar,Fa,Kr,Tr) **دەســگای موخالیف.**

**بە فلســێ نامەوێ مەحبوبەیە دڵ ساف و خۆش ڕوبێ**

**فیدای ئەو دولبەرەم من حیلەباز و توند و جاود بێ**

**کەمالی، بەدەنگی: عەلـی مەردان**




{تاک یاخود تاکەتۆن یەکســانە بە ســێ چارەکەتۆن}



Marinba ماریمبا



میلۆدیۆن
Melodeon



Melodica میلۆدیکا

Muye(Fa,Kr),Maye(Ar) **دەســگازای موویە یاخود مایە**

**دەشێت ڕەچەڵەکی وشەکە لە مووگە/وە هاتبێت کە چەشنە سـروودێکە لەکاتی سـرۆتەپەرسـتنێکی زۆر تایبەتدا دەبێژرێت، هەر ئەم جۆرە سـروودەیش تایبەت بوویێت بە گەورەپیرانی زارەشتیی کە پێیانوتراوە موگان. وشەکە بەمانای زارین و نزاوپاڕانەوە دێت کە بە زوانی عارەبی ماناێتضَرّ ع دەبەخشێت. ئەم وشەیە دەماودەم زارگۆڕکێی بەسـەردا هاتووە تاکو بۆتە مویە، هەروەک زۆر لە وشەی تری کوردیمان کە بەگوێرەی ناوچە چۆنیەتی گۆکردنی دەگۆڕدرێت وەک دەڵێن کاوراگە هاتگە لەکاتێکدا لە ناو.چەیەکیــتر دەڵێن کابراکە هاتیە یاخود هاتووە.**

**موویە...ئاوازێکی دڵتەنگین و چەمەرئامێزە، لەنێو کورداندا باوە کە دەڵێن موویە و شـادی واتە شیوەن و شـایی{بەتایبەتی لە ناوچەکانی لوڕستان و ئیلام، کرماشان و سـنە}.**

ئەو خۆشخوانەی بە موویە سـۆز لێبەرزبێتەوە پێیدەوترێت موویەخوان، موویەخوێن، موویەچڕ، موویەگر. سـەفەدینی ورمێیی بە ناوی مایە بە یەکێک لە شـەش ئاوازەکانی ناویـبردووە.

ئەم هەوایە لێڕشتەیەکی دەســگای ڕاســتە، پێکهاتووە لە:ـ ڕاسـت لەسـەر پلەتۆنی دۆ، نەهاوەند لەسـەر پلەتۆنی سـۆڵ.



نادیارە کۆرد، کۆردی ئافرێنراو، پێکهاتووە لە Mystic Chord, Synthetic chord(E) زنجیرەیەک لە هێکساکۆرد، ئەم کۆردە لەلایەن مۆزیکزان ئەلێکساندەر سکریابیین *Alexander Scriabin*(1872-1915) وە داهێنرا و بریتین لە:ـ



1. زێدەچوارەم *Augmented fourth*،
2. گەستووی چوارەم *Diminished fourth*.
3. زێدەچوارەم *Augmented fourth*.
4. دووان لە چوارەمی تەواو *Perfect fourth*. وەک لەم نموونەیەدا:ـ ***C, F#, Bb, E, A, D…***



# N

ئەگەر یەکێک چێژ لە مۆزیک وەرنەگرێت.....چۆن دەوێرێت بڵێت مرۆڤـم؟؟
ئانا بۆڵـین

---

Nabimba, Deagen marimbaphone (E) نابـیمبا، بە ئامێری زایلەفۆن*Xylophone*دەچێت. ئامێرێکی ئامریکایی ســازکردەیە لە نزیک ســالانی1936ز.

Nacaire(F), Nacara(I), Nakeres, Kettledrum(E) نەقارە، ئامێرێکی ڕەزمیە، جۆرە تەپڵێکی کاسـە مادەنیە بە چەند قەوارەیەکی جیاجیا، دەنگێکی زبری زولاڵی هەیە، زۆرجار بە جووت تەپڵی بەکاردەهێنرێت، یەکێکیان بچووک بە دەنگی زیل و ئەویتریان گەورە بە دەنگی بەم. وەک دابونەریتێک لە مانۆری ئارتەشی و بۆنە و ئاهەنگ و میهرەگانە گەورە و میللییەکاندا چ بە پیادە و چ ئەسپ سواری. دەڵێن گوایە کاتێک تەرمی سوڵتان سەلاحەدین ئەیوبی بەرەو بەخاکسپاردن بەڕێکرا، نزیکەی هەشـت دەستە لە نەقارژەنان و هەشت دەسـتە لە هۆسـیان پێشـەنگی کەژاوەی بوون.

Nacchare, Naccare(I), Castanets(E), Qaşqe(Kr) کەستانێت، قاشقە، ئامێرێکی ڕەزمیە.

Nach(G), After(E), Après(F), Dopo(I) پاشان، بەدوایدا.

Nachahmung(G), Imitation(E), Simili(F) لاسایی.

Nachbarton(G), Neighbouring tone(E) هاوســێ نۆتە.

Nachhall(G), Echo(E) ئێکۆ، دەنگدانەوە.

Nachtmusik(G), Serenade(E) شــەوگارە مۆزیک.

Nachschlag(G), After beat, After note(E) پاش لێدە، پاش نۆتە، دوو نۆتە پێکەوە کە تریللە*Trill*یەک پێکبهێنێت، نۆتەی زێدە بخرێتە پاش نۆتە ســەرەکیەکە، ئەم چەشنی نووسـینە دەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی/16ەم و 17م.




Nachspiel(G), Postlude(E) بەشـی کۆتایی پارچە مۆزیکێک، بەشــەپاشکۆ.

Nach und Nach(G), Bit by bit(E) تیکە بە تیکە.

Nach wie vor(G), As before(E) وەک پێشـتر.

Nahe(G), Near(E), Proche(F) نزیک.

Name of octaves(E) ناوی ئۆکتاڤەکان.

Narrate(E) گێڕانەوە، داســتان.

Narrator(E) گێڕەر، داســتانخوان.

Naso, Nasetto(I), Tip of a bow(E) سـەری کەوان.

National Anthem(E) سـروودی نەتەوەیی.

Natural(E), Naturale(I) سـروشتی، سـادەیی، تۆنێک نە تیژ *Sharp* بێت و نە پانۆک *Flat*.

Natural sign(E), Bequardo(I), Béquarre(F) سروشتە هێما کە لە پێش نۆتەدا دادەنرێت. ♮

Natural harmony series(E) زنجیرە.سـروشتە هارمۆنی

لەرینەوەی ژێی بەستراو لە هەر دووسـەر بەجۆرێک کە دەبێت فریکوێنسـی دەنگە ژێی سەرەکی 100Hz بێت و فریکوێنسی نۆتەکانی زنجیرە هارمۆنی دەنگەکانیـتر بەدوایدا یەکسان بێت بە $100^*n$ لەکاتیکدا هیمای n ژمارەی تەواوکەر *Integer* واتە ....2,3,4,5.

Natural harmony(E) سروشتە هارمۆنی، هارمۆنی سـیانیی، کۆردی باو *Common chord*.

Natural hexachord(E) سـروشتە شەشـکۆرد.




Natural horn(E) ئامێری هۆڕنی سـادە، هۆڕنی ڕاوشـکار.

Natural keys(E) کلیلە سـروشـتیەکان، وەک لەم نموونەیەدا:ـ




Naturalmente(I), Naturally(E) سـروشتیانە، سـادەییانە.

Natural minor scale, Ancient minor scale(E), سـکێڵی سـروشـتە ماینەر.

Scala minore naturale(I)



T-S-T-T-S-T-T

Natural modulation(E) سروشتە مۆدیولێن، گواستنەوە لە کلیلێکەوە بۆ کلیلەکانی نزیک بەخۆی.

Natural trumpet(E) ئامێری ترۆمپێتی سـروشتی بێ دەمەوانە *Valve* لەسەر کونەکانی *hole*.

Natural scale(E) سـروشتە سـکێڵ، سکێڵی بێ تیژ *Sharp* و پانۆک *Flat*.

Nay, Ney(Kr) نای، نەی، شـمشـاڵ.

Naz(Ar,Ar,Tr) ناز. لێڕشتەیەکی سـەر بە دەسـگای ڕاستە کە سکێڵی پێکهاتووە لە ڕەگەزێکی سەرەکی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزێکی لاوەکی حیجاز لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




Neapolitan chord(E) کۆردی نیپۆڵیتان، وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی شاری ناپۆڵی/ئیتالیا، کۆردێکە کە لەسـەر دووەم پلەی پانۆک *flat*ی کلیلی پایەتۆن *Tonic* پێکدەهێنرێت.

Neapolitan mandoline(E) ماندۆلینی نیـپۆڵیتان.

Neapolitan major scale(E), Scala maggiore napoletana(I) سـكێڵی مێجەر نیـپۆلیتان.



Neapolitan minor scale(E), Scala minore napoletana(I) سكێڵی مینۆر نیـپۆڵیتان.



Neapolitan sixth(E) نیـپۆلیتان شـەشەم، كۆردی لەبری*Altered chord*یشی پێدەوترێت كە بریتیە لە یەكەم هەڵگێڕاوەی كۆردی مێجەر لەسەر سەرپایەتۆن*Supertoinc*یكی پانۆک*flat*، دووەم پلەی سكێڵەكانی مێجەر و ماینەر بەكاردەهێنرێت، زیاتر بەكارهێنانیشی بۆ گەیشتنە بە كۆردی زاڵ*Dominant chord*یاخود كۆردی پایەتۆن*Tonic chord*لە دووەم هەڵگێڕانەوەدا. تۆنی پانۆک ڕێ/*D* دەبێتە سوپەر پایەتۆن لە كلیلی دۆ/*C*دا.




Neben(G), Near, At the side of(E) نزیک، لە تەنیشتی.

Nebendominante(G), Secondary dominant, Applied dominant(E) زاڵی پێكار.

زاڵی دواتایی، بریتیە لە جۆرە كۆردێک كە لە مۆزیكی هارمۆنیدا بەكاردەهێنرێت. ئەم زاراوەیە زیاتر بۆ فرۆزەكردنی كۆردێكی حەوتەمی زاڵ{بۆ نموونە مێجەری سـێیەم*Major 3rd*، پێنجەمی تەواو *perfect 5th* ، ماینەری حەوتەم*minor 7th*}بەكاردێت كە زاڵێكی باو نیە بۆ كلیلە سـروشتیەكان. ئەم جۆرە بەزۆری وەک بەشـێک لە هاومۆنیەكی داینەمیک كارپێدەكرێت و بەشێوەیەكی ئاسایی بە ڕەگێكی چوارەمی بەرزتر*4th higher*بەرەو كۆردێک دەجووڵێت، دەیشكرێت لەسـەر هەر پلەیەک سـكێڵدا هەبێت.




Nebenlinien(G),Leger lines(E) هێڵە لابەلاییەكان.

Neben noten(G), Auxiliary notes(E) نۆتە لابەلاییەكان{یاریدەرەكان}.

Nebst(G), Together with(E) پێكەوە لەگەڵ.

Neck, Fretbord(E) مل، دەسک، ئەو پارچە درێژە ڕووپانەی كە لە ئامێرە ژێدارەكاندا ژێ/یەكانی بەسـەردا دەڕوات و پەنجەكانی لەسـەر دادنرێت.

Negligénte(F), Negligente(I), Negligently, Careless(E) بێبایەخ، ئاسـتنكراو.

Nehawend(Ar, Fa,Kr,Tr), Nawend(Kr) **نەهاوەند، ناوەنـــد**

**وشـــەیەکی دێرینی کوردییە بەمانای ناوەڕاســت دێت، ناوچەیەکی هۆزی لەک/لوڕنشـــینە و کەوتۆتە باشووری شاری هەمەدان/ەوە. خەڵکی ئەو دەڤەرە تا ئێستایش هەر خۆیان بە هۆزی لەک دادەنێن. ئێستا شارێکە سـەربە ئوستانی هەمەدان/وڵاتـی ئێرانە.**

**دەسگای ناوەند لە دەسگا سەرەکیەکانی مۆزیکی خۆرەڵاتی/یە، یەکێکەبووە لە ئاوازەکانی سەردەمی ســاســانیەکان، نەوایەکی شــادیبەخش و وروژێنەرە، دەڵێن گوایە جاروبار لە بۆ بەرزکردنەوەی گیانی جەنگاوەریی و هاندان بۆ چوون بەرەو کارزاری جەنگ سـروودی لەسەر هەڵبەسترابێت. دوورنیە کە وەک ســروودێکی بەجۆش و هاندەر بۆ هەڵمەت و پەلاماردان وترابێت کاتێک کە لەنزیک ســاڵی642ی زایینیشــدا دواجەنگێکی ســەخت لەنێوان لەشکری ئیسلام و یەزدگوردی سـێیەم کیسرای دوا دەسەڵاتداری ســاســانیەکاندا هەڵگیرســا. یەزگەرد بە هەر پەلەپڕوزێیەک بوو لەشکرێکی ناڕێکوپێکی لەخۆ گردکردەوە بۆ وەدەستهێنانەوەی تەختوتاراجەکەی بەڵام کار لە کار ترازابوو، نەیتوانی خۆی لەبەر شاڵاوی ئەو هێزەهاتووەدا ڕابگرێت کە هەڵگری پەیامێکی نوێی پڕ لە ئیمان. ئەم دوو هێزە لەچەند لایەکەوە پەلاماری یەکتریاندا، بەڵام لە هەموویان سـەختـتر کارزاری نەهاوەند بوو. کۆتایی جەنگ بە تەواو تێکشکاندنی لەشکری یەزگورد کیسرا هات.**




**مەبەست لەم هەرەکورتە گێڕانەوەیە...وەبیرهێنانەوەی ناوی نەهاوەندە کە دەشێت گوزارە لە ئاوازێکی جۆشەند و بە هەڵمەت بکات. ئەو ڕەگەزانەی سکێڵی ئەم دەسگایەیان پێکهێناوە ئەمانەن:ـ**

a. **لە سکێڵی بەرزبوونەوەدا:ـ**

1. **ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی ڕاست.**
2. **ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی نەوا.**
3. **گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی چوارگا.**

b. **لە سکێڵی هاتنەخوارەوەدا:ـ**

1. **ڕەگەزی کورد لەسەر پایەتۆنی نەوا.**
2. **ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی چوارگا.**
3. **ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا.**
4. **ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی کورد.**

**ســکێڵی دەسگای نەهاوەند لە بەرزبوونەوەدا بەرابەر هارومۆنیک ماینەرە***Harmonic minor scale* **لە مۆزیکی خۆراوادا، لە هاتنەخوارەوەیشدا بەرابەر ســروشتە ماینەر***Natural minor scale*.

**ئەو لقانەی کە سەر بەم دەســگایەن بریتین لە:ـ نەهاوەندی کورد، فەرەحفەزا.... .**

**بەنوری بادەی کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چیبکەم**

**بەشـەمعێکی وەها چاری شەوێکی وەها نەکەم چیبکەم** **مەحوی، بەدەنگی:عەلی مەردان**

**نەهاوەندی کورد**. لێرِشتەیەکی سەر Nehawendi Kurd(Ar), Nawendi kurd(Kr)

**بە دەســگای نەهاوەندە. سکێڵی هاتنەخوارەوەی ڕەگەزی سێیەمی دەســگای کوردە.**




**نەهەفت** Neheft(Ar,Fa,Kr)

**ڕەچەڵەکی وشەکە لە نیهەفتەن***Niheftan***ی فەهلەوییەوە هاتووە و بەرەبەرە بۆتە نەهەفت کە مانای شــاردنەوە، مەســتوور، حەشــاردان، پۆشــین دەبەخشێت. دەشێت ئەم وشەیە وێکچوونێکی نزیکی لەگەڵ نەخەوت یاخود نەخەفت/دا هەبێت کە بەمانای نەخەوتوو دێت. کەسێک کە هەمیشە بێخەو و بێدار بێت، کەسێک کە بە خەڵوەت و گۆشەگیری دوور لە چاوی خەڵک و ئاوەدانی، لە گونجێکی قەناعەت و پەناییدا خۆی حەشاربدات و بکەوێتە ڕازونیاز، نزاوپاڕانەوە. بەدەمیشـیەوە کزەنەوایەکی پرســۆز و هانا دڵگیر بۆ باری پەروەردگار بەرێت بەڵکو بەگەورەیی خۆی ئاوڕێکی بەزەیی لێبداتەوە و بیخاتە ڕیزی یاران و خۆشەویستانی خۆیەوە.**

**لە هەڵسەنگاندن و هەستێکی مۆزیکیەوە گوێ بۆ سروشتی ئاوازەکە شلبکەین پێدەچێت کە هەر لە سەردەمێکی دێریندا بۆن و ڕەنگێکی ڕۆحانی لەخۆگرتبێت، بەڵام گۆڕانکاری ژیان وای لە سروشتی ئاوازەکە کردبێت کە بشێت بۆئەوەی لە نێوەندی شـەیدایی و ئەڤینیشدا ڕەنگی خۆی دیاربکات.**

**لەڕووی هونەرییەوە لێرِشتەیەکی سەر بە دەســگای بەیاتە، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی عەشیران، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی دووگا. هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووەلە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی سـیانی ســێگا لەسەر پلەتۆنی ئاراک{عوراق}.**




**کەوان هێنانەخوارەوە.** Neiderstrich(G), Down-bow(E)

**نۆتە هاوسێکان، نۆتە نا-هارمۆنیەکان{تۆنەکان}کە هەمان تۆنی کۆرد** Neighbouring notes(E)

**بەجێدەهێڵن یاخود دەگەڕێنەوە سـەری بە تۆنێکی تەواو***Whole note***یاخود نیوەتۆن.**

**هەرگیز.** Nejamais(F), Never(E)

**نێکرێز، وشەلێکدراوی نێک و ریز / ی کوردی/فارسی یە،** Nekriz, Nékréz(Ar,Fa,Kr,Tr)

**نێک بەمانای باشوخۆش دێت و ریز{بەفارسی}یاخود ڕێز،ڕێژ{بە کوردی وەک لە گەڵاڕێز، ڕێژەن....بەدیدەکرێن کە جاروبار پیتی ز و ژ بەیەکتری دەگۆڕنەوە}واتە ڕێژەن***Abundance*.

کۆی وشەکە مانای ڕێژەنێک لە ئاوازی باشـبیسـت و خۆش بە دڵ و دەروون بگەیـێنێت. هەندێک لە ڕووی زوانەوانیەکە بەوە لێکیدەدەنەوە کە وشەیەکی فارسی/یە و بە مانای ڕامەکە دیێت، بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە لەوەناکات هیچ لێکدانەوەیەکی ڕۆمانسی ئەوتۆی تێدا بەدیبکرێت.

نێکرێز....لێرشتەیەکی سەربە دەســگای حیجازە، سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی نەوا. هاتنە خوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا و دووەمیشیان ڕەگەزی سەبا زەمزەم لەسەر پلەتۆنی حیجاز.




Neo, New(E), Neue, Neues(G) — نوێ.

Neqare(Fa, Kr), Double drum(E) — نەقارە. ئامێرێکی ڕەزمی جووت تەپڵە. بڕوانە/*Nacaire*.

New Asar(Ar,Fa,Kr,Tr) — نەوئاسار. نەوئەسەر. یاخود ئەسەری دوور.

دەسگایەکی سەرەکییە...سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ گرێ نەوئاسـار{نێکرێز}لەسـەر پلەتۆنی ڕاسـت، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی نەوا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا.




Nerveux(F) Nervous(E), Agité(F), Nervoso(I) — تووڕە.

Nervosissima(I), Very nervous(E) — زۆر تووڕە.

Net, Nette, Netto, Netta(I), Neat, Clear(E) — نێت، ڕوون.

Nettement(F), Nettemente(I), Clearly(E) — بەڕوونی ئاشکرا.

Neuma(Gr), Sign(E), Signe(F), Simbolo(I) — نیوما، هێما، سـیمبۆڵ.

وشـەیەکی یۆنانی سـەتەکانی ناوەڕاسـتە کە وەک زاراوەیەکی مۆزیکی بە لاتینکراو بەکاردەهێنرا بەڵام لەگەڵ هێما مۆزیکیەکانی سـەردەمی نوێدا چ لە مانا و چ ڕواڵەتدا زۆر جیاوازە.

ئەمانەی خوارەوەیش ڕوونکردنەوەیکە سەبارەت بەو زاراوانە لاتینییانەی کە ئاماژەی پێدراوە:ـ

* ڤیرگا*Virga* واتە گۆچان*Rod* و بریتیە لە تاکە نۆتەیەک*Single note*.

*.تراکتۆڵۆس*Tractulus* بە مانای ترپۆکە*Little stroke* دیێت.

* پونکتۆم*Punctum* بەمانای پنت*Point* یاخود خاڵ*dot*دێ، بریتیە لە تاک نۆتەیەک.

*.پێس پۆداتۆس*Pes,Podatus* بەمانای پا*Foot*دێت، بریتیە لە چەند کۆمەڵە جووت نۆتەیەک.

* کلیڤیس*Clivis* بە مانای کۆم یاخود چەمیو*Bend*دێت، بریتیە لە کۆمەڵە جووت نۆتەیەک.

* تۆرکۆڵۆس*Torculus* لە پەیڤی تۆڕکوێرە*Torquere*وە هاتووە، بە مانای بادان*Twist*دێت، بریتیە لە کۆمەڵە سێ نۆتەیەک لە ڕەوشی شەپۆل.

* پۆڕێکتۆس*Porrectus*لە پەیڤی پۆڕیگێرە*Porrigre*وە هاتووە، بە مانای کشان*Extent* لەسەر هێڵەکەی دێت، بریتیە لە کۆمەڵە سێ نۆتەیەک.

*کلیماکۆس*Climacus*لە پەیڤی کلیماکس*Climax*وە هاتووە، بە مانای پلیکانە*Stair*دێت.

* سکاندیکۆس*Scandicus*لە سکاندێرە*Scandere*وە هاتووە، بە مانای بەرزبوونەوە*Rise*دێت.

* سالیکۆس*Salicus* لە پەیڤی سالیرە*Salire*وە هاتووە، بە مانای بازدان*Jump*دێت.

* فلێکسۆس*Flexus* بە مانای چەمیو، کۆم*Bend* دێت.

* ڕێسوپینۆس*Resupinus* بە مانای کۆمی پاش*Bent back*.

ئەمەیش خشتەی نۆتەکانە کە بە تێپەڕبوونی چەرخی ڕۆژگار گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە

| ناوەکانی نیوما | سەتەی نۆیەم و دەیەم | سەتەی یانزەم تاکو سیانزەم | سەتەی هاوچەرخ |
|---|---|---|---|
| Single note,(Rod)Virga | | | |
| (Little stroke)Tractulus, (Point)Punctum | | | |
| (Foot)Podatus, Groups of two notes | | | |
| (Bend)Clivis, Group of two notes | | | |
| (Climber)Scandicus | | | |
| (Ladder)Climacus بریتیەلە کۆمەڵێکە سێ نۆتەیەکی داشکاو | | | |
| (Twisted)Torculus, Pes flexus | | | |
| (Twisted)Torculus, Pes flexus | | | |
| (Extended)Porrectus, Flexus resupinus | | | |
| نیوما پێکەڵەکان | | | |
| Scandicus flexus Group of four notes | | | |
| Porrectus flexus Group of four notes | | | |
| Totculus respinus Group of four notes | | | |
| Pes Subbipunctis, Podatus Subbipunctis Group of four notes | | | |

Neuf(F), Neun(G), Nine(E) نمره نۆ.

Neunachtel takt(G), 9/8time(E) کێشی9/8.

Neunviertel takt(G), 9/4time(E) کێشی9/4.

Newa(Ar,Fa,Kr,Tr) نەوا{نەغمە}، وشەیەکی زۆر دێرینی کوردیـیە بە مانای بەزمێکی بە ئاواز، وەک دەســگایەکی مۆزیک پێکهاتووە لە:ـ سـەرەتا بە گرێیەکی نەهاوەند لەسەر پلەی دووگا دەسـپێدەکات و پاشان بە پلەتۆنی حوسێنی کۆتایی دێت کە لەگەڵ گرێیی پێشوو دەبێتە دەســپێکی ڕەگەزێکی بەیات/ی لێکدراو لەسەر پلەتۆنی نەوا.

مۆرگی سکێڵی پێنجتۆنی*Pentatonic scale*ی هەیە ئەویش بە دوورکەوتنەوە لە نۆتەی حەوتەمینی.




**بە غەمزەی چاوی مەخموری سـیاهی مەستی می کردین**

**بەماچی لێوی موستەغنی لە ئەنواعی مەزەی کردین**

تاهێر بەگی جاف، بەدەنگی/عەلی مەردان

Newba(Ar,Kr) نەوبە، نۆرە، پێدەچێت وشەیەکی بەعارەبیکراو بێت، زاراوەیەکی داهێنراوی زۆریاب*Zoryab*ە کە بە مۆزیکزان و ســترانبێژێکی زۆر بەناوبانگ دادەنرێت لە مێژووی مۆزیکـی سەردەمانی خەلافەتی ئەندەلوسدا.

Newroz(Kr), Niroz(Ar) نەورۆز، ئاوازێکی زۆر دێرینی کوردی بێت بەڵام پێدەچێت زۆریاب بوژاندبـێتیەوە، چونکە لە وڵاتانی مەڕاکیش*Morocco*و دەوروبەریدا ئەم چەشنە ئاوازە هەیە. لێرشتە هەوایەکی سـەربە دەســگای ڕاستە کە پێکهاتووە لە:ـ

ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست و ئەویتریان لە ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی نەوا.




Newrozi Ecem(Kr) نەورۆزی ئەجەم، لێرشتەیەی سەر بە دەســگای ئەجەمە کە پێکهاتووە لە ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی ئەجەم عەشیران، ڕەگەری بەیات لەسەر پلەتۆنی نوا.

ڕەگەزێکی لاوەکیش کە پێکهاتووە لە ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا.




Newshe, Newşe(Kr), Rhymed prose(E) نەوشە، پەخشانی بەساوەند{بەقافیە}، سـەجەع.

Newshyar, Newşyar(Kr) نەوشیار، ئەو کەسـەی پەخشانی بەسـاوەندە دادەڕێژێت.

Ney(Kr), A middle eastern reed flute(E) نای، نەی، شـمشاڵ، وشـەیەکی کوردیـیە بەمانای قامیش دێت، پێنج کونە پەنجەی تێدایە لە پێشەوە و یەک کونی بۆ پەنجەگەورەیش لە دواوەی.

Nexus(L), Tie(E) بەستە.

Ney-anbon, The earliest-knwon bagpipe(E) مەشکەنای،

ئامێرێکی ناوچەی میاندواوە*Mesopotamia* کە دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە چەند هەزار ساڵێک.

Nicht(G), Not(E) بێ، نا.

Nicht brechen(G), Non-arpeggio(E) بێ ئارپیجیۆ لەسەر هارپ، بڕوانە/*Arpeggio*

Nicht schleppend(G), Not dragging(E) ڕانەکێشان.

Nicht so schnell(G), Not to quick(E) نە بەخێرایی.

Nicht transponierend(G), Non-transposing(E) بێ ترانسپۆزە.

Nicht trillern(G), Non-trilling(E) بێ تریللە.

Nicht zurückhalten(G), Not held back tempo(E) تێمپۆ نەگەڕانەوە بۆ دواوە.

Nieder(G), Down(E), Abbasso(I) دانەوان.

Niederdrücken(G), Press down(E) داپەستان.

Niederschlag(G), Bow down-stroke(E) لێدانی بۆ خوارەوە بە کەوان.

Niente(I), Nothing(E) هیچ، دەنگ بەرەو نەمان.

بۆ نموونە کە دەوترێت*Diminuendo a niente* واتە کەمبوونەوە و....بەرەو نەمان.

Nickelodeon, Orchestrion(E) نیکلۆدیۆن، ئامێرێکی کۆنە کە جاران لە گازینۆ و چێشتخانەکان دادەنراو بە کلیلێکی تایبەت لێدەدرا، هەرجارێک بویسترایە دەنگی لێوەبێت کلیلەکە دەخرایە کونێکەوە{هەرەکو چۆن دەغیلەیەکـی داخراو کونێکی تێدەکرێت بۆئەوەی پارەی مادەنی تێـبخرێت}و بەشێوەیەکی میکانیکانە دەنگی لێوەڕا دەردەهات، ئەو دەنگانەیەش کە لێوەی دەبیسترا بریتیبوون لە دەنگی پیانۆ و فلووت و کەمانچە، ماندۆلین، تەپلی چێوەند، باس تەپڵ، تیمپانی، سیمباڵ و سـێگۆنا...هەندێک ئامێریـتـر.

Nineteenth(E) نۆزدەم، میانەیەک لە دوو ئۆکتاڤ و پێنجەم*fifth* پێکهاتووە.

Ninth(E), Neunte(G), Neuvième(F), Nona(I) نۆیەم.

پێکەلە میانەیەکی سازکراو لە ئۆکتاڤ و دووەم*Second*.

Ninth chord(E) نۆیەم کۆرد، کۆردێک لە زاڵی نۆیەم*Dominant seventh* لەگەڵ پلەی نۆیەم.

Nishaburk, Nişaburk(Ar,Fa,Kr) نیشابور یاخود نەورۆز، لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای ڕاستە،




سکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاسـت لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ڕاست لەسـەر پلەتۆنی نەوا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی حوسـێنی، ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی بوسـەلیک، هەروەها دوو ڕەگەزی لاوەکیش کە بریتین لە ڕەگەزی سـیانیی سـێگا لەسـەر پلەتۆنی ئاوج، ڕەگەزی سـیانیی سـێگا لەسـەر پلەتۆنی نیوحیجاز.

Noch etwas langsamer(G), Still somewhat slower(E) هەر بە هێواشــی.

Noch mehr drängend(G), Still more pressing forward(E) هەر توندبوون بەرەو پێشەوە.

Non schneller(G), Still faster(E) هەر خێراتر.

Noire(E) نەوار، بڕوانە/*Crochet*.

Non-chordal note, Non-essential note(E) بڕوانە/*Non-harmonic note*.

Non dominant seventh chord(E) کۆردی نازاڵ حەوتەم/$V^7$.

Non-harmonic modulation(E) مۆدیولێنی ناهارمۆن.

بەگشتی مۆدیولێن ئاماژەیە بۆ کلیلگۆڕین ئەویش لە سێ باردا:ـ

1. مۆدیولێنی پێوانەیی*Metric modul* یاخود*Tempo modul*. مەبەست گۆڕینە لە تێمپۆ.
2. مۆدیولێنی زەنگی*Timbral modul*یاخود زەنگەی دەنگ کە مەبەست گۆڕینی پلەپلەیە لە ڕەنگ و سروشتی تۆنەکەدا.
3. مۆدیولێنی جێیی.*Spatial modul*مەبەست گۆڕینی ئەو جێگەیە کە دەنگەکەی تێدایە.

Non-Harmonic notes(E) نۆتە نا-هارمۆنیەکان، بەو نۆتانە دەوترێن کە لە خوێندنەوەی کۆردەکاندا هیچ بەهایەکیان نیە، پێیشیاندەوترێت نۆتە نا-کۆرداڵەکان*Non-chordal notes* یاخود نۆتە نا-سـەرەکیەکان*Non-essential notes*. ئەو نۆتانەیش بریتین لە:ـ

1. نۆتە پاسـاوەکان*Passing notes*، بەهۆی تۆنێک یاخود نیوەتۆنیکەوە بەنێو نۆتەکانی کۆرد/ەکەدا تێدەپەڕێت.
2. نۆتە هاوسێکان*Neighbouring notes*، بەهۆی تۆنێک یاخود نیوەتۆنیکەوە نۆتەی کۆردەکە بەجێدەهێڵێت یاخود دەگەڕێتەوە بۆی.
3. ئاپۆجیاتۆرا*Appoggiatura*نۆتەیەکە لە بازدان*Leap* نزیک دەبێتەوە بەڵام بە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک جێگیر، ئەو جێگیربوونەیش زیاتر بە ئاڕاستەی پێچەوانەوەی بازدانەکە دەبێت.
4. نۆتەی هەڵاتوو*Escape note*، پێچەوانەی ئاپۆجیاتۆرا*Appoggiatura*یە کە لە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک نزیکدەبێتەوە و بە بازدانێک لەسەر کۆردەکە جێگیردەبێت.
5. نۆتەی هەڵواسراو*Suspension note*.
6. نۆتەی بەرایی*Anticipation note*، گەیشتنی نۆتەی کۆرد/ەکە بەرلەوەی لێبدرێت کە بەزۆری نزیکدەبێتەوە لە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک.
7. نۆتە پێداڵەکان*Pedal notes*، نۆتە ڕەپاتبوونەوە*Repeating note* یاخود مانەوەی تا ڕەوشی هارمۆنیەکە دەگۆڕدرێت.
8. نۆتەی یاریدەر*Auxiliary note*، نۆتەیەکە ئاماژە بۆ نۆتەی کۆرد دەدات بەڵام ناشێت نۆتەی هاوسێ بێت.

9. نۆتە گۆڕاوەکانChanging notes، دوو نۆتەیە، یەکێکیان بە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک کۆرد/ەکە بەجێدەهێڵێت و پاشان بازدەدات بۆ نۆتەی ناهارمۆنی دوایین ئەویش بە تێپەڕبوونی بەسەر نۆتەی کۆرد/ەکەدا بەرلەوەی بە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک لەسەر هەمان نۆتەی کۆرد جێگیربێت.

Non tempéré(F), Untempered, بێ هەوەس، بۆ نموونە میانە دروستەکان{پوختەکان}.
Pure interval(E)

Non-tertian chord(E) کۆردی ناـ سـیانیی،
کۆردێک کە لە سیانیەکان دانەمەزرا بێت، بۆ نموونە:ـ کۆردە چواریەکانQuartal chord.

Non troppo(I), Not too much(E) زۆرنا.

Normal(E) ئاسایی، نۆرماڵ،
سکێڵی دۆ/Cمێجەر کە تەریبی سکێڵی لا/A ماینەرە نموونەیەکە بۆ مێجەر و ماینەرەکانی تر.

Normal ton(G), Concert pitch(E) تۆنی ئاسایی، پەردەی کۆنسێرت.

Normaltonarten(G), Normal keys(E) کلیلە ئاساییەکان، بۆ نموونە دۆ/Cمێجەر و لا/Aماینەر.

Normaltonaleiter(G), Normal scales(E) سکێڵە ئاساییەکان، وەک دۆ/Cمێجەر و لا/Aماینەر.

Nota(I,L), Note(E,F) نۆتە. بریتیە لە کۆمەڵە هێمایەک کە بەهۆیەوە ڕەزم و ئاوازە مۆزیکەکانی لەسـەر دێڕەکان دەنووسرێتەوە، ئەم هێمایانەیش بە پیتەکانی زوانی مۆزیک ناودەبرێن. هەر دێڕێک لەم نۆتە مۆزیکیانە لە پێنج هێڵی تەریب پێکهاتووە و لە نێوانیشیاندا بۆشایی هەیە، جاری وایش دەبێت کە نووسینەوەی ئاوازێک پێویست بە هێڵاسـۆی زێدە بکات. هەر هێڵێک یاخود هەر بۆشاییەک لەمانە گوزارە لە پلەی دەنگەوارەکان{چینەکانی دەنگ}دەکات. بەم هێڵە تەریب و بۆشاییانە کە پانتاییەک دەگرنەخۆ دەوترێن هێڵاسـۆ{بڕوانەStaff}، واتە هەر پێنج هێڵێکی تەریب هێڵاسۆیەکی مۆزیک پێکبـێنێت. بۆ زانینـی هەر ئاوازێکیش پێویسـت بە دانانی چەند جۆرە هێمایەکیـتر دەکات کە ئەمانەیش دەبنە ڕێـپیشاندەرێک بۆ ناسینەوە و دیاریکردنی بەرز و نزمی تۆنەکان، هێمای سـەکتە و بـێدەنگی و وەسـتان و.....گەلێکیـتر.

Nota buona(I), Accented note(E) نۆتەی پاگیر{ئاکسنت}.

Nota caratteristica, Nota sensibile(I), Leading note(E) نۆتەنما.

Nota cattiva(I), Unaccented note(E) نۆتەی کەوتوو{ناپاگیر، نائاکسنت}.

Nota contra notam(I), Note against note(E) نۆتە بەرابەر نۆتە، بڕوانە/Counterpoint.

Nota di passaggio(I), Note de passage(F), Passing note(E) پاسـاوە نۆتە.

Nota doppiamente puntata(I), Double dotted note(E) نۆتەی جووت پنت.
Note doublement pointée(F)

Nota falsa(I), Changing note(E) گۆڕینی نۆتە.

Nota principale(I), Essential note(E) نۆتەی بنچینە.

Nota puntata(I), Dotted note(E) پنتەنۆتە. نۆتەی دۆتن{نۆتەی بە دۆتکراو}.

Nota romana(E) نۆتەی ڕۆمانا، بە نۆتەی نیوما*Neuma*دەچێت.

Nota sostenuta(I), Sustained note(E) نۆتەی کشـاو و پەیوەستە.

نۆتاندن، حەوت بنەمای جیاواز پێویستە بۆ نووسینەوەی کارێکی مۆزیک:ـ

1. پەردە*Pitch* بۆ دانانی ئەو هیمایانەی کە تیژی*Sharp* و گڕی*Flat*تۆنەکە دەسـنیشاندەکات.
2. ماوەی دەنگ*Duration*، بۆ دانانی نۆتەکان و چۆنیەتـی پنت دانان بۆیان لەکاتی پێویسـتدا.
3. پەیوەستاندن*Articulation*، بەکارهێنانـی چەند فۆرمێک لە نیشـانەی وەک سـتاکاتۆ و تێنوتۆ*Tenuto*.... .
4. تێمپۆ*Tempo*، ئەویش بە بەکارهێنانی مێترۆنۆم بۆ ڕاگرتنی ڕەزم و کات.
5. نیشـــانە دینامیکەکان*Dynamics*، ئەویـش بە بەکارهێنانی نیشـــانەکانی وەک *P, f*بۆ وەدەرخسـتنی دەنگەکە چ بە نیانی*Piano* و چ بە توندی*forte* .
6. بێدەنگی*Silence*، ئەویش بە بەکارهێنانی وچان*Rests* و فێرماتا*Fermata*کان..... .
7. دەنگزەنگـــی*Timbre*،ئەویـــش بە بەکارهێنانی پێـکپە*Mute*یاخود نزیکو دوورخســتنەوەی کەوان لە خەرەک*Bridge*لە ئامێرەژێدارەکانـــی وەک کەمانچە، یاخود بەکارهێنانی پێکپە لە ئامێرە براســیەکاندا بە دانانی دەسـت بۆ کەمکردنەوەی زرنگانەوەی زەنگ*Bell*....

Note liée(F), Tied note(E) نۆتەی بەستوو، نۆتەی گرێدراو.

Notenkopf(G), Notehead(E) سەرنۆتە.

Notenlinie(G), Line on staff(E) هێڵەنۆتە، هێڵی هێڵاسۆ.

Notenschlüssel(G), Clef(E) کلیل.

Notenzeile(G), Staff(E) هێڵاســۆ، ســتاف.

Note pointée(F), Dotted note(E) پنتیوە نۆتە، نۆتەی بەخاڵ.

Note value, Valore durata(I), D`une-note(F), Notenwert(G) بەهای نۆتە.




Note voisin(F), Auxiliary note, Neighbouring note(E) هاوسێ نۆتە، نۆتەی یاریدەر.

Notieren(G), Notate(E) دەنۆتێت.

Nuances(E) نوانسە، گوزارە لە کۆمەڵە هێمایەک دەکات کە بخرێتەسەر دەقێکی مۆزیک و چ لە ژەنین و چ لە ستراندا وەک:ـ

*pppp ppp pp p mp mf f ff fff ffff*

Nur(G), Only(E) تەنیا.

Nur pedale(G), Only pedals(E) تەنیا پێداڵ.

Nut, Fret(E) پاژنەکەوانی کەمانچە، کەمەی ژێ، بڕوانە/*Saddle*.

**نیکلهارپا، کەمانچەی دوگمەدار،** Nyckelharpa(G), Keyed fiddle(E)

**ئامێرێکی ژێدارە کە بە کەوان دەژەنرێت، دەنگێکی زۆر خۆش و ناسکی هەیە، لە وڵاتە سکاندیناڤیاکان و باکووری ئاڵمانیادا زۆر باوە، نیکڵهارپای مۆدێرن شانزە تەلی-سیانی و یەک درۆن**_Drone_ **و دوانزە تەلی ڕەقی هەیە کە ناپێچرێتەوە وەک تەلی کەمانچەی ئاسـایی، سـیوحەوت دوگمەی لای دەستەچەپەوەی هەیە بۆ دانانی پەنجە لەسەری و دەنگ پێدەرکردن.**



# O

ئەگەر بتەوێت لە ئاستی پێشکەوتن و شارستانی گەلێک بزانیت.......
گوێ بۆ هونەری مۆزیکیان ڕادێرە!!!
کۆنفۆشیۆس

---

O(I), Or(E) — یان، بۆ نموونە دەوترێت کەمانچە یان فلووت*Violino **o** flauto*.

Obbligato(I), Obligé(F), Obligat(G), Necessary(E) — تەوزیم، *Obb.*کورتەیەتی.

***Obb.*** — کورتکراوەی/*Obbligato*

Oben(G), Above(E), Sur(F), Sopra(I) — سەروو.

Oberstimme(G), The highest part(E) — بالاترین بەش.

Oblique motion(E) — جوولەی نادیار، زاراوەیەکی بەکارهاتووە لە کۆنتراپونت/*Counterpoint*دا بۆ فرۆزەکردن کاتێک یەک دەنگ جێگیربێت و دەنگی دووەم لە ژوور یان ژێر بجوولێت.



Oboe(E) — ئۆبوا، *Ob.* کورتکراوەیەتی. ئامێرێکی تەختەفووپیاکەرەکانە و تاڕادەیەک زۆر بە ئامێری کلارنێت دەچێت تەنیا جیاوازیان لە بەشی دەمدایە کە پیکەکەی لە دوو ڕیشە پێکهاتووە. داهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ ســەتەی حەڤدەم لەلایەن جین هۆتێتۆریێ*Jean Hotteterre* و مایکڵ فیلیدۆر*Michel Philidor* و بۆ یەکەمجاریش کە بەکاهێنرا لە دەرباری پاشا لویس**XIV**دا بوو. ســەردەمی ئێســتامان گەیشــتۆتە ئەو قۆناخەی لەگەڵ هەندێک ئامێری تردا دەســتەیەک پێکبهێنن بەناوی دەستەی ئۆبوا کە ئەمانەن:ـ

1. پیککۆلۆ*Piccolo* یاخود ئۆبوا-موسـیتە*Oboe-musette* دەنگەواری لە تۆنی می پانۆک/$E^b$ لەسەروو دۆ/Cی ناوەڕاست دایە.
2. ئۆبوا*Oboe*، ئۆبوای ئاسـایی کە لە کۆنسـێرتدا هەیە، دەنگەواری لە تۆنی سـی پانۆک/$B^b$ لە خوار دۆ/Cی ناوەڕاسـت دایە.
3. دی-ئامۆرێ ئۆبوا *Oboe d'amore(F), Oboe lungo(I)*، لە دەنگەوارەی ئاڵتۆ*Alto*، لە نێوان تۆنی سـۆڵ تیژ/$G^\#$ی ژێر دۆ/Cی ناوەڕاست و دۆ/Cی ناوەڕاست دایە.
4. هۆڕنی ئینگلیزی*English horn*لە دەنگەواری تینۆر*Tenor*، لە تۆنی می پانۆک/$E^b$ لە خوار دۆ/Cی ناوەڕاسـت دایە.
5. باس/باریتۆن ئۆبوا*Bass/baritone oboe*یەک ئۆکتاڤ خوار ئۆبوای ئاسـاییە.

6. کۆنتراباس ئۆبوا*Contrabass oboe* دوو ئۆکتاڤ خوار ئۆبوای ئاساییە.
7. هێکلفۆن*Heckelphone*هەمان پەردەی ئۆبوای ئاسایی هەیە بەڵام بە لوولەیەکی فراوانتر.
8. باســـسوون یاخود فاگوت*Bassoon or fagott* دوو ئۆکتاڤ خوار ئۆبوای ئاساییە.
9. کۆنتراباســـسوون*Contra-bassoon* یەک ئۆکتاڤ خوار باســـسوونە.

**ئۆبواژەن.** Oboista(I), Oboist(E)

**ئۆکارینا، فیکەفلووت***Vessel flute***، ئامێرێکی هەواییە لە گڵەچینی دروستدەکرێت** Ocarina(E)
**تاڕادەیەک بە سێوی بنئەرز دەچێت، سێ جۆری هەیە:ـ ســۆپرانینۆ ئۆکارینا***Sopranino Ocarina***،**
**ســۆپرانۆ ئۆکارینا***Soprano ocarina* **و باس ئۆکارینا***Bass ocarina*.

**پارچەمۆزیکی بۆنە.** Occasional piece(E)
**کارنامەیەکی مۆزیک کە بۆ بۆنەیەکی تایبەتی نووسـرابێت وەک زەماوەند و خوان و شـینوشـەپۆڕ.**

**مۆزیکئامێری هەشـت ژێ.** Octachord, Octochord(E)

**سـکێڵی هەشتـتۆن یاخود سـکێڵی گەسـتوو.** Octatonic scale or Diminished scale(E)



**ئۆکتاڤ، لە ڕیشەوشەی ئۆکتا***Octe***ی لاتینیـیەوە** Octave(E), Oktave(F,G), Ottava(I)
**هاتووە بەمانای هەشت دێت، وەک زاراوەیەک لە مۆزیکزانیی***Musicology***دا گوزارە لە سـکێڵێکی دیاتۆنیک دەکات کە بریتی بێت لە دوو دەنگ و ڕێژەی فریکوێنسیان**1:2**بێت.**
**ئەمانەی خوارەوە ناوی ئۆکتاڤە جیاوازەکانە لەسەر تۆنی لا/**A **بە فریکوێنسی** 440Hz:ـ

1. **ژێر ـ کۆنترا ئۆکتاڤ***Sub-contra octave*، Co
   **بە هێمای**Co-Bo**، لەنێوان فریکوێنسـی** 16.352-30.868Hz.
2. **کۆنترا-ئۆکتاڤ***Contra-octave***، یان دەبڵ پێداڵ دۆ /**C-*Double-pedal*، **C1**، **بەهێمای**-C1
   B1**، لەنێوان فریکوێنسـی** 32.703-61.735Hz.
3. **گەورە ئۆکتاڤ***Great octave***، یاخود پێداڵ دۆ/**C-*Pedal*، **C2**
   **بە هێمای**C2-B2**، لەنێوان فریکوێنسـی** 65.404-124.470Hz.
4. **گچکە ئۆکتاڤ***Great octave***، یاخود دۆ/ی باس/**C-*Bass*، **C3**
   **بە هێمای**C3-B3**، لەنێوان فریکوێنسـی** 130.810-246.940Hz.
5. **یەک-هێڵەئۆکتاڤ***One-line octave***، یاخود دۆ/ی ناوەڕاست/**C-*Middle*، **C4**
   **بە هێمای**C4-B4**، لەنێوان فریکوێنسـی** 261.630-493.880Hz.
6. **دوو-هێڵەئۆکتاڤ***Two-line octave***، یاخود دۆ/ی ناسک /**C-*Treble*، **C5**
   **بە هێمای**C5-B5**، لەنێوان فریکوێنسـی** 523.250-987.770Hz.
7. **سـێ-هێڵەئۆکتاڤ***Three-line octave***، یاخود دۆ/ ی ســەروو/**C-*Top*، **C6**
   **بە هێمای**C6-B6**، لەنێوان فریکوێنسـی** 1046.500-1975.500Hz.

8. چوار-هێڵەئۆکتاڤ*Four-line octave*، یان دۆ/ی دەبڵ سەروو/*Top*-C، C7، بە هێمای C7-B7، لەنێوان فریکوێنسی 2093.000-3951.100Hz.

9. پێنج-هێڵەئۆکتاڤ*Five-line octave*، یاخود دۆ/ی دەبڵ سەروو/*Double Top*-C، C8بە هێمایC8-B8، لەنێوان فریکوێنسی 4186.000-7902.200Hz.

Octave clef(E) کلیلۆکتاڤ{کلیلۆئۆکتاڤ}. ئەو کلیلە ئۆکتاڤانەی کە زۆر باون بریتین لە:ـ

| 8 | 8 | | 8 | 8 | 15 | 15 |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Octave up G clef | Octave down G clef Vocal tenor clef | Octave down double treble clef | Octave up F clef | octave down F clef | Two octave up C clef | Two octave up F clef |

Octave designation(E) ئۆکتاڤ دانان، ڕێگەیەکە بۆ پێناساندنی نۆتە مۆزیکیەکان هەر لە نزمترین پەردە*Pitch*یانەوە بۆ بەرزترینیان، هونەری داهێنانی ئەم شێوە پێناسەیەیش دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی کەشیش گویدۆ دی ـ ئاریزۆ*Guido d’Arezzo*.

Octave flute, Piccolo(E) ئۆکتاڤ فلووت، پیککۆلۆ.

Octet(E), Octuor,Octette(F) Ottetto(I), Oktett(G) ئۆکتێت، هەشتیی، کارنامەیەک بۆ هەشت ژەنیار ئامادەکرابێت.

Octofone, Mandoline(E) ئۆکتافۆن، ماندۆلین.

Octuple croche(F), Hemidemisemiquaver(E)  کرۆشی شەستوچواریەکی1/64نۆتەی تەواو.

Octuplet(E) کۆمەڵە نۆتەیەک کە باڕ*Bar*ێک بکات بۆ هەشت بەش لەباتی شەش بەشی یەکسان.

Odd meter(E) مازۆری تاک، مازۆرێک کە کێشی سادە و تێهەڵکێشی پێکەوە تێدابێت، بۆ نموونە کێشی5/4کە پێکهاتووە لە 2/4 و 3/4 یاخود بە پێچەوانەوە.

Oeuvre(F), Work, Opus(E) ئۆپۆز، کارنامەیەکی هونەری.

Ohne(G), Without(E), Senza(I) بەبێ.

Ohne begleitung(G), Without accompaniment(E) بێ هاویاریی.

Ohne dämpfer(G), Without mute, Without damper(E) بێ پێکپە. لە ئامێری پیانۆدا پایدەر بەکاردەهێنرێت بۆ کپکردنی دەنگ.

Oktavparallel(G), Parallel octave(E) تەریبە ئۆکتاڤ.

Omnes(L), All(E), Tutti(I) هەموو.

Omnitonique(F), Having all the notes(E) هەموو نۆتەکانی گرتۆتەخۆ.

Once-accented octave(E) ئۆکتاڤی یەکجار ئاکسنت*Accent*، بڕوانە/*One-line octave*.

Ondeggioando(I), Tremolo, Vibrato, Undulating(E) لەرینەوە، ڤێبراتۆ.

Ondes sonore(F) Sound waves(E) شەپۆلەدەنگیەکان.

Ondulation(F), Waving(E) شـەپۆلاندن.

One hundred and twenty-eight note(E) کرۆشی سـەدوبیستوهەشتیەک1/128ی Semihemidemisemiquaver نۆتەی تەواوWhole note.

One hundred and twenty-eight rest وچانی سـەدوبیسـتوهەشتیەک1/128ی وچانی Semihemidemisemiquaver(E) تەواوWhole rest.

Open diapason(E) دیاپازۆنی کراوە،
ئۆرگنی داخراو کە سـەری یەکێک لە بۆریەکانی{یاخود لوولەکانی}کراوەیە.

Open harmony, Open voicings(E) هارمۆنی کراوە،
شـێوەیەکی هارمۆنیە کە نۆتەکانی بە میانەIntervalیەکی بەرین جیادەکرێنەوە.

Open repeat(E) هێڵەباری کراوەی ڕەپات کە لە سـەرەتادا دادەنرێت ئاماژەیە بۆ دووبارەکردنەوە بە شـێوەیەکی کراوە.

Opera(E,I), Oper(G), Opéra(F) ئۆپێرا، هونەرکارییەکی سـەتەی حەڤدەیەمە، سـترانە دراما بە هاویاری ئامێرەمۆزیکیەکان و بە چەشنێک سـتران و بەشـە مۆزیکیەکان بە وتووێژ و گۆیندەییRecitative جیابکرێنەوە.

Opéra Comique`bouffe`(F), Opera buffa(I), Comic opera(E) ئۆپێرای کۆمیک{گاڵتە و پێکەنین}. لە دیمەنی کورتە کۆمیکەوە وەرگێراوە و شـێوەیەکی زنجیرەئۆپێرایەکی لێـهێنراوەتە بەرهەم کە دوازنجیرەی بە بابەتSubjectی دادەنرێت و پێیشیدەوترێت ئینتەرمیزۆIntermezzo.

Opéra lyrique(F), Lyric opera(E) ئۆپێرای سـترانی{لیرایی}،
چەشنە ئۆپێرایەکی ڕازێنراوی سـەتەی نۆزدەیەمە.

Operetta(I), Opérette(F), Operette(G), Short opera(E) ئۆپێراتۆ، کورتەئۆپێرا،
مۆدێرن شــێوەیەکی ســەتەکانی17م و 18مە کە شــێوەیەکی سادەی لەخۆگرتوە.

Opus(L), Opüs(G), Work(E) کاری هونەری، .Opکورتکراوەیەتی.

Opusculum(L), Little work(E) گچکەکارێکی هونەری.

Oratorio(I), Oratory, Praying(E) ئۆراتۆریۆ، لە وشـەڕیشی ئۆراتیۆ/Oratioی لاتینی/یەوە هاتووە، کە بە مانای نوێژ یاخود خوداپەرستیی دێت. لە نزیکەی ساڵی1640زیەوە وەک زاراوەیەک خرایە چێوەیەکی مۆزیکیەوە بەڵام هەر بە دەقێکی ئایینی. لەدوای ســاڵانی ســەتەی نۆزدەمەوە شــێووگێکی دنیایی و نائایینی کرا بە بەردا.

Orchestra, Orchester(G), Orchestre(F) ئۆکێسترا، وەک زاراوەیەک وشەیەکی دێرینی یۆنانییە، گوزارە لەو ڕووبەرە دەکات کە دەکەوێتە نێوان شانۆ و دانیشتوانی بینەرانەوە و دەبێتە شوێنی تایبەت بۆ مۆزیکژەنان لە ئامێرە ژێدارەکان، تەختە و براسە هەواییەکان و ڕەزمیەکان. لە سەرەتای سەتەی بیستەمەوە ئامێرەکانی هارپ و پیانۆ و بەدوایدا هەندێک ئامێری دەنگی سروشتی خرایەسەر.

تیپێکی ئۆکێسترالّی هاوچەرخ کە لەسەر بناخەی سەتەی حەڤدەمەوە دامەزراوە.پێکهاتووە لە:ـ

1. ئامێرە تەختەهەواییەکان*Wood winds*:ـ
   - ســێ فلووت و دوو پیککۆلۆ.
   - ســێ ئامێری ئۆبوا و دوو ئامێری بووقی ئینگلیزی*Cor anglais*.
   - ســێ ئامێری کلاڕنێت و  دوو ئامێری باس کلاڕنێت.
   - ســێ ئامێری باســـسوون و دوو ئامێری کۆنتراباســسوون.
2. ئامێرە براســە هەواییەکان*Brass winds*:ـ
   - چوار بۆ شەش ئامێری هۆڕنی فەڕەنسایی*French horn*، پێیشیدەوترێت هۆڕنی ئۆرکێستــرالّی.
   - ســێ ئامێری تڕومپێت*Trumpet*.
   - ســێ ئامێری تڕۆمبۆن*Trombone* بە دووانی تینۆر*Tenor* و دانەیەک باس*Bass*،
   - یەک ئامێری تووبا*Tuba*.
3. ئامێرە پێرکیوژن*Percussion*ەکان:ـ
   - یەک ئامێری تیمپانی*Timpani*کە بە دەست یەک ژەنیارەوە بێت.
   - تەپلّی چێوەند*Snare drum*، تەپلّی باس*Bas drum*، سیمبالّەکان*Cymbal*، ساج، ســاج، سـەنگ*Gong*.
   - سێگۆنا*Triangle*، زایلۆفۆن*Xylophone*، ڤایبرافۆن*Vibraphone*. ئەمانە بەگوێرەی پێویست ژمارەی ژەنیارەکان دیاریدەکرێن.
4. ئامێرە ژێدارەکان*Strings*:ـ
   - نزیکەی چوار ئامێری کەمانچەی یەکەم.
   - نزیکەی  چواردە ئامێری کەمانچەی دووەم.
   - نزیکەی دوانزە ئامێری ڤیۆلا.
   - نزیکەی دە ئامێری چێللۆ.
   - نزیکەی هەشت ئامێری دەبڵ باس.
5. ئامێرەکانیـتر:ـ دوو ئامێری هارپ و یەک ئامێری پیانۆ.

## Bowed Strings (2)ژێیە کەوانداره‌کان




## ژێیە کەوانداره‌کان Bowed Strings (1)




## Flutesفلووت




## Tubasتووباکان




## Plucked Strings




## Trombonesترۆمبۆنەکان




## Harpهارپ



## Trumpets ترڕومپێتەکان

Piccolo Trumpet in A

Trumpet in E in E flat

Trumpet in D

Trumpet in C

Trumpet in B flat (Cornet) in A

Bass Trumpet in E flat

Bass Trumpet in C

Bass Trumpet in B flat

## Clarinet (کەڕەنای) کلاڕنێت

Clarinet in E♭

Clarinet in B♭

Clarinet in A

Alto Clarinet in E♭

Bass Clarinet in B♭

Contra Alto Clarinet in E♭

Contrabass Clarinet in B♭

## Double Reeds جووت ڕیشەکان

Oboe

Cor Anglais in F (English Horn)

Heckelphone in C

Bassoon

Contrabassoon

## Saxophones ساکسۆفۆنەکان

Sopranino Saxophone in E flat

Soprano Saxophone in B flat

Alto Saxophone in E flat

Tenor Saxophone in B flat

Baritone Saxophone in E flat

Bass Saxophone in B flat

## Horns هۆرنەکان

B flat Alto Horn

Alto Horn in A

French Horn in G

French Horn in E

French Horn in E flat

French Horn in D

French Horn in C

French Horn in F

Flugelhorn in B flat

Baritone Horn (Euphonium) Treble Clef

Baritone Horn (Euphonium) Bass Clef



## Tuned Percussion دەنگە پێرکیوژنەکان

Timpani (20")

Timpani (23")

Timpani (26" - 25")

Timpani (29" - 28")

Timpani (32" - 30")

Glockenspiel

Xylophone

Vibraphone

Tubular Bells

Marimba









## نەخشە تەلاری ئۆرکێسترایەکی نموونەیی















Orchestra bell(E), Glockspiel(G) **زەنگە ئۆرکێسترا.**

**لەو زەنگانەی کە لە ئۆرکێسترادا بەکاردەهێنرێن:ـ**

1. **زەنگە لوولەییەکان***Tubular bells*، **چەند لوولەیەکی مادەنی هەڵواسـراوە کە بە چیلەدارێکی تایبەت لێدەدرێت و دەیشتوانرێت دەنگیان کپــبکرێت، بەرینی***Range* **دەنگیشیان دەکەوێتە نێوان***F3-F5*.
2. **زەنگە مانگای سـویسرایی***Swiss cowbell*، **بەرینە کرۆماتیک***Chromatic range***ی لەنێوان***C3-A5* **دایە. بەناوی ئەو زەنگەی کە دەکرێتە ملی مانگا.**
3. **زەنگە دەسـتیەکان***Handbells*، **شـەسـتویەک زەنگۆڵەیە کە بەرینە کرۆماتیکی** *Chromatic range* **لەنێوان** *C2-C7***دایە.**
4. **لوولەفۆن***Tubaphone*، **لوولە براسی و مسـیەکان، پێیشیاندەوترێت زایلۆفۆنی هەڵواسراو کە بەرینە کرۆماتیکی لەنێوان** *C4-C6***دایە.**

Orchestral piano(E) **پیانۆی ئۆرکێسترالّی،**

**کارنووسێکی هۆنەری تایبەت بۆ ئامێری پیانۆ کە شـێوەیەکی ئۆرکێسترالّی بەخۆوەگرتبێت.**

Orchestral score(E) **دەقنووسی ئۆرکێسترالّی،**

**سـکۆری تەواو کە تیایدا گشت ئامێرەکان و دەنگەکان لەسەر هێلاّسـۆکان بە جیاجیا دادەنرێن.**

Orchestra pit(E) **پاژە ئۆرکێسـترا، ڕووبەرێکە لە بەرایی**

**بنی شـــانۆکەدایە، لە خانەی ئۆپێرا***Opera house***کە لەوێدا ژەنیارانی ئۆرکێسترا دەژەنن.**

Orchestration, Instrumentation (E), Orchestrierung(G) **ئۆرکێستراندن، ئۆرکێستراسازیی.**

**کارێکی هونەری و زانسـتییە بۆ ڕێکخستن و هاوسەنگی لەنێوان ڕەنگ و دەقدا.**

Orchestre de chambre(F), Chamber orchestra(E) **ئۆرکێسترای هەیوان.**

Orchestre symphonique(F), Symphony orchestra(E) **ئۆرکێسترای ســـیمفۆنی.**

Orchestrion(E) **ئۆرکێستریون، بڕوانە/***Nickelodeon*.

Order, Organisation(E), Ordnung(G) **پلە، لێدان، جۆر، ئۆردەر، ڕێکخستن،**

**ڕەوشێکە کە نۆتەکانی کۆردێک لە ژووور نزمترین نۆتەباس***Bass note***دا دەسـپێبکاتەوە.**

Ordered pitch interval, Directed interval(E) **میانە پەردەی لێدراو، میانەی ئاڕاسـتەکراو.**

**لە تیۆری ئاتۆناڵ***Atonal***دا....چەند جۆرە میانەیەکی نمرێنراو هەیە، یەکەم میانەپەردەی ئاڕاستەکراو میانەیەکە لەنێوان دوو پەردەی سـەروو و خوارەوودا، بۆ نموونە میانەی بەرەو سـەروو لەنێوان دۆ/**C**وە بۆ سـۆڵ/**G** بریتیە لە نمرە/**7**، لەکاتێکدا بەرەو خواروو لەنێوان سـۆڵ/**G**وە بۆ دۆ/**C** بریتیە لە نمرە/**7**ــ.**

Ordinaire(F), Ordinario(I), Ordinarium(G), Ordinary, normal, common(E) **ئاسایی، نۆرماڵ، تەکنیکژەنینێکی سـتاندەر کە ناگۆڕدرێت.**

Ordo(L),Phrase(E), Revirement, Locution(F) **بڕگەی مۆزیک، گوزارە، چەشن.**

ئۆرفا، وشەیەکی زۆر دێرینە، Orfa(Ar,Kr,Tr)
گوایە لە ئورهایUrhay،ئورهۆیUrhoyزوانی سیریانی/یەوە هاتووە کە بە مانای شاری ئاو دیت، لەبەرئەوەی کە شارێکی ئاوەدان و فەرەئاو بووە و ڕوباری فرەهات{فرات}یشی بەلادا تێپەڕدەبێت. وشەکە بەرەبەرە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بە ئورها ـ ئورفا. لەبەر پیرۆزی و بە بەهاڕاگرتنیشی لای سەوادی خەڵک بە شانلی ئۆرفاŞanli Urfaناسراوە کە بەمانای ئۆرفای بەها Glorious Urfaدێت، پیرۆزی ئەم شارە دەبەستنەوە بە زادگەی پێغەمبەران حەزرەتی برایمی{د.خ} و حەزرەتی ئەیوب/ە، دەگێڕنەوە کە هەر لەوێیشدا بە فەرمانی نەمرود حەزرەتی برایم دەخرێتە ناو ئاگرەوە بەڵام خودێی مەزن لە گڕی ئاگرەکە دەیپارێزێت و هیچی لێنایەت وەک لە قورئاندا دەفەرموێت:ـ" یا نار کوني برداً و سلاماً على إبراهيم".
لە سەدەی303پ.ز یونانییەکان بە ئێددێساEddesa و سەردەمی ئیمپراتۆرێتی بیزەنتی بە جوستینۆپۆلیسJustinopolisناوی هاتووە. لەنێو خەڵکە کوردنشینەکەیدا هەر لە دێرڕۆژگارەوە بە ڕوها یاخود ڕیهاRiha هاتووە{زوانی عارەبی کردویە ڕوحا یاخود ڕیحا}کە بەمانای ڕەوان یاخود ڕۆح دێت، ڕۆح/یش هەر وشەیەکی ئاڤێستاییە. وشەی ئۆرفە تاڕادەیەکیش نزیکە لە ئاوروڤانە ـ ئۆرواOrwaی ئاڤێستاییەوە زۆر نزیکە کە هەر هەمان مانای ڕۆح و ڕەوان دەبەخشێت.
ئەم ناوچەیە و بەتایبەتی ئەم شارە لەسەردەمی دەسەڵاتداری عەباسیەکاندا مێژوویەکی زۆر گەشی هەبووە لە بوژاندنەوەی فەلسەفە و زانستە یۆنانییەکان و تەرجوماندنیان بۆ زوانی عارەبی.
ئۆرفە....لەڕووی هونەریەوە فۆرمێکە لە دەسگای بەیات لەسەر پلەتۆنی حوسێنی و گیرساندنەوەی لەسەر پلەتۆنی لاA/. لە زۆر بۆنە ئاییەنییەکاندا هەوایەکی زۆر دڵگوشاد و کاریگەری لێوە دەبیسترێت.
جاوەڕێی مژدەی نەسیمم تا لە گوڵشەن دێتەوە بەڵکو فەرمایشت بکا گوڵ بولبولی زوو بێتەوە
مەحوی، بەدەنگی:عەلی مەردان
ئۆرگن، ئامێرێکی دەستی Organ(E), Organo(I), Organum(L), Orgel(G), Orgue(F)
هەوایی کیبۆردە، پێکهاتووە لە پێداڵ-بۆردPedal-boardێکی بەستراو بە موشەدەمەیەکەوە کە پێی لەسەر دادەگیرێت لەڕێی دەمەوانەکانیەوەڕا دەنگەکان دەردەچن. لەسەر ئەو دەمەوانانەیشدا چەند بۆرییەکی تەختە و کانزایی دانراون. ئەم شێوە ئامێرە لە دێر ڕۆژگارەوە لە کڵێسە کاتێدراییەکاندا کارپێدەکرێت و تا سەردەمی ئێستایش بەڵام بە شێوەیەکی ڕێکوپێکتر لە ڕووی میکانیک و تەکنیکەوە. ئەم شێوە ڕێکوپێکەی لە مۆزیکە دونیاییەکانیشدا بەکاردەهێنرێت.
ئۆرگان کۆڕاڵ، چەشنەژەنینێک یاخود کۆڕاڵبێژییەکی کڵێسەییە، Organ chorale(E)
شمارەیەک لە چەند مۆزیکچەشنێکی جیاوازی ئۆرگن/یە، وەک ڕەوشێکی باو بەشێوەیەکی کۆنتراپونتاڵContrapuntal کە لە پێشکەشکردنی سۆزە ئایینیەکانداHymns یاخود وەک دیکۆراندن و ڕازانەوە{وەک فانتاسیی}یاخود لە کاتی سروودچڕینی کۆڕاڵیدا دەژەنرێت.
ئۆرگانیسترۆم، هوردی-گوردی، Organistrum(L), Hurdy-gurdy(E)
ئۆرگنی قەوارە گەورەی سەتەی 19مە لە ئاوروپادا کە بەدەستی دوو ژەنیار لێدەدرا.

Organista(I), Organist(E) ئۆرگنـــژەن.

Organo de cristal(I), Glass harmonica(E) هارمۆنیکای لە شـووشـە دروسـتکراو.

Organographia(L), Description of instruments(E) ئۆرگانۆگرافیا، فرۆزاندنی ئامێرەکان.

Organ grinder(E) ئۆرگنی گەڕۆکی دەستی کە لەسەر جادەکان دەژەنرێت.

Organ pipes(E) لوولە ئۆرگن، ئەو لوولانەیە کە لە ئامێری ئۆرگن بەسـتراوە و دەنگی لێوەڕا پەیدادەبێت لە ئامێرەکانیتر جیاوازە، هەر لوولەیەکی تاکەتۆنێکی لێوەڕا دەردەچێت و بەدوایدا ڕیزێک تۆن لە هەر کلیلێک. ئەو لوولانە دوو پۆلن:ـ

1. لوولە بێ ڕیشـەکان*Flue pipes*، ئەو ئامێرانە ئەگرێتەوە کە بە هەوا دەنگیان لێوەڕا دەردەچێت، وەک فلووتەکان*Flutes*، پرنسـیپاڵەکان*Principals*{جۆرە تڕومپێتێکی سـەرەتاکانی سـەتەی هەژدەمە}، ئامێرە ژێدارەکان.
2. لوولە ڕیشەدارەکان*Reed pipes*، ئەو ئامێرانە دەگرێتەوە کە بە زمان لەرینەوە دەنگی لێوەڕا دەردەچێت، وەک تڕومپێتەکان*Trumpets* و دەنگە مرۆییەکان*Vox humanas*.

Organo portabile(I), A portable organ(E) ئۆرگنی گەڕۆک.

Organ stops(E) ئۆرگنە داخراوەکان، مەبەسـت لە لوولە یەکلا داخراوەکانی ئۆرگنە کە بە گوێرەی درێژیان پەردە*Pitch*یان دیاریدەکرێن و دەچەسـپێنرێن.

Organ tone, Diapason tone(E) ئۆرگن تۆن، دیاپازۆن تۆن، لوولەکراوەیەکی هەشت فووتە*8ft*.

Organum(L), Organ(E), Orgel(G), Orgue(F) ئۆگانۆم، ئۆرگن، چەشنە مۆزیکێکی پۆلیفۆنی سەردەمانێکی زووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی نێوان دوایین سـەتەی/9م تاکو ناوەڕاستی سەتەی/13م. ئۆرگانۆم هەروەک چەشـنە مۆزیکێکی ئاسـاییش بریتیە لە بەشــە سـروودێکی نیوماتیک*Neumatic*{بڕوانە/*Neume notation*} و مەلیسماتیک*Melismatic*{ڕیشەی وشەکە لە مەلیسـما*Melisma*ی یۆنانیـیەوە هاتووە کە بەمانای مۆزیکی دەنگ دێت، واتە یەک سـیلاب*Syllable* لەسـەر یەک نۆتە یاخود زیاتر دابنرێت، چەمکی وشەکە وەک زاراوەیەکی هونەری گوزارە لە سیلابەکانی دەقیک دەکات}.

Oriental(E,F) خۆرەلاتی.

Oriental scale(E) سـکێلی خۆرەلاتی، دەسـگای دووەمە لە سکێلی دەبڵ هارمۆنیک ماینەر.



Origin, Source(E) ماک، سـەرچاوە، چاووگ.

Ornamentação(P), Ornament(E,F), Ornamenti(I), Embellished, Grace(E) ئۆڕنامینت، ئاڕایشت.

زارانەوەیەکـی هونەریە کە گوزارە لە جوانـی و شــــۆخوشــەنگی، زێبایی وماننەندیان دەکات، ڕیشەوشەیەکی زوانی پۆرتوگاڵییە بەمانای زەخرەفە، نەخشاندن و ئاڕایشت دێت، نۆتەیەک یاخود زیاتر دەخرێتەسەر هێڵە میلۆدیەکە بە مەبەستی نەخشاندن و زەخرەفاندنی ئاوازەکە، چێژ وەرگرتن لێی بەچەشنێکی کاریگەرتر ئیتر چ بە نووسین بێت یاخود سـەرزاری. لە سـەتەکانی/17م و 18مدا

وەک نیشانە و هێمایەک لە دەقێکی مۆزیکدا دادەنرا کە هەندێک جووڵەی وەک تریللە*Trill*، مۆردێنت*Mordent*، سوور*Turn*، ئارپیجیۆ*Arpeggio*، ئاپۆجیاتۆرا*Appoggiatura*ی دەگرتەوە. مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم چەشنە ڕازانەوە و دیکۆراندنانە ئاسەوار بەجێهێشتنە لە هەستونەستی گوێگر و گۆڕینی هەوەس و بردنی بۆ دونیای ئەندێشە و چێوەندێکی دڵخۆش یاخود پەست و خەمگین....وەهەروەها.




Orpharion(E) ئۆرفاریۆن،

مۆزیکئامێرێکی ژێدارە لە خێزانی باندۆرا*Bandora*، دەنگی تارادەیەک بە ئامێری عوود دەچێت، نزیکەی نۆ ژێی لەسەر دەبەسترێت. وەدەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سەتەی16/م.

Osservanza(I), Attention, Observation(E) سەرنج، تێبینیی، ئاگاداری.

Ossia(I),Ou(F), Or(E) یان، یاخود.

کورتە ڕەپاتبوونەوە لە جووڵەی میلۆدی، هارمۆنی، ڕەزمی، چەند جۆرێک لە ئۆستیناتۆ هەیە:

1. میلۆدییە ئۆستیناتۆ*Melodic ostinato*، کورت، شێوە ڕەپاتبوونەوەیەکی میلۆدی لەگەڵ میلۆدییەکی تردا بۆ هێنانی هارمۆنی*Harmony*.
2. باس ئۆستیناتۆ*Basso ostinato*، کۆرت، شێوە ڕەپاتبوونەوەیەکی میلۆدی لە دەنگەواری باس*Bass* دا.
3. هارمۆنە ئۆستیناتۆ*Harmonic ostinato*، کورت، ڕەپاتبوونەوەیەکی هاویارییە بە درێژایی میلۆدییەکە.
4. ڕەزمە ئۆستیناتۆ*Rhythmic ostinato*، کورت، بۆ نموونە لە هاوڕەزم*Isorhythm*دا، شێوە ڕەپاتبوونەوەکانی ڕەزم پێیاندەوترێت تالیا*Talea* کە لە هێڵی تینۆر*Tenor*دا لە بەرابەری ئەو نۆتە یاخود پەردانە دادەنرێن کە پێیاندەوترێت ڕەنگ*Colour*. مەرج نیە کە تالیا و ڕەنگ هەمان درێژبوونەوەیان هەبێت.

Ôtez(F), Take off(E) لابردن.

Ôtez les sourdine(F), Take off the mute(E) پێکپەلابردن.

Ottava(I) بڕوانە/*Octave*. بۆ نموونە دەوترێت*all´ ottava*واتە لە ئۆکتاڤدا، یاخود دەوترێت*Coll´ ottava*واتە ژەنین لە ئۆکتاڤەکاندا.

Ottava alta, Ottava sopra(I), Octave higher(E) ئۆکتاڤێک بەرزتر/ $8^{va}$.

Ottava basso(I), Ottava sotto(I), Octave lower(E) ئۆکتاڤێک تزمتر/ $8^{vb}$ .




Ottavina, Superoctave(E) گچکە ئۆکتاڤ،

وەک ئۆکتاڤێک لە سـەروو ئۆکتاڤی سـتاندەر دەژەنرێت و پێشـیدەوترێت سـوپەرئۆکتاڤ.

Ottavino(I), Octave flute and Piccolo(E) ئۆکتاڤ فلووت و پیککۆلۆ.

Ottone(I), Brass(E) براس، بۆ نموونە دەوترێت ئامێرە براسـیەکان*Stromenti d´ottoni*.

Oud, Ud(Ar,Kr,Tr), Barbad(Fa,Kr), Laoutain(Gr), Lute(S) ئامێری عوود، بارباد.

عوود...وشـەیەکی عارەبی بەمانای چەوێڵ:تەختە*Wood*، ئامێرێکی زۆر دێرینە لەنێو میللەتانی خاوەر میانەدا، هەندێک بۆچوون هەیە لەسەر ناوەکەی کە گوایە لەسەرەتادا لە سەردەمی ساسانیەکاندا{تاکو ئێستایش لە نێو میللەتی فارس و کوردسـتانی خۆرەڵات}هەر بە بارباد*Barbad*ناوی براوە ئەویش لەسەر ناوی مۆزیکسازی بلیمەت بارباد/ی کورد{لوڕنەژاد}کە لەسەردەمی کەیخەسـرەوشـای سـاسـانیدا ناوبانگی دەرکرد. ئەم ئامێرە لەڕێی بازرگانانەوە گەیشتە وڵاتی چین بەناوی پـیپا*Pipa* و وڵاتی ژاپۆن بەناوی بـیوا*Biwa*، زۆریاب/یش کە خۆی گەیاندە وڵاتی ئیسپانیا{هەرێمی ئەندەلوسـیا} ئەم ئامێرەی بەناوی ئەلـعود/عارەبی *Al-oud*یاخود*El-oud*ی لەگەڵ خۆیدا برد بەڵام ئیسپانیاییەکان زارگۆڕکێیان تیاداکرد تاکو بە وشەی لووت*Lute*گیرسـایەوە و زۆربەی وڵاتانی ئاورووپایش هەر بە لووت ناویدەبەن.

Ouvert(F), Open(E) کراوە، زاراوەیەکە لە مۆزیکی ترۆبادۆر*Truobadour music*دا کارپێدەکرێت، کادەنسێکە کە دوایین نۆتە تێیدا ناتەواوە و لەسـەر پەردە*Pitch*ی یەک نۆتەی سەروو کۆتایی دەگیرسـێتەوە. لە سـەما فەرەنساییەکاندا بە دووەم و چوارەم دەوترێت سەرووە پۆزیشنەکان *Positions ouvertes*.

Overblowing(E) توند فووپیاکردن لە ئامێرە هەواییەکاندا،

بۆ نموونە لە ئامێرە ڕیکۆردەکان*Recorders*دا کە دەگەیـێنرێتە ئۆکتاڤێک بەرزترـ نزمتر، یاخود کلاڕنێت کە دەگەیەنرێتە دوانزەیەم تۆنی بەرزترـ نزمتر.

Overstring(E) سـەرژێ، زاراوەیەکە بۆ ئامێری پیانۆ، دانانی ژێ/یەکان لە دوو ئاستی جیاواز.

Overtone(E), Oberton(G) ئۆڤەرتۆن، بانـتۆن، سـەرتۆن، بەو نۆتانە دەوترێن کە لە زنجیرە هارمۆنیەکاندا چوون بەناویەکدا {واتە نۆتە لاوەکیەکان} بێجگە لە یەکەم تۆنە بنەڕەتیەکان.

**چەند نموونەیەک بۆ دیاریکردنی سەرتۆنەکان:ـ**

| هارمۆنیک Harmonic | Freq. Hz | نۆتە Note | Comments ڕاڤە |
|---|---|---|---|
| 1 | 131 | C3 | Fundamental بنەڕەت |
| 2 | 262 | C4 | 1 Octave Higher |
| 3 | 393 | G4 | A Fifth above C4 |
| 4 | 524 | C5 | 2 Octaves above fund. and a fourth above G4 |
| 5 | 655 | E5 | A Third above C5 |
| 6 | 786 | G5 | A Fifth above C5 Harms. 4, 5 & 6 form a major chord |
| 7 | 917 | almost B5b | An overtone to avoid دوورکەوتنەوە لێی |

**ئەم دوو هێڵاســۆیەیش نموونەیەکە لە زنجیرە سەرتۆنەکان لە تۆنی دۆ/Cوە:ـ**



Overtone scale(E) **ســکێڵی ســەرتۆن.**

**ئەم جۆرە ســکێڵە زیاتر لە ئامێرژەنینی گیتار/دا کاریــێدەکرێت.**




Overtone series(E) **زنجیرە ســەرتۆنەکان.**



Overture(E) **پێشەکی، ســەرەتا، ســەردەق. پێشەکی مۆزیکێک لە کارێکی ئۆپێرا***Opera***، ئۆراتۆریا***Oratorio***یاخود باللێت***Ballet***. کۆنسێرت پێشــەکی***Concert overture***.**

**کارێکی ســەربەخۆیە. کارێکە بە ســویت***Suite***دەچێت{کە چەند جووڵە***Movement***یەکی هەیە}بە دوو جۆری ســەرەکی:ـ 1. پێشــەکی ئیتالیایی***Italian overture***، بریتیە لە ســێ جووڵە:ـ**

**خێرا***Quick* **- هێواش***Slow* **- خێرا***Quick*.

2. **پێشــەکی فەڕەنسـایی***French overture***، بریتیە لە ســێ جووڵە:ـ**

**هێواش***Slow* **- خێرا***Quick* **- هێواش***Slow*.

------------------------------------
----------------------
------------

# P

مۆزیکی بەجۆش.... کڵپەی ئاگرە لە دڵی پیاوان...و
فرمێسکە لە چاوانی خانماندا.                    بیتهۆڤن

---

**p** **کورتەپەیڤی پیانۆ یاخود پایدەر***pedal*.

Paar(G), Pair(F), Even, Few(E), Poca, Paio (I) **بچەک، جووت.**

Pacato(I), Placid(E) **ئارامگرتە، داسەکنیو.**

Pacatamente(I), Placidly(E) **بە ئارامی، داسەکنیوانە.**

Padiglione(I) **پادیجلیۆنێ، ئامێرێکی زەنگی هەواییە.**

Pakhawraj(Hn) **پاخەوراژ، ئامێرێکی ڕەزمی هیندی گەورەیە، لە خێزانی تەپڵە، شێوەیەکی بەرمیلی هەیە و دوو سەری بە پێست داپۆشراوە کە دەستەڕاست دەنگێکی ناسک***Treble***دەدات و لای دەستە چەپ دەنگی گڕ***Bass*.

Palco(I), Stage(E), Stade(F) **تەختی شانۆ.**

Paleography(E) **پێیلیۆگرافیی، نووسینزانیی، زانستی نووسین، شێوازێکی زۆر دێرینی نووسینە کە بە نەخش و نیگار گوزارەی پێدەکرا.**

Palindrome(E) **پالیدرۆم، ڕستەیەک یاخود پارچە مۆزیکێک کە لە هەردوو لاوە بخوێنرێتەوە. وشەلێکدراوێکی یۆنانییەوە لە پالین***Palin***ی هاتووە کە بە مانای پشت:گەڕانەوە***Back*** دێت، دوا وشەیەش درۆمۆس***Dromos***واتە ڕێگە***Way***دێت. کۆی وشەکە خوێندنەوەی پێچەوانە دەبەخشێت.**

Palmeros(S) **چەپلەلێدانی پیاوانی سەماکەر لە سەمای فلامێنکۆ***Flamenco***دا کاتی مۆزیکژەنین.**

Palm mute(E) ***P.M.*** **دانانی لەپی دەست لەسەر ژێیەکانی ئامێری گیتار بۆ کپاندنی دەنگی.**

Pan(E) **پان، گۆڕینی دەنگ لەنێوان ئەمپەڕی چەپ و ئەوپەڕی ڕاست لە ستیریۆدا.**

Panpipe, Pandean pipe(E) **پانە نەی، ئامێرێکی زۆر دێرینە، پێکهاتووە لە چەند لوولکێکی بەستراو بەیەکەوە بەشێوەیەکی پان، جیاواز لە دەنگەوار و درێژییاندا.**

Pandora, Pandua, Pandurina(I) **پاندۆرا، بڕوانە/***Bandora*. **ئامێرێکی ژێداری زۆر کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی/یە، بە ئامێری عوود دەچێت بەڵام بە قەوارەیەکی بچووکترە.**

Pandore(S) **پاندۆرە، بڕوانە/***Tambura*.

Panflöte(G), Panflute, Panpipe, Syrinx(E), Siringa(I) **پانفلووت، ئامێرێکی زۆر دێرینە، مێژووی دەگەڕێتەوە بەرلە** 3500**ساڵ پ.ز لە ژیاری میزۆپۆتامیا، ئەم شێوەی کە دۆزاوەتەوە و لە مۆزەخانەی بەریتانیا/لەندەن دانراوە پێکهاتووە لە سیانزە بۆ پانزە زەل***Pipe*.

لە سەرەتای سـەتەی نۆزدەمدا، پانفلووت گۆڕانکاری هونەری و تەکنیکی بەسەردا هات و بووە ئامێرێکی لەبار و سەرەکی لە زۆر ئاوازی میللی و ئۆرکێستراڵیدا.

Panharmonikon(G) پانهارمۆنیکۆن، جۆرە ئامێرێکە بە ئامێری ئۆرکێستریۆن*Orchestrion* دەچێت جۆرە ئامێرێکە بە ئامێری ئۆرکێستریۆن*Orchestrion*دەچێت.

Pantomine(E) پانتۆماین، ڕیشـەوشـەیەکی یۆنانیـیە بەمانای لاساییکردنەوەی هەمووشـتێک*Imitation of everything* دێت، لاسـاییکردنەوە و نواندنی بێدەنگ.

Pantonal, Atonal(E) پانتۆناڵ، هاومانا*Synonymous*ی ئەتۆناڵ*Atonal*دەبێتەوە کە چەشـــنە مۆزیکێکە لە ڕێســـاکانی تۆناڵ*Tonal*دەردەچێت.

Parallel Chords(E) تەریبە کۆرد. ڕیزە کۆردێکی یەکلەدوایەکە کە تیایدا نۆتەکان لە گۆڕاندان بەڵام میانەکان نەگۆڕن، بۆ نموونە مێجـەر کۆردی/C-E-Gتەریبە بە کۆردی/F-A-C کە لە گەڕانەوەدا تەریبە بە کۆردی/G-B-D.

Parallell intervals(E) میانە تەریبەکان، جووڵەی دوو بەش یاخود زیاتری هەمان میانە میانە لە یەک ئاڕاستەدا.

Parallell keys(E) کلیلە تەریبەکان، دوو کلیل کە یەکێکیان مێجەر بێت و ئەویتریان ماینەر هەمان پایەتۆن*Tonic*یشیان هەبێت. بۆ نموونە فا ـ مێجەر/*F-major* و فا ـ ماینەر/*F-minor*.

Parallell motion(E) جووڵەی تەریب، دوو بەش لە هەمان میانەی هەمان ئاڕاسـتەدا بجووڵێت کە لە هەمان کاتـدا جووڵەیان تەریبی یەکتربن.

Pareados(Gr), two-line stanzas(E) دوو دێڕ لە هۆنراوە.

Parfait(F), Perfect(E) تەواو.

Parlando, Parlante(I), As speaking(E) پەڕلە، پارلاندۆ، ڕیسیتاتیڤ، گۆیندە، قسەکردنە زیاتر وەک لەوەی سـترانبێژی بێت.

Parlato(I), Spoken(E) قسەکردن، زاراوەیەکە ئاماژە بە جۆرە دیالۆگێک دەدات لە ئۆپێرادا.

Parnasse instrument, Glass harmonica(E) ئامێری شـــووشـە هارمۆنیکا.

Paroles(F), Lyrics, The words to a song(E) سـترانیی، وشەی داڕێژراو بۆ سـتران.

Part, Partie(F) پارچە، یەک دەنگ لە کارێکی فرەـ دەنگیدا.

Partheyen, Partien(G), Partita(I) هاوماناوشەی پارتیتا*Partita*یە.

Partial tone(E) پارتاڵە تۆن، پارچەیی، تۆنی بەکەرتبوو، تۆنی کەرتیو، زنجیرە هارمۆنیەکە لە تۆنەکان کە نۆتە ژێرەوەکانیان پێیاندەوترێت یەکەم پارتاڵ و ئەوانیتر بە نۆتە سـەرووەکان یاخود سـەرتۆنەکان*Overtone*. نۆتەیەکی دروسـتکراو لە فریکوێنســیە بنەڕەتیەکان پێکەوە لەگەڵ هارمۆنیەکانی، وەک یەکەم و دووەم و....وەهەروەها. بنەڕەتی یەکەم پارتاڵە*First partial* و یەکەم هارمۆنیش دووەم پارتاڵ*Second partial* و....وەهەروەها.

Partita(G,I), Suite(E,F) پارتیتا، سویت/ێکی ئیتالیاییه که سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ نزیک ساڵانی 1700زی هەگبەی باڕۆک، بریتیە لە هەوایەکی فرەڕەنگینی سەتەی/18م. سویتSuiteێکی سەتەکانی17م و 18م. فرەجووڵەیەکی پێکهاتوو لە سەما و بێ سەما، یاخود هەر بە تەنیا جووڵەی بێ سەما لە سەتەکانی 18م و 19مدا.

Partitino(I) پارتیتینۆ، نۆتەنووسێک بۆ چەند گروپێکی هاوجنس{هاوکۆکHomogeneous}لە ئامێرە مۆزیکیەکان.

Partition(F), Partitur(G), Partitura(I),Musical score(E) دەقی مۆزیکایی، تیانووسێکی مۆزیکاڵی کە ژەنینی تەواوی ئامێرە مۆزیکیەکانی تێدابێت.

Partito(I), Divided(E) دابەشکراو.

Partitura ristretta(I), Short score(E) کورتەدەق، کورتە نۆتەنووسراو.

Part song(E) بەشی ستران کە بۆ دوو دەنگ یاخود زیاتر نووسرابێت و چەند ئامێرێکی مۆزیکاییش تیایدا هاویار بێت.

Pas(F), Not, Not any, Step(E) نە، هیچیتر نا، هەنگاو.

Pas de deux(F), A dance for two performers(E) سەمای ئامادەکرا بۆ دوو کەس.

Pas d’action(F), A ballet with a dramatic style(E) باللێت بەچەشنێکی درامیی.

Pas glissé(F), A single gliding step(E) تاکە هەنگاوی خلیسک، تاکە خلیسکە هەنگاو.

Pas trop lent(F), Not too slow(E) نە زۆر خاو.

Passage(E), Passaggio(I) پاساو، ڕاگوزار، بزاوتێک لە پێگەیەکەوە بۆ پێگەیەکیتر.

Passing chord(E), Accord de passage(F) کۆردی پاساو.

Passing note(E), Note de passage(F), Note durchgang(G) نۆتەی پاساو، نۆتەیەکە کە بەشێک نیە لە هارمۆنیە گشتیەکە بەڵام هەر وەک هارمۆنی جێگەی دەگۆڕێت و بە هارمۆنیەکی نوێ خۆی دەگەیێنێتە نۆتەیەکی تری هاوساز{کۆنسونانت}.

Passing tone(E) تۆنی پاساو، بڕوانە/Non-harmonic notes، ئەو نۆتە نائاکسنتانەیە کە بە تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک لەنێوان دوو کۆردChordدا دەجووڵێت {بە جووڵەیەکی هارمۆنیانە دانانرێت}.




Passive resolution(E) پاساو ڕەوێن، بەردەوامبوون یاخود ڕەپاتبوونەوەی نۆتەیەکی چالاکActive note، بۆ نموونە کۆردی حەوتەم لەسەر هەمان دەنگیدا لە کۆردی بەدوای خۆی.

Passion(E), Passione(I) یادکردنەوەی هەست بە ئەشکەنجەدانی مەسیح، سروودێکی کڵێسەییە کە ئەشکەنجەکانی حەزرەتی مەسیحی تێدا نمایانکراوە، ئەم چەشنە ئاوازە بووە خولیای زۆر لە ئاهەنگسازانی سەتەی دەیەم تاکو هەژدەم.

Passion music(E) ئەشـکەنجاواز، ئاوازی ئەشـکەنجە.
چەشنە مۆزیکێکە گوزارە لە خۆڕاگرتنی حەزرەتی مەسـیح دەکات لەژێر ئەشکەنجەدا.
Pasticcio(I), Pastiche(F), Medley(E) پاستیچیۆ، لە ڕیشەپەیڤی پیێ*Pie*ی ئیتالیاییەوە هاتووە بەمانای پێکەڵ دێت، کارێکی ئۆپێرالّی تێهەڵکێشە کە لە چەند دیمەنێک پێکهاتووە، هەر دیمەنەیش لەلایەن مۆزیکارێکەوە ئامادەکراوە، ئەم چەشـنە کارە بەتایبەتی لە سـەتەی هەژدەمدا زۆر باوبووە.
Pastoral(E), Pastorale(I) پاستۆڕاڵ، گوندەکی، شـوانی، هاومانای وشەی مادریگالّە*Madrigal*، هەر چەشـنە شـتێک گوزارە لە ژیانباری گەلان بکات، زاراوەیەکـی ڕابوردووە بۆ قۆناخێکـی ڕابواردن*Stage entertainment*کە لە گوزارە بابەتێـکی ژینـگوندەکیەکی سـاکار یاخود پالّەوان داسـتانێک بکات بەبێ ئەوەی هیچ دەنگێک لە ئامێرە مۆزیکییەکان هاویاری بێت.
Pastourelle(F), Pastorela(I) پاسـتۆرێللا، ئاوازی گوندنشینان کە لە وشەکانیدا فرۆزەی سـروشـت و دیمەنی ژیانی گوند بکات.
Pastoso(I), Soft, Mellow(E) نەرم، نەرمونیان.
Pas trop lent(F), Not too much(E) نەوەک زۆر.
Patch, Voice(E) پاچ، واچ، واچە، دەنگی سـروشتی.
Patent voice flute(E) بڕوانە/*Voice flute, patent*.
Pateticamente(I), Pathetically(E), Pathétiquement(F) کاریگەرییەکی بەسـۆز و بەزەیی.
Patetico(I), Pathetic(E), Pathétique(F), Pathetisch(G) سـۆز و بەزەیی هاتنەوە.
Pathos(Gr), Feeling(E) هەسـت، ڕیشەپەیڤێکی یۆنانیـیە گوزارە لە بارودۆخەکانی هەسـتونەسـت دەربڕینی کەسێک دەکات لە ئۆپێرایەکدا، بڕوانە/*Ethos*.
Patimento(I), Suffering(E) تووشـبوون بە خەم و پەژارەوە.
Patsch(E) پاش، سـووکە پیاکێشـان بە ڕاندا بە مەبەسـتی ڕاگرتنی کێشـی مۆزیک.
Patter-song(E) سـترانی توندوخێرا، کارێکی پۆلیفۆنی/یە کە تێیدا دەنگێک یاخود زیاتر بەشـێوەیەکی سـیلاب زۆر بەخێرای بسـترانرێت.
Pauke(G), Kettledrum, Timpani(E) پاوکە، تیمپانیی، ئامێرێکی ڕەزمیـیە،
Pausa(I), Pause(F,G), Rest(E) پاوس، وچان، پەیڤێکی لاتینییە بە مانای پشـوو دێت کە لە نۆتاندنی مازۆر*Measure*دا لە سـکێڵی مۆزیکدا دادەنرێت بەگوێرەی ئەو کاتەی لە ئاوازێکدا وەردەگیرێت.
Pausa di biscroma(I), Demisemiquaver rest(E) وچانی سیودوویەکی1/32 وچانی تەواو.

Pausa de breve(I), Breve rest(double whole rest) دەبڵ وچانی تەواو.


Pausa di centoventottavo(I), Semihemidemisemiquaver rest(E) وچانی سـەدوبیستوهەشتەک، 1/128ی وچانی تەواو.


Pausa di croma(I), Quaver rest(E) وچانی هەشتەک، 1/8ی وچانی تەواو.

Pausa di minima(I), Minim rest, Half rest(E) وچانی نیوە1/2ی وچانی تەواو*Whole rest*.

Pausa di semibiscroma(I) Hemidemisemiquaver rest(I) وچانی شەستوچوارەک، 1/64ی وچانی تەواو.

Pausa di semibreve(I), Pause(F), Semibreve rest, Whole rest(E) وچانی تەواو.

Pausa di semicroma(I), Semiquaver rest(E) وچانی شانزەک، 1/16ی وچانی تەواو.

Pausa di semiminima(I), Crotchet or Quarter rest(E) وچانی چارەک، 1/4ی وچانی تەواو.

یاخود

Pausa multipla(I),Pause multiple(F), Multibar rest(E) فرەباڕی وچان.

Pause, Fermata sign(E) پاوس، هێمای خاوکردنەوە بەرەبەرە.

Peal(E), Tinter(F) گێلگێلەزەنگ، کۆمەڵە زەنگێکی قەوارە جیاواز، لە دوو زەنگەوە تاکو حەوت زەنگ یاخود زیاتر کە هەر یەکە بە دەنگێکی جیاواز لەویتر کۆککراوە.

Pedal(E), Pédale(F) پایدەر، پێداڵ، نیشانەی بەکارهێنانی پێداڵە لە ئامێرێکی وەک پیانۆ کە *Ped.*کورتکراوەیەتی.پێداڵ{پایدەر}ە، کردارێکی تەکنیکیە کە بە پێ ئەنجامدەدرێت، مەبەستیش لە بەکارهێنانی دەکەوێتەسەر جۆری ئامێرەکە. بۆ نموونە:ـ

1. لە ئامێری شـــووشـــە هارمۆنیکا*Glass harmonica*دا بۆ سـووڕاندنەوەی ئەو تەوەرەی کە شـــووشـــەکەی بەردەکەوێت.
2. لە ئامێری هارمۆنیۆم*Harmonium*دا بۆ هەوا هەڵمژین و فووپیاکردن بە زمانەکاندا بەهۆی ئەو مووشـــەدەمەی کە لە بنی ئامێرەکەدا کۆکـکراوە.
3. لە ئامێری هارپ*Harp*دا بۆ پەیداکردنی نیوەتۆنەکان*Semitones*.
4. لە ئامێری پیانۆ*Piano*دا بۆ کزکردنی دەنگەکان ئەویش بە سـووک پیاکێشـانی چەکوشـەکان بەسەر ژێیەکاندا. لە ئامێرەکانی ئۆرگن و هارپسـیکۆرد و کلاڤیکۆرد/دا هەمان فەرمان بەجێدەهێنێت.
5. لە ئامێری سـاج*Timpani*دا بۆ پیاکێشـانی سـاجەکان بەسـەر یەکدا بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و هەنداز کە دەنگەکە لەنێوان سـاجەکاندا پەنگ بخواتەوە و دەنگێکی تایبەت بەخۆی لێوەدەربچێت.
6. لە ئامێری ڤایبرافۆن*Vibraphone*دا بۆ کپاندنی بارەکان کە ئازادانە نەزرنگێنەوە.

Pedal- C(E) پایدەر/C دوو ئۆکتاڤ خوارتر لە تۆنی/Cی ناوەڕاست.

Pedal claves(G), Pedal keys, Pedals(E) پایدەرەکان، پێداڵەکان، کلیلەکانی پێداڵ.

Pedal on(E) Ped. هێمای پێداگرتنی بەردەوام*Sustain* لەسەر پایدەری پیانۆ

Pedal note, Pedal point, Pedal tonne(E) نۆتەی پایدەر ، نزمترین نۆتەیە لەسەر ئامێرێک.



Pédale douce(F), Soft pedal(E) نەرمەپایدەر.

Pellet bells(E) زرنگەی زەنگۆلان،

بریتیە لە چەند زەنگۆڵەیەکی خڕی کانزایی کە بە پیاکێشانیاندا زرنگەیان لێوەدێت.

Pentachord(E) کۆردی پێنج نۆتە، ئامێری پێنج ژێ/یی.

Pentagramma(I), Staff(E) پێنج گراما، ستاف، هێلاسۆ.

Pentatonic scale(E), Scala pentatonica(I) سکێڵی پێنجتۆنیک، سکێڵێکە کە تۆننمای نیە.

میانەکانیشی بەم شێوەیە:ـ




لە پێنجتۆنە سکێڵی مێجەر*Pentatonic major scale*دا نۆتەی چوارەم و حەوتەم ئاستن دەکرێن.



لە پێنجتۆنە سکێڵی ماینەر*Pentatonic minor scale*دا نۆتەی دووەم و پێنجەم ئاستن دەکرێن.



لە پێنجتۆنە سکێڵی ماینەر مێجەر/6 دا *Pent. minor major scale/6* نۆتەی دووەم و حەوتەم ئاستن دەکرێن.



پێنجتۆنە سکێڵی ماینەر/7 ی پانۆک*Pent. Minor/7 flat* 5/*Flat* .



پێنجتۆنە سکێڵی مێجەر تیژی/9 و پانۆک/7 *Pent. major sharp/9 fat/7*، سکێڵەکە پێکهاتووە لە دوو سیانیی*triad* کە بریتین لە:ـ

1. پێنجتۆنە سکێڵی دۆ ـ مێجەر/*C-major* و می بیمۆل ـ مێجەر/*E<sup>b</sup>-major*.



2. پێنجتۆنە سکێڵی مێجەر پانۆک/*Major flat* .



3. **پێنجتۆنە سکێڵی تۆنی تەواو***Whole pentatonic scale* **کە لە مۆزیکی جاز***Jazz music***دا باوە.**



**لە دیدەی مۆزیکزانی***Musicology***یەوە......سـکێڵی پێنحـتۆنی بە گشتی بە دوو جۆر دەپۆلێنرێت:ـ**

1.**ســکێڵــی نیوەپێنجــتۆنی***Hemitonic pentatonic Scale*:**ـ ئەو ســکێڵەیە کە یەک نیوەتۆن***Semitone***یاخود زیاتری تێدایە.**

2. **ســکێڵی نانیوەپێنجــتۆنی***Anhemitonic pentatonic Scale*:**ـ ئەو سکێڵەیە کە هیچ نیوەتۆنێکی تێدا نیە.**

Percossa(I), Percussion(E) **ئامێرە ڕەزمیەکان. بەو ئامێرانەی وەک تەپڵ، زایلەفۆن...هتد دەوترێن کە بە پیاکێشان دەنگیان لێوە دەردەچێت.**

Percussion instrument(E), Stromenti da percossa(I) **ئامێرە پێرکیوژنەکان.**

Perdendo(I), Gradually becoming slower(E) **بەرەبەرە هێواشـکردنەوە.**

Perfect(E), Perfetto(I), Perfectus(L) **تەواو، دروسـت، پڕ، میانەکانی یەکدەنگی***Unison***، لەکاتێکدا کە ئۆکتاڤ و چوارەم و پێنجەم بەتەواوی لەسەر تۆنی خۆیان دەبن بەبێ زێدە***Augemented* **و گەسـتوو***Diminished*.

Perfect cadence(E) **تەواوە کادەنس، بڕوانە/***Canedce*.

Perfect interval(E) **میانەی دروست، پڕ میانە، میانەکانی ئۆکتاڤێک، پێنجەم و چوارەمێک.**

Perfect pitch(E) **پڕ پەردە، پەردەی دروسـت، بڕوانە/***Absolute pitch*.

Perfect prime(E) **سەرەکی تەواو، هاومانا وشەی تاکدەنگە***Unison*.

Perfect time(E) **کێشی پڕ،بە کێشی سـیانیی**3/4 **سـەردەمانی سـەتەکانی ناوەڕاسـت دەوترا.**

Perfect unison(E) **یەکدەنگی تەواو، هاومانای وشـەی یەکدەنگ***Unison*.



Perpetual canon, Infinite canon(E) **کانونی بێـپایان، کانونی سـووڕاو.**

Pes(L), Foot(E), Patte(F) **پێ، بڕوانە/***Neuma*.

Pesamment(F), Pesantemente(I) Heavily(E) **بە سـەگینی.**

Pesant(F), Pesante(I), Heavy(E) **گران، ڕەزین و سـەنگین.**

Pesasntissime(I), Very heavy(E) **زۆر بە سـەنگینی.**

Pesendide(Ar,Kr,Tr) **پەسەندیدە، لقێکە لە دەســگای نەوئەســەر، سـکێڵی پێکهاتووە لە گرێ نەوئەسـەر لەسەر پلەتۆنی ڕاست ڕەگەزێکی لاوەکیش کە پێکهاتووە لە ڕاسـت لەسـەر پلەتۆنی نەوا.**




Petit, Petite(F), Small, Little(E) **گچک.**

Petits Clarinette(F) گچكە كلارِنێت.

Petit flute, Piccolo(F) پیككۆلۆ، گچكە فلووت.

Petits note(F), Cue note(E) گچكەنۆتە،

Petto(I), Chest(E) ســینە كە مەبەسـت ڕۆڵی ســنگە بۆ سـەر دەنگی دەرچوو لە دەمەوە، هەروەكی دەوترێت دەنگی سینە*Voce di petto(F), Chest voice(E)*.

Peu, Petit(F), little(E), Piccolo, Minuscolo(I) كەم، بچەك.

Peu à peu(F), Little by little, Gradually(E) كەم كەم، بەرەبەرە.

Pezzi concertanti(I), Concerted pieces(E) پاژە هەندازەكان، پاژە بە كۆمەڵەكان.

Pezzo(I), Piece(E), Pièce(F), Stück(G) پاژ، پارچە، جۆر.

***pft.*یاخود*Pf.*** كورتكراوەی/*Pianoforte*.

***P.f*** كورتكراوەی/*Piû forte*زۆر بەهێز یاخود*Poco forte*كەمێك بەهێز.

Pfeife(G), Pipe(E,F) بۆری، لوولە.

Pfeifenfuß(G), Foot, Pitch of organ pipes(E) پێ، پەردە لوولەكانی ئۆرگن.

Pfeifenorgel(G), Pipe organ(E) لوولەی ئۆرگن.

Pfiffig(G), Artful(E) هونەرمەندی بلیمەت.

Phantasie, Phantasy(G), Fancy, Fantasia, Imagination(E) فانتاسیی، ئەندێشە، هزر.

Phantasiebilder(G), Pictures of imagination(E) وێنە فانتاســـیەكان.

Phantasiestücke(G), Phantasy pieces(E) پاژە فانتاســیەكان. سـەرناوە بۆ ژمارەیەک لە دانەرە ڕۆمانتیكەكانی وەک ڤاگنەر، شـومان*Schumann*.

Phasing(E) وەک زاراوەیەک بە مانای لێدان*Beating*دێت، بیستنی نزمترین فریكوێنسی تۆنی جیاواز، كاتێک كە دوو لوولە لە هەمان پەردە*Pitch*دا پێكەوەبن و زۆر بەكەمی لە تۆن بەدەربن.

Phone(E) فۆن، پێوانەی دەنگ كە یەكسانە بە 1,000Hzبەگوێرەی پێوانەی دێسیبێل*Decibel*.

Phone(Gr), Sound, Tone, Voice(E) دەنگ، تۆن.

Phonic, Acoustic(E), Phonique(F) دەنگی، ســروشـتەدەنگ.

Phonomêtre(F), Phonometer(E) دەنگپێو، ئامێرێک بۆ پێوانی دەنگ.

Phorminx(E) ئامێرێكی ژێدارە كەمێک بە ئامێری گیتار و لیرا دەبێت، دەنگێكی ناسكی هەیە.

Phrase(E), Phrasé(F) گوزارە، ڕسـتەی مۆزیک، ڕسـتەبەندیی.




Phraser(F), To phrase(E) دەیڕســتێنێت.

Phrasing(E), Phrasierung(G) ڕسـتاندن.

Phrasierungsbogen, Schleifbogen (G), Slur(E) — پەیوەستەکەوان.

Phrygian cadence, Phrygian half close(E) — فریجیەن کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Phrygian mode(E) — دەسگای فریجیەن. بڕوانە/*mode*. یەکێکە لە دەسگا یۆنانییەکان.

S-T-T-T-S-T-T

لە داستانەیۆنانیەکاندا لەسەر زوانی گیانلەبەران دەیگێڕێتەوە دەسگاکە لەلایەن مارسیاس فریجیەن*Phrygian, Marsyas*ناونراوە.

پێکهاتووە لە بەرزبوونەوەی میانەیەکی یەکلەدوایەک*Interval sequence*.

Phrygian tetrachord(E) — فریجیەن تێتراکۆرد، ڕیزە بەرزبوونەوەیەکی چوارنۆتە.

Phrygian(E,F), Phrygisch(G) — فریجیەن.

Phthongos(Gr), Note(E) — نۆتە.

Piacere, Piacimento(I), Pleasure(E) — دڵخواز، خۆشی.

Piacevole(I), Agreeable(E) — پەسەندید. پەسەندبوو.

Pianamente(I), Softly(E) — بە نەرمی.

Pianette, A low upright piano(E) — پیانۆی نزم.

Piangendo(I), Crying, Weeping(E) — دڵتەنگەگریان، **Piang.**کورتکراوەیەتی.

Piange disperatamente(I), Crying hopelessly(E) — گریانی نائومێدی.

Piangevole(I), Mournful(E) — چەمەر، تەواو دڵشکاو و ڕەشپۆش.

Piangevolmente(I), Mournfully(E) — بە چەمەری و ڕەشپۆشی.

Pianino, Small piano(E) — گچکە پیانۆ.

Pianissimo(I), Sehr leise(G), Very soft(E) Très doux(F) — زۆر بە نەرمی، ***pianiss.*** یاخود***PP.*** کورتەیەتی.

Pianississimo(I), Very very soft(E) — لە نەرمیەوە بۆ زۆر زۆر نەرم، ***PPP.***کورتەیەتی.

Pianissississimo(I), Extremely soft(E) — لە نەرمیەوە بۆ یەجگار نەرم،***PPPP.***کورتەیەتی.

Pianisssississimo(I), Very extremely(E) — لە نەرمیەوە بۆ یەجگار زۆر نەرم.***ppppp***

Pianist(E), Pianista(I) — پیانۆژەن.

Piano(E,I,F), Soft tone(E)Planum(L) — پیانۆ، ئامێرێکی مۆزیکە، بە تۆنێکی نەرم.



پیانۆ یاخود پیانۆفۆرتی*Pianoforte*، نزیک ســالانی1726ز لەلایەن تەکنیکاری لۆرەنسایی بەناوی بارتۆلۆمیۆ کریستۆفۆری(1655-1730)*Bartolomeo Cristofori*ی ئیتالیایی/یەوە بەناوی *Piano et forte*وە داهێنرا کە بەمانای ناسک و دەنگ*Soft and loud*دێت.

پیانۆی هاوچەرخ لە نزیکەی پێنج هەزار پارچە پێکهاتووە کە نزیکەی سێ هەزاروهەشتا پارچەی بە چەسپاوی لێبەستراوە. پیانۆی ســەردەمانی زوو لە دار دورســتدەکرا بەڵام پیانۆی هاوچەرخ کانزاکردەیە و بەشێوەیەکی وەستاو بە کێشی**18ton**بە دووسەدوسیی ژێی پۆلاسازکردە، گەورەپیانۆی کۆنســێرت کە کێــشی دەگاتە**30ton** و ژێیەکانی لە پۆلا یاخود کانزای مس دروستکراوە کە تێکڕای گرژیی*Tension*دەگاتە*160pounds/string*. پیانۆی ســپینێت *Spinet piano(E), Spinett(G), Spinett(I), Épinette(F)*کە جۆرێکە لە گچکەهارپسیکۆرد. بەدوایدا تاکو ئێستا نزیکەی دوانزە قەوارەی لێدروستکراوە، لەوانەیش: گەورەپیانۆی کۆنسێرت*Concert piano Grand*، گەورەی نیوە کۆنسێرت*Half concert grand*، پیانۆی هۆڵی پێشــواز*Parlour Grand*، گەورە پیانۆی پیشـەیی*Professional grand piano*واتە تایبەت بە ژەنیارێک کە بۆ خۆی کاری لەسەربکات، گەورەپیانۆی ژووری میوان*Drawing room grand* کە لە ژووری میوان دابنرێت، وەهەروەها.....

Piano à claviers renversés(F) — جووت گەورە پیانۆ بە دوو ڕیز کیبۆردی لەسـەریەک.

Piano à queue(F), Grand piano(E) — گەورە پیانۆ.

Piano duet(E) — ژەنینی پیانۆ بە چوار دەست{واتە بە دوو ژەنیار}.

Piano électrique(F), Electric piano(E) — پیانۆی کارەبایی.

Piano pedals(E) — پیانۆ پیداڵەکان، پیانۆی ئاسایی سێ جۆر پێداڵ هەیە:ـ

1. ڕاسـتە پێداڵ بۆ کپاندنی دەنگ کە پێیشیدەوترێت پێداڵی کپاندن*Damper pedal*.
2. چەپە پێداڵ بۆ ژەنینــی دەنگ بەشـێوازێکی نەرم*Soft*، پێیشــیدەوترێت پێداڵــی ســەر ژێیەکان*Una corda(F), On string(E)*.
3. ناوەڕاسـتە پێداڵ*Middle pedal*، درێژە بە دەنگ دەدات و دەزرنگێنێتەوە، پێیشیدەوترێت پێداڵی دەنگ کشان و درێژەپێدان*Sostenuto pedal*.

Piano quartet(E) — پیانۆی چواریی کە پێکهاتووە لە هاویاری سـێ ئامێری ژێدار:کەمانچە*Violin*، ڤیۆلا*Viola*، چێللۆ*Cello*.

Piano score(E) — پارتیتۆرێک کە بۆ ئۆرکێسترا نووسرابـێت بە هاویاری ئامێری پیانۆ.

Pianto(I), Plaint(E) — پیانتۆ، ســۆز.

Piatti(I), Cymbals(E) — ســیمباڵ، ســاج.

Picado(I) — پیکادۆ، هاومانای پزیکاتۆ*Pizzicato*یە بەڵام بۆ ئامێری گیتار لە ژەنینی مۆزیکی فلامانکۆ کە بە پەنجەی شـایەتمان*Index finger* و پەنجەی ناوەڕاسـت *middle finger*لەسەر ژێ/یەکانی ئامێرەکە بەشـێوازی پەنجەژەنین بەئەنجامدەدرێت.

Picardy third(E), Tierce de Picardie(F) پیکاردی ســێیەم، جاروبار لە بنیادە کادەنس*Authentic cadence*دا تۆنی ســـێیەم*Tonic third*لە کلیلی ماینەردا لە تەریبە مێجەرەکەیەوە*Parallel major*وەردەگیرێت، یاخود بڵێین زاراوەیەکە بۆ بەرزکردنەوەی تۆنی سێیەم و کردنی لە کۆردی ماینەرەوە بۆ مێجەر سێیەم لە دوایین کۆردی دانراوەیەکدا کە بەزۆری لە کادەنسە کۆتاییەکاندا دەردەکەوێت. ئەم جۆرە لە ناوەڕاستی سەتەی هەژدەم{لە هەگبەی باڕۆک}دا زۆر ڕەواجی هەبوو.



Picchettato, Spiccato(I) پیچێتاتۆ، جۆرێکە لە تەکنیکی ســتاکاتۆ کە بە پنت*Dot* و پەیوەستەکەوان بە کەوان*bow*بەسەر ژێیەکاندا چ لە ســەرەوە و چ لە ژێرەوەی نۆتەکان نیشانەدەکرێت.

Piccola, Piccolo(I), Pikkolo(G), Little(E) پیککۆلۆ. گچکە، بچووک.

Piccolo flute, Octave flute(E) گچکە فلووت، لە خێزانی فلووتە، بە بەرزترین پەردە*Pitch*ی هەوایی دادەنرێت لە ئۆرکێسترادا، مەودای دەنگی یەک ئۆکتاڤ سەرووترە لە کۆنسێرت فلووت.

Piccolo Heckelphone(E) گچکە هێکلفۆن، مۆزیئامێرێکی هەواییە کە مەودای دەنگی یەک ئۆکتاڤ لە هۆڕنی ئینگلیزی بەرزترە.

Piccolo trumpet, Small trumpet(E) گچکە ترومپێت. مۆزیئامێرێکی هەواییە کە مەودای دەنگی یەک ئۆکتاڤ لە ترومپێتــی ئاسایی بەرزترە.

Pick(E), Piquer(F), Cògliere(I) پیــک، پارچە پەڕێکی پلاستیکییە کە ئامێرە ژێدارەکانی. وەک گیتار و مانەندیانی پێـلێدەدرێت

Pied(F), Foot(E), Piede(I) پێ، زاراوەیەکە بۆ فرۆزاندنی پەردە*Pitch*ی لوولەکانی ئۆرگن.

Pien(I), Plien(F), Full(E) پڕ.

Pietà(I), Pity(E), Plaindre(F) بەزەیی.

Pietoso(I), Piteous(E) بە بەزەییانە.

Pietosamente(I), Piteously(E) بەچەشنێکی دڵسـۆز و بەزەییانە.

Piffero(I) پیفێرۆ، ئامێرێکی هەوایی جووتزەلە، تاڕادەیەک بە ئامێری ئۆبوا دەچێت. ئەو ئامێرە هەواییانە کە پیشی بۆ دەخورێتەوە، وەک زوڕنا و بالاَبان.

Pifferaro(I), Wind player(E) پیفێرۆژەن، باژەن.

Pikieren(G), To play spiccato(E) ژەنین بەچەشنێکی سـپیکاتۆ.

Pincé(F), Pinched(E), Pizzicato(I) پزیکاتۆ، پەنجەژەنین. باس فلووت. کە پەردە*Pitch*لە تۆنی سـۆڵ/G ی ژێر تۆنی دۆ/Cی ناوەڕاســت.

Pipeau(F), Reed pipe(E) لوولکی زمانەدار، وەک زوڕنا.

Pipiolu(I), Whistle(E) فیکەنەی ئیتالیایی.

Piqué(F), Staccato, Spiccato(I), Sharply detached(E) ستاکاتۆ، پچڕژەنین.

Piston(E) پیستۆن، بریتیە لە دەمەوانەیەک کە لە ئامێرە براس هەواییەکاندا بەکاردەهێنرێت.

Pitch(E) پەردە، ڕادەی تۆنێکی دروست کە فریکوێنسییەکی تایبەت بەخۆی هەبێت، بۆ نموونە ئەوپەڕی فریکوێنسی پەردەی دو/C ی ناوەڕاست یەکسانە بە261.60Hz.

Pitch Class(E) پەردە پۆل، پەردە کلاس، ڕێگەیەکی گشتییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەردانەی کە پەیوەندییەکی ئۆکتاڤییان هەیە، بۆ نموونە $C_2, C_4, C_7$ پیاندەوترێت پەردە پۆلی دۆ/C.

Pitch-distance, Interval(E) پەردە میانە، لە زانستی دەنگدا پێیدەوترێت میانە*Interval*، واتە میانەی نێوان تۆنەکان.

Piû(I), Plus(F), More(E) زیاتر.

Piû allegro(I), Quicker(E) خێراتر.

Piû Lontano(I), Further away(E) دوورە پەرێزتر.

Piû mosso(I), More movement(E) بزێوتر.

Piva(I), Bagpipe(E) ئامێری مەشکەنای.

Pivot chord(E) تەوەرە کۆرد، کۆردی پیڤۆت، کۆردێک بکەوێتە نیوان دوو کلیلەوە.




Pizzicato(I), Pizzikato(G), Plucked(E) پزیکاتۆ، پەنجەژەنین، ژەنینێکی تەکنیکیە زیاتر لە ئامێرە ژێدارەکاندا بەکاردەهێنرێت کە بەسەری پەنجە ژێیەکان لێدەدرێن.پزیکاتۆی خێرا*Snap pizzicato* بە هێمای ئاماژەی پێدەدرێت.

Placabile(I), Peaceful(E) هێوری و ئاسوودە.

Placita(I), Pleasure(E) بەخۆشی و ئاسوودەیی.

پلاگاڵ، لە ڕیشەوشەی پلاگیۆس*Plagios*ی یۆنانیـیەوە هەڵێنجراوە و پاشان خراوەتە ســەر زوانی لاتینی ســەتەکانی ناوەڕاست و بۆتە پلاگاڵیس*Plagalis*، لەدواییدا بە زاراوەی پلاگاڵ گیرساوەتەوە کە بە مانای لاوێز یاخود لابەلا : لاوەکی دێت، ئەویش لەبەرئەوەی کە دەبێتە لێرشتەی چاووگێک کە پێیدەوترێت بنیاد*Authentic*. Plagal(E)

پلاگاڵ بەستە، پلاگاڵ کادەنس، Plagal cadence, Church cadence, Amen cadence(E)
کادەنسێکی زۆر باو بووە لە ســاڵەکانی سەتەی هەژدەمدا. پێیشیدەوترێت کادەنــسی ئامین *Amen cadence*چونکە لە کۆتایی سـرووده ئایینیەکاندا بەکاردەهێنرێت. کادەنسـێکە کە تیایدا کۆردی کۆتـا*Final chord* لەســەر لازاڵ{ژێرزاڵ*Subdominant*}دا{واتە کۆردێک لەســەر پلەتۆنی چوارەم}دەگیرسێتەوە، ئەو کاتەیش کاریگەرێتی کۆردی زاڵ*Dominant*یاخود کۆردی زاڵ حەوتەم*Dominant 7th chord* لە تەواوە کادەنس*Perfect cadence*لاوازتر دەبێت، هۆکیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەکاردەهێنانی بەدوای ئەودایە. بڕوانە/*Cadence*.

دەسگای پلاگاڵ، دەسگای لاوێز، مەبەست لە میلۆدییەکە کە Plagal mode(E)
نۆتەکانی لە تەنیشت کۆتاییدا بە زاڵ*dominant*دەسـپێکات و بەرەو ئۆکتاڤەکەی کۆتایی بێت.

بەگشتی.... دەسگا*Mode*بە دوو جۆر هاتووە، یەکەمیان بنیادە دەسگا*Authentic mode* و ئەویتریان لاوێزە دەسـگا*Plagal mode*. ئەم دوو زاراویە فرۆزەی شــوێنی ئەو نۆتە تایبەتیانە دەکات کە سـکێلێک پێکدەهێنن پێیدەوترێت کۆتایی*Finalis*یاخود*Final*. ئەگەر کۆتایی لە نزمترین نۆتە بێت لە سـکێڵەکەدا، ئەو دەسـگایە پێیدەوترێت بنیاد*Authentic*. کاتێکیش کۆتایی لە چوارەم نۆتەی ســکێڵەکەدا بێت پێیدەوترێت لاوێز*Plagal*یاخود بە پێشـــگری هایپۆ*Hypo*ی{هایپۆ وشەیەکی یۆنانییە بە مانای ژێر*Under*دێت}ئەو دەســگا بنیادە ناوببرێت.

ئەمەیش خشتەیەکە لە ڕوونکردنەوەی سـکێڵەکانی هەر دوو دەسگاکە:ـ

یەکەم: گەڕانەوەی بۆ ســەتەی نۆیەم ناسـراو بە دەسـگا گریگۆریەکان:ـ

1.دۆریەنی بنیاد*(Dorian (authentic* یاخود *protus authenticus*کە دەسگایەکی ماینەرە*Minor mode*.

**D** E F G **A** B C D
T S T T T S T

2. هایپۆدۆریەنی پلاگاڵ*(Hypodorian (plagal*یاخود *Protus plagalis*.

**A** B C D **E** F G A

3.فریجیەنی بنیاد*(Phrygian(authentic*یاخود *Deuterus authenticus*کە دەسگایەکی ماینەرە.

**E** F G A **B** C D
S-T-T-T-S-T-T

4.هایپۆفریجیەنی پلاگاڵ*(Hypophrygian(plagal*یاخود*Deuterus plagalis*.

**B** C D E **F** G A B

5.لیدیەنی بنیاد*(Lydian(authentic*یاخود*Tritus authenticus*.

**F** G A B **C** D E F
T T T S T T S

6.هایپۆلیدیەنی پلاگاڵ*(Hypolydian(plagal*یاخود*Tritus plagalis*.

**C** D E F **G** A B C

7.میکسۆلیدیەنی بنیاد*(Mixolydian(authentic*یاخود*Tetrardus authenticus*.

**G** A B C **D** E F G
T T S T T S T

8.هایپۆمیکسۆلیدیەنی پلاگاڵ*(Hypomixolydian(plagal*یاخود*Tetrardus plagalis*.

**D** E F G A B C D

**دووەم: گەڕانەوەی بۆ سـەتەی شـانزەم و وەبەرهێنانی لەلایەن گلارینۆس**(1488-1563)*Glareanus*ی سـویسـرایی:ـ

1. **ئایۆلیەنی بنیاد***(Aeolian(authentic* **کە دەسگایەکی ماینەرە***Minor mode*.

**A** B C D E F G A
T S T T S T T

2. **هایپۆئایۆلیەنی پلاگاڵ***(Hypoaeolian(plagal*.

E F G **A** B C D E

3. **ئایۆنیەنی بنیاد***(Ionian(authentic*.

**C** D E F G A B C
T T S T T T S

4. **هایپۆئایۆنیەنی پلاگاڵ***(Hypoionian (plagal*.

G A B **C** D E F G

5. **لۆکریەنی بنیاد***(Locrian(authentic*، **دەسگایەکی ماینەرە***Minor mode*.

**پێشـــیدەوترێت هایپەرئایۆلیەن***Hyperaeolian*{**هایپەر وشەیەکی یۆنانییە بەمانای سـەروو***over***دێت**}.

**B** C D E F G A B
S T T S T T T

6. **هایپۆلۆکریەنی پلاگاڵ***(Hypolocrian(plagal*.

F G A **B** C D E F

Plainte(F), Lament(E) **لاوانەوە ئیتر چ بە سـتران بێت یاخود بە ژەنینی ئامێر کە ئەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی هەڤدەم و هەژدەم.**

Plectron(G), Plectré(F), Plectrum(E,L) **پێلێدە، پیاکێش، بریتیە لە پەڕێک یاخود پارچۆکەیەک ژێ/یەکانی وەک ئامێری گیتار و سـازی.... پێلێدەدرێت.**

Pluck(E) **پلەک، لێدانی ژێ/یەکان چ بە پەنجە و چ بە پەڕێکی{وەک پەڕی باڵندەی تاووس} بچووک کە پێیدەوترێت***Pick***بە مەبەستی لەرینەوەیان تاکو ئەو دەنگـی لێوەبێت.**

Plus animé(F), Faster(E) **پەلەتر.**

Plus lente(F), Slower(E) **هێواشـتر.**

Plus vite(F), Quicker(E) **بژێوتر.**

Pneuma(Gr), Breath(E), Etere(F) **هەناسە.**

Pocchissimo(I), Very little(E) **زۆر کەم.**

Pochette(I), Small violin-like, kid(E) گچکە کەمانچە، کەمانچلە.

Poco(I), Little(E) کەم، پچەک.

Poco allegro(I), Somewhat quicker(E) پچەک گورجتر.

Poco a poco(I), Little by little(E) کەمکەم، بەرەو کەمبوون.

Poco a poco con sordino(I) بەرەوکەمبوون بە پێکپە، بەشی ئامێرە ژێدارەکان لە ئۆرکێسترادا بەدوایەکدا پێکپە*Mute*دەخەنەسـەر دەنگیان لەکاتێکدا ئامێرەکانیتر بەردەوامن لەسـەر ژەنینیان.

Poco forte(I), Somewhat loud(E) تاڕادەیەک دەنگبەرز.

Poco meno allegro(I), Somewhat less quick(E) تاڕادەیەک کەم گورج.

Poco più lento(I), Somewhat slower(E) تاڕادەیەک هێواشتر.

Poggiato(I), Leant upon(E) پۆجیاتۆ، لاربوونەوە بەسەر.

Poi(I), Then, Afterwards(E) پاشـان، لەدواییدا.

Poi a poi(I), By degrees(E) پلەپلە.

Poids(F), Weight(E) کێش.

Point(F),Punta(I), Punkt(G), Dot(E) پنت، دۆت.

Point de repos(F), Pause€, Riposarsi(I) پاوس، وچان.

Point final(F), The concluding pause(E) پنتی کۆتا، بە پاوس کۆتایی هاتن.

Polifonia(I), Polyfonie(F,G), Polyphony(E), Polymnia(Gr) پۆلیفۆنیی، پۆلەدەنگیی، کۆنوێژرێکی کلێسـەییە کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی ناوەڕاست، بریتیە لە ئاوێزاندنی چەند میلۆدییەک کە پێکەوە فراهەمبکرێت.

Polka پۆلکا، سـەمایەکی بەڕەچەڵەک چیکی/یە*Czechs* لەسـەر کێشی2/4 بە 46ـ50لێدان*beat* لە خولەکێکداو بە ڕەزمی دا_دا_دوم. دا_دا_دوم{da-da-dum da-da-dum}. ئەم سەمایە لەسەرەتای سـاڵەکانی1880ز لە هەرێمی بۆهیمیا*Bohemia*{وڵاتی چیک/ی ئێستا}سەریهەڵداوە و بە جووتێ سـەماکارێکی بەرابەر یاخود بە تەنیشت بەئەنجامدەدرێت.

Polychord(E), Polyaccord(F), Polyakkord(G) پۆلەکۆرد، فرەکۆرد. ئاوێزاندنی دوو کۆردیسـادە، یاخود زیاتر سـیانیی*Triad*ەکان نموونەیەکن لەم جۆرە.

| Ima7 | IImi7 | IIImi7 | IVma7 | V7 | VImi7 | VIImi7(b5) |
|---|---|---|---|---|---|---|
| maj. triad +maj.7 | min.triad +maj.7 | min.triad +maj.7 | maj. triad +maj.7 | maj. triad +maj.7 | min.triad +maj.7 | Dim.triad +min.7 |

Polychord-C over-D(E) پۆلە کۆردی دۆ/C سـەروو ڕێ/D.
بریتیە لە/ D, F#, A, C, E, G کە بە کۆردی C/D دەناسرێت.

Polyharmony(E) پۆلەهارمۆنی، دوو دانراوەی هارمۆنی یاخود زیاتر کە بەرابەر یەکتر بژەنرێن، تەکنیکێکی مۆزیکدانەرانی سـەتەی بیستـەمە.

Polyrhythm(E) پۆلەڕەزم، مۆزیکێک کە لە یەک کاتدا چەند ڕەزمێکی جیاوازی تێدا بەکاربـێت.

Polytonal, Polytonality(E) پۆلەتۆناڵ، مۆزیکێک کە چەند کلیلێکی تێدا بەکاربهێنرێت.

Pommer(G) پوممەر، بلوێرەسورنا، کەمێک بە ئامێری ئۆبوا دەچێت.

Pompeuse(F), Pomposo(I), Arrogant€ سەرکێش و ڕۆحــزل.

Pomposamente(I), In a grandiose style(E) بە ڕۆحــزلی.

Ponderoso(I), Massively(E) بە سـەنگینی.

Pont(F), Bridge(E), Ponte(I) پرد، خەرەک، دامە

Ponticello,Cavalletto(I), Chevalet(F), Steg(G), Bridge(E) خەرەک، پل، پرد، دامە

ئەو پارچەتەختەیەی وەک پردێک تەلی ئامێرەژێدارەکانی بەســەردا ڕادەبوورێت بۆ گەیاندنی دەنگەکان بە کودەکی{سـنووق}ئامێرەکە و دەنگدانەوە تیایدا.

Porrectus(L) بڕوانە/*Neumatic notation*.

Portamento(I), Glide, Very legato(E) پۆرتامێنتۆ، زۆر بە خلیسکبەندیی

Portando, Portamento(I), Sliding from one note to the next(E) پۆرتاندۆ، بە پەیوەستەیەکی خلیسکانی لە نۆتەیەکەوە بۆ هیتر.

Portatif(F), Portativ(G), Portative organ(E) پۆرتاتیف، گچکە ئۆرگنی گەڕۆکی سـێ ئۆکتاڤ کە لە سالانی سەتەی پانزەم زۆر ڕەاجی هەبووە.

Portable keyboard(E), Tragbares klavier(G) کیبۆردی هەڵگرتوو.

Portamento(I), Carrying very legato(E) زۆر مانەوە بەبێ وەسـتان.

Portando(I), Tragend(G), Sliding from one note to next(E) بڕوانە/*Portamento*، خلیسکان لە نۆتەیەکەوە بۆ نۆتەی ئایندە.

Portato, Portare la voce(I), Carrying the voice(E) مانەوە لەسـەر دەنگەکە.

شێـوەژەنینێکی ئارتیکیولییە*Articulation*لەنێوان ستاکاتۆ و لێگاتۆ.

Porté, Portée(F), Stave, Staff(E) هێڵەتەواوەکانی هێلاسـۆ{سـتاڤ}ی مۆزیک.

Portée du bas(F), Lower staff(E) هێلاسۆی نزمتر، باسی خوارەوە.

Portée du haut(F), Highter staff(E) هێلاسـۆی بەرزتر.

Posato(I), Sedate(E) ڕەزین، ئاسـوودە.

Posaune(G), Trombone(E) ئامێری ترۆمبۆن.

Posément(F), Sedately(E) بە ڕەزین و ئاسـوودەیی.

Position(E), Posizione(I) جێ، پۆزیشن، پۆز،

لە ئامێرە ژێدارەکاندا...مەبەست لە دانانی دەسـتەچەپە لە شـوێنەتۆنـێکی دیاریکراودا. لە ژەنینی ئامێری ترۆمبۆن*Trombone*دا ئەو جێی خلیسکاندنەیە کە تێیدا نۆتە تایبەتەکانی لێوە دەردەچێت. لە هارمۆنیدا مەبەســت لە ڕێکبەندی نۆتەکانی کۆردە، بۆ نموونە ئەگەر جێی پایەتۆن*Tonic*لە باس*Bass*دا بێت ئەوا جێی کۆردەکە لە ڕەگ*Root position*دا دەبێت.

Position markers(E) نیشانەجێیەکان، ئەو پنتە بچووکانەیە لەسەر دەسکی ئامێری گیتاردا یارمەتی ژەنیار دەدات بۆ وەسـتان لەسەری.

Positiv(G), Positive(E), Positif(F) پۆزەتیف،

زاراوەیەکە کە بەگشتی بەکاردێت بۆ گچکە ئۆرگنی هۆڵ*Small chamber organ*.

Posthorn(E) پۆستـهۆڕن، ئامێرێکی هەوایی قولاپدار و تۆن خزاندنی هەیە،

نزیکەی ساڵی1820ز بەو ناوەوە لە ئاڵمانیا وەدەرکەوت.

Posthumous(E) چاپکراوەی دانەران*Composers* لەپاش مردنیان.

Postlude(E), Postludium(G,L) بەشی کۆتایی یاخود پاشینی پارچە مۆزیکێک.

Pot-pourri(I) کارێکی مۆزیک کە لە چەند ئاوازێکی میللی پێکهاتبێت.

Pouce(F), Thumb(E) پەنجەگەورەی دەست.

Pour(F), For(E) لەبەر، لەپێناو

Poussé(F), Up-bow(E) کەوان بەرەو سەرەوە کە دەشێت بوترێت کەوان بەرەو چەپ.

Power chord(E) هێزی کۆرد، بڕوانە/*Fifth chord*.

Praeambulum(L), Préambule(F), Introduction(E) پێشەکی.

Praeludium(L), Prelude(E), Präludium(G), Préamble(F), Preludio(I) پێشەنگ.

ژەنینی یاخود چڕینی پارچەیەک لە بەراییدا پێش چەندپارچەیەک.

Praecentor(L), Precentor(E) پریسێنتۆر، ڕێبەر، پێشکەشکار.

ڕێخەری گروپی کۆرس و خوانندان لە کڵێسەدا.

Prall, Pralltriller, Schneller(G), Half trill, Inverted mordent پڕاڵ، پڕاڵتریللە،

Passing shake(E)

لە ڕیشەوشەی پڕاللن*Prallen*ی ئەڵەمانی/یەوە هاتووە کە بە مانای مۆردێنت*Mordent*ی بەرەو سەرەوە و هەڵگەڕاوەی دێت، پێشیدەوترێت

به نووسین به ژەنین

نیوـ تریللە*Half trill* کە جووڵە تەکنیکێکی خێراگۆڕینە

لە تۆنی سەرەکی*Principal tone*لەگەڵ یاوەرە تۆن*Auxiliary tone* ێکی لەسەرەوەی خۆی.

Precipitosamente(I), Impetuously(E) بە هەڵپەیی، بەشێوەیەکی هەڵەداوان، بە پەلەیی.

Precipitato(I), Precipitate(E) پەلەدەکات.

Precipitoso(I), Impetuous(E) پەلە.

Preciso, Precisione(I), Rhythmically precise(E) بە ڕەزمیەکی ورد.

Pregando(I), Praying(E) نوێژکردن.

Preghiera(I), Prayer(E) نوێژکار.

Premier, Première(F), Prima, primo(I), First(E) یەکەم، دەسپێکی پارچەمۆزیکێک.

Première fois(F), Prima volta(I), First time(E) یەکەمجار.

Premuorsamente(I), Anxiously(E) بە شپرزەیی.

Premuroso(I), Thoughtful(E) قووڵ بیرکردنەوە.

Près(F), Near((E) نزیک

Presa, Guida(I), Direct(E) پرێسـا، بڕوانە/*Guida*.§

هێمایەکە بۆ پیشـاندانی هاتنە ناوەوەی بەشـەکانیـتری کانون*Canon* پێیشـیدەوترێت ڕێنما*Guida*.

Presque(F), Almost(E) بەزۆری.

Pressando, Pressant(F), Pressieren(G), Accelerando(I), Pressing(E) پەلەخوازی.

Pressus(L) بڕوانە/*Neuma*.

Prestation(F), Performance(E) فراهمکردن.

Prestissimamente(I), Very quickly(E) زۆر بەگورجی.

Prestissimo(I), Quickest movement(E) گورجترین جوولان، تا بتوانرێت بەگورجی.

Très vite(F)

Presto(I), Quick, Quicker than Allegro(E) گورجی، لە ئاللێگرۆ*Allegro*خێراتر.

Primary chords(E) کۆردە سـەرەتاییەکان،

کۆردەگرنگەکانە لە کلیلێکدا کە پێکهاتوون لە:ـ I , IV , V.

Primary triads(E) سـیانییەسـەرەتاییەکان، پێکاتوون لە دوو جۆر:ـ

1. سـیانییە سەرەتاییەکان*Primary triads*کە لەسەر پایەتۆن*Tonic*، ژێرزاڵ*Subdominant* و زاڵ*Dominant*دامەزراون.
2. سـیانییە دواتاییەکان*Secondary triads*کە لەسەر پلەکانی تری سکێڵەکە دامەزراون.

Prima vista(I), First sight(E) یەکەم ڕوو{دیمەن}.

Prime(E) سـەرەک، یەکەم نۆتە لە سـکێڵێکدا.

Primo amoroso(I) کەسێکی نێرینە کە سـەرکاری کۆمەڵەی ئۆپێرا بێت.

Primo uomo(I), Leading man, Principal male singer(E) سـترانبێژی یەکەم.

Principal(E) پرینسـیپاڵ، بنچینە، بنەڕەت، ڕێبەری بەشێک لە ئۆرکێسترایەک، بۆ نموونە:ـ

کەمانچەژەنی سـەرەکی لە گروپی کەمانچەدا پێیدەوترێت پرینسـیپاڵ. یەکێکە لە لوولە*Pipe*کانی ئامێری ئۆرگن*Organ*، بۆ نموونە ئەو لوولەیەی کە بۆ دەنگی فلووت سـازکراوە باریکە لە درێژیدا و تیژ و ڕوونە لە دەنگیدا. زۆر جۆری تری هەن بەڵام دووانیان زۆر سەرەکین، یەکێکیان پایدەر*Pedal* بە درێژە لوولە داخراوی هەشت پێ*8ft*، ئەویتریان دەستی*Manual* بە درێژە لوولەی چوارپێ*4ft*. هەمان جۆری ئۆرگنی لوولە داخراوەکان لە ئینگلتەرە پێیاندەوترێت دیاپازۆنەکان*Diapasons*.

Principal part or voice(E), Hauptstimme(G) H⌐ بنەڕەتە بەش یاخود دەنگ.

Priority(E) پێشـەکی

Probe(G), Prova(I), Repetition(E) ڕەپات، ڕەپاتبوونەوەی نمایشێک یاخود پارچەمۆزیکێک.

Proemio(I), Preface, Prelude(E) بەرایی، پێشـەکی.

Prognos(Gr), Forecast(E) بەرزان، پێشزانیی، پێشبینـیی.

Programme music, Deskriptive music(E) مۆزیکی پڕۆگرام، مۆزیکی فرۆزەیی،

مۆزیکێک کە فرۆزەی بابەتێکی تێڕامان یاخود سـۆزێکی کاریگەر بکات.

Progression(E), Fortschreitung(G) پێشبەریی، بریتیە لە زنجیرە تۆنێکی بەرەو پێشـەوەچوون کە لە دوو جۆر پێکهاتووە:ـ

1. میلۆدی پێشبەریی*Melodic progression*، جوولاندنە لە نۆتە*Note*یەکەوە بۆ نۆتەیەکی بالاتر.
2. هارمۆنی پێشــبەریی*Harmonic progression*، جوولاندنە لە کۆرد*Chord*ێکەوە بۆ کۆردێک بالاتر.

Progressive tonality(E) تۆنالیتی پێشــبەر، زنجیرەیەک لە جوولە بەدوایەکچوونی پارچە مۆزیکێک لە کلیلێکە بۆ یەکێکیتر.

Progressivo(I), Progressive(E) پێشـبەر، زنجیرەیەک لە بەرەو پێشـەوە ڕۆیشتن.

Progressivamente(I), Progressively(E) بەشێوەیەکی پێشـبەریی.

Prolatio(L), Prolation(E) درێژاندن، پرۆلاتیۆ، بڕوانە/*Mensur* .

Prolatio major پرۆلاتیۆ مێجەر، سێ بەشبوونی نیوەبریڤەکان*Semibreve* بۆ مینیمەکان*Minim*.

Prolatio minor(E) پرۆلاتیۆ ماینەر، دووبەشبوونی نیوەبریڤەکان*Semibreve* بۆ مینیمەکان*Minim*.

Prolog(G), Prologue(E) سـەرەتایەک یاخود پێشـەکیـیەک بۆ کردنەوەی کارێکی دراما.

Promptement(F), Promptemente(I), Quickly(E) بە گورجی.

Prompter(E), Rammentatore, Suggeritore(I) یادخەرەوە، ئەو کەسەی لە پەنایەکی تایبەت لەسـەر شـانۆ یادی ئەکتەرەکان دەخاتەوە.

Pronto(I), Ready(E) ئامادە.

Proposta(I) پرۆپۆستا، بابەتێکی فیوگە*Fugue*یە، پێشگەری*Antecedent*لە کانون*Canon*.

Proportio(L) پەیوەندی میانەکان*Intervals*.

Proportion(E) ڕێژە*Ratio*، پەیوەندێتی نۆتەیەک لە نۆتەیەکی ترەوەڕا، پەیوەندی بەها کاتیەکان*Time values*لە تیۆرە ڕەزمیەکانی مۆزیکی پێوراوەدا*Mensurable music*.

Proslambanomenos(Gr) نزمترین نۆتە لە مۆزیک سکێلی یۆنانی لە سـەردەمانی زوودا.

Psalm(E), Psaume(F) یەشت، نزاواز{ئاوازی نزا}، بەو سـەدوپەنجا سـرووده دەوترێت کە لە تیانووسی پسالمەکان*Book of psalms*دا هاتووە و دەگەڕێتەوە بۆ حەزرەتی داوودی پێغەمبەر.

Psalmodie(G), Psalmody(E) پسالمۆدیی، زانین و ڕێخستنی دەنگەکان لە پسـالمەکاندا.

Psalterion(Gr), Psaltérion(F), Psalterium(L) پسالتێریۆم، ناوی ئامێری هارپە*Harp*لە سەردەمی بیزەنتیەکاندا، بەئامێری تریگۆنۆن*Trigonon*دەچێت.

Psaltery, Psalterium, Psalter (E), Saltere, Sauterie(F), Salterio(I) پسالتەری، سەنتوور، ئامێرێکی ژێدارە کە بە پلێکترۆم*Plectrum*لێدەدرێت.

Pseudo-score(E) فێلەـ سـکۆر، نۆتەی نووسـراو بێ لە دەنگە هاوکۆکە سـتوونەکان.

Pulgar(E) پولگەر، جۆرێکە لە تەکنیکژەنین لە ئامێری گیتاردا بە بەکارهێنانی پەنجەگەورە، ئەم شـێواز ژنینە زیاتر لە مۆزیکی فلامانکۆدا باوە.

Puls(G), Pulse, Pulsation(F), Beat(E), Picchiare(I) ترپە، لێدان.

Pulsatile instruments, Percussion instruments(E) ئامێرە پێرکیوژنەکان،

ئەو ئامێرانە دەگرێتەوە کە بە چەند جۆری جیاواز پیادەکێشرێت.

Pult(G), Pupitre(F), Desk(E) سەکۆ، ئۆرکێستراپەک کە بۆ دوو ژەنیار کرابێت.

Punctum(L) پونکتۆم، بڕوانە/*Neuma*.

Punctus(L), Dot, Point(E) پونکتۆس، وەک زاراوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ سەتەکانی ناوەڕاست بەمانای نۆتە لە کۆنتراپونت*Counterpoint*دا، بەمانای دۆت*Dot*یاخود پنت{خاڵ}یش دێت{بڕوانە*Dot*}.

Punta d'arco(I), Tip of the bow(E) لێواری کەوان.

Puntare(I), To dot a note(E) دۆت کردنی نۆتەیەک، دۆتاندنی نۆتەیەک.

واتە دانانی پنتێک لەسەر یاخود لەتەک نۆتەیەک.

Puntato(I), Dotted noted(E) دۆتـژەنین، واتە ژەنینی نۆتەکان بە شـێوەی ستاکاتۆ.

Punto coronato, punto d´organo(I) هێمای فێرماتۆ/بڕوانە*Fermata*.

Punto di valore(I), Augmentation dot(E) زێدە خاڵ، دۆتی زێدە.

Pure minor scale(E) سکێڵی ماینەری سروشت.

Pure music(E) پوختە مۆزیک، بڕوانە/*Absolute music*.

Putti(I), Choir boys(E) کۆرسی کوڕان.

Pyrrhic(E) بڕگەپێوانەی لە دوو کورتە سیلاب*Syllable*پێکهاتوو.

Pythagoras(E) فیساگۆرس، یەکێکە لە فەیلەسوفە مەزنەکانی یۆنان و تاکو ئێستایش، بە پیری تیۆری مۆزیک دادەنرێت، بە شیکردنەوەی لەرینەوەی ژێیەکان لە چەند درێژییەکی جیاجیادا توانی ئەو پەیوەندیەی نێوان پێوانەی ژمێرەیی و دەنگی مۆزیک بدۆزێتەوە. وەک لێی دەگێڕنەوە، توانی پەیوەندی ماتماتیکانەی بێدەنگەمۆزیک*Musical consonance*بدۆزێتەوە لە کێشی ئەو چەکوشەی ئاسنگەر بەکاریدەهێنێت. فیساگۆرس بۆیدەرکەوت کە ئەگەر بێتو میانەی ئۆکتاڤێک بەڕێژەی2:1بێت، ئەوا پێنجەمی*Fifth*بەڕێژەی 3:2 دەبێت و چوارەمی*Fourth*بە ڕێژەی 4:3، هەموو تۆنەکە بەڕێژەی9:8 دەبێت. ڕێژەی ئەم میانانە ڕێخۆشکەرێکبوو بۆ دیاریکردنی درێژی ژێی/یەکان لەسەر ئامێرەکانی وەک قانوون*Canon*یاخود مۆنۆکۆرد و.... .

Pythagoras comma(E) فیساگۆرسە کۆما، جیاوازییەکە لەنێوان دوانزە تۆنی پێنجەمەتەواو*Perfect fifth*ەکان و حەوتەمە ئۆکتاڤە*Seven octave*ەکاندا. کۆمایەکی فیساگۆریی{3^12/2^19=531441/524288}یەکسـانە بە23,46Cents.

Pythagorean minor third(E) فیساگۆریی ماینەر سـێیەم، جیاوازییەک لەنێوان سـێ تەواوی چوارەم و ئۆکتاڤێک بەڕێژەی2:1 ، ئەم شێوەیەی یەکسـانە بە 294cents کە 22centsپانترە لە ماینەر سـێیەمی سروشت{پوختە}*Pure minor third*.

فیساگۆریی مێجەر سێیەم، میانەکانی یەکسانە بە408cents کە Pythagorean major third(E)
بە بڕی 22cents لە سێیەم پوختە*Pure third*گەورەترە{6:5}، جیاوازیش لەنێوان فیساگۆریی مێجەر سێیەم و پوختە سێیەم*Pure third* پێیدەوترێت سینتۆنیک کۆما*Syntonic comma*.

سکێلی فیساگۆریی، مۆزیکزانی هۆڵەندی ئارنۆوت ڤان زووڵلێ Pythagorean scale(E)
(1400-1466)*Arnout Van Zwolle*گۆڕانکارییەکی پەسەندی لە سکێلی فیساگۆرییدا کرد ئەویش بە دانانی کۆما*Comma* لەنێوان تۆنی سی/B و تۆنی فا دیێز/$F^{\#}$. کە بووە ڕێخۆشکەرێک بۆ پێکهێنانی سێیەم چوار*Third four*:ـ ڕێ ـ فادێز/$D\text{-}F^{\#}$، لاـ دۆ دێز/$A\text{-}C^{\#}$ ، می ـ سۆڵ دێز/$E\text{-}G^{\#}$ و سی ـ می بیمۆڵ/B-Eb کە زۆر بەکاردێت. لەسەر ئەم سکێلە...پوختە مێجەرێک لە سیانییەکان لەسەر ڕێ/D، لا/A و می/E دەدات. بەڵام چوار پوختە مێجەری سیانیی تر کە پێکدێن لە:ـ سی ـ ڕێ دێز/$B\text{-}D^{\#}$، فا دێز ـ لا دێز/$F^{\#}\text{-}A^{\#}$، ڕێ بیمۆڵ ـ فا/Db-F، لا بیمۆڵ ـ دۆ/Ab-C ئەوەندە بەکارنایەت هەر ئەم سکێڵە سادەیە، یانزە پوختەی پێنجەم بەدەوری بازنەکەدا پێکدەهێنێت و کۆمای فیساگۆری/یش دەهێڵێتەوە لەنێوان سۆڵ دێز و می بیمۆڵ لەگەڵ چوار پوختە مێجەری سیانییدا.

زنجیرە فیساگۆرییەکان، Pythagorean series, Phythagorian tuning(E),
Pythagoreische Stimmung(G)
یاخود پێنجەمی تەواو*Fifth perfect*کە یەکێکە لە سێ میانەکان{ئۆکتاڤ، پێنجەم، چوارەم}، نۆتەبەندییەکی پێشبەری/یە لە شێوەی سکێلێکی کرۆماتیکدا، وەک لەم ڕوونکردنەوەیەدا:

*C G D A E B F# C# G# D# A# F C*

تێمپێرامێنتی فیساگۆریی. Pythagorean temperament(E)




دەشێت مۆزیک سکێلێکی پێنجتۆنی*Pentatonic musical scale* لە تەنیا ئۆکتاڤێک و پێنجەم و چوارەمدا سێ میانە بە ڕێژەی8/9 و دوو میانەی گەورەتر پێکبهێنرێت. ئەگەر بچەک لەو دوو میانە گەورەترە{ڕێ ـ فا/D-F و لا ـ دۆ/A-C}بقرتێنرێت ئەوا دوو میانە بە ڕێژەی9/8{تۆنی تەواو} و دوو میانەی بچووکی نیوەتۆن لە سی ـ دۆ/B-C و می ـ فا/E-F دێنەکایەوە.

## Pythagorean intervals(E) میانە فیسـاگۆرییەکان.

بریتیە لەو میانانەی کە لەم خشـتەیەی خوارەوەدا ڕوونکراوەنەوە:ـ

| میانە Interval | ڕێژە Ratio | لێرشـتە Derivation | پێوانەی بە سەنت Cents |
|---|---|---|---|
| unison | 1:1 | unison 1:1 | 0.00 |
| minor second | 256:243 | octave - major 7th | 90.22 |
| major second | 9:8 | $(3:2)^2$ / 2 | 203.91 |
| minor third | 32:27 | octave - major 6th | 294.13 |
| major third | 81:64 | $(3:2)^4$ / 4 | 407.82 |
| fourth | 4:3 | octave - 5th | 498.04 |
| augmented fourth | 729:512 | $(3:2)^6$ /8 | 611.73 |
| fifth | 3:2 | $(3:2)^1$ | 701.96 |
| minor sixth | 128:81 | octave - major 3rd | 792.18 |
| major sixth | 27:16 | $(3:2)^3$ / 2 | 905.87 |
| minor seventh | 16:9 | octave - major 2nd | 996.09 |
| major seventh | 243:128 | $(3:2)^5$ / 4 | 1109.78 |
| octave | 2:1 | octave 2:1 | 1200.00 |

------------------------------------

----------------------

------------

# Q




لەم ڕۆژگارەدا... تەنیا مۆزیکی نەخۆش بازاڕی هەیە.

نیتشە

---

**ئامێری قانوون، بڕوانە**/*Kanun*. Qanun, Kanoon(Ar,Fa,Kr,Tr)



**قارچغار، قارجغار یاخود بەیاتی شـوور** Qarçığar, Qarcığar(Ar,Az,Kr), Beyati shur(Kr)

**شـــوور بەمانای وەجد(وەژد:وەشت)دێت واتە جۆشـوخرۆشـێکی پەیدابوو لەگەڵ خۆدی خۆدا.**

**قارجغار....وشەیەی لێکدراوە و پێکهاتووە لە قار واتە جەڕەی ئاو، ئەو جەڕەیەی کە لە سەرە ڕێــی بۆ هەژاران و ڕێبواران دادەنرێت تاکو تینوێتییان بشکێنن و دڵودەروونیانەوە فێنک ببێتەوە، جغار/یش واتە خەموخەفەت. چەمکی وشەکە فرۆزەی ڕازی کەسێک دەکات کە چۆن خەڵکانی هەژار و ڕێبوار بە جەڕەیک ئاو فێنکایی دێتەوە بە گیانیاندا، بەڵام ئەمی هەژاری ڕێبوار لەبری ئاو جەڕەیەکی پڕ لە ئاخوداخ و خەموخەفەت دەنۆشینێت.**

**لێرشتەیەکی سەر بە دەســگای بەیاتە، سـکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی نەوا. لەبەرئەوە دەشێت دابنرێت بە خۆشنەوایەکی پەیوەست لە نێوان دەســگای بەیات و حیجازدا.**




**بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت ئەوێ    بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت ئەوێ**

**ئەســیری، بەدەنگی: عەلی مەردان**

**قەرەباغڵی، لە وشەی قەرەباغ/ەوە هاتووە و کەوتۆتە نێوان وڵاتی ئارمینیا و** Qerebağĺi(Az,Kr)
**ئازەربایجان، لەم ناوچەیەدا ڕێژەیەک لە کوردی تێدا نیشتەجێیە.**
**قەرەباغڵی...لێرشتەیەکی سەر بە دەسگای کوردە و کەمێکیش خۆی دەدات لە سەبا زەمزەم.**




**قەتار، گاتار. وشەیەکی هەرە دێرینی ئاڤێستایی/کوردییە،** Qetar(Kr)
**چەند بۆچوون و لێکدانەوە هەیە بۆ ڕەچەڵەکی وشەکە بەڵام لە هەموویان زارشت***Logic***تر و زۆر نزیکتر بە سیما هونەرییەکەی گەڕانەوەیەتی بۆ گاتا***Gata***کە سرۆتێکی سروودئامێزە. گوزارەیەکە لە ڕازونیاز و هۆگرییەکی ڕۆحی کە بە بەزمێکی بڕگەیی هیجایی لاوژەی هۆرامی کۆن و بە بەزمی سیاوجامانە و مانەندی وتراوە.**
**بوونی ئەم بەزمە هۆزانەیش لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر دێرین، هەر لەم تێڕوانینەوە زۆر لەبارە کە وشەی گاتا و قەتار چ وەک وشە و ڕواڵەت چ وەک ناوەڕۆک نزیکایەتییان لەگەڵ یەکتر هەبێت. لەبەرئەوە پێدەچێت قەتار ئاسەواری ئایینی زاردەشت بووبێت و ئایینزای ئەهلی هەق/یش میراتگری بێت.**
**قەتار یاخود گاتار{پێکهاتووە لە گات+ ار، لەسەر کێشی خواستار، گوفتار}بەو کەسە دەوترێت کە قەتار دەچڕڕێت{واتە گاتاچڕ:گاتاخوێن}هەر وەک ڤیداخوێنی هیندۆسان و قورئانخوێنی مسوڵمانان.**
**ئەم بەڵگەیە بەسە بۆ پووچاندنەوەی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت لە قیطار/ی عارەبیەوە هاتووە{پیتی ق،گ لەو پیتانەن کە لەگەڵ زوانی عارەبیدا ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت چونکە پیتی ق یەکێکە لەو پیتانەی دەخیلن لە زوانی کوردیدا بەڵام هەر گۆی پێدەکرێت}کە هاومانای کاروان/ی کوردی دەبێتەوە، ئەمەیش تاڕادەیەک دوورە و بە زۆر دەگەڕێنرێتەوە بۆ زوانی عارەبی، وێڕای ئەوەیش زۆر ئەستەمە بیسترابێت کە هەوای قەتار لەنێو کاروانچیاندا خوێندرابێت. ئەو کزەسۆزەی کە هەستی پێدەکرێت کزەی سۆفییان و نزاخوازانە. خودی ئەم سۆزە لەڕووی هونەریەوە، هەستی پێدەکرێت کە لە ناخی ڕۆحێکی ئایینیی و ژینباری کۆمەڵایەتییەوە هەڵدەقوڵابێت.**
**هەندێک سەرچاوە ئەم دەسگایەی بردۆتەوە سەر دەسگای ئەسفەهان{بەیاتی ئەسفەهان}.**



**فەسڵی نەو پایز تازە کەردەن مەیل ڕەزان ئەرزان کەرد ڕەشتە ئەو سوەیل**
**مەولەوی، بەدەنگی:علی مەردان**
Qezzaz(Ar,Kr) **قەزاز.**
**فۆرمێکە لە دەسگای بەیات، ئەو فۆرمە زیاتر لە ناوچەی کەرکوک/دا باوە.**

Qoryat(Kr) قۆریات، خۆڕیات. ڕەچەڵەکی وشەکە لە هواتڕە/ی ماد/کوردییەوە هاتووە کە بەمانای شــینەدەشتاییەکی بە پیتوفەڕ دێت. ئەم وشـەیە...هەروەک گەلەک وشـەی کۆنیتر گۆڕانکاری لە پیتگۆڕکێ و پیتسواندنی بەسـەردا هاتووە. بۆ نموونە پیتی هـ بۆتە خ وەک لە هۆر/دا لە هەندێک بەکارهێناندا بۆتە خۆر، پیتی ث/یش لەو پیتەکوردییانەیە کە لەسەر زاردا سواوە مەگەر زۆر بەدەگمەن نەبێت ئەویش لە لاوژەی هۆرامیدا. بەهەرحاڵ...وشــەی هواتڕە پاش ئەو گۆڕانکارییانەی بۆتە خوارە:خۆرە کە هەر هەمان مانای شینەدەشـت دەگرێتەوە. هەر لەسەر ئەم ناوە...هەندێک ناوچەی کوردســتان هەیە بەناوی خۆرەتوو/خانەقین، خۆریە/ی گەورەگەڕەکی شــاری کەرکوک کە لە سـەردەمانێکی دێریندا لێژە دەشتێکی بەپیتوفەڕی بەردەم قەڵای کەرکوک بووە.
بە هاتنی میللەتانی تورکمان و عارەب بۆ نێو خەڵکانی کوردنشینی دیسـان گۆڕانی بەسەردا هاتەوەوە و بووە قۆریە و پاشــان بە قۆریات. ئەم ئاوازە لە ســەردەمانێکی زۆر دێریندا بەری هەناسەی پاڵە و ڕەنجەدرانی ماندووی سـەر بێستان و سەوزەجاڕ و دروێنە و....لەسـەر کێڵگە و لە شــەوچەرەیشیاندا کە کۆڕی دانیشتنیان بە سـەرگوروشـتەی سـەیروسـەمەر و قسـەی نەستەق و یاریوگەمەی فۆلکلۆری گەرم دەبوو، دەنگخۆشـان و مۆزیکژەنان بە هەنکی بەسـۆز و ژەنینی خرۆش ئەوەندەیتر کۆڕیان ڕازاوەدەکرد. لەوانەیە لەنێو ئەو ئاوازانەدا کە زۆر خۆش و تایبەتبووبێت بە ڕەواندنەوەی ماندوبوونی سـەر خۆر/یان ئەم ئاوازە بووبێت کە دەماودەم بە ناوی خۆریات بۆمان ماوەتەوە. دەشێت پرسیارێک قوتبێتەوە و بڵێت بۆچی بە خۆریات یاخود قۆریات هاتووە؟ وەڵامەکەیشی دەشێت ئەوە بێت کە لە زوانی کوردیدا هەندێک وشە هەیە کە لەسەر کێشی جۆرە کۆ/یەکی عارەبی وشە تاکەکە دەبێتە کۆ وەک دێ بۆتە دێهات، سەوزە بۆتە سەوزەوات، باخ کراوەتە باخ و باخات...هتد، ئاوەهایش لەوانەیە بۆ خۆشبوونی لەسەر زار ئەو ڕێیەی پێدرابێت کە بەو شـێووگە گۆی پێـبکرێت. کزەی ئەم هەوایە بەزۆری لە ناوچەی کەرکوک و کفری لە شــەوچەری کورد و تورکوماندا ڕەواجی هەیە. دەشێت هەر لەبەر ئەو بەربڵاوی و ڕەواجەی بێت کە وەک فۆرمێک لە چەند دەسگایەکی وەک حیجاز و ڕاســتدا دەبیسترێت.

Quadrat(G) هێمای تۆنی سروشتی. بڕوانە/*Natural sign*.

Quadrapule(E) چواروپل، پەیڤێکی پێشــگرە کە بە لێکدراوی لەگەڵ پەیڤێکی دوای خۆیدا کە بەگشتی لە چوار ڕوخســاردا ئاماژی پێدەدرێت:

1. چوارپلە کۆنتراپونت*Quadruple counterpoint*، واتە کۆنتراپونت بە چوار میلۆدی کە هەڵگەڕاوەن بە شـێوەیەکی ئاڵوگۆڕانە.
2. چوارپلە فیوگە*Quadruple fugue*، واتە فیوگە*Fugue* بە چوار بابەت.
3. چوارپلە وەسـتاو*Quadruple stop*، واتە کۆردێکی چوار نۆتە لەسەر ژێی ئامێرە کەوانداره‌کان.
4. چوارپلە کات*Quadruple time*، واتە کێشڕاگرتن بە هێمای4/4یاخو ***C***.

Quadriad(E) چوارکۆردیی.



Quadricinium(L) دانراوەیەکی مۆزیک لە چواربەشـدا.

Quadrivium(E) چوارینە، کۆمەڵە هونەرێکی ئاوەزیی*Liberal Arts*سـەتەکانی ناوەڕاسـتە کە بریتین لە حەوت بەش، چواریان وانەگەرییەکی ماتماتیکانەیە پێیدەوترێت چوارینە*Quadrivium*و بریتیە لە ژمێرگەریی*Arithmetic*، سـتێرناسیی*Astronomy*، ئەندازە*Geometry* و مۆزیک. سـێ بەشی دوایین پێیدەوترێت سـێی ڕەوانبێژیی*Rhetorical three* یاخود تریڤیەم*Trivium* کە بریتیە لە ڕێزمان*Grammar*، زارشـتیی*Logic* و ڕەوانبێژیی*Rhetoric*.

Quadruple Contrapoint(E) کۆنتراپونتی چوارتۆنی.

Quadruple fugue(E) پارچە فیوگە*Fugue*یەک بە چوار بابەتی جیاجیا.

Quadruple-croche(F), Sixty-four note(E) چوارپلە کرۆش، نۆتەی1/64.



Quadruplet(E), Quartole(G), Quartolet(F) چوارپلە ، گروپێکی نۆتە چوارتایی.



Quadruplet in time of three(E) چوارپلە لە ڕەزمی سیانیدا.



Quadruplum, The fourth voice(E) چواردەنگ.

Qual(G), Agony(E) ئازار.

Quanto(I), As much(E) وازۆر.

Quarta(L,I), Interval of a perfect fourth(E) چوارتا، کوارتا. میانەی چوارەمی تەواو.

Quartakkord(G), Fourth chord(E) چوارەم کۆرد.

Quartal or quintal chords(E) ئەو کۆردانەی کە لەسـەر میانەی چوارەم و پێنجەم پێکهاتبێت.

Quarta modi, Quarta toni(L,I), The subdominant(E) چوارەم پلەی سـکێڵێک، ژێرزاڵ.

Quart de soupir(F), Semiquaver rest, Sixteenth rest(E) ی1/16 پشووی تەواو.



Quart de pausa(F), Quarter rest, Crotchet rest(E) ی1/4 پشووی تەواو.




Quarta de ton(F), Quarter tone(E) چارەکە تۆن.

Quarte(F,G), Interval of a fourth(E) میانەی چوارەم.

Quarte juste(F), Perfect fourth(E) چوارەمی تەواو.

Quartenparallelen(G), Parallel fourths(E) تەریبەچوارەمەکان.

Quarter note, Crotchet note(E) چارەکەنۆتەی تەواو.

Quartet(E), Quartett(G), Quartetto(I) کوارتێت، کارێکی مۆزیک بۆ چوار بەشی سەربەخۆ.

Quartfagott(G), Large bassoon(E) کوارت فاگوت، کەتە باســوون،
ئامێرێکی باســوون کە بە چوار پەردە*Pitch* لە ستاندەر باســوونی ئۆرکێسترا نزمترە.
Quartflöte(G), Small flute(E) کوارت فلووت،
گچکە فلووت، ئامێری فلووت کە بە چوار پەردە*Pitch* لە ستاندەر فلووتی ئۆرکێسترا بەرزترە.
Quartgeige(G), Small violin(E), Violino piccolo(I) کوارت ڤیۆلین، ڤیۆلینۆ پیککۆلۆ،
ئامێری گچکە کەمانچە کە بە چوار پەردە*Pitch* لە کەمانچەی ئاســایی ئۆرکێسترا بەرزترە.
Quarto(I), Quatrième(F), Fourth(E) چوار.
Quartsextakkord(G), Six-four chord(E) کۆردی شـەش ـ چوار.
Quatre-mains(F), Four hands(E) چوار دەست.
Quatricinium(L), Composition in four parts(E) مۆزیک دانراوەیەکی چوار بەش.
Quattricroma(I), Hemidemisemiquaver, Sixty-fourth note(E) 1/64ی نۆتەی تەواو.
Quattro(F), Four(E) چوار.
Quaver, Eighth note(E) 1/8ی نۆتەی تەواو، بڕوانە/*Croche*.
Quaver rest, Eighth rest(E) 1/8ی وچانی تەواو.

Queue(F), Stam(E) کورتەیە بۆ پیانۆی گەورە*Grand piano(E), Piano à queue(F)*،
Queue de la note(F), Stem of a note(E) ملی نۆتە،
Quieto(I), Quiet, Calm(E) هێمن، لەسـەرخۆ.
Quietissimo(I), Quietest(E) زۆر هێمن.
Quindecima, Quintadecima(I), Double octave(E) دەبڵ ئۆکتاڤ.
Quint(E,I), Quinte(F,G), Fifth interval(E) میانەی پێنجەم، تۆنە ژێی می/*E*ی ئامێری
کەمانجە، پێشگرەپەیڤی ناوی هەندێک ئامێری مۆزیکە و ئاماژەیە بۆ دەنگی پێنجەم چ لە ســـەر چ
لە خوار ئامێری ئاســایی، وەک دەوترێت کوینتفاگوت*Quintfagott*.
Quinta, Quintus(L), Semi(E) هاوتایە بۆ وشەی کوینتۆس*Quintus*کە بە مانای نیمچە دێت.
Quintabschluss(G), Semi-cadence(E) نیمچە کادەنس، بەستن لەسـەر پلەتۆنی زاڵ.
Quinta decima(I,L), Interval of a fifteenth(E) میانەی پانزەیەم.
Quinta falsa(L), Diminished fifth(E) گەستووی پێنجەم.
Quintal chord, Quintal chord(E) کۆردی پێنجەم.
Quintal harmony(E) کوینتاڵ هارمۆنی، هارمۆنی کە لەسەر میانەی پێنجەم بنکەی بەستبێت.
Quinta modi, Quinta toni(I,L), Dominant(E) پێنجەم پلەتۆنی سکێڵێک، پلەتۆنی زاڵ.
Quinte juste(F), Perfect fifth(E) پێنجەمی تەواو.
Quintenzirkel(G) بازنەی پێنجەمەکان/بڕوانە*Circle of fifths*.
Quintparallelen(G), Parallel fifths(E) پێنجەمە تەریبەکان.

Quintole(G), Quintuplet(E) **یەک گروپە نۆتەی پێنجـتایی**







Quintuple time(E) **کێشی پێنج چارەکی**5/4.



-----------------------------------

----------------------

------------

# R



روان/عوودی چینی
Ruan/Chinese lute



ڕەبەک
Rebek





Rebab ڕەباب

# R

مۆزیک... گوزارە لە شتێک دەکات کە ناتوانین بیڵێین،
لەهەمان کاتیشدا ناتوانین لێی بێدەنگ بین!!!!          ڤیکتۆر هوگۆ

---

Ra(F,I), D-Flat(E) **ڕا، دووەم پلەدەنگ نزمی سکێڵی مێجەرە لە پلەدەنگی دۆ/**Do **وە، گوزارە لە ڕێ بیمۆڵ***D-flat***دەکات. وشەی ڕا لە زوانی کوردیدا چەند واتایەک دەگەیەنێت لەوانەیش:ـ ڕێگە، ئاواز، سروود، نەوا ، خوێند، ئاهەنگ، پەردە، بڕوانە/***Rast*.

Rabab, Rubob, Rebeb, Rebec, Rubible(Ar,Kr,Fa,Tr) **ڕەباب، ئامێرێکی ژێدارە دێرینی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەکانی/9م و 10م، لەو سەردەمەوە لە زۆر وڵاتانی خۆرهەڵات وەک ئامێرێکی میللی بەکاردەهێنرێت، دەشێت بوترێت کە هەر میللەتە بەگوێرەی ناوچەکەی بایەخی بە شێوە و چۆنیەتی دورستکردنی داوە.**

Rabbia(I), Rage, Anger(E) **تووڕە، توند.**

Rabbiosa(I), Furiously, Angrily(E) **بەتووڕەیی، بەتوندی.**

Racket(E), Rackett(G) **ڕاکێت، ئامێرێکی هەوایی جووتزمانەی سەردەمەکانی چەرخی هۆریزانە***Renaissance***کە تاڕادیەک بە ئامێری شاون***Shawm* **و سوڕنا دەچێت.**

**چوار جۆر دەنگەواری هەیە:ـ**

1. **سۆپرانۆ***Soprano* **لە بەرینی دەنگی** *C – d´*.
2. **ئاڵتۆ/تینۆر***Alto-tenor* **لە بەرینی دەنگی** *C – g*.
3. **باس***Bass* **لە بەرینی دەنگی** *G – d*.
4. **باس***Bass* **لە بەرینی دەنگی** *F- c*.

Rackett fagott(G), Early bassoon(E) **کۆنترین شێوەی ئامێری باسسوون***Bassoon* **لە سەرەتاکانی سەدەی/18مدا پەرەیپێدرا و بووە ئەو ئامێرە کە سەردەمی ئێستا دەژەنرێت.**

Raddolcendo(I), Becoming gentler(E) **بەرەو نەرمو ئارامی.**

Raddolcente(I), Calming down(E) **هێوربوونەوە.**

Raddoppiamento(I), Doubling(E) **دەبڵێن، دوو ئەوەندەکردن.**

Raddoppiare(I), To double(E) **بە دەبڵکردن.**

Raddoppiato(I), Doubled(E) **دەبڵیو، دەبڵکراو.**

Radical bass(E) **ڕەگە باس، هێڵی باس***Bass- line***کە پەیوەندی هەیە بە بنەڕەتی کۆردەکانەوە، تۆنی بناخە لە کۆردێکدا.**

Raffrenando(I), Slowing(E) **هێواشکردنەوە لە خێرایی.**

Rag, Raga(Hn) **ڕاگ، ڕا، پەیڤێکی سـانسـکریت***Sanskrit***یە بە مانای ڕەنگین و سروود دێت. گوزارە لە ئەڤین، سـۆز، تاسـە، سـویّ، شـەیدایی، خۆشی و جۆش و خرۆشی....دەکات لە مۆزیکدا.**

Raggiante(I), Interested(E) **خۆشـحاڵ، درەخشـان.**

Rageur(F), Ill-tempered(E) **هەوەس ناخۆش، بێهەوەس.**

Ragtime(E) **چەشـنە مۆزیکێکی ڕەزمی ئافرۆ-ئامریکاییە کە دەگەڕێتەوە بۆ سالاّنی1890ز.**

Raĥetul-arwaĥ(Ar,Fa,Kr,Tr) **ڕاحەتولئەرواح، ڕاحەتولروح. ڕاحـروح. پێدەچێت لە ڕاح ڕۆح/ی ئاڤێستاییەوە وەرگیرابێت کە بە واتای ڕۆحی ڕەها:ڕۆحی ئازاد دێت و مۆزیک دەسگایەکی سەردەمانی ساسانیەکان بووە. لێرشتەیەکی سـەر بە دەسـگای سـێگایە، سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سـێگای سـیانیی لەسـەر پلەتۆنی ئاراک، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی دووگا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەی کە هەمان ڕیزبەندی نۆتەکانی بەرزبوونەوەیە پێکهاتووە لە:ـ گریّ نێکرێز لەسـەر پلەتۆنی ڕاسـت.**




Raking(E) **شـانەکردنی کۆردە شـکستەکان لەسـەر ئەو ئامێرانەی وەک عوود، تار، سـاز....هتد.**

Ralentir, Ralentissant(F), To slow down(E) **سـست بێتەوە.**

Rallentamento(I), Slackning of the tempo(E) **خاوکردنەوەی تێمپۆ.**

Rallentare(I), To slow(E) **خاوبێتەوە.**

Rallentando(I), Graduated Slowing(E) **پلەپلە خاوبوونەوە.**

Rallentando a poco a poco(I) **خاوبوونەوەی کەمکەم.**

Rallentando molto(I) **زۆر بە خاوی.**

Rallentando poco(I) **کەم خاوبوونەوە.**

Rallentando sempre(I) **بێوەستان خاوبوونەوە.**

Rallentando sino alfine(I) **خاوبوونەوە تا کۆتایی.**

Rallentato(I), Slowed(E) **خاوبوو.**

Range(E), Umfang(G) **ڕانژ، ڕێنج، پانتایی دەنگ لە نزمترین نۆتەوە بۆ بەرزترین نۆتە لە پارچەمۆزیکێکدا، پانتایی تۆنی ئامێرێک یاخود دەنگێک، بۆ نموونە پانتاییە تۆنی ئامێری هارپ وەهایە:ـ**



Rank(E) **ڕانک، ڕیزە لوولەدەنگێکی ئامێری ئۆرگنە کە بە یەک لوولە داخراوە***Stop***وە بەستراوە، بۆ نموونە:ـ هەموو لوولەکانی فلووتی سـەرتیژ***Spitz-flute* **یەک جۆر دەنگی فلووتیان هەیە، ئەو ئۆرگنانەی بەشـێوەیەکی پراکتیک هەن لە سـیّ تاکو نۆ دانە ڕانک/یان هەیە.**

Rapidamente(I), Rapidly(E) **بەخێرا.**

Rapidità(I), Rapidité(F), Rapidity(E) خێرایی.

Rapido(I), Rapid(E), Rapide(F) خێرا.

Rapproacher(F), Bring closer together(E) نزیکردنەوە بۆ یەکتر.

Rasch(G), Quick(E) پەلە.

Rascher(G), Quicker(E) پەلەتر.

Rassel, Ratsche(G), Rattle(E) ئامێرە خڕنگەکان کە بەشێکن لە ئامێرە ڕەزمیەکان.

Rast(Ar,Fa,Kr,Tr) دەسگای ڕاســت

بەنوری بادەی کەشــفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چیبکەم

بە شـەمعێکی وەها چاری شەوێی وا نەکەم چیبکەم مەحوی، بەدەنگی:عەلـی مەردان

بۆ لێکدانەوەی ناوی دەســگای ڕاســت....پێویســت دەکات ئاوڕێک لە وشـــەی ڕاگ*Rag*بدەینەوە کە وشـــەیەکــی زۆر دێرینـــی سانسکرێتی هیندی/یە و بە سەرەتا سروودێکی زۆر پیرۆز دادەنرێت لە ســرۆتەئایینی براهمایی هیندۆسەکاندا کە بریتیە لە کۆمەڵە سـروودێکی ڕازونیاز، ســوپاس و ســتایشە بۆ خوداوەند ڕیگڤێدا*Rigveda*. دەشێت ئەم وشەیە{واتە ڕیگ یاخود ڕاگ}نزیکایەتییەکی هەبێت لەگەڵ وشەی ڕا/ی کوردیدا کە لە هەندێک بەکارهێناندا بە مانای ڕێگە و بەمانای نەوا یاخود ئاهەنگ/یش هاتووە. لە ڕیشەوشەی ڕاگ/ەوە وشــەی ڕاگاســت*Ragasit*یش هاتووە کە ئەمەیان دەبێت دەماودەم نزیک بووبێتەوە لێمان. لەسەر هەمان کێش زۆر وشەی کوردیمان هەیە کە بە پاشگری ســت/کۆتایی دێت وەک توانست، زانســت...و هیتــر. لەوانەیە بۆ ئاسانی ســەر زمان هەر دوو پیتی **گ** و **ا** لە وشەی ڕاگاســت/دا بەرەبەرە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت لەسـەر زوان ســوابێت و بە دواوشەی ڕاســت جێگیر بووبێت و ئیتـر بەو شـێوەیە مابووبێتەوە تاکو ئێســتا.

بەپێی نووسیدەی یارسان{ئەهلی هەق، ئایینـزایەکی زۆر دێرینی کوردســتانە}.....لە دەورەی حەوتەوانە/دا بەندێک لە پەیامی سەرەنجام نووسراوە گوایە ئەو دەمەی کە خودێ حەزرەتی مشیە(واتە ئادەم)دەئافرێنێت و دەیەوێت پڕتەوێک لە یەزد(ڕۆح)ی خۆی بکات بە بەریدا، پاش چل ڕۆژ فەرمان بە سـەردەسـتەی فریشـتان بەنیامین دەدات کە ئاوازێکی وا بۆ ڕۆح بچڕێت کە بزە و خرۆشی بچێتە جەسـتەی حەزرەتی مشـیە/یەوە. فریشـتە بەنیامین/یش بە نەوایەکی ڕەوانی پڕ ڕاز و ســۆز بەناوی ڕاســت/ی بۆ دەچڕێت، ئەویش بەخۆشی ئەو نەوا یەزدی/یەوە دەکەوێتە بزە و خۆی دەکات بە جەستەی مشیە/دا. مشیە/یش بە شەیدای ئەو بەزمەوە دەکەوێتە وەشت و خرۆشی.

ســەفەدینی ورمێیی/یش کە حەزرەتـی ئادەم/ی لە یەکێ لە نووســینەکانیدا بە دەســگای ڕاســت چواندووە ئەوە دەگەیەنێت کە هەروەک چۆن ئادەم یەکەم گیانلەبەرێکی خوداکردەیە لە شێوەی مرۆڤدا و هەر لەمیشـەوە مرۆڤ نەوە پەی نەوە کەوتۆتەوە، ئاوەهایش ئاوازی ڕاست{واتە دەســگای ڕاســت}بەسـەرەتای هەموو دەسـگاکانیـتر دادەنرێت و کراوەتە پێگە و مەزرایەک بۆ دەسـگامۆزیکیەکانیـتر. دەشێت هەر لەم تێڕوانینەوەڕا هەندێک وای لێکبیدەنەوە کە لە ڕواسین/ەوە هاتبێت کە ڕەگی وشـەکەیش ڕوا/یە مانای ڕواندن دەگەیەنێت، بەڵام گەر لە ڕووی چەمکە ڕۆحی و هونەریەکەیەوە بڕوانینە مانای وشـــەکە پێدەچێت زیاتر لە وشەی ڕاگاست/ەوە نزیکـتر بێت.

ڕاســت....بە یەکێک لە دەســگا ســەرەکییەکان لە مۆزیکی کوردیدا دادەنرێت. کەم بەزموئاوازی کوردی هەیە بچێتەوەسەر ئەم دەســگایە بەڵام زیاتر لە بۆنە ئایینیەکاندا دەبیســترێت. یەکەم کەسێک کە وشەی ڕاست/ وەک زاراوەیەکی هونەری بوژاندەوە زانای ئیسلامی کورد نەژاد ســەفەددینی ورمێیی کە لە هەردوو پەڕاوەیەکەیدا بەناوی"الادوار و الرسالة الشرفية" ئاماژەی پێداوە و خستویشیەتە ناو خانەی چلەم لە بازنە مۆزیکیەکانیدا.

سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاســتە لەســەر پلەتۆنی ڕاســت، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا. سکێڵی هاتنەخوارەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی نەهاوەند لەسـەر پلەتۆنی نەوا، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی سێگا لەسەر پلەتۆنی سێگا. لە سـکێڵی خۆراواییدا بەرابەر پلەتۆنی دۆ/Cدەبێتەوە. ســکێڵی دەســگای ڕاست لە کوردســتانی خۆرەڵات




پلەتۆنەکانی بەم چەشنە ڕیزبەندە:ـ دۆ ـ ڕێ ـ مـی ـ فا ـ سـۆڵ ـ لا ـ ســی بیمۆل ـ دۆ.

Rattenendo, Rattenuto(I), Holding back(E) گەڕانەوە بۆ پێشتر.

Rattle, Clapper(E), Sonaglio(I) خشخشە، جۆرێکە لە ئامێرە پێرکیوژنەکان*Percussion*.

Rauh(G), Rauque(F), Rough,Coarse(E) ڕەگڵە، زبر.

Rauschend(G), Murmuring(E) زەمزەمە.

Rauscher, Schwärmer(G) ڕاوشەر، پاساو*Passage*ێک کە تیایدا هەر نۆتەیەک یاخود هەر دوو نۆتەیەکی بەدوایەک چەندین جار ڕەپاتبکرێتەوە.

Rauschflöte, Rauschpfeife(G) ڕاوشەپایپ، ئامێرێکی دەبڵ ڕیشەی لوولەداری سـەردەمانی سـەتەکانی ناوەڕاست و هۆرێزانە کە لە ئەوروپادا ڕەواجی هەبووە.

Ravalement(F) بەرینی دەنگ هارپسیکۆرد یاخود ئۆرگن کە لە ســێ جۆردا فرۆزە دەکرێت:-

1. *Á petit ravalement* بە بەرینی{ڕێنج*Range*}ی چوار ئۆکتاڤ.
2. *Á ravalement* بەرینی لەنێوان چوار بۆ پێنج ئۆکتاڤ.
3. *Á grand ravalement* بە بەرینی پێنج ئۆکتاڤ.

Ravvando il tempo(I), Picking upp the tempo(E) هەڵگۆزاندنی تێمپۆ.

Ravvivando(I), Quickening(E) پەلاندن، پەلەکردن.

Re, Ré(F), D(E,G) ڕێ، دووەم پلەدەنگە لە مێجەر سـکێڵدا لە پلەدەنگی دۆ/Cیەوە.

Real answer(E) ڕاستە بەرسـڤ، کورتە گوزارە مۆزیکێکە کە بابەتێک یاخود زوو هاتنەناوەوەی ئاوازێکی سەرەکی*Theme*و لە پلەی پێنجەمەوەڕا پەیدادەبێتەوە. ئەم جۆرە لە فیوگە*Fugue*دا باوە.

Realisation(E), Realisierung(G) پەیـپێبردن، بە ئەنجامدان،

لە کارە هارمۆنیەکانی ســەتەکانی حەڤدە و هەژدەمە کە بریتیە لە زێدەکردنی کۆرد*Chord* و نۆتەپاســاوەکانیــتر*Passage note* بۆ باسێکی ڕازاوە{بڕوانە/*Figured bass*} لەلایەن کیبۆردژەنەوە، خستنەسەری درەخشاندن{ئۆڕنامێنت} بۆ هێڵە مۆزیکەیەکان لەلایەن تەکنەواز*Soloist*یەکەوە بە مەبەستی گیرســانەوەی دەنگە جیاوازەکان و پەیوەندییان بەیەکتریەوە بۆ پەیبردنی زیاتر بە جوانی و شـۆخ و شــەنگی لەو ئاوازە مۆزیکیانەدا.

Ré-bémol(F), Re-bemolle(I), Des(G), D-flat(E) ڕێ ـ بیمۆڵ.

Ré-bémol majeur(F), D-flat major(E) ڕێ بیمۆڵ ـ مێجەر.



Ré-bémol majeur gamme(F), D-flat major scale(E) سکێڵی ڕێ بیمۆڵ ـ مێجەر.



Ré-bémol mineur(F), Re-bemolle minore(I), D-flat minor(E) ڕێ بیمۆڵ ـماینەر.
Des-moll(G)

Rebond(F), Bounce(E) تەپتەپەکردن.

Rebube, Rebute(F), Jew´s harp(E) چەنگ{هارپ}ی چەناگە.

Recapitulation(E), Réexposition(F), Reprise(E,F,G) بەرگوزیدەی بڕگە سەرەکیەکان،

ڕەپاتکردنەوەی بەشــە سـەرەکیەکان بەکورتی، ئەم چەشــنە بەتایبەتی لە شــێوەکانی سـۆناتا*Sonata*بەکاردەهێنرێت.

Rechte(G), Right(E) ڕاســت.

Rechte hand(G), Right hand(E) دەستە ڕاســت.

Récit(F), Swell organ(E) ئۆرگنی زل و تۆکمە، کورتکراوەی/*Recitative*.

Recital(E), Rezital(G) لە ڕیشەوشەی*Recito*ی لاتینیـیەوە هەڵێنجراوە کە بەمانای

خوێندنەوە و لەبەرکردن بەدەنگی بەرز، جێبەجێکردنی کارێکی مۆزیکی کە تیایدا چەند گچکە ژمارەیەک لەو کارانەی گرتۆتەخۆ، بۆ نموونە بە چەشنی یەک گۆیندەیی*One solo recital*یاخود دوو گۆیندەیی*Duo recital*.

Recitative(E), Récitatif(F), Recitativo(I), Rezitativ(G) گۆیندەیی، ڕێسـیتاتیڤ،

بەگشتی...چەشنێکە لە ستران لە ئۆپێرا و ئۆراتۆریۆ*Oratorio*دا بۆ دیالۆگ بەکاردەهێنرێت کە گێڕانەوەیەک دەنوێنێت زیاتر نزیکە بە گێڕانەوەیەکی درامایی بە دەنگ و ڕەزمەوە وەک لە ستران. لە دوو جۆری سـەرەکی/یش پێکهاتووە:ـ

1. گێڕانەویەکــی هاویارەکــی*Accompagnato*یاخود ئامێرەکــی*Stromentato*کە گوزارە لە هاوکاری ئۆرکێسترا بکات.
2. گێڕانەوەیەکی پەرت*Staccato* و وشک و نابژێو*Secco(dry)*کە هاوپارییەکی زۆر سادەی کۆردالی*Chordal*لەگەڵدایە، یاخود بڵێین تەنیا بەچەشنێکی کۆردە هەڵبەســتراوێکی

شکستە*Occasional broken chord*کە لە هارپسیکۆرد یاخود چێللۆدا هەیە{هەندێجاران لەگەڵ هێڵی باس بە دەبڵ باس*Double bass*بەهێزدەکرێت}، ئەم چەشنەیان لە سەتەکانی هەژدە و نۆزدەمدا لە ناو ئۆپێرادا پەسەندبوو.

3. ڕیسیتاندۆ، Recitando, Recitante(I), Récitant(F), More speach than song(E)
گۆیندەیی. پارچە سۆلۆ*Solo part*یەک زیاتر گۆیندە بێت وەک لە ستران.

گێڕانەوەیەکی هاویاریی. Recitativo accompagnato; Obbligato(I), Recitative accompanied(E)

گێڕانەوەی بێ تێمپۆ، چەشنێکی ناحەز*Unlike*کە زیاتر گۆیندە لە هەڵبژاردنی کاتدا ئازادە. Recitativo a tempo(I)

پەڕلە گێڕانەوە، جۆرە ئاوازێکی دەسگایی*Mode*یە کە زیاتر لە ئاخاوتنی ئاساییەوە نزیکە. Recitativo parlando(I)

سادەگێڕانەوە، Recitativo secco(I), Quick-moving recitative over – -simple punctuated chords(E)
گێڕانەوەیکی جووڵە خێرایە بەسەر کۆردەکاندا کە بەژمارە دیاریکراوە. زیاتر لەگەڵ هارپسیکۆرد و چێللۆ یاخود ڤیۆلا دی گامبا *Viola da gamba* وەک هاویار*Accompaniment* بەرکادێت.

گێڕانەوەی ئامێرالی کە هاومانای هاویاریی*Accompagnato*یە. Recitativo stromentato(I)

گویندەکردن، تەکنەوازیی. Réciter(F), Peforming solo part(E)

گۆیندەی نۆتە. گێڕانەوە ئەو بڕگە و گۆزارە نۆتە یاخود تۆنانەی کە لە سروودێکی کلێسەییدا پێویست دەکات بە دەنگەوە ببێژرێت، لە سروودی گریگۆریاندا ئەم نۆتەیە زاڵە*Dominant*. Reciting note(E)

ئامێری بلوێر کە هەشت کونی هەیە، Recorder, Fipple flute(E)
دووانی بچووکە و لە پشتەوەیە، وەک ئامێرێکی میللی هەوایی لە سەتەکانی شانزەم و حەڤدەم و هەژدەم و تا سەردەمی ئێستایش زۆر باوە، ئەو ستاندەر بلوێرانەی کە ناویان هەیە و وەک ئامێرێکی مۆزیک دەنۆتێنرێن، ئەمانەن:ـ

1. سۆپرانینۆ/*Sopranino*لەسەر کلیلی فا/F، تۆنێکی تیژ*Treble*ی هەیە، نۆتەی نووسینی لە تۆنی فا/Fسەرووتر لە تۆنی دۆ ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات بەڵام نۆتەی ژەنینی دەبێتە ئۆکتاڤێک سەرووتر لە نۆتەی نووسراو.
2. سۆپرانۆ*Descant/Soprano*لەسەر کلیلی دۆ/C، تۆنێکی تیژ*Treble*ی هەیە، نۆتەی نووسینی لە تۆنی دۆی ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات بەڵام نۆتەی ژەنینی دەبێتە ئۆکتاڤێک سەرووتر لە نۆتەی نووسراو.
3. تیژ/ئاڵتۆ*Treble/alto*لەسەر کلیلی فا/F، تۆنێکی تیژ*Treble*ی هەیە، نۆتەی نووسینی ئاساییدا لە تۆنی فا/Fسەرووتر لە تۆنی دۆ/Cی ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات هەندێجاریش لە تۆنی فا/Fسەرووتر لە تۆنی دۆی ناوەڕاست*Middle-C*وە، بەڵام نۆتەی

**ژەنینی ئاسایی هەر وەک نووسینەکەیەتی و لە هەندێجاریشدا دەبێتە ئۆکتاڤێک سەرووتر لە نۆتەی نووسراو.**

4. **تینۆر/*Tenor*، لەسەر کلیلی دۆ/C، تۆنێکی تیژ*Treble*ی هەیە، نۆتەی نووسینی ئاسایی لە تۆنی دۆ/Cی ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات و ژەنینیشی هەر وەک خۆیەتی.**
5. **باس/*Bass*، لەسەر کلیلی فا/F، تۆنێکی گڕ*bass*ی هەیە، نۆتەی نووسینی ئاسایی لە تۆنی فا/F وە یەک ئۆکتاڤ و پێنجەم خوارتر لە دۆ/Cی ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات و ژەنینیشی یەک ئۆکتاڤ سەرووتر لە نۆتەی نووسراوی.**
6. **گەورەباس*Great bass*، لەسەر کلیلی دۆ/C، تۆنێکی گڕ*bass*ی هەیە، نۆتەی نووسینی لە تۆنی دۆ/C دوو ئۆکتاڤ خوارتر لە تۆنە دۆ/Cی ناوەڕاستەوە بەڵام نۆتەی ژەنینی ئۆکتاڤێک سەرووتر لە نۆتەی نووسراوی.**
7. **کۆنتراباس*Contra bass*، لەسەر کلیلی فا/F، نۆتەی نووسینی ئاسایی لە تۆنی فا/F وە یەک ئۆکتاڤ و پێنجەم خوارتر لە دۆ/Cی ناوەڕاست*Middle-C*وە دەسپێدەکات و ژەنینیشی هەر وەک نووسینەکەیەتی.**
8. **ژێر کۆنتراباس/کۆنترا گەورە باس*Sub contra bass/Contra great bass*، لەسەر کلیلی دۆ/C، تۆنێکی گڕ*bass*ی هەیە، نۆتەی نووسینی دوو ئۆکتاڤ خوارتر لە دۆ/Cی ناوەڕاست*Middle-C* و ژەنینیشی هەر وەک نووسینەکەیەتی.**
9. **ژێر ژێر کۆنتراباس/کۆنترا گەورە باس *Sub Sub contra bass/Contra contra great bass*، لەسەر کلیلی فا/F، تۆنێکی گڕ*bass*ی هەیە، نۆتەی نووسینی لە فا/F وە دوو ئۆکتاڤ و پێنجەم خوارتر لە دۆ/ی ناوەڕاست*Middle-C* و ژەنینیشی هەر وەک نووسینەکەیەتی.**

Recte(L), Straight line(E) **ڕێکتە، ڕێک، ڕاستەڕێ.**

Recto, The front of foil(E) **بەرایی ڕووپەڕ.**

Rectus(L), Similar(E) **مانەند، هەمان، وەکی دەڵێن هەمان جووڵە*Motus rectus*.**

Recueil de chansons(F), Songbook(E) **ستراننامە.**

Red brass(E) **سوورەبراس، ئەو ئامێرانەی کە 90%ی کانزای مسCu و 10%ی زینکەZn.**

Ré-dièse(F), Re-diesis(I), Diss(G), D-shap(E) **تۆنی ڕێ-تیژ.**

Ré-dièse mineur(F), Re diesis minore(I), Dis-moll(G), D-sharp minor(E) **کلیلی ڕێ تیژ ـ ماینەر.**

Redita, Reddita(I), Return, Repeat(E) **ڕەپات، گەڕانەوە.**

Redoble(E) **ڕیدۆبلە، زنجیرە چوار یاخود پێنج لێدانێک لە یەک یاخود دوو لێداندا.**

Redoublé(F), Compound(E) **پێکەڵ، تێهەڵکێش.**

Redoublé interval(E) **میانەی تێهەڵکێش.**

Reduction(E), Riduzione(I) **ڕێکخستنێکی سادەی پارچە مۆزیکێک بەشێوەیەکی کەمتر.**

Réduire(F), Reduzieren(G), To arrange(E) **ڕێکیبخات.**

Redundant entry(E) زێدە دەنگێک*Extra voice* لە سەرەتای دەسپێکی فیوگە*Fugue*یەکدا.

Reed(E), Anche(F), Zunge(G), Ancia(I) زەل، زمانە، تیغی نای، ڕیشە.
لە ئامێرە هەواییەکاندا دروستدەکرێت کە بە لەرینەوە دەنگ پەیدادەبێت، زمانەی مۆدێرنیش هەیە کە لە پلاستیک دروستدەکرێت.

Reed instruments(E) ئامێرە زمانەدارەکان، وەک ئامێری کلارنێت، ساکسۆفۆن کە تاک زمانەن.

Reed Organ(E) زمانە ئۆرگن، وەک ئامێری هارمۆنیۆم، میلۆدیۆن، کۆنسێرتینا...هتد.

Reed pipe(E) ئۆرگنی دەنگ لوولەی زمانەدار کە دەنگێکی بەهێزی هەیە.

Reed stop(E) دەستە لوولەیەکی ئۆرگن کە زمانەی لە ڕیشە دروستکراون.

Refrain(E,F), Ritornello(I) ویردخوانی، پارچەیەک لە سترانێک کە بوترێتەوە لە کۆتایی هەر بڕگە*Stanza*ی هۆزانێک یاخود پارچە مۆزیکێکدا.

Refrapper(G), Strike again(E) دووبارە لێدانەوە.

Regel(G), Rule(E), Règle(F), Regnare(I) یاسا.

Regel der octave(G), Rule of the octave(E), Règle de l´octave(F) یاسای ئۆکتاڤ.

Regens chori(L), Conductor of a church choir(E) ڕابەری کۆرسی کڵێسە.

Regie(G), Production(E, F), Produzione(I) دەرهێنان.

Régisseur(F), Opera producer(E) دەرهێنەری ئۆپێرا.

Register(E) ڕێجیستەر، دەستە لوولەیەکە لە ئامێری ئۆرگندا کە دەنگی لێوەڕا دەردەچێت.

Registerzug(G) دوگمەکانی ئۆرگن.

Registering, Registration(E) تۆمارکردن، ڕێجیستراندن، هەڵبژاردنی لوولە دەنگیەکان بەشێوەیەکی دروست لە ئامێری ئۆرگن و هارپسیکۆردەکاندا.

Régulier(F), Regular(E), Regolare(I) ڕێکوپێک.

Rehawi(Ar,Kr) ڕەهاوی،. ڕیشەی وشەکە لە ڕوها:ڕوحا/وە هاتووە کە شارێکی زۆر پیرۆز بووە لە سەردەمانێکی زۆر دێریندا{بڕوانە/Orfa}. یەکێکیش بوو لەو ئاوازانەی سەردەمی کەیخەسرەوی ساسانی. لێرشتەیەکی سەربە دەسگای ڕاستە کە سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ

راست — دووگا — سێگا — چوارگا — نەوا — حوسێنی — ئاوج — گردان

ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست،
ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا.

Rein(G), Pure, Clear, Perfect(E) Parfait(F), Perfetto(I) ڕوون، پوختە، دروست، تەواو.

Reine 386ctave(G), Perfect octave(E) پوختە ئۆکتاڤ.

Reine prim(G), Unison(E) یەکتۆنی پوخت.

Reine quarte(G), Perfect fourth(E) دروستە چوارەم. چوارەمی تەواو.

Reine quinte(G), Perfect fifth(E) دروستە پێنجەم، پێنجەمی تەواو.

Reines interval(G), Perfect interval(E) دروستە میانە، میانەی تەواو.

Reines moll(G), Authentic;Natural minor scale(E) مینۆر سکێڵی سـروشت.

Relâché(F), Loosened(E) خاوکردنەوەی ژێ/یەکان.

Relatif(F), Relative(E) خزم، پەیوەندی، نزیکبوو.

Relative keys(E) کلیلە خزمەکان، کلیلە هاوتەریبەکان، ئەو کلیلانەن کە هاوبەشن لە هێمایاندا، وەک دۆ-مێجەر و لا- ماینەر.

| هێمای کلیل key signature | کلیلی ماژۆر major key | نزیکە کلیلی مینۆر relative minor key | هێمای کلیل key signature | کلیلی ماژۆر major key | نزیکە کلیلی مینۆر relative minor key |
|---|---|---|---|---|---|
| no sharps or flats | C major | a minor | no sharps or flats | C major | a minor |
| 1 sharp | G major | e minor | 1 flat | F major | d minor |
| 2 sharps | D major | b minor | 2 flats | B flat major | g minor |
| 3 sharps | A major | f sharp minor | 3 flats | E flat major | c minor |
| 4 sharps | E major | c sharp minor | 4 flats | A flat major | f minor |
| 5 sharps | B major | g sharp minor | 5 flats | D flat major | b flat minor |
| 6 sharps | F sharp major | d sharp minor | 6 flats | G flat major | e flat minor |
| 7 sharps | C sharp major | a sharp minor | 7 flats | C flat major | a flat minor |

Relative major(E) خزمە مێجەر، ئەو کلیلە مێجەرانەن کە دەبنە هاوتەریبی مێجەری کلیلە ماینەرەکان، بۆ نموونە سـۆڵ ـ مێجەر/*G-major*دەبێتە خزمە مێجەری می ـ ماینەر/*e-minor*، چونکە هەردووکیان یەک هێمای تیژ*Sharp* لە کلیلیاندا هەیە.

Relative minor(E) خزمە ماینەر، ئەو کلیلە ماینەرانەن کە دەبنە هاوتەریبی کلیلە مێجەرەکان، بۆ نموونە دۆ- مێجەر/*C-major* دەبێتە خزمە ماینەری می بیمۆڵ ـ ماینەر/*E flat-minor*، چونکە هەردووکیان هێمای سـێ دانە بیمۆڵ/$B^b$ لە کلیلیاندا هەیە.

Relative modulation(E) خزمە مۆدولێن، گۆڕینی لە کلیلێکەوە بۆ کلیلێکی خزمی، بۆ نموونە دۆ-مێجەر بۆ لا-ماینەر یاخۆد می-ماینەر بۆ سـۆڵ-مێجەر....وەهەروەها.

Releve(E) بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی نووک و پاژنەی پێ لە سـەمای باڵێت/*Ballet*.

Religieux(F), Religioso(I), Religious(E) ئایینـی.

Religiosamente(I), Religiously(E) دینایەتی،.

Remote keys(E) کلیلە پەیوەندیدارەکان، بۆ نموونە کلیلی دۆ/*C* و کلیلی فا تیژ/$F^{\#}$.

Renaissance(E), Rinascimento(I) ڕێنیسـانس، ڕینوێسـاز، هۆرێزان. بروانە/*Rinascimento*.

Renforcer(F), Increase(E) زێدە، زۆرکردن.

Renversément(F), Inversion(E) هەڵگێڕاو.

Renvoi(F), Sending back, Repeat sign(E) ناردنی بۆ دواوە، گەڕانەوە، هێمای گەڕانەوە.

Repeat(E), Répéter(F), Replica(I) ڕەپات، چەنبارەکردنەوەی باڕ*Bar*یک یاخود چەند باڕێک تا ئەو جێگەیەی بە هێمایەکی تایبەتی بۆی دیاریکراوە.

هەندێک جۆر هێمای ڕەپاتکردنەوە هەیە کە لە ژەنیندا بەکاردەهێنرێن وەک:ـ

1. ڕەپاتکردنەوەی نۆتەکان*Repeat notes*.



2. ڕەپاتکردنەوەی بە کۆمەڵ*Repeat groups*.



یاخود تا کۆتایی ڕســـتەکە و ژەنینەوەی.



3. بارِ ڕەپاتکردنەوە*Repeat bars*.



4.ڕەپاتکردنەوەی هەموو پاشماوە بارِەکان*Repeat whole bars*.



5.ڕەپاتکردنەوەی بەشـــەکان*Repeat Sections*.




Repente(I), Immediately(E) ناگەهانی، یەکســـەر.

Repercussa(L) دەنگدانەوە، ڕەپاتکردنەوەی تۆنێکی تینۆر*Tenor*، زاڵ*Dominant*یاخود گێرِانەوە لە دەســـگا*Mode*یەکدا.

Repercussio(L), Repercussion(E), Ripercussione(I) دەنگدانەوە، هەمیشە
ڕەپاتکردنەوەی هەمان دەنگ، بۆ نموونە وەدەرخستنەوەی بابەت*Subject*یکی فیوگە*Fugue* پاش پێشەند*Exposition*.

Repetiteur(E), Répétiteur(F), Repetitore(I),Reptitor(G) سەردەستەی ئۆپێراچڕان، مامۆستای یاریدەری.ڕاهێنەر.

Répétition(F), Repetizione(I), Repetition, Rehearsal(E) ڕەپاتبوون، پرۆڤە، جارێکیتر.

Replicato(I), Repeated, Doubled(E) دووبارەکراو.

Réplique(F), Replica(I), Answer, Octave(E) بەرسڤ. ئۆکتاڤ، دووبارە، میانەیەک لە ئەنجامی هەڵگێڕانەوە*Inversion*یەکەوە بێت.

Reply, Answer(E), Réponse(F), Rispondere(I) بەرسڤی فیوگە*Fugue*یەک.

Repos(F), Repose, Break, Rest(E) پشوو، وچان، حەسانەوە.

Report(E) ڕاپۆرت، وەڵامدانەوەی بابەتێک لە فیوگە*Fugue* ، کانون یاخود هەر شێوەیەکیتر.

Requiem(L) سروودی لاوانەوە و یادی مردووان لە کڵێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکدا.

Résolu, Résolument(F), Resolutely(E) بە خواست و دڵبەندیەوە، بە ئەزمەندەوە.

Résolution(F), Resolution(E) زنجیرە پێشبەریی*Progression*یەک لە نۆتەیەکی ناساز*Discordant note*یاخود کۆرد*Chord*ێک بۆ نۆتەکەی خۆی یاخود بۆ کۆردەکەی خۆی. زنجیرە پێشبەرییەکی هارمۆنیە لە ناسازکۆرد*Discord*ەوە بۆ سازکۆرد*Concord*.

Resonance(E), Resonanz(G) زرنگانەوە، ڕینگانەوە. ڕنگە.
دیاردەیەکی فیزیکی دەنگە کە لێوەیڕا گوێبیست دەتوانێت دەنگی ئامێرەکان بناسێتەوە.

Resonator(E), Resonateur(F) پێزرنگە، ئامرازێکی میکانیکە زرنگەی پێدەردەکرێت.

Respiro(I), Semiquaver rest(E) تاوێک، وچانی هەناسەیەک، 1/16ی وچانێکی تەواو.

Response(E), Responsorium(L) هەلهەلەلێدان بە ئامێرەهەواییەکان، بەرسڤدانەوە لە پارچەیەکی فیوگەدا.

Rest(E) پشــوو، وچان.

Rest value(E) بەهای پشوو. هێمای بێدەنگی بەپێی کات وەک لەم نموونانەدا:ـ




Restrictio(I), The stretto of a fugue(E) شـێوازە ژەنینێکی توند و تیژە لە فیوگەیەکدا.

Resultant note(E) بەرهەمە نۆتە، دوو نۆتە بە دەنگێکی بڵند. نۆتەیەک کە لە بار و دۆخێدا بێتەبەر لەکاتێکدا دوو نۆتە لە هەمان کاتدا بژەنرێن، ئیتر جیاجیا تۆن*Differential tones*بن لە فریکوێنسیاندا یاخود کۆکـتۆن*Summation tones* هەر لە فریکوێنسیاندا.

Retard(F), Retardation, Delay(E) کۆسـپ، دواخستن، هێواشـبوونەوەی تێمپۆ.

Retardant(E) دواخستە نۆتە.

Retenant, Retenu(F), Ritenuto(I), Suddenly slower(E) خاوبوونەوەی کتوپڕ.

Retro(L), Backwords(E) بەرەوپاش.

Retrograde motion, A theme played backwards(E) جووڵەی بەرەوپاش،

جووڵەیەکی پێچەوانە و بەرەو لێژی، ڕشتەمۆزیکێک*Theme*کە بەرەوپاش بژەنرێت، ئەم جۆرە لە سـەتەی چواردەمدا ئاهەنگسازان کاریان لەسەر دەکرد.

Retrograde inversion motion(E) جووڵەی بەرەوپاش و پێچەوانە،

ڕشـتەمۆزیکێک*Theme*کە بەرەوپاش و پێچەوانە و بەرەو لێژی بژەنرێت.

Retrogrado(I), Retrogradus(L), Retrograde(E) گەڕانەوە بە هەمان ئاڕاسـتە.

Retrogression, A weak harmonic movement(E) جووڵەهارمۆنیەکی تاڕادەیەک لاواز.

Retto(I), Right, Straight, Similar, Direct(E) ڕاست، ڕاستەوخۆ، ڕێک، هەمان.

Réunis(F), Coupled(E) جووتکراو.

Reveille(F), Wake upp call(E) بووقـی سـەربازیی بۆ بێدارکردنەوە لەکاتی بەرەبەیاندا.

Revenir(F), To return(E) بگەڕێتەوە.

Reverberation(E) گەڕانەوەی دەنگ، دەنگدانەوە، *.Reverb*کورتکراوەیەتی.

Reverse motion(E) پێچەوانە جووڵە، بۆ نموونە:ـ گۆڕینی میانە هەڵبەزیوەکان

*Ascending intervals* بۆ میانە دابەزیوەکان*Descending intervals* و بە پێچەوانەیشەوە.

Revidiert(G), Revised(E) پیاچوونەوە.

Revolving lute, Hurdy-gurdy(E) ئامێری هوردی-گوردی.

Rhyme(E) نەوشە، واژەی بەسـاوەند، کۆتایی دوو وشە بە هەمان بەزموڕەزم لە هۆنراوەیەکدا.

Rhythm(E), Rhythmus(G), Ritmo(I) ڕەزم، ڕێکخستنی لێدانە بەهێزەکان*Strong beats* و لێدانە لاوازەکان*Weak beats*لە پارچە مۆزیکێکدا.

ڕەزم لە هونەری مۆزیکدا...پێیشـیدەوترێت کێش، گوزارە لە ڕێکخستنی دەنگە مۆزیکیەکان دەکات بۆ یەکە کاتیە یەکسـانەکان لە ڕسـتەیەکی مۆزیکدا کە بە هێمایەکی کەرتی لە سـەرەتای هێڵاسـۆ*Staff*دا دادەنرێت، بۆ نموونە دەوترێت 2/4 و 3/4 و 5/8....وە هەروەها. شـمارەی سـەرە*Numerator*ی کەرتەکە بریتیە لە وردکردنەوەی کاتەکان لە یەکەکاتـێکی گەورەدا و شـمارەی ژێرە*Denominator*یش بریتیە لە یەکەی کاتی گەورە و یەکسانیشـە بە چوار بەشـەکات{یاخود بڵێین چوار هەنگاو}و چەنجارەی چوار.لە مازۆر*Measure*ێکدا.

ئەمانەیش چەند نموونەی ڕەزم{کێش}ێکن کە لە مۆزیکی کوردی/دا بەکاردەهێنرێن، چەندۆکە دانەیەک لەم ڕەزمانە کە بەناوی سـەما و هەڵپەڕکێی کوردییەوە ناونراون، بیرۆکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مۆزیکزان ئەنوەر قەرەداخـی کە لە کۆتایی سـالانی شـەستەکانی سـەدەی بیستەمدا پێشنیاریکرد:ـ









کێشی بەگتاشی




کێشــی چەپی یاخود دەهۆڵــی




کێشی چۆپــی




کێشــی سەربەند




کێشی خۆشــرەنگ




کێشی دەرویشــی ـ2ـ




کێشــی دەرویشی ـ1ـ




کێشــی ســەنگین




کێشــی زێرەفکەند




کێشــی سۆفییان




یان




کێشــی ســواریی




کێشی کەندرە




کێشــی ســێپێیی




کێشــی فەرەنگین




کێشــی گەڕیان




کێشـــی چەلەبــی




Rhyme binaire(F), Duple rhythm(E) **جووت ڕەزمی.**

Rhythmic Augmentation(E) **زێدە ڕەزم، درێژکردنەوی کاتی نۆتەکان لە میلۆدییەکدا.**

Rhythmic diminution(E) **گەستووە ڕەزم، کورتکردنەوەی کاتی نۆتەکان لە میلۆدییەکدا.**

Rhythmic modes(E) **شێوازە ڕەزمیەکان، وەک ڕێگەیەک پێناسەدەکردێت کە تێایدا یەکێک یاخود زیاتر لە لێدانە لاوازەکان***Unaccented beats***کۆکبکرێن لەگەڵ لێدانێکی بەهێزدا***Accented beats***. سێ جۆر بڕگە لە شەش شێواز***Mode***ی ڕەزمدا خۆی دەنوێنێت، درێژەی هەر بڕگەیەکیش بە ژمارە دەپێورێت، یەکەپێوانەی ژمارە/3 بڕگەیەکی درێژە، یەکەپیوانەی ژمارە/2 بڕگەیەکی مامناوەندیە، یەکەپێوانەی ژمارە/1 بڕگەیەکی کورتە. وەک لەم شێوازانەدا دیارە:ـ**

**شێوازە ڕەزمی یەکەم***Rhythmic mode 1***بە ڕەزمی ترۆشیاک***(1 2)Trochaic.*

**وە هەروەها.** 2 1 | 2 1 | 2 1 |

**شێوازە ڕەزمی دووەم***Rhythmic mode 2***بە ڕەزمی یامبیک***(2 1)Iambic.*

**وە هەروەها.** 1 2 |1 2 |1 2 |

**شێوازە ڕەزمی دووەم***Rhythmic mode 3.*

**بە ڕەزمی داکتایلیک{پەنجەیی}***(3 | 1 2) Dactylic*

**وە هەروەها.** 3 | 1 2 | 3 | 1 2 |

**شێوازە ڕەزمی چوارەم***Rhythmic mode 4*

**بە ڕەزمی ئەناپێستیک***(3 | 1 2) Anapestic .*

**وە هەروەها.** 1 2 | 3 | 1 2 | 3 |

**شێوازە ڕەزمی پێنجەم***Rhythmic mode 5*

**بە ڕەزمی سپۆندیاک***(3 | 3) Spondaic .*

**وە هەروەها.** 3 | 3 | 3 |

**شێوازە ڕەزمی شەشەم***Rhythmic mode 6*

**بە ڕەزمی سێ بڕگەیی***(1 1 1) Tribachic .*

**وە هەروەها.** 1 1 1 | 1 1 1 | 1 1 1 |

Rhythmic notation(E) **نۆتاندن ڕەزمی، سیستەمی خوێندنەوە و نووسینی مۆزیک.**

Rhythm section(E) بەشی ڕەزم، بۆ نموونە لە باندێکی جازدا ئامێرە پێرکیوژنەکان*Percussion*
بەشی ڕەزم تەرخاندەکرێت بۆ پیانۆ، دەبڵ باس{یاخود باسی کارەبایی}، گیتار و تەپڵ...هتد

Rhythm syllables(E) سـیلابە ڕەزمیەکان، گۆ*Vocal*کردنی دێڕە ڕەزمیەکان بە بەکارهێنانی یادوەریی*Mnemonics*، بۆ هەر جۆرە دێڕێکیش سیلابەکان بەیەکەوە دادەنرێن. مامۆسـتا و مۆزیکزانی فەڕەنسـایی ئێمیل- جۆزێف چیفێ*Emile-Joseph Chevé* 1864ـ1804ز پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەشێت ڕەزم بە پەیڤی هەڵبژێردراو بۆ یادکردنەوە بەکاربهێنرێت لە دێڕە ڕەزمیەکاندا. ئەم جۆرە سیستەمە لە نێو مۆزیکی ئاوروپاییدا بڵاوبووەوە و کەوتنە کارپێکردنی. گرنگی بەکارهێنانی بەم شێوازە{ڕەزمە سیلاب}زیاتر بۆ یادخستنەوەیە وەک لەوەی هەر ناولێنان بێت. لەڕاستیدا ئەم سیستەمە کە لە کەلتووری هیندستانیدا پێیدەوترێت دۆڵ*Dol* بەر لە سەدان و هەزاران ساڵ کارپێیدەکرێت و هەروەها لە هەندێک شـوێنی ئافریکایشـدا. لە هونەری مۆزیکدا کە بەکاردێت مەبەسـت لەوە نیە کە جێی پیتەمۆزیکیەکانی وەک کرۆش و دەبڵکرۆش و...مانەندیان بگرێتەوە بەڵکو زیاتر زانین و پەیبردنە بەو کات و پێچوونەی ئەو ڕەزمە کە چ سـیلابـێکی بۆ دەبێت.
بۆ ئەم مەبەستە دوو خشتەی پێچوون سازکراوە بۆ گزارەکردن لەو سیلابانە. یەکێکیان پێیدەوترێت کاتی سادە*Simple time* و ئەویتریان کاتی پێکەڵ*Compound time*{بڕوانە/*Duration*}.

Rhythme ternaire(F), Triple rhythm(E) ڕەزمی سـیانی.

Ri(I), D#(E,G) تۆنی ڕ/ی تیژ، دووەم پلەتۆنە لە مێجەر سـکێڵ/ی لە پلەتۆنی دو/Cوە.

Richettato, Spiccato(I) بڕوانە/*Spiccato*.

Richtig(G), Right, precise(E) ڕاست و دروست.

Rideau(F), Curtain(E) پەردەی شانۆگەریی.

Ridendo(I), Laughing(E) پێکەنین، خەنین.

Riding(E) دووبارە ژەنینەوەی دێڕە ڕەزمیەکان بە چیل*Stick*کان و سەرەفڵچە*Brush*کان لە ئامێری سـیمباڵ*Cymbal*دا.

Ridotto, Riduzione(I), Redoute(F), Reduction, Arrangement(E) کەمکردنەوە، ڕێکخستنەوە، هەڵگۆزینی پارچە مۆزیکێک کە لەلایەن مۆزیکژەنەوە و بیسەرانەوە زۆر خۆشبێت لە بۆنە خۆشیەکانی وەک سەماکردن بەکاربهێنرێتەوە.

Riff(E) ڕیف، مۆزیک گوزارەیەکی کورت، بەزۆری ڕەپاتبوونەوەیە بەتایبەتی لە مۆزیکی جاز*Jazz* و بلووز*Blues*دا.

Riga, Rigo(I), Staff, Stave(E) هێڵاسـۆ.

Rigore, Rigoroso(I), Strict time(E) توند، کاتی تەواو.

Rilasciando, Rilasciante, Rilassando(I), Releasing(E) بڕوانە/*Rallentando*.

Rime(F), Rhyme(E) نەوشـە، بەزمی هۆزان، سـەروبەندی هەڵبەسـتی بەڕەزم.

Rimettendo, Rimettendosi(I) گەڕانەوە بۆ تێمپۆی یەکەم.

Rinascimento(I), Renaissance(E, F) چەرخی نوێگەریی. وشەلێکدراوێکی ئیتالیاییە و لە*Ri-nascere* پێکهاتووە. *Ri*یاخود*Re* واتە دیسان*Again* و*Be born*واتە لەدایکبوو. کوی وشەکە دەبێتە دیسان لەدایکبوو کە لە چەمکی فەلسەفییەوە واتای بوژانەوە و نوێبوونەوە دەبەخشێت. وەک بزوتنەوەیەک لە سەتەی چواردەمدا لە ئیتالیا سەریهەڵدا، لە سەتەی شانزە فەڕەنسا بووە شۆڕشێک و پاشان بە سەرانسەری ئاوروپادا تەشەنەیکرد.

Rincalzando(I), In good humour(E) لە هەوەسێکی خۆشدا.

Rinforzamento, Rinforzo(I), Reinforcement(E) بەهێزکردن.

Rinforzando, Rinforzato(I), Reinforced(E) جەختکراو لەسەر تۆن.

Ring(E) بازنەزەنگ، دەستە زەنگێکی نمرێتراو بە3، 4، 5، 6، 8، 10، یاخود 12 کە بە شێوەیەکی بازنەیی هەڵدەواسرێت و هەر یەکێکیان بە تۆنێکی جیاواز لەویتر کۆک دەکرێت.

Ripieno(I), Filling up(E) تێروپڕ، مۆزیک زاراوەیەکی کۆنە کە ژەنیاران{بەتایبەتی کەمانچەژەنان}بۆ ناسینەوە و جیاکردنەوەی پاساوەکان*Passages*بەکاریاندەهێنا و پاشان هەمووی لە ئۆرکێسترایەکی تەواودا دەژەنران. لە هەندێک بواری مۆزیکی مۆدێرندا بەدیدەکرێت وەک لە باندە براسیەکاندا. وشەکە لە ئۆرگنی ئیتالیاییدا بە مانای تێکەڵ*Mixture*دێت.

Riposo, Riposata(I), Respose, Resposeful(E) بە ئارامی و هێوری.

Riprende(I), Resume(E) پاراو، دەسپێکردن لەسەرەتاوە.

Ripresa(I), Repeat(E) بڕوانە/*Repeat*.

Riscaldano(I), Livelier(E) بە گەرم و جۆش.

Risentito(I), Lively, Poignant(E) بە خرۆشی و بژێوی.

Risoluto(I), Bold(E) بوێر و دلێر.

Risolutamente(I), Resolutely(E) بوێرانە و ئەزمەندانە.

Risoluzione(I) بڕوانە/*Resolution*.

Risposta(I), The answer in a fugue(E) بەرسڤ لە فیوگەیەکدا.

Ristretto(I), The stretto in a fugue(E) توند و بەجۆش لە فیوگەیەکدا.

Ristringendo(I), Quickening(E) پەلەیی.

Risuonanza(I), Resonance(E) زرنگانەوە.

Risvegliato(I), Animated(E) هانداو، چالاک.

Ritardando(I), Gradual change of tempo(E) گۆڕینی تیمپۆ هێدی هێدی،

Ritard(I), The gradual diminishing of speed(E) کەمکردنەوەی خێرایی بە هێدی هێدی.

Ritenuto(I), Suddenly slower(E) هێواشبوونەوەی کتووپڕ، *.Rit*کورتکراوەیەتی. هەندێکجار لەباتی*Ritardando*بەکاردەهێنرێت.

Ritmico(I), Rhythmic(E) ڕزمی.

Ritornel(E), Ritournelle(F), Ritornello(I), Ritornell(G) ڕیتۆنێل، پارچەیەک یاخود بەشێک کە بۆی بگەڕێیتەوە، پاساو*Passage*ێکی کۆنسێرتۆ کە ژەنیارێک تێیدا بێدەنگ دەبێت، بەشێکی داخراوی لە مادریگاڵی ئیتالیایی لە سەتەی چواردەمدا، ناوی هێمای گەڕانەوە.

Ritorno(I), Return(E), Retour(F) ڕیتۆرنۆ، گەڕانەوە.

Riverso(I), Reversed(E) بڕوانە/*Retrograde*.

Rivolgimento(I) هەڵگەڕانەوەی پارچەکان لە دەبڵ کۆنتراپونت/دا.

Rivoltato(I), Inverted(E) هەڵگەڕاو.

Rivolto(I), Inversion(E) هەڵگەڕانەوە.

Ro(Kr) ڕۆ، ئاوازی ماتەمینی و شینوشەپۆڕ. وشەیەکی زۆر دێرینی سانسکریتی/کوردییە کە گوزارە لە لاواندنەوەی کەسێک دەکات کە جەستەی بە خاک سپاردبێت و لە جیهان ڕۆیی بێت، واتە ژیانی دونیایی بەجێهێشتبێت و بۆ ئەو دونیا ڕۆیی بێت ئەویش بە ڕێخستنی چەند بەیتێک{مەبەست لە بەیت لێرەدا ئاوازە بە هەڵبەستەوە}و دەربڕینی بە چەشنی هەی ڕۆ...هەی ڕۆ یاخود هەر چەشنێکیتر کە وشەی ڕۆ/ی تیادابێت.

Robusto(I), Robust, Strongly voice(E) نێرومەند، دەنگی زوڵاڵ.

Rock and Roll(E) ڕۆکاندرۆڵ، مۆزیکێکی میللی ئامریکاییە کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیک سالانی1950ز، چەشنە بڵندڕەزمێکی بلووزە*Blues* کە هەندێک دانراوەی لە دوانزە باڕ بلووز پێکهاتووە. زۆری ئامێرەکانی کارەبایی و دەنگ زۆر بەرزن{ وەک ئامێری گیتار، ساکسۆفۆن، پیانۆ و باس...}. وەک زاراوەیەکی مۆزیک بەمانای دەنگێگی زۆر بەرزی لەرزێنەر و خۆسووڕێنەر دێت، چەشنە مۆزیکێکە کە لەتاو دەنکەگەی مرۆڤ دەهێنێتە سەما و خۆڕاوەشان.

Roco(I), Raucous(E) دەنگێکی زبر و زۆر بەرز.

Rococo(F), Rokoko(G) ڕۆکۆکۆ، چەشنە مۆزیکێکی ڕەنگینی زەخرەفێنراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی1725-1775زی سەتەی هەڤدەم، ڕەوشی ئەم چەشنە مۆزیکە ناسراوە بەوەی زیاتر چەشنە مۆزیکی باڕۆک سادەیی پێوەدیارە.

Rohr, Rohrblatt(G), Reed(E) زمانەی ئامێرە هەواییەکانی لە قامیش سازکراو.

Röhrenglocken(G), Tubular bells(E) زەنگەلوولەییەکان.

Rohrflöte(G), Reed-flute(E) فلووتی زمانەدار لە ئۆرگنی لوولەداخراودا*Organ stop*.

Roll(E), Roulons(F), Ruolo(I) ڕۆڵ، زنجیرەیەک لە فرەلێدانێکی زۆر خێرای تەپڵ بە شێوەیەکی وەها کە وەکو دەنگێکی هەمیشە بەردەوام بێتە بەرگوێ.

,Rollo(I), Roulement de tambour(F), Drum-roll(E) ڕۆڵەدرەم، ڕۆڵەتەپڵ.

Roll trommel(G), Rullante tamburo(I), Tenor drum(E) تینۆرە تەپڵ.

Roma music, Gypsy music(E) ڕۆما مۆزیک، مۆزیکی قەرەچ.

Roman numerals(E) نمره ڕۆمانیه‌کان، بۆ نموونه:ـ له حه‌وت کۆردی دیاتۆنیک ســیانیی

له‌ســه‌ر ســکێڵێکی دۆ ـ مێجه‌ر*C-major*دا

C: I ii iii IV V vi vii

به‌م چه‌شنه نمایانده‌کرێت.

Romance(E,F), Romanza(I), Romanze(G) ڕۆمانس، سترانێکی میللی ئاسان

سه‌رزار و ساده که دواسه‌ته‌کانی هه‌ژده و نۆزده‌دا له فه‌ڕه‌نسا و ئیتالیا زۆر باوبووه.

Romance sans paroles(F), Song without words(E) ســترانی بێ هه‌ڵبه‌ست و وشه.

Romantic(E), Romantik(G), Romantique(F), Romanticismo(I) چه‌رخی ڕۆمانتیک،

گاهێکی مێژوویی مۆزیکه که به دوای چه‌رخی کلاسیکدا هات و نزیک ساڵانی1900ز کۆتایی پێهات.

Romantic music(E) مۆزیکی ڕۆمانتیک، مۆزیکی سه‌ته‌ی نۆزده‌م، چه‌شنه مۆزیکێکی ناسـراوبوو

به‌وه‌ی که مۆرگی ئه‌ڤینی، ڕه‌نگینی هارمۆنیانه، پڕهه‌ستونه‌ست بزوێن و نه‌ته‌وه‌یی گرتبووه‌خۆ.

Ronde, round(F), Rotondo(I), Semibreve, Whole-note(E) ڕۆنده، گرده‌نۆته،

نۆتی ته‌واو.جۆره سه‌مایه‌کی به‌جۆش و به کۆمه‌ڵی سه‌ته‌کانی هۆرێزانه*Renaissance*که له شێوه‌ی بازنه‌یی یاخود به‌ڕیز له که‌شوهه‌وایه‌کی ده‌ره‌وه‌دا به‌ئه‌نجامده‌درێت.

Rondo(I,E), Rondeau(F) ڕۆندۆ،

هه‌ڵێنحراوی وشه‌ی ڕیتۆنێللۆ*Ritornello*ی لاتینییه که به‌مانای گه‌ڕانه‌وه*Return*دێت، گه‌ڕانه‌وه بۆ ماکی ڕشــته‌*Original theme*که یاخود مۆتیف*Motif* که بریتیه له پارچه‌ی/*A*.

به‌گشتی...ڕۆندۆ، فۆرمێکی مۆزیکی چه‌ند پارچه‌جیاوازی ڕیزبه‌نده به تێمپۆیه‌کی به‌جۆش *lively tempo* له‌ســه‌ر ڕه‌وتی*A-B-A-C-A-D-A*که یه‌که‌م به‌شی یاخود سه‌ره‌کی له‌نێوان به‌شه لاوێزه‌کاندا*Subsidiary* دووباره‌ده‌کرێته‌وه و ته‌واو بوونیشی هه‌ر به‌هه‌مان پارچه. ئه‌م فۆرمه له زۆر کاری مۆزیکیدا ڕه‌چاوده‌کرێت، بۆ نموونه:چواره‌م جووڵه له زۆربه‌ی کلاسیک مۆزیکه‌کان و سێیه‌م جووڵه‌ی کۆنسێرت و سۆناتاکان به ڕۆندۆ کۆتاییان پێده‌هێنرێن. مێژووی ئه‌م فۆرمه‌یش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ســه‌ته‌کانی ناوه‌ڕاســت و له نزیک سه‌ته‌ی هه‌ژده‌میشدا بوژێنرایه‌وه و ئاخنرایه کۆتایی هه‌ندێک ســیمفۆنی و سۆناتا و جاروباریش وه‌ک پارچه مۆزیکێکی سه‌ربه‌خۆ پێشکه‌شده‌کرا. وه‌ک فۆرمی ئامێراڵی*Instrumental form*، به‌زۆریش تێمپۆیه‌کی به‌جۆشی هاویاره.

Root(E), Rave(F), Radice(I) ڕه‌گ، بناخه نۆته، له کۆرد*Chord*دا نۆته




نزمترین شوێنی ده‌بێت و به یه‌که‌م نۆته‌یش.داده‌نرێت له سکێڵێکدا

Rosin, Resin(E), Résine(I) ڕۆسین، چۆک، مادده‌یه‌کی پاکژی ڕاتینجه{که‌تیره‌یی}

له مادده‌ی ترپێنتاین*Turpentine* که بۆ مووی که‌وانی ئامێره ژێداره‌کان به‌کارده‌هێنرێت بۆئه‌وه‌ی خشـاندن و به‌رکه‌وتنێکی ته‌واو له‌نێوان ژێ و مووه‌که‌دا بدات و به له‌رینه‌وه‌ی ده‌نگێکی خۆش بسـازێت. بێ ئه‌و مادده‌یه ده‌نگ له‌رینه‌وه وه‌ک پێویســت ناسـازێت.

Rota(L), Round, Wheel, Hurdy-gurdy(E) پێچکه، خڕ، ئامێری هوردی ـ گوردی.

Rotar valve(E) بڕوانه/*Valve*.

Rote, Rotte(E) ڕێگەی فێرکردن بە لاسـاییکردن. ئامێری کروت*Crwth*، لیرا*Lyre*.

Rotondo(I), Round, Full note, Rounded note(E) تۆنی تەواو، گردەنۆتە.

Round(E) کورتە کانون ئاوازێکی بەردەوام کە هەموو دەنگەکان لە هەمان پەردە*pitch*دا یاخود ئۆکتاڤێکدا دەوترێت.

Rounded binary(E) دووانی سـووڕخواردوو، شـێوەیەکی دانراو لە دوو بەش کە دووەمیان بە گەڕانەوە بۆ یەکەم کۆتایی پێـبێت، هەر بەشـەیـش تیایدا ڕەپاتبوونەوەیە.

Rovesciamento, Rovescio(I), Reversion€ پێچەوانە، جووڵەی پێچەوانە بەرەو دواوە، هەندێکجار لە بە مانای گەڕانەوە *Retrograde*دێت. هەڵگەڕاوە لە کۆرد و میانەکاندا.

Rubato(I), Robbed(E) تێمپۆی ئازاد دیاریکراو لە پارچە مۆزیکێکدا.

Rückung(G) بڕوانە/*Syncopation*.

Rudement(F), Roughly(E) بە زبری.

Ruff(E) سـێ لێدانی خێرا بەر لە یەکەم لێدانی سەرەکی کە جۆرە پیاکێشانێکی تەپڵ ژەنینە.

Ruhe(G), Peace(E) ئاشـتی، ئارام، ئاسـوودە.

Ruhepunkt(G) بڕوانە/*Fermata*.

Ruhig(G), Calm, Peaceful(E) ئاسـوودەیی، هێوری.

Russian bassoon, Upright serpent(E) ئامێری باسـسـوونی ڕوسیایی،. ئامێری سـەرپێنت/ی وەستاو

-----------------------------------
----------------------
------------

# S











Serpent سێرپێنت


Saxophone ساکسۆفۆن

# S

دەنگەنازکەکان کە بزردەبن....لە بیرەوەریدا دەزرنگێنەوە!!!!

شیللی

---

S | *Soprano, Solo, Segno, Sordino*/کورتەی

Sacbut, Sagbut(S), Saquebute(F), Pull-Tube, Sackbut(E) | ساکبوت. ناوی کۆنەئامێری ترۆمبۆن لە سـەتەی چواردەمدا.

Saccadé(F), Sharply accented(E) | ئاکسنتی تیژ، هەنکێکی توند.

Sackpfeife(G), Bagpipe(E) | مەشکەنای.

Sacoche(F), Bag(E) | مەشکە، کیسە، کوننە.

Sacred music(E) | مۆزیکی ئایینی{تایبەت بە کڵێسەی کاتۆلیک}.

Sacré(F), Sacred(E), Sacro(I) | سـپەنتا، ئایینی زۆر پیرۆز.

Saddle, Sillet(F), Nut(E), Sattel(G) | ژێدان، کەمەی ژێ، ئەو پارچەچیلکەیەی کە لە کۆتایی دەستەکی کەمانچە{کلکە کەمانچە}دەچەسـپێنرێت و ژێیەکانی بەسـەردا دەبرێن و دەنیشێنرێن و ئینجا بەهۆی برغوەکانیەوە بادەدرێن و توونددەکرێن.

Saite(G), String(E) | ژێ، تەل، تار، سیم، ژێی مۆزیک ئامێرەکان، وەکی دەوترێت ژێی سـۆڵ.

Saiten instrumente(G), String instrument(E) | ژێی ئامێرەکان.

Sajat(E) | سەنجۆکە، گچکە سیمباڵ، سەنجی بچووک کە بخرێتە نێوان پەنجەکانەوە بۆ لێدان.

Salicional, Salicet(F), Willow(E) | سالیسێت، لوولەداخراوێکی کانزایی/یە هەشت پێ/ییە8-foot لە ئامێری ئۆرگندا، دەنگێکی زۆر خۆشی لێوە دەردەچێت، جۆرێکی تری هەیە بەدرێژی چوار پێ4-foot. وشەکە لە سالیکس*Salix*ی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بەمانای چنار دێت یاخود شتێکی دروستکراو لە دارەچنار، بەمانای هەڵلاجیکردنیش دێت، کاتێک کە هەلاج بە لورکەکەی لە ژێ/یەکە دەدات ونگەونگی لێوەدەردەچێت.

Salle de concert(F), Concert hall(E) | کۆنسێرتی هۆڵ.

Salmo(I) | بڕوانە/*Psalm*.

Salphinx, Salpinx(Gr), Ancient Greek trumpet(E) | سالفینکس، کۆنەئامێری ترۆمپێتی یۆنانییە کە لە برونس دروستکراوە، پێدەچێت لە بۆنە و ئاهەنگدا بەکارهێنرابێت.

Saltando, Spiccato(I), Sautillé(F) | ژەنین بە کەوان بە شێوازێکی بەجۆش و دلگیر.

Saltarello(I) | سـەمایەکی ئیتالیایی خێرایە لەسەر کێشی6/8.

Saltato(I), Dancing(E) سـەماکردن.

Salteretto(I) پێچوونیرەزمە دێڕێکی سێ نۆتە بەڕێژەی 3:1:2

Salto(I), Leap, Jump(E), Sauter(F) بازدان.

Samba(E) سامبا، سـەمایەکی زۆر باوی گەلانی وڵاتی بەرازیلی/یە بە کێشی2/4.
بەڵام هەر بارێکی لە سێ هەنگاو پێکهاتووە و وا لە سـەماکە دەکات کە کێشی 3/4وەربگرێت.

Samisen, Sanshin, Shamisen(E) سامیسن، ئامێرێکی ژاپۆنی/یە سێ ژێی لەسەر دەبەسترێت، تاڕادەیەک بە ئامێری ڕەباب دەچێت.

Sammlung(G), Collection(E) کۆکردنەوە.

Sampogna(I), Bagpipe(E) مەشکەنای.

Sämtlich(G), Complete, Collected(E), Compléter(F) تەواو، دروست، کۆبەندە.

Sanayi(Hn), Shawm(E) شـانەی، زڕنای هیندستانی.

Sandpaper block(E) بلۆکەسـمارتە، دوو بلۆکەتەختە کە ڕووپەری هەر لایەکیان پەڕەسمارتەی بەسەردا چەسپێنراوە، کاتێک کە هەردوو ڕووپەرەکە دەخشێنرێت بەیەکدا خشەی لێوە دەردەچێت.

Sanduri(Gr), Zither(E) ئامێری زیتار.

Sanft(G), Soft, Gentle(E) نەرمونیان.

Sanftmütig(G), Gently(E) بە نەرمونیانی.

Sangle(F), Strap(E) سـەنگڵ، پشتێنی سەرشان بۆ ئەو ئامێرانەی پێویستیان بە هەڵگرتنە.

Sanpi(Ch), Chinese flute(E) فلووتی چینی.

Sans(F), Without(E) بەبێ.

Sans accompagnement(F), Unaccompanied(E) بەبێ هاویار.

San pédale(F), Without pedal(E) بێ پێداڵ، بێ پایدەر.

Saptak(Hn), Scale(E) سـاپتاک، سـکێڵ.

Sarabanda(I), Sarabande(F), Zarabandas(S) سەمایەکی ئیسپانی/یە بەکێشی خاوی 3/4 و بە ئاکسنتی دووەم لێدان*Second beat*. بۆ یەکەم جار کە ئاماژەی پێدرا دەگەڕێتەوە بۆساڵانی 1539ز لە ناوەڕاستی ئامریکا کە لە نووسراوی نووسەری پانامایی*Panama*فێرناندۆ گوزمان مێکسیا*F. G. Mixia*کە بەناوی زارابەندا*Zarabanda*هاتووە، نزیک ساڵانی1583ز داگیرکەرانی ئیسپانیایی دەگەنە وڵاتانی لاتین ئامریکا و دەکەونە تاڵانکردنیان. لەوانەی کە دەکەوێتە بەر ئەو تاڵانکردنە ئەو سەمای زارابەندە/یە کە دەیگوێزنەوە بۆ ئیسپانیا و بەسەرانسەری ئاورووپادا بەناوی سارابەند بڵاودەبێتەوە.

Sarangi(Hn) ئامێری کەمانچەی هیندستانی/یە،کە چوار ژێی لەسەر بەستراوە.
وشەیەکی لێکدراوە لە *Sau* و *Rangi* کە بە مانای سەد ڕەنگ دێت.

Sargam(Hn) سـارگام، بڕوانە/ *Hindustani music*.

Sarod(Hn) سارود. ئامێرێکی چوار ژێ/یە، باس ڕەباب.

Sats(G), Movement, Subject, Style, Phrase(E) چەشن، جوولان، بابەت، ڕێسا، ڕستە.

Saut(F), Sbalzo, Sbaltzato(I), Skip, Jump(E) هەڵبەزین بە هەردوو پێ و دابەزین لە هەمان جێ. زاراوەیەکە بۆ سەمای باللێت*Ballet*بەکاردێت.

Savart(F) ساڤارت، سیستەمێکی لۆگاریتم پێوانەییە بۆ میانەمۆزیکیەکان کە نزیکەی ساڵی1819ز لەلایەن فیزیکزان و مۆزیکزانی فەڕەنسایی فێلیکس ساڤارت *Felix Savart*(1791-1841)وە داهێنرا، لۆگاریتم میانەی دوو نۆتە دەکاتە1/1000. بەپێی ئەم ڕێسایە دەبێت ئۆکتاڤێک پێکبێت لە301.03ساڤارت. جیاوازی نێوان پەردەیەکی گەورە{9/8} و پەردەیەکی بچووک{10/9}یەکسانە بە پێنج ساڤارت کە دەکاتە یەک کۆما*Comma*.

Saw(E) هەڕە، مشار.

Saxhorn(E) ساکسهۆڕن، ئامێرێکی هەوایی سەربە خێزانی ئامێرەبراسیەکانە، ساڵی1840ز لەلایەن کارسازی بەلچیکایی ئانتۆنی جۆزێف ئۆدۆڵف ساکس{1814-1894ز}/ەوە داهێنرا، سێ تا پێنج دەمەوانە*Valve*ی بۆ دەنگ هەیە. ئەم ئامێرەیش هەر بەناوی خۆیەیەوە خێزانێکی پێکهێناوە.

| ئامێرەکانی سەربە خێزانی ساکسهۆڕن<br>The instruments of Saxhorn family | |
|---|---|
| Soprano cornet | E flat |
| Cornet | B flat |
| Flugel or Contralto horn | B flat |
| Tenor horn | E flat |
| Baritone | B flat |
| Euphonium | E flat |
| Bb bass | B flat |
| Eb bass | E flat |
| BBb bass | B flat |
| EEb bass | E flat |

Saxophone(E), Sassofone, Saxofonia(I), Saxofon(G) ساکسۆفۆن، نزیک ساڵی1841ز بۆ یەکەمجار کارسازی بەلچیکایی ئانتۆنی جۆزێف ئۆدۆڵف ساکس ئەو ئامێرەی خستە پێشانگاکەیەوە بۆئەوەی بکەوێتە بەرچاوی خەڵک، هەر بەناوی خۆیشیەوە ئەم ئامێرە کەوتە بەردەستی ژەنیارانەوە. ئامێرێکی هەوایی براسیی ڕیشەدارە کە جۆرەکانی بریتین لە:ـ

*Sopranino, Soprano, Alto, Tenor, Baritone, Bass and Contrabass*

Saxophone quartet(E) چوارساکسۆفۆنی، تیپێکی چوار ساکسۆفۆنژەن کە پێکهاتووە لە:ـ*Soprano, Alto, Tenor, Baritone*.

Saz(Kr) ساز{بەمانای نەغمە دێت}، کۆک. ئامێرژێدارێکی زۆر دێرین و میللی و زۆر باوی نێو کوردەوارییە. ژێ/یەکانی جووت تەلن کە دوو یاخود سێ ژێ/ی لەسەر بەستراوە. لە کاریگەری بۆ سەر دڵ و دەروونی کۆمەڵگای کوردەواری بە ئامێری لیرا/ی یۆنانی بچێت.

Sazgar(Ar,Kr) سـازگار. لێڕشتەیەکی سەربە دەسـگای ڕاسـتە کە پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا.




Sbarra(I), Bar-line(E) هێڵەباڕ.

Sbarra doppia(I), Double bar(E) دەبڵ باڕ.

Sbuffando(I), With anger(E) بە تووڕەیی.

Scagnello(I), Bridge(E) پێڵ، پردی ئامێرە ژێدارەکان.

Scala alterata(I), Altered scale(E) سـکێڵی گۆڕاو.



Scala aumentata(I), Augemented scale(E) زێدە سـکێڵ.



Scala cinese(I), Chinese scale(E) سـکێڵی چینی.



Scala Cromatica(I) بڕوانە/*Chromatic scale*

Scala diminuita(I), Diminished(Octatonic) scale(E) گەستووە سکێڵ/سکێڵی هەشت تۆن.



Scala enigmatica(I), Enigmatic scale(E) سـکێڵی شاراوە. سکێڵێکی تایبەتە و بۆ یەکەمجار ساڵی1897ز لەلایەن مۆزیکزان گیوسپی ڤێردی(1813-1901)*G.verdi* وە داهێنرا.



Scala estonale(I), Whole tone scale(E) سـکێڵی تۆن تەواو.



Scala orientale(I), Oriental scale(E) سـکێڵی خاوەری{خۆرەلاتی}.



**ســکێڵ. مەودای پێوان.** Scale(E), Scala(I), Gamme(F), Tonleiter(G),Saptak(Hn)

**وشـەی سـکێڵ یاخود پێوانگ وەک زاراوەیەک لە هونەری مۆزیکدا....بریتیە لە ڕیزبەندی کۆمەڵە نۆتەیەک کە بەشـێوەیەکی ڕێســا بەرز و نزمدەکرێتەوە. لەنێوان هەر دوو نۆتەیەکی دراوســێیشدا بوارێکی پێوراو هەیە پێیدەوترێت میانە***Interval***. بۆ نموونە ئەگەر بە هەر نۆتەیەک دەستـپێبکرێت و بە هەمان نۆتەیش کۆتایی پێـبهێنرێت کە دەکاتە هەشــت تۆن پێیـدەوترێت ئۆکتاڤ***Octave*** **واتە دوو میانە نیوپەردە و پێنج میانە پەردەی تەواو**T-T-S-T-T-T-S-T.

**جیاوازی لە نێوان سـکێڵ و دەسـگا***Mode* **لەوەدایە کە ســکێڵ پەردەی سـەرەتا{یاخود پایەتۆن***Tonic***}ی نیە. دەشێت تاکە سـکێڵێک چەند دەسگایەکی جیاواز لەخۆبگرێت کە ئەویش دەکەوێتەسـەر ئەو نۆتانەی کە وەک پایەتۆن***Tonic* **بۆی هەڵدبژێردرێت.**

**لە ســکێڵێکی مۆزیکدا ســێ فەرمان***Function***ی ســەرەکی ڕۆڵ دەگێڕێت، ئەویش:ـ**

1. **ڕۆڵگێڕانی وەک ژێدەرێکی میلۆدی***Melodic resource* .
2. **ڕۆڵگێڕانی وەک ژێدەرێکی هارمۆنی***Harmonic resource* .
3. **لە ڕووی تۆناڵی***Tonally***یەوە ڕۆڵێکی کارا و کاریگەر***Effective***ی هەبێت.**

**لەوانەیشە پرسیاری ئەوە بکرێت بۆچی بۆچی ســکێڵی مۆزیک دوانزە تۆنە؟ بۆچی زیاتر و کەمتر نیە؟**

**بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بزانین...بایەتە ئاوڕێک لە ئامێری پیانۆ بدەینەوە و سەیری کلیلە ڕەش و سـپیەکانی بکەین ڕاستی ئەو دوانزە تۆنانەمان بۆ دەردەکەوێت.**

**ئەگەر لە دیدەیەکی فیزیکانەوە ئەم دیاردەیە شیـبکەینەوە دەردەکەوێت کە نۆتەی پەردەیەک یاخود بلێین فریکوێنسییەک بە بازنە لە چرکەیەدا** *Cycles/second* **دەپێورێت واتە ئەگەر بۆ نموونە تۆنی لا/**A**وەربگرین پێوانەی دەکاتە** 440**زرنگە لە چرکەیەکدا{440Hz/sec}. مەودای نێوان دوو نۆتە کە بەپێـی ڕێژەی پەردەکانیان دەپێورێت پێیدەوترێت میانە***Intrval***. ئەگەر ڕێژە میانەی دوو نۆتە بریتی بێت لە تەواوکەرە بچووکەکان***Small integers***{وەک: 2/1, 3/2, 4/3}ئەوا پێکەوە دەنگی باشیان دەبێت و زیاتریش هاوساز***Consonant* **دەبن لەوەی ناهاوساز***Dissonant***بن.**

**ئەو میانە پوختانە**(سروشت)*Pure niterval***ی کە بچووکترن یاخود یەکسانن بۆ ئۆکتاڤێک و بە هاوساز دادەنرێن ئەمانەن:ـ**

a. 2/1 **ـ ڕێژەی ئۆکتاڤێک.**

b. 3/2 **ـ ڕێژەی پێنجەمی تەواو***Perfect fifth*.

c. 4/3 **ـ ڕێژەی چوارەمی تەواو** *Perfect fourth* **کە دەکاتە هەڵگەڕاوەی هارمۆنی**3/2.

d. 5/4 **ـ ڕێژەی مێیجەری ســێیەم***Major third*.

e. 6/5 **ـ ڕێژەی ماینەری ســێیەم***Minor third*.

f. 5/3 **ـ ڕێژەی مێیجەری شـەشـەم***Major sixth***کە دەکاتە هەڵگەڕاوەی هارمۆنی**6/5.

g. 8/5 **ـ ڕێژەی ماینەری شـەشـەم***Minor sixth***کە دەکاتە هەڵگەڕاوەی هارمۆنی**5/4.

**هەر وەکو باوە....سـکێڵ**_Scale_ **لە پلەتۆنی نزمەوە بۆ بەرز ڕیزبەند دەکرێت بەڵام دەشێت لە تۆنی بەرزیشەوە بۆ نزم ڕیزبەندبکرێت. دەشێت هەر ئەو سـکێڵەیش لە هەر ئۆکتاڤێکدا ڕەپاتـبکرێتەوە. هەروەها دەکرێت ڕەپاتکردنەوەی ئۆکتاڤ وەک بازنەیەکی ڕێکخراو لە پەردەپۆلەکاندا** _Pitch classes_**پیشـانبدرێت ئەویش بە زێدەکردن و کەمکردنی پەردەپۆلە ڕیزبەندەکان.**

**وەک لەم نموونەیەدا کە بازنەی دۆ مێجەر/**C-major **بەم شێوەیە ڕیزبەندە:ـ**

.C-D-E-F-G-A-B-[C

**تاک سـکێڵ**_Single scale_**بە ڕوونی لە چەند پەردە ئاسـت**_Pitch level_**ێکـی جیاوازدا دەردەکەوێت، بۆ نموونە دەشـێت سـکێڵی دۆ/**C **لە پەردە ئاسـتی دۆ/**C4**دا دەسـپێبکات، هەروەها لە ئۆکتاڤ بەرزبوونەوەیەکیشدا لە پەردە ئاسـتی دۆ/**C4**دا دەربکەوێت. هەر ئاوایش دەشێت بەم چەشـنە دەسپێکەکان لە ئاستەکانی دۆ/**C6**، دۆ/**C7 **دەربکەون.**

**دەتوانرێت سـکێڵ بە چەند شـێوەیەک فرۆزەبکرێت**_Described_ **، لەوانەیش:ـ**

1. **بەپـێی ئەو میانە**_Interval_**یانەی کە تیایدایە. بۆ نموونە:ـ**

**سکێڵی دایاتۆنیک**_Diatonic_**، کرۆماتیک**_Chrmatic_**، تۆنی تەواو**_Whole tone_

2. **بە پـێی ژمارەی ئەو پەردەپۆلانە**_Pitch class_**ی کە تیایدایە، بۆ نموونە:ـ**

**سـکێڵی پێنجـتۆنیک**_Pentatonic_**کە سـکێڵێکی پێنج تۆنی/یە، شەشـتۆنیک**_Hexatonic_**کە سـکێڵێکی شەش تۆنی/یە، حەوتۆنیک**_Hetatonic_**کە سـکێڵێکی حەوت تۆنی/یە.**

3. **بەپـێی بەکارهێنانی لە سەردەمانی مۆزیکی بەرلەمێژوو** _Prehistoric music_**دا بە هەندێک زاراوە کە گوزارە لە چەند تۆنێک بکات، بۆ نموونە:ـ دایتۆنیک**_Ditonic_**کە مەبەست دوو تۆنی/یە، ترایتۆنیک**_Tritonic_**کە مەبەست لە سێ تۆنی/یە، چوارتۆنیک**_Tetratonic_**کە مەبەست چوار تۆنی/یە، وەهەروەها......**

4. **بەپـێی بەکارهێنانی لە جاز**_Jazz_ **و کلاسیک مۆزیکی مۆدێرن**_Modern classical music_**دا، بۆ نموونە:ـ سـکێڵی ئۆکتاتۆنیک**_Octatonic_**کە هەشت تۆنی/یە.**

**سیلابەکانی سـکێڵ، مەبەست لە ناوەکانێتی بە دۆ، ڕێ، می، فا، سۆڵ، لا، سی.** Scale Syllables(E)

**بەگشتی/یش....دوو جۆر سـکێڵ هەیە:ـ**

1. **سـکێڵ کرۆماتیکی هەڵبەزیو**_Chromatic scale ascending_**، واتە ڕیزبەندی تۆنەکان بەرەو ژوور بە شێوەیەکی کرۆماتیکانە.**

Scale Syllables سیلابەکانی سـکێڵ

Chromatic Scale Ascending

| | C | C# | D | D# | E | F | F# | G | G# | A | A# | B | C |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Italian | do | di | re | ri | mi | fa | fi | sol | si | la | li | ti | do |
| English | do | di | re | ri | mi | fa | fi | sol | si | la | li | ti | do |
| French | do | di | ré | ri | mi | fa | fi | sol | si | la | li | ti | do |
| German | do | di | re | ri | mi | fa | fi | sol | si | la | li | ti | do |

2. سـكێڵ كرۆماتيكى دابەزيو*Chromatic scale descending*، واتە ڕيزبەندى تۆنەكان بەرەو خوار بە شێوەيەكى كرۆماتيكانە.

Scale Syllables سـيلابەكانى سـكێڵ

Chromatic Scale Descending

| | C | B | Bb | A | Ab | G | Gb | F | E | Eb | D | Db | C |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Italian | do | ti | te | la | le | sol | se | fa | mi | me | re | ra | do |
| English | do | ti | te | la | le | sol | se | fa | mi | me | re | ra | do |
| French | do | ti | te | la | le | sol | se | fa | mi | me | ré | ra | do |
| German | do | ti | te | la | le | sol | se | fa | mi | me | re | ra | do |

Scale-tone triads(E) سـكێڵى تۆنەـ سـيانييەكان، سـێ نۆتە كە هەر يەكە لە پلەى سكێڵێكدا، سـكێڵى تۆنەـ سـيانييەكان لە كليلێكى مێجەردا بريتين لە:ـ

*I(Maj), ii(m), iii(m), IV(Maj), V(Maj), vi(m), vii(diminished)*

Scandicus(Gr) بڕوانە/*Neume Notation*.

Scemando, Diminuendo(I), Dimnished(E) گەسـتن، كەمكردنەوە،كەستن.

Scena(I), Scène(F), Scene, Stage(E) ديمەن، پەردە، شـانۆ، بەشـێك لە شـانۆگەريى ياخود ئاوازێكى ئۆپێراڵى سـەربەخۆ.

Schäferlied(G), Shepherd´s song(E) سـترانى شـوان.

Schäferpfeife(G), Shepherd´s pipe(E) بلوێرى شـوان.

Schäfertanz(G), Shepherd´s dance(E) سـەماى شـوان.

Schalmei, Schalmey(G) شالمەى، لوولە داخراوێكى زمانەدارە لە ئامێرى ئۆرگنـدا بەدرێژى*18ft, 8ft, 4ft*. سـوڕناى سـەردەمى ناوەڕاست، هۆڕنى سـيگناڵ.

Scharf(G), Sharply, Preciesly(E) بە شـێويەكى تيژ، بەتەواوى.

Schärfe(G), Sharpness(E) تيژيى.

Schauerig(G), Gastly(E) بەسـام و ترس.

Schauspieler(G), Actor(E) ئەكتەر، نوێنەر.

Scheithholt(G) سـەنتوورى ئەڵەمانيايى لە سـەردەمێكى پێشوودا، زيتار/*Zither*.

Schelle(G), Bell(E) ئامێرى زەنگ.

Schellentrommel(G), Tambourine(E) ئامێرى تامبوورين.

Scherz(G), Scherzo(I), Fun, Joke(E) شـۆخى،گاڵتە. بەگشتى پارچەيەكە جووڵەيەكى بژێوى لەخۆگرتوە. ئەم جووڵەيە لەلايەن مۆزيكزان هايدن*Haydn*پەرەپێدرا و بەدوايدا مۆزارت و بەتايبەتى بێتهۆڤن/يش لە مينوێتە سـيمفۆنى*Symphonic minuet*دا.جووڵەيەكە لە سـيمفۆنى و سـۆناتا/يەكدا، ياخود خێرا تێمپۆيەكى3/4 لە شـێوەى A-A-B-A و بەشى B بە تريۆ*Trio*ناوببرێت.

چوارینەیەک لەم شـێوە هونەریە لە کۆتاییەکانی سـەدەی هەژدەم لە سـۆناتا و سـیمفۆنی و مینوێتMenuetو باللێتBalletدا بە کێشی 3/4 وەدەرکەوت.
لە مینوێت/دا بە فۆرمی A-B-A لە هەندێک سیمفۆنیای بیتهۆڤن/دا وەبەرچاودەکەوێت.

Scherzando, Scherzante(I), Jokingly(E) بە خۆشـی و شـۆخیەوە، .Scherz کورتەیەتی.

Scherzetto(I), Little scherzo(E) گاڵتۆکە، گچکە شۆخی.

Scherzevomente, Scherzosamente(I), Playfuly(E) بە گەمە و شـۆخییەوە.

Scherzoso(I), Playful(E) بەخۆشـی و خەندەییەوە.

Schiettamente(I), Sincere, Plain in sense(E) بە هەستێکی سـادە.

Schietto(I),Schlicht(G),Simple, Plain(E) سـادە.

Schifferklavier(G), Piano accordion(E) پیانۆ ئەکۆردیۆن.

Schisma(G), Split, Very small interval(E) شـیزما،
ڕیشەوشەیەکی یۆنانییە بە مانای پارچەکردنSplitدێت، واتە پلەGradکە وەک دوانزە ڕەگی کۆمای فیساگۆریی پێناسەدەکرێت. لەم پێناسەوەڕا دەشێت بووترێت کە شیزماSchisma میانەیەکی زۆر بچووکە لە ئەنجامی ڕێژەیەک لەنێوان کۆمای فیسـاگۆرییPythagorean commaو کۆمای سـینتۆنیSyntonic comma بەبڕی32805/32768پەیدادەبێت کە یەکسانە بە1.9537 Cents.
یاخود دەشێت جیاوازیەکە لەنێوان هەشت پێنجەمی تەواو+ مێجەر سێیەمی تەواو و پێنج ئۆکتاڤ.
هەروەها جیاوازیەکە لەنێوان کۆمای سینتۆنی و دیاشـیزماDiaschisma.

Schlacht(G), Battle(E) جەنگ،کارزار، پێکادان.

Schlag(G), Stroke, Beat, Pulsation(E) لێدان، پیاکێشـان، ترپە.

Schlagfell(G), Drum skin(E) چەرمە تەپڵ.

Schlaginstruments(G), Percussion instruments(E) ئامێرە نەگرەییەکان.

Schlagzeuger(G), Drummer, Percussionist(E) تەپڵژەن، نەگرەژەن.

Schlagzither(G), Plucked zither(E) مۆدێرنە زیتار.

Schlagenbass(G), Serpent(E) ئامێری سـێرپێنت.

Scheifer(G), Coulé(F) ئۆرنامێنتOrnamentێک میانەی دوو نۆتە پڕبکاتەوە.

Schleppend(G), Strascinando(I), Gragging(E) پیاڕابووردن، ڕاکێشـان.

Schleunig(G), Prompt(E) گورج.

Schlitztrommel(G), Slit drum(E) تەپڵی لوولەیی دروستکراو لە لقی دار
کە داهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخە هەرە دێرینەکان.

Schlummerlied(G), Slumber song(E) سـترانی لایەلایە، لۆرین.

Schluss(G), End, Conclusion, Cadence, Close(E) پایان، ئەنجام، کادەنـس، بەسـتە.

Schlüssel(G), Clef(E) کلیل.

Schlüssfall(G), Cadence(E) کادەنـس.

Schlüsskadenz(G), Harmonic cadence(E) هارمۆنیک کادەنس.

Schlüss satz(G), Finale(F), Coda(I), Tail(E) ئەنجام، دوایی، کۆتا.

Schlüsszeichen(G), Double bar(E) دەبڵ بارِ، لەکاتی تەواوبووندا ئاماژەی پێدەکرێت.




Schmeichelnd(G), Lusingando(I), Lyrical, Flattering(E) ئەوینیی، دڵکەشی.

Schmerz(G), Pain, Sorrow(E) ئازار، مەخابن.

Schmerzhaft, Schmerzlich(G), Painful, Sorrowful(E) ئازارناک، خەمبار.

Schmetternd(G), Blaring(in horn playing)(E) بووق لێدان بەدەنگێکی بالا.

Schnabel(G), Beak, Mouthpiece(E) پیک، ئەو شـوێنەی دەخرێتە ناو دەمەوە بۆ فووپیاکردن وەک ئامێری کلارِنێت.

Schnabelflöte(G), Beak-flute(E) پیک فلووت.

Schnarre(G), Rattle, Snare drum(E) ئامێرە خرنگەکان، گچکەتەپلی یەکلا پێست.

Schnarrsae(G), Snare(E) بەن، ئەو پتەی دەوروبەری پێستی پێدەبەسترێت بۆ دروستکردنی تەپڵ.

Schneke(G), Snail, Scroll(E) سـکرِۆڵ، کلکە کەمانچە، دوادەستەکی کەمانچە کە شـێوەیەکی پێچاوپێچی هەیە و تەلەکانی لێـدەبەسترێت.

Schnell(G), Allegro(I), Fast, Rapid, Quick(E) خێرا، پەلە.

Schneller Werden(G), Accelerando(I), Acceleration(E) ئاکسیلێراندۆ، پەلە.

Schnelligkeit(G), Speed(E) دەو، خێرا.

Schofar, Shofar(E) شــۆفار، شــەیپوور.

Schon(G), Already(E) زووتر.

Schöner gesang(G) برِوانە/*Bel canto*.

Schrammel chromatic accordion(E) لای رِاستی ئۆکۆردیۆن کە کیبۆردەکەیەتی و بە دەستـەرِاست دەژەنرێت. لە سـیستەمی/*B-Griff*دا دوانزە دوگمەی باس دیاتۆنیکی لەسەرە.

Schrapen(G), To Acrape(E) دەیکرِێنێت.

Schrapinstrument(G), Scraped instrument(E) ئامێری کرِەکرِ.

Schraube(G), Screw(E) برغوو، پێچەک.

Schreibart(G), Style(E) چەشن، شـێواز، ستایل.

Schriftleiter(G), Editor(E) ئامادەکار.

Schrifteitung(G), Editorshipe(E) **ئامادەکاریی.**

Schritt(G), Step(E), Marche(F) **هەنگاو.**

Schrittmässig, Schrittweise(G), Stepwise(E), Andante(I) **بە پیاسـە، پیاسەکردن.**

Schrittweise(G), Stepwise, Conjunct movement(E) **هاوبەشەجوولە، کۆگرتە جوولە.**

Schüchtern(G), Shy(E), Ombrageux(F) **شـــەرم.**

Schulter(G), Shoulder(E) **شـــان.**

Schultergeige(G), Shoulder viola(E) **بڕوانە**/*Viola da spalla*.

Schultyerstütze(G), Shoulder rest, Chin-rest(E) **حەسانەوەی شان، حەسانەوەی چەناگە، مەبەست لەو ئامێرە ژێدارانەیە کە دەخرێنەسەر شان و بە چەناگەیش دەگیرێن، جارناجار ژەنیار پێویستی بە داگرتنی ئامێرەکەی هەیە لەسەرشانی بۆ ماوەیەکی کەم لە ژەنینێکی درێژخایان لەنێو تیپێکی مۆزیکدا.**

Schütteln(G), Secouer(F), To shake(E) **بیشەکێنێت، ڕایوەشێنێت.**

Schüttelrohr(G), Shaker(E) **ڕاوەشێن.**

Schwach(G), Weak, Soft, Faint(E) **لاواز، نەرم، بێهۆش.**

Schwammschlägel(G), Sponge(Soft)mallet(E) **دەسکێکی سـەرەتۆپ هەوری{ ئیسفەنج }، لە ئامێرە ڕەزمیەکانی وەک دەهۆڵ بۆ نەرمەلێدان بەکاردێت.**

Schwärmer, Raucher(G) **ڕاوشەر، پاسـاوێک***Passage***کە هەر نۆتەیەک یاخود هەر دوو نۆتەیەک تیایدا بە شـێوەیەکی یەکبەدوایەک چەندین جار ڕەپات بکرێتەوە.**

Schwebung(G), Difference tone, Tremulant(E) **لێدان لەنێوان دوو نۆتە و نۆتەیەکی تردا بە شـێوەیەکی سـووکی بەدەر لە تون***Tune***. تۆنی جیاواز، لەرزین.**

Schweigen(G), To be silent(E) **بێدەنگبوون.**

Schweigezeichen(G), Rest(E) **پشـــوو.**

Schwellen(G), To swell(E) **بڕوانە**/*Crescendo*، **ئاوسان، فووپیاکردن.**

Schwer(G), Ponderous, Difficult(E) **زۆر سـەنگین، سەخت و گران.**

Schwermüthig, Schwermutsvoll(G), Dejected, Heavy-hearted(E) **داهێزراو.**

Schwinded(G), Becoming quiter(E) **بڕوانە**/*Diminuendo, morendo*.

Scie Musicale(F), Usical saw(E) **مۆزیکی هەڕە{مشار}.**

Scintillante(I), Brilliant(E) **درەخشـان.**

Scioltezza(I), Freedom, Ease(E) **ئازادی، ئاسـانی.**

Sciolto(I), Free, Easy(E) **ئازاد، ئاسـان.**

Scivolando, Sdrcciolando(I), Glissando in piano playing(E) **خزاندن لە پیانۆ ژەنیندا.**

Scoperto(I), Uncovered(E) **کراوە، دانەپۆشـراو.**

Scordato(I), Out o tune(E) **لە تون بەدەر.**

**سـكۆرداچورا، لە وشـەی***Scordare***ی** Scordatura(I), Mistune(E), Altered tuning(E)
**ئیتالیاییەوە هاتووە بەمانای نەواشـێواندن***Mistune***کە مەبەسـت لە کۆککردنی تۆنی نائاسـايی ئامێرە ژێدارەکانە بۆ ڕادەی ئاسـایی کەمێک بەرزتر {وەک گیتار...}.**

**سـکۆر، دەقی نووسـینی** Score(E), Partition(F), Partitura(I), Partitur(G)
**کارنامەیەکی مۆزیک کە نۆتەمیلۆدی هەموو دەستە و ئامێری تیپێکی ئۆرکێسترای تێـیدا نۆتێنراوە.**
**دەشێت سکۆرێکی هاوچەرخ بەم شێوەیە دەسـنیشـانبکرێت:ـ**

1. **بەشـــی تەختەهەواییەکان، کە بریتین لە:ـ**
   **پیککۆلۆ***Piccolo***، فلووتەکان***Flutes***، ئۆبوا/ئینگلیزی***Oboe(Cor anglais)***، باس کلارِنێتەکان***Bass-larinets***، دەبڵ باسـسـوونەکان***Double bassoons*.
2. **بەشـی براس هەواییەکان، کە بریتین لە:ـ**
   **هۆرنەکان***Horns***، ترومپێتەکان***Trumpets***، ترۆمبۆنەکان***Trombones***، تووبا***Tuba*.
3. **بەشـی ئامێرە ڕەزمیە لێدەرەکان***Percussion***، کە بریتین لە:ـ**
   **تیمپانـی***Timpani***، تەپلـی یەکـلا***Side drum***، گەواڵ {باس ـ دەهۆڵ}***Bass drum***، سـێگۆشـە***Triangle*...**.هتد.**
4. **ئامێرەکانیـــتر، کە بریتین لە:ـ هارپ***Harp***، سـیلێستا***Celesta*.
5. **ئامێری سـۆلۆ***Solo instrument***، کە بریتین لە:ـ**
   **پیانۆ***Piano***، سـۆلۆ کەمانچە***Solo violin*...**.هتد.**
6. **دەنگی سـۆلۆ** *Solo voice* **کە بریتین لە:ـ سـۆپرانۆ***Soprano*.
7. **کۆرس***Choir(Chorus)***، کە بریتین لە:ـ**
   **سـۆپرانۆ***Soprano***، ئالتۆ***Alto***، تینۆر***Tenor***، باس***Bass*.
8. **ژێدارەکان***Strings***، کە بریتین لە:ـ**
   **یەکەم کەمانچەکان***First violins***، دووەم کەمانچەکان***Second violins***، ڤیۆلاکان***Violas***، چێللۆکان***Cellos***، کۆنتەرباس یاخود دەبڵ باسـەکان***Double basses*.

**نەخشەکێشانی سـکۆر، مەبەست لە دیاریکردنی ئامێر و دەنگەکان** Score layout(E)
**چ بە بەش و تاک، کلیل و دەنگەوار و هێڵەکان بەشـێوەیەکی هەنداز و ڕێکوپێک. بۆ نموونە دەبێت ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە زۆر لە سـەرووی دەبڵ باسـەکان بنۆتێنرێت، بەگشـتی...ئامێرە پەردە بەرزەکان لە بەشـێکی بەرزتر لە ئامێرە پەردەنزمەکان دەنۆتێنرێت.**

Scoring, Instrumentation, Orchestration(E) ئامێراندن، ئۆركێستراندن.

Scorrendo, Glissando(I), In a flowing manner(E) خلیساندن، گلیسـاندۆ، خزاندن.

Scucito, Non legato(I), Disconnected, Detached(E) نابەستوو، نابەند.

Scuotere(I), To shake(E) ڕایبوەشێنێت.

Sdegnante(I), Disdaining(E) تووڕەیی.

Se(I), If, In case, As(E) ئەگەر، لەباری، وەک.

Sea song(E) ســـترانی مەلە، لە ناوەڕاستی ســەتەی نۆزدەمەوە لەلایەن ئەمەریکایی و ئینگلیزانەوە داهێنرا کە چ بەکۆرس یاخود بەتەنیا بەئەنجاندەدرێت.

Seba(Ar,Fa,Kr,Tr) ســەبا، سیبا

لە وشەلێکدراوی سـوبح با/یە یاخود بای سـوبح کە بەمانای سـروەی بەیان دێت. بایەکی ناسـکی زۆر خۆشی هەڵکردوو کە دڵێکی پڕخەموپەژارە بەدرێژایی شــەو لە خەڵوەتی خواپەرستی یان دڵدارێک چاوەڕوانی شــنەبای بەرەبەیان بکات تاکو ئەو دڵە بەسـوێیەی ڤێنکبکاتەوە.

بە بۆچوونێکیتر...وشەلێکدراوەکە پێکهاتووە لە سۆ یاخود سو کە بەمانای خەفەت، سـووتاو و سـوێ بوونەوە دێت دواتریش وشـەی با/یە کە مەبەست هەوایەکە، بەڵام چۆن با/یەک؟ بایەکی هەڵکردوو لە دڵێکی سـووتاوی پڕلەخەم و خەفەت، هەڵاوە هەناسەیەک کە لە سـینەیەکی پڕ لە حەسرەت و گوشراو و دەروونێکی بەکوڵوە هەڵکات و بیدات بەدەم کزەبای پڕسۆز و ببێتە تیرێکی ئەوین دڵی دڵبەری پـێ بپێکێت، چەمکی وشەکە سـیوابونەوەی شەیدایان و دەروێشان دەبەخشێت.

دەشـێت سـەبا لە ڕیشەوشەی سـیوا/یشەوە هەڵێنجرابێت کە لە دواییدا زوانی فارسی کردبێتی بە سـیبا و عارەب/یش شـوێندەمی فارس کەوتبێت و پیتی س/ی کردبێتە ص و بووبێتەصبا.

لە بەشی باکووری ناوچەی ئێســتای موکریان شـوێنێک هەیە بەناوی تەختی سـلێمان{یاخو کۆشکی سـلێمان}. دەڵێن گوایە لە چەند سـاڵێکی سـەدەی سیازدەمدا فەرمانڕانێک بەناوی سـلێمان شــا دەسـەڵاتداری ئەم ناوچەیە بووە. شـاژنێکی زۆر جوان و سەلاری هەبووە بەناوی شــاژن ســیبا. سـلێمان شــا کوشکێکی زۆر جوانی لەو شـوێنەی کە ئیسـتا پێیدەڵێن شـارۆکەی شـنۆ بۆ بەرزدەکاتەوە. هەر لەوانەیە لە دیوەخانی شــا/دا کۆڕی بەزموخۆشی ســازکرابێت و لەوانەیش ئاوازیک بەناوی ئەو شــاژنەوە تاکو مەیلوخۆشەویســتی بۆ شــا ببزوێت.

لەڕووی هونەری و هەستی مۆزیکیەوە...بڕوانینە ســروشـتی ئەم ئاوازە دەسگایەکی خەمناکە، ســۆزێکی زۆر پڕ ســـوێی تیایدا هەسـتپێدەکرێت، کزەبایەکی زۆر پڕســۆزی هەیە و هەرکەسێک بیبیسـتێت دەردەکەوێت کە لە دڵودەروونێکی ســووتاوەوە کە وەختە سـوێی بێتەوە و دیمەنێک، ئیتر ئایا ئەو دیمەنە ئەڤینی بێت یاخود شـەیداییەکی دەروێشـی{ســـۆی شەیدایان و دەروێشــان}.

شـیرینە و شـیرین شـیرین گشت کەسم عیشقی تۆ داسـە تیشـەوە دەسـم

بەدەنگی:شەهابی جەزایری کرماشانی



دەســگایەکی سـەرەکییە و سـکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سەبا لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی حوسێنــی. هەروەها دوو ڕەگەزی لاوەکی پێکهاتوویش لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی چوارگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی گردان.

Seba Kurdi(Ar,Kr,Tr) ســەباکورد، لێڕشتەیەکی سەربە دەسگای کوردە کە سکێڵی پێکهاتووە لە ڕەگەزی سـەبا لەسەر دووگا، ڕەگەزی کورد لەســەر حوسـێنی.




Seba zemzem(Ar,Kr,Tr) ســەبا زەمزەم،

زەمزەمە....وشەیەکی زۆر دێرینی ئاڤێســتا/ییە بە مانای ویردی ژێرلێو دێت، نزایەکە لە دەمی ڕاوەسـتاندا بۆ نوێژ یاخود لەسـەر خوان بەنەرمە ئاوازێکی ژێرلێوی دەخوێنرێت. دەڵێن گوایە لای زاردەشــتیان وا باوبووە کە بەرلە دەسـتبردن بۆ خواردنی ســـەرخوان لەژێر لێوەوە چەند نزایەکی ناســکی نەرمئاواز دەخوێنرا بۆ پیرۆزکردنی زادەکە و پاش تەواوبوونیش نزای ســوپاســگوزاری بۆ ئاهورامزدا دەخوێنرا بۆ ئەو ڕۆز(رزق)ەی پێـی بەخشــیون. ئیســتایش لای کوردان نانی گەنم بە چاووگێکی ڕۆز دادەنرێت، زۆر پیرۆزە و گوناهە فڕێ بدرێت.

ســەبا زەمزەم، لێڕشتەیەکی سـەربە دەسـگای سـەبا/یە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سەبازەمزەم لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی حوسـێنی.
سکێڵی هاتنەخوارەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




Secco, Staccato(I), Simple, Undorned(E) ســتاکاتۆ، سـادە، بێـنەخشین.
بە ستاکاتۆ*Staccato*بچێت، ژەنینی نۆتەیەک یاخود کۆردێک و پاشان بەخێرایی لابچێت.

Sechs(G), Sei(I), Six(E) شــەش.

Sechstongruppe(G), Hexachord(E) هێکساکۆرد، شــەشــکۆرد.

Sechszehntel(G), Semicroma(I), Semiquaver(E) 1/16ی نۆتەی تەواو.

Sechszehntelpause(G), Seizième de soupir(F) Hemidemiquaver rest(E)  1/64ی وچانی تەواو.

Sechzig(G), Sixty(E) شــەسـت.

Second(E,F), Seconda(I) یەک میانە نێوان دوو پلەتۆن لە دیاتۆنیک*Diatonic*، بەشی ئاڵتۆ، بەشە دووەم لە کۆمەڵە ئامێرێکی وەک بووترێت دووەم کەمانچە لە دەستەی کەمانچەژەنان، دووەم هۆڕن لە دەستەی هۆڕنــژەنان.

Secondando(I) بڕوانە/*Colla voce*.

Secondary dominant chord(E) کۆردی زاڵی حەوتەم*Dominant 7th chord*،
کۆردێکە کە مێجەری سێیەم، پێنجەمی تەواو و ماینەری حەوتەمی تیادایە.
Secondary leading tone, Secondary leading note(E) تۆنی دوا نۆتەنما.
Secondary triad(E) دواتا سیانیی، بڕوانە/*Primary triad*.
Secondary voice or line(E), Nebenstimme(G) N⌐ دەنگی لاوەکی یاخود هێڵی لاوەکی.
Secondo volta(I), Second ending, Second-time(E) دووەم جار{باڕ*Bar*}، دوا دووەم.
Second fois(F)


شێنگ
Shêng/Hüsushêng


Sarangiسەرەنگی


سانزا
Sanza

Second crops(F), Middle joint(E) پەیوەستی ناوەڕاست.
Second dessus(F), Second treble(E) دووەمی دەنگەواری بەرز{زیل}.
Seconde(I), Sekunde(G), Second(E,F), Second interval(E) دووەم، دووەم میانە.
Second inversion(E) دووەمی هەڵگەڕاوە.
Second subject(E) دووەم بابەت، جۆرە جووڵەیەکە لە شێوەی سۆناتایە و پێکهاتووە لە دوو پارچە تۆناڵ و سێ بەشی لەخۆگرتووە کە بریتین لە:ـ
*Expostion, development, recapitulation*
Section(E), Abschnitt(G) بەش.
Seele(G), Soul, Feeling(E) ڕەوان، هەست.
Seelenvoll(G), Soulful(E) بەهەستەوە، بە گیانێکی پڕهەستەوە.

سـەفا، یەکێکە لەو ئاوازە هەرە دێرینانەی کە ئەحمەدی خانی ئاماژەی پێداوە. Sefa(Ar, Kr)
بەداخەوە ئێستا لەنێو هونەری کوردیدا نامۆیە. لێرشـتەیەکی سـەر بە دەسـگای سـەبایە، هەر هەمان سـکێڵی دەسـگای سـەبا/ی هەیە بەڵام لە پلەتۆنی موحەییەردا دەگۆڕدرێت تاکو ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی گردان ببێتە ڕەگەزی ڕاست.

سـەفەر، هەر هەمان سکێڵی دەسگای بەیاتە و Sefer(Kr)
تاڕادەیەکیش تایبەتە بە شاری سلێمانی. تایبەتمەندییەکەی تەنیا لە هۆنراوەکەیەوەڕا دەبینرێت، هەر لەبەرئەم هۆیەیشە کە بە دەسگای سەفەر ناودەبرێت، هەر لە سـەرەتادا بە ئای سـەفەر دەسپێدەکات. هۆنراوەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ شاعیرێکی ونبوو بەناوی غەریب ناوێک، گوایە بەر لە نزیکەی سـەد سـاڵێک لەمەوبەریش بە دەنگی ئەحەی ناسر هەر لە شاری سـلێمانی بیستراوە:ـ

سەفەر بۆ باوکی خۆم ناکەم
جگەرگۆشـەم بەجێ بێڵم
هەتا یادی جگەر وەستابێ
من فیکری پدەر ناکەم....

ئەگەر ئەمجار خەلاسیم دێ
هەتا زیندووم سەفەر ناکەم
بکوژرێم من لەجێی خۆم نابزووم
خۆم دەربەدەر ناکەم......

لەکن من عەیشی ڕووی دنیا
لە مەوتینـدا موقیـم بوونە
بەهەشت خۆشە بەڵام فەرقی
لەگەڵ گۆشەی حەزەر ناکەم...

بەرۆکم بەردەن چاکە
بەسم لۆمە و نەسیحەت کەن
ئەمن خۆ گوێ لە ئینسانی
نەفام و شێت و کەر ناکەم....

بەئاوی ناو دەمـی یارم
کەوا لەب تەشنە و وشکم
چ داد نادا بە حاڵـی من
بە هیچ شەکراوێ تەڕ ناکەم....

سـێگا، واتە ئاوازی سـێیەم. یەکەم کەسێک کە وشەی سێگای Séga(Ar,Fa,Kr,Tr)
وەک زاراوەیەکی مۆزیکی بوژاندەوە زانای ئیسلامی قوتبەددینی شیرازی بوو لە پەڕاوەکەیدا بەناوی درة التاج لغرة الدیباج. زانای سـەفەددینی ورمێیی خستبوویە بازنەی شـەست و شـەشـەمینەوە. یەکێکە لە دەسـگا سـەرەکیەکان، سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سـێگاسـیانیی

لەسەر پلەتۆنی سـێگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا، لە سکێڵی هاتنەخوارەویدا ڕەگەزی ڕاست دەبێتە نەهاوەند پاش گۆڕینی پلەتۆنی ئاوج بە ئەجەم.

لە سکێڵی خۆاراییدا بەرابەر تۆنی می کاربیمۆڵ دەبێتەوە.

لە دڵما شـکڵی باڵات نوری چاوم هێندە جێگیرە

لە یەک جیانابێتەوە بێ عەینی وەکو شەکەر شیرە

کەمالی، بەدەنگی:عەلی مەردان




Séga maye(Ar,Kr) سـێگا مایە، سـێگا موویە، یەکێکە لەو دەسگا

مۆزیکیانەی کە سەفەدینی ئورمێیی ئاواژەی پێداوە. مایە یاخود موویە{بڕوانە/Muye}....وشەیەکی کوردیە چەند مانایەکی لەخو گرتووە وەک مانای ئاکام، ئەنجام، ئەسڵ. وەکو بڵێین لە ئاکامی سێگاوە هاتبێتە کایەوە. لێڕشتەیەکی سەر بە دەسگای سـێگایە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی سـێگا لەسەر پلەتۆنی سـێگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا.




Segno(I), Sign(E) نیشانە، بۆ نموونە دەوترێت نیشانەی گەڕانەوە *dal segno*.𝄋

Segue(I), It follows(E) دوای دەکەوێت، درێژەپێدان بەبێ وەستان، *Seg.* کورتەیەتی.

Segue la coda(I), The coda follows(E) بەدواچوون تا کۆتایی.

Seguela finale(I), The final follows(E) بەدواچوون تا پایان.

Seguendo, Seguente(I), Following(E) بەدواچوون.

Seguendo il canto, Col canto(I) بڕوانە/*Colla voce*.

Seguito(I), Fortsetzung(G), Continuation(E) بەردەوامبوون.

Sehnsucht(G), Longing(E) ئارەزو، تەوس.

Sehnsüchtig, Sehnsuchtsvoll(G), Longingly(E) بەتەوسەوە.

Sehr(G), Very, Much(E) سـەهر، زۆر، فرە.

Sehr Gemächlich(G), Very comfortable(E) زۆر ئاسوودە.

Sehr kurz(G), Very short(E) زۆر کورت.

Sehr lang(G), Very long(E) زۆر درێژ.

Sehr langsam(G), Very slowly(E) زۆر هێدی و لەسەرخۆ.

Sehr langsam beginnend(G), Begining very slowly(E) دەسپێکردنێکی زۆر لەسەرخۆ.

Sehr lebhaft(G), Very fast(E) زۆر خێرا.

Sehr scharf rhythmisiert(G), Very strong rhythms(G) ڕەزمێکی زۆر بەهێز.

Sher zart(G), Very tender(E) زۆر بەسۆز و ناسک.

Seite(G), Side(E), Lato(I), Côté, Flanc(F) لا، لاپەڕە، یەکێک لە لایە چەرمەکانی تەپڵ.

Sema(Kr), Dance(E) سەما، بڕوانە/Heĺperrké .

Semaine(F), Weak(E), Gràcile(I) لاواز.

Semi(I,L), Half(E) نیمە، نیوە.

Semibiscroma(I), Hemidemisemiquaver(E) 1/64ی نۆتەی تەواو.

Semibreve(E,I), Whole note(E), Ronde(F) نۆتەی تەواو.

Semibrevis(L), Halfbreve(E), Ronde(F) نیوەکورت{لە سەردەمانێکی زۆر کۆندا}.

Semichorus(I), Half chorus(E) نیوەکۆرس، مەبەست لە کۆرسی سترانبێژان کە تەنیا لە دەنگی نێرینە یاخود مێیینە پێکهاتبێت.

Semihemidemisemiquaver(E), Centoventottavo(I), Cent-vingt-huitième(F) 1/128ی تۆنی تەواو*Whole note*.

Semiquaver(E), Semi-croma(I) Sixteenth-note(E) 1/16ی نۆتەی تەواو.

Semisuspirum, Semiminum(L), Crotchet(E) نیوەمینوم، کرۆش، نۆتە پێوانێکی زۆر کۆنە کە ئێستا وەک زاراوەیەک گۆی پێناکرێت.

Semitone(E), Semitonium(L) نیوەتۆن، نیوەمیانەی تۆنێک، میانەی دووەم مایەنر. بە دوو جۆر گوزارەی پێدەکرێت:ـ

1. کرۆماتیک نیوەتۆن*Chromatic semitone*کە یەکسانە بە 25/24 و تیایدا هەمان پیتی مۆزیک بەکادەهێنرێت، وەک لە نموونەی/ *D, D#* .
2. دایاتۆنیک نیوەتۆن*Diatonic semitone*کە یەکسانە بە 16/15 و تیایدا پیتی مۆزیک بە جیاوازی بەکاردەهێنرێت، وەک لە نموونەی/*D, E-flat*.

Semitonium modi(L), Leading note(E) نۆتەنما.

Semitonium naturale(L), Diatonic semitone(E) نیوەتۆنی سروشت.

Semplice(I), Simple(E) ئاسان.

Semplicemente(I), Simply(E) بەئاسانی.

Semplicissimo(I), Extremely simple(E) ئەوپەڕی ئاسانی.

Sempre(I), Always, Continually(E) هەمیشە، بە بەردەوامی، *Semp.*کورتەیەتی.

Sempre insistendo(I), Still persistent(E) **هەر بە بەردەوامی.**

Sempre in tempo(I) **بەردەوامبوون لەسـەر هەمان تێمپۆ.**

Sempre legato(I), Always slured, Smoothly(E) **هەمیشە پەیوەسـت، بەنیانی.**

Senj, Metal castanets(E) **سـەنج، کەسـتانێتی کانزایی.**

Sensibile(I), Sensitive, Leading note, Subtonic(E) **هەسـتیار، هەستیوو، نۆتەنما، ژێرپایە، بریتیە لە مێجەر حەوتەم لە هەر سـکێڵێکدا.**

Sentimental(E) **ویژدانیی، هەستیاریی.**

Sentimentale(I), Feelingly(E) **بەچەشنێکی هەستیاریی.**

Sentimento(I), Feeling(E) **هەست.**

Sentito(I), With expression, With feeling(E) **بەهەسـتەوە، بە هەست دەڕبڕینەوە.**

Sentoor, Sentur(Ar,Fa,Kr), Dulcimer(E) **سـەنتوور، ئامێرێکی ژێداری زۆر کۆنە ئامێرێکی زۆر باو و سـەرەکییە لە مۆزیکی کوردیدا. بەڵام لەسـەردەمی ساسـانیەکاندا لەسـەر دەستی مۆزیکژەن باربەد خاسکاری تێدا کراوە. لە هەندێک سەرچاوەدا بە بەهلبەد یاخود فەهلبەد هاتووە کە ئەگەر لە دیدەی پیتگۆڕکێ زوانەوە بۆی بچین دەشێت کە هەر هەمان ناوی بارباد بگەیەنێت{دوور نیە بە پێچەوانەکەیشی ڕاست بێت}. سـەنتوور ژمارەی ژێیەکانی دەکەوێتەسەر قەوارەی ئامێرەکە، بەڵام بەگشتی دەشێت لەنێوان 24 بۆ 99 ژێی لەسەر ببەسترێت، هەرچەندە جۆری تری هەیە بە هەشـتا ژێ/وە. هەر تۆنەی لە سـێ ژێی یەکدەنگ پێکهاتووە، سـەتنوورێکی شەستوسـێ ژێ بیستویەک پەردە*Pitch*ی هەیە.ئامێرێکی زۆر تۆن خۆش و دڵگیرە، لەبەرئەوە زۆر لەنێو میللەتانی وەک کورد و فارس و باکووری هیندستان و لە میللەتانی ئاوروپای خۆرەڵاتی وەک یۆنان و بولگاریا و ڕۆمانیا زۆر باوە.**

Senza(I), Without(E), Dénué de, Sans(F) **بەبێ.**

Senza abbandonare la corda(I) **بێئەوەی کەوانەکە لەسەر ژێ/یەکە بەرزبکرێتەوە.**

Senza Affretare(I), Without rushing(E) **بێ توندی.**

Senza basso(I), Without bass(E) **بێ باس.**

Senza fretta(I), Without haste(E) **بێ خێرایی.**

Senza interruzione(I), Without interruption(E) **بێ پچڕان.**

Senza misura, Senza tempo(I), In free time(E) **بێ تێمپۆ، بەکورتی *s.t.***

Senza pedale(I), Without pedal(E) **بێ پێداڵ{پایدەر}، بەکورتی*s.p* .**

Senza replica(I), Without repeat(E) **بێ ڕەپات، بێ دووبارە.**

Senza ritornello(I), Without returning back(E) **بێ گەڕانەوە.**

Senza sordino(I), Unmuted(E) **بێ میوت. بێ پێکپە.**

Senza souno(I), Without tone, Spoken(E) **بێ تۆن کە مەبەست تەنیا قسـەکردنە.**

Senza vibrato(I), Without vibrato(E) **بێ لەرینەوە.**

Sepataro(I), Single, Detached(E) جیا، تاک، نابەستوو.

Séparé(F), Separeted, Uncoupled(E) پارپارە، نابەستوو، جیاجیا.

Sept(F), Septem(L), Seven, Interval of a seventh(E) حەوت، میانەی حەوتەمێک.

Septakkord(G), Sept chord(F), Seventh chord(E) حەوتەم کۆرد.

Septemdecim(L), Seventeen(E) حەڤدە.

Septet, Septuor, Sepette(F), Septett(G), Septetto(I) سـێپتێت، گروپێکی جاز*Jazz* ی حەوت ئامێرژەنی پێکهاتوو لە دەسـتەی تەپڵ{پێداڵ باس، تەپلۆکەی یەکلا*Snaredrum*یی، هەندێکجار سـیمباڵی بەفلچەلێدەر یاخود بەدارلێدەر}، دوو گیتار، دوو ترومپێت، دوو ساکسۆفۆن، دوو کلارنێت یاخود ترۆمبۆن، باسـی ژێدار یاخود باسی کارەبایی.

Septimal comma(E) کۆمای حەوتی، لە دیمانی ئاوازدا یەکسانە بەڕێژەی64/63 و بە میانەی27.264Cents کە جیاوازیە لەنێوان فیساگۆریەن{بەڕێژەی16/9 و میانەی996.089Cents}و هارمۆنیکی حەوتەم{بەڕێژەی7/4 و میانەی68.825Cents}.

Septième(F), Septime(G), Septimus(L), Interval of a seventh(E) میانەی حەوتەمێک.

Septuple time(E) کێشی حەوتایی{وەک 7/4، 7/8....هتد.}، حەوتایی لە ڕەزمی چواری یاخود شەشی

Sequence(E), Sequentia(L), Sequenz(G) زنجیرە ویردێکی بەزمیوی بەدوایەکە لە سرووده ئایینەکانی کلێسەی ڕۆمان ـ کاتۆلیکاندا و بە پەیڤی ئەللێلویا ناوژەن دەکرێت، ڕیشەپەیڤی ئەللێلویا*Alleluia*یش عیبریە و گوزارە لە زاتی خودێی پەروەردگار دەکات، ئەم ڕەوشە لە ئایینی ئیسـلامیشـدا ناسـراوە بە زیکری دەروێشـان و ویردی سـۆفیان کە لە هەر ئەڵقەبەستنێکی سـۆفیاندا پەیڤی ئەللا ئەللا یەکبەدواییەک دەوترێتەوە.

Sequence modulation(E) ڕەچە مۆدیولێن، زنجیرە مۆدیولێن، زنجیرە میلۆدییەک یاخود هارمۆنییەک بە چەند پەردە*Pitch*ێکی جیاواز لە ناو چەند کلیلێکی جیاواز.

Seraphim, Musical glasses(E) ئامێرە شـووشـەکان.

Serenad, Serenade(E), Serenata(I), Sérénade(F), Nachtmusik(G) ئێوارەسـتران. سـترانێک یاخود ژەنینێک لە شـەوگارێکی کراوەدا بەئەنجامبدرێت.

Serenatella(I), Diminutve of Serenata(E) ئێوارەسـترانۆکە، بچووککراوەی ئێوارەسـتران.

Serenità(I), Calmness(E) ئارامی، بێدەنگی.

Sereno(I), Calm(E), Calmer(F) ئارام، بێدەنگ.

Serio, Seria, Serioso, Seriosa(I), Grave, Serious(E) مەتین، فەڕبوودیی، گرنگیـپێدان.

Seriosamente(I), Seriously(E) فەڕبوودانە.

Serpent, Black pudding(E) سـەرپێنت، براس ئامێرێکی هەواییە و بە ترومپێت دەچێت.

Serpent Forveille,Serpent à pavillon(F), Upright serpent(E) ئامێری سەرپێنتی ستوونی.

Serpentone(E,I), Bass horn(E) باس هۆڕن.

Serrando,Serrato(I), Serrant(F), Pressing, Faster, Tightly(E) .بەتوندی، خێراتر، پەستان

Sesquitone(L), Minor third(E) .ماینەر سێیەم یاخود میانەی سێ نیوەتۆن

Sessanta(L), Sixty(E) .شەست

Sestet, Sestetto(I), Sextet(E) .گروپێکی لە شەش ئامێر یاخود شەش دەنگ پێکهاتوو
Sextet(G), Sextuor(F)

Sétar(Fa, Kr)  .سێتار، ئامێرێکی ژێداری خۆرەڵاتی زۆر دێرینە
کە سێ ژێ/ی لێبەستراوە

Settanta(F), Seventy(E) .حەفتا

Sette(I), Sieben(G), Seven(E) .حەوت

Settima(I), Interval of a seventh(E) .میانەی حەوتەم

Settimana(I), Weak(E) .لاواز

Settimanale(I), Weakly(E) .بە لاوازی

Settimino(I) .*Septet*/بڕوانە

Settimo(I), Seventh(E) .حەوتەم

Seufzend(G), Sighing(E) .هەنسکدان

Seufzer(G), Sigh(E), Soupir(F) .هەنسکدەدات

Seul, Seule(F), Alone(E) .تەنیا

Seventh chords(E) .کۆردە حەوتەمەکان

| نووسینی کۆرد Chord as written | ناوی کۆرد Chord as named | نۆتەکانی کۆرد Chord notes |
|---|---|---|
| Cm13, Cmi13 | C minor thirteenth | C E♭ G B♭ D F A |
| C13♯11 ♭9 | C thirteenth sharp eleventh flat nine or C dominant thirteenth | C E G B♭ D♭ F♯ A |
| C13♯11, C13 | C thirteenth sharp eleventh or C thirteenth or C dominant thirteenth | C E G B♭ D F♯ A |
| Cmaj13, Cma13♯11 | C major thirteenth sharp eleventh or C major thirteenth | C E G B D F♯ A |
| C13sus4, C13sus | C thirteenth suspended fourth | C F G B♭ D F A |

| Symbol | Symbol | Chord Name | Chord Intervals |
|---|---|---|---|
| C7 | | C seventh (or dominant seventh) | 1 3 5 b7 |
| C7-5 | C7dim5 | C seventh diminished fifth | 1 3 b5 b7 |
| C9 | | C ninth | 1 3 5 b7 9 |
| C7(b9) | C7min9 | C seventh minor ninth | 1 3 5 b7 b9 |
| C7(#9) | C7aug9 | C seventh augmented ninth | 1 3 5 b7 #9 |
| C9-5 | C9dim5 | C ninth diminished fifth | 1 3 b5 b7 9 |
| C(#11) | C9(#11) | C augmented eleventh | 1 3 5 b7 9 #11 |
| C11 | | C eleventh | 1 3 5 b7 9 11 |
| C13 | | C thirteen | 1 3 5 b7 9 13 |
| C13-9 | C13(b9) | C thirteen minor ninth | 1 3 5 b7 b9 13 |
| $C13^{-9}_{-5}$ | C13(b9)b5 | C thirteen minor ninth dim 5th | 1 3 b5 b7 b9 13 |

Seventeenth(E) حەڤدەیەم، میانەی دوو ئۆکتاڤ و سـێیەمێک.

Seventh(E), Siebente(G) حەوتەم، حەوتەمی مێجەر کە بە نیوەتۆنێک لە ئۆکتاڤ بچووکترە، یاخود حەوتەمی ماینەر کە بە نیوەتۆنێک لە تۆنی تەواو بچووکترە.

Seventh chord(E), Accord de septième(F) حەوتەم کۆرد، پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەنۆتە *Root note*، سـێیەم لەسـەروو ڕەگەوە، پێنجەم لەسـەروو ڕەگەوە و حەوتەم نۆتە لەسەروو ڕەگەوە.

Seventh chord inversion(E) هەڵگەڕاو، بڕوانە/*Inversion*.

Sex(L), Six(E) شــەش.

Sexaginta(L), Sixty(E) شەست.

Sexte(G), Sextus(L), Interval of sixth(E) شـەشـەم، میانەی شـەشـەم.

SextetE), Sextett(G), Sextette, Sextuor(F) شەشیی، گروپێکی جاز*Jazz*ی شەش ئامێرژەنی پێکهاتوو لە دەستەی تەپڵ{پێداڵ باس، تەپڵی یەکلا کە هەندێکجار سـیمباڵی بەفلچەلێدەر یاخود بەدارلێدەر}، دوو گیتار، دوو ترومپێت، دوو سـاکسـۆفۆن، دوو کلارنێت یاخود ترۆمبۆن، باسی ژێدار یاخود باسی کارەبایی.

Sextole(G), Sextolet(F), Sextuplet(E), Sestina(I) دەبڵ تریۆلە. کۆمەڵە نۆتەیەکی شـەشـتایی لە ڕەزمی چواریدا.

Sextuple meter, Sextuple time(E) شەش مەتر، پێوانەیەکی شەش لێدانە لە باڕێکدا.

Sforzando(I), Forcing(E) بەهێز، توندلێدان لەسەر نۆتەیەکی دیاریکراو، بەکورتی/***sfz.*** .

Sforzando piano, Sforzato piano(I), Strongly accented(E) بەهێز، بەکورتی/***sfp.*** ، بەهێز دەسـتداگرتنی کتوپڕ لەسـەر ژەنینی کۆردێک و بەدوایدا بەلاوازی بژەنرێت.

Sforzatissimo(I), Very strongly accented(E) زۆر بەهێز.

Sforzo(I), With force(E) سـفۆرزۆ /***sf.*** . هێمای توندلێدان لەسەر نۆتەیەک یاخود کۆردێک.

Sfumate, Sfumato(I), Very lightly(E) زۆر بە سـووکی و نیانی.

Sgabello(I), Piano stool(E) سـگابێللۆ، کورسی دانیشتنی پیانۆژەن لەبەردەم ئامێری پیانۆدا.

Sgambato(I), Weary style(E) خەمگین چەشـن.

Sgomenta(I), Dismayed(E) بەترس و سـام.

Sgra-snyan(E) ئامێرێکی ژێداری زۆر دێرینی سـەربە ناوچەکانی هیمالایا*Himalaya*یە.

Shake, Trill(E) بڕوانە*Trill*، ڕاوەشاندن، تریللە، شـەکاندن.

Shaker(E) ڕاوەشـێن، ئامێرێکی پێرکیوشـنە*Percussion*، ناوەڕۆکەکەی پڕکراوە لە وردە سـاچمە کە بەڕاوەشاندنی خشـەخش دەکات و ڕەزمی پێدەگیرێت.

Shanaz higaz, Ŝanaz ĥicaz(Ar,Kr,Tr) شــاناز حیجاز، لێرشتەیەکی دەســگای حیجازە. ســکێڵی هاتنەخوارەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی حوسێنی. ســکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە گرێ نێکرێز لەسەر پلەتۆنی نەوا




**شـاناز سـێگا، شـاناز کوردی.** Shanaz séga, Ŝanaz sega, Ŝanaz kurdi (Ar,Kr,Tr)




**لێرشتەیەکی سەر بە دەسگای کوردە. پێکهاتووە لە ڕەگەزێکی سـەرەکی بەناوی ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزێکی لاوەکی بەناوی حیجاز لەسەر پلەتۆنی حوسـێنی.**

**تیژ، دێز.** ♯ Sharp(E), Dièse(F), Diesis(I), Kreuz, Scharf(G)

**بەرزبوونەوەی نیوەتۆنێک لە پەردە***Pitch***یەکدا، وەک زاراوەیەک گوزارە لە مێجەر***Major* **و زێدە***Augmented***دەکات، لوولەکانی ئامێری ئۆرگن کە دەنگێکی زۆر تیژیان هەیە، دوگمە ڕەشەکانی کیبۆرد.**

**شـاون،** Shawn(E), Chalumeau(F), Chalmei(G), Cialamello(I), Zuřna(Kr)

**ئامێرێکی دوو ڕیشـەیی***Double-reed***سـەردەمانی سـەتەی ناوەڕاسـت و هۆرێزانە***Renaissance***، حەوت کونی پێشەوە و یەک کونی دواوەوەی بۆ پەنجە گەورەی تیادایە، بەرین***Range***ی تۆنەکانی دەگاتە دوو ئۆکتاڤ ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ لێهاتووی و توانایی ژەنیارەکە. دەنگەوارەکانی ئامێری شاونی مۆدێرن بەم جۆرانە پۆلێنراون.**

1. **سـۆپرانینۆ***Sopranino* **کە نزمترین نۆتەی لە** F´ **دایە.**
2. **سـۆپرانۆ***Soprano* **کە نزمترین نۆتەی لە** c´ , g´ **دایە.**
3. **ئاڵتۆ***Alto* **کە نزمترین نۆتەی لە** g , f , d , c **دایە.**
4. **تینۆر***Tenor* **کە نزمترین نۆتەی لە** c , G **دایە.**
5. **باس***Bass* **کە نزترین نۆتەی لە** F , C **دایە.**
6. **گەورە باس***Great bass* **کە نزمترین نۆتەی لە** C , GG **دایە.**

**شــەد.ترانز، ترانسپۆزە.** Shed(Ar,Tr), Şed(Kr), Transposition(E)

**لە وشەی چەت/ی کوردیەوە هاتووە کە بەمانای توندکردن و کوکـکردنی ژێی تۆنێک دێت بۆ هەمان تۆن بەڵام لە پلەئۆکتاڤێکی بەرزتردا. زۆرجاریش بە پەردە ناودەبرێت چونکە هەر بە بەکارهێنانی گۆڕینی دەنگێک بۆ دەنگێکی بەرزتری خۆی ئەوە دەگەیەنێت کە پەردە{تۆن}یەکیتر لە هەمان تۆن پەیدادەبێت بەڵام لە ئۆکتاڤێکی بەرزتردا. شەداو: چەتاو، واتە پەردەیەکی گۆڕاو بۆ پەردەیەکیـتری خۆی لە ئۆکتاڤێکی بەرزتردا. لە زوانی عارەبیدا زاراوەی تصویر دەگرێتەوە.**

Shed Urban, Şed urban, (Ar,Kr,Tr) شــەدئوربان

لێرشتەیەکی سەر بە دەســگای حیجازە{هەر ترانسپۆزەی دەسگای حیجازیشە}، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی یەکـگا، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا.




Shenai(Hn,Kr) شـانەی، ئامێری شــاون*Shawn* دەگرێتەوە لە باشـووری هیندستان.

Sheng(Ch), Sho(Ja), Mouth organ(E) شـەنگ، ئۆرگنی چینی کە بە فووی دەم دەژەنرێت.

shewq Efza, Şewq Efza(Ar,Kr,Tr) شــەوقــئەفزا. لێرشتەیەکی ســەر بە دەسـگای ئەجەمە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی ئەجەم عەشیران، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




Shawqi DĺÍ, Şewqi DĺÍ (Ar,Kr,Tr) شـەوقیــدڵ. لێرشــتەیەکی سـەر بە دەســگای حیجازە، سکێڵی پێکهاتوە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی نەوا. هەمانە سکێڵی حیجاز دیوان/یشە بەڵام لە پلەتۆنی یەکــگا/وە.




Shewqtereb kurdi(Ar,Kr,Tr) شەوقیـتەرەب کوردی. لێرشتەیەکی سـەر بە دەســگای کوردە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسـەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی ســەبا لەسـەر پلەتۆنی نەوا.




{شەنگوڵە:سونبولە}

Shift(E) گواستە، جووڵەی دەستەچەپ لەسەر دەسـتەکی ئامێرە ژێدارەکان لە جێیەکەوە بۆ جێیەکیـتر ئیتر چ بۆ سەرەوە بێت کە پێیدەوترێت هەڵگواستە*Shifting up* یاخود بۆ خوارەوە کە پێیدەوترێت داگواستە*Shifting down*. بۆ نموونە ناوەکان لە ئامێری کەمانچەدا نیوەگواستە-*Half shift*یەک دووەم پۆزە*Second position*یە، تەواو گواستە*Whole shift*یەک سـێیەم پۆزە *Third position*یە، دەبڵ گواستە*Double shift*یەک چوارەم پۆزە*Fourth position*یە، وەهەروەها.... .

Sheet, Şit(Kr), Whistle(E) شـیت، فیـکە.

Shnewd, Şnewd(Fa,Kr) شــنەود، گوێڕادێران، گوێگرتن. گوایە کاتی خۆی فەرمانڕەوایی ئەمەویەکان، عەباسیەکان و تاگەیشتە عوسمانلیەکانیش لە دیوەخانەکانیاندا بە ئامادەبوونی یاوەران و میوانانیان بەزمی خۆشــیيان لە ئاهەنگی گۆرانی و مۆزیک دوور لە خەڵک گیڕاوە، پەنا هۆدەیەکیشیان لە دیوەخانەکەدا بە پەردەیەکی شــاش داپۆشراو هەبووە. بۆ ڕێزگرتن لە بوونی خەلیفە یاخود ســوڵتان لە دیوەخاندا، لە پشتی ئەم پەردەیەوە خەلیفەژن و دەســوپێوەندی دانیشــتوون بۆ گوێگرتن لە ئاهەنگەکە. دیمەنەکەیش وەها پیشاندەدرا کە گوایە لەو ئاهەنگەدا لەبەرچاودا نین، تەنیا دەشــنەون{واتە دەبیستن}، خۆ ئەگەر خۆشخوانی ئافرەت بهێنرایە بۆ گێڕانی ئاهەنگ لە دیوەخاندا هەر دەبرایە ئەو پەناهۆدەیە و گوێی لێدەگیرا.

Shofar(Hb) شــۆفار، شــەیپوور، ئامێرێکی زۆر کۆنی یەهودیانە کە ســەردەمانێکی زوو لە شاخی گیانلەبەران دروستدەکرا، ئامێری ناقوور{لە ســورەتی ئینعام/73،74}، بووقی ڕۆمی، بە عیبری شــافارShaphar و بە ئاســووری شــاپاراShappara و هۆڕنHornی ئاورووپایی. لە ئاورووپا هەر ئەم شــێوەیە گۆڕانکاری بەســەرداکراوە و شــێوەی ترومپێت*Trumpet*ی ئێســـتای وەرگرتووە.

Short octave(E) کورتە ئۆکتاڤ. بۆ نموونە ئەگەر ســکێڵی ســۆڵ ـ مێجەر لێبدرێت بەم شێوەیە دەبێت:ـ C A B C D E F# G




ئەم جۆرە ئۆکتاڤە ئێســتا ئەوەندە بایەخی پێنادرێت.

Shruti(Hn) شــروتی، گوزارە زاراوەیەکی کلاسیک مۆزیکی هیندیــیە بۆ میکرۆتۆن.

Shuffle(E) شــەفڵ، تێمپۆی هێواش لە ڕەزمی جازدا، هەر لێدانێکی ســەرەکی بۆ ســێ لێدانی بچووکتر دابەشکراوە، ئەم چەشــنە تێمپۆیە لە بلووز مۆزیک*Blues music*دا زۆر دیارە.

Shushık, Şuşık(Fa, Kr) شــوشک، شیشک، ڕەبابی چوارتار.

Shishım, Şişım(Fa, Kr) شــیشــم. ئامێرێکی ژێداری ســـەردەمی ســاســانیەکانە.

Si(I), B(E), H(G) یەک، حەوتەم پلەتۆن لە پلەتۆنی/دۆ*do* وە.

Si alza il sipario(I), The curtain rises(E) پەردە بەرزکردنەوەی شــانۆ.

Si-bémol majeur(F), Si-bemolle maggiore(I), B-flat major(E) ســی بیمۆڵ ـ مێجەر.



Si-bémol majeur gamme(F), B-dur skal(G) ســـکێڵی سی بیمۆڵ ـ مێجەر.



Side drum, Snare drum(E) تەپڵۆکەی یەکلا، تەپڵێکی مامناوەند قەوارەیە.

Siegeslied(G), Victory song(E) ســروودی ســەرکەوتن.

Signalhorn, Hunting horn, Bugle(E) بووق، هۆڕنی ڕاو. هۆڕنی بانگ.

Signe(F), Sign(E) ئاماژە.

Silbe(G), Syllable(E) ســیلاب.

Silence(E), Sileceux(F), Silenzio(I) بێدەنگی، بڕوانە/*Rest*.

Si leva il sordino(I), Take of the mute(E) لابردنی پێکپە.

Si-maggiore(I), Si-Majeur(F), B-Major(E), H-Dur(G) سـی ـ مێجەر.



Si-majeur gamme(F), H-dur skal(G), B-Major(E) سـکێڵی سـی ـ مێجەر.



Similar motion(E) جووڵەی وێکچوون، دوو یاخود چەند بەشێک لە پارچەمۆزیکێکدا کە لە یەک کاتدا و بە یەک ئاڕاسـتە جووڵەبکەن.




Simile(I), Similar(E) وێکچوون، گوزارەکردن لە شـتێک، ***sim.*** کورتەیەتی.

Simile marks(E) هێما وێکچوونەکان، ئاماژەیە بۆ ڕەپاتکردنەوەی گروپەنۆتەیەک یاخود چەند باڕێکی تەواو، بڕوانە/*Repeat*.

Si-mineur(F), B-minor(E), Si-minore(I), H-moll(G) سـی ـ ماینەر.

Simple(F), Single(E) تاک، سـادە، میانەی سـادە، میانەی کەمتر لە یەک ئۆکتاڤ.

Simple binary form(E) بڕوانە/*Binary form*.

Simple Counterpoint(E) کۆنتراپونتی سـادە و بێئاڵۆز.

Simple interval(E) میانەی سـادە، میانەیەک کە ئۆکتاڤێک یاخود کەمتری پێکهێنابێت، ئەو میانە سـادانەی کە باون ئەمانەن:ـ میانەی یەکتۆنیی*Unison*، ماینەر دووەم*minor second*، مێجەر دووەم*Major second*، ماینەر سـێیەم*minor third*، مێجەر سـێیەم*Major third*، چوارەمی تەواو*Perfect fourth*، سـێتۆن*Tritone*، پێنجەمی تەواو*Perfect fifth*، ماینەر شـەشـەم*minor sixth*، مێجەر شـەشـەم ماینەر حەوتەم*Major sixth minor seventh*، مێجەر حەوتەم*Major seventh*....یاخود هەر میانەیەکیـتر لە هەشـتەک{ئۆکتاڤ}ێک کەمتر بێت.

Simple time(E) کێشی سـادە، بڕوانە/*Time signature*.

Sin, Sino(I), Until(E) تاکو، تاکو ئەو جێگەیە.

Sin´ al fine(I), Until the end(E) تاکو پایان.

Sin´ al segno(I), Until the sign(E) تاکو شـوێنی نیشـانە، بڕوانە/*Segno*.

Si-naturel(F), B-nature(E) تۆنی سـی ـ سـروشـتی.

Sincronizzione(I), Syncronisation(E) هاوکات.

Sinfonia(I), Sinfonie(F) سـینفۆنیا، لە ڕیشـەپەیڤی*Chinfonie*یۆنانییـەوە هاتووە کە بەمانای میانەی ئاوێز و هاوسـاز، دوایی وەک زاراوەیەک بە زوانی سـینفۆنیا*Sinfonia*ئیتالیایی گیرسـایەوە کە گوزارە لە ئەنجامدانی کارێکی مۆزیک دەکات بە ئۆرکێسـترایەکی بچووک کە داهێنانانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەگبەی باڕۆک*Baroque era*، تیایدا فرۆزەی پارچە کارێکی مۆزیک

ئامێراڵی*Instrumental piece*دەکات وەک بەرایی*Prelude*، پێشەکی*Overture*بۆ ئۆپێرایەک، ستراننێک{کانتانا}*Cantana*یاخود سویت*Suite*ێک.

Sinfonietta(I), Small orchestra(E) سینفۆنیتا، سیمفۆنیایەکی کورت و سووک، هەندێ کجار ناوەکە ئۆرکێسترایەکی بچووک لەخۆ هەڵدەگرێت.

Sinfonische band(G), Symphonic band(E) باندی سیمفۆنی.

Sinfonische dichtung(G), Symphonic poem(E) چامەی سیمفۆنی.

Singende säge(G), Musical saw(E) مشاری مۆزیکاڵی.

Singhiozzando(I), Schluchzend(G), Sobbing(E) هەنسکی گریان.

Singhiozzando per tenerezza(I), Tender sobbing(E) ئارەزووی هەنسکدان.

Single appoggiatura(I) تاکە ئاپۆجیاتۆرا، ئاکسنت و نۆتە پاساوەکانی بە گواستنەوەیەکی کتوپڕی نزیکدەبێتەوە و پێیدەوترێت باز*Leap*{نەوەک بە هەنگاوهەنگاو*Step*}.

Single reed(E) تاک ڕیشە، ئەو ئامێرە هەوایيانە دەگرێتەوە کە ڕیشەی فووپیاکردنیان هەیە وەک ساکسۆفۆن، کلارنێت.

Singpartitur(G) سکۆرێک بۆ دەنگەکان و ئامێرەکان بەڵام تەنیا هێڵە دەنگیەکانی تیادایێت.

Singsaite(G), Highest string on an instrument(E) بەرزترین ژێ لە ئامێرەژێدارەکاندا.

Singstimme(G), Singingvoice(E) دەنگی ستران، دەنگ.

Sinitra(I), On the left(E) لای چەپ.

Sinnbild(G), Symbol(E) نیشانە، سیمبۆڵ.

Si piace(I), At pleasure(E) بە ئاسوودە و خۆشی.

Sirventés(F), Troubadour(S) شـایەر، ترۆبادۆر.

Si segue(I), Go on(E) ڕۆیین، بەردەوامبوون.

Sistro(I), Sistrum(E) شیشتروم، ئامێرێکی ڕەزمی زۆر دێریی سەردەمی فیرعەونەکانی وڵاتی میسرە، پێکهاتووە لە کۆمەڵە زەنگۆڵەیەکی بەیەکەوە بەستراو.

Si tace(I), Keep silent(E) بێدەنگ ڕاگرتن.

Six chord(E) شەش کۆرد، پێیشیدەوترێت شەش ـ سێ کۆرد، کۆردەکە لە نۆتەی بنەوە هەڵدەگێڕدرێتەوە و دەبێتەوە یەکەم هەڵگەڕانەوە*First inversion*. بۆ نموونە لە ڕەگەجێی *Root position*کۆردی*C E G*/دەکرێتە*E G C* وەهەروەها... .

Six-four chord(E) شەش ـ چوار کۆرد، کۆردەکە لە نۆتەی بنەوە هەڵدەگێڕدرێتەوە و دەبێتەوە دووەم هەڵگێڕانەوە*Second inversion*. بۆ نموونە لە ڕەگەجێی کۆردی*C E G*/دەکرێتە*G C E* وەهەروەها... .

Sixième(F), Sechste(G), Sixth(E) شەشەم.

Six/nine chord(E) کۆردی شەش/نۆ.

Sixte(F), Sesta(I), Sixth, The Interval of a sixth(E) **شــەشــەم، میانەی شـەشـەم.**

**میانەیەک شـــەش پلەدیاتۆنیکی تیابێت، بۆ نموونە میانە لە تۆنی/***C*** بۆ تۆنی/***A*.

Sixteen(E),Sedecim(L), Sedici(I), Sechzehn(G) **شـانزە.**

Sixteenth interval(E), Sedecima(L) **میانەی شـانزەم، میانەی ئۆکتاڤێک و دووەمێک.**

Sixth chords(E) **کۆردە شـــەشـەمەکان.**

| نووسینی کۆرد Chord as written | ناوی کۆرد Chord as named | نۆتەکانی کۆرد Chord notes |
|---|---|---|
| Cm11, Cmi11 | C minor eleventh | C E♭ G B♭ D F |
| C7♭9#9 | C seven flat ninth sharp ninth | C E G B♭ D♭ D# |
| C7♭9#11 | C seven flat ninth sharp eleventh | C E G B♭ D♭ F# |
| C9#11 | C ninth sharp eleventh | C E G B♭ D F# |
| Cmaj9#11 | C major ninth sharp eleventh | C E G B D F# |
| C7♭9#9+, C+7♭9#9 | C seven flat ninth sharp ninth augmented | C E G# B♭ D♭ D# |
| C7♭9#11+, C+7♭9#11 | C seven flat ninth sharp eleventh augmented | C E G# B♭ D♭ F# |

Slancio(I), Impetuos(E) **بە هەڵپەوجۆش.**

Slargando, Slargandosi, Rallentando(I), Slowing down(E) **ســـستکردنەوە.**

Slash chord(E), Accord avec barre(F) **سـلاش کۆرد، وشەی سـلاش***Slash***وەک زاراوەیەکی مۆزیک مانای هێڵی لار دەگەیەنێت کە بە هێمای / گوزارەی لێدەکرێت.**

**ئەم جۆرە کۆردە پێکهاتووە لە کۆردی سـیانیی***Triad*** و بنە نۆتە***Bass note***یەکی زێدە کە مەرج نیە بەشـێک بێت لە سـیانییەکە. دەبێت بەپێی رێسـای نزمترین نۆتە***Lowest note***ناوی کۆرد** *Chord name***پەیرەوبکرێت. بۆ نموونە**D/F$^{\#}$ **باس نۆتەی هەیە لە چێوەکۆردی**D/ **دا کە بریتیە لە** D F$^{\#}$ A **،** **لە کاتێکدا** Am/G **باس نۆتەی هەیە کە لە چێوەکۆردی** Am**دا نیە بریتیە لە** A C E.

**بەتێکرا...دەشێت بڵێین دوو جۆر سـلاش کۆرد هەیە، یەکەمیان:ـ ئەو کۆردەی کە باس نۆتەکەی بەشێکە لە سـیانییەکە وەک** A/E , A/C$^{\#}$ , Amaj$^{7}$/G$^{\#}$ **وە هەروەها... . دووەمیان:ـ ئەو کۆردەی کە باس نۆتەکەی بەشـێک نیە لە کۆردە سـیانییەکە وەک** Amaj/G , A/F$^{\#}$ **وە هەروەها... .**

C/D, Slash C cover D **کۆردی دۆ/**C **و تۆنی رێ/**D **ی بخرێتەسـەر دەبێتە**D, C, E, G.

Slentando(I), lossening the tempo(E) **بڕوانە/***Rallentando***، بەکورتی/*****Slent.***.

Slegato(I), Un-legato(E) **نالێگاتۆ، ژەنینێکی ناـ نۆتەبەندی، ناپەیوەسـت.**

Slide(E) **خزند، وەک زاراوەیەکی مۆزیکایی بە چەند مانا لێکدەدرێتەوە، لوولەی چوون بەناویەک لە هەنێک ئامێری هەوایی وەک ترۆمبۆن***Trombone*** کە بە هێنانوبردنی**




{**خزاندنی بەناویەکدا**}**تۆنەکان پەیدادەبن.خزاندنی پەنجە لەسەر ژێ/یەکان لە تۆنێکەوە بۆ تۆنێکیتر وەک لە ئامێری گیتار و کەمانجە بەچەشنی گلیساندۆ***Glissando*** یاخود پۆرتامێنتۆ***Portamento*.

**هەندێک ئامێر هەیە کە ئەم زاراوەیە بۆتە پێشگری وەک:ـ**

**سـلاید باس***Slide bass*، **سـلاید گیتار***Slide guitar*، **سـلاید هۆڕن***Slide horn*، **سـلاید ساکسۆفۆن، سـلاید فیکه***Slide whistle*...**هتد**.

Slide trumpet(E), Trompette à coulisse(F), Tromba a tiro(I) **خزه ترومپێت**.

Slide trombone(E), Trombone a tiro(I) **خزه ترۆمبۆن**.

Slur, Tie(E), Schleifbogen(G) **بەسـت، کەوانی پەیوەسـت کە لە سـەرەتای سـەتەی شـانزەمدا هێنرایە کار. ژەنینی کۆمەڵە نۆتەیەک بە یەک لێدانی کەوان یاخود بە یەک پیشخواردنەوە لە ئامێرەهەواییەکان یاخودبە یەک هەناسـە لە سـترانخوانیدا**.



Small octave(E) **گچکە ئۆکتاڤ، ئۆتاڤێکە لە تۆنی**/C **ی ژێر دۆی ناوەڕاست***Middle-C***ەوە دەکشێت بۆ تۆنی**/B**ی ژێر دۆی ناوەڕاست کە نۆتەکانی بەگشتی بریتین لە:ـ** c, d, e, f, g, a, b.

Small orchestra(E) **گچکە ئۆکێسـترا، ئۆرکێسـترایەکی سـتاندەرە بێجگە لە ترۆمبۆنەکان و هەندێک لە هۆڕنەکان و کلاڕنێتەکان و تەپلە کێتلەکان***Kettle drums*.

Smania(I), Frenzy(E) **هەڵچوویی**.

Smaniante(I), Frantic(E) **تووڕە و زوو هەڵچوو**.

Smanioso(I), Restless(E) **بێوچان**.

Smear(E), Gribouiller(F), Ingrassare(I) **جۆرێک گلیساندۆیە بە بڕی نیوەنۆنێک کە لە تیـپەکانی جاز**/*Jazz***دا بە ئامێرە براسـەکان دەکرێت بەتایبەتی ئامێری ترۆمبۆن**.

Sminuendo(I), Diminishing(E) **گەسـتن، کەمکردن**.

Sminuito(I), Diminshed(E) **گەسـتوو، کەمبوو**.

Smorendo(I), Dying away(E) **خامۆشـبوون**.

Smorfioso(I), Mincing, Prim(E) **نازک، شــۆخ**.

Smorzando(I), Gradually dying away to a whisper(E) **بەرەوخامۆشی، بەکورتی.*smorz.***

Smorzo(I), Damper(E) **پێکپە. ئامڕازێکی تایبەت کە دەنگی پـێــکپ دەکرێت**.

Snare drum, Side drum(E) **تەپلۆکەی یەکلا، بەکورتی.*Sn.Dr.*** **تەپلی چێوەبەسـتراو بە تەلی کەمێک ئەسـتوور**.

Snares, Wire-bound gut strings(E) **تەلی دروستکراو لە ڕیخۆڵەی گیانلەران بۆ ژێی ئامێرەکان**.

Snellamente(I), Nimbly(E) **بە شـەنگی**.

Snello(I), Nimble(E), Agile(F) **شــەنگ**.

Soave(I), Suave, Gentle(E) **زرنگ و ئارام**.

Soavemente(I), Sweetly, Softly, Savely(E) **ئارامی، شـیرینڕەوی**.

Soavvissimo(I), Very sweetly(E) **زۆر بە شـیرینڕەوی**.

Socius(L), Member, Felllow(E) **ئەندام، لایەنگر**.

Soffocanto, Soffocato(I), Muffled, Damped(E) **کپکردن، خامۆش**.

Soft consonance(E) .تۆنسـازی نەرم کە بریتیە لە میانەی سـێیەم و شـەشـەمی مێجەر و ماینەر

Soggetto(I), Theme, Subject(E) سـوژە، ڕشتە، بابەتاواز{بابەتێکی ئاوازئامێز}، بۆ نموونە فیوگە*Fugue* جۆرێکە لە بابەتاواز{بابەتەئاواز}.

Soixante(F), Sixty(E) شـەست.

Soixante-dix(F), Seventy(E) حەڤدە.

Sol, So, Soh(F,I) سـۆڵ، بڕوانە/*G* .

Sola, Solo(I), Solo(E) سـۆلۆ، تاکنەوازیی، تاکژەنیی.

Sol bémol(F), Sol bemolle(I), G-flat(E), Ges(G) سـۆڵ ـ بیمۆڵ.

Sol bémol majeur(F), Sol bemolle maggire(I), G-flat major(E) Ges-dur(G) سـۆڵ بیمۆڵ ـ مێجەر.



Sol bemolle maggiore scala(I),G-flat major key(E) سـکێڵی سـۆڵ بیمۆڵ ـ مێجەر.

Sol dièse(F), Sol diesis(I), Gis, G-sharp(E) سـۆڵ ـ دیێز.

Sol dièse mineur(F), Sol diesis minore(I), Gis-moll(G), G-sharp minor(E) سـۆڵ دیێز ـ ماینەر.

Solemn(E), Solemnis, Solennis(L), Solenne(I), Solnnel, Solennelle(I) بەکاو، بەشـکۆ.

Solennellemente(F), Solenemente(I), Solemnly(E) بەشـکۆیی.

Sol-fa(E) سـیلابەکانی سکێڵ، مەبەست لە ناوی پیتی نۆتەکانی مۆزیکە.

Solfége(F), Solfeggio(I) سـۆڵفێـج، زاراوەلێکدراوێکی مۆزیکایی ئاوروپاییە و لە دوو پیت پێکهاتووە:ـ سـۆڵSol و فاFa. پاراوی زاراوەکەیش لەبواری کارپێکردن و دیدەی هونەریەوەڕا نۆتەخوێندنەوەی مۆزیک بەدەنگی مرۆڤ دەگەیەنێت، لە زوانی ئینگلیزیدا بەSolfaو لە فەرەنساییدا بە*Solfége*و لە ئیتالیاییدا بە*Solfeggio*هاتووە.

لە تۆنی جێگیرە دۆ/ی سۆڵفێیجدا تۆنە کرۆماتیکەکان بە گوێرەی ئەم نەخشەیەی خوارەوە ناودەبرێن:ـ

Rising or ascending scale سـکێڵە بەرزبووەکان

| C | C# | D | D# | E | F | F# | G | G# | A | A# | B | c |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| *do*<br>*ut*<br>فڕەنسایی | *di* | *re*<br>*ré*<br>فڕەنسایی | *ri* | *mi* | *fa* | *fi* | *sol*<br>*so*<br>ئینگلیزی | *si* | *la* | *li* | *ti*<br>*si*<br>ئیتالیایی | *do*<br>*ut*<br>فڕەنسایی |

Falling or descending scale سـکێڵە داکەوتووەکان

| c | B | Bb | A | Ab | G | Gb | F | E | Eb | D | Db | C |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| *do*<br>*ut*<br>فڕەنسایی | *ti*<br>*si*<br>ئیتالیایی | *te* | *la* | *le* | *sol*<br>*so*<br>ئینگلیزی | *se* | *fa* | *mi* | *me* | *re*<br>*ré*<br>فڕەنسایی | *ra*<br>ئیتالیایی | *do*<br>*ut*<br>فڕەنسایی |

Solfeggiare(I), To sol-fa(E) سـۆڵفێجاندن{سـۆڵفێجەکردن}، سـۆڵفاندن.

Solfeggietto(I), Little study, Short keyboard piece(E) سـەرناوی کورتە بەشـێکی کیبۆرد، کورتە خوێندنەوە.

Solfier(F) وتنەوەی نۆتەکان بە خوێندنەوەی لە سـکۆرScoreێکدا.

Soli(I), Alone(E) تەنیاکان، کۆی تەنیاSoloیە.

Solid chord(E) کۆردی مەتین، مەبەست لە کۆردێکە کە هەر نۆتێک تێیدا لەیەک کاتدا لێبدرێت.

Solito(I), Usual(E) ئاسایی بەکارهاتوو،

بۆ نموونە دەوترێت وەک ئاسـاییal solito:as usual.

Sollecitando(I), Hastening forward(E) بەرەو خێرایی.

Sollecito(I), Eager(E) بە پەرۆش.

Sol-majeur(F), Sol-maggire(I),G-major(E), G-dur(G) سـۆڵ ـ مێجەر.

Sol-maggiore scala(I),G-major key(E) سـکێلی سـۆڵ ـ مێجەر.

Solmisation(F,G), Solmizatione(I) سـۆڵمیزاندن، سـۆڵمیزەکردن،

سـیسـتەمی ناولێنانی نۆتەمۆزیکیەکان بە ناوەسـیلابەکان، وا بڕوایە کە لەلایەن گویدۆ ئاریزۆ Guido d' Arezzoداهێنرابێت کاتێک لە پرۆڤەی بە سـرووودبـێژەکانی کاتێدراڵ دەکرد پەی بەوەبرد کە بۆ ئاسـانکردنی کارەکەی دەبێت پەنا بۆ دانانی هێمای نۆتەکان بەرێت. بڕوانە/Guido d' Arezzo.

Solo pitch(E) بڕوانە/Scordatura.

Solo quartet(E) گرووپێکی پێکهاتوو لە چوارسـترانبێژ، کارێکی مۆزیک کە بۆ چوار ژەنیار ئامادەکرابێت و یەکێک تیایاندا ڕۆڵێکی ڕابەر بگێڕێت

Soltando(I), Solely(E) بە تەنیایی.

Sombre(F), Dark, Melancholy(E) تاریک. ماتی{میلانکۆڵی}.

Sommesso(I), Subdued(E) تەواو خامۆشی، زۆر سـووک.

Sommet(F), Climax(E) ترۆپک، هاوگ{ئاوج}،

لە هونەری مۆزیکدا...مەبەست لە لێهاتوویی هونەرمەندە چ سـترانبێژ بێت یاخود ژەنیار کە کارامانە لە بەشـێکی زۆر گرنگی کارێکەیدا بتوانێت والاکاری خۆی زۆر بەکاریگەر و تەواو دڵگیر پیشانبدات.

Sommo(I), Highest, Greatest(E) بالاترین، گەورەترین، بەرزترین، ئاوج.

Son(F), Sono(I), Sonus(L), Sound, Tone(E), Klang(G) دەنگ، تۆن.

Sona, Suona(Ch.), Chinese double-reed shawm(E) سـۆنا، سـورنای چینی.

Sonabile(I), Resonant, Full toned(E) تۆنی تەواو، زرنگیو.

Sonante(I), Sounding, Ringing, Resounding(E) ڕنگان، زرنگان، دەنگین.

Sonare(I), To sound, To play(E) بژەنێت، بدەنگێت.

Sonare alla mente(I), To improvise(E) سـەرپێـییکردنی ئاوازێک.

سۆناتا، لێرشتەپەیڤێکی سـناڕێ*Snare*ی ئیتالیاییە بەمانای                Sonata(E), Sonate(I)
ئاوازهاوردن دێت یەکێکە لەو داهێنراوە والا و گرنگانەیە لە هونەری مۆزیکدا، بریتیە لە پارچەیەک کە بۆ سـۆلۆیەک، هاوبارییەک یاخود ئامێرێک ئامادەکرابێت کە بەگشـتی چوار جووڵەی لەخۆ گرتبێت. لە هەگبەی باڕۆکدا وەک کارێکی فرەجووڵە بۆ گروپێکی بچووک لە ئامێران ئاماژەی پێدەکرا کە بەزۆری بۆ سیانی*Trio*یەک دەهۆنرایەوە. لە هەگبەی کلاسیکدا چەند مانایەکی ئامێراڵ*Instrumental*ی لەخۆگرت لەلایەن مۆزیکدانەرانی وەک هایدن، مۆزارت، بێتهۆڤن و هاوچەرخانیان. لە سەردەمەدا هەر ناوێکی وەک سـۆناتا، سیانە*Trio*، چوار ژێژەنی*String quartet*، پێنجژەنی*Quintet* یاخود سیمفۆنی*Symphony*ببرایە هەمووی گوزارەی لە نووسینێک دەکرت کە لە سـێ یاخود چوار جووڵەی جیاواز لە هەوەس*mood* و تێمپۆ پێکهاتبێت.
یەکەم جووڵە بەگشتی پێکهاتووە لە شـێووگە سـۆناتا*Sonata form* کە فراوان دەبێتەوە و دوولاشێوگ*Binary form*ی سـەرەکیش دەبێتە سـێ بەش:ـ
1. پێشــەند*Exposition, Statement*، کاتێک کە دەنگەکان دێنە ناو میلۆدیەکەوە پێیدەوترێت ڕشــتە*Theme*. دەسـپێکی پێیدەوترێت پێشــەند. پێشەندیش دوولا شـێووگـئامێزە، یەکەمیان یەکگرتنەوەی ڕسـتە سەرەکیەکانی ڕشتەکە*Theme*یاخود گروپی ڕشــتەکانە لە پایەتۆنەکەدا*Tonic*. دووەمیان زیاتر شێوازێکی سترانی*Lyrical*لەخۆدەگرێت.
لە پێشەند*Exposition*دا....یەکەم بابەتی سـەرەکی لەسەر کلیلی خۆی پیشاندەدات، پاشان دەوازێتە بابەتی دووەم لەسەر کلیلێکی تر کە بەگشتی زاڵە*Dominant*ئەگەر لە کلیلی مێجەر بێت، یاخود نزیک لە مێجەر ئەگەر لە کلیلی ماینەردا بێت، پاشان داخستنی ڕشتە*Theme*پەیوەنداره بە بابەتی یەکەم و بە کۆدێتا*Codetta*یش تەواودەبێت.
2. گەشند یاخود پەرەپێدراو*Development*، بریتیە لەو ئامڕازانەی*Material*کە هەر پێشتر پێشکەشکراون بەڵام بەشێوەیەکی گەشەی پێدراوتر، لەم بەشەدا تیایدا سـیما و هاوگرتوویەکی نوێ لە ڕەوشی کلیل گۆڕانەکاندا*Modulation* بەخۆوە دەگرێت.
3. هێنانەوەی ڕسـتە سەرەکیە*Recapitulation*، کە ڕەپاتبوونەوەی پێشەندە و بەشی گەشندەی پێوەئاڵۆزاوە و بە کلیلی پایەتۆنیک*Tonic key*تەواودەبێت، کۆدێتا*Codetta*یش لێرەدا پەرەپێدەدرێت بۆ کۆدا*Coda*.
سـۆناتا فۆرم، سـۆناتا شێووگ، پێیشیدەوترێت شــێووگی یەکەم جووڵە*first movement form* و پێکهاتەی دوولا شێووگ.شـێووگەکە لە سـێ بەش پێکهاتووە:ـ
1. پێشــەند*Exposition*.        2. گەشند یاخود پەرەپێدراو*Development*.
3. هێنانەوەی ڕسـتەی سەرەکی*Recapitulation*.

| Expositon | Development | Recapitulation | Coda |
|---|---|---|---|
| 1 | 2 | 3 | |

سـۆناتای هەیوان، سـۆناتای ژوور.                Sonata da camera(I), Chamber sonata(E)

Sonata da chiesa(I), Church sonata(E) **سـۆناتای کڵێسە، بەزۆری تریۆـ سـۆناتایە بە چوار جووڵە:ـ خاو***Slow* **ـ گورج***Quick* **ـ خاو***Slow* **ـ گورج***Quick*.

Sonata rondo(E) **سـۆناتای خولاوە، ڕەوشێکی سـۆناتا فۆرم و ڕۆندۆ فۆرمە، لە ڕۆندۆ فۆرمدا کە پێنج بەشـە و پێکهاتوون لە** A B A C A. **لە سـۆناتا ڕۆندۆ ئەم بەشانە دەبنە**A B A C A B **لەگەڵ کۆدا***Coda* **کە تیایدا** A **دەبێتە بابەتـی یەکەم***First subject*، B **دەبێتە بابەتی دووەم و** C **دەبێتە بەشـی گەشـند***Development*. **ئەم شـێوەسـۆناتایە لەلایەن بێتهۆڤن/ەوە زۆر بەکاردەهات.**

Sonatilla, Sonatina(I), Sonatine(F), Short sonata(E) **سـۆناتینا، کورتە سـۆناتا کە بەگشتی لە سـۆناتا ئاسـانترە، لە دوو بەش پێکهاتووە کە بریتین لە پێشـەند***Exposition* **و هێنانەوەی ڕسـتە سەرەکیە***Recapitulation*.

Sonatore(I), Player(E) **سـۆناتەر، ئەو مۆزیکزانەی سۆناتا بۆ ئامێرەکان دادەنێت.**

Song(E), Canzone(I) **سـتران، ئاواز، گۆرانی، هەسـت دەربڕینێکی سـروشتیە، ئەگەر دەنگ نەبایە، بەزمی ژیان بەچەشنێکیـتر دەبوو. ئەگەر دەنگ نەبوایە، پەیوەندی نیوان مرۆڤ و بوونەوەرانیـتر نەدەبوو، ئەگەر سـتران و ئاوازیش نەبایە هەستیان بۆ یەکتر نەدەبزوا.**

**سـتران وەک زاراوەیەکی مۆزیک چ خۆی بەتەنیا و چ بەهاویاریی***Accompaniment* **لەگەڵ ئامرازیتردا دەکرێت بە چوار بەرەوە:ـ**

1. **سـروودی ئایینی کە مێژوویەکی زۆر دێرینی هەیە و تا ئێستایش ڕۆڵی کاریگەری هەیە لە بۆنە و سـرۆت و ئاهەنگە ئایینـیەکاندا. بۆ نموونە لە کڵێسـە کاتۆلیکەکاندا بە شێوەی تەرنیمە***Hymn*، **کۆنویژ***Mass*، **مۆتێت***Motet*، **ئۆراتۆریا***Oratoria*...، **یاخود لە دینی بوزایی***Buddhism* **و هیندۆسیـی***Hinduism* **و زاردەشتیی/دا کە وەک کۆڵەکەیەکی سـەرەکی بۆ بەجێهێنانی ئەرکە ئایینیەکانیان، لە کوردستاندا ئایینی ئێزدیی و یارسـان{ئەهلی هەقە} سـروودی ئایینی کۆڵەکەیەکی سەرەکیـیە لە سـرۆتەکانیناندا.**
2. **سـترانی فۆلکلۆری***Folk song***کە دەماودەم و سـینەبەسـینە هاتووە و هەمیشـە لەسەرزازی خەڵکدایە و بۆتە بەشێکی زۆر سـەرەکی لە پێناسـەی نەتەو و کەلتووریدا.**
3. **سـترانی میللی و باو** *(Popular song(pop song*. **کە لەنێو کۆمەلگادا زۆر جار شـێوەیەکی بازرگانی بەخۆوە دەگرێت.**
4. **سـترانی هونەری***Art song***کە شـێوەیەکی گۆڕاوی مۆدێڕنی بەخۆوە گرتوە، وەک ئۆپێرا و ئۆپەرێت.... .**

Song form(E) **شـێووگە ستران ، فۆرمە سـتران.**

**زاراوەیەکە فرۆزەی پێکهاتەیەکی سـادە دەکات کە بریتیە لە** A B A، **مۆزیکزانی ئەڵمانیایی شۆبرت هەندێک نموونەی لەم فۆرمە هەیە. لە مۆزیکی میلیدا زۆر لە فۆرمەکان دوولا فۆرم**A A B B **یاخود سـیانەفۆرمن**A B A. **لە سـتاندەر جاز/دا بریتیە لە** A A B A.

Song without words(E) **سـترانی بێ هۆنراوە.**

Son harmonique(F) **بڕوانە/***Overtone*.

Soni alterati(I), Chromatically altered notes(E). نۆتە بەدوایەکەکان بەڕەوتێکی کرۆماتیکانە

Sonoramente(I),Sonorously(E) بە شێوەیەکی دەنگیانە.

Sonore(F), Sonoro(I), Sonorous(E) پڕدەنگ.

Sonorissimo(I), Very sonorous(E) زۆر پڕدەنگ.

Sonsania(E) بڕوانە/*Hurdy-gurdy*.

Soot(Kr), Whistling by Mouth(E) سـووت، فیکەکردن بە دەم.

Sootık(Kr) سـووتک، بلوێری گڵین.

بلوێری لە گڵ دروستکراو. پاش خۆشەکردنی گڵەکە دروستکردنی بەو شێوەیەی دەخوازرێت، دەخرێتە کوورەی ئاگروە تا دەگاتە پلەی سـووتاندن، هەر لەبەرئەوەیشە کە پێیدەوترێت سـووتک.

Sopra(I), On, Over, Higher(E) سـۆپرا، لەسەر، بەسەر، بەرزتر. بۆ نموونە کاتێک دەسـتێک بەسـەر دەسـتەکەی تردا دەبرێت لە پیانۆژەنیندا.

Soprana(I) سـۆپرانا، سـۆپرانیێژی دەنگ مێیینە.

Soprano(E,F,I), Superius(L), Sopranistin(G) سـۆپرانۆ، واتە باڵاترین دەنگ کە مەودای لە تۆنی/Cناوەندەوە*Middle-C* تاکۆ تۆنی/C کە دەکاتە دوو ئۆکتاڤ.



بەگشتی...سـێ جۆری هەیە:ـ

1. سـۆپرانۆ دراماتیک،*Oprano dramatique(F), Soprano drammatica(I),*
   *Dramatic soprano(E)* یەکێکە لە جۆرەکانی دراماتیک.
2. سـۆپرانۆی شـێواز نەرمونیانی *Soprano léger(F), Soprano leggiero(I),*
   *Coloratura soprano(E)*
3. سـۆپرانۆی سـترانیی*Soprano lirico(I), Soprano lyrique(F), Lyric soprano(E)*
   *Soprano naturale, Falsetto(I), Male soprano(E),* سـروشـتە سۆپرانۆ،
   مەبەسـت دەنگی بڵندی پیاوانە.

Soprano clef(E) کلیلی سـۆپرانۆ، پێیشـیدەوترێت کلیلی/C.



Sopranino(E) سـۆپرانینۆ، پەردەی ئەو ئامێرانەیە کە مەودایان دەکەوێتە سەرو مەودای سۆپرانۆ. وەک:ـ سـۆپرانینۆ سـاکسـۆفۆن، سۆپرانینۆ ڕیکۆردەر.....هتد.

Sopraniniblockflöte(G), Sopranino recorder(E) سـۆپرانینۆ ڕیکۆردەر{بلوێر}، فلاژولا.

Sopranino saxofon(G), Sopranino saxophone(E) سـۆپرانینۆ سـاکسـۆفۆن.

Sopranissimo saxophone(E) سـۆپرانیسیمۆ سـاکسـۆفۆن،

بە نازناوی سۆپریلۆ*Soprilo* و پیککۆلۆ سـاکسـۆفۆن*Piccolo saxophone*یش ناودەبرێت کە بە مەودای یەک ئۆکتاڤ لە سـۆپرانۆ باڵاترە.

Soprano bassoon, Fagottino(I) سـۆپرانۆ باسـسـوون، فاگوتینۆ،

ئامێرێکی بچووکە لە خێزانی باسـسـوون.

Sopratonica(I), Supertonic(E) بڕوانە/*Degree*.

Sopra una corda(I), Play on one string(E) ژەنین لەسـەر یەک ژێ.

So rasch wie möglich(G), As quick as possible(E) بە پەلە تا بتوانرێت.

Sorda, Sordo(I), Muffled(E) پێکپە، ئامڕازی دەنگ کپ کردن.

Sordamente(I), Softly, With a muffled tone(E) بە نەرمی، بە سـووکە تۆنێکەوە.

Sordina(I), Surdus(L) بڕوانە/*Damp* . بۆ نموونە دەوترێت بە کپکراو*Con sordino(I), Muted(E)*، یاخود بێ کپکراو*Senza sordino(I), Unmuted(E)*.

Sordina di metallo(I), Metal mute(E) پێکپەی کانزایی.

Sordina wawa(I), Wah-wah mute(E) پێکپەی واوا{واهواه}، لە جاز ـ باندەکاندا بەکاردێت.

Sordone(I), Sordun(E,F,G) ئامێرێکی هەوایی دەبڵ ڕیشەی و لوولەیی سـەتەکانی شانزە و حەڤدەیە، دوانزە کونەپەنجەی تیادایە، تاڕادەیەک بە ئامێری کرومهۆرن*Crumhorn*دەچێت.

Sorgfalt(G), Care(E) بایەخ، ئاگادار.

Sorgfältig(G), Carefully(E) بەئاگاداربیەوە.

Sorpresa molto(I), Very surprised(E) زۆر سـەرسام.

Sorridendo, Sorridente(I), Smiling(E) بە خەندەوە، پێکەنین.

Sortita(I) سـۆرتیتا، یەکەم سترانبێژ لە ئۆپێرایەکدا کە ڕابەرێتی دەسپێکردنیان دەکات، تەواو بوونێکی خوایشـتانە.

Sospirando(I), Catching the breath(E) هەناسـەکێشان، ئاە هەڵکێشـان.

Sospirante(I), Plaintive, Sighing(E) ماتوپەژار، ناڵە، ئاە.

Sospiro(I), Sigh(E) ئاە، ناڵەو زار، هەنسک.

Sospiroso(I), Sighing deeply(E) ئاهێکی لە ناخ دەرچوو.

***Sost. or Sosten.*** کورتکراوەی/*Sostenuto*.

Sostenendo(I), Sustaining(E) سـۆسـتێنێندۆ، درێژەدان بە مانەوە،

Sostenente(I), Sustained(E) درێژەپێدراو.

Sostenuto, Tenuto(I), Soutenu(F), *Sustaining of tone or slackening of tempo(E)* سـۆسـتێنوتۆ، مەبەسـت لە مانەوە و درێژەپێدانی تۆنە یاخود خاوکردنەوە و ئاسـتنکردنی تێمپۆ

Sostenuto pedal(E), Tonhaltepedal(G) پایدەر هێشـتنەوە، پێداڵ هێشـتنەوە.

Sostituzione(I), Change of finger(E) پەنجەگۆڕین.

Sotto(I), Sous(F), Under, Below, Beneath(E) ژێر، بن، لەخوار.

Sotto dominante(I), Sous dominante(F), Subdominant(E) بڕوانە/*Degree*.

Sottotonica(I), Sous tonique(F), Subtonic, Leading note(E) بڕوانە/*Degree*.

Sotto voce(I), In the lowered tones, Softly(E) ژێردەنگ، بە ناسکی، لە تۆنە نزمترەکان. نزمکردنەوەی دەنگ بۆ نموونە بە ئامڕازی پێکپـە*Sordina*.

Soudainement(F), Suddenly(E) **کتوپڕ.**
Souffle(F), Breath(E) **هەناسە، دەنگ.**
Sound(E),Tonale, Sonnons(F), Suono(I) **دەنگ.**
Sound post(E) **دەنگــگەیـێن، ســتوونە دەنگ، ئەو پارچە تەختە باریک و بچووکەیە کە بۆتە کۆڵەکە لە ناوەوەی ئامێری کەمانچەدا لەنێوان ڕووی ژێرەوەی و ڕووی سـەرەوەی کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر پردەکەوە*Bridge* کە ژێیەکانی بەسـەردا دەڕوات، لەڕێی ئەم سـتوونەتەختەوە دەنگی ژێ/یەکان دەگاتە ناو سـنگی کەمانچەکەوە و بەم شـێوەیە دەنگدانەوە پەیدادەبێت، ئەم سـتوونە لە ئامێرە ژێدارەکانی وەک سـاز، تەمبوور، سـەنتوور، چێللۆ، ڤیۆلا و کۆنتەرباس و...دا هەیە.**
Soupir(F), Crotchet rest, Quarter rest(E) **وچانی کرۆش یاخود چارەک{1/4ی تۆنی تەواو}.**
Sourd(F), Deaf, Deaf person(E) **کەڕ.**
Sourd(F), Muffled(E) **کەڕە، کپیو، بڕوانە/***Sorda*.
Sourdine(F), Soft pedal(E) **نەرمە پایدەر لە پیانۆدا، کەمکەرەوەی هەوا لە ئامێری هارمۆنیۆمدا بۆئەوەی کۆردکان بە تەواوی بژەنرێن.**
Sousafon(G), Sousafono(I), Sousaphone, Bass tuba(E,F) **ئامێری سـۆوزافۆن، باس تووبـا، براس ئامێرێکـی هەوای/یە، لە داهێنراو و دروستکردەی مۆزیکزانـی ئامریکایـی جۆن فیلیپ سـۆوزا***J.P.Sousa*{1854-1932ز}**یە.**
Soutenir(I), To support(E) **ڕاگرتن، توندکردن.**
Sous-médiante(F), Submediant(E) **بڕوانە/***Degree*.
Sozîdıİ(Ar,Kr,Tr) **ســۆزیدڵ، لێڕشتەیەکە لە دەســگای حیجاز ، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی عوشیران، ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی بوسەلیک.**

**ئەی مانگ ئەزانم تۆش دەردەداری تۆش بە وێنەی من عاشقی زاری**

**کەمالی، بەدەنگی: علی مەردان**




Sozîdıİara(Ar,Kr,Tr) **ســۆزیدڵارا. لێڕشـتەیەکی سـەربە دەسگای ڕاستە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا.**



Soznak(Ar,Kr,Tr) ســۆزناک، لێرِشتەیەکی دەســگای ڕاستە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ
ڕەگەزی ڕاست لەسەر پلەتۆنی ڕاسـت، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی نەوا.

شـەو و ڕۆژ لە خەیال و لەبەرچاوی لەسەر کوڵما پەخشە پەرچەمی خاوی

بەدەنگی:عەلی مەردان




Space, Interval, Spatium(L) بۆشـایی، میانە هێڵەکانی سەروو و خواری سـکێڵەمۆزیکەکان.



Spalla(I), Shoulder(E) شــان.

Spalliera(I), Shoulder rest(E) پشووی شــان.

Spandendo(I), Expanding, Gettinh more powerful(E) فراوانکردن، زیاتر هێزدان بەخۆ.

Spanish guitar(E), Spanische gitarre(G) گیتاری ئیسپانیایی.

Spannen(G), Spasimo(I), To tighten, Tension(E) توندی، گرژبوون.

Spectre(F), Spettro(I), Spectrum(E) شـــەبەنگ.

Spendedo(I), Promptly(E) یەکسەر، بەخێرایی.

Spendiendo(I), Speeding, Hurring(E) خێرایی.

Spedito(I), Quick(E) گورج، پەلە.

Spezzato(I), Broken(E) شکاندن، پارچەکردن، مەبەست لە بەشـبەشـکردنی ئامێرەکان و دەنگەکانی کۆرس بۆ گروپی بچووکتر و پاشان بنیاتنانەوەیان.

Spianato(I), Level, Smoothed(E) ســفت، لووس.

Spiccato, Staccato(I), Separated, Detached(E) جیاجیا، ناپەیوەسـت، سـتاکاتۆ.

Spiegando(I), Unfolding(E) دەنگرِۆشنی، دەنگ بەرەوکردنەوە.

Spiegata(I), With full voice(E) پڕبەدەنگ.

Spiel(G), Play(E), Jouez(F), Spettacolo(I) ژەنین.

Spieler(G), Player(E) ژەنیار.

Spinet(E), Spinett(G), Spinetta(I), Épinett(F) سـپینێت، هارپسیکۆردی بچووک.

Spingendo(I), Pressing forward(E) فشــاربردن بەرەوپێشەوە.

Spirafina(I), Glass harmonica(E) هارمۆنیکای شــووشــە.

Spirito(I), Spirit(E) یەزد، ڕەوان، گەوهەر.

Spiritoso(I), Spirited(E) بەگیانی بەجۆشەوە.

Spitze(G), Point, Nib(E) نووک، سـەر، سـەرتیژ.

Split note chords(E) . C, E, G, G# :کۆردە نۆتەی ترازاو کە بریتیە لە

Spread harmony, Open harmony(E) هارمۆنی کراوە.

Springbogen(G), Spiccato, Saltando, Saltato, Sautillé(I) هەڵبەزین بە کەوان، Playing with a bouncing bow(E)

لە ئامێری کەمانچەدا شێوازی بەکارهێنانی کەوان لە ژەنینیدا دوو چەشن لەخۆدەگرێت:ـ

1. ژەنینی نۆتەی ناـ پەیوەستSpiccato کە بریتیە لە دانانی پنت لەسەر نۆتەکان.
2. ژەنینی نۆتەی ناـ پەیوەست بەڵام پنتێکی درێژتر و بەرزتر کە پێیدەوترێت سەڵتاتۆSaltato، لەکاتیکیشدا ئەم چەشنە کارییێدەکرێت کە چەن ستاکاتۆیەکی یەکسان هەبێت و بۆ یەکجار پیاکێشانی کەوان لێبدرێت.

Springer(E) دەو، سپرینگەر، نۆتەیەکی یاردەر{نۆتیلە}Auxiliary note لەنێوان دوو نۆتەی سەرەکیدا کە کاتی پێش نۆتەی خۆی وەردەگرێت، پێیشیدەوترێت Accent,Aspiration, plainte(F), Nachslag(G)، جیاوازی لەگەڵ ئاپۆجیاتۆراAppoggiaturaدا ئەوەیە کە ئەمەی دواییینیان نۆتیلەکە ڕەدوی کاتی نۆتەی پاش خۆی دەکەوێت.




Sprung(G), Leap(E) پەڕین، باز، دەو.

Square time, March time(E) کێشــی 4/4، ڕەزمی مارشی{سـوپایی}.

Sruti(Hn) سـروتــی، میانەیەکی مۆزیکایی هیندییە کە لە نیوەتۆن بچووکترە.

Staccatissimo(I) سـتاکاســیمۆ، لێدانی نۆتەیەک بە کاتێکی1/4 و سـێ چارەکەکەی ترthree-quarterبە بێدەنگی دەمێنێتەوە.

Staccato(I), Stakkato(G), Détaché(F), Detached(E) سـتاکاتۆ، دیتاچـێ، نۆتە ژەنینی ناپەیوەست(جیاجیا:پچڕپچڕ:ستاکاتۆ) بە کەوان.




Staccato Volante(F), Slurred spiccato, Flying Staccato(E) فڕیوە سـتاکاتۆ.

کەوانەکە دەبرێت بەسەر ژێیەکەدا بۆ پچڕپچڕکردنی پەردەکان بەڵام لەSlurred staccato/دا بۆ هەر نۆتەیەک کەوانەکە بەهەمان ئاڕاستە دەگەڕێنرێتەوە و دەبرێتەوە بەسەر ژێیەکدا، بەزۆریش کەوانەکە بەرەو سـەرەرەوەUp-bowدەبرێت.

Stacked triad(E) سـیانیی هەڵچنراو لەسەریەک ، جۆرێکە لە ئارپیجیۆ، لەگەڵ ئۆکتاڤێک یاخود دوو سیانیی هەڵچنراو لەسەریەک، لە سکێڵی پایەتۆنTonic، ناوەندەتۆن/Mediant و زاڵ/Dominant سـازبکرێت، پاشان بە پلەی پایەتۆن ڕەپاتبکرێتەوە و بخرێتەسەر بەرزترین تۆن. بۆ نموونە لاـ ماینەر سیانەی ڕیزبەند کە بە A-C-E-A-C-E-Aدەنۆتێنرێت و وەهەروەها بۆ ســیانییەکانیــتر.... .

Staff, Set of parallel lines(E) هێڵاســۆ، ستاف، کۆمەڵە هێڵێکی ئاسۆیی کە بە پێنج هێڵەتەریێکی سـەرەکی هێڵاســۆیەک پێکدهێنن، هێمای کات و کلیلی لەسەرە.




هێمای کلیلەکانیشClef signs.... لەسـەر هەر هێڵێک ناوێکی خۆی هەیە، لەوانەیش:ـ

1. کلیلی تیژTreble clefکە بەرزترین پلەیە، پێیشیدەوترێت کلیلی سـۆڵ/G-clef.




2. کلیلی گڕBass clef پێیشیدەوترێت کلیلی فا/ F-clef




3. کلیلی ئاڵتۆAlto clef پێشیدەوترێت کلیلی دۆ C-clef




Stahlharmonica, Glockenspiel(G), Steel harmonica Carillon(E) هارمۆنیکای پۆلاسازکردە.

Stahlplatte(G), Steel plate(E) پلێتی پۆلا.

StahlSaite(G), Steel string(E) ژێی پۆلاسازکردە.

Stanchezza(I), Wearily(E) بە بێزاری، داهێزراو.

Standup bass, Double bass(E) دەبڵ باس.

Stanza(I), Verse(E) بڕوانە/Vers.

Stark(G), Strong, Loud, Forte(E) بەهێز، دەنگی بەرز، توند.

Stark anblasen(G), Strongly blown(E) فووپیاکردنی بەهێز{لە ژەنینی ئامێرە هەواییدا}.

Stärker(G), Stronger, Louder(E) بەهێزتر.

Stave(E) بڕوانە/Staff.

***St.B.*** کورتکراوەیString bass، بڕوانە/Double bass.

***St.D.*** کورتکراوەیStopped diapasons، بڕوانە/Flute stops.

Steg(G), Bridge(E) دامە، پێڵ، پرد، خەرەک، ئەو پارچەتەختەیەی بەسەر سـنگی ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە و تەمبوور و سـەنتوور و مانەندیانەوە هەیە و تەلەکەی بەسەردا دەبرێت.

***Steg.***(G), At the bridge(E), Ponticello(I) نزیک بە دامە{پرد}کەوە، ئاماژەیە بۆ پیاڕابردنی کەوانەکە بەسـەر ژێیەکاندا نزیک بە دامەکەوە.

Steigendes interval(G), Ascending interval(E) میانە هەڵبەزیوەکان.

Steigern(G), To intensify, To increase(E) زێدەبکرێت.
Steigerung(G) بڕوانە/*Crescendo*.
Stendendo(I), Slowing(E) بڕوانە/*Rallentando*.
Stentamento(I), Slowly(E) بە شـێوەیەکی خاوی.
Stentando(I), Playing i a laborious manner(E) ژەنینێکی بە ڕەوشێکی بەهەوڵ و بێوچان.
Stentare(I), Heavily slowing(E) خاوبوونەوەیەکی قورس.
Stentato(I), Forced, Stentorian(E) بەفشـار، بەزۆر.
Step(E) هەنگاوی سـەمادا، پلەی دەنگ، میانەی پلەدەنگەکان لە سـکێلێکدا.
Stereo(E), Stéréo(F), Stereofonia(I) دەنگی سـتیریۆ.
Steso(I), Extended, Spread out, Slow(E) کشـان، وەشـاندن، خاو.
Stesso, Stessa, Stessi, Stesse(I), Same(E) هەمان.
Stets(G), Steadily, Always(E) هەمیشە، چەسپاوانە.
Sticcardo Pastorate(I), Glass harmonica(E) هارمۆنیکای شـووشـە.
Sticcarto, Strohfiedel(G), Xylophone(E) ئامێری زایلۆفۆن.
Stiel(G), Stem of note(E) ملی نۆتە.
Stift(G), Tube(E) لوولک.
Stile antico(I), Old Style(E) چەشـنی کۆن{ئانتیکە}،
مەبەست لە سـەتەی شـانزە و بە دواوەی کە پێشـیدەوترێت چەشـنی ڕۆمان*Roman style*.
Stile concitato(I), Baroque style چەشنی جۆش و خرۆش، دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی
باڕۆک کە لەلایەن کلاودیۆ مۆنتیڤێردی(1567-1643)*Claudio Monteverdi*یەوە پەرەپێدرا.
Stile moderno(I), Modern style(E) چەشنی مۆدێرن.
Stile risentito(I), Vigorous style(E) چەشنی توند.
Still(G), Quiet, Calm(E) هێمن.
Stille(G), Silence(E) بێـدەنگ.
Stimmen(G), Tuning(E) دەنگ، سـاز.
Stimmflöte, Stimmpfeife(G), Pitch pipe(E) پەردە لوولەی ئۆرگن.
Stimmung(G), Tuning, Temperament(E) بڕوانە/*Accordatura*.
Stinguendo(I), Fading away(E) پەژمردەبوون بۆ گواسـتنەوەی بارێک بۆ بارێکیتر.
Stiracchiando, Stiracchiato, Stirando, Stirato(I) بڕوانە/*Ritardando*.
Stomp, Heavy beat(E) بەجۆش، ڕەزمێکی جازە*Jazz* کە بە لێدانێکی قورس نیشانە دەکرێت.
Stonante(I), Dissonant(E) ناسـازە دەنگ.
Stonare(I), To sing out of tune(E) سـترانی بەدەر لە تۆن، سترانی ناساز.
Stop, Knob(E) دوگمەی ئۆرگن، فشاری پەنجە لەسەر دەستڕووی تەلەکانی ئامێرە ژێدارەکان.

Storia(I), History(E) دیرۆک، مێژوو.
Storto(I), Crooked, Twisted(E) لاولاو شێوە، پێچەک، کۆلاب، قولاپ.
Stracciacalando(I), Babbling, Prattling(E) شۆخیباز، چەنەباز.
Straccinato(I), Dragging(E) بڕوانە/*Ritardando*.
Straff(G), Tight, Strick(E) سزا، توندکردنەوەی پێستی تەپڵ.
Strain(E), Accablement (F), Aggravio(I) میلۆدی، زەنگی دەنگ، شێواز.
Strambotto(I), Rustic song(E) سترانی گوندەکی.
Strappato(I), Strong pizzicato(E) پزیکاتۆی بەهێز.
Strascicando, Strascicnando(I), Heavy sluring(E) بڕوانە/*Portamento*.
Stravagante(I), Fantastic(E) فانتاسیی.
Streichinstrumenten(G), Bowed instrument(E) ئامێری کەوانەدار.
Strepito(I), Noise(E) دەنگەدەنگ، هەراوهوریا.
Strepitoso(I), Noisy, Instrumental effect(E) هەراوهورییایی،
لەو شوێنەی کە ژەنیار بەشێوەیەکی خێرا و ڕەپاتبوونەوە دوو نۆتە لە کۆردێکی تایبەت دەگۆڕێت.
Stretta, Strette(I), Accelerated, Brought together Faster(E) بەپەلە،پێکەوەهێنان،خێراتر
یاخود توندی، گوشین*Tightening, Squeezing*.ئەم جۆرە بەزۆری لە سەتەی نۆزەدەمدا وەک
پاساوێک*Passage*لە کۆتایی ئاریا*Aria*یەکدا.
Strettissimo(I), Very hurriedly(E) بەهەڵەداوان.
Strich(G), Bow stroke(E) لێدان بە کەوان.
Strict(E), Sévère(F), Severo(I) تەواو، توند، سەخت.
Strict imitation, Canonic imitation(E) لاسایی بەشێوازی کانون.
Stridente(I), Rough, Harsh(E) بڕوانە/*Martellando*.
Strillanti(I), Screaming(E) چەهچەهە.
Strimpellata(I), Strumming(E) گەمەکردن بە ژێی.
String(E), Corde(F), Cordicella(I) ژێ، سیم، تەل، تار.
String band(E) باندی ئامێرە ژێدارەکان.
***String.*** کورتکراوەیە بۆ*Stringendo*.
Stringendo(I), Squeezing together, پێکەوە گوشین، پەلەیەکی بەرەو توندی.
Rapid accelerando with crescendo(E)
Stringere(I), To hasten(E) خێرابکرێت.
Stringed instruments(E) ئامێرە ژێدارەکان.
String music(E) مۆزیکی ژێ، مەبەست لە مۆزیکی ئامێرە ژێدارەکانە.

String orchestra(E) ئۆركێسترای ژێ، پێكهاتووه له یەكەم و دووەم دەستە له كەمانچە، چێللۆ و دەبڵ باسەكان.

String quartet(E) ,Streichquartett(G) چوار ژێداره، مەبەست له چوارئامێری ژێداره، پێكاتووه له دانەیەك له یەكەم و دووەم كەمانچەژەن، ڤیۆلاژەن و چێللۆژەن.

String quintet(E), Streichquintett(G) پێنج ژێداره، مەبەست له پێنج ئامێری ژێداره. پێكاتووه له دوو كەمانچەژەن، یەك ڤیۆلاژەن، چێللۆژەن و دەبڵ باس یاخود بەگوێرەی خواست.

String trio(E), Streichtrio(G) سێ ژێداره، مەبەست له سێ ئامێری ژێداره. پێكاتووه له دوو كەمانچەژەن، یەك ڤیۆلاژەن، یاخود كەمانچەیەك، ڤیۆلا و چێللۆیەك.

Strisciando(I), Streichzither(G), Smooth, Gliding(E) بڕوانه/*Glissando*.

Strisciato(I), Smooth, Slurred, Trailed(E) بڕوانه/*Glissando*.

Strohfiedel(G), Straw fiddle, form of Xylophone(E) شێویەكه له زایلۆفۆن.

Stromentato(I), Scored for instrument, Instrumented(E) نووسراو بۆ ئامێر، بەئامێركراو.

Stromentato recitativo(I), Recitative instrument(E) گێڕانەوەی ئامێرالی.

Stromenti d´arco(I), String instruments(E) ئامێره بەكەوانەكان{ژێدارەكان}.

Stromenti da tasto(I), Keboard instruments(E) ئامێرەكیبۆردەكان.

Stromenti di fiato(I), Wind instruments(E) ئامێره هەواییەكان.

Stromenti di legni(I), Wood instruments(E) ئامێره تەختەییەكان.

Stromenti di metallo(I), Metal instruments(E) ئامێره كانزاییەكان.

Stromenti d´ottoni(I), Brass instruments(E) ئامێره براسیەكان.

Stromento(I), Instrument(E) ئامێر.

Stromenti(I), Instruments(E) ئامێرەكان.

Stromento elettrofono(I), Electrophonic instruments(E) ئامێره كارۆفۆنیەكان.

Strong beat(E) لێدانی بەهێز، بڕوانه/*Beating*.

Strophe(E), Strofa(I) سترۆفه، له ڕیشەپەیڤی سترۆفێین*Strophein*یۆنانییەوه هەڵێنجراوه كه بەمانای بادانەوه{گەڕانەوه}*To turn:TO twist*دێت. بەزۆری لەسەر بەزمی سترانی میللی و هونەری هەڵچنراو لەسەر سترانی میللییە، هەڵبەستراوەكەیشی بریتیه له پارچەیەك له چامەی یۆنانی كه دەستەیەك له سترانبێژان له ڕاستەوه بۆ چەپ دەیخوێنن و ڕەپاتبوونەوه بڕگەكان*Stanza*یش بەهەمان ڕەزم بۆ ڕۆیشتن بۆ سترۆفەی ئاینده.

Structural notes(E) نۆته داڕێژراوەكان{دامەزراوەكان}، بریتیه له نۆتەی یەكەم و چوارەم و پێنجەم له سكێلێك كه دادەنرێن به ڕەگی سێ سیانییه سەرەتاییەكان*Three primary triads*.

Strum(E) نقورچگرتن له ژێیەكان به سەری پەنجەكان یاخود هێنانی ڕیشە بەسەریاندا.

Strumentato(I), Orchestrated(E) بڕوانه/*Stromentato* ، به ئۆكێستراكردنی ئامێرەكان.

Strumenti a pizzicato(I), Plucked instruments(E) ئامێره پزیكاتۆییەكان، بڕوانه/*Pluck*.

Strumento(I) بڕوانە/*Stromento*.

Strumento melodico(I), Melodic instrument(E) ئامێری میلۆدی.

Strumento ritmico(I), Rhythmic instrument(E) ئامێری ڕەزم.

Strumento solistico(I), Solo instrument(E) ئامێری سـۆلۆ.

Stück(G), Piece, Composition(E) پارچە، دانراوەیەکی مۆزیک.

Stufe(G), Degree of a scale(E) پلەی سـکێڵێکی مۆزیک.

Stürmisch(G), Stormy, Passionate(E) زۆر تووڕە وەک ڕەشـەبا، تاوگیریی.

Stützend(G), Leading(E) بڕوانە/*Appoggiando*.

Stutzflügel(G), Baby Grand(E) پیانۆی سـێ پێ، پیانۆی مۆدێرن.

Stil(G), Stile(I), Style(E) چەشن، سـەبک.

Style(E), Stile(I) چەشن، مەبەست لەو بنەما سـەرەکیانەیە کە لە هونەری مۆزیکدا ڕۆڵێکی بالا لە بنیاتنانی چەشـنێکی تایبەت دەگێڕن و بریتیشن لە:ـ میلۆدی*Melody*، ڕەزم*Rhythm*، هارمۆنی*Harmony*، داینەمیکی مۆزیک*Dynamics*، شـێووگ*Form*....هتد. ئەمەیش لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێک، لە ولات و میللەتێکەوە بۆ ولات و میللەتێکیــتر، تەنانەت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تریش دەگۆڕێت.

Su, Sull, Sulla, Sui, Sugli, Sulle(I), On, Above, Upon, Up(E), Sur(F) سـەر، بالا، سـەروو، نزیک، لەسەر.

Suave(F,I), Sweet(E) شــیرین.

Suavemento(I), Sweetly(E) بە شوازێکی شــیرینانە.

Sub(L), Sotto(I), Sous(F), Under(E) ژێر.

Subbass Clef(E) کلیلی ژێر باس، بڕوانە/*Staff*.

Sub-contra bass(E) ژێرکۆنتراباس، باس گیتار.

Sub-contra octave(E) ئۆکتاڤی ژێر کۆنتراباس کە لە مەودای $C_0 – B_0$ و لە نێوان فریکوێنسی16,352Hz – 30,868Hzدایە.

Subdiapente(L), The under fifth(E) ژێر پێنجەم.

Subdominant(E) ژێرزاڵ، چوارەم پلە لە ســکێڵی مێجەر و ماینەر، بڕوانە/*Degree*.

Subdominant chord(E) کۆردی ژێرزاڵ، تۆنی ژێرزاڵ دەبێتە ڕەگ*Root* بۆ کۆردەکە.

Subitamente(I), Queckly, Suddenly(E) ناگەهانی، کتوپڕی، خێرایی.

Subito(I), Immediarely, Suddenly, Without pause(E) یەکسەر، کتوپڕ، بەبێ وچان.

Subject, Soggetto(I), Sujet(F) ڕشتە، بابەت، سوژە، بناخەی بیرۆکەیەک*Principal theme* لە شـێوەی فیوگە و سـۆناتا و....مانەندی.

Submediant(E), Sopradominante(I) ژێرناوەند، شـەشـەم پلە لە سکێڵدا.

Suboctave, The octave below a given note(E) ژێرئۆکتاڤ، ئۆکتاڤێک ژێر نۆتەی دراو.

Subordinate chords(E) کۆردە ژێرئاساییەکان. سـیانییەکان*Triad*لەسەر پلەکانی سـێیەم و شـەشـەم و حەوتەم بنیاتدەکرێن، هەروەکو کۆردە حەوتەمەکان جگەلە حەوتەمی زاڵ.

Subito piano(I), Suddenly quiet(E) لەپڕ بێدەنگ، *Sub.p.*کورتەیەتی.

Sub prelo(I), In the press(E) لەژێر پەستان.

Subsemifusa(L), Demisemiqaver(E) 1/32ی نۆتەی تەواو.

Subsemitone, Subsemitonium modi(L) بڕوانە/*Leading note*.

Sustitute chord(E), Accord substitué(F) کۆردی بریکار.

Substitution es doigts(F), Chenge of finger(E) پەنجەگۆڕین.

Subtonic(E) ژێرپایە، حەوتەم پلە لە سـکێڵی سـروشتە ماینەر، نیوپلە لە تۆننما*Leading tone*نزمترە.

Suite(F,E), Partita(G,I) سـویت، شـێوە مۆزیکێکی هەگبەی بارۆکە.

Suives(F), Attacca(I), Go on(E) شـلاو، لەســەر ڕۆیین. بەمانای بەدواکەوتن*Follow*یش دێت، وەک بەدوای دەنگ*Colla voce*.

Sul(I), Obove(E) سـەرو، لەسەر.

Sul bordo(I), Sur le bord(F), At the edge(E) لەسـەر لێوار.

Sul G(I), On the G string(E) لەسـەر ژێ تۆنی سـۆڵ/G.

Sulla corda La(I), On the A string(E) لەسـەر ژێ تۆنی لا/A.

Sull scena(I), Sur la scène(F), On stage(E) لەسـەر شـانۆ.

Sul ponticello(I), Sur le chevalet(F), Bow near the bridge(E) لەسـەر لێواری پرد، مەبەست لە لێخشاندنی کەوانە نزیک بە پرد، بەکورتی***sul pont.***

Sultana, Zither-Viol(E) سـوڵتانا، ئامێری زیتارـ ڤیۆلا کە لە سـەدەی هەژدەمدا هاتەبەرچاو.

Summen(G), Humming(E) هەمهەمەکردن، زەمزەمەکردن.

Suonata(I) بڕوانە/*Sonata*.

Suonatore(I), Player(E) ژەنیار.

Suoni armonici(I), Harmonics, Flageolet notes(E) هارمۆنیەکان، نۆتەکانی فلاجیولێت.

Souno(I), Sound, Note, Tone(E) دەنگ، نۆتە، تۆن.

Super(L), Supra(I), Above, Over(E) سـوپەر، سـەروو، لەبان.

Superacutae claves(L) بەرزترین پێنج نۆتە لە سیسـتەمی هێکساکۆردالّدا.

Superdominant(E) سـەروو زاڵ، بڕوانە/*Degree*.

Superbamente(I), Proudly(E) بەشـانازییەوە.

Subdominant(E) ژێرزاڵ، لازاڵ، شـەشەم پلەتۆن لە سکێڵدا کە دەبێتە ژێرناوەند*Submediant*یش.بڕوانە/*Degree*.

Sulٍtani yekga(Ar,Kr,Tr) سـولّتانی یەکــگا. لێرِشتەیەکی سەربە دەسگای نەهاوەندە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی یەکگا، ڕەگەزی حیجاز لەسـەر پلەتۆنی دووگا.




Superfluous(L), Augmented(E) زێدە.

Superfluous fourth(E) زێدەی چوارەم، ئەو نۆتەیەی کە ڕێژەی فریکوێنسیەکەی بۆ پایەتۆن*Tonic*دەکاتە25:18 کە یەکسانیشە بە 568,717cents.

Superfluous interval(E) زێدە میانە.

Supérieur(F), Superiore(I), Superior(E Greater, Highter(E) . سەرووتر، گەورەتر، بەرزتر

Supertonic(E), Sus-tonique(F) سـەرپایە، سـەروو پایەتۆن.

Supertonic seventh chord(E) کۆردێکی حەوتەم کە لەسەر دووم پلەی سـکێڵێک دامەزرابێت.

Supertonic seventh chord with raised root and third(E) کۆردی حەوتەمی گەسـتوو. *Diminished seventh chord*کە لەســـەر بەرزکردنەوەی دووەم پلە ســکێڵی مێجەرێک دامەزرابێت، ئەم کۆردە دەبێتەوە کۆردی پایەتۆن لە یەکەم هەڵگەڕاوەیدا.

Supertonic triad(E) سـیانیی*Triad*یەک لەسـەر دووەم پلەی سـکێڵێک دامەزرابێت.

Supplicando(I), In a Supplicating style(E) چەشـنی پاڕانەوە.

Supplichevole(I), Supplicating(E) پاڕانەوە.

Suppression(F), Removal, Deletion(E) چزکردن، سـڕینەوە.

Surbahar, Bass sitar(E) سـەربەهار، باس سـیتار/ی هیندی.

Surdelina(I), A kind of bagpipe(E) جۆرێکە لە ئامێری مەشـکەنای.

Surdité(F), Deafness(E) ئامڕازەی پێـکپە.

Sur le contretemps(F), Off beat(E) لێنەدان.

Sur le temps(F), Top of the beat(E) ئەوپەڕ{تۆپ}ی لێدان.

Surmandal, Swarmandal, Svaramandala(E) ســـورمەنداڵ، گچکە هارپی هیندی.

Surnai, Zurna(Ar,Fa,Kr) زوڕنا، سـوڕنا، لە ڕیشـە وشەلێکدراوی سـوڕنا/ی کوردییەوە هاتووە کە پێکهاتووە لە سوڕ بەمانای ئاپۆرە و ئاهەنگ دێت، پاشگری نا لە نای/یەوە هاتووە لوولکە ئامێرێکی هەرەدێرینە لە کوردەواریدا. کۆی وشەکە واتای نایی ئاهەنگ و ئاپۆرە دەگەیێت، ئەویش لەبەرئەوەی کە دەنگێکی زۆر بەرز و زوڵاڵی لێوەدەردەچێت.

Surprise cadence, Interrupted(Suspended)cadence(E) کادەنسی سووڕهێنەر، کادەنسی هەڵاویز*Suspended cacence*، کادەنسی پچریو، بڕوانە/*Cadence*.

Sus-dominante(F) بڕوانە/*Submediant*.

Suspended(E), Suspendu(F) هەڵاویز، بەکورتی/*sus*. ئاماژەیە بۆ کۆردێکی تایبەتی یاخود سـیانیی. بۆ نموونە:ـ Fsus4 بریتیە لە/F-Bb-C کە تیایدا سێیەمA بەرزکراییتەوە بۆ چوارەم کە تۆنی سـی ـ بیمۆڵە/Bb واتە لاـ دێز/$A^{\#}$.

Suspended fourth chordsE) چوارەم هەڵاویزە کۆردەکان، ئەگەر تۆنی سـێیەم لە کۆردێکدا بگۆڕێت بۆ تۆنی چوارەم وا هەستدەکرێت کە کۆردەکە حەز بە گەڕانەوە بکات بۆ تۆنی سـێیەم، جاروبار بەهەڵە پێیـدەوترێت کۆردی یانزەم.

Suspension(E,F,I,G)) ناسازییەک کە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ مانەوەی نۆتەیەک و پاشان بەهۆی تۆنێک یاخود نیوەتۆنێک شیبکرێتەوە بۆ نۆتە کۆرد پاشئەوەی کۆردەکە لێدەدرێت.




Suspended Chords(E) کۆردە هەڵاویزەکان.

| سیمبۆڵ Symbol | سیمبۆڵ Symbol | ناوی کۆرد Chord Name | میانەکانی کۆرد Chord Intervals |
|---|---|---|---|
| C sus | | C suspended | 1 4 5 |
| C7sus | C7sus4 | C seventh suspended | 1 4 5 b7 |

Suspirium(L), Crochet rest, Quarter rest(E) چارەکە پشوو.

Süβ(G), Sweet, Sweetly(E) شـیرین، بە شیرینڕەویی.

Suβe(G), Sweetness(E) شـیرینیی.

Sustain(E) بڕوانە/*Sostenuto*، ژەنین بە شـێوازی لێگاتۆ یاخود سـۆسـتێنوتۆ.

Sustaining pedal مانەوە لەسـەر پێداڵی پیانۆ بۆ زرنگانەوەی یاخود کپکردنی دەنگەکە.

Sussurrando, Sussrrante(I), Whispering(E) سـۆسـەکردن، مورەکردن، چرپاندن.

Sussurrare(I), To Whisper(E) سـۆسـەدەکات، دەچرپێنێت.

Suzuki method(E) مێتۆدی سـوزوکی، ڕێگەی مۆزیک فێرکردنی زارۆکان کە لەلایەن مۆزیکزانی ژاپۆنی شـین ئیچی سـوزوکی*Shin´ichi Suzuki* {1898-1998ز}یەوە بۆ ئامێری کەمانچە داهێنرا بەڵام پاشان پەرەی پێدرا بۆ فێربوونی ئامێرەکانیـتر.

Svanendo, Svanirando(I), Vanishing(E) ونبوون، بەرەبەرە ونبوون.

Svegliando, Svegliato(I), Lively(E) بژێویی.

Svelte(F), Svelto(I), Smart, Quick, Speedly(E) زرنگ، پەلە، بە خێرایی.

Svolgimento(I), Development(E) پەرەپێدان، پێشڕەویی.

Swara(Hn), A note in Indian music(E) نۆتە هیندستانی. بڕوانە/*Hindustani music*

Swell(E), Crescendo(I) دەنگ بەرزبوونەوە پلەپلە.

Sweet tone(E), Ton doux(F) شیرین تۆن.

Syaucamane, Syauçemane(Kr) سـیاوجامانه، سیاچەمانە.

گۆرانی، هۆرە، ســیاوچەمانە قەدیم یادگار، قەومی کوردانە {فۆلکلۆر}

ڕەچەڵەکی وشـەکە لە سـیاوجامانە/وە هاتووە کە لە ســەرانســەری هۆراماندا باوە. چەمکی وشەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ سیاوجامانە واتە ئاهەنگی ڕەشــپۆشان، پێدەچێت لە سـەردەمانێکی زۆر دێریندا کزە و ســۆزێکی ئایینی لەخۆگرتبێت، بەو زاردەشـرەوانەیش وترابێت کە لە ســروودی گاتا/کاندا بەشـداریاندەکرد، هەروەکو باســیلێدەکرێت گاتاکان بە بەزمی ســیاوجامانە وتراوە.

بەرزی ئەسەڵان نزمی هانەی وەز ئاخ پەی جوانەکێم بەرشیەن جەدەس

سیاچەمانەی مام حەییەری نۆدشی

ئەم جۆرە ســرۆتەیش نزیکایەتییەکی هەیە لەگەڵ ئاهەنگی جمانە/ی ئایینی ئێزدی/دا. کە لە سرۆتێکی تایبەتدا کاڵای سیا دەکرێت بە بەری ئەو کەسانەی پلەی ئایینی بەرزتریان پێدەبەخشرێت. بە هاتنی ئایینی ئیسلام و سـەرهەڵدان و گەشـەکردنی سـۆفیگەریی لە ناوچەکەدا، بەرەبەرە ناوەکە چووە چێوەی ناسک{عیرفان}ییەوە و بووە کزەی شـێخان. لایەنە دونیاییەکەیشی بووە ئاوازی سـیاچەمانە کە هەسـت دەربڕینە لە ئەوین و هیجران و هاوار لە دەسـت جەور و سـتەمی ڕۆژگار.

Syllab(F), Syllable(E) سـیلاب، بڕگاندنی دەنگە مۆزیکیەکان، حونجاندنی تۆنەمۆزیکیەکان.

Syllabic melody, Syllabic song(E) میلۆدی سـیلابی، سـترانی سـیلابی.

Syllable name(E) ناوە سـیلاب، مەبەست لە هێمای مۆزیکیەکانە وەک دۆ، ڕێ، می، فا.... .

Syllable mark(E) نیشانە سـیلابیەکان، مەبەست لە دانانی وشەکانە بە بڕگەیی لەژێر نۆتەاندا.



Symbol(E), Symbole(F) سـیمبۆڵ، هێما.

Symboliser(F), Symbolize(E) دەیسیمبۆڵێنێت.

Symétrie(F), Symmetry(E) هەنداز.

Symétrique(F), Symmetrical(E) هەندازیی.

Symmetrical scales(E) سـکێلە هەندازەییەکان. دوو جۆر هەیە:ـ

1. میانە لەبرییەکان*Alternating-interval*. 2. میانە نەگۆڕەکان*Constant-interval*.

| alternating-interval symmetrical scales | |
|---|---|
| augmented scale form one | alternating-interval symmetry of minor third / semitone (half-step) |
| augmented scale form two<br>inverted augmented scale | alternating-interval symmetry of semitone (half-step) / minor third |
| eight-note diminished scale<br>octatonic scale | alternating-interval symmetry of tone (whole-step) / semitone (half-step) |
| eight-note dominant scale<br>dominant diminished scale | alternating-interval symmetry of semitone (half-step) / tone (whole-step) |
| constant-interval symmetrical scales | |
| whole tone scale<br>six tone scale | constant-interval symmetry of the tone (whole step) |
| chromatic scale | constant-interval symmetry of the semi-tone (half-step) |

Symphonia(Gr,L), Symphony(E), Symphoniette(F) سـیمفۆنیا، ڕیشەوشە لێکدراوێکی یۆنانییە لە سـیم*Sym*{یاخود سـەن:سـین*Sun:Syn*}و فۆنیا*Phonia*یاخود فۆن*Phone*پێکهاتووە کە بەمانای دەنگ پێکەوە *Sounding together*دێت و لە ڕووی زانستی و هونەرییەوە گوزارە لە سازاندن و گونجادنی دەنگ پێکەوە*Consonance*دەکات کە ئەمیش لە ناوەڕۆکیەوەڕا پڕاوپڕی زاراوەی هارمۆنی*Harmonious*ی دەبێتەوە. مۆزیکزان میکایل پرایتۆریەس *Mechael Praetorius* {1571-1621ز} وشەی سیمفۆنیای بە جۆرێک لە ئامێری کیبۆردی وەک کلاڤیکۆرد*Clavichord* و پیانۆی سـپینێت*Spinet*فرۆزەدەکرد. چەمکەکۆی ئەم لێکدانەوەیە گوزارە لە بوونی ئۆرکێسترایەکی پڕ دەکات کە چەند جۆرە جوولەی{بەڵام بەزۆری چوار جوولە} لەخۆگرتووە.

Syncopate(E), Syncoper(F), Synkopisch(G) سـینکۆپدەکرێت.

Syncopation(E), Sincope(I) سـینکۆپێن، دواخستن، ئاکسنت لەسەر لێدانێکی چاوەڕواننەکراو، ڕیتم درێژەکشـانەکان یاخود ڕیتم دواخستنی شوێنی نۆتەکان لە بارێکدا.

لە ڕیشەوشە لێکدراوی سـینکۆپە*Synkoptein*ی یۆنانیـیەوە هەڵێنجراوە کە پێکهاتووە لە سین*Syn* واتە پێکەوە*Together* و کۆپتەین*Koptein* واتە ببڕێت*To cut*. دوایی بە زاراوەی*Syncopen*یەوە هاتەناو زوانی لاتینییەوە. کۆی وشەلێکدراوەکە بەمانای تەنگبوون، تەگەرە یاخود دواخستن دێت.

Synthetic chord, Mystic Chord(E) کۆردی ئافرێنراو. بڕوانە/*Mystic Chord*

Syntonic comma, Didymus comma, Ptolemaic comma(E) سـینتۆنە کۆما، گچکەمیـانە، بریتـیە لە جیاوازییەک لەنێوان چواری پێنجەمی پوختە{4 x 701.955=2807.82Cents} و دوو ئۆکتاڤ و مێجەرێکی سـێیەمی پوختە {1200+1200+386.3=2786.3Cents} کە دەکاتە21.52Cents یاخود 1/4ی تۆنێک.

Syntonic minor thirds(E) سـینتۆنە ماینەر سـیانییەکان، پێکهاتووە لە مێجەر نیوەتۆن(16:15*major semitone* و مێجەر تۆن(9:8*major tone*ێکی لەسەرخراو.

Syrinx, Panpipes(E) سـرینک، ئامێری نای/یۆنانی حەوت لوولە دەگەڕێتەوە بۆ. نزیکەی2500پ.ز ناوە بۆ دەنگە ژێـیکانی باڵندە.

System(E), Système(F) سـیسـتەم، مەبەست لە هێڵەکانی نۆتەیە کە بەش و دەنگ و ئۆکتاڤەکان و هەموو نووسراوێکی مۆزیکی لەخۆگرتووە.






سۆوسەفۆن
Sousaphone



Snare drum تەپڵی چێوراو




-----------------------------------
---------------------------
------------------

# T

مۆزیک....جامێکە بێدەنگی تێدایە، دەنگیش....ئەو جامەیە بەڵام بەتاڵە.
هەراوهوریایش....هەر هەمان جامە بەڵام.... تێکشاوە!!!! رۆبەرت فریپ

---

Taal(Hn) **تال، وشەیەکی هیندییە بەمانای لەپی دەست دێت، بەڵام وەک نۆتە***Note***لە مۆزیک هونەری هیندییدا دادەنرێت بە بناخەی میلۆدی مۆزیک. وشـــەی دۆڵ***dol***یش کە لە لەپی دەستەوە دورست بووە بەمانای حونجەکردن بە پەنجە دێت کە واتای سیلاب***Syllable***دەگەیەنێت.**

Tabatière à musique(F), Musical box(E) **مۆزیکای سـنووق.**

Tabelle(G), Table, Index(E), Tavola(I) **تاوڵە، تابلۆ، خشتە.**

Tablaa(Hn), TapÍ(Ar,Kr), Drum(E) **ئامێری تەپڵ، ئامێرێک کە بە لێدان تەپەی بێت. پێیشیدەوترێت دەربووکە***Darbukka***ی رازێنراو بە نەخش و نیگار.**

Tabla tarang(Hn) **تەپڵە تەرەنگ، تەپڵی هەمەرەنگ، کۆمەڵە تەپڵێکی هەمەجۆر قەوارەیە کە هەر یەکەیان لەسەر تۆنیک کۆککراوە.**

Taboret, Tabret, A small tabor, Taborine, A small, Shallow drum like a tabor(E) **دەفۆکە، دەفی بچووک، گچکە دەف.**

Tabouret de piano(F), Piano stool(E) **کورســـی پیانۆ.**

Tabulatura(I), Tabulatur(G), Tablature(E,F) **تابولاچورا.**

**لە ریشـەپەیڤی تابولا***Tabula***ی لاتینییەوە هەڵێنجراوە کە بەمانای تاوڵە***Table***:خشتە دێت، واتە تاوڵەیەک یاخود رووبەرێکی هەڵکۆڵراو. بەڵام لە هونەری مۆزیکدا وەک زاراوەیەک واتای سیستەمی نۆتاندن***System of notation***دەگەیەنێت کە پێداویستیە مۆزیکیەکانی تێدا تۆمارکرابێت وەک بەکارهێنانی پیتە مۆزیکییەکان و هێما و نیشانەکان....هتد.**

Tace, Taci(I), To be silent(E) **بێدەنگ بێت.**

Tacet al fine(L), Remaining silent to the end(E) **مانەوە بە بێدەگی تا کۆتایی.**

Tag(E) **تاگ، زاراوەیەکە بۆ کۆدا***Coda* **لە جاز مۆزیکدا.**

Tail, Flag(E) **پەرچەم، چنگ، کلک، بڕوانە/***Croche.*

Tailgate(E) **چەشـنێکە لە ترۆمبۆن ژەنین***Trombone playing* **لە جاز مۆزیکدا.**

Taille(F) **مەودای دەنگی تینۆر کەوتبێتە نێوان باس***Basse* **و تینۆری بالا***Haute contre*{**کە دەنگی تینۆرنما***Leading tenor***یە لە ئۆپێرای بارۆکدا.**

Taille de hautbois(F), Tenor oboe(E) **تینۆر ئۆبوا، تینۆر سـورنا بەرلە**1660**ز لە ئاوروپا.**

Taille de violon(F), Violon(E) **ڤیۆلا.**

Takht(Kr), Stage(E) **تەخت، وشەیەکی کوردی/یە و بۆتە زاراوەیەک لە هونەری مۆزیکدا کە مەبەست لە تیپێکی مۆزیکە بەو ئامێرە ناسراوانەی وەک کەمانچە و دەفۆکە و عوود و قانوون و سەنتوور لەسەر تەختی شانۆ بەرهەم پێشکەشبکات.**

Takt(G), Bar, Measure, Time, Beat(E) **تەک، لێدان، باڕ، مازۆر.**

Taktaccent(G), Bar accent(E) **باڕ ئاکسنت.**

Taktmesser(G) **بڕوانە**/*Metronome*.

Takt pro minute(G), Beats per minute(E) **تەک لە خولەکێکدا.**

Taktstock(G), Conductor's baton(E) **ئەو دەسکەدارەی بەدەست ڕێبەرەوەیە.**

Taĺ(Kr), Castanette(E) **تاڵ، قاشقە، کەستانێت.**

**مۆزیک ئامێرێکی ڕەزمیە، لە دوو گچکەلەپ ژێرپیاڵەشێوە پێکهاتوە کە یەکێکیان دەبەسترێت بە پەنجەگەورەی دەستەوە و ئەویتریان بە پەنجەشایەتمان ئینجا دەدرێن بەیەکدا بۆ ئەوەی بەدەنگەکەی کێشی گۆرانیەکە ڕابگرێت.**

Tambourine, Drum(E), Tamburo(I), Tambura(F) **دەفۆکەی جووت سەنج.**

Tambur(Ar, Fa, Kr, Tr), Temure(Kr) **تەمبوور، تەمووره، تەنبوور، تەمیرە، تەمیر، تەنبوورە.**

**ئامێرێکی زۆر دێرینە لە ژیانی کوردەواریدا کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیک دوو هەزار ساڵێک. مەودای دەنگی ئۆکتاڤێک و دوو نۆتەیە.هەر ژێیە سێ جووت تەلی لێبەستراوە بەڵام تەمبووری نوێ جاروبار پێنج تەلی لێدەبەسترێت. پێدەچێت ئامێرێکی زۆر باو و پیرۆزیش بووبێت لەلای خەڵک، دەشێت گاتا ـ زاردەشتییەکان بەم ئامێرە سروودەکانیان چڕیبێت، ڕەنگبێت درێژەپێدانی ئەم ڕەوشە سرۆتە بووبێت گەیشتبێتە نێو پەیرەوانی ڕێبازگەی کاکەیی کە بە ئەهلی هەق ناسراون.**

**پیر شاخۆشین{شاموبارەک}کە ژیانی دەگەڕێنەوە بۆ نزیک کۆتایی سالانی سەتەی چوارەمی هیجری، یەکەم کەسێک بووە کە بە فەرمی سروودەکانی یارسان/ی لە پەڕاوی پیرۆزیاندا بەناوی سەرەنجام بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و بەزموڕەزم لە جامخانەدا چڕیوە .و مریدانی لەسەر ئەم ڕەوشە فێرکردووە. هەر وەکو دەیشڵێن گوایە خۆی دەنگی زۆر خۆشبووە و هەر بە ئامێری تەمبووریش سروودەکانی خوێندووە و یارانیشی بۆیان سەندۆتەوە. ئەم سرۆتە ئیتر لەو سەردەمەوە دەبێتە ئاکار و نەرێتێکی ئایینی کە تائێستایش پەیڕەوی دەکەن.**

**لە ئایینی ئێزدی/یشدا ڕۆحێکی بزوێنەرە لە بەجێهێنانی سرۆت و ئەرکە ئایینیەکانیاندا کە دەگەڕێتەوە بۆ بەرلە هەزاران ساڵ. لەم سروشەدا دەردەکەوێت کە ئەم ئامێرە وێڕای ئەوەی کە ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری هەبووە لەسەر ئەو کەسانە کە ئیلهامی زیاتریان بۆ بێت، فاکتەرێکی زۆر گرنگیشی هەبووە لە پاراستنی ئەو سروودانە چ وەک دەقێکی نووسراو و چ وەک ئاواز. ئەم ئامێرە....بەرەبەرە کەوتە ئامێزی ژیانی دونیاییەوە و بووە ڕۆڵێکی کاریگەر لە ستران و ئاوازی کوردیدا.**

ڕەچەڵەکی وشەی تەموور لە تامووره یاخود تارموور/ەوە هاتووە کە بەرەبەرە بۆ خۆشی و خزاندنی سەر زمان بۆتە تەموور. گەر لە دیدەی زوانەوانیەوەڕا لێکبدرێتەوە پێدەچێت کە وشەلێکدراوێکی کوردی بێت و پێکهاتبێت لە تا یاخود **تار** واتە ژێ، ئەو ژێ/یەی کە ئاوازی لێوە هەڵدقوڵێت، ئەویتریش **موور** واتە سرۆ یاخود سرۆش. چەمکی وشەکەیش مانای ژێی سرۆش دەگەیەنێت. لە دەنگەڕێی بەسۆز و کاریگەری ئەو ئامێرەوە سرۆشی ئاوازاوی بۆ دێت و دەیگەیێنێتە ئەو پلە و پایەوە کە زۆر بە پیرۆزییەوە بڕواننە ئەو ئامێرە. چەمکی وشەکە گوزارە لە سۆز و موور، نزا و پاڕانەوەی کەسێک دەکات کە بە ناخی شەیدایی سان/ی پەروەردگاردا ڕۆچووبێت. هەر لەبەر ئەو پیرۆزەییەیشە کە دەبینین ئەوەی تەمبوورژەن بێت و بەتایبەتی پابەندی ئاینزای ئەهلی هەق بێت، هەر پارچە مۆزیکێک بە تاکنەوازی بژەنێت لە دەسپێکدا و لە کۆتایی بوونیشیدا تەموورەکە ماچدەکات وەک ڕێزگرتن و ئەمەگ دەربڕین بۆ ئەو دەنگە پڕسۆزەی کە دەبێتە سرۆبەخشێک بۆ بزواندنی ڕۆحی و دەرخستنی جوانکاری و والاکاری لەو ئاوازەدا.

Tamburo, Tamburo grosse(I), Gan tamburo, Bass drum(E) تەپڵی باس.

Tamburo militaire(I), Snare drum, Side drum(E) تەپڵی سەربازی.

Tamburo piccolo, Tamburo rullante(I), Tenor drum(E) تەپڵی تینۆر.

Tammorra(I) دەهۆڵی گەورە لە پێستی مەڕ و بزن.

Tampon(F), Drumstick(E) داری لێدانی دەهۆڵ.

Tam-tam, Tom-tom(E) تام تام، گەورەساجێکی مادەنییە کە چینەکان بە هەڵواسراوی لێیدەدەن و دەنگێکی سامناکی هەیە.

Tangent(E), Tangente(F,G,I), Touch(E) تانجنت، پەڕماس، لە وشەی تانجیرە*Tangere*ی لاتینییەوە هاتووە کە ئەو بەشەتەختەی ئامێری کلاڤیکۆرد دەگرێتەوە کە کلیلەکانی لەسەرە و بە شێوەیەکی میکانیکی بەر ژێیەکان دەکەوێت کاتێک پەنجەکان دەخرێنەسەریان.

Tangent piano(E), Tangentenflügel(G) پەڕماسی پیانۆ، تانجنتی پیانۆ.

Tango(E) تانگۆ، سەمایەکی/ئارجەنتینیە لەسەر کێشی 4/4 ، بڕەچەڵەکی سەماکە دەگەڕێتەوە بۆ زنجیەکانی ولاتی کۆنگۆ/ی ئێستا و بۆ یەکەم جاریش لە سەرەتاکانی ساڵی1890ز وەک سەمایەکی باو لە ولاتی ئارجەنتین نووسرایەوە و پاشانیش بووە سەمایەکی میللی.

Tanpura(Hn) تانپوورە، ئامێرێکی چوار ژێدارە لە ولاتی هیندستان زۆر باوە، تاڕادەیەک بە ئامێری سێتار دەچێت.

Tantino(I), Very little(E) زۆر کەم.

Tanto(I), Tant(F), So much(E) وا زۆر، بۆ نموونە*Allegro non tanto* واتە زۆر خێرا نا.

Tar(Fa,Kr) تار، ئامێرێکی جووت سێ ژێدارە کەمێک لە سێتار گەورەترە، هەندێکیان چوار ژێی لێبەستراوە. تەختەپەنجەی*Fingerboard*دەسکەکەی کراوە بە بیستوهەشت خانەوە.

Tarana(Fa, Hn, Kr) تەرانە، ستران.

Tarbouka(Br) تاربوکە، دەربەکە، جۆرە تەپڵێکی زۆر باوە لە باکووری ئافریکا.

Tardamente(I), Slowly(E) بەهێوری.

Tardando(I), Retarding, Gradually slowing(E) هێورکردنەوەی پلەپلە.

Tardante, Tardantemente, Tardato(I), Gradually slowing(E) هێورکردنەوەی پلەپلە.

Tardo(I), Slow(E) هێور، هێواش.

Tasis(Gr), Pitch(E) پەردە.

Tasta(I), Fret, Neck(E) دەستان، دەسکی ئامێرە ژێدارەکانی وەک تەموورە، ساز، سێتار

Tastato(I), Fretted(E) تەستاتۆ، بەشبەشکردنی دەستانی ئامێرە ژێدارەکان.

Tastatur(G), Keyboard(E) دەستاتوور، دەساتوور، کیبۆرد.

Taste(G), Tastiera(I), Key, Neck of string instrument(E) دەستێ، کلیل.

Tasteninstrument(G), Keyboard instrument(E) ئامێری کیبۆرد.

Tasto, Fret(I), Touch(E), Touche(E) تاستۆ، کلیل، دەستان، پەڕماس{بەرکەوت}. بۆردی پەنجەدانان لەسەر ژێیەکان.

Te(I), B-flat(E) تۆنی سی بیمۆڵ.

Teatro dell’opera(I) شانوی ئۆپێرا.

Tecnica(I), Technic(E), Technique(G), Technik(G) تەکنیک.

Technique des doigts(F), Finger technique(E), Tecnica della dita(I) تەکنیکی پەنجە.

Technique vocale(F), Vocal technique(E) تکنیکی دەنگ لە سترانبێژیدا.

Tecnico del suono(I), Sound engineer(G) ئەندازەی دەنگ.

Teilen, Theilen(G), Divided(E) بەشکراو.

Teilton(G), Partial, Overtone(E) سەرتۆن، پەرتاڵ.

Tein(G), Ten(E) شمارەی دە.

Teller(G), Plate of Cymbal(E) لەپی ئامێری سیمباڵ.

Tema(I), Theme, Subject, Motive(E), Sujet(F), Motif(G) تێما، بابەت، سۆژە.

Tema con variazioni(I), Theme and variations(E) تێما و گۆڕانەکان.

Tematico(I) وابەستە بە تێما.

Tempera(I) تێمپێرا، لە تێمپێراریێ *Temperare*ی لاتینییەوە هاتووە کە بە مانای تێکەڵاندنی دوو ڕەنگی جیا دێت، لە سەتەکانی چواردە و پانزەدا زۆر بە فراوانی لە ئیتاليا بەکاردەهێنرا وەک ڕەنگی بۆیەیەکی ڕوون و شاش پاش خێرا وشکبوونەوەی لە کاتێکی کورتدا. ئەم تەکنیکە لە بواری مۆزیکدا بۆ دیکۆراندنی دەنگ کاریپێدەکرێت.

**تمپێرامێنت،** Temperament(E), Temperamento(I), Tempérament(F), Temperatur(G)

**ئەم وشەیە لە زوانی کوردیدا بەمانای هەوەس دێت کە هەموو لایەنێکی ئەرێتی و نەرێتی دەروونی دەگرێتەوە واتە ئارەزوو و حەزیاری و مەیل بۆ شتێک بێت. لە زوانی عارەبیدا بەمانای مەزاج و بە زوانی ئینگلیزی و هەندێک زوانی تری ئاوروپایی بە هۆمور***Humor***هاتووە. لە ڕووی فیسیۆلۆجیەوە فرۆزەدەکرێت بەوەی کە بریتیە لە ئاکارێکی بیرکردنەوە، خوڕەوشت یاخود جۆرە کارلێکراوێکی تایبەت***Characteristic***لە خودی مرۆڤدا. بەپێی فرۆزەکردنێکی فیسیۆلۆجیانەی سەتەکانی ناوەڕاستیشدا بە جیاکردنەوەیەک لەنێوان تایبەتمەندێتی فیزیکی***Physical*** **و ئاوەزی***Mental*** **مرۆڤدا لێکددەدرایەوە. لە هونەری شانۆگەرییدا بە هەڵچوون یاخود هەست دەربڕینێکی لەڕادەبەدەر فرۆزەدەکرێت، بۆ نموونە خۆدەرخستنی ئەکتەرێک بە هەموو هەوەسێکیەوە لە نواندنێکدا. بەڵام وەک زاراوەیەک لە هونەری مۆزیکدا ئەگەر چی هەر هەمان مانای هەڵگرتووە لە ڕووی زوانەوانییەوە بەڵام چەمکێکی تر دەبەخشێت. دەشێت ئەو چەمکەیش بەم شێوەیە نمایان بکرێت:ـ**

**سیستەمێکی نەواسازییە***Tuning***کە تیایدا میانەکان***Intervals***لە پوختە***Pure***ییان لادەدەن. مەبەست لە نەوا***Tune***یش لێرەدا... زنجیرە نۆتەیەکی ڕێکخراوە بەشێوەیەکی پەسەند.**

**دەشێت ئەم شێوازە ڕێخستنە بە سێ پۆلی سەرەکی نمایانبکرێت:ـ**

1. **نەواکان***Tunings*...**کە تێمپێرامێنتی فیساگۆریی***Pythagorean temperament*** **و ڕێکەئاوازێن***Just intonation***دەگرێتەوە.**
2. **ڕێکوپێکە تێمپێرامێنتەکان***Regular temperaments*** **کە هەموو پێنجەمەکان بەهەمان ڕێ تێپەر دەبن جگە لە نەشازی پێنجەم یاخود گورگەپێنجەم***Wolf fifth*.
3. **نارێکوپێکە تێمپێرامێنتەکان***Irregular temperaments*** **کە جۆری پێنجەمەکان بە دەوری بازنەکەدا{واتە بازنە پێنجەمیەکان}دەگۆڕێن بەشێوەیەکی وەها کە زۆر لە کلیلە باوەکان***Common keys*** **زیاتر هاوساز***Consonant***بن.**

**بەلێشاو.** Tempestosamente(I), Tempestuously(E)

**لیشاو.** Tempestoso(I), Tempestuous(E)

**تێمپۆ،** Tempo(I), Temps(F), Tempus(L), Takt(G), Time, Beat(E)

**لێدان لە یەکەیەکی کاتدا، کێش و کات پێکەوە دەئاوێزێنێت. زاراوەکانی بریتین لە:ـ**

| Tempo terms | زاراوەکانی تێمپۆ | Beat/min لێدان/خولەکێکدا |
|---|---|---|
| **Grave** Very Slow | زۆر خاو | |
| **Largo** Lento - Slow | خاو | 40-60 |
| **Larghetto** | کەمێک پەلەتر لە لارگۆ | 60-66 |
| **Adagio** Moderately Slow | خاوێکی مامناوەندی | 66-76 |
| **Andante** "Walking" Tempo | ڕەوت تێمپۆ، پیاسە | 76-108 |
| **Andantino** | کەمێک پەلەتر لە ئانداتێ | |
| **Allegretto** | کەمێک خاوتر لە ئەلێگرۆ | |

| Tempo terms | زاراوەکانی تێمپۆ | Beat/min لێدان/خولەکێکدا |
|---|---|---|
| **Moderato** Moderate | مامناوەندی | 108-120 |
| **Allegro** Fast | پەلە | 120-168 |
| **Vivace** Lively | پڕێو | |
| **Presto** Very Fast | زۆر پەلە | 168-200 |
| **Prestissimo** Very Very Fast | زۆر زۆر پەلە | 200-208 |
| **Molto** Very | زۆر ، فرە | |
| **Accel., Accelerando** | بەرەو پەلەتر | |
| **Rit., Ritardando** | بەرەو خاوتر | |

**بنەماسەرەکیەکانیشی بۆ چەند خێراییەک پۆلێنراون وەک:**

1. **زاراوەکانی خاو***Slow*.

| *grave* | solemn; very, very slow سەنگین |
|---|---|
| *largamente* | slow |
| *largo* | broad; very slow زۆر خاو ، فراوان |
| *larghetto* | slow خاو |
| *adagissimo* | rather slow تاڕادەیەک خاو |
| *adagio* | slow, tranquil خاو ، ئارام |
| *adagietto* | slow خاو |
| *andantino* | slow خاو |
| *lento* | slow خاو |
| *andante* | a walking pace هەنگاوی پیاسە |

2. **زاراوەکانی بەرەو خاوتر***Slower*.

| decelerating, getting slower | | |
|---|---|---|
| *rallentando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *ritardando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *allargando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *tardando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *slentando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *strascinando* | gradually getting slower | بەرەبەرە بەرەو خاوتر |
| *ritenuto* | a new steady rate of speed, but slower than the preceding section<br>نوێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خاوتر لە بەشی پێشوو | |
| *meno mosso* | a new steady rate of speed, but slower than the preceding section<br>نوێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خاوتر لە بەشی پێشوو | |
| *meno moto* | a new steady rate of speed, but slower than the preceding section<br>نوێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خاوتر لە بەشی پێشوو | |
| *calando* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |
| *deficiendo* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |
| *mancando* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |
| *morendo* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |
| *sminuendo* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |
| *smorzando* | growing slower as well as softer | خاوتر و نەرمتر |

3. **زاراوەکانـی خێرا***Fast*.

| | | |
|---|---|---|
| *moderato* | moderate | میانەڕۆ |
| *allegretto* | quite fast | ئەوپەڕی پەلە |
| *allegramente* | quite fast | ئەوپەڕی پەلە |
| *allegro* | fast; cheerful | شـادیڕەو |
| *vivace* | lively | بزێو |
| *presto* | very fast | زۆر پەلە |

4. **زاراوەکانی بەرەو خێراتـر***Faster*.

| | |
|---|---|
| *accelerando* | getting faster بەرەو پەلەتر |
| *stringendo* | swiftly accelerating usually with an increase in volume (i.e. *crescendo*) سووکەڕەوتی بەرەو زێدە، بۆ نموونە کرێشاندۆ |
| *affrettando* | swiftly accelerating usually with an increase in volume (i.e. *crescendo*) سووکەڕەوتی بەرەو زێدە، بۆ نموونە کرێشاندۆ |
| *incalzando* | swiftly accelerating usually with an increase in volume (i.e. *crescendo*) سووکەڕەوتی بەرەو زێدە، بۆ نموونە کرێشاندۆ |
| *doppio movimento* | twice as fast دووجار پەلە |
| *più affrettato* | swifter سووکەڕەوت |
| *più mosso* | a new steady rate of speed, but faster than the preceding section نویێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خێراتر لە بەشی پێشوو |
| *più moto* | a new steady rate of speed, but faster than the preceding section نویێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خێراتر لە بەشی پێشوو |
| *veloce* | a new steady rate of speed, but faster than the preceding section نویێ ڕێژەیەکی جێگیر لە خێرا، بەڵام خێراتر لە بەشی پێشوو |

5. **گەڕانەوە بۆ خێرایی سـەرەتا**.

| | |
|---|---|
| *a tempo* | in time; returning to the original pace گەڕانەوە بۆ خێرایی خۆی |

Tempo alla breve(I) **تێمپۆی شـێوازە بریڤ لەسەر کێشی** time/2/2 **یاخود**1/2، **بڕوانە**/*breve*.

Tempo alla semibreve(I), Moderate tempo(E) **تێمپۆی ئاسایی، بڕوانە**/*Tempo ordinario*.

Tempo anteriore(I), Former speed(E) **خێرایی پێشـــوو**.

Tempo aussi rapide que possible(F), As fast as possible(E) **تا بتوانرێت پەلە**.

Tempo binario(I), Temps binaire(F) **جووت مەتر**{**کێشی یەک ڕسـتەی مۆزیک**}.
Duple meter(E)

Tempo commodo(I), Tempo comodo(I) **خێراییەک بۆ ژەنیار بگونجێت**.

Tempo debole(I), Temps faible(F) **لێدانی لاواز، بەشی نائاکسنتی باڕ، بڕوانە**/*Beating*.
Weak beat, Unaccented part of the bar(E)

Tempo deux fois plus lent(F), Half-time(E) **نیوە کات، نیوە کێش**.

Tempo de ballo(I), Dance speed(E) **خێرایی سـەما**.

Tempo di marcia(I), March time(E) **تێمپۆی**{**کێشی**}**مارش**.

Tempo di menuetto(I), Minuet speed(E) کێشی ســەمای مینوێت، بڕوانە/*Minuet*.

Tempo di sarabanda(I), Sarabande time(E) کێشی ســەمای ســەرابەند.

Tempo di prima parte(I), In the time of the first part(E) کێشی یەکەم بەش.

Tempo double(F), Double time(E) دەبڵ کێش.

Tempo fisso(I), Fixed speed(E) خێرای گیراو{خێراییەک بە چەسپاوی بهێڵرێتەوە}.

Tempo forte(I), Strong beat(E) لێدانی توند و بەهێز، بڕوانە/*Beating*.

Tempo giusto(I), Appropriate tempo(E) چەشنە تێمپۆیەک کە لەسـەر داخوازبێت.

Tempo maggiore, Alla breve(I) تێمپۆی بریڤ، شـێوازە تێمپۆی گەورە.

Tempo mark(E) تێمپۆ نیشانە، دیاریکردنی تێمپۆ کە بە نیشـانەی تایبەتی ئاماژەی پێبدرێت.

Tempo modulation, Metric modulation(E) مۆدیولاندنی مەتریی.

Tempo moyen(F), Medium tempo(E) تێمپۆی مامناوەندی.

Tempo ordinario, Tempo minore(I) تێمپۆی ئاسایی، کێشێک نە زۆر خێرابێت و نە زۆر خاو. واتە کێشێکی پێوانیی بێت یاخود ڕەزمێکی باو کە بەزۆری کێشی4/4 دەگرێتەوە و هەندێجاریش بە هێمای/C ئاماژەی پێدەدرێت. بەمانای تێمپۆی سـەرەتا*Tempo primo*یش دێت.

Tempo precedente(I), Previous tempo(E) پێشووە تێمپۆ.

Tempo primiero(I), First tempo(E) یەکەم تێمپۆ کە بە هێمای $I^o$ ئاماژەی پێدەدرێت.

Temporaire(F), Temporary(E) کاتی، واتە دەمێکی نادرێژخایاند.

Temporal(E) تێمپۆیی، واتە خۆبەسـتنەوە بە لێدان*Beat*، ڕەزم و کێش*Meter* کە هەموویان پابەندن بە کات*Time*ەوە.

Tempo rubato(I), Irregular tempo(E) تێمپۆی ئازاد، ئازاد لە دانانی چەند گچکەگۆڕانێک لە تێمپۆدا لە کاتی بەرەوە پێشـچوون لە پارچەیەکدا بە مەبەستی ڕازانەوە بە مۆزیکەکە.

Tempo ternario(I), Tempus ternarium(L), Triple time(E) کێشی سـێتایی.

Tempus imperfectum(L) تێمپۆی ناتەواو، کە بریڤ دەکاتە دوو سـێمیبریڤەوە{یەک بریڤ= دوو سێمیبریڤ}.

Tempus perfectum(L) تێمپۆی تەواو، کە بریڤ دەکاتە ســێ سـێمیبریڤەوە{یەک بریڤ= ســێ سـێمیبریڤ}.

Tendency tone(E) تۆن گرژیی{پڕاوپڕ}، تۆنێک ئارەزووی بەلای تۆنێکی تردا هەبێت.

Tendere(I), To tighten, To Stretch(E) گرژبکرێت، توندبکرێت.

Tendre,(F), Tenero(I), Tender, To tighten(E) ناسک، بەهەسـت.

Tenebroso(I), Gloomy, Dark mood(E) تاریک، ڕووگرژ.

Tenendo(I), Holding, Sustaining(E) هێشتنەوە، بەردەوامبوون.

Tenendo il canto(I), Sustaining the melody(E) هێشـتنەوەی میلۆدیەکە.

Teneramente, Teneroso(I), Tenderly, Softly(E) بە نەرمی، بە ناسـکیی.

Tenete(I), Hold, Sustain(E), Appuyer(F) **بهێڵێتەوە.**

Tenor(E,G), Tenore(I), Ténor(F) **بەرزترین تۆنی نێرینە،**

**لە ڕیشەوشەی تینێرۆ***Tenero***یاخود تینێرە***Tenere***ی لاتینییەوە هاتووە کە بە مانای هەڵگرتن یاخود هێشتنەوە و مانەوەی تۆن دێت. مۆزیک دانەرانی سەتەکانی ناوەڕاست وەک زاراوەیەک بە مانای هێشتنەوەی ڕستە میلۆدییەکە وەک پاڵڕستەیەکی سەرەکی بۆ دەنگەکانیتر بەکاریاندەهێنا. پێشگرەناوی ئامێرەکانە کە دەکەونە نێوان باس ئامێرەکان کە دەنگیان نزمترە و ئاڵتۆ ئامێرەکان کە دەنگیان بەرزترە، بۆ نموونە تینۆر ساکسۆفۆن، تینۆر کەمانچە، تینۆر باسسوون، تینۆر کۆڕنێتۆ***Tenor cornetto***، تینۆر باریتۆن***Tenor bariton***، تینۆر ڕیکۆردەر***Tenor recorder***، تینۆر بێڵ***Tenor bell***، تینۆر بانجۆی چوار ژێ***Tenor banjo***، تینۆر تەپڵ***Tenor drum***...هتد.**

Tenora(I), Tenor folk oboe, Shawm(E) **سوڕنای تینۆر. شاومی تینۆر.**

**تینۆر/***C***، لە نۆتاندنی هێلمۆتز گچکەدۆ***small-c***دەکەوێتە نێوان هێڵی دووەم و سێیەمەوە لە کلیلی باسدا، واتە یەک ئۆکتاڤ نزمتر لە دۆی ناوەڕاست***middle-C***.**

Tenor clef, C-clef(E), Tenorschlüssel(G) **کلیلی تینۆر، پێشیدەوترێت کلیلی دۆ.**




Tenor Buffo(I) **دەنگەتینۆری ئەو کەسەی بەشە کۆمیکەکان دەچڕێت.**

Tenore di forza(I) **دەنگەتینۆرێک کە هێزی زۆری سینگ{واتە سییەکانی}ی پێویستە.**

Tenore di grazia(I), Tenor of grace(E) **تینۆری سۆز و ڕەند.**

Tenore drammatico(I), Heroic tenor(E) **دراماتیکەتینۆر، تینۆری داستانیی{پاڵەوانیی}.**

Tenore leggiero, Tenore lirico(I), Sweet tenor, Lyric tenor(E) **تینۆری شیرین نەوا.**

Tenore robusto(I), Powerful tenor voice(E) **دەنگی بەهێز{پڕ}ی تینۆر، تینۆری سەنگین.**

Tenorgeige(G), Viola(E) **ڤیۆلا.**

Tenori acuti(I,L), High tenors(E) **تینۆرە تیژەکان.**

Tenorino(I), Little tenor(E) **گچکە تینۆر، فرۆزەی تینۆرێک دەکات کە دەنگێکی زۆر بچووکی هەبێت.**

Tenorist, Tenor singer(E) **تینۆرچڕ، تینۆرخوێن.**

Ténor Lyrique(F) **بڕوانە/***Tenor leggiero*.

Tenormandoline(G), Tenor mandolin, Mandola, Mandora(E) **تینۆر ماندۆلین.**

Tenoroon, Tenor bassoon(E) **تینۆڕوون، تینۆر باسسوون.**

Tenorposaune(G), Tenor trombone(E) **تینۆر ترۆمبۆن.**

Tenorsaxophon(G), Tenor saxophone(E) **تینۆر ساکسۆفۆن، مەودای دەنگی دەکەوێتە نێوان ئاڵتۆ{بەرز} و باریتۆن{نزم}.**

Tenorstimme(G), Tenor voice(E) **دەنگی تینۆر.**

Tenor tuba(E) — بڕوانە/*Wagner tuba*.

Tenor viol(E), Viola de gamba(F) — تینۆر ڤیۆل.

Tenso(I), Stylized, Poetic debate between troubadours(E) — بەشێواز، چەشنیو، ستران سەندنەوە بۆ یەکتری لەنێوان شایەراندا بە شێوازێکی تایبەت.

Ten string mandoline(E) — ماندۆلینی دەتار {دە ژێی لێبەسترابێت}.

Tenth(E), Decima(L) — میانەی دەیەم لە سکێلێکی دیاتۆنیکدا.

Tenuto(I), Tenue(F), Holding note(E) — تێنوتۆ، هێشتنەوەی نۆتەیەک بۆ ماوەیەکی درێژتر کە تاڕادەیەک هەمان مانای لێگاتۆ*Legato* دەبەخشێت بەڵام نەوەک بە درێژی فیرماتا*Fermata*، نیشانەکەیشی کورتەهێڵێکی ئاسۆییە چ لەسەر و چ لەخوار نۆتەکە ئاماژەی پێدەدرێت. زاراوەی تێنوتۆ پێچەوانەی ستاکاتۆ دەبێتەوە.



Tepido(I), Unimpassioned, Lukewarm(E) — سـەروەت، بێهەست.

Tepidamente(I), Showing little emotion(E) — پیشاندانی کەمێک جووڵە.

Ter(L), Thrice(E) — سێبارە.

Terana(I), Six beat to the bar(E) — شەش لێدان لە بارێکدا.

Ternaire(F), Ternario(I), Ternary(E) — سێتایی.

Ternary form, Rondo form(E) — شێوە سێتایی کە لە سێ بەش بەشێوەی A B A پێکهاتووە.

Ternary measure, Simple triple time(E) — مازۆری سێتایی.

Tertia, Tertius(L), Terz(G), Terza(I), Tierces(F), Third interval(E) — میانەی سێیەم.

Tertia modi(L), The third degree of a scale(E) — سێیەم پلەی سکێلێک.

Ter unca(L), Demisemiquaver, Thirty-second note(E) — 1/32ی نۆتەی تەواو.

Terzadecima(I), Terzdecime(G), Interval of thirteenth(E) — میانەی سیانزەم.

Terzina(I), Triplet(E) — نۆتەی سێتایی.

Terz nwén(Ar,Kr,Tr) — تەرز نوێن واتە چەشنی نوێ. لێرشتەیەکی سەربە دەسگای کوردە، سکێلی پێکهاتوو لە:ـ ڕەگەزی کورد لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی حیجاز لەسەرپلەتۆنی چوارگا.




Tero suona(I), Difference tone(E) — تۆنی جیاواز.

Testa, Testina(I), Tête de la note(F), Note head(E) — سەر، تۆنی سەرەکی.

Testo, Libretto(I), Text(E) — تێکست، سایە، دەقی نۆتە نووسراو، مەتن.

Tetrachord(E), Tetrachorde(F) تێتراکۆرد. چەمکێکی مۆزیکاییە کە یۆنانەکان لە سەردەمانێکی زۆر دێرینەوە بەهۆی ئامێری لیرا*Lyre*وە وەک ئامێرێکی میللی هەمیشە لە بەردەستدا پەییان پێبردووە و کارییان پێکردووە، ناوەکە بەمانای چوار ژێ دێت، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئامێری لیرا*Lyre*ی یۆنانی. وا باوەڕبووە لایان کە نەوا*Tune*ی نزمترین و بالاترین دەنگی ژێیەکانی ئەم ئامێرە لە میانە*Interval*ی چوارەمی تەواو*Perfect fourth*دایە یاخود بلێین بەرێژەی3:4. دوو ژێی ناوەڕاستی بۆ چەند بەشێک لە میانە کۆکدەکرێن بۆئەوەی چەند مۆزیکدەسگایەکی جیاوازی لێوە بسازێنرێت. سێ ڕەگەزی تێتراکۆرد لە دیمانەمۆزیکی یۆنانیدا هەیە:ـ

1. دیاتۆنیک*Diatonic*، تایبەتمەندێتی ئەم تیتراکۆردە لەوەدایە کە میانەکانی یەکسانن بە یاخود کەمترن لە نیوەی هەموو میانەی تێتراکۆردەکە{کە دەکاتە249Cents}. تایبەتمەندێتی میانەکەی تاڕادەیەک بچووکترە{کە دەکاتە200Cents}لەوەی کە ببێتە تۆنێکی تەواو *Whole tone*. دیاتۆنیک تێتراکۆرد بەشـێوەیەکی کلاسـیکانە*Classically* لە دوو میانە و یەک نیوەتۆن*Semitone* پێکهاتووە.




2. کرۆماتیک*Chromatic*، تایبەتمەندێتی ئەم تیتراکۆردە لەوەدایە کە میانەکانی لە نیوەی میانەکۆی تێتراکۆردەکە گەورەترن بەلام وەک چوار پێنجەمەکان*Four-fifths*ی میانە گەورەترنین{لە نێوان249Cents و 398Cents}. کرۆماتیک تێتراکۆرد بە شێوەیەکی کلاسـیکانە لە ماینەر سـێیەم{کە دەکاتە نزیکەی300Cents} و دوو میانەی بچووکی نیوەتۆن یەکسـان پێکهاتووە.




3. ئێنهارمۆنیک*Enharmonic*، تایبەتمەندێتی ئەم تیتراکۆردە لەوەدایە کە میانەکانی لە میانەکۆی مێجەر تێتراکۆردی چوار پێنجەمـەکان*Four-fifths*گەورەترن{واتە گەورەتر لە398Cents}، ئێنهارمۆنیک تێتراکۆرد بە شـێوەیەکی کلاسـیکانە*Classically* لە دایتۆن*Ditone*ێک و دوو گچکە چارەکە تۆن*Quarter tones*پێکهاتووە.




پاراوی ئەم سـێ جۆر تێتراکۆردە بەم شـێوەیە:ـ




Tetrad, Four-note chord(E) کۆردی چوار نۆتە.

Tetratonon(Gr), Interval of four whole tones(E) میانەیەکی پێکهاتوو لە چوار تۆنی تەواو.

Theater(G), Theatre(E), Théêtre(F), Teatro(I) شـانۆ، تیاترۆ.

Thema(G), Theme(E), Tema(I), Thème(F) تێما، ڕشتە، چەند نۆتەیەکی داڕێژراوە کە پێیشـــیدەوترێت میلۆدی، ئەم میلۆدییە دەبێتە بیرۆکەیەک بۆ بناخە دانانی مۆزیکارێکی هونەری کە ڕەپاتبوونەوە*Repeating* و بەرەوپێشـــچوون*Development*ی تیادابێت، لە شـــیکردنەوەی مۆزیکاڵیدا زاراوەی بابەت*Subject*یشـی پێدەوترێت. وەک لە سـۆناتا، کوارتێت، فیوگە....هتد.

Theme and Variation(E) بڕوانە/*Variation*.

Thème de jazz(F), Melody(E) میلۆدی لە جازمۆزیکدا.

Theme group(E) گروپە تێما، ژمارەیەک لە تێما کە لەسەر یەک کلیل و وەک یەکە*Unit*یەک لەناو بەشـی فۆرمێکدا بن، وەک شـێوەی سۆناتا-ئەللێگرۆ*Sonata-allegro*.

Theorbo(E), Theorbe(G), Théorbe(F), Thiorbo(I) تیۆربۆ، ئامێرژێدارێکی داهێنراوی نزیک سـالانی1700ز/یە لە هەگبەی باڕۆکدا، شـێوەندازێکی تێکەڵە لە ئامێری عوود*Lute* و قانوون *Psaltery-Kanun*.

Theory(E), Théorie(F), Theorie(G) دیمانە، تیۆری.

These(G), Thése(F), Thesis(E) تێز، لێتۆژنامە.

Thiol(Gr), Violin(E) کەمانچە.

Third(E) میانەی سێیەم کە بریتیە لە دوو هەنگاو لە دیاتۆنیک ســکێڵدا، بۆ نموونە میانەی تۆنی دۆ/C تۆنی می/E.

Third inversion(E) ســێیەم هەڵگێڕانەوە ، بۆ نموونە هەڵگێڕانەوەی کۆردی حەوتەم بە بارێکدا کە بکەوێتە نزمترین جێگەوە لە کۆردەکەدا کە ئەویش جێی ڕەگە*Root*. بڕوانە/*Inversion*.

Thirteenth(E) سـیانزەم، میانەیەکی پێکهاتوو لە ئۆکتاڤێک و شـەشـەم*Sixth*.

Thirteenth chord(E) سـیانزەیەم کۆرد، کۆردی حەوت نۆتە*Seven-note chord* کە لەسەر ســێیەمەکان*Thirds* دامەزرابێت.

Thirty-second note(E) بڕوانە/*Demisemiquaver*.

Threni(G), Threnody(E) نووکەخوانیی، سـۆخوانیی، ئاوازێکی خەمەنگێز بۆ لاوانەوەی کەسێک.

Through bass(E) باســی بەردەوام، بڕوانە/*Figured bass*.

Thumb hole(E) کونی پەنجەگەورەی دەست لە ئامێرە هەواییەکاندا.

Thumb line(E) هێڵی پەنجە، لە جازمۆزیکدا زاراوەیەکە بۆ تینۆر، هێڵێکە کە تیایدا پیانۆژەن پەنجەگەورەی چەپی بەکاردەهێنێت.

Thump, Left-hand pizzicato(E) کورتە پزیکاتۆ بە دەستەچەپ.

Tibia(L) تیبیا، جووتبلوێر، جووزەلە، ئامێرێکی زۆر کۆنی سـەردەمانی ڕۆمانە کە پێکهاتووە لە دوو لوولکی پێکەوەبەسـتراو، لە سـرۆتەئاییني و بۆنە میللیەکاندا بەکاردەهێنرا.

Tibia utricularis(L), Bagpipe(E) مەشـکەنای.

Tibicen(L), Flute player(E) فلووتژەن.

Tie, Bind(E) **تەی، بەند، پێکەوەبەستنی دوو نۆتەی هەمان پەردە یاخود زیاتر بەدوایەکدا***Successive* **کە بە هێمای کەوانێک چ لە سەرەوە بێت یاخود خوارەوە ئاماژەی پێبدرێت بۆ درێژەپێدان لەسەر ژەنینی یاخود بێژانی{وتنی}.**



Tief(G), Deep, low, flat(E) **نزم، پان، قووڵ.**

Tiefer alt(G), Lower conteralto(E) **کۆنتەرئالتۆی نزم.**

Teintos(S) **سەمایەکی فلامانکۆییە لە سەمای تانگۆس***Tangos***ەوە هاتووە کە کێشێکی خاوە.**

Tierce(F), Third interval(E) **میانەی سێیەم.**

Tierce majeure(F) **بڕوانە**/*Major third*.

Timbrer(F), Accented(E) **ئاکسنت، هەنک.**

Timbre, Tone-colour(E), Timbro(I) **ڕەنگی تۆن، زەنگ، زایەڵەی دەنگ. جۆرێتی***Quality* **دەنگێک کە تۆنی مرۆڤێک یاخود ئامێرێک لەویتر جیابکاتەوە.**

Time(E), Temps(F), Tempo(I) **دەم، کات، زاراوە بەمانای ڕەزم دێت، بۆ نموونە کە دەوترێت لەسەر کێشی مارش***March time* **واتە لەسەر ڕەزمی مارش***Rhythm of a march*. **وەک هێمایەکیش لەلای چەپی هێڵاسۆ***Staff***کەدا دادەنرێت بۆ پێواندنی کێشی دانراوەیەکی مۆزیکایی.**

**دوو جۆری سەرەکیش لە ڕەزم یاخود کێش هەیە:**

1. **کێشی سادە***Simple time*. 2. **کێشی تێهەڵکێش***Compound time*

| | کێشەسادەکان Simple times | | کێشەتێهەڵکێشەکان Compound times | |
|---|---|---|---|---|
| | کێشەکان Time Signature | بەهای بارێک Value of one bar | کێشەکان Time Signature | بەهای بارێک Value of one bar |
| Duple | ¢ 2/2 | | 6/4 | |
| | 2/4 | | 6/8 | |
| | 2/8 | | 6/16 | |

| | کێشەسادەکان Simple times | | کێشەتێهەڵکێشەکان Compound times | |
|---|---|---|---|---|
| | کێشەکان Time Signature | بەهای بارێک Value of one bar | کێشەکان Time Signature | بەهای بارێک Value of one bar |
| Triple | 3/2 | | 9/4 | |
| | 3/4 | | 9/8 | |
| | 3/8 | | 9/16 | |

| | کێشەسادەکان<br>Simple times | | کێشەتێهەڵکێشەکان<br>Compound times | |
|---|---|---|---|---|
| | کێشەکان<br>Time Signature | بەهای بارێک<br>Value of one bar | کێشەکان<br>Time Signature | بەهای بارێک<br>Value of one bar |
| Quadruple | 4/2 | | 12/4 | |
| | C 4/4 | | 12/8 | |
| | 4/8 | | 12/16 | |

Timidezza(I), Timidity(E) کەمڕوویی، نەوێریی.

Timido(I), Timid(E) ترسنۆک، کەمڕوو، نەوێر.

Timore(I), Fear(E) ترس، بیم.

Timorosamente(I), Fearfully(E) ترسنۆکی.

Timoroso(I), Fearful(E) ترسنۆک.

Timpani, Timballo(I), Timbale(F), Kettle-drum(E) تیمپانی، ئامێرێکی ڕەزمی/یە.

Timpani coperti(I), Muffled drum(E) تیمپانی کپکراو.

Timpanist, Player of timpani(E), Timpanista(I) تیمپانیژەن.

Timpano pedale(I), Pedal timpano(E) پایدەری تیمپانی.

Timple(E) گچکە گیتاری دوانزە ژێ، پێیشیدەوترێت*Guitarrillo*.

Tina(E) کورتکراوەی کۆنسێرتینا*Concertina*.

Tinnitus(E), Acouphène(F) تەنین، زرنگانەوەی گوێ.

Tinter(F), Tinkle, Ring(E) زەنگلێبدات.

Tinnnabolo(I), Tintinnabulum(L), Small bell(E) زەنگۆڵە، گچکە زەنگ.

Tintinnamento(I), Tinkling(E) زەنگلێدان.

Tinto(I), Colour, Expression(E) ڕەنگ، گوزارە دەربڕین.

Tipo(I), Type, Style(E) چەشن، تایپ.

Tirando, Tirare, Tirato(I), Tiré(F) پیاهێنانی کەوان بەرەوخوار بەسەر کەمانچەدا.
Down-bow on the Violin(E)

Tiret(F) بڕوانە/*Mordent*.

Titelblatt(I), Title page(E) سەرناوی لاپەڕە.

Titre(F), Title(E) سەرناو.

Tivra swara(Hn), Sharped note(E) تیڤرا سوارا، نۆتەی پلەتیژ لە مۆزیکی هیندی/دا.

Toccante(I), Touching(E) پەڕماس، بەرکەوتن.

Toccato(I), Tokkata(G), Touquet(F) تۆکاتۆ، لە تۆکاریّ*Toccare*ی ئیتالیاییەوە هاتووە کە بەمانای بەریدەکەویّت*To touch*دیّت، مەبەست لە پارچە مۆزیکیّکە بۆ کیبۆرد کە والاکارییەکی هونەری تیابکریّت، زیاتر بۆ بەرایی*Prelude* فیوگە*Fugue*دادەنریّت. چوارەم{نزمترین}بەشی دەستەی ترۆمپیّتـــژەنان.

Toccatina, Toccatino(I) تۆکاتینا، گچکە تۆکاتۆ.

Toscin(I), An alarm bell(E) لارم{زەنگ}ی بیّداریی.

Todesgesang(G), Drige(E) چەمەریی، ئاوازی خەمگین بۆ مردووان.

Todtenmarsch(G), Dead march(E) مارشی مردووان.

Togliere il pedale sinistro(I) پیّی چەپ هەڵگرتن لە پایدەر{وەک لە پیانۆدا}.

Togliere la sordina(I), Mute off(E) لابردنی پیّکپە.

Tombeau(F), Elegy(E) پارچەمۆزیکیّکی خەمناک بۆ یادی کەسـیّک بنووسـریّت.

Tom-Tom, Tam-Tam(E) تۆم ـ تۆم، ئامیّریّکی تەپڵ/ییە لە ئۆکیّسترای مۆدیّرندا دەبینریّت، دەنگیّکی تیژی هەیە.

Tonality(E), Tonalità(I), Tonalität(G), Tonalité(F) تۆناڵیتیی، ســیستەمیّکی نووســینە کە پەیوەندی نیّوان توخمە تۆنەکانی:ـ میلۆدی*Melody*، هارمۆنــی*Harmony*، میانەکان*Interval*، کۆردەکان*Chord*، سـکیّڵەکان*Scale*، کادەنســەکان*Cadence*، مۆدیولیّنەکان*Modulation*، سـکیّڵی کرۆماتیکەکان هەموو پیّکەوە بە شـیّوەیەکی هەنداز و تەنراو*Weave* بەیەکەوە دەئاویّزیّنیّت.

Tonal(E) تۆناڵ، سـازاڵ، مۆزیکیّکە کە زیاتر لەسـەر بناخەی تۆناڵیتیّتە میّجەر وماینەرەکان و دەسگاکان*Modes* دامەزرابیّت نەوەک لەسـەر دوانزە تۆن*Twelve-tone* یاخود هەر سیستـەمە مۆزیکیّکی ئاتۆناڵی*Atonal* تر.

Tonal centre(E) سازاڵ سەنتەر، تۆناڵ سـیّنتەر، لایەنیّکی پراکتیکە بۆ مۆزیکدانەران*Copmoser* و مۆزیکگەران کە تیّیدا شـرۆڤە و نمایانی هەندیّک لە چەمکەکانی کلیل لە تۆناڵیتیدا دەکات کە کۆردەکان، ســکیّڵەکان، کادەنسـەکان و مۆدیولیّن دەگریّتەوە.

Tonal harmonic scales(E) ســکیّڵەکانی تۆناڵ هارمۆنیک بەگشتی بریتین لە هەشت سـکیّڵی تۆناڵ هارمۆنیکی ســێ بەش، ئەویـش ئەمانەن:ـ

1. ســکیّڵە دیاتۆنیکەکان*Diatonic scales* کە ئەمانە دەگریّتەوە:ـ
   a. ســکیّڵی میّجەر*Major scale*.
   b. دەسـگای ئایۆلیەن*Aeolian mode*.یان سکیّڵی سروشت ماینەر*Natural minor scale*.
   c. ســکیّڵی هارمۆنیک ماینەر*Harmonic nimor scale*.
   d. ســکیّڵی هارمۆنیک میّجەر*Harmonic major scale*.

2. سـکێڵە میلۆدییەکان*Melodic scales*کە ئەمانە دەگرێتەوە:ـ

a. سکێڵی میلۆدیک ماینەری هەڵکەوت{هەڵبەزیو} *Ascending melodic minor sclae* .

b. سـکێڵی میلۆدیک مێجەری داکەوت{دابەزیو} *Descending melodic major scale* .

3. سـکێڵە دەبڵ هارمۆنییەکان*Double harmonic scales*.

a. سـکێڵی دەبڵ هارمۆنی ماینەر *Double harmonic minor scale* .

b. سـکێڵی دەبڵ هارمۆنی مێجەر *Double harmonic major major scale* .

Tonal sequence(E) بڕوانە/*Sequence*.

Tonalità relativa(I), Tinalité relative(F) بڕوانە/*Relative keys*.

Tone, Note(E) تۆن، نۆتە.

Ton entier(F), Whole tone, Interval of major second(E) تۆنی تەواو، میانەی مێجەر دووەم.

Tonfall(G), Cadence, Inflection(E) کادەنس، گۆڕین یاخود ڕێکخستنەوەی پەردە یاخود نۆتە.

Tonführung(G), Melodic and harmonic progression(E) پێشبەری هارمۆنیی و میلۆدیی.

Ton générateur(F), Root of chord(E) ڕەگەتۆنی کۆرد.

Tongue, Reed(E) پیک، زمانە.

Tonic, The key centre(E), Tonica(I), Tonika(G), Tonique(F) پایەتۆن، یەکەم پلەی مێجەر و ماینەر لە سـکێڵدا، کلیلی ناوەند.

Tonic chord(E) کۆردی پایەتۆن. کۆردێک لەسـەر پایە*Tonic*ی کلیلێک یاخود سـکێڵێک دابمەزرێت.

Tonic dominant axis(E) پۆتانی پایەـ زاڵ، پەیوەندییەکی تۆناڵیتییە کە بە کۆردەکانی پایە*Tonic* و زاڵ*Dominant* دیاریبکرێت و ڕەگەکانیان*Root* بەشێک بن لە پێنجەم تەواو.

Tonic eleventh chord(E) یانزەیەم کۆردی پایەتۆن ، کۆردی شـەش نۆتەی سـیانیی هەڵچنراو لەسـەر یەکەم پلەی سـکێڵێک.

Tonic function(E) پایەنما، کۆردێک کە بشـێت لەبری پایە، بۆ نموونە ژێرناوەند*Submdiant*.

Tonic major/Tonic minor(E) مێجەر پایەتۆن/ماینەر پایەتۆن، ناولێنانی دوو کلیلی هاوتەریب کە هەمان پایەتۆنی هەبێت، بۆ نموونە دۆـ مێجەر پێیدەوترێت*Tonic major* و دۆـ ماینەر پێیدەوترێت*Tonic minor*.

Tonic seventh chord(E) حەوتەم کۆردی پایەتۆن ، کۆردی چوار نۆتەی سـیانیی هەڵچنراو لەسـەر یەکەم پلەی سـکێڵێک.

Tonic Sol-fa(E) فێربوونێکی تەکنیکییە لە مۆزیکدا کە لەسەر سـیسـتەمی خوێندنەوەی سـۆلفێج دانراوە.

Tonic traid(E) پایەتۆنی سـیانیی، سـیانییەک لەسەر یەکەم پلەی سـکێڵێک دامەزرابێت.

Tonleiterstufe, Tonstufe(G), Scale degree(E) پلەی سـکێڵ.

Tonlos(G), Tonless(E) تۆنـسز، بێـتۆن.

Ton majuer(F), Major key(E) کلیلی مێجەر.

Ton mineur(F), Minor key(E) کلیلی ماینەر.

Ton naturale(F) تۆنی سـروشـت، کلیلی بێ هێمای دێز و بیمۆڵ وەک دۆ ـ مێجەر و دۆ ـ ماینەر.

Tono intero(I), Tonus(L), Whole-tone, Major second interval(E) تۆنی تەواو، میانەی مێجەر دووەم.

Tonometer(E) تۆنـپێو، ئامێرێکی داهێنراوە لەلایەن فیزیکزانی ئەڵمانی یۆهان هێنریک شـیبلەر *J.H.Scheibler*(1777-1837) بۆ پێوانی پەردە مۆزیکییەکان ئەویش بە پێوانی فریکوێنسییەکانیان.

Tonchluss(G), Cadence(E) بڕوانە/*Cadence*.

Tonschlüssel(G), Key-note(E) بڕوانە/*Key-note*.

Top, The point(E) تۆپ، یەکەم لێدان لە یەکەم مازۆر*Measure*دا، لێدان لە سەرەتاوە.

Top-C(E) تۆپ/C، دوو ئۆکتاڤ سـەروو دۆ ناوەڕاست/*Middle-C*.

Toeculus(L) بڕوانە/*Neuma*.

Toeculus respinus(L) بڕوانە/*Neuma*.

Tornare(I), To return(E) بگەڕێتەوە.

Tornado(I), Returning(E) گەڕانەوە.

Tornado al primo tempo(I), Return to the orignal tempo(E) گەڕانەوە بۆ یەکەم تێمپۆ.

Tornado al tempo(I), Return to the former tempo(E) گەڕانەوە بۆ تێمپۆی پێشتر.

Tossire(I), To cough(E) پاڵدەنێت، دەنگێ کۆکە.

Tostamente, Tosrissimamente(I), Rapidly(E) خێرایی.

Tostissimo(I), Very rapid(E) زۆر خێرا.

Tosto(I), Rapid, At once(E) خێرا، دەسـوبرد.

Touches(F), Fret, Keys of a Keyboard instrument(E) دەسـکی ئامێری کەمانچە، عوود، گیتار، ماندۆلین، سـاز، تار و تەموورە و....مانەندیان.

Toujours(F), Always(E) هەمیشـە.

Tout, Toute, Tous, Toutes(F), All(E) هەموو.

Tout à coup(F), Suddenly(E) کتووپڕ.

Tractulus(L) بڕوانە/*Neuma*.

Tractus(L), Small line, Pause sign, Tail(E) گچکە هێڵ، هێمای وچان، کلک.

Traditional music(E) مۆزیکی کەلەپووریی{میللی}.
ئەو جۆرە مۆزیکانە دەگرێتەوە کە لە نێو ئاپۆرەی میللەتــدا زۆر باوە.

Tradotto(I), Translated, Arranged, Transposed(E) وەرگێڕاو، ڕێکخراو، ڕاگوازراو.

Traducteur(F), Translator(E) وەرگێڕ.

Traduzione(I),Trauction(F), Translation, Arrangement, Transposition(E) وەرگێڕان.
Trafelato(I), Breathless(E) بێ هەناسە.
Tragédie(F), Tragedy(E) تراژیدیی.
Tragender töne(G), Sluring of notes(E) بڕوانە/*Portato*.
Trait(F), A succession of quick notes(E) زنجیرە نۆتەی خێرای یەکلەدواییەک.
Trait d´harmonie(F), A succession of chords(E) زنجیرەیەک لە کۆرد.
Traktur(G), Action(E) ئەکشن، کارجێبەجێکردن.
Tranquillezza(I), Tranquillity(E) هێوریی و ئارامیی.
Tranquillamente(I), Tranquilly(E) بە هێوری و ئارامی.
Tranquillo(I), Calm, Tranquil(E) هێور، ئارام.
Transcription, Rearrengement music for instrumnets(E) ڕێخستنەوەی نۆتەنامەکان بۆ مۆزیک ئامێرەکان، واتە نۆتاندنەوەی ئاوازێک کە بسازێت بۆ ئامێرێکیتر.
Transducer(E), Transducteur(F) ئامڕازی وزەگۆڕ.
Transformer(E), Transformateur(F) وزە ڕاهێز، وزەپێکهێن.
Transitio(L), Modulation into another key(E) ترازاو، ترانسیتیۆ، ترازان بۆ کلیلێکی تر.
Transitus(L), Transition(E) ترازان، گواستن، گواستنەوەی پلەتۆنێک بۆ پلەتۆنێکی بەرزتر بە ئەندازەی ئۆکتاڤێک.
Transitus regularis(L), Passing note(E) بڕوانە/*Non-harmonic notes*.
Transitus irregularis(L), Changing note(E) بڕوانە/*Non- harmonic notes*.
Transpose, To move(E) ترانسپۆزە، ژەنینی پارچە مۆزیکێک لە چەند کلیلێکی جیاواردا یاخود ژەنینی ئۆکتاڤێک یاخود زیاتر بەرزتر یاخود نزمتر لەوەی کە نووسراوە.
Transposed Pentatonic scale(E) سکێڵی پێنتاتۆنیکی ترانسپۆزە.




Transposition(E), Transpozione(I) ترانسپۆزێن، گواستنەوە، نووسینەوەی نۆتەکان کە بگونجێت لەگەڵ پەردەی ستراینبێژ و ئامێران. دوو جۆریش لە گواستنەوە هەیە.

1. ترانسپۆزەی سادە*Simple transposition*، تێیدا میلۆدییەکە هەر لە بازنە ئۆکتاڤی بەرزتر یاخود نزمتردا دەمێنێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێکیتری بەسەردا بێت.



2. ترانسپۆزەی تێهەڵکێش*Transposition into another key*. تێیدا میلۆدییەکە کلیلی لە چەند بارێکدا بە گوێرەی پێویست دەگۆڕێت. لەم دوو نموونەی خوارەوەدا لەسەر کلیلی سـۆڵ ـ ماینەر*G-minor* و فاـ ماینەر*F-minor* بەدوایەکدان.

گەر سەرنجبدەین لە یەکەم بارِدا...دێزی حەوتەم*Sharpened 7th*لە سـۆڵ ماینەر و فاـ دێز دەبنە دێزـ حەوتەم لە فاـ ماینەر و می ـ سروشت*E-natural*.

لە دووەم بارِدا...دێزی چوارەم*Sharpened 4th*لە سـۆڵ ـ ماینەر و دۆـ دێز*C-sharp* دەبنە دێزـ چوارەم لە فاـ ماینەر و سی ـ سروشت*B-natural*.



ئەمانەی خوارەوەیش چەند نموونەیەکیترن بۆ ئەم جۆرە کلیل گۆڕینە:-

.1





.2



فلووتی ئاسۆیی، فلووتی بەلایی. Transverse flute, Cross flute(E)

فلووتی مۆدێرن چەند جۆرێکە لەوانەیش:ـ

1. پیککۆلۆ فلووت*Piccolo flute*...لەسەر کلیلی ڕێ/*D*و یەک ئۆکتاڤ بالاتر لە فلووتی ئاسایی.

2. سۆپرانۆ فلووت*Sopprano flute*...لەسەر کلیلی فا/*F*، چوارەم تۆن بالاتر لە کۆنسێرت فلووت.
3. کۆنسێرت فلووت*Concert flute*...لەسەر کلیلی دۆ/ی ناوڕاست*Middle-C*.
4. ئاڵتۆ فلووت*Alto flute*...لەسەر کلیلی فا/*F*، چوارەم تۆن نزمتر لە دۆ/ی ناوەڕاست.
5. باس فلووت*Bass flute*...لەسەر کلیلی دۆ، یەک ئۆکتاڤ نزمتر لە کۆنسێرت فلووت.
6. کۆنتراباس فلووت*Contrabass(Octabass, Subbass)flute*...لەسەر کلیلی سۆڵ، حەوتەم، چوارەم تۆن یاخود ئۆکتاڤێک نزمتر لە ئاڵتۆ فلووت.
7. دەبڵ کۆنتراباس فلووت*Double contrabass(Subcontrabass)flute*...لەسەر کلیلی دۆ، دوو ئۆکتاڤ نزمتر لە کۆنسێرت فلووت.
8. هایپەرباس فلووت*Hyperbass flute*...لەسەر کلیلی دۆ، چوار ئۆکتاڤ نزمتر لە کۆنسێرت فلووت.

Trasalendo(I), Startled(E) بە سام، ترس.

Trascinando(I), Dragging(E), Schleppend(G) بڕوانە/*Rallentando*.

Trattenendo(I), Zurückhaltend(G) بڕوانە/*Retenant*.

Trattenuto(I), Sustained(E), Retenu(F) بڕوانە/*Retenant*.

Tratto(I), Traîné(F), Dragged(E), Geschleppt(G) بڕوانە/*Legato*.

Tratto non(I), Do not drag(E) بێ کشان.

Trauer(G), Sorrow(E) مخابن.

Trauermarsch(G), Funeral march(E) مارشی چەمەری، مارشی شینی مردووان.

Trauermusik(G), Funeral music(E) مۆزیکی چەمەری، مۆزیک شینی مردووان.

Traum(G), Dream(E) خەون.

Träumerei(G), Dream-picture(E) خەو و ئەندێشە.

Treble(E) زیل، بەرزترین بەش لە کۆراڵچڕیی یاخود لە دەستەیەک ئامێران.

Treble-C(E) تریبڵ دۆ، نۆتەیەک یەک ئۆکتاڤ بالاتر لە دۆ ناوەڕاست/*Middle-C*.

Treble clef(E) تریبڵ کلیل پێیشیدەوترێت کلیلەکانی سۆڵ*G-clefs*.

Treble recorder(E) تریبڵ ڕیکۆردەر، مەبەست لە دەستەیەک لە ئامێرە ڕەزمیەکانە کە نۆتەیان لە تۆنی فا/*F*ی ژێر تۆنی دۆی ناوەڕاستدایە و فراوانی دەنگەکانی لە دوو ئۆکتاڤ و نیودایە. پێیشیدەوترێت ئاڵتۆ ڕیکۆردەر*Alto recorder*.

Treble viol(E) تریبڵ ڤیۆلا، گچکەڤیۆلا، بچووکترین قەوارەی ڤیۆلا.

Tre corde(I), Three strings(E) سێ ژێ.

Tredecim(L), Tredici(I), Trente(F), Thirteen(E) سیی/30.

Tremolo(E,I), Tremulant(G), Tremolante, Tremando, Tremante(I) **تریمۆلۆ،**




**خێرا لەراندنەوەی ئامێرە ژێدارەکان بۆ سەرەوە و خوارەوە چ لێدانی کەوان لە ئامێری کەمانچە و چ بە ڕیشە لە ئامێری ساز و عوود/دا بۆ لەسەر یەک تۆن یاخود دوو تۆنی کۆردێک، بەزۆری لە میانەی سیانییدا بەکاردێت.**

Tremendo(I), Frightening(E) **ترساندن.**

Tremolo legato(E) **تریمۆلۆ لێگاتۆ، خێرا ڕەپاتبوونەوەی دوو نۆتەی لەبری** *Alternating notes* **لەژێر تاکە سلۆرێکدا***Single slur*، **وەک لە ماینەر سیانی***Minor third***ییەکی جیادا. بڕوانە/***Repeated groups*. **ئەگەر سلۆر تیایدا نەبوو ئەوا پێیدەوترێت تریمۆلۆی نالێگاتۆ***Tremolo non legato*.

Triad(E), Accord de trois sons, accord parfait(F) **کۆردی سیانیی، بڕوانە/***Inversion*.







| کۆرد بە نووسین Chord as written | Chord as named کۆرد بە ناو | نۆتەکانی کۆرد Chord notes |
|---|---|---|
| **Cm♭5, Cmi♭5, C°, C dim** | C minor flat 5 or C diminished | C E♭ G♭ |
| **Cm, Cmi** | C minor triad | C E♭ G |
| **C♭5** | C major flat 5 triad | C E G♭ |
| **C** | C or C major triad | C E G |
| **C+** | C augmented triad | C E G# |
| **Csus4, Csus** | C suspended 4th triad where the third of the major triad is raised by a semi-tone (half-step). Because the third is absent, the triad is neither major nor minor. | C F G |

**هەندێک کۆردیتر هەن لەوانەیش:ـ**

| **C5** | C power chord | C G | **C** with no third |
|---|---|---|---|
| **C5/2** | C5 add 2 | C, D, G | **C** with no third and a second |

Triangle(E), Triangel(G), Triangolo(I) **سێگۆنە، ئامێرێکی مادەنیی ڕەزمییە.**

Tribach(Gr) **سێ کورتە نۆتە لە سیلاب***Syllable***کە بریتیەلە** ∪ ∪ ∪.

Trichord(E) **سێکۆردە، سێتارە، مەبەست لەو ئامێرەژێدارانەیە کە سێ ژێ/یان لەسەر بەستراوە وەک ئامێری سێتار، لیرا.... .**

Tricinium(L), Compisition in three parts(E) تریسینیەم، زاراوەیەکی سالانی سەتەی شانزەمە کە گوزارە لە ئاوازێکی سێ بەشی دەکات و سروودی کانتۆس فیرمۆس *Cantus fermus*هەوێنی هەر سێ بەشەکەیە.

Trill, Shaking(E), Triller(G), Trillo(I) قریوە، تریللە، شەکاندنەوە، تریلیلی، تلیلیلی~~~..... tr.~~~

چەشنە مۆزیکێکی ئۆرنامێنت*Ornament*ییە کە خۆشی زیات دەدات بەو ئاوازە.




Trillando(I), Shaking(E) تریلاندۆ، تریللاندن، شەکانەوە.

Trilogy(E), Trilogie(F,G) زنجیرە کارێکی دراماتیکی هونەریی لە سێ بەش پێکهاتبێت وەک لە ئۆپێرا، ئۆراتۆریا*Oratorios*... .

Trimestrale(I), Trimestriel(F), Trimestris(L), Quarterly(E) چواریی.

Trio(E) تریۆ، سیانیی، لە جاز مۆزیکدا گوزارە لە باندێکی سێ ئامێریی دەکات کە پێکهاتووە لە پیانۆ*Piano*، باس*Bass* و تەپڵەکان*Drums*. پارچە مۆزیکێک کە بۆ سێ ژەنیار ئامادەکرابێت. بڕوانە/*Scherz*.

Triolet, Triolit(F), Triole(G), Triplet(E) تریۆلێت، سێپلە، کورتە تریۆ، شێوەیەک لە هەڵبەست.

Trio sonata(E) تریۆ سۆناتا، چەشنە مۆزیکێکی هەیوان بۆ دوو ئامێر و هاوياريیەکی بەردەوام*Continuo accompaniment* کە لە سالانی سەتەکانی17م و 18مدا باو بوو، دوو شێوەیش هەبوو کە یەکێکیان بەناوی*Sonata da camera* و ئەویتریان بەناوی*Sonata da chiesa*.

Tripelconcert(G), A concert for three soloisters(E) کۆنسێرتی سیانیی{بۆ سێ ژەنیار}.

Tripelfuge(G). A fugue with three subjects(E) فیوگە/یەکی پێکهاتوو لە سێ بابەت.

Triple concerto(E) کۆنسێرتی سیانیی، کۆنسێرتۆیەک بۆ سێ ئامێر بە هاویاری ئۆکێسترا.

Triple-croche(F), Thirty-second note(E) سێپلە کرۆش،

Triple time(E), Tripeltakt(G) کێشی سێ ڕەزمیی، بڕوانە/*Time*.

Trisemitonium(L), Minor third(E) ماینەر سێیەم.

Tristamente(I), Sadly(E) خەمگینیی.

Tristan chord(E) تریستان کۆرد، کۆردێکی ئاوێزاوە لە زێدە چوارەم*Augmented fourth*، مێجەر سێیەم*Major third* و پێنجەمی تەواو*Perfect fifth* کە لەسەر ئەم نۆتانە دامەزراوە: ***F, B, D#, G#*** .

Triste(I), Tristo(I), Sad(E) خەمناک.

Tristeszza(I), Tristesse(F), Sadness(E) خەمگین.

Triton(F,I), Tritone(E), Tritonus(G,L) سـێتۆن، ترێتۆن، ئۆکتاڤ دەکاتە دوو بەشی یەکسانەوە و بە کۆردی گەسـتووDiminished وزاڵ حەوتەمDominant 7thدەردەکەوێت.

دوو جۆری سـەرەکیش هەیە:ـ



1. زێدەی چوارەمAugemented fourth وەک لە نێوان تۆنی دۆ/C و تۆنی/فا- دیز #Fدا.
2. گەسـتووی پێنجەمDiminished fifth وەک لە نێوان دۆ/C و تۆنی سـۆڵ ـ بیمۆڵ/Gbدا.

Tritt(G), Step, Treat, Pedal(E) تریت، پلە، هەنگاو، پێداڵ.

Tritus(L) سـیسـتەمی دابەشـبوونی هەمبانەی ئاوازەکانChant repertoryبۆ هەشت دەسگای کڵێسەیی کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سـەتەکانی ناوەڕاست. بڕوانە/Mode.

Trivium(L) بڕوانە/Quadrivium.

Trochee(L), Trochaus(Gr), Trochaique(F) ترۆشێ، کێشێکی مۆزیکایی و هۆنراوەیی دوو سـیلابSyllableییە کە یەکێکیان درێژ و ئەیتریان کورت{ ∪}.

Trois(F), Three(E) سـێ.

Trois cordes(F), Three strings(E) سـێ ژێ.

Troisième(F), Third(E) سـێیەم.

Trosième corps(F), Lower joint(E) پەیوەستەی خوارتر.

Troisième mode(F), Natural minor scale(E) ماینەر سکێڵی سروشتی.

Bass trumpet(E), Tromba bassa(I) باس تڕومپێت.

Jazz trumpet(E), Tromba da jazz(I) جاز تڕومپێت.

Tromba spezzata(I) ناوی کۆنی ئامێری باس تڕۆمبۆن.

Trombetta, Trombettino(I), Small trumpet(E) گچکە تڕومپێت.

Trombettatore, Trombettiere(I), Trumpeter(E) تڕومپێتـژەن، بووقژەن، بووقلێدەر.

Trombone(E) ئامێری تڕۆمبۆن، وشەیەکی لێکدراوی ئیتالیاییە کە پێکهاتووە لەTrombeواتە تڕومپێت و پاشـگریـش بە One واتە گەورەBig. کۆی وشـەکە گەورەتڕومپێت دەگەیەنێت کە مەودایەکی فراوانتری هەیە لە تڕومپێتی ئاسـایی.

دەستەی ئامێری تڕۆمبۆنی مۆدێرن ئامانەن:ـ

1. پیککۆلۆ تڕۆمبۆنPiccolo tromboneی بێ دەمەوانەValve.
2. سۆپرانۆ تڕۆمبۆنSoprano tromboneی بێ دەمەوانە لە پەردەی/Pitch- Bbئۆکتاڤێک بالاتر لە تینۆر تڕۆمبۆن.
3. ئالتۆ تڕۆمبۆنAlto trombone(Trombonino)ی بێ دەمەوانە لە پەردەی/Eb چوارەم تەواوPerfect fourthبالاتر لە تینۆر ترۆمبۆن.
4. تینۆر تڕۆمبۆنTenor tromboneی بێ دەماوانە لە پەردەی/Bb.
5. باس تڕۆمبۆنBass tromboneی بێ دەمەوانە.

6. باس ترۆمبۆنی یەک دەمەوانە لە پەردەی*Bb/F*.
7. باس ترۆمبۆنی دوو دەمەوانە لە پەردەی*Pitched in Bb/F/Gb* .
8. کۆنتراباس ترۆمبۆن*(Contrabass trombone(Double-bass trombone*ی چەند دەمەوانەیەکی جیاجیا لە پەردەی*Pitch in F/Eb/D, BBb* . وەهەروەها...... .

Trombone mute(E) پێکپەی ترۆمبۆن.

Trombonist, Trombone player(E), Tromboniste(F) ترۆمبۆنــژەن.

Trommel(G), Drum(E) تەپڵ.

Trommelbass(G), Bass drum(E) باس تەپڵ.

Trommelfell(G), Skin drum(E) پێستی تەپڵ.

Trommelschlägel(G), Drum stick(E) داری تەپڵ لێدان.

Tromp(F), Hunting horn(E) ترۆمپ، بووقی ڕاو.

Trompa Trump, Jew´s harp(E) ترۆمپا ترومپ.

Trompette bouchée(F), Muted trumpet(E) کپیوە ترومپێت{ترومپێتی کپێنراو}.

Trop(F), Too much(E) زۆر زۆر.

Tropa(E) کۆمەڵە ئامێرێکی فرە قەوارە لە هەمان جۆر.

Troparion(E) کورتە سروودی ئۆرتۆدۆکسی تاک برگە.

Trou(F), Finger-hole(E) کونە پەنجە{لە ئامێرە هەواییەکاندا}.

Troubadour(E), Trouvères(F), Trouvatori(I), Minnesinger(G) شـایەر، شــاییـگێڕ.

ترۆبادۆر......گوایە وشـەیەکی عارەبی بە ئیسـپانیکراوە کە لە ڕیشەوشەی تەرەب*Tarab*وە هاتووە گوزارە لە خۆشی دەربڕین بە دەنگ یاخود بە ئاواز دەکات. پاشگری دۆر*ador*ی ئیسپانیاییشی خراوەتەسەر بۆتە ترۆبادۆر*Trovadore*{بە زوانی ئیسپانیایی} واتە خۆشیـگێڕ. کۆی وشەکە مانای شایەر دەگەیەنێت، بەو کەسە دەوترێت سـەرپێیانە بە سـتران و ئاوازی خۆی شــایی بگێڕێت. پێدەچێت ئەم وشەیە وەک زاراوەیەکی مۆزیک بە هاتنی هونەرمەند زۆریاب بۆ هەرێمی ئەندەلس کەوتبێتە سەر زاری ئەو هەرێمە و ئیتر زوانگۆرکێی ئیسـپانیایی تیاکرابێت تا بەو وشەیە گیرسـابێتەوە کە تا ئێستا ماوەتەوە. ئەو شـایەرانە...لە زۆر کەرنەڤاڵ و پاڵەوانبازی*Acrobatic* خۆنواندن لە پێستی گیانلەبەراندا و بەرگــپۆشیی ڕەنگاوڕەنگی هەمەجۆرە و چەندین چالاکیــتری ســەنجراکێشیان بە خەڵک پیشاند دەدا.

Trugschluss(G), Deceptive(Interrupted, false, Evaded)Cadence(E) فریوە کادەنس،

Trumpet(E), Tromba(I), Trompette(F) ئامێری ترومپێت.

دێرینترین مێژووی ئەم ئامێرە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی1500پ.ز لە وڵاتی میسـر کە کاتی خۆی لە ئێسک*Bone*، قامیش*Cane* و شاخی گیانلەبەر*Ivory* و زیو و داری بامبوو*Bamboo*دروستدکرا. لە ئاوروپایش لەناوی هۆڕن*Horn*دەناسرا و لە وڵاتانی خاوەرمیانەیشدا بە نەفیر*Nafir* و بووق*Bugle*.

لەسەر ئەمانە بیراز و خاسکاری و جوانکاری تیاکرا تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە ئێستا بە چەندین جۆر لە پەردە و قەوارەی لە باند و ئۆرکێستراکاندا ڕۆڵێکی زوڵاڵ و کاریگەر دەگێڕێت.

لەو ترومپێتە سەرەکیانەی کە ئێستا هەن بریتین لە:ـ

1. پیککۆلۆ ترومپێت*Piccolo trumpet*ی چوار دەمەوانە*Valve* لە پەردەی*G/F*.
2. پیککۆلۆ ترومپێتی چوار دەمەوانە لە پەردەی*Bb/A*.
3. سۆپرانۆ ترومپێت*Soprano trumpet* لە پەردەی*D*.
4. سۆپرانۆ ترومپێت لە پەردەی*C*، ستاندەری ئۆرکێسترا.
5. سۆپرانۆ ترومپێت لە پەردەی*Bb*، ستاندەری باندە مۆزیکییەکان.
6. سێ جۆر لە ئاڵتۆ یاخود کۆنتراڵتۆ ترومپێت*Contralto trumpet* لە پەردەکانی*F, F, Eb*.
7. ئاڵتۆ یاخود کۆنتراڵتۆ ترومپێتی چوار دەمەوانە لە پەردەی*Eb/D*.
8. باس ترومپێت*Bass trumpet* لە پەردەی*Bb*، ئۆکتاڤێک نزمتر لە سۆپرانۆ ترومپێت*Bb*.
9. کۆنتراباس لە پەردەی*F*، چوار پەردە نزمتر لە باس ترومپێت.
10. دوو کۆڕنێت*Cornet* لە پەردەکانی*Bb, Eb*.
11. فلووگل هۆڕن*Flugelhorn* لە هەمان پەردەی سۆپرانۆ ترومپێتی*Bb*.

Trumpeter, Trumpetist(E) — ترومپێتـــژەن.

Trumpet crook(E), Ton de trumpette(F) — ترومپێتی پێچەک.

Trumpet mute(E) — پێکپەی ترومپێت.

Trusses, Piano legs(E) — لاقەکانی پیانۆ.

Tsymbaly(E) — بڕوانە/*Dulcimer*.

Tuba(E, F, G, I) — تووبا، براس ئامێرێکی هەواییە.

سێ جۆر تووبا هەیە:ـ

1. تینۆر تووبا*Tenor tuba* لە پەردەی*Bb*.
2. باس تووبا*Bass tuba* لە پەردەی*F* ، *Eb*.
3. کۆنتراباس تووبا*Contrabass tuba* یاخود دەبڵ باس ساکسهۆڕن*Double-bas saxhorn* لە پەردەی*C* ، *Bb*.

Tuba mute(E) — پێکپەی تووبا.

Tubetto(I), Tube(E) — لوولە.

Tubicen(L), Tuba player(E) — تووباژەن.

Tumultuoso(I), Tumultuous(E) — توند، هاژەوهوژ.

Tune, Air, Melody, Song has word(E) — هەوا، نەوا، میلۆدی.

Tune deafness, Tone deafness(E) — تۆنی بێدەنگ.

Tuning(E) — کۆک یاخود سازکردنی دەنگ بەشێوەیەکی پاک.

Tuning fork, Tonometer(E) — چەتاڵە کۆک، تۆنـــپێو، دیاپازۆنی شێوە U.

Tuning hammer, Tuning key(E), Accordoir(F) کلیلی کۆککردنی ژێیەکانی پیانۆ، هارپسیکۆرد، کلاڤیکۆرد و سـەنتوور... .

Tuning wire(E) سـیم{وایەر} کۆککردن.

Tuoni ecclsiatici(I), The church modes(E) دەسگا کلێسەییەکان.

Tuoni transportati(I), Transposed modes(E) دەسگا ترانسپۆزەکان.

Tuono(I), Thunder(E) گرمە.

Turbato(I), Disturbed(E) بێزاربوو.

Turn(E), Gruope(F), Gruppetto(I), Dopelschlang(G) کۆلاپ، تەکنیکێکی ئۆرنامێنتییە بە هێمای ∾ لەسەرووی نۆتەکە ئاماژەیە بۆ درێژبوونەوە.




Turnaround, Cadence(E) خۆگەڕانەوە، پێچکردنەوە، هەمان مانای کادەنس دەگرێتەوە بەڵام لە مۆزیکی جاز/دا بەم زاراوەیە گوزارەدەکرێت.

لەسەر کلیلی دۆ/C




Tutta, Tutte, Tutti, Totto(I), All(E) هەموو.

Tutak(Kr) توتاک، بلوێری گڵین{لە گڵ دروستکراو}.

Tutta la Forza(I), All the power(E) هەموو هێز.

Tutte le corde(I), All the srings(E) هەموو ژێیەکان.

Tuyau(F), Pipe(E) بۆری، لوولە.

Tuyau à Anche(F), Reed pipe(E) زمانەی لوولک.

Tuyau d´orgue(F), Orgn pipe(E) لوولەی ئۆرگن.

Twahym(Kr), Well done(E) **تواهیم، زاراوەیەکە گوزارە لە ئافەرین بۆ خۆشخوانێک کە بەیتی حەیران بیێژێت. لەدوای هەر بڕگەیەک کەسێک لە گوێگران خرۆش بیگرێت ئەم وشەیەی بە زاردا دێت وەک بیەوێت بڵێت:ـ تۆی هەم واتە هەر بمێنیت بۆ ئەو حەیرانە خۆشەی دەیێژیت.**

Twelfth(E) **میانەی دوانزەم کە دەکاتە ئۆکتاڤێک و پێنجەم.**

Twelve note(E) **دوانزە نۆتە.**

Twelve-string guitar(E) **گیتاری دوانزە تەل کە هەر دوانە پێکەوە تۆنێکی هەیە و بەم ژێیانەیش کۆککراون:** ***E-A-D-G-B-E*** .

Two note chord(E) **کۆردی دوو نۆتە، بۆ نموونە: دۆـ سـۆڵ/***C-G*** **کە پێیشیدەوترێت کۆردە دۆ/***C*****ی بەهێز.**

Three note chord, Triad(E) **کۆردی سـێ نۆتە، سیانیی.**

**وەک لەم نموونانەدا:ـ**

| کۆرد بە نووسین<br>Chord as written | Chord as named کۆرد بە ناو | نۆتەکانی کۆرد<br>Chord notes |
|---|---|---|
| **Cm♭5, Cmi♭5, C°, C dim** | C minor flat 5 or C diminished | C E♭ G♭ |
| **Cm, Cmi** | C minor triad | C E♭ G |
| **C♭5** | C major flat 5 triad | C E G♭ |
| **C** | C or C major triad | C E G |
| **C+** | C augmented triad | C E G# |
| **Csus4, Csus** | C suspended 4th triad where the third of the major triad is raised by a semi-tone (half-step). Because the third is absent, the triad is neither major nor minor. | C F G |

Tympany(E) **ئامێری تیمپانی، ئامێرێکی ڕەزمی/یە، لەنێو زۆر میللەتانی ئافریکا و باشووری ئاسیادا باوە، شـێوە پەرەپێدراو و چاککراوەکەی لە ئۆرکێستراکاندا ڕۆڵێکی گرنگ لە خێزانە ڕەزمیەکاندا دەگێڕێت.**

Tympanist, Kettle-drum player(E) **ژەنیاری ئامێری تیمپانی، تیمپانـژەن.**



Tonometer دەزگای تۆنپێو



زەنگە پەرستگاییەکان
Temple bells



Tuba تووبا



Timpani تیمپانی



Trumpette تڕومپێت



Trombone تڕۆمبۆن



Tom-Tom Drum
دەفی دوم ـ دوم

-------------------------------------
-----------------------
------------

# U

مۆزیک.....ســرۆشی ڕۆح و دەرووی خەندەی دڵانی ئارامە... .
بێتهۆڤن

---

Und(G), And(E) وە، پیتی و/ی پەیوەست.

Über(G), Over, Above, Too(E) سەرو، هەروەها.

Übergang(G), Transition, Modulation From one key to another(E) گواستن، مۆدیولێن لە کلیلێکەوە بۆ کلیلێکیــتر.

Übermäßig(G), Augmented(E) زێدەکراو.

Übermäßiger Akkord(G), Augmented chord(E) زێدەکراوە کۆرد.

Übermäßiger Dreiklang(G), Augmented triad(E) زێدەکراوەی ســیانیی.

Übermäßiger Sextakkord(G), Augmented sixth chord(E) زێدەکراوەی شەشەم کۆرد.

Übermäßiges intervall(G), Augmented interval(E) زێدێکراوە میانە.

Übung(G), Étude(F), Exercise(E) ڕاهێنان، مەشــقکردن.

Ud(Ar,Kr), Lute(S), Barbad(Fa,Kr) عوود، بارباد، بەمانای چەوێڵ*Twig*دێت کە جۆرە دارێکی نەرمی بۆندارە*Aromatic stick* ئامێرێکی ژێداری پێنج ژێ/ییە، ئامێرێکی زۆر دێرینە کە بۆ یەکەم جار لە ســەردەمی دەســەڵاتڕانی ســاســانیەکاندا بەناوی بارباد*Barbad* وەک ئامێرێکی مۆزیکی ژێدار هاتووە، لە ســەردەمی دەسەڵاتڕانی عەباسیەکان و بە دەرکەوتنــی هونەرمەندی کوردنەژادی ونبووی نازناو بە زۆریاب*Zuryab*ئەم ئامێرە بەشــێوەیەکی پەرەپێدراو و کاریگەر هاتە مەیدانی هونەرەوە و بەرەبەرە نازناوی عوود/ی پێدرا و تا ئێستا بەو ناوە ماوە.

Uguale, Uguali(I), Equal(E) یەکســان.

Ugualmente(I), Equally(E) بەشــێوەیەکی یەکســان.

Ugualià, Uguaglianza(I), Equality(E) یەکسانێتی.

Ukelele,Ukulele ئوکیلیلە، ئامێرێکی پۆرتوگاڵ/ی چوار ژێیە، تاڕادەیەک بەئامێری گیتار دەچێت.

Ultimo, Ultima(I), Last(E) دوا.

Umano, Umana(I), Human(E) مرۆڤ.

Umore(I), Humour(E) هەوەس.

Une(F), Uno(I), One(E) یەک، یەرێ.

Una corda(F), One string(E) یەک ژێ.

Unca(L), Quaver, Eighth-note(E) هەشتەک، 1/8ی نۆتەی تەواو.

Unda maris(L), Wave of the sea(E) شەپۆلی دەریا.

Undecima(I,L), Undezime(G), Eleventh interval(E) میانەی یانزەیەم.

Undecimole(I) ئوندێسیمۆلێ، گروپە نۆتەیەک کە بارێک یاخود بەشەبارێک بۆ یانزە پارچەی یەکسان دابەشبکات.

Ungerader takt(G), Ternary, Triple time(E) کێشی سێتایی3/4.

Ungleicher contrapunkt(G), Unequal counterpoint(E) کۆنتراپونتی نایەکسان، کۆنتراپونتێک نۆتەکانی لە کانتۆ فێرمۆ*Canto fermo*دا بەهای جیاجیایان هەبێت.

Uni, Unie, Unis, Unies(F), United, Smooth(E) لووس، یەکگرتوو.

Unico(L), Unique(E) یەکانە، تەنیا، بێوێنە

Unison(E), Unisson(F), Unisono (I), Unisonus(L), Einklang, Vereint(G) یەکتۆن، میانەی نێوان دوو نۆتەی وەکیەک، بۆ نموونە لە تۆنی دۆ/Cی سروشتیەوە بۆ تۆنی دۆ/Cی سروشتی کە پێشیدەوترێت یەکتۆنی تەواوە *Perfect unison* یاخود سەرتەواو*Perfect prime*. لە تۆنی/C بۆ تۆنی دۆی تیژ/$C^{\#}$ پێیدەوترێت زێدە یەکتۆن*Augmented unison*یاخود *Aug. prime*، لەبەرئەوەی کە بە یەک نیوەتۆن لە یەکتۆنی تەواو زیاترە. هەروەها لە تۆنی/C بۆ پلەتۆنی دۆی پانۆک/$C^{b}$پێیدەوترێت یەکتۆنی گەستوو*Diminished unison*.

Unitamente(I), Unitedly, Jointly(E) بە شێوەیکی بەستراو، پێکەوە لەگەڵ، یەکگرتوویی.

Unmeasured music, Free rhythm(E) مۆزیکی نەپێوراو، مۆزیکی ئازاد لە ڕەزم لە هەندێک سروود ئایینی و سترانی شایەران*Truobadour*دا دەبیسرێت.

Uno(I), One(E) یەک.

Un peu(F), Un poco, Un po´(I), Little(E) بچەک، کەم.

Un peu plus lent(F), Little slower(E) بچەک خاوتر.

Un pochettino(I), Very little(E) زۆر کەم.

Un pochino(I), A very little(E) هەر زۆر کەم.

Un poco accelerando(I), Accelerarting a little(E) کەمێک پەلەکردن.

Un poco più lento(I), A little quicker(E) کەمێک خێراتر.

Un po´lontani(I), A little further away(E) کەمێک دوورکەوتنەوە.

Unrein(G), Out of tone(E) لە تۆن بەدەر، دەرەوەی تۆن.

Unruhig(G), Restless, Without peace(E) بێئارام.

Unschuldig(G), Innocent(E) بێگوناه.

Unten, Unter(G), Under, below(E) ژێر، پایین.

Unterbrechung(G), Interruption, Suspension(E) هەڵاویز، هەڵواس، پچڕان.

Unterbrochene cadenz(G), Interrupted cadence(E) پچڕە کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Unterdominante, Untersatz(G), Subdominant(E) لازاڵ، ژێرزاڵ.

Unterhalbtone(G) نۆتەنما، بڕوانە/*Leading note*.

Unterleitton(G), Fourth degree of the scale(E) چوارەم پلەتۆن لە سکێڵدا.

Untermediante(G), Submediant, Superdominant(E) ژێرناوەند، سەرزاڵ.

Untersetzen(G), Passing the thumb under the other fingers(E) تێپەڕاندنی پەنجەگەورە بە ژێر پەنجەکانی تردا لەکاتی ژەنینی ئامێری کیبۆرد.

Unverziert(G), Unornamented, Simple(E) بێزەخرەفە، سادە.

Unvollkommen(G), Imperfect(E) ناتەواو.

Unvollkommene cadenz(G), Imperfect(incomplete)cadence(E) ناتەواوە کادەنس، بڕوانە/*Cadence*.

Uomo(I), Man(E) پیاو.

Up-tempo(E) بژێوە لێدان، بەتایبەتی لە مۆزیکی جاز/دا بەکاردەهێنرێت لەبەرئەوەی ژەنینێکی تێمپۆ خێرا لەخۆبگرێت.

Up-beat, Weak beat(E) لاواز لێدان، لە ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە و مانەندیان کەوانەکە بەرەو سەرەوە لێبدرێت.

Up-bow, Strong-beat(E) توندە لێدان، لە ئامێرە ژێدارەکانی وەک کەمانچە و مانەندیان کەوانەکە بەرەو خوارەوە لێبدرێت.

Upper appoggiatura(I), Upper leaning(E) ئاپۆجیاتۆرای بالاتر.
بڕوانە/*Appoggiatura* .

Upper mordent, Inverted mordent, Tied trill(E) مۆردانتی بالا، بڕوانە/*Mordent*.

Upright piano(E) پیانۆی وەستاو، پیانۆیەک ژێیەکانی بە ستوونی بەستراون.

Uranion, Glass harmonica(E), Üveg-harmonika(G) یۆرانیۆن، شووشە هارمۆنیکا.

Und so fort(G), And so forth(E) وە بەرەو سەرەوە، ***u.s.f***کورتەیەتی.

Und so weiter(G), And so on(E) ڕۆیین لەسەری، ***u.s.w***کورتەیەتی.

Uraq(Ar,Fa,Kr,Tr) عوراق، بڕوانە/*Arak*ئاراک.

Uşşaq(Ar,K,Tr), Auşaq(Fa, Kr) ئاوشاک، ئاوشـشـاق، عوشـشاق یەکێکە لەو 30پەردەیەی هونەرمەندان نێکیسیا و بارباد سازاندبوویان و لە دەرباری کەیخەسرەوی ساسانیدا دەیێژرا. سەردەمی ئێستا کە وەک دەسگایەکی مۆزیک شیدەکرێتەوە، لێڕشتەیەکی سەر بە دەسگای نەهاوەندە بەڵام سکێڵی هاتنەخوارەوەی کە دەچێتەوە سەر بوسەلیک پێکهاتووە لە:ـ
ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی نەوا، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا.




Uşşaq Turk(Ar,Kr,Tr) **عوشـشـاقی تورکی. لێرِشتەیەکی سەر بە دەســگای بەیاتە، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ لە ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی دووگا، ڕەگەزی نەهاوەند لەســەر پلەتۆنی نەوا.**




Uşşaq Misri(Ar,Kr,Tr) **عوشـشاقی میســری لێرِشتەیەکی سەر بە دەســگای نەهاوەندە {ترانسپۆزەیە لەسەر پلەتۆنی ڕاست}، سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی بەیات لەسەر پلەتۆنی نەوا.**




Ut, Do, Doh(F,I), C(E,G) **تۆنی/دۆ لە سکێڵی دیاتۆنیکدا.**

Ut bémol(F), C flat(E) **دۆ بیمۆڵ**/$C^b$.

Ut bémol majeur(F), C-flat major(E) **کلیلی دۆ بیمۆڵ ـ مێجەر.**

Ut dièse(F), C-sharp key(E) **کلیلی دۆ تیژ**/$C^\#$.

Ut dièse majeur(F), C-sharp key(E **کلیلی دۆ تیژ**/$C^\#$ **ـ مێجەر.**

Ut-majeur(F), C-major(E) **دۆ**/C **مێجەر.**





Violin
کەمانچە(خۆراوایی)



Viola ڤیۆلا

# V



Vibraphone ڤێبرافۆن



ڤینا/ی هیندی
Veena

# V

ئامانج لە هونەر...چێژ وەرگرتنە لە جوانیـیەکـی سارا.....!!!
کانت

---

Va(I), Continues(E) **وا، ئاماژە بۆ بەردەوامبوو بەو چەشنە.**

***V.*** **کورتکراوەیە بۆ:ـ** *Voce, Volte, Volti, Violino, Vide.*

***Va.*** **کورتکراوەیە بۆ** *Viola.*

Vacillant(F), Vacillando(I), Waving(E) **شـەپۆلدان، ئاماژەیە بۆ لەراندنەوەی ژێیەکان.**

Vaghezza(I), Longing, Grace(E) **ئارام و پەرۆش.**

Vago(I), Vague, Uncertain tempo or expression(E) **تێمپۆ یان گوزارەیەکی نادیار.**

Valse(E,F), Valzando,Valzer(I),Volvere(L), Waltz(G) **ڤالس، سـەمایەکی 3/4ی ئەڵمانیاییە، پێشەکی...سـەماکە چەند میلۆدییەک دەگرێتەخۆ بەرلەوەی بە کۆدا***Coda***کۆتایی پێـبێت، لەرووی هارمۆنیشەوە لە یەکەم لێدانیدا کۆردی بەهێزی هەیە، بەدوایدا دووەم و سـێیەم لێدان دێن کە دوو کۆردی لاوازن. ئەم چەشنە لە بارێ***Bar***ێکەوە بۆ بارێکیتر رەپات دەبێتەوە.**

Valve(E), Ventil(G), Ventile(I), Soupape(F) **دەمەوانە، ئامرازێکە لە هەندێک ئامێرە براسیەکاندا***Brass instrument***کە کۆنترۆڵ و ئاراستەی هەوا دەگۆرێت لە رێی چەند لوولەیەکـی درێژ جیاواز بۆ گۆرینی پەردە***Pitch***ی ئەو نۆتەیەی لێدەدرێت. دوو جۆریش دەمەوانە هەیە کە، جۆری یەکەم پێیدەوترێت دەمەوانە پەستێن** *Piston valve*، **وەک لە ئامێری ترومپێت***Trumpet***دا هەیە. جۆری دووەم پێیدەوترێت دەمەوانەی خولاوە** *Rotary valve*، **وەک لە ئامێری تووبا***Tuba***دا هەیە.**

Valve trombone(E), Trombone à Pistons(F) **دەمەوانەی ترۆمبۆن.**

Valve trumpet(E), Tromba a Pistoni(I) **دەمەوانی ئامێری ترومپێت.**

Va presso(I), Goes up to(E) **وا رۆیین تاکو... .**

Value(E), Valeur(F), Valore(I), Wert(G) **بەها، سـەنگی نۆتە، بروانە/***Duration*، **بریتیە لە پێوانی کێشی نۆتەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا.**

Variamente, Variatamento(I), Differently(E) **بە شـێوەیەکی جیاواز.**

Variante(F,I), Variant(E) **جیاواز، گۆڕیو.**

Variation(E), Variazione(I) جۆرانجۆر، ڕەنگاوێز، مۆزیک شـێووگ*Form*ێکە کە لە جوارانجۆر بەخشــی چەندبارەبوونەوەی ڕشـتە*Theme*یەکرای یەکبەدووایەک بەئەنجام دێت. شـێوازێکی ڕەنگئامێزیــی و مۆزیکبازییە*Manipulation* کە تیما*Theme* تیایدا جۆرانجۆری ڕەنگاوڕەنگ لە میلۆدی و ڕەزم و هارمۆنی لە خۆدەگرێت.

Veemente(I), Vehement(E) توند و تیژ.

Veemenza(I), Vehemence, Energy(E) بڕست، وزە.

Velato(I), Voilé(F), Veiled(E) پۆشین، تارا.

Vellutato(I), Soft and Velvet(E) نەرم و ناسک.

Veloce(E,I), Véloce(F), Quick(E) خێرا.

Velocissimo(I) زۆر خێرا.

Velocità(I), Velocity(E) خێرایی، توندڕۆیی.

Velouté(I), Velvety(E) نەرمێتـیی.

Vent(F), Wind(E), Vento(I) با.

Ventil horn(G), Ventile corno(I), Valve horn(E) دەمەوانەی هۆڕن.

Ventil instrument(G), Valve instrument(E) ئامێری دەمەوانەدار.

Ventil posaune(G), Ventile trombone(I), Valve trombone(E) دەمەوانەی ترۆمبۆن.

Ventilloses horn(G), Valveless horn, Natural horn(E) هۆڕنی سادە{بێ دەمەوانە}.

Ventil trompet(G), Valve trumpet(E) دەمەوانەی ترومپێت.

Vento de Legno(I), Woodwind(E) تەختەباییەکان، تەختەهەواییەکان.

Vents(F), Wind instruments(E) ئامێرە هەواییەکان.

Venusto(I), Beautiful, Pretty(E) جوان، شۆخ.

Verbindung(G), Binding(E) بەندێن.

Verbindungszeichen(G), Slur, Bind(E) بەند، پەیوەست.

Verdeckt(G), Hidden(E) شـاراوە.

Verdeckt octaven´Octavparallelen´(G), Hidden octaves(E) ئۆکتاڤە شـاراوەکان. یاخود ئۆکتاڤ تەریبە شـاراوەکان.

Verdeckte quinte´Quinteparallelen´(G), Hidden fiffths(E) پێنجەمە شـاراوەکان. یاخود پێنجەم تەریبە شـاراوەکان.

Verdopplen(G), Double(E) جووت، دەبڵ.

Vergnügt(G), Contented(E) شاد و خۆشــحاڵ.

Vergrösserung(G), Augmentation(E) زێدە.

Verein(G), Society(E) جڤات، کۆمەڵ.

Verhallend(G), Dying away(E) دەنگ بەرەو نەمان، دەنگی پەژمردە.

Verklärt(G), Transfigured, Glorfied(E) نیگارترازان، بەشکۆڕاگرتن.

Verkeinerung(G), Diminution(E) گەستن، کەمکردنەوە.

Verlängerungspunkt(G), Augmentation dot(E) زێدە دۆت{پنت}.

Verlängerungszeichen(G), Fermata(E) بڕوانە/*Fermata*.

Vermindert(G), Diminished(E) گەســتوو، کەمبوو.

Verminderter Akkord(G), Diminished chord(E) گەستووە کۆرد.

Verminderter Septakkord(G), Diminished seventh chord(E) حەوتەم کۆردی گەستوو.

Vermindertes dreiklang(G), Diminished triad(E) ســیانیی گەستوو.

Vermindertes intervall(G), Diminished interval(E) میانەی گەستوو.

Vernehmbar(G), Perceptible(E) تێبینراو، پەیبردوو.

Vers(G), Verse(E), Verso(I) بەزم{وێژەی بەڕەزم کە هەڵبەست دەگرێتەوە}، ستراني شايەران*Truobadour*کە پێکهاتوو لە پێنج بۆ دە بڕگە.

Versetto(I), Stanza, Versicle(E) بڕگەی بەزم{واتە هۆنراوە}.

Versetzung(G), Transposition(E), Transpozione(I) ترانسپۆزە.

Verstimmt(G), Out of tune(E) تۆنی ناکۆک،

Verweilend(G), Delaying(E), Rallentando(I) دواخستن.

Verzieren(G), Embellish(E) بڕوانە/*Ornament*.

Verzierte melodie(G), Ornamented melody(E) میلۆدی زەخرەفێنراو{ئارایشتە}.

Verzögern(G), Retard(E) بڕوانە/*Ritardando*، نۆتەی دواکەوتوو.

Verzögerung(G), Delay, Retardation(E) دواکەوتن.

Verzweiflungsvoll(G), Full of despair(E) پڕنائومێد.

Very(E), Très(F) فرە، زۆر.

Very detached(E), Très détaché(F) بڕوانە/*Spiccato*.

Vezzosamente(I), Graceful, Pleasing(E) بە شیرینی و دلۆڤانی.

Via(I), Away(E) لەڕێی، بەلای.

Vibrant(E,I), Vibrating(E) لەرینەوە، نەوەستان.

Vibrato(I), Tremglement mineur(F) ڤێبراتۆ، لەرین.

Vibraphone, Vibra-harp, Vibes(E) ڤێبرافۆن، ڤێبراهارپ، مۆزیک ئامێرێکی کانزاییە بە ئامێری زایلەفۆن دەچێت.

Vicenda(I), Change(E) گۆڕین.

Vicendevole(I), Interchangeable(E) بەنۆبە.

Vicino(I), Near(E) نزیک.

Vide(F), Empty(E) بۆش، کراوە، واز، وەک دەوترێت ژێواز یاخود کراوە ژێ *Corde à vide(open string)*.مەبەست ئامێرەکانی وەک کەمانچە و مانەندی دەگرێتەوە.

Viel, Viele(G), Much, Many(E) زۆر، فرە.

Vielchörig(G), For several choirs بۆ چەندین کۆڕاڵ.

Vielle(E) ڤیـێللا، ئامێرێکی ژێداری سەتەکانی ناوەڕاستە کە لێوەیڕا ئامێری ڤیۆل*Viol*ی ، لێکەوتۆتەوە کورتکراوەیشە بۆ ئامێری*Vielle à roué*واتە ئامێری هوردی-گوردی*Hurdy-gurdy*.

Viel näher und stärker(G), Much nearer and stronger(E) زۆر نزیکتر و بەهێزتر.

Vielstimmig(G), Polyphonic, In several parts(E) پۆلیفۆنیک لە چەندین بەشدا.

Vier(G), Four(E) چوار.

Vierachteltakt(G) کێشی4/8.

Vierhalbetakt(G) کێشی4/2.

Vierhändig(G) بۆ چوار دەست{ بۆ کیبۆردی دوو کەسی بەکاردەهێنرێت}.

Vierklang(G), Four notes, Seventh chord(E) کۆردی چوار نۆتە، کۆردی حەوتەم.

Vierstimmig(G), In four parts(E) لە چوار بەشـدا.

Vierstimmig harmonie(E), Four-part harmony(E) چوار بەشـە هارمۆنی.

Vierte(G), Fourth(E) چوارەم.

Viertel(G), Fourth portion, Quarter(E) چارەک، چواربەش.

Viertle-note(G), Crotchet(F), Quarter-note(E) چارەکە نۆتە، کرۆش.

Viertel pause(G), Crotchet pause(F),Quarter rest(E) چارەکە وچان، چارەکە پاوس.

Viertelton(G), Quarter-tone(E) چارەکە تۆن.

Vierundsechzigstel note(G) 1/64ی نۆتەی تەواو*Whole note*.

Vierundsechzigstel pause(G) 1/64ی وچانی تەواو*Whole-rest*.

Viervierteltakt(G) کێشی4/4.

Vif, Vive(F), Lively(E) بژێوی.

Vigore(I), Vigour(E), Vigueur(F) توند.

Vigoroso(I), Vigorous(E), Vigoureux(F) بەتوند.

Vigorosamente(I), Vigorously(E), Vigoureusement(F) بە شـێوەیەکی توند.

Vihuela d'arco(F), Bowed vihuela(E) ڤیۆلی بە کەوان، ئامێری ڤیۆل/ی سەردەمێکی دێرین.

Villanelle(F) هەڵبەست یاخود سـترانە پاسـتۆراڵیەکانی سـەتەی شـانزەیەم.

Villareccio(I), Rustic(E) گوندەکی.

Viloncello(I), Violoncello(E) ئامێری ڤیۆلۆنسیللۆ.

Vina(Hn) ڤینا، وشەیەکی سـانسکریت *Sanskrit* یە، ئاماژەیە بۆ ئامێری ژێدار کە بەگشتی کراون بە دوو جۆرەوە. جۆرێکیان پێیدەوترێت تات *Tat*، ئەو ئامێرە ژێدارانە دەگرێتەوە کە بە پێلێدە{لێدەر} *Plucked* دەژەنرێن وەک ئامێری تار، سـیتار، عوود، هارپ. جۆرەکەیتر پێیدەوترێت ڤیتات *Vitat*، ئەو ئامێرە ژێدارانە دەگرێتەوە کە بە کەوان دەژەنرێن و لەوەی پێشوو زۆر کۆنترە.

Vinata(I), Drinking song(E) سـتران ئاهەنگی مەی نۆشین.

Viol(E), Viole(F) ڤیۆل، خێزانی ئامێرە ژێدارەکانی ڤیۆل بریتین لە:ـ

1. پاردێسـۆس ڤیول *Pardessus de viole*/ (g)c` e` a` d`` g``.
2. تریبڵ ڤیۆل *Treble viol*{بچووکترین قەوارەی هەیە لە خێزانەکەدا d g c` e` a` d``}.
3. ئاڵتۆ ڤیۆل *Alto viol*/ c f a d` g`(c``).
4. دیڤیژن باس/ *Division viol*{D G c e a d`}.
5. ، لیرا ڤیۆل *Lyra viol*/جۆرانجۆرە... .
6. باس ڤیۆل *bass viol*/ (AA)D G c e a d`.
7. ڤیۆلۆنی گامبا *Violone(da gamba)*/ GG C F A d g.
8. تینۆر ڤیۆل *Tenor viol*/ (G) c f a d` g`.
9. ڤیۆلۆنی کۆنتەرباس *Violone del Conterbasso*/ DD GG C E A d.

ئەم ئامێرانە تێکڕا بە کەوان لێدەدرێن، شـانەکانی لێژو داکەوتوون، پشتیان پانە، ناوسک بۆش و قووڵ و کێش سووکن، بەگشتی شـەش ژێیان لەسەر بەستراوە، هەندێکی تریان وەک پاردێسۆس پێنج ژێی لەسەر بەستراوە کە دەخرێتە نێوان هەردوو لاقیشەوە و بنکەکەی لەسەر زەوەی دادەنرێت و دەژەنرێت. بۆ یەکەمجار لە سـەتەی پانزەیەمدا هاتەبەرچاو و بووە یەکێک لە باوترین ئامێری سـەردەمی هۆریزان *Renaissance* و بارۆک.

Viola all´inglese, Viola inglese(I) ڤیۆلای ئینگلیزی، زاراوەیەکی ئیتالیاییە بۆ ئامێری ڤیۆل.

Viola alto, Ritter-viola(E) ڤیۆلا ئاڵتۆ، لەلایەن مۆزیکژەنی ئەڵمانیایی هێرمان ڕیتەر *H.Ritter* وە داهێنراو و لە یەکێک لە ڤێستیڤاڵەکانی مۆزیکژەنی بەناوبانگ ڤاگنەر/دا دەیژەنی، پاشان ژێی می/ $E$ پێنجەمی $E´´$ بۆ زیدکرد.

Viol bastarda, Small bass viol(E) ئامێرێکی سەردەمانی سـەتەی شانزەم و حەڤدەمە. ئەم ئامێرە لە وڵاتی ئینگلیزاندا لە لیرا ڤیۆل *Lyra-viol* ناسراوە.

Viola Clef(E) بڕوانە/ *Alto clef*.

Viola de braccio(I), Modern violin(E) **ڤیۆلای دەستی، کەمانچەی مۆدێرن. یەکێکە لە ئامێرەکانی سەربە خێزانی ڤیۆل*Viol*، لە سەرەتاکانی سەردەمی هۆرێزاندا پەیدابوو، پاشان شانبەشانی ئامێری ڤیۆلا دی گامبا*Viola de gamba*پەرەیپێدرا و بووە ئەو ئامێرەی کە ئێستا پێیدەوترێت کەمانچەی مۆدێرن، لەبەرئەوەی دەنگێکی بەرز و ناسک و بەجۆشو خرۆشی هەیە، بووە یەکێک لە ئامێرە میللییەکان.**

Viola de gamba(I), Viol for the leg(E) **ڤیۆلی دی گامبا، واتە ڤیۆلی لاقدار کە دەخرێتەسەر ئەژنۆ یاخود نێو هەردوو لاقەوە. لە ئامێرەکانی سەربە خێزانی ڤیۆلە*Viol*، لە سەردەمانی سەتەی شانزەیەمدا زۆر ڕەواجی هەبووە، شێوەیەکی ئامێری کۆنتەرباسی ئێستایە بەڵام بە قەوارەیەکی زۆر بچووکتر. لەسەر کلیلی باس تۆنەکانی کۆکدەکرێن، شەش ژێی لەسەر بەستراوە بەڵام ژەنیارە فەرەنسایەکان حەوتەم ژێی نزمیان خستەسەر و بووە حەوت ژێ کە تاڕادەیەک بە چێللۆ*Cello*دەچێت.**

Viola d´amoure(F) **ڤیۆلی دی ئامۆرێ{ڤیۆلی شەیدایان}، لە ئامێرەکانی سەربە خێزانی ڤیۆل*Viol*،لە سەردەمانی سەتەی هەژدەمدا ڕەواجی هەبووە، ئامێرێکی بە زایەڵە و بەسۆزە شیرین دەنگە، لەبەرئەوە بە ئامێرێکی بەردەستی شەیدایان و ئەڤینداران دەناسرا.**

Viola de spalla(F) **ڤیۆلا دی سپالا، لە ئامێرەکانی سەربە خێزانی ڤیۆل*Viol*، لە سەردەمانی سەتەی هەژدەمدا ڕەواجی هەبووە، ئامێری گەورەیە و دەخرێتە سەر سنگ و سەرشانی ڕاست لەکاتی ژەنیندا، وەک ڤیۆلای مۆدێرن چوار ژێی لەسەر بەستراوە بە تۆنی/C-G-D´-A´، لەبەرئەوەی دەنگێکی خۆشو لەبار هەیە لەزۆر بۆنە و ئاهەنگدا وەک ئامێرێکی هاویار بەکاردەهێنرا.**

Viola di bardone(F) **ڤیۆلا دی باردۆنێ، ڤیۆلا بە تۆنی باریتۆن.**

Viola di Fagotto(F), Tenor violin(E) **ڤیۆلا دی فاگوتۆ، ڤیۆلینی تینۆر.**

Viola pomposa(G), Tenor violin(E) **ڤیۆلا پۆمپۆزە، ڤیۆلینی تینۆر. مۆزیکاری ئەڵمانیایی سیباستیان باخ داهێنەری ئەم ئامێرەیە.**

Viola tenor(E) **ڤیۆلا تینۆر، لە ئامێرەکانی سەربە خێزانی ڤیۆلینە*Violin*کە بەرینی دەنگی دەکەوێتە نێوان ڤیۆلای ئاسایی*Standard Viola* و ڤیۆلۆنسیللۆ*Violoncello*.**

Violectra(E) **ڤیۆلێکترا، ئامێرێکی کارەباییە کە لە نزیک سالانی1995ز پەرەیپێدرا، لە جۆرەدارێک دروستکراوە کە بەئارەزووی ژەنیارانی لێهاتوو لەنێوان سێ بۆ چوار، پێنج، شەش، حەوت و تاکو هەشت دانە ژێی لەسەر دەبەسترێت.**

Violenfamilie(G), Viol family(E) **خێزانی ڤیۆل، ئەو ئامێرانەن کە سەربەم خێزانەن.**

Violento(I), Violent(E) **توند.**

Violentamente(I), Violently(E) **بەتوندی.**

Violenza(I), Violence(E) **توند.**

Violetta(I), Three stringed violin(E) **کەمانچەی سێ ژێ/ی سەتەکانی حەڤدەم و هەژدەم.**

Violi(Gr) Violin(E), Violine(G), Violino(I), Violon(F) **کەمانچە.**

Violin(E), Fiddle(G), Violino(I) کەمانچە.




ڕەچەڵەکی وشەکە لە ڤیتولا*Vitula*ی لاتینییەوە هاتووە کە بەمانای دەسترانێت*Sing*یاخود دڵخۆش *Rejoice*دێت، لە باستانی دێرینی ڕۆماندا ناسناوێک بووە بۆ خواوەندی خۆشی*Joy*. لە سەتەکانی ناوەڕاستدا وشەکە زوانگۆڕی بەسەردا هات و بووە ڤیۆلا*Viola*. لە دوای نزیک1579ز وە بە زوانی ئیتالیایی بووە ڤیۆلینۆ*Violino*. ئەم وشـــەیە وەک زاراوە بە ســـەرانســـەری ئاوروپادا بە ڤیۆلین*Violin*بڵاوبووەوە. لە هەندێک وڵاتی ئاوروپای وەک ئاڵمانیا بە فیدڵ*Fiddle*داودەبرێت کە ئەمیش هەر لێڕشتەی وشەی فیتولا/یە. بڕوانە/*Kemançe*.

Violin clef, Violinschlüssel(G), G-clef, Treble clef(E) کلیلی کەمانچە، کلیلی ســۆڵ.

Violifamilie(G), Violin family(E) خێزانی کەمانچە، ئەو ئامێرانەن کە سـەربەم خێزانەن.

Violifamilie(G), Violin family(E) خێزانی کەمانچە، ئەو ئامێرانەن کە سـەربەم خێزانەن.

ئەم ئامێرانە دەگرێتەوە:

1. ڤیۆلینۆ پیککۆلۆ*Violino Piccolo* بە دەنگەوارەکانی/ c', g', d'', a'' .
2. کەمانچەی ئاسـایی*Violin* بە دەنگەوارەکانی/ g, d', a', e'' .
3. دووەم کەمانچە*Second violin* کە بڕێکی زۆر کەم گەورەترە لە کەمانچەی ئاسایی بە دەنگەوارەکانی/ g, d', a', e'' .
4. ڤیۆلا*Viola* بە دەنگەوارەکانی/ c g d' a' .
5. تینۆر کەمانچە*Tenor violin* بە دەنگەوارەکانی/ G, d, a, e' .
6. ڤیۆلۆنسیللۆـ پیککۆلۆ*Violoncello piccolo* بە پێنج ژێی دەنگەوار/ C, G, d, a, e' پێیشیدەوترێت/*Viola pomposa* یاخود *Viola di fagotto*.
7. کەمانچێللۆ{ڤیۆلۆنسیللۆ*Violoncello*}کە پێیشیدەوترێت چێللو*Cello*، تۆنێکی باس*Bass*ی هەیە لە خێزانی خۆیدا بە دەنگەوارەکانی/ C, G, d, a .
8. دەبڵ باس*Double bass*، بە دەنگەوارەکانی/ EE, AA, D, G .

Violino primo(I), First violin(E) یەکەم کەمانچە.

بەو کەمانچەژەنە دەوترێت کە لەڕیزی پێشەوەی ئۆرکێسترادایە.

Violone, Double bass viol(E) ڤیۆلۆنێ، دەبڵ باس ڤیۆل.

Violon-tenor(E) ڤیۆلۆن تینۆر، لە نزیک ساڵی1833ز هێنرایە سـازکردن بە درێژی71cm، یەک ئۆکتاڤێک لە کەمانچەی ئاسایی نزمترە، بەشێوەیەکی سـتوونی دەخرێتەسەر ئەژنۆ دەژەنرێت.

Virga(L) بڕوانە/*Neume notation*.

Virtuose(F,G), Virtuoso(E) هونەرمەند، کەمانچەژەن، چێژوەرگر لە هونەر.

Vista(I), Vue(F), Sight(E) دیمەن، دیدە.

Vistamente(I), Vitement(F), Quickly, Immediately(E) بە پەلەیی.

Visto(I), Quick(E) — پەلە.
Vitesse(F), Speed(E) — خێرا.
Vivace(I), Vivacious(E) — بە گیانێکی بەجۆش و بزێوانە، ***Viv.***کورتەیەتی.
Vivacemente(I), Liveliness(E) — جۆشەند.
Vivacezza(I),Vivement(F), Vivacity, Lively(E) — بەچەشنێکی بەجۆش و بزێوانە.
Vivacetto(I), Rather vivacious(E) — تۆزێک بەجۆش و بزێوانە.
Vivacissimamente, Vivacissimo(I), Very vivacious(E) — زۆر بەجۆش و بزێوانە.
Vivido,Vivo(I), Lively(E) — بەچەشنێکی بەجۆش و بزێوانە.
***Vl.***یاخود***V^no^.*** — کورتکراوەی ڤیۆلینۆ/ *Violino*.
***Vla.*** — کورتکراوەی ڤیۆلا/ *Viola*.
***V^llo^.*** — کورتکراوەی ڤیۆلۆنسێللۆ/ *Violoncello*.
***Vln.*** — کورتکراوەی کەمانچە/*Violin*.
Voca(I), Voce(I), Vox(L), Voix(F), Voice,Part(E) — گۆ، دەنگ، بەش، پارت، واچە.

چوار توخمی ســەرەکی هەیە کە دەنگی لەســەر بەندە:ـ

1. لەرینەوە، واتە فریکوێنسی*Frequency*کە پلەی دەنگەکە دیاریدەکات.
2. شـێوەی شـەپۆلی*Wave form* کە جۆری دەنگەکە دیاریدەکات.
3. کات*Time* کە مەبەست پێچوونی دەنگە*Duration*.
4. مەودا*Extent*، ئەوپەڕی لەرینەوە دیاریدەکات کە پلەی دەنگ دەیگاتێ.

Vocable(E) — بەرگۆ، شـیاوی گۆکردن، کۆمەڵە پیتێک کە چاوپۆشـــی لێدەکرێت لە مانایاندا.
Vocal(E) — گۆیی، مەبەست لە گۆ-دەنگیەکانە.
Vocalisation(F), Vocal exercise(E) — گۆیندە کردن، ڕاهێنان لەسـەر پیتە دەنگیەکان.
Vocal range(E) — مەودای گۆدەنگیەکان بڕوانە/*Voci*.




Vocalizzare(I) — ســترانبێژیی لەسـەر پیتەدەنگیەکان.

Voce alta(I) دەنگی بڵند.

Voce bianca(I), White voice(E) دەنگی سپی، زاراوەیەکە بۆ
بۆ فرۆزە کردنی دەنگەکانی منداڵ و مێیینە.

Voce di petto(I), Vox pectoris(L), Chest voice(E) دەنگە ســینەییەکان،
ئەو دەنگانە دەگرێتەوە کە پێویستیان بە پاڵهێزی ســنگەوە هەیە.

Voce di testa(I), Vox Capitis(L), Head voice(E) دەنگە ســەرەکیەکان،
ئەو دەنگانە دەگرێتەوە کە پێویستیان بە جووڵەی ناو دەم هەیە.

Voce granita(I), Powerful, Rounded voice(E) بەهێز، دەنگی گرخواردوو.

Voce pastosa(I), Full, Soft, Flexible voice(E) پڕ، ناسک، دەنگی نەرمو لەبار.

Voce principale(I), Principal voice(E) دەنگە بنەڕەتیەکان.

Voces aequales(L), Voci eguali(I), Equal voice(E) دەنگە یەکسانەکان.

Voce spittica(I), A voice with clear enuncation(E) دەنگێک بە گۆیەکی ڕەوان.

Voci(I), Voices(E) دەنگەکان،
ئەو دەنگەوارانەیش کە بەگشتی لە مرۆڤدا هەن:ـ
سـۆپرانۆ*Soprano*، میزۆسـۆپرانۆ*Mezzo-soprano*، کاسـتراتۆ*Castrato*، ئاڵتۆ*Alto*{کۆنتراڵتۆ}، کۆنتراتینۆر*Countertenor*، تینۆر*Tenor*، باریتۆن*Baritone*، باس*Bass*.

| Voice types جۆری دەنگەکان | Ranges مەوداکان |
|---|---|
| Soprano | |
| MezzoSoprano | |
| Castrato | |
| Alto(Contralto) | |

-1-

| Voice types جۆری دەنگەکان | Ranges مەوداکان |
|---|---|
| Countertenor | |
| Tenor | |
| Baritone | |
| Bass | |

-2-

Voicing(E) دەنگێن،
مەبەست لە ڕێکخستن و کۆکـکردنی دەنگەکانی زیل و بەم/ی پیانۆ یاخود لوولەکانی ئۆرگنە.

Voglia(I), Longing(E) بە تەوس و پەرۆش.

Voile(F), Veil(E) دەنگپۆش،
لە دانانی پارچە کوتاڵێک بەسەر ڕووی ئامێرە تەپڵ*Drum*یەکاندا بۆ کپاندنی دەنگیان.

Voilé(F), Veiled(E) دەنگپۆشیو.

Voix voilée(F), Not clear voice(E) دەنگپۆشیو.

Volante(I), Flying, Fast and light(E) ســووک و پەرواز.

Volata(I) ڤۆلاتا، ڕەچە نۆتەیەکی پەلە کە شێوەیەکی زەخرەفە بە میلۆدیەک بدات.

Volatina(I) ڤۆلاتینا، بچووکراوەی{گچکاندن}/*Volata*یە.

Volgendosi(I), Turning(E) وەرچەرخان.

Volkston(G), Folk style(E) چەشنی فۆلکلۆر.

Voll, Volles, Vollem(G), Full(E) پڕ، تەواو.

Volles chor(G), Full choir(E) کۆرسی تەواو.

Volles orchester(G), Full orchestra(E) ئۆرکێسترای تەواو.

Volles werk(G), Full organ(E) کارێکی تەواو بە ئۆرگن ئەنجامبدرێت.

Völlig(G), Complete(E), Compléter(F) تەواو، دروست.

Vollstimmig(G), Full texture(E) دەنگی کۆک و پڕ،

زاراوەیەکە بۆ ئاماژەدان بە دەقێکی تەواو لە کۆڕاڵ یاخود کارێکی کۆنتراپونتاڵ*Contrapuntal*.

Volta(I), Turn, Time(E) دەم، کات، کۆلاپ، بڕوانە/*Gruppetto*.

Volta prima(I), First time(E) یەکەم کات.

Volta Seconda(I), Second time(E) دووەم کات.

Volteggiando(I) پێپەڕاندنی دەستە چەپ بەسەر دەستە ڕاستدا لەکاتی پیانۆژەنیندا.

Volti(I), Turn, Turn over(E) گەڕانەوە{هاتنەوە}بەسەریادا.

Volti subito(I), Turn over quickly(E) بەسەرکردنەوە بە پەلە.

Volubile(I), Voluble(E) ســووڕکە، خولگە.

Volume(E) پلەپلەکردنی دەنگ بۆ بەرز و نزمکردنی.

Vom(G), From(E) لە.

Vom anfang(G), Da capo(I), Return to the beginning(E) گەڕانەوە بۆ ســەرەتا.

بڕوانە/*Da capo*.




Vor(G), Before, Forward(E) پێش. بەرەوپێشەوە.

Voraus(G), Beforehand(E) پێشدەست.

Vorausnahme(G) بڕوانە/*Anticipation*.

Vorbereiten(G), To prepare(E) ئامادەی بکات.

Vorbereitung(G), Preparation(E) ئامادەکردن.

Vorgeige(G), The orchestral leader(E) پێشەنگی ئۆرکێسترا، یەکەم کەمانچەژەن

لە یەکەم دەستەی کەمانچەژەنەکان.

Vorhalt retard(G), Variously(E) فرەنۆتەی جیاواز لە دواخستن، ئەم دواخستەیە لە هەندێک شـێوەدا بەکاردەهێنرێت، وەک هەڵاوێز لە هارمۆنیدا(*suspension(harmony)*، دواخسـتن لە تێمپۆدا(*Retardation(tempo)*، ئاپۆجیاتۆرا لە زەخرەفاندندا(*Long Appoggiatura(ornamentation)*، سـینکۆپاندن لە ڕەزمدا(*Syncopation(rhythm)*

Vorhanden(G), Available(E) پەیدابوو، بەردەستە.

Vorher(G), Formerly(G) پێشـەکیانە.

Vorig(G), Preceding(E) زووتر، پێشـینتر.

Voriges Zeitmass(G), The preceding time(E) کاتی پێشـین.

Vorschlag(G), Fore stroke(E) بەرلێدە، پێشـنیار، بڕوانە/*Appoggiatura*.

Vorschlagsnoten(G) بڕوانە/*Grace note*.

Vorspiel(G), Overture, Prelude(E) بەرایی.

Vorsingen(G), Audition(E) تاقیکردنەوەی توانای کەسـێک بۆ سـتراندن.

Vorzeichnung(G), Key or Time signature(E) کلیل یاخود هێمای کات.

Vorwärts(G), Forwards(E) بەرەوپێش، جلەوکێش.

Vorwärts drängend(G), Pressing forwards(E) زۆرکردن بەرەوپێش.

Vorwärts gehen(G), Moving forwards(E) بەرەوپێش جووڵاندن.

Vox angelica(L), Voix céleste(F) لوولەداخراوەی ئۆرگن، لوولی دەنگی هارمۆنیم کە زایەڵەیەکی نەرم و ئاسـمانی هەیە.

Vox Capitis(L), Head voice(E) دەنگی سەرەکی.

Vox gutturis(L), Throat voice(E) دەنگی هەنکەڕە{حونجەرە}.

Vox humana(L), Tenor oboe(E) داخراوە لوولەی ئۆرگن کە لاسایی دەنگی مرۆڤی پێدەکرێتەوە، تینۆر ئۆبوا.

Vuata, Vuato(I), Empty(E) بۆش، بەتاڵ، کراوە.

هەروەکو دەوترێت ژێی کراوە{ کراوەژێ}*Corda vuata(I), opening string(E)*.

----------------------------------
--------------------------
-----------------

# W

**بێدەنگی و مۆزیک...گوزارە لە شتێک دەکەن کە فرۆزەناکرێت.**

**ئالدۆس هێکسلی**

---

Wachtel(G), Quail(E) **کەرەک، مۆزیک ئامێرێکی هەواییە، ڕاوچیان بۆ لاسـییکردنەوەی باڵندەی کەرەک*Quail* بەکاریدەهێنن بەمەبەستی ڕاوکردنی.**

Wagner tuba(E) **ڤاگنەر تووبا، براس ئامێرێکی هەوایی کە مۆزیکزانی ئەڵمانیایی ڕیچاردڤاگنەر (1813-1883)*Richard Wagner*لە هۆڕنی فەڕەنساییەوە چاکاری تیاداکردووە کە ئامێری بە باریتۆن هۆڕن*Baritone horn*دەچێت. بە جۆری*B-flat tenor* و *F-bass*خراوەنەتە سەر خێزانی هۆڕن*Horn family*.**

Waltflöte(G), Wooden flute(E) **شمشاڵی شوان، لوولەی ئۆرگن بەو دەنگە بە درێژی 4پێ.**

Walthorn(G), Bugle, Hunting horn(E) **هۆڕنی ڕاو{بێ دەمەوانە}، بووق.**

Walze(G), Ascending or Descending(E) **والزە، بەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی دەنگ بە پێداڵ لە ئۆرگندا بەشـێوەی کریشاندۆ و دیکریشاندۆ.**

Walzer tempo(G), Walz-time(E) **تێمپۆی سـەمای ڤالس.**

Wankend(G), Wavering, Shaking(E) **شـەکانەوە، لەرینەوە.**

Warmth(E) ,Wärme(G) **گەرما.**

Washt, Waşt(Kr) **وەشت.، هەلەکە، سـەمای دەروێشان.**

Water drum(E) **تەپلاو، مەبەست لەو تەپڵانەیە کە دەنگیان بە دەنگی شـڵپەی ئاو دەچێت.**

Wavelength(E) **درێژە پێڵ، بە هێمای/$\lambda$ گوزارەی لێدەکرێت کە بریتیە لە ماوەی نێوان ترۆپکی سـایە پێڵ و ترۆپکی لەدوای خۆی. درێژی پێڵەدەنگیەکان کە بتوانرێت بیسترێن لە مەودای یەک بۆ بیست پێ{1-20feet}دایە. پێڵەدەنگی فریکوێنسـییە بەرزکان کورتن، پێڵەدەنگی فریکوێنسـییە نزمەکانیش درێژن.**



Weak beat(E) لێدانی لاواز، بڕوانه/*Beating*.
Wechselgesang(G), Antifona(I), Antiphony(E) بڕوانه/*Antifona*.
Wechseln(G), Change(E), Alternare(F) گۆڕین.
Wechselnote(G), Changing note(E) نۆتەگۆڕین.
Wedge(E), Cale(F) هێمایه بۆ ستاکاتیسیمۆ*Staccatissimo*، نۆتەکە کەمدەبێتەوە بۆ چارەک.
Weg(G), Away, off(E), Acheminement(F) دوورکەوتنەوە.
Wehmut(G), Sorrow(E), Diuleur(F) مخابن.
Weich(G), Soft, Tender, light, Weak(E) نەرم، بەتەوس، سووک، لاواز.
Weinend(G), Wailing(E) هاوار.
Well-tempered(E), Wohltemperiert(G) بڕوانه/*Equal temperament*.
Wellenform(G), Wave form(E) شەپۆل{پێڵ} ئاسا.
Weites intervall(G), Compound interval(E) میانەی پێکهاتوو.
Weltliche musik(G), Worldly music, Secular music(E) مۆزیکی دونیایی.
Weltmusik(G), World music(E) مۆزیکی جیهانی.
Wenig(G), Little(E) کەم، پچەک.
Weniger(G), Less(E) کەمتر.
Wenig schnell(G), Less fast(E) کەمتر خێرا.
Werden(G), Become(E) ببێت.
Wesentlich(G), Essential(E) سەرەتا.
Western mouth organ, Harmonica(E) دەمە ئۆرگنی خۆراوایی، هارمۆنیکا.
Wesht, Weşt(Kr) وەشت، سەمای دەروێشان.
Whip(E) قامچی، ئامێرێکی نەگرە*Percussion*ییە لە دوو باڵە تەختەی جومگەدار بەشێوەیەک کە ژەنیارەکە هەرردوو باڵەدارەکە دەدات بەیەکدا دەنگێکی وەک لێدان بە قامچی لێوە دێت.
Whistle(E), Sheet, Şit(Kr) ئامێری فیکە، شاور، شیت.
Whole bar note(E), Gamme par ton(F), Ganzer takt note(G) نۆتەی باڕتەواو، نۆتە مێجەری تەواو.
Whole bar rest(E) پشووی باڕی تەواو کە بریتیەلە چوار باڕی تێمپۆ جیاواز.



جاری وا هەیە کە ڕیزە باڕێکی لە دەقێکی مۆزیکدا نیشانەدەکرێت وەک وچانی باڕی تەواو کە دەشێت هەمووی پێکەوە کۆبکرێتەوە و بەژمارەی/21 ئاماژەی پێبدرێت، وەک لەم نموونەیەدا:



Whole note, Semibreve(E) نۆتەی تەواو.

Whole note rest(E) وچانی نۆتە تەواو کە بریتیە لە دوو نیوەنۆتە و چوار چارەکە نۆتە

Whole rest, Semibreve rest(E) پشووی تەواو.

Whole step, Whole tone(E) تۆنی تەواو، میانەی مێجەر دووەم{دوو نیوەتۆن}.

Whole tone scale(E) ســکێڵی تۆنی تەواو. جیاوازی لەگەڵ ســکێڵەکانیـتردا لەوەدایە کە ئەم شــەش تۆنی هەیە. ئەگەر ســکێڵەکە لە تۆنی دۆ/Cوە ڕیزبەند بکرێت بەم شێوەیە دەبێت:ـ $C-D-E-F^{\#}-G^{\#}$- میانەی نێوان تۆنەکانیش میانەی تەواون*Whole interval*کە بە پیتیW ئاماژەی پێدەکرێت.




Widerhall(G), Echo(E) زایەلە، دەنگدانەوە، پەتان.

Wie(G), Like(E), De suite(F) وەک.

Wie anfänglich(G), As at the beginning(E) وەک لە سـەرەتادا.

Wieder(G), Again(E) جارێکیتر.

Wiederholung(G, Repetition(E) ڕەپات.

Wiederholungszeichen(G), Repeat sign(E) ڕەپاتکردنەوەی نیشـانە.

Wieder langsam(G), Again slowly(E) جارێکیتر بە لەســەرخۆیی.

Wieder schnell(G), Again quick(E) جارێکیتر خێرا.

Wieder starker(G), Again stronger(E) جارێکیتر بەهێزتر.

Wie eine Vogelstimme(G), Like a bird song(E) وەک خوێندنی باڵندە.

Wie früher(G), As previously(E) وەک پێشووتر.

Wiegenlied(G), Cradle song(E) لایەلایە، لۆرین، لانکە ستران.

Wie oben(G), As above(E) وەک لە سـەرەوە.

Wind instrument(E) ئامێرە هەوایی‌یەکان{زیاتر براس دەگرێتەوە} کە لە پلاستیک و تەختە و هەندێک کەرەســتەی تری وەک شــاخی گیانلەبەران و ئێســک، شــووشــە و گڵ دروستدەکرێن.

Windlade(G), Wind chest(E) ســنگەبا، ئەو مەشکەهەوایەیە کە لە پشــت لوولەدەنگیەکانی ئۆرگن/دا دانراوە بۆ دەنگ پەیداکردن.

Wirbel(G), Peg, Drumsticks(E) ژێ پێچەک، دوگمەی ژێ توندکردن، داری تەپڵ.

Wirbeltrommel(G), Tenor drum(E) تەپڵی تینۆر.

Woodblock(E) بلۆکە تەختە، ئامێرێکی نەگرەیی شـێوە لاکێشـەیە، زیاتر لە جاز مۆزیکدا بەکاردەهێنرێت، لەم چەند سـاڵانەی دوایییندا لە ئۆرکێسترا سـیمفۆنیەکانیشدا سـوودی لێوەرگیراوە.

Written root(E), Sixth chord(G,I) ڕەگی نووسراو، مەبەست لە نزمترین تۆنە کۆردێکە کە لە سـیانییەکاندا ڕێکبخرێت ، پێیشیدەوترێت ڕەگی دەنگێن*Sounding root*.

Wunsch(G), Wish(E), Désirer(F) ئارەزوو.

Würdig(G), Dignified(E) شـیاو، فەرزام.

Wüthend(G), Raging, Furious(E) تووڕە، خەشمین.



X

زایلۆفۆن
Xylophone

مرۆڤ.....بەهاترین بوونەوەری خواکردە.....
زێڕ.....زێباترین کانزای ســروشتە....
مۆزیک.....بالاترین هونەری جوانییە... پەندی دانایان

---

**زایلۆفۆن، لە ڕیشەوشەی** Xilofono(I),Xylofon, Xylophon(G), Xylophone(E,F) **زایلۆن***Xylon***ی یۆنانی/یەوە هەڵێنجراوە کە بەمانای تەختە***Wood***دێت، ئاوروپای خۆرەڵات شــوێنی وەدەرکەوتنێتی، ئامێرێکی نەگرە***Percussion***یە بە شــوولێکی تایبەتی سەرەتۆپ بەسەر چەند پارچە کانزا***Metal*** یاخود مادەنێکی ڕیزبەندکراودا دەدرێت تاوەکو دەنگی لێوەڕا دەربچێت، دەنگەکانیشی یەک ئۆکتاڤ لە نۆتە***Note***ی ئاســایی بەرزترە. مەودا***Range***ی دەنگی لە ســێ ئۆکتاڤ و نیو پێکهاتووە واتە لە دەنگەواری فا/F وە بۆ دەنگەواری دۆ/ $C^{1111}$، لە هەندێک قەوارەیدا مەودای دەگاتە پێنج ئۆکتاڤ.**

**خەمەنگێژ، خەمەنگێز. واتە خەم بەرپاکەر یاخود خەمێکی** Xemengêj, khemengêz(Kr) **پێشـخواردوو لە دڵ و دەروونداا. لێڕشتەیەکی ســەر بە دەسـگای بەیاتە کە سکێڵی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی دوگا، ڕەگەزی هەوشــار لەســەر پلەتۆنی ســێگا.**

نۆتەی دەسپێک

**عەزیزان من ئەوا ڕۆیم لەلاتان لە مەزڵومان بەلا دووربێ ولاتتان**

**مستەفابەگی کوردی، بەدەنگی: عەلی مەردان**

**زایلۆگانۆم، هاومانای ئامێری زایلۆفۆنە.** Xyloganum(E)

----------------------------------
--------------------------
-----------------

# Y




مۆزیک.... زۆر بەهاترە لەوەی کە ببێتە ئامڕازێک بۆ گەمە و ڕابواردن.
ئەرەستۆ

---

Yekga(Ar,Fa,Kr,Tr) **یەکــگا، واتە یەکەم ئاواز.**
**لقێکی سـەربە دەسـگای ڕاســتە. سـکێڵی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی ڕاست لەسەر یەکــگا، ڕەگەزی ڕاست لەسەر دووگا. سـکێڵی هاتنەخوارەوەیشی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی بەیات لەسـەر پلەتۆنی دووگا لەگەڵ گۆڕینی نیوەپلەتۆنی حیجاز بۆ چوارگا و پلەتۆنی بوسـەلیک بۆ ســێگا.**




Yellow brass(E) **زەردە براس. داڕشتەیەکی پێکهاتووە لە 70%کانزای مس و 30%کانزای قوڕقوشم پێکهاتەی ئەم داڕشتە لەبارە بۆ دروستکردنی گەلێک ئامێری هەوایی کە ناسراون لە براس ئامێرە هەواییەکان.**

Yaoqin(Ch), Chinese wind harp(E) **یاوکین، هارپێکی هەوایی چینی/یە.**

Yesht, Yeşt(Av), Psalm(E) **یەشــت، تەرنیمە، ســروودی ئایینی.**
**وشەیەکی ئاڤێستاییە کە واتای پەرستن و نزا و پاڕانەوە دەبەخشـێت.**

Yesna(Av) **یەسنە، وشەیەکی ئاڤێستاییە و لە سـانسـکریتیدا بە یەجنە لە فەهلەویشدا بە یەزیشنە هاتووە، یەکێکە لە سـرۆتەکانی ئاڤێسـتا و چەشنە پەرسـتنێکی لەخۆگرتووە بە مۆرگێکی هۆرە/ییانە دەچڕدرێت.**

ئەمەیش نموونەیەکە لە کۆپلەی یەکەمی یەســنا ـ هاتی ژمارە/47 لە سروودی سـێیەم بەناوی سـپەندمەد گات کە دە بڕگەییە، ئاوازەکەیشی لە ســەر دەسگای ئەجەمە و بە نەوایەکی هۆرە/ییانە دەچڕدرێت.

سـپەنتا مەئینیو ڤەهشتا چا مەنەنگها چا

هەچا ئەشـئەت شیڤەتنا چا چەنگها چا

ئەسـمائی دان هەڤوورتاتە ئەمەرەتاتا

مەزدائو خشەترا ئارمەئەیتی ئەهوورو.

ئەمەیش پاراوی مانایەتی:ـ

ئەوەی لە سـایەی....مینـووی سـپەنتا پیند، گفتە و کردار، بە نێک پیشـاندا بە هێز و ســـۆزی مەزدای ئاهـورا ســـەرفراز دەبێت لەنێو نەمـراندا.




----------------------------------

--------------------------

-----------------

# Z


زورنا/سورنای
Žurna


زیتار
Zithar/Zitar

# Z

مۆزیک.....بەر لە هەموو شتێکە!!!! .     پۆڵ ڤێرلین

---

Zählzeit(G), Beat(E), Battement(F), Picchiare(I) **لێدان.**

Zampogna(I), Neapolitan bagpipe(E) **ئامێری مەشکەبای دوو مەشکە*Drone*ی سەر بە شاری ناپۆلی/ئیتالیاییە، ئەم ئامێرە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی شانزەم و هەڤدەم.**

Zampagnetta, Zampagnino(I), Small bigpipe(E) **مەشکەنایی بچووک.**

Zanfonia(E) **بڕوانە/*Hurdy-gurdy*. ئامێری هوردی-گوردی ئیسپانیایی پێنج ژێ.**

Zarb(Fa,Kr), Drum(E) **زەرب، تەپڵ.**

Zart(G), Soft, Tender(E) **ناسک، نەرم.**

Zartheit(G), Tenderness(E) **ناسکیی.**

Zärtlich(G), Tenderly(E) **بە ناسکی.**

Zauberflöte(G), Magic flute(E) **بلوێری جادوو.**

Zehn(G), Ten(E) **دە.**

Zeit(G), Tempo(I), Time(E) **تێمپۆ، کات.**

Zeitmesser(G), Chronometer, Metronome(E) **مێترۆنۆم.**

Zenbur(Hn) **زەنبور، ژەنپور، زەمبەلەک، مۆزیکئامێرێکی ژێداری هیندییە**

Zenburak(Fa,Kr), Zembelek(Kr) **زەبنوراک، ژەنپوراک، هارپی چەناگە. بڕوانە/*Jaw harp*.**

Zengoĺe(Ar,Fa,Kr,Tr), Zengeřan(Kr) **زەنگوڵە، پێیشیدەوترێت زەنگەڕان{زەنجران} ئەو بازنە زەنگۆڵەیەی دەکرێتە ملی ڕانە مەڕ. زۆر مانا دەبەخشێت لە ژیانی گوند و لادێ و کۆچەریدا، لەو سوودانەی کە هەیەتی بێدارکردنەوەی مێگەل یاخود ڕانەمەڕ و شوانەکەیە کە دەبێت هەمیشە گوێبیستی ئەو دەنگەبن تاکو لەیەکتر دوور نەکەونەوە. ئەو دەنگی زەنگۆڵەیەی ملیان دەبێتە بەزم و ڕەزمێکی سروشتی چ بۆ شوانەکە و چ بۆ ڕانەکە، زۆر جار هەر ئەم دەنگە دەبێتە سروبەخشێک بۆ شوانەکە و بە هەوایەکی خۆشئاواز هەست و هۆگری ڕانەمەڕەکە بۆ خۆی ڕابکێشێت. دەشێت هەر لەم دیمەنەوەڕا ئەم وشەیە وەک زاراوەیەک کرابێت بە بەرگی ئەم ئاوازەدا. هەر ئەو زەنگۆڵەیەیشە کە دەکرێتە ملی وڵاخی بارهەڵگر و کاروانچیان گەشتی گەرمیان و کوێستانی پێدەکەن.**

ڕیشەوشەی زەنجەران/یش....کە وشەیەکی بە عارەبیکراوە لە زەنگ و ڕان پێکهاتووە، ئەو دەنگە دەگەیەنێت کە لە زایەڵەی زەنگی ڕانەمەڕ{واتە زەگەڕان}ەکەوە دەردەچێت و دەبێتە هەوێنێکی خۆشئاواز بۆ شوانەکە. وەک زێوەر دەفەرموێت:ـ

هۆ کاکەی شوان گوێم لێ یە لەو بندارە ئەوی ئەیلێیت نایلێیتەوە دووبارە

بەو ئاوازەت مێگەلەکەت سەرخۆشن سەر مەست ئەڕۆن ئەلەوەڕن بەجۆشن

زەنگۆڵە یاخود زەنگەڕان....لێرشتەیەکی سەربە دەسگای حیجازە، سکێلی بەرزبوونەوەی پێکهاتووە لە:ـ ڕەگەزی حیجاز لەسەر پلەتۆنی ڕاست، ڕەگەزی ئەجەم لەسەر پلەتۆنی چوارگا. سکێلی هاتنەخوارەوەیشی لە ڕەگەزی نەهاوەند لەسەر نەوا، ڕەگەزی کورد لەسەر بوسەلیک.




Zewar(Fa,Kr) زەوار، ئەو سیمە درێژە ڕەقەیە کە لای دەستەڕاستی ئامێری سەنتوور چەسپکراوە بۆئەوەی ژێیەکانی بەسەردا ببرێت.

Zhong(Ch), Zang(Kr), Bell(E) زەنگ.

Ziehharmonica(G), Accordion(E) ئامێری ئاکۆردیۆن.

Zierrathen(G), Ornaments(E) ئۆرنامێنتەکان.

Zigeuner(G), Zingaro(I), Gypsy(E) زگێنەر، قەرەچ، دۆم.

Zigeunerartig(G), Gypsy style(E) چەشنی قەرەچ.

Zigeunerlied(G), Gypsy song(E) ستranی قەرەچ.

Zigeuner musik(G), Gypsy music(E) مۆزیکی قەرەچ.

Zigeuner skala(G), Gypsy scale(E) بڕوانە/*Gypsy scale*.

Zil u Bem(Fa,Kr), Treble and Bass(E) زیل و بەم، دوو دەنگی پەیوەستن بە یەکتری.

زیل گوزارە لە دەنگی ناسک*Treble* و تیژ دەکات، بەم گوزارە لە دەنگی گڕ*Bass* و نزم دەکات. بەرینی نێوان ئەم دوو دەنگە ئۆکتاڤێکە. واتە ئەگەر تۆنی دۆ/C وەک بەم*Bass*وەربگیرێت، دەبێت یەک ئۆکتاڤ بەرزتر بە زاراوەی زیل*Treble*گوزارەبکرێت. لە زوانی عارەبیدا پێیدەوترێت قەرار{بەم} و جەواب{زیل}. ئەم دوو وشەیە وەک زاراوە زیاتر لە سکێل دانانی دەسگامۆزیکیەکاندا بەرچاو دەکەوێت. بۆ نموونە:ـ دەشێت بە پلەتۆنی ڕاست کە دەکەوێتە سەر پلەتۆنی دۆ/Cناوەڕاست پێیبووترێت بەم ـ ڕاست{قەرار ڕاست}، بە یەک ئۆکتاڤ بەرزتر دەبێتە پلەتۆنی گردان کە دەشێت پێیبووترێت زیل ـ ڕاست{جەواب ڕاست}. هەروەها بۆ دەسگای سێگا/یش کە بە یەک ئۆکتاڤ بەرزتر زیل سێگایە و پێیشیدەوترێت پلەتۆنی بزورگ....هتد.

Zilaphone(I) بڕوانە/*Xilofono* .

Zília(Gr), Finger cymbal(E) پەنجەی ساج{کۆس}، بڕوانە/*Cymbal*.

Zimbalon, Cymbalon(E) — **زیمبالۆن، بڕوانە**/*Sentoor* .

Zink, Zinke(G) — **زینک، تۆتیا، بڕوانە**/*Cornetto*.

Zinnpfeife(G), Tin whistle(E) — **فیکەی دروســتکراو لە کانزای تەنەکە.**

Zir-Afkend(Ar,Fa,Kr) — **زیرئەفکەند. ئاوازێکی زۆر کۆن و دێرینە، یەکێکە لەو دەســگا ســەرەکیانەی لە ســەردەمی ســاسانیەکاندا باوبووە، زانا سەفەدینی ورمێیــش لە نووسینەکانیدا ختسویەتە بازنەی حەوتەم لە دوانزە خانەی ئاوازەکاندا کە بریتین لە:ـ بازنەی عوشـشاق، بازنەی نەوا، بازنەی حوسێنی، بازنەی بوسەلیک، بازنەی حیجازی، بازنەی ڕاست، بازنەی زیرئەفکەند، بازنەی زەنگۆڵە، بازنەی ڕاهاوی، بازنەی ئەسفەهان، بازنەی عوراق، بازنەی بزورگ.**

**وشەلێکدراوێکی ئاڤێستایی/کوردییە:ـ زیر + ئەفکەند. زەرە ـ زەڕەـ زەڕ و پاشان بۆتە زێڕ{کە لە زوانی فارسیدا بۆتە زیر}واتە زەرد و بریسکەدار، دوا وشەیش کە ئەفکەندە بەمانای کەوتوو دێت. کۆی وشەکە ڕەنگی زەرد لێنیشتوو و یاخود زەرد هەڵگەڕاو دەبەخشێت. ئەم ڕوخسارەیش لە کەسێکدا ڕوودەدات کە باری دەروونی تەواو نەبێت و خەمبار و دڵتەنگ بێت. هەندێک بیروڕایتر پێی وایە کە وشەلێکدراوی زیرئەفکەند کە بە مانای ژێرکەوتوو دێت ئاماژەیە بۆ چوارەم ژێی خوارەوە لە ئامێری برباد. کاتی خۆی ئەم ئامێرە چوار تەلی لەسەر بەستراوە بەڵام زۆریاب تەلی پێنجەمی بۆ خستەسەر و ئیتر لەو سەردەمەوە کە بە ئامێری عوود ناسرا تەلەکانی بووە پێنج ژێ.**

**زێڕئەفکەند....ڕووی ڕۆمانسیانەوە لێکبدرێتەوە، گوزارە لە دڵتەنگی و زار و هیجرانی دەکات. دانانی ئەو ئاوازە دەگەڕێتەوە بۆ باربادی هونەرمەند و یاوەرانی، ئەو دەمەی کە پاشای ساسانی خەسرەوی پەروێز و شازادە شیرین لەوپەڕی هەوای ئەڤینی خۆیاندابوون. جاروبار لەڕووی نازەوە لەیەکتر زویر دەبوون. جا لەلایەن خەسرەو/ەوە داوا لە برباد دەکرا ئاوازێکی وای بسازێنێت گوزارە لەو بارە بکات. ئەمیش{واتە برباد} دەکەوتە پیاهەڵدانی شازادە و جوانی تاڵتاڵی گێسیای بە زەردەی تیشکی خۆر دەچواند. وەک بڵێیت زەردە تاڵتاڵی زێڕینی ئەو زوڵفە چەینچینەی بۆتە نەخشێک بەسەر شانوسینەیدا و بەناز و گریشمەوە بەرەبەرە لە دڵی دوور دەکەوێتەوە، بەڵام ئەو زێڕین تاڵتاڵەی ڕوخسارە خەسرەوی زەردهەڵگەڕاو و بێئارام و دڵشکاو کردووە. ئینجا دەیەوێت ئەو دڵ زویرییەی شازادە کە بۆتە ئاهێکی پیشخواردووی لە سینەی گوشراویدا بـیکاتە کزە بایەکی بەسۆز بـیگەیەنێتە دڵی ناسکی شازادە شیرین و ئاشـتی بکاتەوە.**

**زیرئەفکەند...لێرشتەیەکی سـەر بە دەســگای بەیاتە، کە هەمان سکێڵی هاتنەخوارەوەی دەســگای حوسـێنی{لقێکە لە دەسـگای بەیات}یە کە لە پەردەی موحەییەرەوە دەسپێدەکات، ئینجا پلەتۆنی ئاوج دەبێتە ماهوور، پلەتۆنی ســێگا دەبێتە بوسـەلیک، پلەتۆنی دووگا/یش دەبێتە زێڕگوڵە و دواجار لەسـەر پلەتۆنی حوسـێنی عەشـیران دەگیرسێتەوە.**

Zither(E) — **زیتار، ئامێرێکی ژێدارە، تاڕادەیەک بە ئامێری قانوون دەچێت، چل ژێی لەسەر بەستراوە. لەلای دەسـتە چەپی ئامێرەکە چوار بۆ پێنج ژێی زێدەی لەسـەر بەستراوە بۆ هاویاری ژێیەکانیــتر.**

Zitter(G), Cittern(F) — **زیـتەر، زیتـێرن، ئامێری گیتار لە سـەردەمانێکی زۆر زوودا.**

Zitternd(G), Trembling(E) — **زرنگانەوە.**

Zolfa(I), Sol-fa(F) هاومانای سـۆڵ- فا.

Zuerst(G), First(E) یەکەم.

Zulfällig(G) بڕوانە/*Accidental*.

Zufällige Versetzungszeichen(G), Accidental signs(E) هێما بەڕێکەوت{لاوەکی}ەکان.

Zufolo(G), Small flute(E), Flageolet(E,F) گچکە فلووت.

Zug(G), Slide(E), Glissière(F) کشان، ڕاکێشـانی لوولەی تڕۆمبۆن بۆ گۆڕینی تۆنەکانی.

Zugabe(G), Encore(E) جارێکیتر.

Zugtrompete(G), Slide trumpet(E) سـۆپرانۆ تڕۆمبۆن، تڕومپێتی لوولەکێش.

Zunehmend(G), Increase in loudness(E), Crescendo(I) زێدەبوونی دەنگ، کرێشـێندۆ.

Zunge(G), Tongue,Read(E) زمان، ڕیشـە.

Zurück(G), Back again(E) دیسـان گەڕانەوە.

Zurückgehalten(G), Ritenuto(I), Slowing down(E) خاوڕەوی لە تێمپۆدا.

Zuřna, Suřna(Ar,Fa,Kr,Tr) سـورنا، زوڕنا، وشـەلێکدراوێکی کوردیە،

**پێکهاتووە لە سور یاخود <u>سـوور</u> واتە ئاهەنگ، ئاپۆرەی خەڵک. پاشگری <u>نای</u>/یش مەبەست لە ئامێری نای/ە. کۆی وشـە لێکدراوەکە نای/ی ئاپۆرە دەگەیەنێت، ئەو ئامێرە دەنگ زوڵاڵەی کە لە ئاهەنگێکی زۆر گەورەی وەک شـایی و زەماوەند، جەژن و شـادی و یادی نەورۆز. تەنانەت لە بۆنەی شـین و چەمەری/یشـدا لێدەدرێت. ئامێرێ زۆر باوی تری کوردەواری بە چەندین ناو و شـێوە و قەوارەی جیاواز هەیە وەک شـمشـاڵ، لوولک، بلوێر، کەتەبلوێر، بالابان، جووزەلە و سـوڕنای، زوڕنا، فیکەنە....هتد. ئەمانە و چەندین ناویتر کە هەمووی لە خێزانی <u>نای</u> دادەنرێن.**

Zusammen(G), Together(E) پێکەوە.

Zusammengesetzter takt(G), Compound time(E) تێمپۆی تێهەڵکێش.

Zusammenklang(G), Harmony(E) هارمۆنی.

Zuvor(G), Before(E), Avant de (F), Prima che(I) لەپێش، بەرلە.

Zwei, Zwo(G), Two(E) دوو.

Zweifach(G), Twofold(E) دووانی، جووتی.

Zweihalbetakt, Zweihalbetakt(G) کێـشی2/2.

Zweichörig(G), For two choruses(E) بۆ دوو کۆرس.

Zweifache(G), Double(E) دەبڵ.

Zweifache intervalle(G), Compound intervals(E) میانە تێهەڵکێشـەکان.

Zweifacher contrapunkt(G), Double counterpoint(E) دەبڵ کۆنتراپونت.

Zweigesang(G), Duet(E) ئاوازە دووانی.

Zweigestrichene octave(G), Octave, Twice lined(E) دوو ڕیزە هێڵ، ئۆکتاڤ.

Zweihändig(G), Two-handed(E) دوو دەسـت.

Zweistimmig(G), In Two parts(E) لە دوو بەشـــدا، بۆ دوو دەنگ یاخود بۆ دوو ئامێر.

Zweite, Zwote(G), Second(E) دووەم.

Zweiteilige form(G), Binary form, Two. part form(E) جووت شـێوە، دوو بەشـە شێوە.

Zwischen(G), Between(E) لەنێوان.

Zwischenraum(G), Space between two lines(E) بۆشـــایی، نێوانە هێڵ.

Zwölf(G), Twelve(E) دوانزە.

Zwölfachteltakt(G) کێشـــی12/8.

Zyklus(G), Cyclic(E) بازنەیی.

Zymbel(G), Cymbal(E) بڕوانە/*Cymbal*.



# سەرچاوە کوردیەکان


1. زمانی ئاڤێستا...سۆکۆلۆڤ

وەرگێڕان و لێدوان و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی کوردی ئەمڕۆدا: محەمەد ئەمین هەورامی.

2. فەرهەنگی پەهلەوی....عەلی نانەوازادە.

3. ئاڤێستا....گاتاکان لە مێژینەترین سروودی کورد.

جەلیل عەباسی

4. فەرهەنگی ئێریەن ڤاچ....کوردیی کۆن و هی نوێ

محەمەد ئەمین هەورامی

5. ئاوڕێکی نزیک بۆ مێژووی گۆرانی و مۆسیقای خۆمان- ئەهلی هەق-

عادل محەمەدپوور

6. هەورامان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ـ کولتوورییە،

بەرگی یەکەم، دووەم/2004ز. نووسینی/ڕۆستەم ئەیوب

7. مێژووی مۆسیقای کوردی/......محەمەد حەمەی باقی.

8. سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی.....محەمەد حەمەی باقی.

9. گۆڤاری چلاواز ژمارە 3، 6.

10. مێژووی ئارامیەکان لە کوردستاندا...شاسوار. خ. هەرشەمی.

11. عەلی مەردان و شیعری هەڵبژاردی کوردی/1982ز.

کۆکردنەوەی: عبدالقادر علی مەردان.

12. دەروازیەک بۆ ئاواز و گۆرانی کوردی....محمود زامدار.

13. سەربردەی کۆمەڵە حەیران بێژێکی کورد.

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: سەعدوڵلا ئیسماعیل شێخانی.

14. سترانێت شاهی و دیلانا کۆمەلائێکێ

کۆمکرن و بەرهەڤکرا: احمد عبداللە زەرو و خالد حسین یعقوب

15. سترانێت کۆچک و دیوانا.

کۆمکرنا: مستەفا نوری بامەڕنی

16. زەردەشت و ئامۆژگاری یەکانی.....هاشم رضا

وەرگێڕانی لە فارسی یەوە: محەمەد گۆمەیی.

17. شیرین و خەسرەو....خانای قوبادی

بوژاندنەوەو لێکدانەوەی: محەمەدی مەلا کەریم.

